


لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی
ناوەندی **غەزەلنووس** - بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب ( ٣٦٣ )

# سنوورە ژێرپێ خراوەکان

## عەلی کەریمی

دیزاینی بەرگ: باسم رەسام
دیزاینی ناوەڕۆک: پەیام ئەحمەد
چاپ: یەکەم - ٢٠٢٢
چاپخانە: سلێمانی
تیراژ: ( ١٠٠٠) دانە
نرخ: ( ١٢٠٠٠ ) دینار
لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی
(٤٠٠) ساڵی ٢٠٢٢ پێ دراوە
بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس** - بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



---

سلێمانی، پشتەسەرا، گەراجی پاسەکانی تووی مەلیک، باڵەخانەی هۆشیار قەفتان، بازاڕی کتێب
۰۷۷۰۳۵۷۳۷۵۷ xazalnus@gmail.com
/nawandixazalnus

## وته و پێزانینێک

ئەم وشــە و دێڕانەی لە دووتوێی ئەم کتێبەدا، دەکەونە بەر دیدەی بەڕێزتــان، بەشــێک لە سەرگورشــتەی مرۆڤێکن، کە هــەر لە هەرەتی مێرمنداڵییــەوە عەوداڵی ئازادی و ســەربەخۆیی بووە. لــە ڕۆژگارانی تاریک و ئەنگوســتەچاوی حوکمی ڕەشی بنەماڵەی پەهلەوی لە ئێران، مەلاشــووی کەوت و فرچکی گرت و دارەدارەی کرد و هەســتایە سەر پێ.

لــە هەرەتی لاوێتیدا بە هەوای «خوایــە وەتەن ئاوا کەی» و «ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کوردزمان» گۆش کرا.

ئەوجار دیســان دەسەلاتی پیس و بۆگەنی ئاخوندی شیعە بەرۆکی گــرت و مەغۆلئاســا پەلاماری ولاتەکەیان دا. ئیتر لــە خۆی ڕاپەرموو، دەســتی دایە تفەنگ و لێیان وەشاخان کەوت و هەرگیز قبووڵی نەکرد، کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئەواندا بژی و مل بۆ زۆرداری و دیکتاتۆرییان دابدات.

چارەنووســی وا هەڵدرایەوە کە هەر لە هەرەتی لاوێتییەوە، لە شار و گــەڕەک و کەســوکار، لــە خوێندن و ژیانی ئاســایی، لــە دڵداری و خۆشەویستی، تەرە بێت.

ئــەوەی دەیبینــی و هــەر ئێســتا لــە بەردەســتتدایە و خــۆت بــە خوێندنەوەیــەوە مــژوول کــردووە، گێڕانــەوەی حەکایەتــی ژیــان و بەســەرهاتی تاکێکــی هاوولاتیــی خۆتــە. لاوێکی دەیەکانی شەســت و

حەفتا و هەشتای سەدەی ڕابردوو، لە جیهانێکدا پڕ لە شەڕ و ئاڵۆزی، ئاژاوە و بەربەرەکانی، کێبەرکێی وڵاتان و زلهێزەکان. لەناو ئەم جیهانە پانوبەرینەدا شــوێنێک هەیە، هەر هێندەی ســەری پەنجەتووتەی خۆت، کە لەسەر نەخشەی جوگرافیای سەر زەوی بوونی نییە و هەرچی لێی بگەڕێیــت بۆت نادۆزرێتەوە، چونکە جیهان ئیعتراف بە بوونی ناکات و چاپکەرانی نەخشەی زەوییش، هەر نازانن وڵاتێک هەرچەندیش بچووک بێت، هەیە و ناوی کوردستانە!

ئەم تۆزە خاکە، بووەتە ناســۆر و ســندانی ســەر دڵی چوار وڵاتی بەهێــز و داگیرکەرانــی کوردســتان. زیاتــر لە پێنجســەت ساڵە لەناو بەرداشــی ڕۆم و عەجەمــدا دەتلێتــەوە و دەفلیقێتــەوە، تەنانــەت مافی هەناسەکێشانیشی پێ ڕەوا نابینن.

کە منداڵ بووم و لە قوتابخانە دەمخوێند، وەک بیرم بێت، لە وانەی جوگرافیادا دەیانگوت: سەتوســی وڵاتی سەربەخۆ لە بینای کۆمەڵەی نەتــەوە یەکگرتــووەکان نــاو و ئاڵایــان هەیــە. ئێســتا کە ئــەم دێڕانە دەنووســـم، دەڵێن نزیک بە دووسەت وڵات لە هەمان بینا، ناو و ئاڵایان دەشــەکێتەوە، مخابــن ئــاڵای کوردانی هەر لێ نییە! لــە ماوەی پەنجا شێست ساڵدا، حەفتا وڵات و نەتەوە بە سەربەخۆیی خۆیان گەیشتوون، ئەگەرچی نەتەوەکەی من، بە درێژایی ســەت ساڵی ڕابردوو کاسەسەر و چاوی لاوانی چاندووە و بارانی خوێنی بەسەریاندا باراندووە، کەچی وەرزی دروێنەکەی هەر دیار نییە[1] و دیل و بندەستی داگیرکەرانە!

ئەگەرچــی ســەدەی ڕابــردوو بوو بــە ڕزگاری لــە کۆلۆنیالیزم و گەیشتن بە ئازادی و سەربەخۆیی زۆرێک لە وڵاتان، بەڵام ئەوە بیست ساڵیش بەسەر سەدەیەکی تردا تێپەڕ بوو، کورد بە هەر چوار پارچەوە تروســکاییەک بەدی نــاکات، هیچ نەبێ موژدەبەخشــی نەوەی داهاتوو بێت.

لە مەیدانی شــەڕانخێوی خەباتی ســەدەی بیســتەمدا، ئیتر بۆ منی

١- ئاماژەیە بە شیعرە بەرزەکەی «دوانزە وانە»ی عەبدوڵڵا پەشێو.

پتـر لە چل سـاڵ بەشـدار لـەم خەباتە، بـە کۆڵەپشـتێکی ئاخێنراو لە ئەزمـوون و دەرد و ژان، لـە ئەمڕۆدا، لەگەڵ هەمـوو تەنگوچەڵەمەی نێونەتەوەیـی و پیـلان و کۆمەڵکوژیـی داگیرکەرانـدا لەسـەر ڕێگەی ئازادیی کوردستان، دیسانیش دەبێ بە تێرادیوی بڵێم؛ «خەتای سواران نەبوو، پێشسوارەکانمان قورس و ناوەستا بوون».[1]

ئـەم دێرانـەی بـە زوویـی تێیـان دەپەڕێنیـت و دەیانخوێنیتـەوە، سریوەیەکن لە هیوا و بێهیوایی، هەوراز و نشێو، ترس و ئازایەتی، مان و نەمان، مەردی و نامەردی، وەفا و سپڵەیی، سەرکەوتن و ژێرکەوتن، یاخیبوون و گوێلەمستی، فرەزانی و گێلی، ئازاد و کۆیلە، پاک و ناپاک، زانـا و نەزان، بەڕەحم و بێڕەحم، بوون و نەبوون، ئاشـتی و شـەڕ و وڵاتداری و بێوڵاتی.

وەک ڕۆڵەیەکی دایکی ئەم نیشتمانە، خۆم بە قەرزداری بینیوە و بە ئەرکی خۆمم زانیوە لە بەرپێیدا بنوشتێمەوە و هەتا هەم خزمەتی بکەم، بە گژ دوژمنانیدا بێمەوە و سەر نەوی بکەم بۆ دۆست و فیداکارانی.

زیاتر لە چلوپێنج ساڵە لەبەر کەوشکەنی کەپرە شکاو و وێرانەکەی ئەم نیشتمانەدا، بەبێ هیچ چاوەڕوانی و قازانج و بەرژەوەندیی تایبەت بە خۆم، دەستەونەزەر و گوێ بە فەرمانی خزمەتم بەو دایکەم. ئەمڕۆ کـە دەبینـم ئیتر وردەوردە هێز و گوڕی لاوێتـی ڕووی لە کزبوونە و هەربینا باروبنەم تێوەپێچا، تۆ ئەی دایکی نیشـتمان، دەزانم لە بەردەم بارەگای بەرزی نەتەوەکەمدا شایەدیم بۆ دەدەیت، هەرگیز خیانەتم لێ نەکردیت، بە پاداشـت خزمەتم نەکردیت، درۆم لەگەڵدا نەکردیت، خاکی و بچـووک بووم بەرامبـەر بە هەموو ڕۆڵە خزمەتـکار و بەوەفاکانت، سوور بووم لە لەقاودانی ڕۆڵە بێئەمەک و دز و گەندەڵەکانت، دوژمنانی ناوخۆتـم هەر هێنـدەی داگیرکـەران و ناحەزانی بێگانـەت پێ پیس و چەپەڵ و خوێڕی و خائین بووە، هەرگیز دەسـتم بۆ دەسـەڵاتی ناوخۆ و بێگانە پان نەکردەوە و بێمنەتم لێیان گەر بە دینارێک لە هیچ کامیان

١- ئاماژەیە بە شیعری «بەهار هەر دێ»ی مامۆستا هێمن.

بەهرەمەند و سـوودمەند بووبووم. خزمەت بە وڵات و پێشمەرگایەتیم بـە ئەرکـی خۆم زانیـوە، دەبێ گەواهـی بدەیت هەرگیز نـە بۆ پارە و نـە بـۆ جنس، کە ئەم دوانە ماکەی هەرچی خیانەت و خراپەن، سـەرم شـۆڕ نەکرد و توخوونیان نەکەوتـم. بۆ گوزەرانی ژیان ئەوەندە قاچم درێـژ کرد لە بەڕەم دەرنەچێ. دەزانی زۆر جاران بە زللە ڕووی خۆم سوور دەکردەوە، تا ناحەزانم پێم نەزانن، ئێستاش تۆ بۆ ئەم ڕۆڵەیەت ئالنگاری بکە لە دۆسـت و دوژمن، لە زەمین و ئاسمان، ئەگەر تەنانەت بۆ تاقەجارێکش بێت پەنام بۆ دوژمنانت بردبێت، یان لێیان سـوودمەند بووبم، ئەگەر لەوانەی خۆیان بە دەسەڵات و حاکمی کەلاوەکەی بەشی باشـووری نیشتمانەکەت دەزانن، ملم لار کردبێت و تەنانەت بە فلسێک لێیان سوودمەند بووبم. بۆیە ئەو چەند وشەیەم وەبیر هێنایەوە، خۆت دەزانی لە چەند سـاڵی ڕابردوودا بە هۆی بەگژداچوونەوەم بە حوکمی بنەماڵـە و گەندەڵـی و ئەو ناسـۆرەی بە ناوی کوردایەتییەوە لەسـەر دڵـت هاتـووە؛ ڕۆڵە بێئەمەک و تالانچییەکانت لـە بەرامبەر لەقاودان و ڕیسواکردنیان، ترسنۆکانە و خوێڕییانە هاتن، بە درۆ و بوختان لە پێش چاوانت سـووکم بکەن، بۆیان نەکـرا لەناوم بەرن، هەوڵیان دا تیرۆری کەسـێتیم بکەن و دەمێک بە پیاوی ئاخوندەکانی ئێران و سـەردەمێک بـە دۆسـت و یـاری سـەدامی خوێنڕێـژ و ئەنفالچیـی وڵاتەکەتیـان شـوبهاندم. تووخوا دایکی نیشـتمان لە دار و بەرد و گشـت کەسەکان بێمنـەت بە، ئەگەر لە خیانەت، پارەپەرسـتی و هەرچی پێی دەگوترێت سوودمەندبوون، زەرەیەکت شک برد، ڕیسوای خۆت و زەمانەم بکە و ڕووڕەشی دنیا و قیامەت.

جریـوەی ئـەم چەنـد وشـانەی کۆتایـی، گەلێـک لـۆم زەحمەت، شـەرمهێنەر و بەعەیبە دەزانی لە ئاسـت گەورەییتان، بەس لەمێژ بوو گلەیـی، ڕق و بێزاریـم لە دوژمنانی ناوخۆی گـەل و وڵاتەکەت پۆنگی خواردبـووەوە و ئێـرەم بە چاک زانی بەم چەنـد دەردی دڵ و زوخاو هەڵڕشـتنە، ئەسـتۆپاکی و خزمەتکاریم وەبیر خـۆت و هەموو تاکێکی

ئەم کوردســـتانە بهێنمەوە و گەر سەریشـــم نایـــەوە، دڵنیا بم میللەت و هاوزمانەکانم ڕاستییەکانیان پێ گوتراوە.

تۆش ئەی خوێنەری بەوەفا و وردبین، لێم ببوورە لە خراپنووســـین و نەپەرژانە ســـەر باری ئەدەبی و پڕ لە حورمەتم بۆ وشـــە و زاراوەی زمانە پڕ لە شانازی و خۆشەکەم، کوردی.

داوای لێبـــووردن لە هەموو ئەو هاوقەتار و هاوڕێیانم دەکەم کە بە جۆرێک لە جـــۆرەکان ناویان هاتووە و حیکایەتەکـــەم بەدڵیان نەبووە، دڵنیـــا بن مەبەســـتم ناوزڕاندن و توانـــج و ئیهانەکردن نەبـــووە، بەڵکو تەنیا گێڕانەوەی ئەو مێژووە بووە کە خۆم ئاوام دیوە، کە نووســـیومە و شـــەرت نییە ئەوەی من گوتم وا بووبێت، ئەوە تەنیا گۆشـــەنیگایەکی مـــن بـــووە و گێڕانەوەیەکە بـــۆ ئاهێکی دەروون. بە هـــۆی بوونم وەک مرۆڤێکی بێدەسەڵات و پێشمەرگەیەکی سادە لە مێژووی پێشمەرگایەتی و کاری سیاســـیم، هەرگیز بۆم نەلوا، یان باشتر بڵێم عەقڵم پێی نەشکا یاداشتی ڕۆژانە بنووسمەوە و ڕووداوەکان بە ڕۆژژمێر و کات و سات بنووســـمەوە، تەنیا بیر و هزری خۆم بەکار هاتووە لە گێڕانەوەی ژیان و ڕووداوەکانی ئەم چەند ســـاڵەی تەمەنم، بۆیە ئەگەر ڕێکەوتێک، یان گێڕانەوەیـــەک وەک خۆی نەبێ و پاشـــوپێش کرابێت، تکایە بیخەنە بەر لێبووردەیی و بە حسێبی فەرامۆشکاریی منی دابنێن.

درێـــژدادڕی و زۆرگوتنـــم، لاپەڕەکانـــی زۆر لـــەوە زیاتـــر کرد، کە خـــۆم بۆ دانابـــوو، بۆیە ناچار بەشـــی دووهـــەم و ڕۆژگاری ئاوارەیی و دوورەوڵاتی و دیســـان چالاکبوونم لە خەباتی شـــاری و دەســـەڵاتی کوردی لە بەشێکی نیشـــتمانم، باشوور و هەرێمی کوردستان، دادەنێم بۆ عومر باقی و دەرفەتێکی دی، هیوادارم بتوانم بە زوویی پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێزمی بکەم.

لەو ماوەیەدا کە بیری نووســـینی ئەم ســـریوانە هاتە ناو مێشـــک و خەیاڵم، زۆر بوون ئەوانەی هانیان دام و پاڵپشت و هاوکار و مامۆستام بوون، چاکە و لوتفیان ناکرێ فەرامۆش بکرێت:

بەڕێـزان؛ دوکتـۆر تریفە عومەر، مامۆسـتا حەسـەن قـازی، ڕەزا مەنوچێهری، مامۆستا کامیل عومەر، مامۆستا عەزیز ڕەئووف، شەفیق حاجـی خدر، جـەواد حەیدەری، محەمـەد عەبدوڵڵا، هەژار عوسـمان، عەباس کەریمی و هاوسـەری بەتاقەت و پشوودرێژم پرشنگ بللوری، ناکـرێ نەڵێـم سوپاسـی بێپایانـم بـۆ یارمەتیتـان و ئێوە نەبـان ئەم پەڕتووکەم بۆ تەواو نەدەکرا!

تۆش ئەی خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم، بە میهرەبانی و لوتفەوە لەگەڵمـدا بـدوێ و دڵنیا بـە، هەموو ڕەخنـە و تێبینییەکانـت بە دڵێکی گەورەوە لە سەر دیدەم دادەنێم و داواکارم لێت ئەم پرێسکە ئاڵەکۆکەی شوانەکەی خۆتان، لە بەردەرگای کەوشکەنی ماڵە گەورەکەی کتێبخانەی کوردیدا جێیەکی لەبۆ بکەیتەوە.

عەلی کەریمی

# ١

## ژیانی منداڵیم

دوابــەدوای سەرماوســۆڵ و ڕێبەندانــی زســتان، لەگــەڵ یەکــەم هەڵکردنی شــنەی شــەماڵی بەهاری و توانەوەی ســەهۆڵ و چلوورەی گوێســەبانەکان و شــاخە بەفرینەکانی گەڕەکی ڕزگەیــان، لە خانووی جاران و قەدیمی حوســێن زێڕینگەران[1]، بە قســەی دایکم پێنج ڕۆژی بەهــار چووبــوو، لە شــارەکەی پەت و ســێدارە، ســابڵاغی ئەوســا و مەهابــادی ئێســتا، وەک دەڵێــن کۆرپەیەکی کاڵ و زیــت، بە پێکەنین و کاکۆڵبەســەر، لە داوێنی دایکێکی یادگاری ژێــکاف و کۆمار، دەکەوێتە خوار و بە هەڵمژینی هەوای پیس و ئالوودەکراوی ســەر گۆی زەوی، ســییە ناســک و بچکۆلانەکەی دێتە ژان و پێکەنینی یەکەم چرکەســاتی ژیانــی لــێ دەبێتە ژان و گریان، ژانێکی خۆش، مژدەبەخشــی بوونێکی نوێ بۆ دایک و باب و خوشک و برا.

یەکێکی دی زیاد بوو، برای گەورەمان هەشــت ســاڵ تەمەنی بوو، خوشکی دواتر سێ ساڵ و براکەی پێش خۆیشم هەر هەڤدە مانگ دەبوو، تازە لە شــیری دایک دەبووەوە. دایک و بابێکی لاو و تازەپێگەیشــتوو بــە چــوار منداڵــی وردەوە، ماڵێکــی پڕ لە میــوان و حەشــیمەت. بابم کوڕەگــەورەی باپیــرم بوو. کە بابــم ژنی هێناوە، باپیریشــم تازە ژنی دووهەمی گواســتبووەوە، دایکی بابم تەڵاقــی وەرگرتووە، ئیتر هەموو منداڵەکانــی باپیــرم لەگــەڵ منداڵەکانی بابم لە تەمەنــدا زۆر لێک دوور نەبووین. بابم لە دایکی خۆی تەنیا برا و خوشــکێکی هەبوو، خوشــک مێــردی کردبوو، براکەشــی زۆرتــر لای ئێمە بوو، هەر بە ئەویشــمان دەگــوت مامــە. منداڵەکانــی دیکەی باپیــرم بە هۆی ئــەوەی بە تەمەن

---

١- مەبەست (حوسێن فروهەر) ئەندامی ژمارە یەکی کۆمەڵەی ژێکافە.

زۆرمـــان لێ نزیک بوون، پێمان نەدەگوتن مـــام و پوور، بەڵکو گازمان دەکردن بە: «ڕەحمەت»ی باپیرم، «مەحبووب»ی باپیرم و... تا دوایی!

دوای کۆماری کوردســـتان و لەســـێدارەدانی پێشـــەوا و زیندانی و ئاوارەبوونی ســـەرانی کۆمـــار، دایکم بە ڕۆیشـــتن و دوورکەوتنەوەی کاکـــی، زۆر بـــە زوویی بە مێردی دەدەن و لە تەمەنی ســـێزدە ســـاڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ بابمدا دەکات، هەڵبەت ئەویش تەمەنی هەر هەژدە ســـاڵ دەبێت. دایکم خوشـــکێکی بچووکتر و منداڵـــی دەبێت، کە دەچێتە قوتابخانـــە، بۆ سەرپەرشـــتیکردن خوشـــکی دێنێتە لای خـــۆی، واتا لە لایەک مام و لە لایەکی تریش پوورم، زۆرتر لەگەڵ ئێمەدا بوون.

پـــوورم دەبێتـــە مامۆســـتا، مامیشـــم لە قەیســـەریی شـــار دوکانی جلوبەرگ دەکاتەوە و بەیەکیشـــەوە هاوسەرگیری دەکەن. دایکی دایکم کـــە بێوەژنێکی پیر و تاک و تەنیـــا و زۆر بەڕەحم بوو، ئەویش زۆرتر لەگەڵ ئێمەدا دەژیا و پێمان دەگوت «دایە».

باپیـــرم و بابم یـــەک بەدوای یەکـــدا و ماوەی نێوانـــی منداڵەکانیان کەمتر لە ساڵ و نیو، منداڵیان دەبوو، هەردوو لا چوار منداڵیان هەبوو، دوو مانگ دوای لەدایکبوونم، مام و پووریشم یەکەم منداڵیان بووە.

خزمانی لادێی باوکم، شەو و ڕۆژ بۆ دەواودەرمان و سەردانکردنی شـــار، لای ئێمە بوون، یەک دەهات و یەک دەچوو. دایکم ئەوکات تەنیا بیســـتوچوار- بیســـتوپێنج ســـاڵی تەمەن بووە، وێڕای کۆشـــێک منداڵ، دەبوایە ســـەرقاڵی ماڵی باپیرم، مام و پوور، چێشـــتلێنان و شوشـــتن و خاوێنکردنەوەش بوایە. کە میوانی لادێمان دەبوو، ئیتر کێچ و ئەسپێش لەگەڵیاندا وەلای ســـەرەوە دەکەوتـــن و چەند ڕۆژ دواتریش، ئەو دایکە دەبوو جلان بکوڵێنێ و ئاساریان لەناوبەرێت.

بابـــم تـــازە وردەوردە خەریـــک بـــوو لە هـــەژاری و دەســـتکورتیی سەردەمی کۆمار ڕزگاری دەبوو، ماڵی پێکەوە نابوو، ئاگای لە هەموان بوو؛ باب، برا، منداڵان و خزمانی ئەمبەر و ئەوبەر، بۆ ساتێک ئاسوودە نەبوو، لە دائیرە کاری دەکرد، دوکانی هەبوو، کەســـابەتی دەغڵودان و

مەڕومالاتی دەکرد، ئاخر دەبوو بە هەموو لایەک ڕابگات.

دوای ماڵکردنی مام و پوور، وردەوردە بووژانەوە دەستی پێ کرد، برا و خوشـــکێکی دیشمان هاتنە دنیاوە، بووینە شەش منداڵ و دایک و باب، واتا خێزانێکی هەشـــت کەســـی و خانوویەکی گەورە و فراوان، بە حەوشـــە و حەوز و باخچەوە. ئەو بەشە لە خانووەکە، کە ماڵی مامی تێدا بوو، دوای ڕۆیشـــتنیان بە تیغەیەک[1] لە ماڵی خۆمان جیا کرایەوە و کرا بە دوو دەست خانووبەرە، بە کرێ درا و بوو بە یارمەتیدەرێکی باشی بژێویمان.

هەر شـــەش خوشـــک و برا، لـــە زمانی مام و پـــوورەوە بە دایکمان دەگوت باجی و بە بابمان کاکە. بیرمە کە گەورە بووم لە پۆلی شـــەش و حـــەوت بووم، مام و پوور ماڵـــی خۆیان کردبوو، ڕۆژێک کاکم کۆی کردینەوە و گوتی ئیتر جوان نییە، با بە دایک و بابمان نەڵێین «باجی» و «کاکە»، دەبێت لەمەودا هەموو بڵێین ‹دایە» و «بابە»، هەر واشمان کرد و ئیتر باجی بوو بە دایە و کاکە بە بابە!

### ساوای سەلاری ناو بێشکە

دەڵێن: منداڵێکی ژیر و بێدەنگ و زۆر پاکوخاوێن بووم. دایکم دەڵێ: لە کاتی لانک و پێهەڵگرتن و دارەدارەدا لە هەموویان بێئەرکتر بوویت. زۆربەی ڕۆژەکان لەناو لانکدا بەســـتراومەتەوە و دایکم خەریکی کاری ناوماڵ و منداڵانی دی بووە، من دەنگم لێوە نەهاتووە و تەنانەت خۆشم پیـــس نەکردووە، نەگریاوم و کەمتر ڕایانژانـــدووم، بۆ نانی نیوەڕۆ کە باوکم هاتووەتەوە، پێش هەموو شـــت هاتووە و ســـەری لانکی لاداوە، دەســـرازەی لانکەکەمی شـــل کردووەتەوە و دەســـت و قاچەکانی ئازاد کردووم و خۆم بۆ باوکم هاویشـــتووە، بانگی دایکمی کردووە: «وەرە ڕەعنـــا چاو لـــە کوڕی خۆم کـــە، تەنانەت خۆشـــی پیس نەکـــردووە و ویشـــکوبرینگە»! بۆیە لە بیرمە تا حەوت هەشـــت ساڵییش هەر گیرۆدە

---

١- تیغە، دیواری تەنکی نێوانکەر.

و هەڵـوەدای باوەش و پشـتقونی باوکم بـووم و هەموو گەورەکان بە گاڵتە دەیانگوت؛ عەلی بۆنی قونی باوکی لە هەموو بۆنێک پێ خۆشترە و زۆر جاریش هەر لەوێ خەوم لێ کەوتووە!

باوکـم نازی تەواوی پێ دابووم، دایکم پەروەردەیەکی سـەختی بە لێدانەوە دەکردم، هەمیشـە مەراقی ئەوە بووە بۆچی نەیانهێشت بچێت بۆ خوێندن؟! بۆچی ناتوانێت بخوێنێت و بنووسێت؟! پوورم کە خوشکی بچووکی بوو، خوێندبووی و مامۆستا بوو، ئەو شەو و ڕۆژ لە خوێندن و دەرس و مەشق، یارمەتیی عەتای پوورزا و ئامۆزامی دەدا و تەنانەت پێـش تەمەنـی خوێندن، لەگـەڵ خۆیدا دەیبردە مەدرەسـەی کچان، کە خـۆی لەوێ مامۆسـتا بـوو. دایکم بـە هاتنی یەکەم کوڕی خوشـکی، کـە دوو مانگێـک لە من بچووکتر بـوو، بەیەکـەوە کەوتینە گڕوگاڵ و گاگۆڵکێ و غارەغار و سەرنجی گەوران ڕاکێشان و چوونی خوێندنگە، زۆرتر کەڵکەڵەی نەخوێندەواری و نوقسانی لە ئاست خوشکی بچووکی هەڵیگرت. هاوتەمەنیم لەگەڵ منداڵی یەکەمیان، بوو بە هۆکاری سەرەکیی کێبەرکـێ و هەموو ناکۆکی و کەموکووڕی و گرێوگۆڵەکان، چ ئەوکات و چ لە داهاتوودا. چەند ساڵ دواتر سەرەنجام دایکم بە سەری پیری و خاوەنی شەش منداڵ، لە ماڵەوە خوێندنی شەشی سەرەتایی تەواو کرد و خۆی فێری خوێندنەوە و نووسین کرد. وردەوردە لە کاتی دەسپێکی چوونم بۆ مەدرەسـەـ، لە زۆر نەهامەتی و نەبوونی ڕزگارمان بووبوو، تەنیا خوشک و برایەکم بچووک بوون و تەڕ و پۆشتەکردنیان گەرەک بوو. پوور و مامم تەنیا کوڕ و کچێکیان بوو لەگەڵ ژیانێکی فەرهەنگی و بەحیسێبی ئەوکات مۆدێرن.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، کە بابم زۆر دەوڵەمەندتر بـوو لە مامم و ئەوان، تا ئەوکاتیش لە خانووی کرێدا بوون، بەڵام ڕوخسـار و شـێوە ژیانی ماڵی ئێمە زۆر سـادە و خاکی بوو، خۆڵاوی و پینەی شـەلواریش لای ئێمـە فـراوان بـوو، کەچی لای مـام و پوور زۆر هایلایـف و مۆدێرن بـوو، هاتوچۆکەرانی ئـەوان خەڵکی فەرهەنگی و ڕەئیس و گوریسـی

دەوائیـر و خەڵکـی تاران بـوون، هیی ئێمەش خەڵکـی لادێ و فەقیر و هەژار و سـادەکەی شـار و گەڕەک بوون. ئێمەی خوشـک و برا زۆر جار جلەکۆنەی یەکترمان دەدرایە و لەسـەر سـفرەش ڕفان ڕفان بوو، کەچی هیی ماڵی مامم ئاخیر مۆدەی تاران بوو، بە قوربان و سـەدەقە ڕانەمریشک دەرخواردی منداڵان دەدرا.

### قوتابخانە، ماڵێکی دیکە

چوونەخوێندنگەی من و عەتای کوڕەمامم، ڕقەبەری و تەنانەت جار هەبوو شـەڕ و نێوان ناخۆشـیی برایان و خوشکانیشی لێ دەکەوتەوە. ئەگەرچی پێشتر مام و پوور لە سایەی دایک و بابمدا دەژیان و تەنانەت بۆ یەکیش بوون و هەر لەژێر سـەقفی وانیش ژیانی هاوبەشـیان پێک هێنابـوو، بابم، کاکە گیان و دایکم، باجی گیان و چوار منداڵەکانیشـیان ڕۆح و گیانـی مـام و پـوور بـوون. ژیانێکی پڕ لە سـادەیی و سـۆز و خۆشەویسـتی لە شـارە خنجیلانەکەی سـابڵاغ، کە زۆربەی خزم و دۆسـت و ئاشنا بوون، دەگوزەرا و ڕۆژبەڕۆژ بەرەو ژیانی خۆشتر و دەوڵەمەندبوون دەچوون.

بـە هاتنەدنیـای یەکەم منداڵیان؛ عەتـا و دواتر چوونی ناو کۆڵان و یاریکردن و سەرشکاندن، شـەڕی منداڵانیش هەرچەند ئاشتبوونەوەی یەکجار خێراشـی لەگەڵدا دەهات، جاروبار دەبوو. من و حوسێنی برام لـە تەمەنـدا زۆر نزیـک بوویـن و شـەو و ڕۆژ لە یـاری و کۆڵان و مەدرەسـە بەیەکەوە بووین، عەتاش هەر هاوتەمەنی ئێمە بوو، ئەویان بردە ئەو مەدرەسەیەی پوورم لێی مامۆستا بوو، هەرچەند مەدرەسەی کچان بوو. عەتا نازدار و پاکوخاوێن و وەک کوڕە دەوڵەمەندان وێنای دەکـرد، زۆر جاران دەکەوتە بەر هێرشـی کوڕانی گـەڕەک و فڕاندنی پایسـکیل و گیرفانەکانـی، دەبـوو من و حوسـێن ئاگامـان لێی بێت و تەنانەت شـەڕی لەسـەر بکەین. عەتـا لە لای باب و بـە تایبەت دایکی هەرگیـز خۆی خەتابار نەدەکرد، کە دەکەوتە بـەر لێکۆڵینەوەی؛ بۆ وا

پیس بووی و کوا پارەکانت و چی و چی، یەکسەر هەمووی بەسەر من و هەندێک جاریش حوسێندا دەهێنا. مامم بە هۆی ئەوەی دوکاندار بوو و پوورم مامۆستا، وەک دەڵێن زۆر زەلیل و گوێلەمستی پوورم بوو.

### زەبیحی و ژن و یەکسانی

لێرەدا گەرەکمە لە باسەکەم لا بدەم و ئاوڕێک بدەمەوە سەر یەک لە گرنگ و مرۆڤایەتیترین دیاردەکانی ناو کۆمەڵ، ئەویش یەکسانی، یان عەدالەتی نێوان ژن و پیاوە لەناو کۆمەڵگەدا. هەموو دەزانین یەک لەو دیاردانەی لە سەدەی ڕابردوو، لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوادا مشتومڕ و باسی گەورە و تەنانەت شۆڕشی لێ کەوتووەتەوە، پرسی ژنان و بەرابەری و مافەکانیان بووە، تەنانەت لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی جیهانیشدا.

دایک و پوورم هەر زۆر زوو بە منداڵی، بابیان کۆچی دوایی دەکات، لەگەڵ دایکیان دەکەونە ژێر سەرپەرشتی و لوتفی برای گەورەیان، کە یەکێک لە دامەزرێنەر و سەرکردەکانی کۆمەڵەی ژێکاف و کۆماری کوردستان دەبێت، واتا عەبدولڕەحمانی زەبیحی و ئەویش بە حەق جێی باوکیان دەگرێتەوە. پێش ئەوەی کۆمار جوانەمەرگ بێت و پەڕیوەی باشوور بێت، خوشکی بچووکی (هاجەر)، دەنێرێتە مەدرەسەی کچان لە کۆماری کوردستان، کە تازە دامەزرابوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی گوایە دایکم لە تەمەنی منداڵی لایداوە، مامۆستاکەی پێی دەڵێت: «تۆ بۆ هاتوویە ئێرە، بۆ ناچیە ماڵی مێرد؟!» دایکم ئەوکات دە دوازدە ساڵی دەبێ، زۆر بە خۆیدا دەشکێتەوە و دەچێتەوە ماڵ. لەگەڵ دایکیدا دەست دەکات بە کڵاوچنین و دروومانکردن و بوخچە دروستکردن. بوخچە پارچەیەکی جوانی چوارگۆشەی یەک مەتری بوو، دەهاتن ئەو پارچەیەیان بە کۆمەڵە بەنێکی ڕەنگاوڕەنگ، کە پێیان دەگوت مارگا، گوڵدووزی دەکرد و بە دەرزی و دەزوو و ئەم مارگایانە، زۆر جوان دەیاننەخشاند و وێنەی سروشت و گوڵیان لێ دەچنی، بە تاقەت و

سەبرێکی بێوێنە و هەزاران تەقەڵ بە چەند ڕۆژان بوخچەیەکیان ئامادە دەکرد. هەر ئەو کارەشیان بۆ مەلافە و جلوبەرگی دۆشەک و لێفەی خەوتن دەکرد. بۆ تێوەپێچانی جلوبەرگ، لە کاتی چوونی حەمام، لەجیاتی ساک و جانتا، بوخچە بەکار دەهات.

## گریانی بووک

دایکم ئەو زوڵمەی نەچوونی مەدرەسەی، هەرگیز پێ فەرامۆش نەدەکرا و مەراقێکی گەورە بوو لەسەر دڵی. پوورم هەر بە پارەی فرۆشتنی بوخچە و سەرکلاوەچنینی دایکی و خوشکی خوێندی و بوو بە مامۆستا. دوای کۆمار و بەتەنیامانەوەی لەگەڵ دایکی پیر و خوشکە بچکۆلانەکەی، بەبێ ئەوەی بزانێت و هەست بە هیچ بکات، دەینێرنە ماڵی مێرد و خۆی دەیگێڕاوە ئەو ڕۆژەی ژنان بە بووک بردوویانە بۆ ماڵی باوکم، ئەوەندە منداڵ و کرچوکاڵ بووە، کاتی ئێوارێ ئەو ژنانەی لەگەڵیدا هاتبوون، هەڵدەستن بڕۆن، ئەویش چارشێو بە سەردا دەدات تا لەگەڵیاندا بڕوات، کەچی دەنگی دەدەن و دەڵێن، لەمەودوا ئێرە ماڵی تۆیە. ئیدی زۆر دەگری و بەجێی دێڵن.

## زمانی سابڵاغی

مامم بۆ شتکڕینی دوکان، هاتوچۆی تارانی دەکرد و لەم ڕێگەیەدا زۆر دۆستی دەوڵەمەند و ڕەئیس و گوریسی پەیدا کردبوون. پوورم لەناو ئیدارەی فەرهەنگدا، واتا پەروەردە، زۆر ناسراو و خاوەن کەسایەتی بوو، لەگەڵ کاربەدەست و خاوەن پۆست و مەقامی شاردا تێکەڵاوییان پەیدا کردبوو، ئەمانە بووبوونە هۆکار، تەنانەت لە ماڵی دوو خوشک و دوو برادا جیاوازیی چینایەتی و فەرهەنگییەکی زۆر زەق خۆی نیشان بدات. بە کورتی ماڵی ئێمە لادێیی و شەعبی، ئەوانیش تاراندیدە و شارستانی و بەپۆز وێنا دەکران، تەنانەت ئەمە وای کردبوو، زمانی ئاخاوتن و دواندنمان جیاواز بێت، ئەوان زۆرتر و بە زۆری

وشـــەگەلی فارســـی و بەئەداوئەتوار لەناو زمانـــە کوردییەکە بهاوێن و ئێمەش زۆر سابلاغییانە لەگەڵ یەک بدوێین.

دایکــم وەک کچەهەژارێک دێتە ماڵی مێرد، تەنانەت بۆ یارمەتییەکی بچووکی دایک و خوشــکی، چاولەدەستی مێردەکەی دەبێت، لە تەمەنی بیســتوچوار ساڵیدا خاوەنی چوار منداڵە، لە ماف و شارستانییەت هیچ نازانێــت و تەنانــەت خوێندن و نووســین فێر نەبووە، لە لای ئاســاییە پیــاوی مــاڵ بەکەیفــی خۆی بــکات و هیچ نرخــی بۆ دانەنێــت و بگرە جــار هەبوو بە شــەق و زللەش تێی بکــەون و جێوبانی لێ فڕێ بدەنە نــاو کــۆڵان و بە گریــان و پاڕانەوە ڕێی ژوورێــی بدرێتەوە. بە چلەی زستان بە ئاوی ترومپا جل و کۆنەی منداڵان بشوات و زۆر لە ڕۆژان چەنددەســت میوان بە خواردن و نوســتن و هەڵگــرە لە بەریان، بەڕێ بکات. لە کۆمەڵگەی شێســت حەفتا ساڵ پێش ئێستای سابلاغ، زۆربەی ژنان کۆیلەیەک بوون بە دەست مێرد و کۆمەڵگەوە و دەبوو بۆ کڕینی دوو شــایی[1] بنێشــت چاولەدەســتی مێرد بان و هیچ ســەرچاوەیەکی سەربەخۆی ماڵیی خۆیان نەبوو.

### دەسەڵاتی پارە

پوورم کارمەند و کاربەدەستی میری بوو، حقوق و مووچەی گەلێک لە مامم زیاتر بوو، یەکڕاست دەدرا بە خۆی، سەوادی بوو و ئاگای لە پێشکەوتنی کۆمەڵگە و جیهان بوو، فێری مافەکانی خۆی و پاراستنیان بووبوو. ئابووریی سەربەخۆ و ڕۆشنبیری وای کردبوو، پوورم بەسەر مامدا زاڵ بێت و بە پێچەوانەوە دایکم کۆیلە و بندەستی بابم بێت.

دەگەمــە ئــەو ئەنجامە لە کۆمەڵگــەدا هەتا ژن خاوەنــی ئابووریی ســـەربەخۆ نەبێت، ناتوانێت ڕزگاری ببێ لە چەوساندنەوەی پیاوەکان، ئەمــە خــۆم لە ژیانــی بنەماڵەییــدا پێی گەیشــتم و بــڕوام پێیەتی. خۆ ئەگەر ســەیرێکی مێژوویــی و ڕەوتی بەرەوپێشــچوونی کۆمەڵگەکانی

---

١- یەکەی پارەی ئێران لە سەردەمی قاجاردا.

مرۆڤایەتییش بکەین، زۆر بە زەقی دەردەکەوێت لەناو ئەو کۆمەڵگە، یان وڵاتانەی ژن، ماف و ئازادییەکانی خۆی دەستەبەر کردبێت و پێی گەیشتبێت، ئەوە ئەو کۆمەڵگەیە لە هەموو بوارەکانی ژیان و بە تایبەت پێشکەوتوویی ئابووری و پەروەردە لە سەرووی وڵاتانی تری جیهان وەستاون و لە زۆر کێشە و ئاڵۆزیی کۆمەلایەتی و تەنانەت کۆیلایەتی و کۆلۆنیالییش ڕزگاریان بووە. ژن بە سەربەخۆیی ئابووری دەتوانێت شانبەشانی پیاو ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژی بیگەیەنێتە ترۆپکی ئاسوودەیی و سەربەخۆیی. چاوخشاندنێکی خێرا بە وڵاتانی سکاندیناوی و ئەورووپای ناوەند، کە تێیاندا ژن بە مافەکانی یەکسانی و بەرابەری لەگەڵ پیاو تا ڕادەیەکی زۆر گەیشتووە، ئەم ڕاستییە دەردەخەن هەموو کۆمەڵگەیەک بەبێ یەکسانیی مافی ژن و پیاو، سەقەت و دواکەوتووە!

دایکم هەرچەند پوورمی وەک گەورەکردن گەورە کردبوو، لەماڵی خۆی زەماوەندی بۆ گێڕابوو، بەڵام لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە، خۆی لەو پێ کەمتر بوو، دەتوانم بڵێم لێیشی دەترسا و بە بیانووی «هاجەر شێتە» ترس و شەرمی خۆی دەشاردەوە. جلوبەرگ، هاتوچۆ، چۆنایەتی و شێوەی خواردن، میوانەکان و هەستان و دانیشتن و ئەتەکێت و جۆری قسەکردن و بەکارهێنانی وشەگەلی فارسی، دابونەریت و فەرهەنگی، ئێمەی لێک جیا دەکردەوە. بە کورتی پوورم ئەو سەردەم، ئەمڕۆیی بوو و دایکیشم دوێنێیی بوو.

خەتاکانی عەتا و خۆپیسکردن و لێدان و کوتان و پارەونکردن و هەموو کەتنەکانی، بەزۆری بەسەر من و حوسێندا دەهاتن. بەڵام ڕەقیب و بەرامبەری عەتا زۆرتر من بووم تا حوسێن، هۆکاریش ئەوە بوو حوسێن هەر خۆی منداڵێکی ئارام و لەسەرخۆ و لە شەڕ و هەلاتهەلاتندا، دوورەپەرێز بوو. هەر ئەوەندە پوورم بە شاتەشات و گریان و لەخۆدان پیلی عەتای دەگرت و دەهات بۆ لای باجی و بە دایکمی دەگوت: ها باجی بزانە عەلی چیی کردووە و چیی بەسەر عەتا

هێناوە؟! باجییش سـوور دەیزانی عەلی نەبێ، لە کۆڵان کوڕانی برسـی و جلشـڕ عەتـای هەر دەخۆن و کوڕە نازدارەکـەی بەرگەی دوو ڕۆژ ناگرێت، عەتاش یەکسەر بۆ ئەوەی خۆی دوور بخاتەوە لە شەڕی دایکی دەیگـوت؛ مەمـان! عەلی وام پێ دەکات. ئێمە بە دایکمان دەگوت باجی و دواتریش دایە، بەڵام منداڵانی مام و پوورم بە لاسـایی فەرەنگسـتان دەیانگوت «ماما». ئیتر عەلی لێدان و داغ و سـیاچاڵ، چاوەڕێی دەکرد و عەتاش بەناو بازاڕدا کەباب و ئایسکریمی بۆ دەکڕدرا و سەدان جار بە قوربان و سەدەقەی دەبوون و بەگوێیدا دەگوترا ئیتر مەچۆ بۆ لای ئەم لادێیی و وەحشی و بێفەرهەنگ و بێ«کلاسە»!

## ژێرزەمینێک پڕ لە ترس و نامۆیی

من لەدایک نەبووبووم، دەڵێن ئەو خانووەی ئێمە زۆر قووڵ بووە و هەژدە پلیکان دەبوو لە کۆڵانەکەمانەوە بچیتە خوار و بگەیت بە حەوشە. دواتر بابم پڕی دەکاتەوە و دێتە تەڕازی کۆڵان، بەڵام بنی هەموو ژوور و هـۆدەکان ژێرخانێکی حوجرە بە حوجرەی زۆر تاریک و نمدار بوو. بیرمە لە یەکێک لە حوجرە و تاقەکان ئاو هەڵدەقوڵی. پڕ بوو لە شـتی زۆر کۆن و داروپەردوو، کوپەی گەورە و زۆر شـتی سەیروسەمەرە، ئەوەندە تاریک بوو، بە ڕۆژی ڕووناکی هاوین دەبوو چرا لەگەڵ خۆتدا بـەری. من نا، بەس گەورەکان دەبوو سـەریان دانەوێنن بۆ ئەوەی وە میچەکە نەکەوێت. ژنان و خەڵکی گەڕەک دەیانگوت ژێرخانی ماڵی ئێمە بـە تایبەت لە یەکێـک لە حوجرە و تاقەکان جندۆکـەی تێدایە و کەمتر دەیانوێرا ئەندامانی ماڵەوەشمان بە تەنیا و بەبێ چرا بچن بۆ ژێرخان. لە حەوشەڕا، بە پانەوە دەرگایەکی گەورەی ئاسنی زۆر قورس لەسەر پشت، ڕێی چوونی ژێرخان بوو، بە دوو کەس هەڵدەدرایەوە و هەشت نۆ پلیکان بە کۆمەکۆم دەچوویە خوار. پێشخانی یەکەم و ڕووبەڕوو پڕ بوو لە کوپە ترشـیات و مرەبا و خواردەمەنیی زستان و بەرمیلەنەوت و شـتی وەهـا. بە دەسـتی ڕاسـتی پێشـخاندا دەچوویت بـۆ ژوور و

حوجرەیەکی سێ بە چوار و کۆمەڵێک کەرەسە و شتەشکاوی لێ بوو، تاقێکی بچووک لەوێرا ڕێی دەکردەوە بۆ حوجرەیەکی گەورەی دی، کە تا ڕادەیەک پاکوخاوێـن بوو، پەنجەرەیەکی زۆر بچووکی لە بنمیچەکە ڕوو بە حەوشـە تێـدا بوو، کزەڕووناکییەک دەهاتـە ناو حوجرەکە، بە دەسـتی چەپی پێشـخانەکەدا چوار حوجرەی بەسەر یەکەوە هەبوون، کـە پـڕ بوو لە دار و سـووتەمەنی و گوێنی[1] و کشـپەڵ[2] و سـەدان شـتی بەکەڵـک و بێکەڵک. سـێهەم حوجرە و ژێرخان بـوو، دەیانگوت جندۆکەیان لێ دیوە!

ئیتر هەر کە پوورم بە شاتەشات و عەتا بە گریانی درۆینە بەربینگی دایکمیـان دەگرت، یەکسـەر دەرگای ژێرخـان هەڵدەدرایەوە، بە نقورچ و شـەپەلاغە و دارکارییەکی تێروتەسـەل، فڕێ دەدرامـە ناو ژێرخان و دەرگای ئاسـن، بـە نەعرەتـە و شریقەوشـیخ دادەخـراوە و دوو بەردی گەورەی دەسـتاڕی لە سـەر دادەندرا. جارجـار بەبێ گوناحی حوسێنیشـیان لەگەڵم دەخسـت. لە دەسـپێکدا هێند لە ئازار و ترسـان دەگریام، فرمێسکە وشـکهەڵگەڕاوەکانم لەسەر کوڵمەی سپی و ناسکم قەتماغەی دەکرد و بە مشـتەکۆڵە بچووکەکانم ئەوەندە چاوەکانم ڕێک دەگووشـی، دەبرژانەوە و فرمێسک وشـکایی دەهات، چڵم و فرمێسک تێکـەلاو دەبوون و شـۆڕاوکەیان بۆ نـاو زار و دەمم دەچووەوە. جار هەبوو ئەوەندە دەگریام، لەسەر عەرزە تەڕ و شێدارەکە خەو دەیبردمەوە و بێدەنـگ دەبـووم، گەورەکانیش بیریان دەچووەوە منداڵێکی شـەش حەوت ساڵان لەم ژێرخانە تەڕ و تاریک و پڕ لە دووپشک و جاڵجاڵۆکە و مێروو، بە تەنیایە و ئەوەندەی هەنسک داوە جەرگ و دڵ و ڕیخۆڵەی خەریکە دێنە دەر.

ئـەم بێرازکردنە تەنیا جارێک و دوان نەبوو، هێند دووپات کرایەوە

١- گوێنـی، گیایەکی دڕکاویی خۆڕسـکە، کەتیرەی لـێ پەیدا دەبێت و بۆ سووتان و تەندووریش بەکاری دێنن.

٢- کشـپەڵ، پشـقەڵ، ڕیخی مەڕ و بزن، وەک نۆک خڕە و بۆ سـووتان و تەندوور بەکاری دێنن.

بیرم لە جێخۆشــکردن کردەوە. وردەوردە ورەم دایە خۆ و دەجووڵام و زۆر بە ترسەوە سەرم لە حوجرەکانی دی دەدا و بە تاریکی ڕاهاتم، بەڵام هەر نەمدەوێرا بە لای حوجرە و هۆدەکەی جندۆکاندا بچم.

ئــەوەش یــەک لــە داب و پــەروەردە هــەرە ســەقەتەکانی وڵاتانی ئیســلامی و ڕۆژهەڵاتــی بوو، کە منداڵیان بە شــتی درۆ و ترســهێنەر بــار دێنا. بۆ ئــەوەی منداڵ بــەدوور بگرن لە کارێــک، پەنایان دەبردە بەر تۆڵە، جەهەننەم، ڕۆژی قیامەت، ســووتانی ناو ئاگر، گۆڕەوشار و دەیان حیکایەتی دوور لە ڕاســتی، وای لە سایکۆلۆژیی منداڵ و گەورە دەکرد بڕوای بە خۆی نەبێت و هەمیشە ترسی لە دڵدا بێت و لە مردنی خۆی بە هۆی ئەم حیکایەت و درۆیانە، زیادە لە حەد بترسێت و مردن وەک ڕووداوێکی سروشــتی سەیر نەکات. ئێمە بە گشتی لە مردوو، لە گۆڕســتان و تاریکی دەترســێین، بەزۆری ئەوەندە ترســمان لە مردنی خۆمان نییە، بەڵکو بیر لەوە دەکەینەوە دوای مردن و لەناو گۆڕدا چیمان بەسەر دێنن. زۆربەی مەزهەبەکان و بە تایبەت ئیسلام بۆ کەلەپچەکردن و خۆفەرزکردن بەســەر مرۆڤەکاندا، پەنایان بردووەتە بەر ترساندن و تۆقاندن و تا ڕادەیەکی باشــیش هەتاکو ئێســتاش ســەرکەوتوو بوون، تەنانــەت بە هۆی ئەو هەموو درۆیەی لەســەر لەشــی بێگیانی مردوو بۆیان کردووین، زۆربەمان بە تاریکی لە گۆڕســتان دەترسێین، کەچی لە زۆر وڵاتاندا گۆڕستان بە چەشنی پارکێکی جوان و دڵگیر بۆ پیاسە و کاتبەســەربردنە. ئەوەنــدەی پــەروەردەی دینی بیریان لە ترســاندن و تۆڵەلێکردنــەوە کردووەتەوە، هەوڵیان نەداوە بە ڕێگەیەکی زانســتی منــداڵ پــەروەردە بکرێــت و لەجیاتــی بەکارهێنانی عەقــڵ و لۆجیک و زانست، ڕێگەی ئاسان و کاریگەر واتا ترس و تۆقاندنیان بەکار هێناوە بــۆ بەکۆیلەکردن و هەڕەشــە لە مرۆڤــەکان. ئــەم کۆمەڵگەیانە بوونە کارگەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی مرۆڤی بێباوەڕبەخۆ، ترسنۆک، گێل و دوور لە عەقڵ و زانســت و لۆجیک! ڕەنگە گەورەکان بۆ پاراســتنی شــتە خۆشــەکانی وەک، ترشــیات و هەنگوین و مرەبا و گوێز و بادام

و... گوتوویانــە ژێرزەمیــن جندۆکەی لێیە و منــداڵ نەیوێراوە بچێت و دەستیان بۆ بەرێت!

## ژێرخانەکەی عەلی

بــۆ خۆدزینــەوە و خۆخافڵاندنــم، نازانــم چۆن دوو ســێ وشــەی ئایەتەلکورســی فێــر بووبــووم، بەبێ ئــەوەی هیچ لە ماناشــی بزانم، یەک پشــوو زۆر بە هەڵە دەمگوتنــەوە و دەجووڵام. هێدی هێدی ترس دەڕەوییەوە و نەدەما، کەوتمە بەر پشکنین و ئەملاوئەولاکردنی شتومەک و ئەشــیا کۆنەکانی ناو ژێرخان. هۆدە و حوجرەیەکم دەستنیشان کرد و هەمــوو جــار دەچوومە ئەوێ و ماڵە بچکۆلانەیەکم لە شــتی بێکەڵک و کۆنەشــکاو بۆ خۆ دروســت کــرد، ئیتر بەبێ ئەوەی لێــم بدەن، یان دە ژێرخانێــم باوێن، یان شــکایەتم لێ بکەن، خۆم دەچووم و زۆربەی کاتەکانــم تا گــەورەش بووم و چوومە ناو تەمەنــی مێرمنداڵییش، هەر لەوێ بەسەر دەبرد. ئەو شوێنە بە کردەوە بەڕەسمی کرا و ناو نرا ماڵ و ژێرخانەکــەی عەلی، تەنانەت زۆر لە گەورەکانیــش نەیاندەوێرا بێنە ئەوێ. ئەوجار لەناو ماڵەوە و ڕێک لە بان ئەو ژێرخانەی خۆم، وایەری کارەبــام بــەرداوە خوارێ و بەرقم بــۆ ماڵە بچکۆلانــە و عەجایبەکەم ڕاکێشا. یەک دوو جار بە شەو و لە کاتی کارکردنم بۆ ڕاکێشانی کارەبا و ناشارەزاییم، وا هات شۆرتی گەورە دروست ببێ و فیوزی ڕەئیسیی ماڵ، کە لەوســەری حەوشــە و نزیک لە کۆڵان بوو، بە دەنگی بەرز و ئاگرلێکەوتنەوە دەرپەڕێت و خامۆشی بەسەر هەموو ماڵەوەماندا بێت. ئیتر کە بابم لە ماڵ دەبوو، نەعرەتە و سەگبابگوتنی لە هەموو گەڕەکدا دەنگی دەداوە و عەلی کونەمشــکی لێ دەبووە قەیســەری. بە یارمەتیی مامۆســتا و یــەک دوو خــزم، ئاخریەکەی خۆم فێری ســەرەتاییەکانی کارەبایی کرد و ژێرخانم وەک ڕۆژی ڕووناک لێ کرد. بە دڵ حەزم لە ماڵەکــەم بوو، زۆربەی کات لەوێ بووم و لەناو ژێرخانی جندۆکەکاندا ڕۆژبەڕۆژ پەرەم بە دەسەڵاتداریی خۆم دەدا.

لــە پۆلی حەوت بــووم، هاوڕێیەکم ناوی حەسـەن بوو، کوڕەفەقیر و بابێکی زۆر بەدفەڕ و چەقۆوەشـێن و عەرەقخۆری هەبوو، خۆیشی دواتر هەر ئەم ڕێگەیەی گرتە بەر و وازی لە خوێندن هێنا. حەسەن منی وەک برا خۆش دەویسـت و منیش بۆ ئەو وەک برا بووم و هاتوچۆی ماڵی یەکمان دەکرد. ئێمە زۆر پێکەوە بووین و بەیانیان بەدوامدا دەهات و لە قەراغی شار بەیەکەوە دەچووینەوە قوڵکەی کەران.

## کەرگاین

قوڵکەی کەران، چاڵێکی گەورە بوو لە تەنیشـت پردی تازەی شـار، لە سەردەمی ژێکافدا لەوێ مرۆڤێکی بەئەمەکی ئەندامی ژێکاف، بێستان و سـەوزەی بۆ فرۆشـتن لێ کردبوو. بیرمە مەدرەسـەی ئێمەیان لەم قوڵکەیـە دروسـت کرد، شـەش پۆلێک بـوو، لە بێسـتان و باخەکەیان دابـڕی، بەشـەکەی تری هەر بێسـتان و سەوزەفرۆشـی بـوو. من و حەسـەن، بەناو دێراوی سـەوزە و خەیار و تەماتەدا دەچووینەوە ناو حەوشـەی مەدرەسەکەمان. خەڵکی لادێی دەوروبەری شار بەیانیان بە کەر و ئێستر دەهاتن بۆ شار، ماست و ڕۆن و دۆیان دێنا بۆ فرۆشتن. دواتـر، پاش وردکردنەوەی ڕسـق و ماڵیان، کەرەکانیـان لەم قوڵکەیە دەبەسـتەوە و خۆیان دەچوون بۆ ناوشار و حەمام و کەبابخواردن و قەنادی[1]چوون. ئیتر بە هۆی ئەوەی ئەم بەشەی شار و مەدرەسەکەی ئێمـە بـە هاوین و زسـتان دەیـان و بگـرە زیاتر گوێدرێـژی لێ بوو، (قوڵکەی کەران)یان بەسەردا بڕی. یەکەم جار بە چاوی خۆم بەیانییەکی زوو لەگەڵ حەسـەندا، بەرەو هاوین بوو، دەچووینەوە مەدرەسە، دیتم پیاوێک لەسـەر بەردێک وەسـتاوە و خەریکی گاینی گوێدرێژێک بوو، هەر قوشـقی بووم و نەمدەزانی شتی وا دەبێت، حەسەن غاری دایە و ڕەپێی نا و کابرا هەڵات، خۆشـیی ئەو ڕۆژە و زاوابوونمان لێ تێک دا و بە هەناسەساردی لێیدا ڕۆیشت!

---

١- قەنادی، دوکانی شیرینی و ئایسکریم و ساردەمەنی.

## سەربان بۆ سەربان بەفر

بیرمە زستانی ئەوکات لە ماڵی خۆمانەوە بە سەرباناندا دەچووینەوە مەدرەسـەـ، بەفـر ئەوەنـدە زۆر بـوو، ئەوەندەش لە سـەـربانەکان، کە دەیانماڵی و لە کۆڵانەکانیان دەکرد، کۆڵان و بانەکان دەکەوتنە تەڕازی یەک و ئیتر هەر بە خلیسکێنە و بان بە بان دەچووینەوە بۆ خوێندنگە. لە کۆڵانەکانی شاردا تەنیا تولەڕێیەک دەکراوە و دیواری ئەم تولەڕێیانە لە بەفر بە بەرزی دەگەیشـتنەوە سـەـربانی ماڵەکان، زسـتانی ئەوکات ڕۆژ هەبوو دوو سـێ جار بانەکانیان دەماڵی و بانماڵ بە وەروەرەی[1] سـەـر شـانیان بە کۆڵاناندا دەگەڕان و هاواریان دەکرد؛ بانماڵ بانماڵ... ئیتـر ئـەوەی کوڕ یان پیاوی نەبا بانگیان دەکردن و بە یەک دوو تمەن بانەکانیان دەماڵین، سەقفی ئەوکات هەمووی دارەڕا بوون، بۆیە بەرگە و تاقەتی بەفری قورسیان نەدەگرت و زۆر جار بانەکان تێکدەقرمان و زەرەر و زیانی زۆری جێ دەهێشت.

## لەجیاتی ئەسپ

ماڵـی بابـی دایکم، کە ئـەوکات تەنیـا خاڵە محەمـەد و خاڵۆژنم و کچەکەیـان و جارجاریـش نەنکـم لێی دەژیان، ڕێک لەسـەر هەورازی کۆڵانی دەرمانخانەی ئەیووبیان و ساڵەزادەی بوو. دواتر یەک لە یەکەم دوکتۆرەکانی سابڵاغ، کە ئەرمەنی بوو، دوکتۆر بنیامین هاتە خانوویەک بەرامبـەر ماڵـی خاڵم، ڕێک لە ناوقەدی هەورازەکـە. ماڵی ئێمە و خاڵم هەر هەشـت بۆ نـۆ ماڵی نێوان بوو، مەیدانچەی حەسـەنزادە دەکەوتە ناوەڕاسـتی ماڵـی ئێمە و خاڵم. لە گۆشـەی خـوارەوەی مەیدانچەکە، ماڵـی مامـەی نەفتی بوو. مامەی نەفتی مرۆڤێکی ناسـراو و باش بوو، کۆشـێکی منداڵ و خوێندکار هەبوو. مامەی نەفتی زۆر کەس دەیناسی و خۆشیاندەویسـت، عارەبانەیەکی پێ بوو، خۆی لەجیاتی ئەسـپ یان

١- بێڵێکی پانە بۆ بەفرماڵین.

گوێدرێژ دەچووە نێوان دوو قۆڵەکەی و بە سـینگ و دەسـتەکانی لێی دەخوڕی، پشـتی داشـقەکەی دە دوانزە چەلەنگ نـەوت بوو، هاواری دەکـرد نەفـت، نەفـت! جلوبەرگـی مامـەی نەفتـی گەلێـک عەنتیکە و سەیروسەمەرە بوو، یەک دوو پانتۆڵ و کەوا نەبوو، بەڵکو چەندانەیەک بوو بەسـەر یەکـەوە لە بەری دەکردن، هەمـووی نەوتاوی و ڕەش و پیـس بوو، لـە دوورەوە بۆنی نەوتی لێ دەهـات، پێڵاوەکانی جووتێک پۆسـتاڵی فشوفۆڵ بوو، زۆر جاران لە هەورازی ماڵی خاڵم داشقەکەی بۆ سەر نەدەخرا و گەر تووشی باین لەگەڵ حەسەن بە گاڵتە و پێکەنین لـە پشـتەوەڕا پ‌اڵ‌ـمان بۆ پێوە دەنا و سەرماندەخسـت. زسـتانان ئەم هەورازە لەبەر سەهۆڵ و خلیسکێنەی کوڕانی گەڕەک، وەک شووشەی لێ دەهات، پاتەی لاسـتیکمان لە پێ دەکـرد، ئاورمان دەکردەوە و بنی پاتەکانمان لەسەر ئاگرەکە ڕادەگرت تا دەهات سنووری تواندنەوە، بەم شـێوەیە پێڵاوەکانم لووس و ئامادەی خلیسـکانێ دەدرێ زستانانە بە هۆی لووسـیی هەورازەکە بۆ مامەی نەفتی گەلێک زەحمەت و عاستەم بوو لە سـەرکەوتن و دابەزینی ئەم هەورازە و ماڵەکەشـیان هەر وەک گوتم لە سـەرووی هەورازەکە بوو، ڕۆژانە دوو سـێ جار دەبوو لێی بچێتە خوار و لێی بێتەوە سەر. مامەی نەفتی زستانان پۆستاڵەکانی کە تا نزیک ئەژنۆی دەبوون، بە پێچەوانەوە چەپ و ڕاست لە پێی دەکرد، دەیگـوت ئـەوە وەک سـتۆپ و تورموز وایە و خۆمی پـێ دەگرمەوە! مامەی نەفتی یەک لە ڕوخسـارەکانی لەبیرنەچووی گەڕەکی ئێمە بوو. سـیما و چرچولۆچی نێوچاوان، لەشی شەکەت و ماندووی، جلوبەرگی ژاکاو و ئەو بارە قورسـەی سەر عارەبانەکەی، هەموو کەسێکی بیری ئەم گوتەیەی مامۆسـتا هەژار دەخسـتەوە: «ئای مردن لە کوێی ژیان کوشـتمی». مامەی نەفتی کۆشـێک منداڵی بەم تەرزە پێگەیاند و دواتر من لە شاخ بووم، بیستم کوڕە گەورەکەی بووەتە دوکتۆر و مەتەبی[1] خۆی هەیە.

---

١- مەتەب، شوێنی پێشوازیی دکتۆر لە نەخۆشەکانی، عەیادە.

## منداڵانی لاسار

بەشـێک لە گـەڕان و خۆخەریککردن و یاریی منداڵانی شـارەکەی من؛ کەلاوەگەڕان، قەریقەرێن، داروهەلووک، نانناێن، خوزێن، مێشـێن، تۆپێن، شـەڕەگەڕەک، میرمیرێن و... بوو. سـەردەمی منداڵیی ئێمە هیچ یاریگە و شـوێنی وەرزشـی، تایبەت یان جێیەک بۆ بەسەربردنی کاتی بەتـاڵ نەبوو. هەبوو نەبوو کۆڵان و سـەرجادەکان و کەلاوە کۆنەکان هەبوون. تۆپێن و داروهەلووک و هەموو یارییەکانی دی هەر لە کۆڵان و شـوێنی هاتوچـۆی خەڵک دەکران. کۆڵانەکان خـۆڵ و بەردڕێژ، یان قوڕوچڵپـاو و بەفـر بوون، زیاتر لە پانزە بۆ بیسـت منـداڵ بەیەکەوە شـەقمان لـە تـۆپ هەڵدەدا، یـان هەمـوو بەیەکـەوە لـە غارغاردێندا بوویـن، هاتوهـاوار و تەپوتۆزێکمان دەکرد لە مەیدانی شـەڕ، خراپتر و گەورەکانیـش هیـچ چارەیان نەبـوو جیا لە قبووڵکـردن و خۆلادان. جارجاریش جنێو و نێوی بابیان دێنایـن. شووشـەی ماڵان شـکاندن و دیواری سواخ ڕوخاندن، پیشەی ڕۆژانەمان بوو، شکایەت و هاتنی لای دایک و بابەکانیش شەڕی گەورەی لێ دەکەوتەوە و دەبوو خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، شادی و یاری دەبوو نرخەکەی شەقی گەورەکان بێت.

## چیرۆکەکانی باوکم

لەگـەڵ ئـەوەی باوکم پیاوێکـی زۆر ماندوو و نەوەسـتاو بوو، بە ڕۆژ زۆر هیلاکـی کار و پارەپەیداکـردن دەبـوو، زۆر شـەوان کـۆی دەکردینـەوە و حیکایەتـی بـۆ دەگوتیـن. حیکایەتی باوکم لە ڕاسـتیدا زۆرتر بیانوو بوو بۆ پێداهەڵگوتن و نیشاندانی عیشق و خۆشەویستیی خـۆی بۆ من. حیکایەتـەکان هەرگیز تەواو نەدەبوون و هەر شـەوەی سەرگوزشتەیەکی نوێ بوو لە «عەلی شێرکوڕ و براکان و دێوەکان». دڵنیام حیکایەتەکانی بابم لە تەمەنی پێنج شەش ساڵیمدا شوێنی زۆریان لەسـەر ئایندە و ژیان و کەسایەتی و تەنانەت هزر و چارەنووسیشمدا

دانـــا. حیکایەتەکانی بابم هەر ئەو کات دایدەڕشــتن، کـــە هەمووم‌مان لە دەوری کۆ دەبووینەوە، زۆرتر سەرچاوەی لەو ئەفسانە و داستانانەی لە قاوەخانەکان لە زمانی نەقاڵەکان یان شانامەی فردۆسی بیستبوونی، دەگرت. لە زۆربەی حیکایەتەکانی بابمدا کوڕێکی ئازا و پاڵەوان هەبوو، ناوی عەلی شێرکوژ بوو، کاتی خۆی لە جەنگەڵی گوندەکەیان شێرێکی کوشــتبوو، ئیتر عەلی شــێرکوژ بووبوو بە نازناوی. عەلی چەند برای دەبــێ و لە دەوروبەریان چەند دێوێک بوون، کە ئازاری خەڵکیان دەدا و مەترســـی بوون لەســـەر وڵات و... هەر جارە عەلی دەچووە شـــەڕی دێوێک، براکانی یان خۆیان دەدزییەوە، یان لە شەڕەکەدا عەلی شێرکوژ برایەکـــی لە دەســـتی دێوەکـــە ڕزگار دەکرد و دێوەکـــەی بۆ جەهەننەم دەنارد، یان براکان خەریکی کەیف و خۆشی بوون و عەلی لە دارستان و شـــاخان خەریکـــی ڕاوی دێـــو و ناحەزان بوو، یـــان عەلی بۆ ئەوەی خەوی لێ نەکەوێت و کێشـــکی برایانی بکێشێت، پەنجەی خۆی دەبڕی و خوێی تێ دەکرد و...

## زللەیەک لە مامۆستا

مـــن ئەوکات پێم وا بوو بابم لە خۆشەویســـتیی من، ناوی پاڵەوانی حیکایەتەکانـــی کردووەتـــە عەلـــی و بەڕاســـتییش لـــە هەموو خوشـــک و بـــراکان زیاتـــر تامـــەزرۆی حیکایەتەکانـــی بابم بـــووم و زۆر جاران بەڕاستی هەستم بە پاڵەوانیی خۆم دەکرد، ئەم هەستە وای لێ دەکردم مەغـــروور بـــم و ناحەقی لە کەس قبووڵ نەکەم، کـــە ناحەقیم بەرامبەر دەکـــرا و هیچم بۆ نەدەکرا، لە قین و حەســـرەتا تێرتێر دەگریام. بیرمە لـــە پۆلـــی حەوت بـــووم، مامۆســـتاکەم زۆر بە ناحەق ویســـتی لێم بدا، گوتـــم من نەبـــووم و تێکەڵاوی شـــەڕی هاوپۆلەکان نەبـــووم. هەر من گوتم و ســـوێندم خوارد، ئەو نەیســـەلماند و شـــولکی بەرز کردەوە و لێـــی دام، منیـــش یەک زللەم لـــێ دا و هەڵاتم! ئەوکات ئـــەم کارەی من لـــە جوملەی بەرد بـــە کەعبەداندا بوو، چەند ڕۆژ خۆم شـــاردەوە و لە

ئاخردا بە هەزار تکاوڕجا ڕایانگرتمەوە و مامۆستاکەم زۆری قین لێ هەڵگرتم. لەناو منداڵانی گەڕەکیشدا بەڕاستی بزوێنەری هەموو چالاکی و تیمدروستکردن و بزێوی و سەرشێتیی منداڵان بووم، دەستەیەکمان هەبوو بۆ تۆپێن و شەڕەگەڕەک و یاری، پێمان دەگوت دەستەی «عەلی جاوید»، ئێستاش نازانم ئەم «جاوید»ە لە چییەوە هاتبوو، لە کتێبی مێژووییدا وا بزانم سوپایەک لە شەڕە کۆنەکاندا هەبوو بە ناوی جاوید! ئیتر عەلی پێش دەکەوت بە دار و قوماشێک بە سەریەوە و دە بۆ پانزە منداڵ بەدوایدا. توورەکە لە خۆڵە پۆتینە[1] و لم پڕ دەکرا، لەسەر سەرمان زۆر بە توندی هەڵماندەسووڕاند و لەپڕ قۆچەقانیئاسا دوورمان هەڵدەدا و تەواوی گەڕەک لەبەر تەپوتۆز چاوی هەڵنەدەهات. بە کورتی گەڕەکمان وەک مەیدانی شەڕی پاڵەوانەکان لێ دەکرد و زۆر جارانیش بە توورەکەی پڕ لە خۆڵەوە دەچووین بۆ شەڕەگەڕەک.

یەک لەو بەدفەڕییانەی دەمانکرد، خۆهەڵاوەسین بە داشقەی ئەسپ بوو. ئەوکات ترۆمبێل زۆر کەم بوو، زۆربەی خەڵک بۆ هاتوچۆ، یان شتومەکگواستنەوە لە داشقە یان عارەبانەی ئەسپ کەڵکیان وەردەگرت، ئێمەش لە پشتەوەڕا سێ چوار منداڵ خۆمان پێدا هەڵداوەسی و داشقە بە غاری ئەسپ وەک بای شەماڵ بە جادە و کۆڵانەکاندا دەفڕی و جاروباریش دەکەوتینە بەر قامچیی تیژ و درێژی داشقەچی، خۆ ئەگەر هاتباو وەشوێنیکمان کەوتبا زۆر بەئازار بوو. یەکەم هاوڕێی جوانەمەرگم وا بزانم پۆلی سێ و چواری سەرەتایی بووین، کاوە ئیمامی کوڕی میرزا ڕەحمانی ئیمامی، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژێکاف بوو، لە یەک پۆل و سەر مێز و کورسی دادەنیشتین، هەموو کاتەکانی مەدرەسە بەیەکەوە بووین و بەیەکەوە هاتوچۆمان دەکرد. کاوە هەتا حەز بکەیت منداڵێکی جوان و پاکوخاوێن و لەبەردڵان بوو، سپی و ناسک وەک منداڵە ئەورووپی بوو، لەناکاو گوتیان کاوە مرد! گۆیا خۆی بە داشقەوە هەڵواسیوە، جا یان کەوتووە یان بەر قامچیی

١- خۆڵی زۆر نەرم.

داشــقەچی کەوتــووە، ئەوە یەکەم لەدەســتدانی هاورێیەکی نزیکم بوو. بەداخەوە دواتر لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا دەیان هاورێم تێدا چوون و شەهید بوون.

### هاورێی گیانیبەگیانی

مەدرەسەی من و حوسێن رێک لەوسەری شار بوو، لە بناری کێوی داشــامەجید[1] و تەنیشت چرابەرق[2]. لە رۆژدا دوو جار دەچووینەوە بۆ مەدرەســە، بەیانیان دەچووین و نیوەرۆیان دەهاتینەوە بۆ نانخواردن و پشوویەک، سەعات دوو دیسان دەستی پێ دەکردەوە تا چوار و نیو. بە زســتان و بەهار و پاییز ئەمە رێگەی هەموو رۆژێکمان بوو. پۆلی یەک، حوســێن بە تەنیا لە مەدرەسەیەکی ناوشار بوو، ساڵی دواتر لەگەڵ مندا ئەویشیان گواستەوە بۆ مەدرەسەی سەعدی، کە بەرێوەبەرێکی زۆر باش و دڵســۆزی ســابڵاغیی هەبوو. رۆژانە جانتایەک بە کۆڵەوە، دووبەدوو لەگەڵ حوسێندا رێی مەدرەسەمان دەگرت، بە پێی دوو منداڵی وەک ئێمە تەواو دوور بوو، زســتانان سەرما و کرێوەی موکریان ناوبانگی هەبوو، بەفر زیاد لە مەتر دەکەوتەوە، مەدرەسەی ئێمەش قەراغ شار و لە بناری کێوە بەناوبانگەکەی شــار، داشــامەجیددا بوو، زۆر جار سەرماوسڕ بە تایبەت دەســت و پەنجەتەزێن، بڕســتی لێ دەبڕیم، دەگریام و حوســێن لەسەر حاڵی خۆیەوەڕا دەستەکانی دەگوشیم و لە گیرفانی خۆی دەنان. پاییز و بەهاران جەوێکی دیکە بوو، هەموو ئەو رێیەمان بە شەڕەشــەق و غارغارێن و فشــقیات دەبڕی. ئێمە لە برا دەرچووبووین، دوو هاورێی گیانیبەگیانی بووین. نهێنیی یەکترمان دەپاراســت و لای گەورەکان وەک عەتــا فزوولــی و دووزمانیمان لەیەک نەدەکرد و تەنانەت لەســەر یەکتر لێشمان دەدرا و ئیعترافمان لەسەر یەک نەدەکرد.

---

١- داشامەجید، کێوێکی بەناوبانگە لە مەهاباد.
٢- چرابەرق، کارەبای ســابڵاغ پێشتر مەولیدە بوو، لەوێوە دابین دەکرا و ئێواران کاتی تاریکی هەڵیان دەکرد.

لە چرابەرقەوە، پەنا مەدرەسەکەمان جۆگەی ئاو هەبوو، لەمبەر و ئەوبەری گەورەترین جادەی شار کە ڕێک شاری دوو بەش دەکرد. کارێزێکی زۆر خوڕێن و پڕئاو لەناو حەوشەی چرابەرق هەبوو، ئەم ئاوە بەم جۆگەیانەدا بە خوڕ دەهاتە خوار و دەچووەوە چوارڕێی بێهداری[1]، دواتر بوو بە چوارڕێی ئازادی، ئەوجار لەوێرا بۆ چوارچرا و بە تەنیشت قوڵکەی کەراندا دەچووەوە چەمی گەورەی سابڵاغ، کە دواتر بەنداوی لەسەر دروست کرا.

## کەشتیی سفرەکان

ماوەیەک بوو لە دەرس و مەشق کەمتەرخەم بووم، بە گشتی تەلەبەی چاک بووم، نازانم پۆلی یەک یان دوو بوو، چەند جارێک سفرم وەرگرت، گوتم حوسێن نابێت بە کەس بڵێی، ئەویش گفتی دەدا. وەرەقەی سفرەکانم دەکردە کەشتی، زۆری لێ شارەزا بووم، کەشتیی وام بە کاغەزی دروست دەکرد، هەڵنەدەوەشا. کەشتیی سفرەکانم لە جۆگەی داویشتن، لەگەڵ کەشتیی منداڵانی دیدا کێبەرکێمان دەکرد، سفرەکانی من تیژ دەڕۆیشتن و خۆیان لە چۆمی داویشت، ئەو ڕێگە دووورودرێژە، قەراغە و قەراغ جۆگە، لەگەڵیاندا هەڵدەهاتین و چاودێریمان دەکرد ئاخۆ ئی کاممان دەیباتەوە.

ساڵی خوێندن سێ بەش بوو، پێیان دەگوت سولس، پاییز تەواو دەبوو ئیمتحاناتی سولسی یەک دەهات، ئەوجار زستان و پێش پشووی نەورۆز ئیمتحانی سولسی دوو، ئینجا بەهار تەواو دەبوو؛ ئاخری مانگی جۆزەردان ئیمتحانی گەورە و سولسی ئاخر دەدرا. ئەو ساڵە گوتم، لە یەک یان لە دوو بووم لە سولسی یەک زۆر خراپ کەوتبووم، لەگەڵ حوسێندا تەکبیرمان کرد باسی نەکەین، مودیر کە دۆستی بابم بوو، نامەیەکی دا بە حوسێن تا بیداتە بابم، زانیمان سەبارەت بە خراپیی ئیمتحاناتی منە، نامەکەشم کردە کەشتی و خۆی گەیاندە دەریا. پاش

١- بێهداری، دایرەی تەندروستی مەهاباد.

ماوەیــەک مودیــر، کە زۆر جار پیاوانی شــار لەبــەر دوکانی بابم، یان مامــم کۆوەدەبوون و دوکانەکانیان لە ناوەڕاســتی شــار بوو، بە بابم دەڵێ: نامەکەت ســەبارەت بە خراپیی ئیمتیحاناتی عەلی پێ گەیشــت؟! بە حوســێندا بۆم ناردی! (بابیشم، کە ئاگای لە هیچ نییە) دەڵێ: نەوەڵڵا شتی وام نەدیوە! جا چۆن عەلی تەمبەڵە؟!

ئیتــر بە پەلــە لێکۆڵینــەوەی توندوتیژ دەســتی پێ کرد و ئاشــکرا بــوو عەلی هەموو ســفرەکانی کردووە بە کەشــتی و لە ئاوی جۆگەی هاویشــتووە. لە سەردەمی ئێمەدا لە مەدرەسە بەیانیان پێش چوونمان بــۆ پۆلەکان، هەموو خوێندکاران لە حەوشــە ڕیز دەکران و پێشــەکی سروودی ئێران و شەهنشا، دواتر وەرزش، چەند حەرەکەیەکی دەست و قــاچ و مــل، ئەوجــار نایبــی مودیر پێمــان دەگوت نــازم، کۆنترۆڵی پاکوخاوێنیی دەکرد، دەســتەکانمان شــەق لە تەنیشت یەک ڕادەگرت و ئەویش پێدادەهات بە وردی ســەیری قژ، پانتۆڵ، چاکەت و بنی نینۆک و دەســتەکانی دەکردین، هەر شــوێنێکی بەدڵ نەبا ئەوە بە ڕاستەکەی دەســتی یان شــوڵکی تەڕ یەکڕاســت لەو شــوێنەی دەدا. لە هەمووی ناخۆشــتر، سەرمای زســتانان و ئەو هەمووە بەپێوەوەستان، ئەو کاتە بوو کە بە ڕاســتەکە لە پشتی دەســتی ڕەقوتەقی دەداین. هەبوو منداڵ خــۆی بــۆ ڕانەدەگیرا و شــۆراوکەی میز لەنــاکاو دەهاتە خــوار، ئیتر کارەسات بوو کارەسات بۆ ئەم منداڵە!

ئــەوکات مەدرەســەکان بــۆ خــواردن بودجەیــان هەبوو، شــیر و نانــی گــەرم و هێلکــە و ڕۆنیکەرەیان دەداینێ، هەڵبەت کە من دەســتم بــە خوێندن کرد، هەر ئەو ســاڵە بــوو، دواتر ئــەم ناندانەیان هەڵگرت، پاشــان لە ئاخروئۆخری زەمانی شادا بۆ منداڵانی سەرەتایی، خواردن لە مەدرەســە ســەرەتاییەکان تا پۆلی پێنج داندرایــەوە و پێیان دەگوت «تەغزییە»، کە زۆری گەندەڵی تێدا دەکرا.

دوو ســێ ڕۆژ دوای ئاشــکرابوونی کارنامــەی ســفرەکانم، بەیانی دوای خوێندنــەوەی ســروود، لەنــاکاو مودیــر هاتــە بەرامبــەر ڕیزی

خوێندکارەکان، چوو بۆ سەر کورسییەک و دەستی بە قسە کرد، زانیم چ باسە، مەرگم بە ئاوات دەخواست بە کونی لووتمدا بێتە دەر و گیانم دەرچێت! دەی دەی پێدا هاتەخوار و هەموو حیکایەتەکە و سەفرەکانم و شاردنەوەیانی باس کرد، کێشەکە ئەوجار بۆ ئاغای مودیر من نەبووم، بەڵکو حوسێن بوو، کە بۆچی نامەی مودیری نەگەیاندووە؟! بێدەنگییەکی بەسام ئەو حەوشەیەی داگرتبوو، گوێم لە لێدانی دڵی خۆم و حوسێن دەبوو، زۆری قسە کردن و هۆشم نەمابوو، بانگی حوسێنی کرد چوو بۆ پێشەوە، شوڵکی تازە و تایبەت هێنرا بۆ ئاغای مودیر، بگرە بەریدەست، دەیان شوڵکی لە بەری دەستی جوان و بچووکی حوسێن دا، نازانم بۆ لە تاوان و لە شەرمان نەمردم. سولسی سێ و لە تاقیکردنەوەی ئاخری ساڵدا لە هەموو مەدرەسە نمرەی سێهەمم بەدەست هێنابوو، وێنەیان لە ڕۆژنامەی گەورەی ئێران، ئیتلاعات چاپ کردم. دەبێ ئێستاش لە ئەرشیڤیدا مابێت!

### گریانی دایکی نیشتمان

بیرمە پۆلی سێ بووم، شارەکەمان سەرتاپا ڕەشپۆش بوو، سیمایەکی گەشت نەدەدیت، خەفەت و بێزاری، ڕقوکینە لە ڕوخساری گەورەپیاوان و لاوان و ژنان بە ئاشکرا بەدی دەکرا، شار بۆنی خوێن و کەلاکی کۆنی لێوە دەهات، ئاسمان جاربەجار ڕەش دادەگەڕا و جادەکان تاریک دەبوون، سەرباز و تفەنگ و سەرنێزە لە گەڕان و هاتوچۆدا بوون، ئای کە چ ژانێکە دایکی نیشتمان دەیگرێت، کاتێک پیرەپیاو و گەورەیەکی شار و سەردەمی کۆمار پێشی بە فرمێسکەکانی ناگیرێت و لەناو کۆڵان و جادەی شار دەستبەئەژنۆ دێتە خوار و لەبەرخۆیەوە بە سرتە و چپە، پڕ بە دەروونی هاوار دەکات ئەیەڕۆ پشتم شکا، پەکوو لەم کارەسات و خوێنخۆرییە، ئای کە ئاستەمە کوڕت شۆڕەسواری مەیدان بێت و بە دەستی پیاوی خوێڕی و ژاندەرمی شا بێتە کوشتن. دەبێ دار و بەرد، ئاسمان و زەوی بێنە گریان و دایکی

نیشـــتمان بکەوێتە قژڕنین لەتاوی لاواندنەوەی بەســۆی خوشکی کاک لەدەستچوو، ئاهـ و ناڵەی خوشکانی شۆڕەسواران و دایکانی سەرسپی، ئاگری لە عالەم بەردەدا و بەردی دەتواندەوە. ڕێبوارەکان بە ئەســپایی و بە بێدەنگی بە چاوی زەق و فرمێسکتێڕژاو دەیانڕوانییە یەکتر و بەم نیگایە هەزاران وشـــە و پرســـیار و تۆڵە و حەماســـە دەهاتە وێناکردن. ئای بۆ وێنەکێشـــێک و چیرۆکدارێژێک ئەم ڕۆژانەی شارەکەمانی وەک تابلۆ و ڕۆمانێکی تراژیدی نەخشاندبا. ئەم شارە لەوەتی هەیە شینگێڕە، ڕێک بیست ساڵ پێش بوو کۆمارە ساواکەی کوردستان، سەری بڕدرا و ســـەرۆکەکەی بـــە دارەوە کـــرا. دەڵێن ئەوکاتیش دایکی نیشـــتمان بۆ کۆمار و شەهیدەکانی سەری خۆی دەقوڕ نابوو، بسکی سپی و ئاڵۆزی هەڵدەسووڕاند و توکی لە ئاسمان دەکرد، ئەمڕۆش دوای بیست ساڵ لە هەمان چوارچرا، جەستەی بە گوللە بێژینگکراوی منداڵە چاوگەشەکانی کۆمـــار لە پەیژە بەســـتراون و بە عەموودەکانـــی چوارچرایانەوە ناون و ســـەربازی عەجـــەم هەر بۆ ئیهانە، ســـوتووی جگەرەکەی لە کەللەی سەریان دەکات، ئەوەم بە چاوی خۆم بینی.

### مەیتی جوامێران

شۆڕشـــی لاوەکانی دوای کۆمار، ســـاڵانی ٦٧-١٩٦٨ی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان بە دەستی پیسی شای ئێران و هاوپەیمان و بەکرێگیراویی شـــای گۆڕبەگۆڕ، هەندێک لە ســـەرکردەکانی کوردی باشـــوور و مەلا مســـتەفای بارزانـــی، تێکوپێـــک شـــکابوو. دەردی ســـەرباری دەردان شۆڕەسوارانی ڕۆژهەڵات بە دەستی کورد و سەرۆکی بەناو باشووری کوردستان بۆ خۆشخزمەتی شای دژەکورد، هاتنە شەهیدکردن و ئاگری شۆڕشـــێکی کوردیان خامۆش و بێدەنگ کرد. نۆ دە ساڵان بووم، بەبێ ئەوەی دەستی چەپ و ڕاستی خۆم ناسیبێت و عەقڵم بە دنیا شکابێت، لەناکاو مەیتی ئەو جوامێرانەم بینی، بە پشـــت جێبەوە ڕایاندەکێشن، بە

نەردیوانەوە[1] شریتپێچکراون و شوێنی دەیان فیشەک بە جەستەیانەوە بوو. یەک لەمسەری کۆڵان و ئەوی تر لەوسەری چوارچرا و یەک لەمسەری شار و ئەوی دی لەوسەری بازاڕ، هەموویان بە دارتێل و پایەدیوارانەوە نابوون و سەربازێک بە تفەنگ و سەرنێزە لە تەنیشتیان وەستاوە و گاڵتە بە ڕێبواران دەکات و بەوپەڕی بێشەرمی دەڵێن، وەرن چاولێبکەن، ئەوەیە عاقیبەتی خیانەت بە شاهنشامان!

سەرکردەکانی شۆڕشی ڕۆژهەڵات، کاک سولەیمان موعینی و کاک عەبدوڵڵای برای، کاک سمایل شەریفزادە، سەدیق ئەنجیری، مینە شەم، ساڵە لاجانی، مەلا ئاوارە، قادر شەریف، خەلیل شەوباش و... بە دەستی شای ئێران و مەلا مستەفای سەرکردەی شۆڕشی باشوور کوژران و بە زیندوویی، یان بە مردوویی تەسلیم بە ساواکی ئێران کرانەوە و شۆڕش لە ڕۆژهەڵات بۆ ماوەیەک بێدەنگ و خامۆش کرا.

### چ دەبوو وا نەبوایە؟!

لەناوچوونی ئەم شۆڕشە زەرەر و زیانێکی یەکجار قورس و قەرەبوونەکراوی لە هەموو بزاڤ و جووڵانەوەکانی چوار پارچەی کورد دا، بە تایبەت ڕۆژهەڵات و باشوور. ڕێک بیست ساڵ پێشتر بوو یەکەمین کۆماری کوردستان هەر لەم شارەدا سەریان بڕی و جوانەمەرگ بوو. شۆڕش، مێژوو یان ڕەوتی ڕووداوەکان بە ئەگەر وا با و ئەگەر وا نەبا نایەتە چوارچێوەی لێکدانەوەیەکی زانستی و ناشکرێت بکرێتە ڕاستبینی، بەڵام دەبێ هەڵسەنگاندن و خەسارناسی بۆ بکرێت و بۆ دواڕۆژ و نەوەکانمان، ببێتە وانە و ئەزموون.

ساڵی ١٩٤٦ کۆمار لە سێدارە درا و دەسپێکی شەستەکان شۆڕش بە بەشدارییەکی باش و پڕ لە نوخبە و ڕۆشنبیری هەڵکەوتوو، لە شاخەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان چەخماخەی لێ درا. ئەم شۆڕشە بە پێشەوایی سیکۆلار و چەپەکان و نوخبەی عەدالەتخواز و بڕوابوون

---
١- نەردیوان، پەیژە.

بــه خەباتــی چینایەتی، ڕابەری دەکرا و بەراورد بە تویژ و دروشــم و بەشــداریی پان و بەرینی عەشــایر و دەرەبەگەکانی سەردەمی کۆمار، هەنگاوێکی گەلێک پێشــکەوتووخوازانە بوو. ڕێک دە ســاڵ دواتر تاج و تەختی شــای ئێران ســەروژێر و لە ژێر پێی کۆمەڵانــی خەڵکی ئێراندا پلیشــایەوە. فەرزەکانم ڕوون و ئاشکرایە و مەبەستمە بڵێم گەر کۆمار وا زوو چۆکــی دانەدابــا و عەشــایر و دەرەبەگەکان و بارزانی پشــتی کۆماریــان بــەر نەدابــا و قازی محەمەدیــان بە تەنیا جێ نەهێشــتبا و شۆڕشێکی نەتەوەییان لە شاخە سەختەکانی هەردوو دیوی کوردستان هەڵگیرساندبا، هەر دە دوازدە ساڵ دواتر بە سەدان خوێندکار و چالاکی نەتەوەیــی و پێشــمەرگەی ئــازا و گیانلەسەردەســتی وەک: موعینــی، شــەریفزادە، مەلا ئاوارە، ســاڵە لاجان و قادر شەریف و مەلا محەمەد زەنگەنــەکان، لە دیوی گەرمێنیش ئەوە پــڕ دەبوو لە مام جەلال، عەلی عەســکەری، عومەر دەبابە، ئارام، نەوشــیروان، مولازم ئەنوەر مەجید ســوڵتان، بابە شــێخ و مامەڕیشــەکان و هەر وا یارمەتییش دەدران بە دەیانــی وەک نەجمەدیــن بیوک کایا لە دیاربەکــرەوە و زۆری دیکەش لە کوردســتان پشتی ئەم شۆڕشــەیان زیاتر قایم دەکرد. ئەم خەیاڵ و ئارەزووە بە ئاشــبەتاڵی مەلا مســتەفا لە ١٩٧٥دا بە مــاوەی کەمتر لە بیستوچوار سەعات، بوو بە بلقی سەر ئاو.

گوتم؛ لە ئاخروئۆخری ساڵانی پەنجاکاندا تەنیا دە ساڵ دوای کۆمار، بە دەیانی وەک دوکتۆر قاســملوو، ئەحمەد تۆفیق، کەریم حیســامی و سیراجییەکان یاخی بوون لە شای ئێران و ڕوویان لە شاخ و شۆڕشی باشــوور کرد. لە ساڵەکانی نیوەی دوایەی شەستەکاندا، شاخ و دۆڵ و نــاو شۆڕشــی ئەیلوول پڕ بوو لە خوێنــدکاری زانکۆ و لاوانی لادێ و شارەکانی ڕۆژهەلات، بەتەمای ڕاپەڕین و شۆڕشێکی نەتەوەیی دەستیان دابووە چەک و شەڕی پارتیزانی، کە ئەوکات لە زۆربەی جیهاندا باوی بوو و زۆربەشیان سەرکەوتن. ئەمانە هەمووی بۆ بەرژەوەندیی شای ئێران بە دەســتی ســەرکردەکانی شۆڕشــی ئەیلوول و شەخسی مەلا

مســـتەفا، یـــان کـــوژران، یانیش بە مردوویـــی و زیندوویی تەســـلیم بە ســـاواک و حکومەتی پەهلەوی کران و جووڵانەوە و شۆڕشـــی لاوانی ڕۆژهەڵات دیسان هەر وەک کۆمارەکەیان جوانەمەرگ بوو. لە خەیاڵی خۆمدا دەڵێم ئەگەر جووڵانەوەی ٦٧-٦٨ لە ڕۆژهەڵاتدا لە شاخەکان و بە پارتیزانی بەردەوام با و دە ســـاڵ دواییش حکومەتی ئێران لە ســـاڵی ١٩٧٩دا ئـــەم بەڵایەی بەســـەر هاتبا و ئێمەی کورد بـــە ئامادەیی تەواو و شۆڕشـــێکی چەکداری لە پشتمان، بەرەوپیری ئاڵوگۆڕییەکانی ئێران چووباین، تۆ بڵێی تووشـــی ئەو هەموو بێئەزموونی و کارەســـاتە باین، کە لە ســـەرەتاوە کۆماری ئیســـلامی بەســـەری هێناین؟! یانیش دیسان دەڵێم تۆ بڵێی لە ســـاڵانی پێش شۆڕشـــی ئێراندا بـــە دەیانی وەک کاک فوئاد و سەعید موعینی و حەمەحوسێن کەریمی و خوێندکارانی دیکەی ڕۆژهەڵات لە زیندانەکانی شـــادا بەند کرابان، یان ئەوەتا کە خەتەریان هەست پێ دەکرد ڕوویان لە شاخەکان و شۆڕشەکە دەکرد.

بەجێهێشتنی سەرانی کۆمار، ئاشبەتاڵ و تێکوپێکدانی جووڵانەوەی شەســـتەکانی موعینی و شەریفزادە لە ڕۆژهەڵات، بە هیچ خەسارەیەک بەراورد ناکرێت و میزانی زەرەر و کارەساتەکانی، کە بەداخەوە دەستی کوردیشی تێدا بووە، تەسەور ناکرێت و ڕەنگە گەر ئەم دوو سێ شتە وا نەبوونایـــە، زۆر کارەســـاتمان لـــە مێژووی کورددا، وەک: شکســـتی کۆمـــار و ئیعدامی ســـەرکردەکانی، لە بەندکردنی ســـەدان شۆڕشـــگێڕ و خوێنـــدکار لە زیندانەکانی شـــای ئێراندا، ئەنفـــال، کیمیایی، هەڵەبجە، کۆڕەو، قەلاچۆکردنی گوندەکان و کوشتاری بە کۆ و ئیعدامی لاوەکانی ڕۆژهەڵات و شکستی جووڵانەوەکەمان نەدیبا!

### ئەمە سیامەندی موعینییە

نیوەی ســـاڵ بوو، لە ناوەڕاســـتی وانەگوتنـــەوەدا، مودیرەکەمان لە دەرگای دا و هاتە ژوور.

مامۆستا یەکسەر گوتی: هەستنە پێ.

هەموو هەستاین.

فەرموون دانیشن.

منداڵێکی مووقرژیی چنگ تێوەناچێی زەرد و سووری ناسک و ڕوخسار لادێیی و سووتاو، بە کەوا و پانتۆڵ و پشتێنی تا سەر سینگ، منداڵێک بە جلوبەرگی پیرەپیاوان، دەستی ئاغای مودیری گرتبوو. مودیر گوتی، ئەمە سیامەندی موعینییە. خۆشەویستی منە و لە ئەمڕۆوە دێتە پۆل و هەموو یارمەتیی بدەن، لە وانەکان دوانەکەوێت. هۆدەکە پڕ بوو، هەمووی نیمکەتی سێ نەفەری بووین، من لە پێشی پێشەوە بووم، خۆم بچووک کردەوە و جێگەم بۆ کردەوە، گوتم: با بێت لە لای من دانیشێت. ئەوە پەنجا ساڵ پێش بوو، هات و دانیشت، ئیتر بووینە هاوڕێ. زۆر نەبوو کە مەیتی باوکیان هێنابووەوە شار و خۆیشی لە گوندی سونێی قەڵادزێوە لەگەڵ دایک و خوشکی ساوای هاتبوونەوە ماڵی باپیری.

دیسان هەر ئەم ساڵە کارەساتێکی گەورە و دڵهەژێن شارەکەی گرتەوە، ئەمجار لافاو و ئاوی بێڕەحم. سابلاغ ئاوەڕۆی نەبوو، بۆیە زۆربەی بەهاران لافاو دەیگرتەوە و بە سەدان کەس ماڵوێران و شتومەکیان وەسەر ئاو دەکەوت. لافاو زۆرتر گەڕەکی خڕێ، کە دەهاتەوە سەر چوارڕێی ئازادی و گەڕەکی یەرغووی دەگرتەوە، کە دەچووەوە بۆ لای پردی یەرغوو و چۆمی شاری. ماڵە پوورێکم لە گەڕەکی خڕێ بوو، پوورێکیشم لە یەرغوو بوون. هەردوو فەقیر و ماڵەکانیان خشتی گڵ و سواغ بوو، هەر زۆر زوو دەتلیسایەوە، پڕ بە جادەی سەرەکیی شار، شاپووریان پێ دەگوت، وەک چەمێکی قوڕاوی و بە گرفە و لوورە ئاو دەهاتە خوار، مرۆڤەکان خۆیان لەبەر نەدەگرت و ئاو تا سینگی گەوران دەهات، مەنجەڵ، نوێن و بان، سەماوەر و قاپوقاچاخ و کورسی و تەنانەت هەندێک جار سەیارە و هەموو شت بە گوڕی لافاو بەرەو خوار دەبوونەوە، ماڵوێرانی و ماڵبەقوڕگرتن ئەوە بوو کە دەماندیت. خەڵکی لەگەڵ یەک زۆر یەکدڵ و یەکگیان بوون و کەس لە یارمەتیدان درێغیی نەدەکرد، ئێمە بەشێکمان بەرەو ئەو ماڵی

پــوور و ئــەوی دی بۆ ماڵــی پوورەکەی گەڕەکی یەرغــوو دەچووین. شــین و گریان و ڕۆڕۆ هەموو شــاری گرتبووەوە. گەڕەگی ئێمە باش بــوو، بــە هۆی ئەوەی بەرز بوو لافاو نەیدەگرتــەوە، هەموو دەچووین بــۆ یارمەتیی گەڕەکەکانی دیکە و ماڵمان پڕ دەبوو لە خزم و دۆســتی ماڵوێران و لافاوبردوو!

ئاخروئۆخــری ســاڵانی ٦٠ و ســەرەتاکانی ٧٠ی زاییینی ســەدەی ڕابــردوو، بە هــۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت و گەشــەی ئابووریی ئێران، خەڵک تا ڕادەیەکی زۆر لە خۆشــگوزەرانیدا دەژیان، وردەوردە لــە کۆمەڵگــەی ئێــران چینــی وردەبــۆرژوا ســەری هەڵــدەدا، ڕادەی خوێنــدەوار هــەر دەهــات و زیــادی دەکــرد، تەنانەت دایــک و باب و پیرەکانیــش دەچوونــە خوێندنــی شــەوانە، ئەکابیریان[1] پــێ دەگوت. کردنەوەی دانشسەرا، هەمان پەیمانگەی مامۆستایان ڕوو لە زیادبوون بوو، تەنانەت لە مەهاباد دانشســەرای کچان کراوە بۆ پەروەردەکردنی مامۆســتایانی کچ. کوڕان دوای نۆ ســاڵ خوێندن، زۆربەیان دەچوونە ڕەزائییــە (ورمێ)، یان شــاری خۆیە کە دانشســەرای کوڕانی لێ بوو، دوای دوو ســاڵ دەهاتنــەوە یەکســەر دەبوونــە مامۆســتا و لەجیاتی ســەربازییش هەر ڕەوانەی دێهات دەکران بــۆ وانەگوتنەوەی منداڵانی لادێ. بۆ لاوێکی حەڤدە هەژدە ســاڵان پیشەی مامۆستایی و مووچەی نزیــک بە هــەزار تمەن، ئیتر پاشــایەتی بــوو. وردەوردە وای لێ هات جادەکانــی مەهاباد پــڕ بوون لە ترۆمبێلی ئەم لاوانــە و ئیتر دەبوو لە چوارڕێیانــەکان پۆلیــس و مــرور دابندرێن، ئەوەش کۆمەڵێکی باشــی لاوانی برد بۆ لای خۆی و هەرکەس تەنیا شــەش پۆل خوێندنی هەبایە بۆ مەدرەسەی پۆلیس قبووڵ دەکرا. زۆربەی هاوڕێیانی مەدرەسەم لە پۆلی نۆ بەرەو دانشسەرا بوونەوە لە خۆیە و ڕەزائییە، کۆمەڵێکیشمان

---

١- ئەکابیر، مەدرەســەی شەوانە بوو بۆ گەورەساڵان، دوای ڕیفورمی شا «شۆڕشــی سپی» لە ساڵانی ١٩٦٢دا بوو کە دەگوترا هەموو کەس دەبێ خوێندن و نووسین فێر بن.

بەتەمای زانکۆ، دەبوو خوێندنی دواناوەندی و دەبیرستان تەواو بکەین و دیپلـۆم وەرگرین بۆ ڕێگەپێدان لە زانکۆکانی ئێران، کە ئەوکات تەنیا زانکۆی دەوڵەتی هەبوو، کە زۆریش نەبوون، تەنیا لە شارە گەورەکانی وەک تاران و تەورێز و شیراز و... هەبوون.

شـا بە لێشـاو دەستی کرد بە قەرزدان بە مامۆستا و کارمەندان بۆ کڕینـی خانوو و سـەیارە و شـتی تر، تا ڕادەیەکی بـاش لە خافڵاندنی لاوان و دوورکەوتنەوەیان لە حەز بە کاری سیاسـی و شۆڕشـگێڕی، سـەرکەوتوو بوو. لە سابڵاغ، کە مەکۆی خەڵکانی سیاسی و نەوەکانی کۆمار بوو، چەند بنەماڵەیەک نەبێت کە لاوەکانیان سەریان لە سیاسەت و بیروڕای مارکسی و کوردایەتی دەخورا، ئەوەی تر مەست و خولیای خۆشییەکانی ڕابواردن و مەدح و ستایشی شا بوون. لەم ساڵانەدا حەز و ئـارەزوو بـۆ دامەزراندن لە ئەرتەش و پۆلیس بە ڕێژەیەکی بەرچاو ڕووی لـە زیادبـوون بـوو. جاران زۆر بـە هەڵکـەوت و دەگمەن بوو لاوێکی سابڵاغی بچێت بۆ ئەم دەزگایانە کار بکات، تەنانەت بە عەیبەش دادەندرا. ئەم خەڵکانە کە لەم دەزگایانە کاریان دەکرد، زۆر جێی متمانە و خۆشەویستی خەڵک نەبوون.

### هەنگاوەکانی شا

شـا کـە گەشـەی ئابووریی وڵاتـی دی و لە سیاسـەتەکانی خۆی ڕازی بوو، دەسـتی برد بۆ لەناوبردنی هەموو ئەحزاب و گوتی: ئێران تەنیا یەک حیزبی پێویسـتە. حیزبی «ڕەسـتاخیز»ی[1] دروست کرد و دەبـوو هەمـوو تاکێکی ئێران ئەندامی بێت. سـاواک کە چەند سـاڵێک

١- حیزبی ڕسـتاخیز، حیزبەکەی شا بوو، کە ساڵی ١٩٧٤ بە فەرمانی شا دروسـت بوو، زۆربەی حیزبەکانی دیکەی ئێرانی لەناو خۆیدا تواندەوە و دروشـمی تەنیا یەک حیزب بەرز بووەوە و زۆربەی کارمەند و سەرووی ١٨ ساڵ بە زۆر دەکرانە ئەندامی حیزب و بەو هەنگاوە شا ویستی نیزامی تاکحیزبی بێنێتە ئاراوە و هەموو نیزامی سیاسیی ئێران بێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی، هەرچەند زۆریش سەرکەوتوو نەبوو.

بــوو دامەزرابوو، بوو بە دێوەزمەیەکی تۆقێنەر و خەڵکی دەیانگوت لە هەموو شــوێن و ماڵێک بوونی هەیە. شا دوای کودەتاکەی موسەدیق[1] توانیبووی خۆی کۆ بکاتەوە و دوای شۆڕشی چەکداری لە ڕۆژهەڵات و تەفروتوناکردن و لەناوبردنی ســەرکردەکانی ئەم شۆڕشــە، خیانەت و بێدەنگیــی حیزبــی تــودە[2] وەک چالاکتریــن و گەورەتریــن حیزبی سیاســی و چەپی مێژووی ئەوکاتی ئێران، ڕێگەی بۆ شا خۆش کرد لە ڕێگەی ســاواک و ئەشــکەنجەی لاوان و خۆشــگوزەرانی و ئیمتیازدان و دەوڵەمەندکردنیــان، تــا ڕادەیەکــی زۆر باش، دووریــان بخاتەوە لە سیاسەت و فکری شۆڕشگێڕی، نە تەنیا خەڵکی ئێران لەدوای موسەدق دەســتیان هەڵگرت لە دژایەتیی شا، بەڵکو شاپەرستی فەخر و شانازی بوو. تەنیا لە موکریان نووزەیەک هەبوو و بە سرتە و لە بنەوە و زۆر بە نهێنی چەند کەسێک هەبوون بە پەیکەرەکەی شایان دەگوت گازەردا!

### سیمای شار گۆڕا

ســیمای شاری سابڵاغ، دوای شکانی شۆڕشــی ساڵانی ٦٧ و٦٨ی زایینی و کوشــتن و لەسێدارەدانی ســەرکردەکانی، وەک موعینییەکان و شــەریفزادە و ئەنجیری و مەلا ئاوارەکان و... بە دەســتی شا و مەلا مستەفا، زۆر زوو بە تەواوی گۆڕا و سیمای سیاسیبوون و شۆڕشگێڕیی ئەم شــارە بوو بە ڕاگواســتنی مامۆستا دڵســۆز و کوردپەروەرەکانی شــار بۆ شــارەکانی دووری ئێران و ڕووکردنی لاوان بەرەو خوێندن و دوورکەوتنــەوە لــە سیاســەت. تێکەڵاویــی خەڵــک و چوونیــان بۆ

١- موســەدیق، محەمەدی موســەدیق ســێهەمین ســەرۆکوەزیرانی ئێران بوو لە ســاڵی ١٩٥٢دا، پیاوێکی نیشــتمانی بوو، ویســتی نەوت لە دەستی ئینگلیــزەکان دەربێنێــت و بــە نیشــتمانی کرد، خەڵک ڕژانە ســەر جادە و پاڵپشــتی بوون، شــا هەڵات و ئێرانی بۆ چەند ڕۆژێک بەجێ هێشــت، بە کودەتایەکی ئەمریکا و ئینگلیز هێنایانەوە و موسەدیق گیرا و سوڵتەی شا ئەوەندەی دیکە قایمتر کرا.

٢- حیزبی تودە، یەکەم حیزبی کۆمۆنیستی سەر بە سۆڤییەت ساڵی ١٩٤١، لە ئێران دامەزرا و پەیڕەوی لە سیاسەتەکانی سۆڤییەت دەکرد.

دەرودەشــت، پیاســەی ئێوارانی قــەراخ باخی مکائیل و بلــواری تازە، گۆڕدرا بۆ دانیشتنی بەرامبەر تەلەفزیۆن و زۆرتر بەیەکەوەبوونی ناو ماڵ و خێزان بۆ خۆیان و حەزەرکردنیان لە نامۆیی و بێگانە.

# ٢

## منداڵانی سابڵاخ

من و حەسەن تەنیا شەوەکان دەچووینەوە ماڵ و لێک جیادەبووینەوە، دەنا لە تولحی بەیانییەوە هەتا ئێوارانی درەنگ بەیەکەوە بووین. بوونی حەسەن لە تەمەنی منداڵیدا بۆ من وەک قەڵایەک بوو. لە سەردەمی منداڵیی ئێمەدا، لە شارەکەم زۆربەی هەرە زۆری منداڵان نەدار و کوڕەهەژار و کرێکار و لادێیی بوون. شەڕەجنێو و لێدان و ڕفاندن و جلدڕاندن لەناو ئەو توێژەدا پیشەی ڕۆژانەیان بوو، هەر ئەوەندە لە مەدرەسە و کۆڵان کوڕە نازدار و پاکوخاوێنێکیان دەستکەوتبا، ئیتر سابڵاغی گوتەنی «تەرکی دۆڵەیان» پێ دەکرد، لە هیچ و خۆڕایی بەربینگیان[1] پێ دەگرت و گەڕیان تێ دەهاڵاند، هەتیوباز و سەرسەرییەکان هەراسانیان دەکرد، بە تایبەت گەر فارس و عەجەم بایە.

## گەڕەکی پیاوانی میری، «کوی فەرەح»

شا لە دەرەوەی شار نزیک پادگانی سەربازی، گەڕەکێکی فاخر و مۆدێرنی دروست کردبوو، هەمووی خانووی جوان و ئەورووپایی بوون، وەک ئەو گوندانەی ئەمڕۆ لە شارەکانی باشوور، حکومەت و سەرمایەدارەکان دروستی دەکەن. ئەم گەڕەکە تەنیا و تەنیا بۆ پیاوانی میری بوو، کە زۆربەیان لە ئەرتەشدا بوون و خەڵکی غەیرەکورد بوون، بە کرێیەکی زۆر هەرزان دەیاندرایە، هاتوچۆ تەنیا بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان ڕێگەپێدراو بوو. شوێنێکی زۆر خۆشی شاری گرتبوو، بەرز بوو، دەستی ڕاستی شیو و دۆڵ و بەنداوی شار بوو، شانی

---

١- بەربینگپێگرتن، گەڕپێگرتن، پێشپێگرتن، شەڕپێفرۆشتن.

چەپی دەشــتی پان و بەرینی پادگان و دواتر بەشــێکی ئەم دەشتە کرا بە «خانەی جەوانان»، واتە ماڵی لاوان، لە پشتەوەڕا دەیڕوانییە شاخ و کێوی مەنگوڕایەتی و جادەی سەردەشــت، ڕووەکەشی بەرامبەر شارە جوانەکەی ســابڵاغ بوو، پێیان دەگــوت «کوی فەرەح» و بە ناوی ژنی شــاوە کرابوو، بیرمە کە تەواو بوو خەڵک دەستەدەســتە دووراودوور دەچوونە تەماشای و بە تەنیشتیدا پیاسەیان دەکرد، خانووەکان عەرزەکی و ڤیلایی و یەکقات دروست کرابوون، دەروازەی چوونەژووری هەبوو، یەکەم جار بوو کۆلانی پان و ڕێکوپێکی ئاسفالت و قیرکراومان دەدیت، تا ئەوکات تەنیا یەک دوو جادەی سەرەکیی شار قیر کرابوون و هەموو کۆلانەکان خۆڵ و گاشەبەرد بوون. منداڵی «کوی فەرەح» لە دوورەوە دیار بوون، پاکوخاوێن، جلی جوان، ڕوومەتی سپیوسۆڵ، بە ئیحترام و ئەدەب، جانتای چاک، سەعات لە دەست، کاکۆڵ شانەکراو، بۆنی خۆش و پارە لە گیرفاندا.

منداڵــە ســابڵاغی دەچوونــە دەوروبــەری کوی فەرەح بۆ شــەڕ و گەڕفرۆشــتن، هەر ئەوەندە منداڵێک بە تەنیا دەبوو و دوور دەکەوتەوە لە ماڵ و حەرەســەکانیان، ئیتر منداڵە ڕەشــوڕووتەکانی شــار سواری ســەری دەبــوون و جلکیان لە بەردا تیتۆڵ تیتــۆڵ دەکرد و چیی پێ با بەتاڵان دەچوو. بابی زۆربەی ئەم منداڵانە بەرپرســی باڵای حکومی و ئەرتەش بوون، بۆیە ســەربازەکان دەبوونە حیمایە و تەنانەت نۆکەر و کارداری ماڵەکانیان، منداڵیان دێناودەبرد، لەناو بازاڕ لە کڕینی شتومەک وەک حەمــاڵ بەکار دەهێنــران و لە هاتوچۆکردنــی خانمی ڕەئیس، لە دواوەی دەڕۆیشــتن و جانتایان هەڵدەگرت. قسەوباس لە کەشوهەوا و ژینگەی ســوننەتیی ئەوکاتی شار لەسەر ژن و منداڵی ئەو کاربەدەستە غەیرەکوردانــە یەکجــار زۆر بوو، خانمێکی جوان بە ســەری ڕووت و سینگی کراوە، تەنوورەی کورت یان شەلواری تەنگ، سەربازێکی لاوی جــوان بە دوایــدا، دیار بوو خەڵک چیی دەگوت، بە گشــتی خەڵک زۆر بە ســووکی و بە بێئەخلاق ســەیری ژن و منداڵی ئەوانی دەکرد، وایان

دەزانی هەرچی ژنی گروهبان، ئوستوار، ئەفسەر و سەرهەنگ و... بایە ئـەوە حەتمەن بێئەخلاق و حیـزە، هەڵبەت ژینگەی ئەو ژنانەش ئەوەی دەخواسـت کە وا بن، بە هـۆی کراوەیی و سووراوسـپیاوی[1] زۆر و ئازادییان لەچاو ژنی شار، زۆر سێکسی و حەشەری دەهاتنە بەرچاوی پیاوی ئەوکاتی هیچ نەدیو و تینووی کورد. ئەوە بوو، هەر پێشەکی ئەم ژنە عەجەمانە مەحکوم بوون بە سوک و حیز. بە عام ژنی غەیرە کورد زۆر ئازادتر و کراوەتر لە ژنان و کچانی شار دەژیان و پەیوەندییان بە پیاوان و کوڕان سروشتی و ئاسانتر دەچووە پێش. لە بیرمە ژنی یەک دوو گروهبان و ئەفسـەر ئەوەندە بە زەقی لەگەڵ چەند لاوچاکی شـار دەستیان تێکەڵ کرد، ئیتر لەبەر قسەوباسی خەڵک مەجبوور کران شار بەجێ بهێڵن و ئیشەکەیان بگوازنەوە. بنەماڵە کۆن و سوننەتییەکان زۆر بە کەمی دەیانهێشـت ژن و منداڵیان هاتوچۆی ئەم خێزانە ئەرتەشییانە بکـەن. ئێمەی منـداڵ و مێرمنداڵیش هەر بەم دید و بۆچوونە سـەیری کوڕە جوان و لووسـکەکانی ئەوانمان دەکـرد، کەم نەبوون کوڕی ئەم دەرجەدار و کاربەدەسـتانەی ئەرتەشی شا، کە لە سابڵاغ بە زۆر حیز کران و منداڵە سابڵاغی بە زۆر سواریان دەبوون.

### شەڕی کورد و عەجەم

سەردەمێک هەر ئەم ساڵانە کە پۆلی حەوت و هەشت بووم، بیرمە لەناکاو شـەڕی گەورەی کورد و عەجەم هەر لەسـەر ئەم کارانە ساز دەبـوو، لە باخی مکائیل، لە میانـدواو چواررێی کەریم جووجوو دەیان شەڕی قورس لەنێوان پیاوان و گەنجانی شاردا لە لایەک و گروهبان و پیاوانی میری لە لایەکی دیکە کرا و بریندار و سەقەتبوونی لێ کەوتەوە. خەڵکانـی وەک محەمەد کانەبی و عەلی دەروێشـی بووبوونە پاڵەوانی لاوانی سابڵاغ لە شـەڕی دژی عەجەمان. هەڵبەت چەند خانەوادەیەکی ئـازەری، بەهایـی و جوولەکە و مەسـیحی لە دێرزەمانـەوە هەبوون،

---

١- سووراوسپیاو، ئارایش و مێکاپی ژنان.

لەگـەڵ خەڵكی سـابلاغ وەک خوشـک و برایان لێ هاتبوو و بەشـێک بوون لە سیما و كولتووری شارەكە، هەرچەند بە هۆی سیاسەتی هەڵە و دەمارگرژیی چەند كەسێک، زۆربەی ئەوانە لە ترسان دوای شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩دا سابلاغیان جێ هێشت.

لەپەنا كوی فەرەح، ڕێک لە جەمسـەری جادەی سەردەشت لەسەر تەپۆڵكـەی قەراخجادە، دارێكی كۆن هەبوو بە تاقی تەنیا، پێیان دەگوت «تاقـەدار»، نازانـم مابێت یان نەمابێت، بەڵام دیارە پێش سـەردەمانی ئێمـەش ئـەم دارە بووەتە جێـی گفتوگۆ و باسـی تەنانەت شـاعیر و سیاسـی و شۆڕشـگێڕانی شـارەكە، چەند قەبری لێ بوون، دەیانگوت ئەسحابە، یان عەجەمی لێ كوژراوە.

تاقەدار جاران دەیڕوانییە سـەر پردی سوور و ئێستاش دەڕوانێتە سـەر بەنداوی شـار. بەرسـێبەرەكەی جێی ڕاز و نیاز و دەردی دڵی لاوان و خەڵكی تریش بوو، هەبوون بە دزییەوە دوو پیاڵە عەرەقیشیان لـە بن سـێبەری هەڵدەدا و بـەدەم گۆرانیگوتن و قەتـارەی ماملێیەوە بەرەو شار خلۆر دەبوونەوە.

### گۆڕی جوولەكەكان

لەگەڵ حەسـەندا زۆر جار بەرەو مەڵبەنـدی كوی فەرەح و تاقەدار هەڵدەكشـاین، ماڵی حەسـەنی هاوڕێم لە تەنیشت كەلاوەیەک بوو زۆر دوور نەبـوو لـەوێ، چاكـە چكۆلـە مەرقەدێک بوو، بە ئـاڵا و پەڕۆی شـڕ و كەسک و سـپی و دەرزیلەوە، گەڕەكەكەش هەر ناوی گەڕەكی چاكەچكۆلە بوو. ماڵی حەسـەن بە تەنیشـت چاكەكەوە بوو. حەسـەن كورتەباڵا بوو، پتەو و ماسـولكەكانی بەهێز بوون، مسـت و پەنجەی دەسـتی وەک كوتـک وا بـوو، هەتـا بڵێی نەتـرس و ئازا بـوو، منداڵ دەرەوەستی نەدەهاتن، جارجار بە دزییەوە جگەرەی دەكێشا.

لـە پۆلـی حـەوت و هەشـت بووین، ڕۆژێک لـە وانەی علـوم واتا زانسـت مامۆستا باسی فوسیل و پاشماوەی زیندەوەرانی كۆن و بەرد

و شــتی وای بــۆ دەکردیــن، گوتــی هەرکەس بگەڕێت و شــتێکی کۆن و پاشــماوەیەکی مێژوویــی بدۆزێتــەوە و بیهێنێت بۆ مەدرەســە نمرە وەردەگرێــت. گوتم حەســەن بچین بۆ کوێ؟! با شــتێک بکەین لە هیی هەموان باشــتر بێت. لە وانەکاندا حەســەن زۆر تەمەڵ بوو و گوێی پێ نــەدەدا، بــەڵام بۆ گەڕان و چوونی شــاخ و قەراغ چەم و ئاو ســەری پێــوە نەبــوو. دوانیــوەڕۆی پێنجشــەممان زوو بەڕەڵایــان دەکردیــن، حەســەن گوتی، لە داوێنی شــاخی خەزایی لە باکووری شــار، قەبری زۆر کۆنی لێیە و دەڵێن هیی جوولەکەکانە و هیچ گوناحیشمان ناگا، با بچین بە دڵنیاییەوە شــتی زۆری لێیە. تەدبیری نەدەویســت و بە پاچ و پێمــەڕەوە وەڕێکەوتین. چووینە ناو قەبرە کۆنەکان و گەڕاین، گۆڕێکی زۆر کۆن و ســافەوەبوومان دیتەوە، کۆڵیمان و دامانەوە تا گەیشــتینە کۆمەڵێک ئێســقان، ڕێک وەک ئەوەی پێمان دەگوت ئیسکلێت، هەمانبوو لــە تاقیگەی مەدرەســە لە پلاســتیک. شاگەشــگە بووم لە خۆشــیان و ترســێکیش ســەراپای داگرتبووم، بەڵام بوونی حەســەن و گوێنەدانی بە ترس و ڕۆح و ئەم شــتانە، غیرەتی وەبەر دەنام. تەلیســمان هێنا و زۆر بە وردی و سەرەخۆیی هەموو ئێسکەکانمان هەڵگرتن، چووینەوە شــار و لە ماڵی حەسەن شــاردمانەوە، ڕۆژی خۆی بردمان بۆ وانەی علوم، لەســەر مێزی تاقیگە ئێســقانەکانمان ڕێــک وەک خۆی چنێوە و ڕیزمان کرد، مەدرەســە و مودیر و مامۆستاکان هەمووی هاتبوون بۆ تەماشا، ئیسکلێتەکەی حەسەن و عەلی شوێنی تایبەتی گرت لە تاقیگەی مەدرەسە و بە هەر کاممان نمرەی بیستیان پێ داین، کە یەکەم ڕوتبەی مومتاز بوو. حەســەن بە ژیانی بیســتی وەرنەگرتبوو، گوتی لە ماڵەوە خۆ کەس باوەڕم پێ ناکات!

### تاقیگە بچووکەکەی ژێرخانەکە

ژووری ژێرخانەکــەم لــە ماڵــەوە هەر دەهات و ئاوەدانتر و شــتی سەیروســەمەرەی لێ دەردەکەوت، لە کەســوکار کەمتر دەیانوێرا بێنە

ئەویّ، حەسەنم دەبرد و زۆری یارمەتی دەکردم لە کۆکردنەوەی شتە عەنتیکـەکان، مجریّکم[1] بوو سـەری دادەخـرا و قفلّم لیّ دابوو. مجری عەلی، سەری مارومیّرووی تیّدا بوو، بۆ کەس زاتی وەی دەکرد بە لایدا بچیّت؟! لاشـەی مار و دووپشک و جرِوجانەوەری دی، لەناو شووشە ئەلکهوولانـدا بـوون. منداڵیّکـی لەبارچـووی پیّنجشـەش مانگانـەم لە کەلاوەی پشت شیّرە خورشید، تاقە خەستەخانەی شار، دۆزیبووەوە و لە بانکەی[2] شووشەیی پڕ لە ئەلکهوولم نابوو، پیّیان دەگوت منداڵەکەی عەلی. کارەبام بۆ ناو ژیّرخانەکە ڕاکیّشابوو، لە سەریّ هەڵدەبوو، دەکرا لـە خواریّـڕا بیکوژیّنیەوە، یان بـە پیّچەوانەوە. دەیـان تابلۆی کارەبام هەبـوو، هەریەکـە خەریتەیەکـی تایبەت و جیاوازی هەبـوو، لە وانەی فیزیادا تیّلگرافی مۆرسـم بە وایەر و بزمار دروسـت کردبوو، ئەلفوبیّ واتا خەت و نوقتەی تیّلگراف فیّر بووبووم، بە کاغەز و تۆپی گەورە و بچووک و گلۆپی کارەبایی مانگگیران و خۆرگیران، کسـوف و خسوفم بـۆ ئەندامانی، ماڵ بە تایبەت بابم نمایش دەکرد، لە سـەردەمی وانەی جەدوەلی مەندەلیوف و هەژماری کانزا ناسراوەکانی سروشت وا بزانم ١٠٤ دانە، یان زۆرتر بوون، زۆربەی ئەوانەی سـەرنجیان ڕاکیّشابووم پەیدام کردبوون، بۆ نموونە سۆدیۆم (Na) وەک نەرمترین کانزا ئەگەر لەگەڵ ئاودا تیّکەڵ بیّت، هیدرۆژیّنەکانی ناو ئاوەکە ئازاد دەکات و ئاگر و تەقینـەوە ڕوو دەدات، وەک پەنیرە و بـە ڕەنگی کریّمییە و بە چەقۆ لەت دەبیّت، لەناو نەوتدا ڕایدەگرن و لە هەوای ئازاد ڕەش دادەگەڕیّت، یان مس (Cu) کە توانای تواندنەوەی ئاسانە، قاڵبی ویّنەم دیّنا و مسم دەتوانـدەوە و تیّم دەکرد و شـتی جوانی مسـیم لیّ دروسـت دەکرد، جیـوە (Hg) تاقـە کانزا بوو کە حاڵەتی ئاوەکی هەبـوو، لە لوولەیەکی بچووکی کاغەزم دەکرد و لەسـەر لەپی دەسـتم دەمجووڵاند و خەڵکی

---

١- مجری، سندووقی بچووک لە تەختە دروست دەکرا.
٢- بانکە، شووشـەوات بۆ ڕاگرتنی ویشکە و شـلەمەنی، وەک بەرمیلیّکی بچووکە.

پێ قوشـقی دەبوو، ئەگەر بە دەوری قەڵەمێکدا بە کاغەزی ناو پاکەتی جگـەرە، یـان ئەلەمینیـۆم لوولەیەکی بچووک دروسـت بکەیت و یەک دڵـۆپ جیـوەی تێ بکەیت و سـەری بگـری، لوولەکە هـەر بە کەمێک جووڵـە هەڵبەزودابـەز دەکات وەک سـەماکردن، گۆگـرد (S)، بۆنێکی ناخـۆش و توانـای تەقینـەوە و ئاگرکردنەوەی هەبـوو. مجری عەلی، ئەنواعی تێزاب (ئەسـید) و شـلەمەنیی تێدا بوو، بەیەکەوە تێکەڵوپێکەڵم دەکردن، هەڵمی سەوز و ڕەنگاوڕەنگم لێ دروست دەکردن، وردەئاسن و شـتم تێ دەکردن، دەتوانەوە. دوای گەڕان و حەولێکی زۆر ڕۆژێک هێندەی کلۆشەکرێک سۆدیۆمم لە دەرمانخانەیەکی کۆنی شار بە هەزار تەمەننا و پاڕانەوە کڕی، لە شووشەیەکی پڕ لە نەوتدا لە مجرێ بۆرەدا هەڵمگرت، ئێوارەیەک بابم ماندوو هاتبووەوە نان و ماسـتی شـەوانەی خواردبوو، خەریکی ڕادیۆ و گوڵەبەڕۆژەخواردن و چاخواردنەوە بوو، مەلافەیەکیـان[1] ڕادەخسـت و لە دەوریـدا گوڵەبەڕۆژەیان دەترووکاند و توێکڵەکەیـان فڕێدەدایە ناو مەلافە، یان سـفرەکە، چووم سـۆدیۆمم هێنـا و گوتم بابە ئێسـتا جـادووت بۆ دەکەم، گوتـی دادەی بزانم چی دەکەیـت؟ لێوانێکـم ئاو هێنا و گوتم ئەوە ئاوە، سۆدیۆمەکەشـم لە ناو شووشـە پـڕ لە نەوتەکە هێنا دەر و بە چەقـۆ هێندەی لەتکەنۆکێکم لێ بڕی و گوتم پەنیرە، دەسـتم کرد بە دەسـتجوولاندن و «حەجی مەجی لاتەرەجی»[2] و سۆدیۆمم لە قاپە ئاو هاویشت و گڕی گرت و دەستی بـە هەڵبەزدابـەز و هەڵم کـرد، بابم هەزار جاری گوت یـا ئەڵا یا ئەڵا، ڕووی بابت ڕەش بێت عەلی، ئاخری تووشـی فەتەڕاتێکمان دەکەیت و هەلاتم بۆ ژێرزەمینەکە.

---

١- مەلافە، چەرچەف و بەرگەدۆشەک و لێفە.
٢- حەجی مەجی لاتەرەجی، چەند وشەیەکی لەم چەشنە بوون لە حکایەت و داستانە کۆنەکان، جادووگەرەکان دەیانگوتنەوە.

## ڕۆحکێشانی باوکم

زۆرم حەز لە ڕادیۆشکاو و میکرۆفۆن و بڵندگۆ و ئەم شتانە بوو، ڕادیۆیەکم لەسەر پارچەتەختەیەک دروست کردبوو، ڕادیۆکەی ناوشاری دەگرت، بابم پیاوێکی زۆر خوداناس و پاک و بێگەرد بوو، سەری چووبا نوێژ و ڕۆژوو، یان تەراویحی مزگەوت و نوێژی جومعەی مزگەوتی سووری شاری نەدەچوو. هەرگیز جگەرەی نەکێشا و عەرەقی نەخواردەوە، قوماری نەدەکرد و پێی حەرام بوو، کەچی زۆر زووش لە تەمەنی ٥٩ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. ئێوارەیەک ویستم تووڕەی بکەم و بیترسێنم، هەر بۆ گاڵتە و پێکەنین، چەند ڕۆژ بوو خەریک بووم سیمی زۆر تەنک و باریکم لە کۆنە دینام و ترانسی ڕادیۆ و شتی کارەبایی پەیا کردبوو، ڕامکێشابوو بۆ ژووری نوستنی باوکم، کە لەوسەری ژوورەکانی دی بوو، وایەرم هێنابوو بەناو کەلێنە دیوار و ژێر فەرش بۆ ژووری میوانان لەوسەری ماڵ، کە زۆربەی کات داخرابوو، تەنیا لە ڕۆژانی جێژن و هاتنی میوانی موهیم و گەورەدا دەکراوە، پڕ بوو لە شتی جوان و شیرنی و ئاجیل[1] و گەز و خواردنی خۆش. سەری وایەرەکە لە ژوورەکەی باوکم بڵندگۆیەکی بچووکی ڕادیۆی دەستیم لێ بەستبوو، سەرەکەی دیکەم لە ژووری میوانان بە سیستمێکی دەنگی و مایکێک ئامادە کردبوو، شەو هات و نان خورا و مەجلیس و قسە و فشقیاتی ماڵبات دەستی پێ کرد و منیش وەک لەسەر ئاور بم، حەجمینم[2] نەبوو، پەلەم بوو باوکم بچێتە ژووری خۆی بۆ نوستن. بابم زوو دەنوست و جەماعەتی بەدیار تەلەفزیۆن و قسەکردن جێ دەهێشت، هەر ئەوەندە باوکم ڕۆیشت و دەرگای ژووری خۆی داخست، منیش خۆم دزییەوە و چووم بۆ ژووری میوانان، کەرەسەی موئامرە و تۆقاندن هەمووی ئامادە بوو، وردەوردە زانیم باوکم خەریکە خەوی لێ دەکەوێت، مایکم هەڵکرد

---

١- ئاجیل، چەرەزات، تێکەڵەی پستە و بادام و تۆکولەکە و ویشکەی تر.
٢- حەجمین، ئۆقرە و قەرار، ئارام بوون.

و بــە دەنگێکــی زۆر بــۆڕ گوتم: «های! هــای! برایم! برایــم! ئامادە بە هاتووووووم بۆ ڕۆۆۆۆحکێشــانت». هەر ئەوەندەم زانی هەرا ساز بوو، باوکم بە دەرپێی کورتەوە خۆی لە ژووری دانیشــتن هاویشتبوو، هــاواری کردبوو یەکێک لــە ژوورەکەیدایە و هاتووە بۆ ڕۆحکێشــانم. زۆر ترســا بــوو، دایکم و کاکم و جەماعــەت گوتبوویان هیچ نییە، کار کاری عەلییە و چووبوون بڵندگۆکەیان دیبووەوە و بە بابمیان نیشــان دابوو. ئیتر پڕ بەو ماڵە بابم دەیگوڕاند؛ ســەگباب عەلی، ڕووی باوکت ڕەش بــێ عەلی! زۆر زوو لەگەڵمدا ئاشــت دەبووەوە و دواتر دەیگوت ئەوە چۆنت دروست کردووە؟!

### ژیانی دێ

کاکم و من ئەوکات وەک برا گەورە و برا بچووک بووین، عەتفێکی تایبەتی بۆم هەبوو، خۆشــی دەویستم و هەمیشە هانی دەدام بۆ کاری عیلمی و خوێندن و کەم وا بوو لێم بدا و شەڕم لەگەڵدا بکات، دواتر کە گەورە بووم و چووم بۆ تەورێز و خوێندن و دواتریش سیاســیبوونم و چوونی شــاخ و هەندەران، زۆرتــر وەک دوو هاوڕێ بووین تاوەکو کاک و برای بچووک.

ئــەوکات باوکم دوو دێــی لە ئاغاکان بە ئیجارە وەرگرتبوو، زۆر لە شــار دوور نەبوون، یەک دوو ســەعاتەڕێ بوو بە ســەیارە و سواری ولاغ. گەنم، جۆ، چەوەندەر و گوڵەبەڕۆژە حاســڵی عەرزەکانمان بوون، ڕانەمەڕ و گاڕان، تراکتۆر و شــۆفێرمان هەبــوو. هاوین و پاییز کاری ئــەم دێیانــە یەکجار زۆر بــوو، کاکم زۆری حەز بــە خوێندن نەدەکرد و هــەر نەچــوو بۆ زانکــۆ، زۆری حەز لــە دێ و کاری جوتیاری بوو. هاوینــان زۆربــەی کات لەگەڵ بابم و کاکم، پێم خۆش بوو بچم بۆ دێ و لەگەڵ سروشــتدا ئاوێتە بم. مەڕداری و ئەسپســواری هەرگیز لێیان ماندوو نەدەبووم، بە سەعات و دوان بە تراکتۆرەکە و جەنجەڕی تازە و ئاســن، گێرەی گەنمم دەکرد و لەمســەری مەزرا بۆ ئەوســەر گاسن

بە دوامدا، عەرزم دەکێلا، سـەید حوسـێنی شۆفێرمان کە من دەچووم دەحەسـاوە، لەبن شـۆڕەبییەکان بەدەم جگەرەکێشـان و چای کتریی ڕەشە بۆخۆی خەو دەیبردەوە و زوو زوو دەیگوت: «بەخوا ئەم میرزا عەلییە نیعمەتە بۆ ئێمە»!

حەز و خولیای من بۆ سروشـت و کار لەگەڵ جوتیار و مەڕداری، تەمەنـی مێرمنداڵیـی منیان گەلێک دەوڵەمەند کـرد و هاوینەکانی پۆلی حـەوت و هەشـت و نۆ، زۆربەی هـەرە زۆری لە دێ و لەناو خەرمان دەنوسـتم و تا بەری بەیانیان لەگەڵ کوڕەجحێڵان و کیژۆڵانی لادێ لە گەڕەلاوژە و قسەی خۆش و پێکەنین و یاریکردن ماندوو نەدەبووم.

خۆشـترین کاتـم ئەو کاتانە بـوون بەرەو پاییز، کـە خەرمان بە با دەکرا و سوور دەبوو، یان بەران تێ بەردەدرا.

ئەوکات کۆمباین یان دەڕاسـە بۆ گەنـم و جۆ دروونەوە زۆر کەم بـوو، مەڵەغان و داس هەبوو، ئیش بە هەرەوەرزی[1] دەکرا، هەر ڕۆژە هەمـوو پیاوانـی دێ یارمەتیی ماڵێکیان دەکـرد و دروێنە یان خەرمان و شـەنکردنەکەیان بـۆ تـەواو دەکرد. کاتـی دروێنەکردن، بـە دەیان پیـاو بـە مەڵەغـان و داس دەهاتـن و بـە گۆرانی و لاواندنـەوە، گەنم و جۆکەیـان دەدروو و باقەباقـە جێیـان دەهێشـت. کابـان و ژنان بە ئاگر و دار چێشـتیان لێ دەنا، مەسـرەفی ئەم بەشـە هەمووی لەسەر شـانی سـاحێب دەغڵ بوو، دواتر هەموو ئەم باقانە بە عارەبانەی کەڵ و گامێـش دەهاتـەوە نزیـک دێ و مەیدانچەیەک هەبوو لـە قەراغ دێ پێیان دەگوت جێخەرمان، لەوێش جۆخین[2] دەکرا، ئەم کلۆشە هەمووی لـەم جێخەرمانە وەک شـاخێک کۆ دەکراوە، ئـەوەی هەیبا بە تراکتۆر و ئـەوەی نەشـیبا بـە ولاغ و گوێدرێژ و جەنجەڕ گێـرە دەکرا، دەبوو بـە کا، دەنکـی گەنم و جۆکەش لە کلۆشـەکە جیا دەبـووەوە. ئەوجار چاوەڕێی بای شەماڵ بوون و شەنەکان ئامادە بوون بۆ بەباکردن. ئیتر

---

١- هەرەوەن، کارکردنی بەکۆمەڵ و بەیەکەوە.
٢- جۆخین، کلۆشی گێرەکراو، خەرمان.

وردەوردە کایەکە بە زەبری با دوور دەکەوتەوە و گەنمێکی سـوور لە ئاست خۆی دەردەکەوت و دەیانگوت خەرمان سوور بووە. دڕوویەکی پیـس هەبوو ناوی نووسـەنەکە بـوو، جیاکردنەوەی لـە گەنمەکە زۆر زەحمەت بوو، ساڵ هەبوو زۆر بوو، دەبوو بە کەو یان داژگیر[1] جا بە قوونەکەو[2] با یان باڵەکەو[3]، هەموو دەغڵەکە پاک بکەنەوە. بۆ پێوان و زانینی کێشـی حاسـڵەکە جەعبەیەک هەبوو پێیان دەگوت کیلە، پوتێکی دەگرت، نزیک بە شانزە کیلۆ.

ئـەوکات پـارە لە دێهـات زۆر نەبوو، بەڕاسـت خەڵـک فەقیر بوو، پاییزان چەرچی و دەسـتگێڕ بەناو دێهاتاندا بە گوێدرێژ دەسووڕانەوە و شـتومەکی وەک پارچە، نوقڵ، پێداویسـتیی ژنان، گوێزان، زەنگیانە، قاپوقاچاغی شووشـە و سـووراحی و شـتی ناوماڵیان پێ بوو. ئەمانە بە پارە نەبوون، هەر لەسـەر خەرمان لەگەڵی دەسـازایت و لەقەرا ئەو شتانەی دەتویست کیلەیەک یان دوو یان چەند کیلەت گەنم پێدەدا، واتا کاڵا بە کاڵا ئیشی خۆت ڕایی دەکرد.

### بەرانتێبەردان

شتێکی تر کە زۆرم حەز لێ بوو، بەڕاستی کەیفم پێ دەکرد هەر لە سەرە پاییز، بەرانتێبەردان بوو.

قەدیـم دوای مەڕزانـێ لە نەورۆز بەران لـە ڕان دوور دەخرایەوە، هەتا پاییز، لە پاییز ئیتر مەڕ بەرانی دەگرت و ئاوس دەبوو.

ئەوکات لە سابڵاغ هەم دەباغخانە هەبوو لە گەڕەکی باخی سیسە و هەمیش دوکانی خمگەری، هیی دوو برای زۆر بەڕێزی کۆنی شارەکە، لەناو بازاڕ بوو. ئەوانە لە ناو مەنجەڵی زۆر گەورەدا، خمیان دەگرتەوە و خوری یان بەنەکانیان کە تەشی کرابوون تێ داویشت و دەکوڵاند بە

١- کەو، داژگیر یان داشـگیر، جۆرێک لە بێژنگ و سـەرەند، یان هێڵەگن، گەنم و جۆی پێ خاوێن دەکەنەوە.
٢- قوونەکەو، کەوکردن بە دانیشتنەوە.
٣- باڵەکەو، کەوکردن یان داژگیردانی دەغڵ بە پێوە.

ئەنواعی ڕەنگ. دەچووم بۆ لایان و یەک دوو پیاڵە خمی شین و سوور و کەسکم لێ وەردەگرتن.

دەهاتمەوە دێ و چەند بەرانێکمان بوو زیاتر لە پێنج بۆ شەش مانگ بوو، لە ڕانەمەڕەکە دوورخرابوونەوە، مەڕ زۆرتر لەگەڵ شوان لە کوێستان و دەرەوەی دێ بوون، ئێواران دەهاتنەوە نزیک دێ و بێری دەیاندۆشین، نان و پێخۆری شوان و سەوڵەی[1] سەیەکانیان لە خورجێنی شوان دەنا و بەڕێیان دەکردنەوە بۆ شاخ. بەرانەکان هەر لەناو دێ بوون و منداڵێک بۆ ئاودان و گەڕان هەر لە دەوری دێ دەیجووڵاندن و دابەستەیان دەکردن بۆ بەهێزبوون، جا بەڕاستی بەهێز بوون و زۆر کەڕەت بە شاخ و کەللەی سەریان لە خەڵکیان دەدا.

بەرانەکانمان بە خوم[2] دەرەنگاند و جوانمان دەکردن، بە کوردی ئامادەی زاوابوونمان دەکردن. شوان لەناکاو لە ڕۆژێکی خۆشی مانگی ڕەزبەر، لە دوورەوە بە ڕانەمەڕەوە لە مەزرا پەیدا دەبوو، بەرانەکان هەر کە مەڕەکانیان دەدی سمکۆڵیان دەکرد و حەجمینیان لێ دەبڕا، دەبوو لە ناو چیغدا ڕایانگرین، بۆ ئەوەی بەرەو ڕانەکە هێرش نەبەن. شوانیش بە خۆی و بە سەیان، پێشی مەڕەکانیان دەگرت تێکەڵی بەرانەکان نەبن، تاکو ساحێب ڕان خەڵاتێکی باشی بۆ نەنێرێت، سەرەنجام دەبوو دەستێک کەواوپانتۆڵ، یان پێڵاو و دیارییەکت بۆ ناردبا و ئەویش پێشی مەڕەکانی بەردەدا. دیمەنی هاتنەخواری بە غاری مەڕەکان لەمسەرەوە و بەربوونی بەرانەکانم، بە هەڵتۆز[3] و ڕاکردن و بەریەککەوتنیان هەرگیز بیر ناچێتەوە. لە ماوەی کەمتر لە چەند خولەکێک هەر بەرانەی بە دەیان مەڕی بەردەکەوت و لەگەڵیاندا جووت دەبوو. مەڕی کوردی دوگێکی قورسی لە جێی کلکی هەیە و

١- سەوڵە، لە ورکەنان و ئاردی پیس و دانەبێژراو، کولێرەی ئەستووریان بە تەندوور بۆ سەگان دروست دەکرد.
٢- خوم، یان خم، هەش، گیایەکە بەنی پێ شین دەکەن.
٣- هەڵتوز، هەڵبەزدابەز و تەپوتۆزکردن، «هەتا بەرغەل بەهاران بچنە ناو کۆز هەتاکو کارژیلە بکەن هەڵتۆز هەڵتۆز» دیوانی سەیفولقوزات.

ئەندامــی زاوزێــی پێ دەشــارێتەوە، کەچی ئەم بەرانە دوو دەســتی لە پشــتی مەڕەکە قایم دەکرد بە حەرەکەتێکی زۆر وەســتایانە بە کەللە و ســینگی خۆی دوگەکەی بۆ لای ســەروو دەبرد و یەکەندەردوو کاری خــۆی لەگەڵ مــەڕی تازەبووک بە ئەنجام دەگەیانــد. ئیتر ئەم مەیدانی عیشق و عاشقی و جووتبوونە، سێ چوار سەعاتی دەخایاند. ژن و پیاو و کــوڕ و کچانــی لادێ لە دەوریان بە حیلکــە و پێکەنین و چاوداگرتن زیاتر لە بەران و مەڕەکان کەیفیان دەکرد، ڕەشــبەڵەک ســاز دەبوو و دەستگوشــین و خۆ لە قۆل و ڕانخشــاندنی کیژۆلان، هەر بۆ ئێوارە و یــەک دوو ڕۆژ دواتــر چەنــد خوازبێنی و مارەکردنی لــێ دەکەوتەوە. پاییزانە و کاتی بەران تێبەردان جەنگەی ترێ بوو، دەبوو ســاحێو مەڕ یان ئاغا بە سەوەتان ترێ بکڕێ، یان بێنێت و خەڵک بیخۆن.

دوای ئــەم ئێوارەیە و ماندوو و شــەکەتی کاکی بــەران، ئاخر هەر کامەیــان دە بۆ پانزە مەڕی بەردەکەوت، ئیتر لێک جیا نەدەکرانەوە، لە بەفرانبار و لە بیدایەتی چلەی بچووک خاوەن مەڕ دەیزانی چەند مەڕی بەرانــی گرتووە. لە ئاخروئۆخری ڕەشــەمە، ســەرەتای نــەورۆز مەڕ دەســتی بەزان دەکرد و دە دوانزە ڕۆژ دواتــر بەرخۆڵەکانیان دەبردە دەشت و ئیتر ڕێک سێزدەبەدەر و کاتی سەیران و بەهار بوو.

یەک لەو شتانەی دوای زیاتر لە پەنجا ساڵ بیرم ناچێتەوە، شەوانی ســەرخەرمان و قیڕاندنی بۆق و جریوەی سیســرک و مانگەشەو بوو. لەناو کادا نوســتن و بانگی بەیانــی خەوەربوونەوە بە دووکەڵی تەپاڵە، بۆڕاندنی مانــگا و گاڕان، خوێندنی کەڵەباب، زەڕینی گوێدرێژ، وەڕینی سەگەل، ئەم ژیانە سادە و بێریاییەی لادێی کوردستانم زۆر لە لا خۆش بوو. جارجار لەگەڵ کوڕان و پیاوەکاندا، کە هەموویان تووتن و پەڕیان پێ بوو و ســیغاریان دەکێشــا، منیش دەستم بۆ دەبرد و دەمپێچاوە و دەمکێشــا، کەسیش لای بابم یان کاکم باسی نەدەکرد، ئەوە دەستپێکی سیغارکێشــانم بوو، بۆ ماوەی ٤٠ ســاڵ یەک پشــوو کێشــام و بە دڵ لەزەتم لێ دەبرد، تاکو لە ئایاری ساڵی ٢٠١٦دا و ڕێک دوای چل ساڵ،

بە هۆی ئەوەی لە هەموو شــوێن دەنگیان دەدایت و ئیتر حورمەت بۆ جگەرەخۆر لە کوردستانیش نەدەما، لەناکاو دامنا و هەرگیز دەستم بۆ نەبردەوە.

## ٣

### سیستمی خوێندن

لە پۆلی هەشــت بۆ نۆ شــا سیســتمی خوێندنی گــۆڕی و گوتیان، دەیکەنــە نیزامی فەرەنســی. لــە پۆلی هەشــت تاقیکردنــەوەکان کرانە سەرانسەری و زۆر توندیان گرت. جاران کە دەچوویت بۆ دەبیرستان ســێ هەڵبــژاردەت هەبوو: ڕیازی یــان ماتماتیک، تەبیعی یان زانســت، ئەدەبــی. زۆر بــە هەڵــە سیســتمی پەروەردە خــۆی وای لــێ هاتبوو، خوێنــدکاری زرنگ بــۆ ڕیازی و کەمێک خوارتر بــۆ تەبیعی و ئەوانی تریــش لە ئەدەبی خۆیــان دەگرتەوە! بۆ هــەر کام لەوانەش تەنیا یەک دەبیرســتان هەبــوو، ڕیازی لە خــوار گەڕەکی ئێمە بوو، دەبیرســتانی محەمەدڕەزا شــا، تەبیعی لە جادەی وەفایی، دەبیرســتانی پەهلەوی و ئەدەبی لە داوێنی داشــامەجید، دەبیرستانی ئیبنی سینا بوون. دانشسرا هەبوو بۆ بوون بە مامۆستا، دەبوو کوڕان بچنە ڕەزائییە، یان خۆیە.

ئەو ساڵە کە من دەبوو داهاتووی خۆم بۆ خوێندن دیاری بکەم، نیزام گۆڕا و چەند لقوپۆپی دی لێ بووەوە، لە ڕاستیدا هەڵبژاردە بۆ خوێندکار زیاد کرا. خوێندنی عەمەلی وەک دارتاشی و لوولەکێشی، کارەبایی و ئەم پیشانەی ناوبازاڕ هاتنە ناو بواری خوێندن لە هونەرستانی سەنعەتی و دوای دوو ساڵ خوێندکار دەکەوتنە ناوبازاڕ و کارکردن.

لە پۆلی هەشت سەرکەوتوو بووم و بۆم هەبوو هەرچی پێم خۆش بێــت بیخوێنم و بــۆ هیچ کام لەم هەڵبژاردنانە بەربەســتم نەبوو. کاکم هاوڕێیەکــی بــوو، ماڵیان لــە تاران بوو، لــە کۆنکــوور، تاقیکردنەوەی سەرتاســەری لە خوێندنی پزشــکی وەرگیرابوو. هاتبوو بۆ ســەردانی کاکــم و باس هات گوتــی حەیفە عەلی لەم گێــژاوەی خوێندنی نیزامی نوێ ســەری لێ بشــێوێت، با بێ دەبیرســتانێکی زۆر بەناوبانگ هەیە

نـاوی ئەلبـوورزە[1] و بە دڵنیاییەوە ئەم نمرانـەی عەلی قبووڵ دەکەن و داهاتـووی زۆر باش و سـەرکەوتوو دەبێت. ئەمە چووە ناو مێشـکی کاکم و دواتر بە پەلە تا هاوین مابوو بەڕێیان کردم بۆ تاران.

### تاران لە یەکەم بینیندا

عەلی تەمەن پانزە ساڵ وەک گوندییەک بۆ یەکەم جار خۆی لە تاران دیتەوە. بە یارمەتیی دۆسـتەکەی کاکم و براکانی چووم بۆ دەبیرسـتانی ئەلبـورز و ناونووسـینم کرد، هاویـن بوو چەند حەوتوویـەک مابوو بۆ دەسـتپێکی خوێندن. لەگەڵ برایەکی ئەو دۆسـتەی کاکـم کە هاوتەمەنی خۆم بوو، بە ناو شـاری تاراندا دەگەڕاین. هەموو شـت بۆ من تازە بوو، هـەر ملم دەسـووڕاند و سـەرم سـووڕ مابـوو لەم هەمـوو ترۆمبێل و چێشـتخانە و شـەربەتی میوەی خۆش، یەکەم جارم بوو شیرمۆز بخۆم، زۆرم پێ خۆش بوو، بینای بەرز و چەندقاتم نەبینیبوو، پلیکانی کارەبایی و ساختومانی پلاسکۆ وڕ و گێژیان دەکردم، کچە ڕووت و مینیژووپلەبەر و زۆڵەکانـی تارانـی جـەرگ و هەناویـان دێنایە دەر. ئەوەی لە هۆشـم نەمابوو خوێندن و حەز بە خوێندن بوو. لە یەکەم تاقیکردنەوە کەوتم و لە مێرمنداڵێکی بەدفەڕی زیت و وریاوە بوومە منداڵێکی شەرمنی فەقیرۆکەی گاڵتەپێکراو. کە دەسـتم کرد بە چوونی ئەلبورز، دیتم هەموویان بە جلی جـوان و ترۆمبێلی گران، شـۆفێر دەیانهێنێت و دەیانباتەوە، لە پشـووی وانەکان لە حەوشـە، کەس نامدوێنێت و لەگەڵمدا ناوەسـتێت، عەلی وەک مۆمێک دەتوایەوە، وەک گوڵێک سیس و کز دەبوو، ڕۆژگارێکی ناخۆش و پڕعەزاب و خۆبەکەمزانینم هەبوو، منداڵە دەوڵەمەند و وەزیر و مودیری تاران هەمووی لەم دەبیرسـتانە بوون، منیش گوندی و لادێیی. زۆر زوو زانیم هەڵناکەم، بەس چۆن بێژم دەگەڕێمەوە، دوای ئەو هەموو مەسرەف و پۆز و خۆڕانانی دایک و باب و خوشک و برا، عەلی لە تاران و ئەلبورز دەخوێنێت، چۆن دەرباز دەبم لەم کارەسات و گێژاوە؟!

[1] - ئەلبورز، بەناوبانگترین خوێندنگەی ئامادەیی ئێران بوو لە تاران.

**دەستپێکردنەوەی خوێندن لە سابلاغ**

هەرچۆنێـک بوو، هاتمەوە سـابلاغ و لە بەشـی ڕیـازی- فیزیک لە دەبیرسـتانی محەمەدڕەزا شـا وەرگیرام، ئەو سـاڵە بۆ من هەر چاک نەهات. ئیتر گەورە بووبووین و لە قۆناغی دواناوەندی بووین، هەموومان سەرمان لە زۆر شت دەخورا، هاوپۆلەکان زۆربەی یەکترمان دەناسی و پێشـتر هاودەورە بووین، هیی تازەشمان بوو. چەند کەسێکمان زۆر حەزمان لە چوونی شاخ و کێو و ناو ئەشکەوت و دەر و سەحرا بوو. کۆڵەپشـتیمان شـەوانە سـاز دەکرد، لە کترییەڕەشـە و نان و پێخۆر، شـەوەکی پێش مەلابانگدان لە دەرەوەی شـار یەکمان دەگرتەوە و بە شـاخدا هەڵدەگەڕاین، یەک دوو سـەعات بە پێ و هەورازاندا، ئەوجار لەسـەر کانـی و پشـوودان و گۆرانـی و شـیعرخوێندنەوەی کوردی. تاهیـر تۆفیـق گوێلێگرتن و گوتنـەوەی ئاواز و مەقامەکانی نیشـانەی سیاسـیبوون بـوو. حاجی قـادر و هێمن، وێردی سـەرزمانمان بوون، هەمـوو کوردایەتیکردنمـان ئەم مەقـام و گۆرانییانە بوو، گاشـەبەردە تەختەکان ڕەنگە ئێستاش شوێن نووسین و یادگارییەکانی ئێمەیان پێوە مابێت. فەقرەقا و سـەری مەیدان و لەندی شـێخان و لاچین و شـاخی زاوابووک و دریاز و بایندەرێ، کەوپەڕ و عەولاکوردە، کێتکە و دێبوکر و مەنگوڕان، ئەم سـەیرانگە و شـوێنە ئاسـتەمانە بوون زۆر کەڕەتان بۆی دەچووین. زۆر جار لەم ڕێگەوبانانە تووشـی لە خۆمان گەورەتر دەبووین، کە دەمانزانی سیاسـەتکردن و دژایەتیی شـا و ساواک لێکی نزیـک کردبوونـەوە. زۆر بە گەرمـی لەگەڵ ئێمەدا دەدوان و قسـەی سیاسـی و کوردایەتییان بۆ دەکردین، هەڵبەت زۆر بە وریایی، چونکێ کەڵ بە موو بەند بوو[1]، سـاواک هەموو گەنجانی بە تایبەت سـابلاغی چاودێری دەکرد و دەبوو هەر شـتێک بۆنێکی کەمی سیاسی لێ هاتبا،

١- کـەڵ بە موو بەند بوون، بە واتـای ڕۆژگاری تاریک و لەژێر فەرمانی حاکمی زاڵم و دیکتاتۆربووندا و کەس نەوێرێ هیچ بڵێت.

زۆر بــە نهێنــی و شــاراوەیی بکــرێ، تەنانەت گوێگرتن لە ســروود و مەقامی کوردی. نووسین و بوونی کتێبی کوردی ئەوپەڕی سیاسیبوون بوو.

## بارزانی و خەڵکی سابڵاغ

ئــەو ســاڵە ١٩٧٥، بە هۆی شۆڕشــی باشــووری کوردســتانەوە، کۆنترۆڵــی ســاواک بەســەر خەڵکدا لەدەســت دەرچووبــوو، خەڵک بە کەیفی خۆی باســی مەلا مستەفا و شۆڕش و شەڕی کورد و عیراقیان دەکرد. ســابڵاغ پڕ بووبوو لە بارزانی و کوردی باشــوور، دەهاتن بۆ ئیســتراحەت و «بــای باڵی خــۆدان»[1] و شــتکڕین و دەواودەرمان و تیماری برینداران.

خەڵک و لاوانی وریا و ئاگای شار، زۆریان حەز لە سەرکردایەتیی شــۆڕش و خــودی مەلا مســتەفا نەبــوو، ڕەخنەیان بوو لــەوەی کاتی ڕووخانی کۆمار، (قازی)ی بە تەنیا هێشــتەوە و خۆی ڕۆیشــت. دواتر ئــەم بەلایــەی ســالانی ٦٧-١٩٦٨، کــە بەســەر ســەرکردەکانی لاوی ســابڵاغی هێنا بە کوشــتن و تەحویلدانەوەیان بە شــا، ئەمە بۆ خەڵکی ئاشــنا بەم مێژووە زۆر قورس و گران بوو، هەرچەند زۆربەی خەڵکی شــار عەتفی بوو لەگەڵ پێشــمەرگە و خەڵکی باشــوور و تەنانەت زۆر کەســیان لەناو ژن و منداڵی خۆیان جێ کردبووەوە و پەنایان دابوون، بەڵام بارزانییەکان لەناو شار خۆشەویست نەبوون، هەر بۆیەش زۆرتر ئــەوان لــە نەغەدە دەبوون. پێشــمەرگە و خەڵکی ســادەی شــارەکانی باشــوور لە ســابڵاغ زۆر خۆشەویســت بوون و زۆر دۆستایەتی هەر ئەوکات لەنێوان خەڵکی باشــوور و سابڵاغدا بناغەی داندرا و ئێستاش بەردەوامە.

---

١- بای باڵی خۆدان، مەبەست لە پشوودان و چوون بۆ کەیف و ئیستراحەت و گەڕان.

### هونەر لە سابڵاغ

ئەوکات لە سابڵاغ هەرچەندە حیزبی سیاسی و دەسەڵاتی کوردی بوونی نەبوو و دەسەڵاتی ساواکی شا هەموو کەلێن و قوژبنێکی تەنیبوو، دیسانیش مەکۆی کوردایەتی و جووڵەی سیاسی بوو. هەموو ئەدیب و هونەرمەند و سیاسی و پیاوخاسێکی باشوور خولیای بینین و زیارەتی سابڵاغ بوون، ئەوان زۆرتر ناوی «مەهاباد»یان بەکار دێنا. زۆربەی خەڵکی ئەودیو کە دەهاتن خوازیاری دیتنی گۆرانیبێژی بەناو و دەنگ، کاک محەمەدی ماملێ بوون، شەووڕۆژ ماڵەکەیان لەبەر میوانی باشوور بەرنەدەکەوت، کاک محەمەدیش لەگەڵ خێزانی، باجە ئامین بە گەورە و بچووکەوە ڕێزی هەموویانیان دەگرت و پێشوازییان لێ دەکردن. تیپی مۆسیقای سلێمانی بەڕاستی شۆڕشێکی بەرپا کرد و گۆرانییەکانی کەریم کابان، برایم خەیات، عوسمان عەلی، قادر کابان، حەسەن گەرمیانی و ئەوانی دی جۆشوخرۆشی خستە ناو دڵی لاو و پیری شار. پێشتریش قژکاڵی لیوئاڵ و باخچەی پاشا و بریندارم بریندارمی هۆمەر دزەیی و قادر دیلان دڵی عاشقانیان ئاوپڕژێن دەکرد و هەموو ناو تاکسی و تۆمارگەکان هەر ئەو کاسێتانە بوون، کە بە هۆی شۆڕشی باشوورەوە هاتبوونە ڕۆژهەڵات.

گۆرانییە بەناوبانگەکەی کەریم کابان، شیعری شاعیری مەزن بێسارانی، وەهای شوێن لەسەر ڕۆح و هەستم دانابوو، هەر ئەوکات هەمیشە دەمگوت، هەرکات ژیانی هاوسەری پێک بێنم و کچم ببێت، ناوی دەنێم «برژانگ».

گیانە لە پرخەی خەوی خەوما
پێ بنێ وە بان هەردوو چاوما
نەڵێی برژانگت تیژە وەك چقڵ
ئەچەقێتە پێی ناسکتر لە گوڵ
من بەو برژانگە بۆیە خۆشحاڵم
خاکی بەرپێکەی تۆی پێ ئەماڵم

هەرچەندە تیــژ بێ ، بۆ پێــی تۆ نەرمە
بۆ تێهەڵســوونی ژێرپێت ، دڵ گـــەرمە
ســـــا تووخوا پێیەك بنێ سەر دیدەم
ئـــەو دیـــدەی بێ تۆ هیچ کەس نەدیدەم
ئەگەر نەخشـــێکی غەیری تۆی تیا بێ
تووخـــوا کوێری کە، بـــــا نابینـــا بێ
کە پێت هەڵبڕی، ســـەیرکە چەن جوانە
بـە خـــــوێنــــی دیــــدەم خەنەبـــەندانە

**کردەوەی بارزانییەکان لە سابڵاغ**

بێزارکەر و قێزەون ئەم بارزانییە بەرپرسانە بوون، بە بەستە هەزار تمەنیی پارەی ئێرانیان لەناو بازاڕ دەردێنا و فشـــەیان پێوە دەکرد، بێ گوێدانە خەڵکی هەژار و برســـی، تەخشـــان و پەخشـــانیان دەکرد، ئەم کردەوەیە بۆ پیاوە بەساڵداچووەکانی شار و هاوڕێکانی قازی محەمەد و خەڵکی بەئاگای شـــار نەک تەنیا خۆش نەبوو، بەڵکو دەبووە بێزاری و نائومێدی و زۆر لە پیاوە کۆنەکانی شـــار دەیانگوت ئەمە شکســـتە و شا هەڵیاندەسووڕێنێت و هەربینا بینیمان فرۆشتنی!

سابڵاغ قەحبەخانەی ڕەسمیی لێ نەبوو، ڕەزائییە و تەورێز لێی بوو، بـــەڵام لە کۆنـــەوە یەک دوو ماڵ لە خـــوارەوەی پردی یەرغـــو لە قەراغ چۆمەکە هەبوون، ماڵی عەبوو نێرەیان پێ دەگوت، دوو ســـێ ژن بوون لەژێر سەرپەرشـــتیی ئەو پیاوە کاسبییان پێوە دەکرا. پێش هاتنی خەڵکی باشـــوور هەڵبەت سابڵاغییەکان بە هەڵە و قســـەی باوی ناو خەڵک هەر دەیانگـــوت «بارزانییەکان»، ئەم ماڵانە زۆر چۆڵ و خامۆش بوون و بۆ خەڵکی شار زۆر عەیبە بوو بچن بۆ ئەم شوێنانە، زۆرتر خەڵکی بێگانە و ســـەربازی پادگان ڕۆژانی هەینی دەچوون دەنا چۆڵ بوون. دوای هاتنی کوردانی باشوور و بارزانییەکان ئەم دوو ماڵە بەرنەدەکەوتن و ژنی وای تێدا بووە دەڵێن ڕۆژی وا بووە یەک ژن ٢٠ بۆ ٣٠ پیاوی بەڕێ کردووە.

ئــەم دیاردەیە لەناو شــاردا زەق بــووەوە، گەورە و پیاوماقوڵانی شــار ئەوەیان پێ قبووڵ نەکرا و بە ئەمری فەرماندار ماڵەکانیان ڕووخاندن و چۆڵکران و هەرگیز ئەم دیاردەیە نەهاتەوە بۆ شار.

### پێشوازی لە بریندار

هەواڵ هات کۆمەڵێک بریندار بە هۆی بۆمبارانی تەیارەوە، هێندراون بۆ سابڵاغ و لە خەستەخانەی شار جێ نەبووە و هەمووی لە «خانەی جەوانان» جێیان بۆ کراوەتەوە. لە ئەنجوومەنی دەبیرستان پێشنیاز کرا وەک نوێنــەر وەفدێک بچێت بۆ بەخێرهاتن و گوڵبردن. بە خۆشــییەوە من و چەند کەســی دیکــە هەڵبژێردراین و بە گوڵ و شــیرینی چووین بــۆ لای بریندار و نەخۆشــەکان لە خانەی جەوانــان، بۆ یەکەم جار لە تەلەفزیۆنی مەهاباد نیشــان دراین و قســەکانی منیان بڵاو کردەوە، کە بەخێرهاتنــی کوردانی باشــوور دەکەم، بە دڵنیاییــەوە دەبێت ئەم گرتە فیلمە لە ئەرشیڤی تەلەفزیۆنی مەهاباد هەبێت.

### دوو ماڵە بارزانییەکە لە ماڵمان

ڕۆژێک ئێمە لە دەبیرســتان بووین، باوکم لەپڕ لە کاتی کارکردندا، لەگــەڵ یــەک دوو بارزانیــدا دێتەوە مــاڵ و بە دایکم دەڵێــت، ئەم دوو ژوورەی ئەوبەری حەوشە چۆڵ بکات و خاوێنیان بکاتەوە. دایکم دەڵێ:

- ئەیرۆ بۆ میرزا برایم؟!
- بۆی ناوێ و دەڵێم چۆڵی بکە.
- بۆ ناکا بە کرێت دابێت؟!
- کرێی چی، ناوەڵا ئەم دوو ماڵە بارزانییە لێیان قەوماوە و لە بازاڕ تووشیان بووم، با ماوەیەک تا بە لایەکدا دەکەون لێرە بن!
- قــەت شــتی وا نابێــت، جا ئێمە چــۆن بێگانە و غەریبــە بێنین بۆ ناوماڵی خۆمان، کچی جحێڵم هەیە، کەی ئەوەمان کردووە؟!
- کچێ ڕەعنا هەموو ماڵی سابڵاغ یەک دوو ماڵی عێراقی و بارزانیی

تێدایە، هەر ئێمە نیین، گوناحن دەبێت یارمەتی بدرێن!

ڕەعنا بە گریانەوە دوو ژوورەکە خاوێن دەکاتەوە و ئەو ماڵانە دێن و دەبنە هاومەنزلی ئێمە تا دوا ڕۆژەکانی چوونەوەیان بۆ باشوور.

## شەڕی خۆمان هەر دەکەین

لـەم ڕۆژانەدا ڕادیۆی دوو مەوج واتا شـەپۆلی کورت برەوی زۆر بوو، هەموو پیاوانی بازاڕ و کاسبکار ئێواران، دەنگی شۆڕش، ئیسرائیل و بی بی سـی فارسـییان دەگـرت. بەیانیان گێڕانـەوەی دەنگوباس و خەبەری شـەڕی پێشـمەرگەی بارزانـی و جەبهەکان لەنـاو دەوایر و ناوبازاڕ بە تایبەت هەواڵی تازە و نەبیسـتراو، خۆڕانان و فشەشـی لێ دەکەوتەوە و زۆر عەیبە بوو ئاگات لە دەنگوباسی شەڕ نەبێت!

مـام تەهـای دوکانـدار شـەوی پێش نە ئـاگای لە هیچ بـووە و نە ڕادیۆی کردووەتەوە.

جیرانەدوکان بە دەنگی بەرز:

- ئەرێ خەبەر چییە؟!

هەر کەسە شتێک دەڵێ: ئیسرائیل وای گوت، بی بی سی وای گوت و دەنگی شۆڕش...

- ئەدی مام تەها تۆ چت بیستووە؟!

- بەخوا من درەنگ گەیشـتمەوە ماڵ و فریای فارسییەکە نەکەوتم، بەڵام عەرەبییەکم گرت، ئەویش زۆری لێ تێنەگەیشـتم، ئەوەندە حاڵی بووم گوتی... گوتی...

- ئاخر عەرەبییەکە چیی گوت؟!

- مەلا مستەفا گوتی، ئێمە شەڕی خۆمان هەر دەکەین!

ئەم «شـەڕی خۆمان هەر دەکەین»ە بوو بە قسەی خۆشی خەڵکی سـابلاغ و ئێسـتاش بۆ زۆر شـتی نەسـتەق و ماندار خەڵکی بەکاری دێنن. وەک نەقڵی دوو پێنج تمەنی، دەگێڕنەوە حەمەدی وسوو کوتکەی و کەریم سـێ بسـت کە دوو ڕوخسـاری جوان و بەناوبانگی پیاوانی

سابلاغ بوون، ئێواره به پیاسه و بەکاوەخۆ قۆڵ له قۆڵی یەک بەرەو ماڵ دەبنەوە، لەناکاو حەمەد له دوورەوە چاوی به ده تمەنییەک دەکەوێت لەسەر جادەکە کەوتووە، به خۆگێلکردن زۆر به ئەسپایی پێی لەسەر دادەنێت و کەریم به قسان دەخافڵێنێت و له ئاستی خۆی دەچەقێ به بیانووی قسەگێڕانەوە بۆ کەریم، هەر دێهێنێ و دەیبا، بەڵکو کەریم ئاوڕێک بداتەوە و ئەویش به خێرایی ده تمەنە بخاتە گیرفان. نەخێر فایدەی نابێت و کەریم زەق وەستاوە و چاو ناترووکێنێ. کاک حەمەد هەر چەقیوە و قسە درێژ دەکاتەوە و ناجووڵێت، سەرەنجام کەریم دوای پێنج شەش خولەک ماندوو دەبێ و دەڵێ: گەواد لاقت هەڵگرە و بیکە دوو پێنج تمەنی درەنگە با بڕۆین، تومەز ئەویش له ئەوەڵەوە ئاگای لێ بووە و ده تمەنەی دیوە. دەڵێ بیکە دوو پێنج تمەنی واتا با بەشی بکەین و بیبڕینەوە و بڕۆینەوە! ئیتر ئەوە ئێستاش له هەموو دەڤەری موکریان باوە کەسێک زۆری لەسەر بڕوا، پێی دەڵێن بیکە دوو پێنج تمەنی، واتا خولاسەیکەوە و کورتی ببڕەوە!

### ئاشبەتاڵی باشوور

زۆری نەبرد دەنگۆی خیانەتی شا به هاوکاریی «هەواری بومێدین»، سەرۆککۆماری ئەلجەزایر و پێککەیشتنیان لەگەڵ سەدام، هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەری گریاند. له ماوەیەکی کورتی یەک دوو ڕۆژیدا به دەیان هەزار پێشمەرگە چەکی دانا و جاڕی ئاشبەتاڵ درا، سەرکردە و نزیکەکانی بنەماڵەی بارزانی له کەرەج و تەنیشت شای ئێران له ڤێلا و خانووی چاک و مۆدێرن جێیان بۆ کرایەوە و نەسرییەی ملیۆنی بەستەی هەزار تمەنی شەق و تازەیان وەردەگرت. خەڵک به قورپێوان و لەخۆدان و تەنانەت خۆکوشتن پۆل پۆل گەڕانەوە و تەسلیمی سەدام و بەعس بوونەوە. دەماندیت خەڵکی بێدەرەتان و لێقەوماو و فەقیر به چلەی زستان و به نەداری و کولەمەرگی ئاوارەی شارەکانی ئێران بوون و به غەریبی و نانی سواڵ، مانەوە

و نەگەڕانەوە ماڵوحاڵی خۆیان لە باشـوور. ئێسـتاش پاشـماوەی ئەم شکست و خیانەتی شای ئێران و مەلا مستەفا دەیان و سەدان قوربانی و تراژیدیای بەجێ هێشـتووە و چارەنووسـی زۆر کەس و ماڵباتی بە تەواوی گۆڕی و هەرگیز وەک خۆیان لێ نەهاتەوە. لە مێژووی خەباتی شۆڕشـگێڕانەی میللەتانی جیهاندا پێم شک نایەت، سەرکردەیەک وەک مەلا مسـتەفا ئاوا بە بێڕەحمی و بۆ خۆشی و ئاسوودەیی ژیانی خۆی و بنەماڵەکـەی، میللەتێکـی بـێ پشـتوپەنای جێ هێشـتبێت و ڕوحمی نەجوولابێـت بۆ ئەو هەموو ماڵوێران و برسـی و پێخواسـی ئاوارەی شـارەکانی ئێران، ولاتێک کە هەر لە دێرزەمانەوە زۆربەیان بە چاوی گوندی سـەیری کـورد دەکەن و نەیاری ئەو میللەتـە بوون! بە چاوی خۆم لە سەرمای ژێر بیست پلەی تەورێز، دوای ئاشبەتاڵ خەڵکم بینی؛ لەو هەشت هەزار بارزانییەی سەدام لە ساڵی ١٩٨٣دا قەتڵوعامی کردن و ئەمـرۆش سـەرانی بنەماڵـەی مەلا مسـتەفا خۆیانی پـێ بادەدەن و موزایدەیان پێوە دەکەن. لە ئاخری خیابانی شـا لەژێر خێمە، شـۆفێری تاکسـییەکی بێناموس خەریکی معامەلە و ڕازییکردنی کچەکەیان بوو بە تای ماکسـییەکی تەنکەوە، هەڵیگرێت! لەگەڵ حوسـێنی برامدا لێیان نزیـک بووینەوە و هەتیوی شـۆفێری تاکسـیمان ڕاو نـا. دواتر بۆمان ڕوون بووەوە هەر خۆی بۆ تێرکردنی ماڵ و ژیان دەستی داوەتە ئەم کارە و یەکەم جاری نەبوو!

دەگمەنە لە مێژووی خەباتی میللەتاندا، شـۆڕش شکستی خواردبێ و میللەت قوڕی وەسـەر کرابێ و لە ئاوارەیی و ئەشـکەنجە و زینداندا بەسەری بردبێ، ڕابەری شۆڕش و بنەماڵەکەی لە ناز و نیعمەتدا لەژێر سایەی دوژمنی گەلەکەی، ژیانیان بەسەر بردبێت!

**خنکانی برایم**

لە ئاخروئۆخری سـاڵی خوێنـدن نزیک دەبووینـەوە و ئیمتحاناتی ئاخری سـاڵ دەسـتی پێ دەکرد. بۆ دوورکەوتنەوە لە گەرما و کەشی

ســازگار باو بوو خوێنــدکار پەنایان بۆ باغ و دەرودەشــتی دەرەوەی شار دەبرد بۆ خوێندن و سەعیکردن. چەند هاوپۆلێک بووین ئەو ڕۆژە گوتمان، دەچین بۆ قەراغ ســەددی شــار و مەلەیەکیش دەکەین، مادام هەوا گەرمە. خەریکی چا و کتریی ڕەشــە بووین، برایم قادری و یەک دوو هاوپۆلــی دیکەمــان لە خــوارەوەی ئێمە بــوون، ئەوەندەمان زانی هاوار بڵند بوو، برایم چووپێکی ســەیارەی لە ئاو هاویشــتبوو و پێش خــۆی دابــوو، بــا چووپەکەی بۆ پێشــەوە بردبوو و برایــم هەر دوای کەوتبــوو، ئیتر کــە چووین هاوڕێکانــی گوتیان لەنــاکاو نوقم بوو. نۆ شــەو و ڕۆژان لەگــەڵ ئەوەی هەمــوو ڕۆژ ئیمتیحانمان بوو، لە قەراغ ئــەم ئــاوە هەر چاومــان گێڕا، برایم دیــار نەبوو، مەلــەوان و غەواس لــە ڕەزاییەوە هاتــن هەر فایدەی نەبوو، برایم ون بووبوو، ســەری نۆ ڕۆژە بــە نائومیــدی بار و بنەی قەراغ ئاومــان کۆ کردەوە و هاتینەوە، دیاربوو لە هەموو ئیمتیحانات دەکەوم. ڕۆژی ئاخر، لای ئاوەکە کەسی لــێ نەمابــوو، شــۆفێرێک لە لای سەردەشــتەوە خۆ بە شــاردا دەکات و هــاوار دەکات مەیتێکــم دیوە لــە قەراغ ئاو. ئیتر خەبەر دەســتبەجێ گەیشــتە دەبیرســتان و هەموو بەرەو بەنداوەکە ڕامان کرد، شــەپۆلی ئاوەکــە برایمێکی ئەســتوور و باتێکراوی بە ئارامــی دەجووڵاند، برایم خۆی وەســەر ئاو کەوتبوو، تەنیا ئەســتوور بووبوو و ســەری لووت و نەرمایــی گوێیەکانــی ماســی خواردبووی. برایم بە شــین و گریانی کەسوکار و ئێمەی هاوپۆلی لە گۆڕستانی بوداق سوڵتان نێژرا و ئەوە دووهــەم هاوڕێــی ژیانم بوو، کە بە کارەســاتی دڵتەزێــن و بە ناکامی ماڵئاوایی لێ بکەم.

ئەو ساڵە بۆ یەکەم جار لە ژیانم لە خوێندن کەوتم و ئیتر سابڵاغم بۆ پاییز و ســاڵی خوێندنی نوێ جێ هیشــت و تا دەســتپێکی شۆڕشی گەلانی ئێران لە ١٩٧٨دا شــاری تەورێــزی ئازەربایجان بوو بە ماڵ و مەسکەنم.

# ٤

پێش من، کاکم و پەروینی خوشکم و حوسێن، ساڵێکی خوێندن بوو لە تەورێز بوون و دەیانخوێند. ئەو ســاڵەی من چووم، کاکم خوێندنی تــەواو کردبــوو، ناردبوویان بۆ کرمان و بەلوچســتان بۆ ســەربازی. پەروین خەریک بوو خوێندنی زانکۆی تەواو دەکرد، شووی کردبوو بە کوڕی پوورمان و نەگوازرابووەوە و چاوەڕێی تەواوکردنی خوێندنیان لێ دەکرد، دوای ماوەیەکی کورت ئەویش گەڕاوە و چوو بۆ ماڵی مێرد لە ڕەزاییە. حوسێن لە دەبیرستانێکی کۆنی تەورێز دەیخوێند.

## هاوسێکەی بەر پەنجەرە

دوای گەیشتنم بۆ تەورێز دەبیرستانی مەشهور و دووهەم لە هەموو ئێران، دەبیرســتانی فێردۆســی وەریگرتم. خوشک و براکانم لە ماڵێکی زۆر ســوننەتی لە گەڕەکێکی کۆنی تەورێز، دوو هۆدە و پێشــخانێکیان لە نهۆمی سەرووی ماڵەکە بە کرێ گرتبوو. ساحێب ماڵ زۆر ئیسلامی و کۆنەپارێز بوو، دوو کچی جەوانی هەبوو، پەنجەرەی هۆدەکانی ئێمە لە قاتی ســەرەوە، ڕێک دەیڕوانییە حەوشــەی ئــەوان. کە من چووم و کاکم ڕۆیشت و پەروین ڕۆیشت، ماینەوە من و حوسێن. دیار بوو ئاغا ڕەزای ساحێب ماڵ هیچ کەیفی بەوەی نەدەهات دوو زگورتی لە ماڵیدا بــن، وردەوردە ئاهەنگــی پرتەوبۆڵە و من ژوورم بە زگورتی نەداوە و خوشکتان لێرە نەماوە و دەروجیران قسەی باش ناکەن و... دەستی پێ کرد و نیازی بوو من و حوسێن دەربکات، هەر واشی کرد.

**پیرێژنێکی بەدفەڕ**

هەرچی دەگەڕاین کەس ژوور و خانووی نەدەدا بە دوو کوڕی جەوان و سەڵت، بە ناعیلاجی ژوورێکی زۆر دوور و ناخۆشمان لە ئاخری خیابانی شا دەستکەوت، زۆر بە گرانتر و دوورتر، کۆمەڵێک کوردی باشوور و بارزانی دوای شکستی شۆڕش لەم گەڕەکە لەناو خێمە و جەمەلۆن گیرسابوونەوە. هەتا بڵێی ژیان و هاتوچۆمان لەگەڵ پیرێژنێکی نالەبار و بەدفەڕی ساحێب ماڵ فەلاکەت بوو. سمایلی هاوڕێمان هەتا دەهات بۆ سەردانمان دەبوو بە شەڕی کورد و عەجەم. پیرێژن شەووڕۆژ هیچ کاری نەبوو، کێشکی ئێمەی دەکێشا و هەر ئەوەندە بۆنی کردبا میوانێکمان هاتووە، بە شاتەشات پانزە بیست پلیکان دەهاتە سەر و هاواری دەکرد:

- ئەوە میوانتان هەیە؟! نەمگوت من ماڵم بە دوو کەس بە کرێ داوە؟

- بڕۆ دایکەکەم برۆ دەستمان لە یەخە بکەوە، ئێستا دەڕوات و ناچێتە ئاودەست!

- چووزانم، بۆخۆتان دەزانن من هەموو ڕۆژێک چاڵی توالێتم پێ بەتاڵ ناکرێ!

چار نەبوو میوانمان هاتبا و تووشی کێشە لەگەڵ پیرێژندا نەبووبایەنەوە!

ئیسماعیل مستەفازادە خەڵکی سابلاغ و خوشکەزای یوسف فەرەهمەند بوو. یوسف کوڕی کەریم جووجووی قاوەچی مەشهوری سابلاغ بوو. لەمێژ بوو لە تەورێز کاری دەکرد و دەیخوێند، ئەو ساڵە سمایلی بۆ خوێندن هێنابوو بۆ لای خۆی، زۆر لە ئێمە نزیک بوو. دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، سمایل بوو بە پێشمەرگەی کۆمەڵە و لە شانزەی ئابی ساڵی ١٩٨٨دا، لە بۆمبارانی کیمیایی بەعس بۆ سەر بارەگاکانی کۆمەڵە لە بۆتێ، لە باشووری کوردستان شەهید بوو.

## ماڵی تازە

بابم لە حاڵ و وەزعی مزل[1] و مەسکەنمان ئاگادار کرایەوە، گوتی ڕۆڵە ئەمە وا نابێت، دیارە منداڵەکانی من یەک بەدوای یەکدا بۆ خوێندن و ڕەنگە دوارۆژ بۆ کاریش ڕێیان هەر بکەوێتەوە تەورێز، باشتر وایە بگەڕێی خانوویەکی گەورەی تەواو ڕەهن بکەی، با سێ بۆ چوار هۆدە بێت، دووی بۆ خۆتان و دووش بە کرێ بدەن بە هاوڕێ و هاوشاری خۆتان، بە پارەی کرێکە خۆتان بەڕێوە بەرن و ئیتر هەموو ڕۆژ دەسەر من مەکەن بۆ پوڵ و خەرجیتان. بە کورتی تێیگەیاندین ڕەهن چییە و ئێمەش لەگەڵ حوسێندا لە خۆشیان هەموو ڕۆژ دوای دەبیرستان دەگەڕاین بەناو نووسینگە و دەلاڵی خانووبەرەدا. خانوویەکی عەرزەکیمان دیتەوە بە حەوشە و دوو ژوور و ژێرخان و دوو هۆدەی گەورەش لە سەرەوە. شوێنێکی زۆر باش و ناسراوی خیابانی شەهناز جنووبی، بۆ ماوەی دوو ساڵ بە ڕەهنی شێست هەزار تمەن. ئەوکات بەڕاستی ئەم پارەیە زۆر بوو، ترۆمبێلێکی پەیکان بە نۆزدە بیست هەزار تمەن بوو. بابم خۆی هات بۆ تەورێز و چووین ساحێب ماڵی دیت و بە تورکی کەوتە قسەکردن و داشکاندنی چاکی پێ کرد و گوتی دوای دوو ساڵ لێشت دەکڕم. ئیتر بوونە دۆست و ئێمەش کلیلی خانوویەکی گەورەمان وەرگرت. یەکسەر ماڵمان گواستەوە و هەر دەستبەجێ دوو لە هاوشارییەکانی خۆمان، کە تازە لە زانکۆ وەرگیرابوون، دوو هۆدەکەی سەرەوەمان پێ دان.

## ڕۆژە خۆشەکانی تەورێز

خۆشترین ساتەکانی ژیانی تەلەبەییم و زگورتیبوونم ئەم سێ چوار ساڵەی تەورێز بوو. چەند ڕۆژێک بوو لە دەبیرستانی فێردۆسی خەریکی خوێندن بووم، بە پێچەوانەی چوونم بۆ ئەلبورزی تاران، هیچ

١- مزل، مەنزل، شوێنی نیشتەجێ و حەوانەوە، ماڵ و خانوو، هۆدەی بە کرێ دان.

شەرم و هەستی غەریبایەتیم نەدەکرد، تەنیا ئەوە بوو لە تاران هەموو بە فارسی قسەیان دەکرد و بۆ من هیچ موشکیل نەبوو، بەس لە تەورێز وەک لای خۆمان لە سابلاغ، زۆربەی کات تەنانەت مامۆستاکانیش هەر بــە زمانی دایک، واتا تورکیی ئازەری قســەیان دەکــرد، خوێندن تەواو فارسی بوو، بەلام لە دەرەوەی پۆل و حەوشە هەموو بە تورکی قسەیان دەکــرد. کاتی پشــوو دوو کــوڕم دەدەیتن لە قوژبنێکی حەوشــە، یەک بالابەرز و ئەوی دی کورتتر، هەمیشە بە یەکەوەن و تێکەڵی کەس نابن. ئاخری ڕۆژێکیان لێیان نزیک بوومەوە بە فارســی دواندمن، زۆر زوو لێک ئاشــکرا بووین، کە هەرســێکمان کوردین، گوتیان خەڵکی بۆکانین و کاکمــان لــە زانکۆ دەخوێنێت و ئێمەش هاتوویــن و مزڵمان گرتووە. بەهمــەن و کەمالی عەلیار، دواتر زانیم کاکیان کاک تاهیر عەلیاریش لە زانکــۆی تەورێز قبووڵ بووە و هاتوون بۆ خوێندن. ئەوان لە پۆلی من نەبوون، بەلام هەر کە زەنگی لێ دەدا، لە حەوشــە و دوکانەکە یەکمان دەگرتەوە، زۆر سەنگین و لەسەرخۆ و بێوەی بوون. هەردووکیان زۆر زرنگ و خوێندکاری باش بوون. دوای ڕۆیشتنم لە تەورێز و دەسپێکی شۆڕش، ئاگام لێیان نەما.

ســێ چوار ســاڵ دواتــر، ڕۆژێک لە گەشــتێکی پێشــمەرگایەتی لە جاندارانــی مەنگوڕان، کە زۆربەی ناوچــە ئازادکراوەکانی دەوروبەری سابلاغ، پاسدار گرتبوونیەوە، لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگەی کۆمەڵە کەمالم بینی! ئەوەی تەســەورم نەدەکرد دیتم، قوشــقی بووم و یەکترمان ماچ کــرد، پێــم وا نەبوو ئەم برایانە هەر لە کوردســتانیش بــن، تا چ بگات بــە پێشــمەرگەبوونیان. زۆرمان قســە کردن و زانیــم هەردووکیان لە ڕێکخراوێکی چەپی کۆمۆنیســتیی سەرانسەری ئێراندا ئیشیان کردووە و تــازە هاتوونەتــە ناو کۆمەڵە و بەهمەنیش هەر پێشــمەرگەیە و کاک تاهیری کاکیشــیان پێشــمەرگەی دێموکرات و ئەندامی سەرکردایەتییە. بەداخەوە دوای ئەم دیدارە زۆری نەبرد من لە باشووری کوردستان لە یەکێتی نیشتمانی، پێشمەرگە بووم، بیستم کەمال لە شەڕێکی نابەرامبەر

و قارەمانانە لەگەڵ پاسداری کۆماری ئیسلامی لە ناوچەی سەقز، ٢٨-٥-١٩٨٤ شەهید بووە.

کوردانــی تەورێــز، یــان خانەوادە بــوون و کارمەنــدی میری، یان زۆربــەی وەک من زگورتی و خوێندکار بــوون. زۆربەی هەرە زۆری خوێندکارەکان کوڕ بوون و هێشــتا دوورکەوتنەوەی کچان بە تەنیا لە کۆمەڵگەی کوردی ســابڵاغ زۆر باو نەبوو. زۆربەیان یان ئەوەتا دوای دیپلــۆم شــوویان دەکرد، یان دانشســەرایان تەواو دەکــرد و دەبوونە مامۆستا.

## مرازی گەورەبوون

کۆمەڵە خوێندکارێکی کورد هەمووی ســەڵت یەکترمان گرتبووەوە و هاتوچــۆی گەرموگوڕمان هەبوو. ژینگــەی کوردانی تەورێز وای لە من کرد زۆر زوو پێبگەم و لە ئاســت تەمەنی بچووکی خۆم زیاتر پێ ڕاکێشــم و وەک ســەرەپیاو وێنا بکــەم. زۆرم حەز لێ بــوو گەورەتر بنوێنم و ئەدای گەورانم دەردێنا. بۆ خۆبەگەورەنیشاندان، سیغارکێشان و مەشــرووبخواردنەوە، ئەوجــار دەم لــە سیاســەتدان شــەرت بوو، منیــش هەرســێ کەتنەکەم دەکردن. بە کــردەوەش، بە هۆی دیوەخانی گــەورە و وەزعــی باشــتری ماڵیم لەوانی تــر، بۆم لوا بــوو کە وا بم. ئێوارەی پێنجشــەمان و هەینی، کە پشــوودان بوو، کــۆ دەبووینەوە و گۆرانیگوتن و شــیعرخوێندنەوە و عەرەقخواردنەوە و سیغارکێشان و ســروودی کوردی کەرەسەی سیاســیبوون و کوردایەتیکردنمان بوو. سیمای هۆدەکەی من زۆر کوردەواری بوو. بە دەیان تەسبیح، جەواڵ، جاجــم، ســەماوەر، کــەلاش، خورجێــن و...، بە شــتومەکی کولتووری ڕازاندبوومەوە. بە خەتی خۆش نووسیبووم و لە دیوارم دابوو:

«بە هەڵۆیی کە لە ژین بێبەش بم – نەک هەزار ساڵ قەلی ڕووڕەش بم»

کۆمەڵێک وێنەی ســەرکردە و شــەهیدانی شۆڕشی ٦٧ و ٦٨ پانایی

دیوارەکانی هۆدەکەمیان داپۆشیبوو.

ئـەم ژیانــە زۆر زوو منی هێنا بۆ ناو کۆمەڵی گەورەکان و ژینگەی سیاسـیی خوێندکارانی کـورد. لەناو پۆلی خوێنـدن، کوڕێکی ئازەریی هاوڕێـم هەبـوو. فیروز کـوڕی بنەماڵەیەکی ناسـراوی ئـازەری بوو، باوکی مامۆستایەکی بەناوبانگی ئەدەبیات بوو، تەنیا ئازەری و هاوپۆلم بـوو هاتوچـۆی ماڵمی دەکرد، زۆر ئیسـلامی و خوداناس بوو. زۆری باسـی دوکتۆر عەلی شـەریعەتی و خومەینی بۆ دەکردم، کە لە عیراقە و موجتەهیـدی ئەوانـە. عەلی شـەریعەتی بـە قاچاغ چەنـد ناميلكەی دەرچووبوو و دەستاودەسـت لەناو خەڵکی سیاسـی دەگەڕان. ڕۆژێک فیـروز زۆر بە نهێنی و سـوێندان چەنـد نامیلکەیەکی پێ دام و گوتی بیخوێنەوە. زۆر دادەنیشتین و باسی بیروڕاکانی شەریعەتی بۆ دەکردم. فیـروز یەکەمی هەموو دەبیرسـتانەکەمان بـوو، دەرجەکانی هەمووی یەکەم و باڵا بوو، زۆر دژی شـا بوو، ئاگای لە هەموو جموجووڵەکانی ناو بازاڕ و لایەنگرانی خەباتی دژی شا بوو.

### بە شیعری گۆران دەستمان پێ کرد

چەند هاوڕێیەکم لە سابڵاغ بوون و جاروبار پارەی کەمی ڕۆژانەی گیرفانیان کۆ دەکردەوە و دەهاتن بۆ سەردانم، بە هاتنی ئەم هاوڕێیانم یەک دوو ڕۆژی خۆشمان ڕادەبوارد، بۆ شوێنە خۆشەکانی ئەم شارەم دەبردن. کتێبکڕین و دیارییدان بە یەکترمان کردە باو، نامەنووسـین بە کوردی بە خەت و ئیملای فارسـی، لەگەڵ هاوڕێیان ڕێگەی فێربوونی کـوردی نووسـین بوو. یەکـەم کتێبی کـوردی، هاوڕێیەکـم بە دیاری بۆی ناردم «بەهەشـت و یادگار و سروشـت و دەروون»ی مامۆستا گۆران بوو، شـیعرەکانی مامۆسـتا هێمن و «خەیام» بە کوردییەکەی مامۆسـتا هـەژار دەبـوو لەبەر بکەیـن. ڕۆمانەکانی ماکسـیم گۆرکی، تۆڵسـتۆی، ئەلکسـاندەر پوشـکین، نیکۆلای ئەسترۆفسـکی، مێژووی شۆڕشـی ڕووسیا لە نووسـینی لئۆن ترۆتسـکی و نووسەرانی وەک

مەنسـووور یاقوتی، عەلی ئەشـرەف دەرویشیان، سـەمەد بێهرەنگی و سەرەتاییەکانی فەلسـەفەی ژۆرژ پۆلیت سێر و چەند کتێبی بەرگسپی قاچاغـی وەرگێڕدراوی کتێبـە مارکسـییەکان، کتێبخانەیەکی بچووکی تاقەی ناو دیوارە ئەستوورەکەی هۆدەکەمی پێک دەهێنا و بە دایم قفڵ کرابوو، نەدەبوو میوان و غەریبە پێبزانن چی دەخوێنینەوە.

### تەلەفۆنێک لە دایکمەوە

پەیوەندیگرتن لە تەورێز لەگەڵ ماڵەوەمان لە سـابلاغ ئاسان نەبوو، تازە تەلەفۆن داهاتبوو، زۆربەی ماڵان لە سابلاغ و تەورێزیش تەلەفۆنیان نەبوو، هەموو شارێک تەلەفۆنخانە و تێلگرافی لێ بوو. لە سابلاغ ماڵی ئێمـە تەلەفۆنیان بوو، دەبوو بە مەرکەز واتا تەلەفۆنخانە بڵێن و بۆیان وەسـڵ بکات. لەگەڵ حوسـێندا دەبوو زۆربەی ڕۆژە هەینییەکان بچین بـۆ «موخابرات»، واتـا تەلەفۆنخانەی تەورێز و لەگەڵ دایکمان قسـە بکەیـن. ڕێڕێـداری نەبوو، چەند کابینەی بچووک بـە دەوری هۆڵەکەدا بوو، دیسکێکی گەورە و چەند کارمەندێک بلیتیان دەبڕی و ژمارەکەیان دەنووسی، ئیتر دەبوو بچی دانیشی، یان بە پێوە لەناو شلۆقیی خەڵکدا بوەسـتی و چاوەڕێـی بانگکـردن بیت. زۆر جاران یەک دوو سـەعات چـاوەڕوان دەبوویـن و لەنـاکاو دەیانگـوت بەداخەوە خـەت خراپە و ناگیرێت، ئەو حەفتەیە بەبێ قسەکردن لەگەڵ دایکماندا دەهاتینەوە و تا هەینی داهاتوو دایکمان لە نیگەرانیدا دەبوو، دەنا بە دەنگی بەرز هاواری دەکـرد ئاغای فلان بۆ ژووری ژمارە فلان، ڕامان دەکرد و گوشـیمان هەڵدەگرت و جاریش هەبوو کارمەندەکەی تەلەفۆنخانەی مەهاباد پێش ئـەوەی ماڵە خۆمـان بگرێت، تێر چاکوچوونی لەگەڵماندا دەکرد و باس و خەبەری تەورێز و دۆست و ئاشنای لێ دەپرسیین، ئەوجار لەو لای سـیمەکانەوە دایکم، یان باوکم دەنگیان بەرز دەبووەوە. دەبوو زۆر بە پەلە هەردوو لا پەیام و قسـەکانمان کردبا، تەلەفۆن ئەوکات زۆر گران بوو. بەشـی زۆری موشـتەریی تەلەفۆنخانەکان سـەرباز و خوێندکار

بــوون، بۆ هەموو شــارەکانی ئێران. لە بیرمــە جارێکی دوو هەفتە بوو قسەمان نەکردبوو، دایکم گوتی:

- شــتێک هەیە پێتان دەڵێم نابێت ناڕەحەت بن و نابێت بەم زستانە سەختەش بێنەوە، هەرچی بوو تەواو و سەرەخۆشییش نەماوە!

- چی بووە دایە گیان کێ مردووە؟!

- وەڵا ئەوە حەفتە زیاترە باپیرتان مردووە!

- ئەدی بۆ نەتانگوت بێینەوە؟

لەنــاکاو کارمەنــدی تەلەفۆنخانەی ســابڵاغ ناســیاو بــوو هەڵیدایە: «ئاغــای کەریمی تەســلییە[1]تان عەرز دەکەم». دیــار بوو گوێگرتن لە قسەی خەڵک بۆیان، زۆر عادی و ڕەوا بوو!

- ڕۆڵە باوکت گوتی، لێیانگەڕێ بەو زســتانە ئوتوبووس بە حەوت هەشت سەعات ناگات و زۆریش خەتەرە، بێنەوە چیتان پێ دەکرێت؟!

زۆرمان پێ ناخۆشــبوو، سەرەخۆشــیمان لە باوکمــان کرد و تاقە باپیریش ڕۆیشت. ئیتر شتێکمان نەما بە ناوی نەنک و باپیر!

ئەوکات ئوتوبووس هەبوو لەنێوان سابڵاغ و تەورێز، تازە ترمینالی شــار دروســت کرابوو لە لای مەیدانی مەلا جامی ســەرزارکی کۆلانی ســێ ئاشــان. ترمینالی تەورێز زۆر گەورە و پڕ لــە خەڵک بوو. دایکم هەموو هەفتەیەک ســاکێک خواردنی بۆ دەناردین، بیری لە هەموو شت دەکردەوە، لە گۆشت، کفتە، شامی کەباب (شفتە)، سەوزە، تەنانەت برنج و خۆرەشــت. بیدایەت لە مەهاباد یەکێک دەیبــرد بۆ ترمیناڵ و دەیاندا بە شــۆفێرەکە، ئەغڵەب دۆســت و ناســیاو بوون، ئەویش لە لای خۆی دایدەنا نەڕژێن و تێکەڵ نەبن، من یان حوسێن ئێوارەی هەینی دەچووین بۆ ترمینالی تەورێز و چاوەڕێ دەبووین بۆ پاســی ســابڵاغ، زســتانان زۆربــەی جار وەدرەنگ دەکــەوت و لەبەر بەفر و ڕێگیران زۆریان پێ دەچوو، ئیتر دەبوو لە حەوشــەی ترمیناڵ بە سەرمای زستانی تەورێز

١- تەسلییەتپێگوتن، سەرەخۆشیلێکردن، داوای سەرساخیکردن بۆ خاوەن مردوو.

چاوەڕێ بین تا پاســی سابڵاغ بگات و ساکە سپی وەربگرین و بە پەلە بگەڕێینەوە ماڵەوە. وردەوردە وای لێ هات زۆربەی شۆفێرەکان ساکە ســپیی ئێمەیان دەناسی و بۆیان دەهێناین، دەنا بەبێ ئاگاداریی شۆفێر ساکیان لە سابڵاغ دەخستە ناو سندووقی پاسەکە و ئێمەش هەر وا لە تەورێز هەڵماندەگرتەوە، بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بێت!

## تەورێز وەک کۆمارەکەی خۆمان

ڕۆژ نەبوو لە سابڵاغەوە خەڵک نەیەت بۆ تەورێز، خوێندکار، نەخۆش و بــازرگان لــەم توێژانە بوون زۆر دەهاتن، بــە حوکمی کوردبوون و هاوشــارییبوونەوە ئێمەیــان دەدۆزییــەوە و ئێمەش چیمان لەدەســت هاتبا لە دیتنەوەی دوکتۆر و چوونی دانیشــگا و شــتکڕین یارمەتیمان دەکــردن. بــە هۆی چاککردنی ڕێگەکە و نزیکی چ لەمەودا و چ لە باری مێژوویی، تەورێز بووبوو بە مەکۆیەکی ســەرەکی بۆ خەڵکی ســابڵاغ. دانیشگەی تەورێز یەک لە ئاستبەرزەکانی هەموو ئێران بوو، کۆمەڵێکی بــاش خوێندکاری کوردی لەخــۆ گرتبوو، تەنانــەت ژن و ژنخوازییش لەنێوان ئەم دوو شــارەدا لە کۆنەوە ڕووی داوە، کێشــەی ســەرەکی، مەزهەب و جیاوازیی شــیعە و ســوننی بوو. کەشــوهەوای سیاسی و ســەربەخۆخوازی لە تەورێزیش وەک کوردستان و سابڵاغ زۆر بەتین و لە ڕۆژەڤدا بوو، ئاخر زۆر لەمێژ نەبوو حکومەتەکەی ئەوانیش وەک کۆمارەکەی ئێمە جوانەمەرگ کرابوو. وەک چۆن سابڵاغ لە کوردستان بووبوو بــە هێمای ناســیۆنالیزم و مەرکەزی کوردایەتــی، تەورێزیش ناوەندی ئازەرییەکانی هەموو ناوچەکە بوو بۆ بیری سەربەخۆخوازی.

یــەک لە شــوێنە هەرە قەرەباڵــغ و پڕ لە حەشــیمەتەکانی ئێران بە گشــتی، بازاڕی گەورەی تەورێز بوو، چەندین بازاڕ یەک لەدوای یەک ســەریان گیراوە بە گومبەز و میعماریی کۆنی ســەردەمی سەفەوی و قاجــار، بینــای کۆن و مێژوویــی وەک ئەرکی عەلی شــا، ئەلگولی یان شــاگولی، ئارامگەی شاعیران و زۆر شوێنی دیکە هەبوون بۆ گەڕان و

دیتنیان. ئەوەی لە هەموان گرنگتر و خۆشتر بوو، بازاڕە یەک لەدوای یەکەکان بوو، بازاڕی تەورێز بە گەورەترین بازاڕی سەرداپۆشراو دادەندرا لە جیهاندا. بازاڕەکانی فەرش، شووشە، ئاڵتوون، چەرم، کەوش، ڕاستەبازاڕ و بازاڕی ئەمیر، ئەو شوێنانە بوون هەر کە دەچوویە ژوور و یەکەم بازاڕ ئیتر هاتنەوەت نەبوو. سەعات دوای سەعات مرۆڤ نەیدەزانی چۆن تێدەپەڕێت! لەبەر جوانیی فەرش و شووشە و بللوور و کەوش، بۆنی گیاوگوڵ و زەعفەران و بەهارات، شیرینی و چەرەزات و ئاجیلی زۆر نایاب، سەرمەست و وڕ دەبوویت. لەخۆڕا نەبوو دەیانگوت بازاڕی تەورێز شادەماری ئابووریی هەموو ئێرانە.

### جەوێکی ڕۆمانسی

ئێمەی خوێندکار نە ئیشمان بوو نە پارە، بەس بە چەند ڕۆژ جارێک دەبوو سەری ئەم بازاڕە بەجۆش و سەرسامهێنەر و پڕ لە سڕ و جوانییە هەر بدەین، ئێوارەی پێنجشەممان هەر کە دەچوویە ژوور، ئیتر پێهەڵگرتن نەبوو، بە پاڵ و لەسەرخۆ بەبێ ئەوەی هەست بکەیت بە جووڵەی زۆر ئارام و مێرووئاسا بە سەعاتێک چەند مەترێکت دەبڕی. لە ویشکەساڵیی ژینگەی پەیوەندیی کوڕان و کچان، ئەمە ئەو شوێنە بوو گەنجان بەبێ شتکڕین و پارەخەرجکردن بە چەندین سەعات کاتیان تێدا بەسەردەبرد و نە تەنیا دڵداری و سرتە و چپە هەبوو، بگرە دەستبۆبردن و ڕۆمانسییەتی پیاوانی ڕۆژهەڵاتی، کە زۆربەی جاران لەم شوێنگەلە لە شکڵی خۆپێوەنان بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندیی کچ، یان کوڕە جوانکیلەکان خۆی دەدیتەوە، ئاگریان دەکردەوە.

قاوەخانەی عاشقانی ئەم شارە نەدەبوو لە کیس خۆتی بدەیت، عاشقلەر ئەو تارلێدەرانە بوون، سازی ئازەرییان بە سینگەوە دەنووساند و بە حەرەکاتی توند و سەمای قاچەکانیان و ئاوازی ئازەری و شیعری حەماسی و دڵداری و تەنانەت سیاسی و مێژوویی تابلۆی هونەری بەنرخ و دانسقەیان دەخوڵقاند. ئاوازی عاشقان لە زمان

و بەیانی عاشـقلەرەکان بەشـێک بوو لە مێژوو و فەرهەنگی تەورێز و ئازەرییـەکان. بە خواردنەوەی چایەک بە تاکـە قڕانێک[1] دەکرا بۆ ئەم قاوەخانانـە بچیـت و بە کەیفی خـۆت گوێ لە نەوای دڵفڕێنی سـازی ئازەری بگریت.

## ژنانی ژێر چارشێو

گەڕەکە کۆنەکان و مەرکەزی شار زۆربەیان لە بنبەستی دوورودرێژ و دەروازە پێک هاتبوون، یەکەم ماڵمان لە گەڕەکی کۆنی ماڵی سـەمەد بێهرەنگـی بوو لە بنبەسـتی مەهپەیکەر، ئەم بنبەسـتە لە کۆڵانێکی پان جیادەبووەوە و زارکی چوونەژووری بنبەستەکە دەروازە بوو، جووت دەرگایەکی ئەسـتووری داری نەخشێندراو، تەقولبابێکی ئاسنی گەورە، دەیانگوت پێشتر شـەوانە دایانخستووە و شوێنی دەرگەوان لە سەری دەروازەکە هەر مابوو، گۆیا زەمانی زوو شەوانە بە تفەنگەوە کێشکیان کێشـاوە. ڕاڕەوی باریکی ئەم بنبەسـتە ڕێک بۆ سـوارێک کرابوو. لە زارکـی دەرگاوە تـا بنەوانی بنبەسـت هەمووی پێچاوپێـچ و زیاتر لە چوارسەت بۆ پێنجسەت مەتر و سەت بۆ سەت و پەنجا ماڵێک دەبوو، تەنیا مەجالی پیادە و پاسکیل هەبوو، ئەگەر شتومەک و باری قورست پێ با، دەبوو حەماڵ و عارەبانەی بچووک بە کرێ بگریت، بۆ بەدبەختیی ئەم ماڵەی ئێمە کە ساڵی ئەوەڵ تێیدا بووین، لە بنی بنەوە بوو. زۆربەی ماڵباتی ئەم گەڕەکانە خەڵکی سـوننەتی و دیندار و شـیعەی زۆر تۆخ بوون. شـیعە بەزمێکی ژنانیان هەیـە ڕۆزەخوانی پێ دەڵێن، ئاخوندێک بانگ دەکەن بۆ ماڵ، دەروجیران کۆ دەبنەوە و گوێ لە ئاخوند دەگرن. هەموو ژنەکان تەواو خۆیان لە ژێر چارشـێودا دەشـارنەوە، بە کۆ لە دەوری یەک دادەنیشـن و ئاخوند لەسـەر کورسییەک وەلای سەرەوە دەخـەن، هاتنی پیاوان ڕێپێـدراو نییە. ئاخوند دەسـت دەکات بە چەند ئایـەت و گێڕانەوەی کوشـتنی عەلی و حوسـێن و ئیمـام ڕەزا و ئیتر

---

١- قڕان، ڕیاڵ- یەکەی پوڵی ئێران.

ئیمامی عەباس و بە کەیفی خۆی چەشـــنی نەقالان بە ئاهەنگ دێتە گۆ، ژنــان لــە پرمەی گریــان دەدەن، دادوبێداد دەکەن و هــەزاران جنێو و لەعنــەت ڕەوانــەی ئیمامــی عومەر و بە تایبەت عایشــە و یەزید و ئەم تایفەیە دەکەن. زۆر جار گوێمان لێ دەبوو لە هاتوچۆی دەر و کۆلاندا بە ئێمەیان دەگوت عومەری!

### سیفەی یەک دوو سەعاتی

لــە گەڕەکــی ئێمە ڕۆزەخوانــی زۆر بــوو، وا هەبوو لــە گەڕانەوە بــۆ ماڵ دەبــوو خۆ لادەین و لەگــەڵ ژناندا، لەم کۆلانــە تەنگەبەرانەدا بــەر یەک نەکەویــن. بە خوتبــەی ئاخوند ئەوەندە گریابــوون، چاویان ســـوور دەچووەوە. ئاخوندی شــیعە دەرامەدی چاکــی هەبوو لە ڕۆزە خوێندنــەوەدا، هــەر کەس دەبــوو پێنج قران و تمــەن و دوو تمەنی بۆ دانابــا، هەموویــان ورگیان لە پێش و ملیان ئەســتوور و پاکوخاوێن و سپیوســۆڵ بوون، دین و مەزهەبی شــیعە بۆ ئەوان، نان و ئاو، جنس، خۆشــی و ئاســوودەیی بوو. ئــەوان، ئاخوندەکان کــە گازیان دەکردن ئاغا، مەرجەع بوون بۆ پرســیارگەلی خەڵک و گیروگرفتەکانیان. ژنانی کــۆن و ســـوننەتی بڕوای زۆریان بە ئاغا هەبــوو، زۆر جاریش هەبوو ئاغــا تەماحی تێ دەکــردن و هەر لە جێوە بە خوێندنی ئایەتێکی کورت بــۆ یــەک دوو ســـەعات لە خۆی ســیفە دەکردن، کاری خــۆی لەگەڵدا دەکردن و ئیتر هەموو شت ئاسایی دەبووەوە، تەنانەت هەر بۆ ئێوارە، ژن دەگەڕاوە ســەر ماڵ و مێردی خۆی، ئاخوند دینی بە کەیفی خۆی دادەڕشــتەوە و قانوون و شەرعی بۆ چێ دەکرد. ئەمڕۆ شتێکی بە دڵ نەبوو حەرامی دەکرد و بەیانی کە دەیزانی زەرەری لێ دەکات، یەکسەر حەلاڵــی دەکــردەوە، هەڵبەت ئێســـتاش هــەر وایە، بۆیە لە شــیعەی بە تایبەت دوازدە ئیمامیدا تەقیە هەیە، کە بە کورتی جگە لە شەرعییەتدان بە درۆکردن، هیچی تر نییە.

**خوا، قەند و چای حەرام کردووە**

لێـرەدا گێڕانەوەی یـەک دوو حیکایەت زیاتر دەوری ئاخوندمان بۆ باس دەکەن لە مەزهەبی شیعەدا:

دەڵێن لە سـەردەمی قاجاردا، ئەفسـەرێکی بەریتانی لە هیندەوە چا دێنێتـە ڕۆژهەڵاتی ئێران، لە کرمان و خوراسـان و ئـەم ناوە چایەکی زۆر بەرهـەم دێنێـت، خەڵک چا و قەنـدی ئەوەندە دەخۆنـەوە، تەواو ئەفسەر دەوڵەمەند دەبێت، ئاخوندێکی کرمان دەچێتە لای و دەڵێ:

- ئەدی کوا بەشی من؟!

- بەشی چی تۆ چ کارەی؟!

- من مەلا و ئاخوندی ئەم شارەم، خەڵک بە قسەی من دەکات!

- بڕۆ هەرچی پێت خۆشە بیکە من تۆ ناناسم!

- نامناسی؟! خۆت دەبینییەوە!

مەلا لە خوتبەی نوێژی هەینیدا:

- میللەت دەزانن ئێوە بە زوویی خوا غەزەبتان لێ دەگرێت؟!

- میللەت: بۆ چمان کردووە ئاغا؟!

- خوا قەند و چای حەرام کردووە و ئێوەش دەیخۆنەوە!

- میللەت: شین و گریان و لەخۆدان.

سـاڵ تێپەڕی و ئەفسـەری بەریتانی ئیفلاسی کرد و لە بازاڕ کەس چا و قەندی نەدەکڕی، بە پەلە گەڕاوە بۆ لای ئاخوند:

- بۆ وات کرد، بۆ حەرامت کرد؟!

- ئەی، پێم گوتی بەشی من، تۆ هەر حیسێبت بۆ نەکردم.

- بمبوورە بەڕاستی نەمدەزانی، تازە چوو!

- نا دەکرێ ئەگەر بەشی من جیا بکەیتەوە، چاکی بکەینەوە!

- چۆن؟ تازە حەرامە لای خەڵک!

- هیچ نییە تۆ بەشـی من سـەدا چل بنووسـە و ئیمزای بکە، کارت پێی نەبێت!

هەینیـی داهاتـوو ئاخوند وەسـەر میمبەر کەوت و گوتـی، دەزانم

زۆرتان حەز لە چا و قەندە، پرسم کردووە گەر بێتو پێش خواردنەوەی چایەکە غوسڵێک بە قەندەکە بکەن، ئەوە ئیتر حەڵاڵ دەبێتەوە!

میللـەت دەسـتیان بـە چاخواردنـەوە کـرد و زۆر مەمنوونـی ئاخونـد بـوون. جیاوازییەکە هەر ئەوە بوو لەپێشـدا قەندەکەیان لەناو چایەکە هەڵدەکێشـا! ئێسـتاش لە هەمـوو ناوچەکە بـە ئێمەی کوردی ڕۆژهەڵاتییشـەوە چای بە قەندی دەخۆنەوە و زۆر کەسیش قەندەکەی بە چایەکە تەڕ دەکا و ئەوجار دەیخواتەوە!

**شەهیدی گواوی**

لـە تەورێز کە زێراب و سیسـتمی ئاوەڕۆی نەبوو، پێشـتر باسـم کـرد، هەمووماڵەکان چاڵیـان هەبوو، بۆیە جاروبار کە چاڵ پڕ دەبوو، کەنکەنەچـی کە ئیشـی بەتاڵکردنی ئەم چاڵاوانە بـوو، دەهات و بەتاڵی دەکردن. دەڵێـن ژنێک براکەی کەنکەنەچی دەبێت و لە کاتی کارکردندا تێـی دەکەوێـت و دەخنکێت! شـەهیدبوون لە لای شـیعە زۆر گرنگ و سـەروەرییە و ڕێگەی چوون بۆ بەهەشـتە، وەک چۆن ئیمام حوسـێن شەهیدە، زۆر حەز بە شەهیدبوون دەکەن. ژنە دەچێتە لای ئاخوند و بە گریانەوە دەڵێ براکەم لەناو چاڵی ئاودەست، کاتی خاوێنکردنەوە خنکا و مرد، هاتووم بزانم شەهیدە یان نا؟!

ئاخوند دەڵێ: «بەلی، بەلی، شـەهید دی ئەمما پۆخلی شەهید دی»! واتا شەهیدە، بەڵام شەهیدێکی گواوی!

خۆ خۆشـمان بە چاوی خۆمان دیمان پاسـداریان دەنارد بۆ شەڕ لەگـەڵ پێشـمەرگەدا، کلیلیان پێ دەدان بۆ بەهەشـت و شـەهیدبوون. تەنانەت ئاخوند سـادق خلخالی کە لە دەسـتپێکی شۆڕشی ڕۆژهەڵاتدا ناردیان بۆ حاکمی شەرعیی کوردستان، ماوەی مەحکەمەکانی یەک بۆ دوو چرکەیان دەخایاند، لێیان پرسی کوا وا دەبێ؟ گوتبووی بۆ نابێ؟! ئەگـەر گوناحبار بێ ئـەوە بە حەقی خۆی گەیشـتووە و ئەگەریش بە بێگوناحی ئیعدامی بکەم ئەوە شەهیدە و دەچێتە بەهەشت!

ساڵانی تەوریز بۆ من ئەو سەردەمانە بوون، یارمەتیی گەورەیان دام بۆ خۆناسین و چاوکراوەیی ژیانم لە هەموو بوارەکان، لە تەوریز فێری ڕاوەســتان لەسەر پێ، ســەربەخۆبوون، ڕوانینی چاوکراوانە بۆ دۆست و دەوروبــەر، کۆمەڵایەتیبوون، خۆدیتنەوە لە بەرەی پێشــکەوتوویی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی و دوورکەوتنەوە لە خورافات بووم. بە گشــتی بۆ لە بەرەی چەپدابوونم، قەرزداری ژینی ئەم چەند ساڵەم، دوور لە ماڵ و نازی دایک و باب، لە تەمەنی مێرمنداڵییەوە، کە لە تەوریز بەسەرم برد.

ساڵ لەدوای ساڵ و ڕۆژبەڕۆژ هاتنی لاوان و هاوتەمەنەکانی خۆم لە کوردســتانەوە بۆ تەوریز و شــارە گەورەکانی تری ئێران ڕووی لە زیادبــوون بــوو، خوێندکارێکی زۆر ڕوویان لــە خوێندنی باڵا کردبوو، بــە هەزار کوێــرەوەری و نەبوونی دەیانخوێند و بە ئومێدی وەرگرتنی شەهادەی بەرز و گەڕانەوە بۆ وڵات و خزمەت بە خەڵک بوون.

گوتم، بە هیمەتی بابم نە تەنیا ڕزگارم بووبوو لە کرێنشــینی، بگرە بووبووم بە ساحێب ماڵ و دوو هۆدەشم هەبوو بۆ بەکرێدان. بە هۆی شاڵاوی هاتنی خوێندکارە لاوەکان لە شارە کوردییەکانەوە و نەبوون و قەیرانی خانووبەرە، ئەم دوو ژوورەی من هەرگیز وەعەرز نەدەکەوتن، هەڵبەت جیا لە قەیران یەک دوو هۆکار هەبوون بۆ خواستیان، شوێنێکی باش و نزیکی ناوشار بوو، کرێی زۆر نەبوو، هەموو بیستبوویان کەش و فەزای دۆســتانە و سیاســیی ماڵی ئێمە غوربەت و تەنیایی بە چۆکدا هێناوە.

کوڕێــک هــات هاوشــاریی خۆمــان بوو، باوکــی ناســراوی باوکم بــوو، چووبــوو بۆ لای باوکــم و ئەویش گوتی، ڕۆڵە ماڵێکی باشــن و زۆر فەقیــرن، ئەگــەر دەزانی هۆدەیەکیان چۆڵ دەبــێ بیدەیە. کوڕێکی سەردەشــتیی لێ بوو، خەریک بوو دەڕۆیشــت، هاوشاریی گەیشت، لە تەکنیسێنی بینا و ڕێوبان وەرگیرابوو، دەورەکەی دوو ساڵ بوو. باقی، هەتــا بڵێی کوڕێکی ڕووخۆش و بەجۆش و کۆمەڵایەتی بوو، هەر زوو کردمانە هاومزڵی خۆمان، سەری زۆر لە سیاسەت دەخورا.

## لەبەر دڵی فیروز

ڕۆژێکی ساردی پاییزی ساڵی ١٩٧٧، فیروزی هاوڕێم لە دەبیرستان گوتی، دێی ئەمشـــەو زۆر بە نهێنی بچین بـــۆ تەعزیەی کوڕی ئیمام لە حوســـێنییەی ناو بازاڕ؟ گوتم، کێ مردووە؟ گوتی، کوڕەگەورەی ئیمام خومەینی، حاج مستەفا ئاغا لە نەجەف مردووە، لێرە شا ئیجازەی نەدا بە ڕەسمی تەعزییەی بۆ دانێن، بازاڕ بە شەو و دوور لە چاوی ساواک بۆی دادەنێت. من هیچ بڕوام بە شیعە و مەزهەب نەبوو، بەس فیروزم زۆر خۆش دەویســـت و زۆر هاوکاری یـــەک بووین، گوتم فیروز تەنیا لەبەر دڵی تۆ دێم.

ئێوارەی درەنگ یەکمان گرتەوە و چووم بەدوایدا، بازاڕ ئارام بوو، ئەم کۆڵان بەم کۆڵان و ئەو بازاڕ بەم بازاڕ، گەیشتینە مزگەوتێکی لەبەر دەرگاوە خەڵـــک بـــوو تا حەوشـــە و ناو هۆڵە گەورەکە، پڕ لە فەرشـــی جـــوان و ڕازاوە، تێگەیشـــتم هەر خۆیان، بازاڕییـــەکان پێی ڕادەگەن و ئیدارەکەی بەدەســـت خۆیانە. فیروز هەر قســـەی بۆ دەکردم، ئەمە حاج فلانـــە، ئەمە یەکەم تاجری شـــارە، ئەم کوڕی فـــلان موجتەهیدە و ئەمە فلان ئایەتوڵلا و ئەوی تر دوکتۆر و سەرمایەدار و ئیتر بەدوایدا...

هەرگیز نەمدەتوانی تەســـەوری ئەوە بکـــەم خومەینی تا ئەم ڕادەیە لای شـــیعە گەورەیە. لەوێ باس کرا کە حاج مستەفا بە مەرگی تەبیعی نەمردووە و باسی موئامەرە و کوشتنیان بەسەر شا و سەدامدا دەهێنا. باســـیان کرد ئیمام زۆر پەرۆش و تازییەبارە بۆ کوڕی گەورەی و دە فکـــری تۆڵەدایە. گوێم لە قســـەی زۆر خەتەر بوو بە دژی شـــا، یەکەم جـــارم بـــوو لـــە کۆبوونەوەیەکی وادا بە ئاشـــکرا گوێم لـــە جنێودان و دروشـــمی دژ بە شا و ڕێژیم دەبوو. بۆم دەرکەوت فیروز زۆر چالاکە و وەک بەرپرس قسە و ڕاوێژیان لەگەڵدا دەکرد. ئەویش زۆر بەئەدەب و لەسەرەخۆ، بە ڕوخسارێکی تەواو ماتەمەوە دەیدواندن و ڕێوشوێنی بـــۆ دیاری دەکردن، تێگەیشـــتم بازاڕ خەریکی کوڵینـــە و هەر بەم یەک

شــەوە لە مزگەوت ئەمــە کۆتایی نایەت، هەمــوو ئەوانەی لەوێ بوون باســی کوشتنی حاج مســتەفایان دەکرد، نەک بە مردنی ئاسایی خۆی. هەر ئەمشــەوە پارەیەکی زۆر کۆکرایەوە و هەرچی حاجیی بازاڕ بوو بەشــدارییان کرد و گوتیان پارە بــۆ بزووتنەوەی ئیمام کۆ دەکەینەوە. هــەزاران ســەڵوات و شــیعاری بەرزم بــۆ پشــتیوانیی خومەینی گوێ لــێ بــوو. ئەمە یەکەم بەشــداریم بوو لەناو کۆبوونەوەیەکی دژی شــا و حکومەتــی ئێــران، هەرچەند بەدڵ پێم ناخۆش بــوو کە بینیم بەرەی ئیسلامی وا بەهێزن. فیروز دیسان داوای لێ کردم ئەمە زۆر خەتەرە و نابێت کەس پێی بزانێت. هاتمەوە ماڵ و بۆ کەســم باس نەکرد لە کوێ بووم. چەند ڕۆژی نەبرد بیســتمان لــە قومیش حەرەکاتێک هەبووە بۆ لایەنگری لە خومەینی و تەعزیە بۆ کوڕەکەی، چەند کەسێک بە تەقەی پیاوانی شا کوژراون و بڵاوەیان پێ کراوە.

### شت دەقەومێ

مانگی دووی ساڵی ١٩٧٨ بوو، سەرمای ڕێبەندانی ١٣٥٦ی هەتاوی، هەم دیســان فیروز هات و گوتی شەممە مەیەوە دەبیرستان، یان وەرە بــۆ بــازاڕ، یان بچۆ بۆ دانیشــگە، بەیانی زوو دەســت پــێ دەکەین، بۆ چلەی شــەهیدانی قوم تەزاهورات دەکەین. هەینی هەموو لە ماڵ بووین و باســم کــرد، ڕۆژی شــەممە حوســێن و باقی و هەمــوو چووین بۆ بــەر زانکــۆی تەورێز، دیار بوو شــت دەقەومێت، پۆل پــۆل خوێندکار لــە دەرگا گەورەکەی زانکــۆ دەهاتنە دەر و لێک نزیک دەبوونەوە، ئیتر هەر ئەوەندەمان زانی دروشــم بەرز بووەوە و زۆر بە ئارامی دەســت کــرا بــە ڕێپێوان بەرەو شــار. مەســافەی نێوان زانکۆ و ناوشــار زۆر بوو، هەر دەهات و بەشــداری زیادی دەکرد، دروشمی سەرەکیی ئێمە لــە زانکۆوە کە ڕێکەوتین «اتحاد- مبــارزه- پیروزی» واتا؛ «یەکێتی- تێکۆشــان- سەرکەوتن» و کۆمەڵێک شیعاری چریکی فیدائییانی خەڵق بوو، هەموو بەیەکەوە دەمانگوتنەوە. نزیک مەیدانی ســەعات و جادەی

تەربیــەت بووینەوە، خەڵکێکی زۆر بە دروشــم و ئەی ئیمام ئەی ئیمام پەیــدا بــوون و تێکەڵ بوویــن، گوتیان بازاڕ تێکەڵی خۆپێشــاندان بوو. هەر دەســتبەجێ حەولیان دا شــیعاراتی ئێمە، کە لە زانکۆوە هاتبووین بگۆڕن و بە دەنگی زۆر بەرز هاواریان کرد ئەم شــیعارە کۆمونیستییە و «رهبر ما خمینی – نهضت ما حسینی»، واتا «ڕابەرمان خومەینی و بزووتنەوەکەمان حوسەینی» وەسەر دەنگ و دروشمەکانی ئێمە کەوت و ئیتر بازاڕ و مەلا و مەزهەبی شیعە، تا ڕووخانی شا دەستیان بەسەر هەموو جووڵەکانی داهاتوودا گرت.

## مەرگ بۆ شا

لــە بــازاڕی شیشــەگەرخانە، ئیســلامی و چەپ و کۆمۆنیســتەکان ئاوێتــەی یەک بوون و شــیعاری مەرگ بۆ شــا بەرز بــووەوە، هەموو بــازاڕ داخرا و تەقە لە خۆپێشــاندەران کــرا. هەموو کەس هەڵدەهات و بڵاوەی دەکرد و دیســان کۆ دەبوونەوە و یەکیان دەگرتەوە، بە دەیان کــوژراو و بریندار لە مەیدانی ســەعات، جــادەی تەربییەت و بەردەمی بــازاڕی شیشــەگەرخانە و خیابانی کوروش کەوتبــوون و لە گیانەلادا بــوون، کەس فریای کەس نەدەکەوت و تەقە لە هەموو لاوە بوو، ڕۆژە کورتەکانــی ڕێبەندان فریای خەڵــک کەوتن و وردەوردە بەرەو کۆتایی ڕۆژ دەبووینەوە، لەگەڵ حوسێن و باقی بەرەو ماڵ هەڵدەهاتین، لەناکاو باقــی کــەوت و هاواری لێ بڵنــد بوو، گەڕاینەوە و بە جووت شــانمان خستە بنباڵی باقی، هەمو گیانی خوێن بوو، فریانەکەوتین بزانین وەکوێی کەوتــووە. بە هیلاکی و کوێرەوەرییەکی زۆر و خۆپاراســتن لە پۆلیس و ســەربازان، بە جادە و کۆڵاناندا خۆمان گەیاندەوە ماڵ و باقیمان بە بێهۆشــی لەســەر فەرشــەکە درێژ کرد، لە پشــتملی خوێن هەڵدەقوڵی، لەگەڵ حوســێندا زۆر ترســابووین. ئەوە یەکەم جارمان بوو تووشــی لێــدان و کوتــان و تەقــە ببین و هاوڕێمان دە شــەلاڵی خوێنــدا ببینین. خوار ماڵی خۆمان هەموو ڕۆژ تابلۆی دوکتۆرێکی ســابلاغیم دەدیت و

دەمزانــی ئەو دوکتۆرە لەوێیە، گوتم حوســێن ئــاگات لێی بێت دەچم و دەیهێنم. هەموو دەســت و جلەکانــم خوێن بوون، هەرچی هاوارم کرد، لەسەر پەنجەرەی سەرووی مەتەبەکەی[1] خۆی نیشان دام و بۆم باس کرد چمان لێ قەوماوە، گوێی نەگرت و دوو جنێوی دا و دەریکردم. لە گەڕانەوە بۆ ماڵ بیستم بریندار یەکجار زۆرن و خەستەخانەی شاپوور کە زۆر دوور نەبوو لە ماڵمانەوە، بریندار ڕادەگرن. هاتمەوە حوســێنی بــرام تەواو شــپرزە و شــێواو و خوێنــاوی بوو، فەرشــێکی گەورەی تەورێزمــان بوو، هەر هەمووی خوێن بوو، باقی لە ناوەڕاســتیدا تخێڵ بوو[2]، کە زانیمان پشــتملی گرتووە، ترســاین بمرێت. گوتم دەچم بزانم تاکســی پەیدا دەبێــت. هەرچەند بردنی بۆ خەســتەخانە، گەر تیماریش کرابایە بە واتای گرتن و زیندان بوو. هاتمە ســەری جادەکە و دەســتم بــۆ دەیان ســەیارە بەرز کــردەوە، کــەس ڕاینەدەگرت، ســەیارەیەکی بچــووک هــات گوتم، ئاغا دە تمەن و بمبە بۆ خەســتەخانەی شــاپوور نەخۆشــم هەیــە خێــرت دەگا، پارەکە زۆر بوو، لە کاتی ئاســاییدا هەر تمەنێک یان دوو تمەن بوو. گوتی، باشــە برۆ نەخۆشەکەت بێنە. لەگەڵ حوســێندا کە باقیمــان هێنا، زانیــی بریندارە نرخی زیاد کــرد، گوتمان چیت دەوێت هەر بمانگەیەنە. گوتی بیســت تمەن. جادەکان پڕ بوون لە ســەرباز و ئامبولانس، حەوشەی خەستەخانە جمەی دەهات لە خەڵک، بــە هاتوهاوار و دەمرێ و دەمرێ باقیمــان گەیاندە هۆڵی لای ژووری عەمەلیــات، بە دەیان کەســی بریندار و مردوو لــە ڕاڕەو و بەر پلیکان و تەنانەت حەوشــە کەوتبوون. باقی ســمێڵێکی ڕەشی جوانی ستالینیی هەبــوو، هەمــوو پێیان وا بوو لە ســەرکردەکانی چریک و شــتی وایە، دوکتۆرێکی زۆر میهرەبانی جەوانی فارسمان لێ پەیدا بوو، لەگەڵ دوو پەرســتاری زۆر جوان و تەڕ و ناسک. دوکتۆر بە پەرستارەکانی گوت بیبەن بۆ ئەشیعە و زوو بیبەن بۆ ژووری عەمەل. زانیی من و حوسێن

---

١- مەتەب، عەیادەی دوکتۆر.

٢- تخێڵ، بەسەر زەویدا پانەوەبوو.

کوردیــن و زۆر حورمەتی گرتین. زۆری نەبرد ئێمە لە پشــت دەرگای عەمەل وەک شــێتان نیگەران و لە هاتوچۆدا بووین، چەند ئاشــنایەکی خۆم بە برینداری دیتن، دوکتۆر بە بزەی لێو هاتە دەر و گوللەیەکی لە دەســت ناین، کە لە پشــتملی باقی هێنابوویە دەر. لە ڕووی ئەشیعەکە، بۆی باس کردین؛ بە هۆی مەســافەی زۆرەوە گوللەکە سارد بووەتەوە و ڕێک لە ســەری شــادەماری بڕبڕەی وەستاوە، هیچ خەتەری لەسەر نییــە و تەنیــا خوێنی زۆر لێ ڕۆیشــتووە و دەبێت ئیســتراحەت بکات. کچــەکان ئێمەیان بردە لای باقی، وەهۆش نەهاتبووەوە، گوتیان دەبێت لێرە بێت، لەگەڵ حوسێن لێیان پاڕاینەوە گەر بێتو لێرە بێت، دەیگرن و لــە زیندانی دەکەن. وەعدیان دا بەیانــی زوو بچین بۆمان دەرباز بکەن و لــە ماڵــەوە تیمــاری بکەین. هاتینــەوە بە ماندوویی و هیلاک، شــەو درەنگ بوو، چەند هاوشاریمان لێ پەیدا بوون و ماڵمان پاک کردەوە و ڕێوشوێنمان لە ئەگەری هاتنی ساواک دانا و زۆر شتمان کۆ کردنەوە، فەرشمان خاوێن کردەوە و ئاساری خۆین و برینداریمان نەهێشت.

## هاوڕێی ناو ڕۆژنامەکە

بەیانــی لەگەڵ حوســێندا چووین بۆ لای خەســتەخانەی شــاپوور، ڕۆژنامــەی ئیتلاعــات گەورەتریــن ڕۆژنامــەی ئێــران دەرچووبــوو، لاپــەڕەی ئــەوەڵ و نیوەی تــەواوی، وێنەیەکی گــەورەی باقی بوو بە سمێڵێکی گەورەی چریکی. ئیتر هەرچی کردمان هەر نەیانهێشت نزیکی حەوشەکەش بینەوە، قەرار لەگەڵ پەرستارەکان ئەوە بوو، ئەوان باقی بێنــن بۆ دەرەوەی خەســتەخانە و ئێمەش بە تاکســی بیبەینەوە ماڵ و دواتر بۆ ســابلاغ و ماڵی باوکی. دار و بەرد سەرباز و پیاوانی ساواک بوون، هەرچۆنێک بێت یەک لە کچەکان خۆی گەیاندە من و حوسێن و گوتی، شەو ڕۆژنامەنووس هاتوون و باقی لە سەر تەخت کە وەهۆش هاتبووەوە یەکســەر چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کردووە، ئێستاش پاسەوان لەســەری وەســتاوە و هیچمان بۆ ناکرێت و دەیگوازنــەوە بۆ زیندان.

چەندێک وەستاین و حەولمان دا شتێک بکەین و بیفرێنین و پەنجەرە و ڕێگەی دیکەمان تاقی کردەوە، هیچی سەری نەگرت. هاتینەوە ماڵ و لە دوورەوە هەستمان پێ کرد ماڵەکەمان لەژێر چاودێریدایە و کێشکچی لەسەر کۆڵانەکەیە. پاشەوپاش کشاینەوە و بە کۆڵانی پشتەوەدا وەسەر دیوار کەوتین، هەرچی کتێب و شتی وا هەبوو لە جانتایەک لە حەوشەدا چاڵمان کرد و هەر بەسەر دیواردا هاتینەوە سەر جادە، بە تاکسی خۆمان گەیاندە ئیستگەی «راه آهن» واتا ڕێی ئاسن، شوێنێک بوو لە دەرەوەی شار، شەمەندەفەر لەوێڕا دەڕۆیشت بۆ شارەکان. شار بە شار بە سەیارە و لۆری و دەستبەرزکردنەوە خۆمان گەیاندەوە سابلاغ، هەموو نیگەران بوون، خەبەری باقی لە ڕۆژنامە هەموو کەس بیستبووی، باقی بووبوو بە پاڵەوانی ناو خەڵک.

## ٥

### چلەی کوشتاری تەوریز

ماڵ و کاشـــانەم شـــێواو و نەمانوێرا بچینەوە تەوریز، خەبەر هات هەموو ئەوانەی ڕۆژی مێژوویی شـــەممە ٢٩ی ڕێبەندانی ســـاڵی ١٣٥٦ واتـــا ١٨ی مانگـــی دووی ســـاڵی ١٩٧٨، ڕۆژی کوشـــتاری خوێناویـــی تەوریز، نەچوونەوە بۆ سەر کار و زانکۆ و مەدرەسە هەمووی دەگیرێن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت. باقی و سەدان کەسی دیکە گیران و لە زیندانەکانی شادا بەند کران.

چلەی کوشـــتاری تەوریز لە زۆربەی شـــارە شیعەکانی ئێران گیرا، چلە کە تایبەت بە مەزهەبی شیعەیە و لە «اربعین» واتا ٤٠ ڕۆژ دوای مەرگـــی ئیمامـــی حوســـێنەوە هاتووە، بـــوو بە باو و تەنانـــەت چەپ و کۆمۆنیســـتەکانیش چلەیان بەکار دێنا بۆ دژایەتی و خۆپێشـــاندان دژی شا.

بە کەمتر لە ســـاڵێک چلـــە بەدوای چلەدا، شـــا بارگەوبنەی تێوەپێچاو و ڕژیمی پەهلەویی باوک و کوڕ دوای پەنجاوچوار ســـاڵ وایان لێ هات شـــوێنگۆڕێکیان دەســـت نەکەوێـــت. خومەینی بە ســـووربوونی خۆی لە نەجەف و پاریســـەوە شای ڕووخاند و واشی کرد هەموو هێزەکانی تری دژی شـــا، جگـــە لە کوردســـتان بکەونە ژێـــر ڕکێفـــی هەژموونی خۆی و کۆماری ئیسلامی. مێژوو وا دەڵێت، بەڵام ئایا بەڕاستی خومەینیی ئاخوند شای ڕووخاند یان شا چیتر خوازراو و جێی متمانەی ڕۆژئاوا نەبوو؟!

یـــان کۆبوونەوەکانـــی گوادەلـــۆپ لـــە ســـەرەتای ســـاڵی ١٩٧٩دا لەنێوان ســـەرۆکەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمان و فەرانســـە، وتارە حەماســـییەکانی ڕۆژانەی ڕادیۆ بی بی سی و فەرانسە دژی شا، تاج و تەختیان تێکەوە پێچا؟!

## یەکەم ڕاپەڕین و خۆپێشاندانی شارەکانی کوردستان

چـوار مانـگ بوو هەموو شـارەکانی ئێـران چلە بە چلـە دژایەتیی خۆیان لەگەڵ شـادا ڕاگەیاندبوو، ڕۆژانە شـەهید و بریندارییان هەبوو. لە کوردسـتان و شـارەکەی منیش هیچ خەبەر نەبوو. لە پێنجی مانگی شەشی ١٩٧٨دا کاک عەزیز یوسفی کەسایەتیی بەناوبانگی کوردستان، دوای بیستوپێنج ساڵ زیندانی ئازاد کرا و دواتر لە تاران کۆچی دوایی کـرد. دوو ڕۆژ دواتر بە بەشـداریی هەزاران کەس بەرەو گۆڕسـتانی بوداق سـوڵتان بەڕێمان کرد، مامۆسـتا شـێخ عێزەدین حوسـێنی بە کوردی تەڵقینی دا و حەماسی بەشداربوان بەرز بووەوە. خەڵک بە کۆ بەرەو گۆڕی شـەهیدی سـەرکردە سولەیمان موعینی چوون و دەست کرا بە سرووودی کوردی و دروشمی مەرگ بۆ شا گوتنەوە. ئەوجار بە ڕێپێوان بەرەو شار بووینەوە، ئەو ڕۆژە وەک بیرم مابێت لاوێکی شار بە تیری سـەربازی شا پێکرا و شەهید بوو. ئەوە وەک یەکەم ڕاپەڕین و خۆپێشاندانی شارەکانی کوردستان تۆمار کرا.

## کتێبە بێناونیشانەکان

کتێبی بەرگسـپی، کتێبگەلێک بوون بۆ شوێنەونکێ و شاردنەوەیان هیچ لە بەرگەکەیان نەدەنووسـرا. هەموویان مارکسی و سەر بە چەپ بـوون، کـەس نەیدەزانی لە کـوێ چاپ دەکرێن و کـێ چاپیان دەکات، بـەس دیار بوو زۆربەیان سـەر بـە حیزبی تودەی ئێـران بوون و لە لای ئەوانـەوە بڵاو دەکرانەوە. تەورێز کانگای ئەم کتێبانە بوو، زۆر بە قاچاخـی دەچووم و دەمهێنان، لـە چوارڕێی ئازادی بە یارمەتیی چەند هاوڕێ پانمان دەکردنەوە، یەک و دوو دەمانفرۆشتن، پاسەوان و پۆلیس هێرشـیان دەکرد، دەمانپێچـاوە و هەڵدەهاتین. لە تەزاهوراتی ڕۆژانەی شـار هەسـتم کرد خەڵک خوازیاری سـروودی کوردین، نامیلکەیەکی کۆنـم هەبوو لـە باشـوورەوە هاتبـوو، هەمووی سـروودی کوردیی

سەردەمی شۆڕش بوو، بە یارمەتیی کچێکی خزممان، لە ئیدارەیەک تایپیست بوو، زۆر بە ترس و پاڕانەوە ڕازی بوو ئێواران دوای دەوام بێ و بۆم تایپ بکات. تایپێکم لە کوڕی پوورم، کە کۆمپانیای هەبوو، وەرگرت، هەرچەند زۆر بە ترسەوە دای، هەموو لاپەڕەکانی نامیلکە و سروودەکانم لەسەر ئیستنسیڵ تایپ کرد، ئەوجار دەبوو ڕۆنیو، واتا دەزگای چاپی پۆلیکۆپی پەیدا بکەم. گوتیان لە خەستەخانەی سیل یەکدانەی لێیە، نیوەشەو لەگەڵ چەند هاوڕێ چووین و هێنامان، باشترە بڵێم بە زۆر داگیرمان کرد.

### کتێبی سروود

لەو ماوەیەی هاتبوومەوە سابلاغ، پەیوەندیی توندوتۆڵم لەگەڵ پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە قەندیل و هاوڕێیانی کۆمەڵەی مارکسی- لینینی گرتبوو، هەروەتر لەم ڕێیەدا کۆمەڵێک هاوڕێی تازەم پەیدا کردبوون، کاک سولەیمان بللوری، جەمال موفتی، کەریم بللوری، مەمەد سەبزەچی، مینە قەڵەو و زۆری دیکە، کە بە خۆشییەوە لە ژیاندا ماون و ناویان نابەم.

بە یارمەتیی ئەم هاوڕێیانە شەوانە تا بەیانی لاپەڕەکانی «سروودی کوردی بۆ لاوان»مان چاپ دەکرد و بەیەکەوەمان دەنووساندن. کتێبمان تەواو کرد، بە ناوی خوازراوی «هێرش چالاک» ئامادە کرا.

ڕۆژی دواتر زیاتر لە ٥٠٠ کتێبمان لەناو کارتۆن و گوێنیدا بردە چوارڕێی ئازادی و لە ماوەی کەمتر لە یەک سەعاتدا، دوای یەک دوو جار هێرشی پۆلیس، هەموویمان فرۆشت و بڵاو کردەوە. ڕۆژی دواتر هەر وەک هەموو ڕۆژانی تر ڕێپێوان دەستی پێ کرد، کە بینم خەڵک کتێبی سروودی کوردییان بە دەستەوەیە و شیعر و سروودەکان بەبێ هەڵە دەڵێنەوە، لە خۆشیان پێم وا بوو بە عاسماندا دەڕۆم. خەڵک نەیدەزانی «هێرش چالاک» کێیە.

## کارەساتی هەکاری

دوای برینداربوونـــی باقیـــی هاوەنزلّـــم لە تەوریـــز، زۆربەی کات لە ســـابلاغ بووم، لەو ماوەیەدا بیســـتمان کارەســـاتێکی گەورە بەسەر پێشـــمەرگەکانی یەکێتیـــدا هاتـــووە و زیاتـــر لە ٧٠٠ کـــەس تێداچوون، بە کوشـــتن و برینداربوون و تەســـلیمبوونەوە و وازهێنان. کارەســـاتی هەکاری لەنێوان مانگەکانی پێنج و شەشـــی ســـاڵی ١٩٧٨دا ڕووداوێکی دڵتەزیـــن و ناخـــۆش بوو، بـــە تایبەت ماوەیـــەک بوو دوای ئاشـــبەتاڵ شۆڕشـــی نوێ هەستابووەوە ســـەرپێ و کۆمەڵێک هاوڕێ بووین زۆر دڵمان پێی خۆش بوو، خەبەر بە باشی نەدەگەیشت، لە لایەک نەبوونی ئامرازی پەیوەندی و لە لایەکی تریشەوە توندوتیژیی پیاوانی ساواک، بە تایبەت لە سابلاغ و سەردەشت و خانێ. خەبەر وا هاتبوو کەس نەماوە و ســـەرانی قیادە موەقەت هەر هەموویان کوشتوون و بە زیندوویی لە شاخ هەڵیانداشتوون و بە ئاڕ پی جی لەناویان بردوون.

## یارمەتی بۆ پێشمەرگەی باشوور

ئێمە بە تایبەت لە ســـابلاغ دوای ناشـــتنی کاک عەزیز، ترســـمان لە دەزگا و پیاوانی ساواک ڕەویبووەوە و ئێواران بە بیانووی یارمەتی بۆ لێقەوماو یان هەژاران، گۆیا ماڵەهەژارێک ســـووتاوە و شـــتی وا، بەناو جادەکانـــی شـــاردا دەهاتینە خوار و کڵاوەکانمـــان ڕادەگرت و پارەمان کـــۆ دەکردەوە، خەڵک کە دەیدیت خەڵکی ناســـراوی وەک ئێمە ســـواڵ دەکەین، زۆر بە حورمەتەوە یارمەتیی باشیان دەکردین و زۆربەشیان دەیانزانـــی هـــەژار و ماڵســـووتان بیانـــووە و پارەکە بۆ پێشـــمەرگەی باشوور و یەکێتیی نیشتمانییە. زۆربەی جاران من و سولەیمان بللوری کۆمـــان دەکردەوە و دەماندا بە دەرمان، خواردەمەنی، پەتوو، کاپشـــێن و جلوبەرگ.

**بێتەڕەف بێشەرەفە**

لە ماوەی بەهار و هاوینی حەفتاوهەشتدا، وەک چالاکێکی ڕێپوانەکان و کۆبوونــەوەی مزگەوتــەکان دەرکەوتــم، بــە هۆی فرۆشــتنی کتێبە (بەرگســپییەکان) و بڵاوکردنەوەی سروودی کوردی، خەڵک دەیناسیم و بەرچاو بووم. خەڵکی شار ڕۆژانە دەیان جار بە بەر دوکانی باوکمدا دەڕۆیشــتن، دوکانەکەی ڕێک لەناو دڵی شــاردا بــوو، هەموو ڕێڕەوی خۆپیشــاندانەکان هــەر دەبــوو بەوێدا گــوزەر بکات. باوکیشــم لەبەر دوکانەکەی ڕادەوەســتا و ســەیری دەکرد و زۆر جــار خۆم لە چاوی نەدیو دەکرد، بەڵام هەر دەشــیدیتم. کاتی یەکتربینین و شــەوان گەر لە ماڵ بام، هەر شەڕمان بوو، دەیگوت هەموو ئاژاوە و فیتنەی ئەم شارە لە بن سەری تۆ دایە! ئێوارەیەک چوومەوە، باوکم غەزەبی لێ دەباری و لەگەڵ دایکم و کاکم بە دەنگی بەرز لە گفتوگۆی شــەڕانیدا بوو، هەر منی بینی گوتی: بێشــەرەف بۆخۆتی، ئیتر هەرچی جنێو و ســەگباب و چی و چی! گوتم:

- دایە، کاکە، چ بووە؟ چم کردووە؟!

- بۆ بە باوکت دەڵێی بێشەرف؟!

- هەرگیز شتی وام نەگوتووە!

- بابم: ئەی بێشەرەف! درۆ دەکەیت خۆم بە چاوی خۆم و بە گوێی خۆم ئەم ئێوارەیە لێم بیستی!

- وەڵڵا شتی وا نییە!

گوتــی: ئاغــا! ئــەم ئێوارەیە جەنابت بــە بەر دوکانی منــدا نەهاتن؟ هەزاران کەست وەدوای خۆت نەدابوو؟! مستت ڕانەدەوەشاند؟! پێت بە عەرددا نەدەدا؟! یەک بۆ خۆت هاوارتان نەدەکرد «بێتەرەف بێشەرەفە»!

- ئەوجار زانیم! بەخوا بابە گیان لەگەڵ تۆمان نەبوو.

جیرانەدوکانی باوکم، دوو ســێ دوکان خوارتر پیاوێکی ســابڵاغی بوو، شووشــەواتی دەفرۆشــت، خۆی و کوڕەکەی بە ســاواکی ناویان دەرکردبوو. باوکم ڕاستی دەکرد، هەر کە ڕیزەکەمان گەیشتە بەرامبەری

دوکانەکەی، هەموو یەکدەنگ دروشمی «بێتەرەف بێشەرەفە»مان زۆر بە حەماسەوە دەگوتەوە.

- بابە هەموو دەزانن مەبەستمان حاجی... بوو!

- ئاخر بۆیە تۆ بێشـــەرەفی! ڕۆژی دوای ناشـــتنی عەزیز یوســـفی هـــەر ئەم حاجییە، کە لای تۆ بێشـــەرەفە، بەیانـــی زوو جەنابت لە خەو هەڵنەستابوویت، هات و لە دەرگای دا، گوتی میرزا برایم با عەلی چەند ڕۆژ بچێتە دەر و دیار نەبێت. نەهاتم گوتم عەلی بڕۆ لە دەرەوەی شار بـــە و دەتگـــرن؟! ئەوە پیاوەتیی حاجی... بوو، کە نەگیرایت و داریان تێ نەبڕییت هەی بێشەرەفی سەگباب!

ئەوجـــار، مـــن بێتەرەفـــم، نـــە لای ئێوەم و نە لای شـــا، بـــۆ دەبێت بێشەرەف بم؟!

ئیتـــر دیار بـــوو فایدەی نییە و زۆر خەڵکی بازاڕ بەم دروشـــمەمان تووڕە بووبوون! زۆرم حەول دا ئاشـــتی کەمەوە، دیار بوو حاجی... لە دوکان گلەیـــی لە باوکم کردبوو و گوتبووی خۆ من چاکەم لەگەڵ ئێوە و عەلی کردووە!

### مامۆستا شێخ عێزەدین

یـــەک دوو ڕۆژ دواتر هەر بە هەمان جادە و بە بەردوکانی باوکمدا هاتینە خوار و مامۆستا شێخ عێزەدین لە پێشی پێشمانەوە بوو، «مەرگ و نەمـــان بۆ شـــا» و «بڕوخێ بڕوخێ» و ســـروودی ئـــەی ڕەقیبمان دەگوتـــەوە. باوکـــم و زۆربـــەی دوکانـــدارەکان هاتـــن و چوونە ڕیزی مامۆستا و دەستیان لە ئێمە بەرز کردەوە بە نیشانەی ڕازیبوون. ئێوارە هاتـــەوە و بە شـــادی و پێکەنین گوتی: ئەدی کـــوڕی خۆم، ئەگەر دوو پیاوی پیاوانەی وەک مامۆستاتان لەگەڵدا بێت، ئێمەش پشتیوانتانین!

لەو ڕۆژەوە بۆ پاراســـتن و پاسەوانیی مامۆستا بە تایبەت، شەوانە کۆمەڵێک لاوی سابڵاغ لە ماڵی مامۆستا کێشکمان دەکێشا و یەک دوو لەمانە دواتر بە ســـمێڵی گەورە و کڵاشـــینکۆفەوە لە هەموو ئێران وەک

پاسەوانی مامۆستا ناویان دەرکرد؛ وەک مستەفا سوور و خالید سمیڵ.

هاتنی مامۆستا بۆ نێو خەڵک و ڕێپێوانەکان، گیانێکی تازەی وەبەر خەڵک نا، دیسان بۆ جارێکی تر سابڵاغ بووەوە مەکۆی شۆڕشگێڕی و خەبات و کوردایەتی. دیسان دوای کۆماری کوردستان، ئەم شارە بوو بە ناوەندی سیاسی، نە تەنیا لە ڕۆژهەڵات، بگرە لە هەموو کوردستان.

ڕۆڵ و کەسایەتیی مامۆستا وەک ئیمامی جومعەی شار؛ لەو کاتەدا کە لە هەموو شارە گەورەکانی ئێران مزگەوت و ئاخوند دەوری سەرەکییان دەگێڕا، پێویستییەکی گەورە بوو. مامۆستا نە تەنیا لە باری مەزهەبی کێشەکەی ڕاست دەکردەوە، بەڵکو بەو ئەندازەیە بگرە زیاتریش دۆست و هاوپەیمانی هێز و خەڵکانی چەپ و سێکۆلار بوو، ئەو بە ئاشکرا قسەی خەڵکی پێشکەوتووی دەکرد و خوازیاری جیایی دین و سیاسەت و دەسەڵات بوو.

ماڵی ئێمە و مامۆستا هەر لە یەک گەڕەک بووین و زۆر دوور نەبووین، زۆربەی کات دەرگای ماڵیان ئاوەڵا بوو، پڕ بوو بە تایبەت لە گەنجان و مامۆستایانی شار. مامۆستا زۆری حورمەتی مرۆڤی شۆڕشگێڕ دەگرت، خەڵکی زۆر باش و خۆشەویست لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەوریان گرت و تا درەنگانی شەو لای دەمانەوە. هەرچەندە ماڵەکەی مامۆستا خانوویەکی زۆر سادە و بچووک بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خێزانێکی گەورە و زیاتر لە نۆ کەس بوون، هەرگیز ماندوو نەدەبوون لەو هەموو میوان و چادانان و نانخواردن و دانان و هەڵگرتنە. مامۆستا بۆ ڕاکێشانی خەڵک و یەکڕیزی، بە تایبەت پێش سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، دەوری گەورە و مێژوویی گێڕا. ئەو بە کردەوە لە ناو ماڵی خۆی کە شەش کچی هەبوو، سەلماندبووی بڕوای بە یەکسانی و مافی ژن هەیە، بڕوای بە حکومەتێکی دوور لە ئایین و مەزهەب، سێکۆلار و عەدالەتخواز هەبوو. قسە و وتەکانی مزگەوتی پڕ بوون لە ئامۆژگاری بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگەیەکی مۆدێرن و دوور لە توندوتیژی. مامۆستا ئیمامی جومعەی شار بوو لە مزگەوتی کۆن و مێژوویی شار،

مزگەوتی سوور. لەناو بازاڕیش مزگەوتێکی خۆی هەبوو و زۆرتر بە ڕۆژ لەوێ دادەنیشت. بەیانیان بە دەیان لاو و خەڵکی چالاک بۆ ڕووخانی شا، دەچووین و لە دەوری دادەنیشتین، وردەوردە وای لێ هات مزگەوتەکان بوونە ناوەندی قسە و گفتوگۆ و شوێنی بڕیاردان. خەڵکی توندڕەوی ئیسلامی زۆر کەم بوون و زۆربەی چالاکەکانی شار لاوانی چەپ و دوور لە ئینتیمای مەزهەبی بوون. مامۆستای زۆر خۆشەویستی مەدرەسەکانی سابڵاغ، کاک کەریم دانشیار، یەک لە هەرە دەموچاوە شیرین و خۆشەویستەکانی لاوانی شار بەکردەوە بووبوو بە ڕاوێژکارێکی دانا و بە مشووری مامۆستا شێخ عیزەدین. زۆربەی کات دەیان لاو بە گۆپاڵ و جاروبار بە دەمانچەوە، لەبەر دەرگاکەی ئامادە بوون. بە هەزاران کەس بەشداریی نوێژی جومعەیان دەکرد، تەنانەت ئەوانەی کە نوێژیشیان نەدەکرد هەر دەهاتن. قسە و باسکردن لەسەر کەسایەتیی مامۆستا و ڕووداوەکانی تەمەنی ئەم پیاوە نوورانییە، سەدان لاپەڕە هەڵدەگرێت و حەقە کارێک و لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی، ئاکادیمی، سیاسی و کۆمەڵایەتیی فرەڕەنگی لەسەر بکرێت و باشتر بە نەوەی داهاتوو بناسێندرێت. لێرەدا من ئەوەم بۆ دەکرێت لە گۆشەنیگای پێشمەرگە و کەسێک کە لە نزیکەوە شانازیی ناسینیم پێ براوە، لەم کورتە بیرەوەرییانەمدا باسی بکەم.

# ٦

## شەهیدبوونی خانەی موعینی

هەر لەو سەروبەندە و هاوینی ١٩٧٨ بە هۆی کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی، کە تێکەڵاویمان ئیتر زۆر بووبوو، بیستم کاک خانەی موعینی، کە تازە لە زیندان وەک قارەمانێکی ئەشکەنجە ئازاد بووبوو، زۆر جار لەناو شار دەماندیت و وەک مرۆڤێکی سەنگین و ئارام و بێدەنگ و گۆشەگیر دەماننناسی، چووەتە باشوور بۆ لای پێشمەرگە و سەرکردایەتیی یەکێتی، تووشــی شــەڕ هاتوون و شــەهید بووە. هەواڵێکی جەرگبڕ و ناخۆش، ئەوە بوون بە ســێ برای شــەهیدی بنەماڵە. کاک خانــە برای بچووکی کاک ســولەیمان و عەبدوڵڵای موعینی بوو. یەک دوو جار سیمامەندم لە ســەرجادە و خۆپێشاندان بینی و هەستم کرد هیچی نەزانیوە، بۆیە هیچ باســم نەکرد، هەتا چەند ڕۆژ، وردەوردە خەڵک هەستیان بە خەبەرەکە کردبوو. برادەرانی یەکێتی و کۆمەڵەی ڕەنجدەران ئەوجار بە ڕەســمی بنەماڵە و خەڵکیان لێ ئاگادار کردەوە و چۆنێتیی ڕووداوەکەمان بیست. لە دێی دڕی لە ناحیەی ماوەت کاک خانە تووشی پێشمەرگەکانی یەکێتی هاتووە و داوای کردووە بیگەیەنن بە سەرکردایەتی، ئەوانیش شەو لەم دێیە ماونەوە و نەیانزانیوە ئیخباری کراون، بەیانی زوو جاش و جەیش دەوریان داون، کاک خانە و بەرپرسی مەفرەزەکە کاک ئەحمەد فەتحوڵڵا و چوار پێشمەرگە شەهید بوون.

## کادیرانی یەکێتی لە سابڵاغ

لە هاوینی ئەو ساڵەدا زۆر بە خێرایی، شار و گوندەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردســتان بەر شەپۆلی بەرینی ڕاپەڕینی خەڵک دەکەوتن و ڕۆژانە لە هەموو شارەکان خۆپێشاندان و شەهید و بریندار و گرتن هەبوو. ئەوە

وای کردبوو پێشمەرگەکانی باشوور دوای کارەساتی هەکاری بە هۆی هاتوچــۆی خەڵکــی ڕۆژهەڵات بۆ لایان و جووڵــەی خۆیان و بێورەیی ژاندەرمی شا، تا ڕادەیەکی باش ببوژێنەوە و گیانێکی تازە بگرن.

یەک دوو کادری باڵای یەکێتی و کۆمەڵەی مارکسی هاتن بۆ سابڵاغ و زۆر زوو لەگەڵ شــەهید ســولەیمانی بللــوری بەرەوپیریان چووین، وەک شۆڕشگێڕ و خەڵکانی بەرز، بە حورمەتەوە چاومان لێ دەکردن، ئەو قەدر و ڕێزەی ئێمە و بنەماڵەکانمان لێمان دەگرتن، بەو قورســاییە بــوو کە هەمــوو خەڵکانی جیهان لــە قارەمان و ســەرکردەی خۆیانی دەگرن، ئەوان بەڕاستی لامان گەورە بوون و ئازیز. هەرچی ویستبایان، هەبا و نەبا دەســتبەجێ ئامادە کرابوو. خەڵکی ســابڵاغ دەیانزانی ماڵی ئێمــە و شــەهید ســولەیمان بــە زۆری کادر و پێشــمەرگەی لێیە، هەر بۆیــە زۆر بە حورمەتەوە دەیانڕوانییە ئێمە و زۆر جار بە تەعلیق و لە بنــەوە پێیــان دەگوتین، ئێمەش حەز دەکەین لــە خزمەتیاندا بین و هەر بۆخۆتانیان دامەنێن، ئێمەش خۆمان لێ گێل دەکردن و دەمانگوت هەر کات هاتن بە چاوان؟!

هاوینی ٧٨ ئەو هاوینە بوو بەڕاســتی ئێمە وەک کوردی ڕۆژهەڵات نەمانهێشــت کارەساتی هەکاری زۆر بە پێشــمەرگە و شۆڕشی نوێوە دیار بێت و برینەکان زۆر بە توندی ســاڕێژ دەبوونەوە و جارێکی دی کوردی باشــوور بەرەو بەهار و بووژانەوە هەنگاوی دەناوە. بە دەیان پێشــمەرگەی کۆمەڵەی مارکســی لای ئێمە و بە قاچاغ مداوا دەکران و بۆ شــارە گەورەکانی ئێران بەڕێ دەکران. مام ڕۆستەمی پێشمەرگەی ناســراوی شۆڕش بە برینداری گەیشتە سابڵاغ، کاک کەریم دانشیار و کەریــم قادری دوای خزمەتێکی زۆر ڕەوانەی ناو شۆڕشــیان کردەوە. نامیلکەی کۆمەڵەی مارکســی-لینینی کوردستان[1]، پەیڕەو و بەرنامەی کۆمەڵەیــان پــێ دام و بــە قاچاغ لەگەڵ چەند پۆســتەری شــەهیدان و

---

[1]- کۆمەڵەی مارکسی- لینینی کوردستان- ئەندێشەی مائۆتسە تۆنگ، دواتر لە سەرەتای ١٩٧٩دا ناویان گۆڕی و بوو بە کۆمەڵەی ڕەنجدەران.

نامیلکەی دیکە لە تەوریز بۆم چاپ کردن و هێنامنەوە.

کاک دلێـر سـەید مەجیـد کادری بـالای کۆمەڵە و سـەرکردایەتی بەزۆری لای ئێمە بوو، خەریکی دابینکردنی شتومەک و پەیوەندی بوو، زۆر چـالاک و لێزان بوو، لە هەر قوژبنێک بایە، پێشـمەرگە، بریندار و تۆراو دەیاندیتەوە و داواکارییان لێی هەبوو، دیار بوو لە شـنۆ، خانێ، سەردەشت و سەقز، خەڵکی دیکەشی دەناسین و یارمەتییان دەدا.

کاک سولەیمان بللوری تیمێکی باشی لە کوڕە خاس و بەحەماسەکانی شار وەک شەهید جەمال موفتی و شەهید کەریم بللوری، عەبووی برای و چەنـدی دیکە ئامادە هەبوو بۆ یارمەتیکردن و خزمەت بە هاوڕێیانی یەکێتیـی نیشـتمانی. کاک دلێر ئـەو کوڕانەی دەناسـی و زۆر جار بۆ هاتوچۆ و گواستنەوەی شتومەک و تەنانەت چەک، هاوکارییان دەکرد.

## شەڕی ڕووخانی شا

لە مانگی دووی سـاڵی ۷۸وە شـەڕی ڕووخانی شـا دەسـتی پێ کردبوو، ڕەوتی ڕووداوەکان زۆر خێرا و هیچ بە قازانجی شـا نەبوو، هـەر دەهـات و خومەینـی، کـە بـە کـردەوە بووبوو بە سـەرکردەی شـۆڕش، زۆرتر پێی دادەگرت لەسـەر ڕووخان، جگە لە ڕۆیشتنی شا هیچـی دیکەی قبووڵ نەبـوو، لەگەڵ بەرهەڵسـتکارانی چەپ و لیبراڵی ئۆپۆزسیۆنی شا، زۆر باش مودارای دەکرد و وەعد و وەعیدی زۆری دەدا بە قسە و لێدوانەکانی، کە ئێرانی دوای شا، دێموکراتیک و بە دڵی چینی زەحمەتکێش و ئازادی بیروڕا دەبێت.

لە دوای هاتنەوەم لە تەوریز و جێهێشتنی خوێندن و ماڵ و هێلانەکەم، سیاسـەت و شۆڕشگێڕی بوو بە پیشە و ئامانجی تا بە ئەمڕۆم. ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنووسـم ڕێک چل سـاڵ زیاتری لاداوە، هیچ پەشیمان نیـم لەم چل سـاڵەی تەمەنی خـۆم و بگرە تەنیا سـەروەریی ژیان کە هەمبێت، بیرەوەریی پڕ لە خۆشی و بڕک و ژان، دەربەدەری، دووریی نیشـتمان و ئەلبوومێکی پڕ لە فەخر و شـانازیی هاوڕێیانی شـەهید و

زیندووه. بۆچی دەبێت پەشـیمان بم لە چل سـاڵ تەمەنی پڕ لە هەوراز و نشـێو، پڕ لە ئومێد و نائومێدی، پڕ لە حەماسـە و داسـتان، ناسینی سـەدان مرۆڤی پاک و شۆڕشـگێڕ لە هەر چوار پارچەی کوردسـتان؟ لە کورە سپیوسـۆڵێکی خاوێن و دەسـتوپێ بەخەنەی نازداری شاری، بوومە پیاوێکی سەروریش سپیی کوردەواری، بە ناسینی دەیان جوتێر و ئاغا و پیاوماقوڵ، سەرکردە و ئەدیب و نووسەر، دیتنی دەیان شاری گـەورەی جیهـان، تێکەڵاویی هونەرمەندان و چالاکی سیاسـیی نەوەی نوێ، هەگبەیەکم پێیە مەگەر خوا هەر بۆخۆی بزانێت چیی تێدایە؟!

## سولەیمان بللوری

هاتنەوەم بۆ سابلاغ و مانەوەی ئەم چەند مانگە لە ساڵی ٧٨ و چەند مانگێـک لـە ٧٩ یادگاریی پڕ بەها و زێڕینی منە، دەسـکەوتی گەورەی ژیانمـی تێدایە. یـەک لەو گەوهەرە نایابانە، ناسـینی شۆڕەسـوارێکی مەیدانی کوردایەتی، وەفا، خوشەویسـتی، پاک و بێگەرد و شۆڕشگێڕ، شەهید سولەیمان بللوری بوو.

هاتنەوەم بۆ سابلاغ و ئامادەبوونم لە کۆڕ و چوارڕێ و قاوەخانەکان، بە دیکۆر و قەدوگیپاڵ و جلوبەرگی سیاسییانە و لە تەمەندا هەر بیست سـاڵێک، سەرنجی زۆر کەسی ڕادەکێشا. کە دەڵێم دیکۆر و جلوبەرگی سیاسـییانە، وەک خۆی لێم وەرگرن، ئەوکات بۆ ئەوەی سیاسـی وێنا بکەیت، کراسـێکی فشـی جووت گیرفانی چینی، سیغارکێشـان بە مژی خەسـت و قووڵ، شـەڵواری کـوردی و زسـتانان پاڵتۆیەکـی درێژی ڕووسی، کەرەستەی لازم بوون. منیش ڕێک وا بووم.

دوو سـێ مێرخاسـی جوان هەبوون زۆرم دەدیتن، لە من گەورەتر بوون، زۆر چاونەترسانە وەک تابلۆی نەقاشی بە جلوبەرگ و شەدەی کـوردی زۆر جوان دەردەکەوتن. ئەوان چاویان لە من دەکرد و منیش ئارەزووم بوو لێیان نزیک ببمەوە. یەک لەوان سـولەیمان بللوری بوو، تـازە لە سـەربازی هاتبووەوە. ئێوارەیەک سـولەیمان لای سـەرووی

چوارڕێــی ئازادی لێم هاته پێش و ســڵاو و چاکوچۆنیی لەگەڵدا کردم. لە ماوەی چەند چرکەدا وەک دوو ناسراو و هاوڕێی چەند ساڵەمان لێ هات. ئەو کاکمی دەناسی و گوتی، جارێک هاوپۆل بووین.

لەشــولار و سمێڵ، جلوبەرگ، مشکی و پێچ و فەقیانەی، ڕێک وەک سوار و میرزادەکانی جزیر و بۆتان دەچوو، لە بازاڕ و جادە و کۆڵان، گەنجــان پێشــیان پــێ دەگــرت، داوای فێرکردنی جامانەبەســتنیان لێ دەکرد، ئەویش هەر لە جێوە بۆی دەبەستن، ئەو زۆربەی لاوانی شاری بەرەو پۆشینی جلوبەرگی کوردی هان دا، لە شایی و زەماوەندان خۆی گاوانیی بەر نەدەدا و عەبووی برای لە سەرچۆپی بوو، لە بوژاندنەوەی فەرهەنگ و کولتوری کوردی ســولەیمان و ئەم چەند کەســە، دەوری بالآیان لەناو خەڵک و لاوانی تازەپێگەیشتوودا بینی.

تێکەڵاوی لەگەڵ ســولەیماندا زۆر زوو هەمــوو ئەندامانی ماڵەوەی گرتەوە و بە کردەوەش بوو بە کوڕی ماڵمان. پیاســەی ئێوارانی شــار لەگــەڵ ســولەیمان و هاوڕێکانی، لەزەت و خۆشــیی ژیانمــان بوو، لە بەشــداریی ڕێپێــوان و چالاکیی سیاســیدا، ئــەو وەک قەڵایەک بوو، بە ســەدان وێنەی سەرکردەکانی شۆڕشەکانی کورد، قازی، موعینییەکان، مام جەلال، ئەختەر، مارگرێت و...ی بردە ناو خەڵک و گەنجانی سابلاغی فێری خوێندنەوەی ڕابردوو و مێژوو دەکرد. گۆرانیی ڕەسەن، بەیت و مەقام، سروود و کاسێتی هەموو هونەرمەندانی باشوور لای سولەیمان دەســت دەکەوتن. ئەرشیفی گۆرانی و سروودی کوردییەکەی، تەنانەت تۆمارگەکانــی شــار داوایان لێ دەکــرد، بۆ یەکەم جار ئــەو بوو کاک محەمــەد ماملــێ، عەزیــز شــاهروخ، عەزیــز ماملێ و ناســر ڕەزازیی بەرامبــەر یــەک لــە ماڵی خۆیــان دانا. لەم ســەفەرەدا بــۆ یەکەم جار ناسری بە گەنجانی سابلاغ ناساند و بەهرە و دەنگە جادووییەکەی ئەم هونەرمەندە تازەیەی بە حەق بەرز نرخاند.

ســولەیمان و بنەماڵەکەیان بە دڵ و گیان لە خزمەت پێشــمەرگە و کادر و بریندارەکانی یەکێتیی نیشتمانیدا بوون، هەر کەس بۆ یەک ڕۆژ

لەو ماڵە نزیک دەبووەوە ئیتر پێی دوور کەوتنەوە و وازهێنانی نەدەما، ئەوان بە تایبەت سولەیمان، کە دۆستایەتییان دەکرد، بەدڵ و گیان و یەکڕەنگی دەیانکرد. بە سەدان کادر و پێشمەرگەی یەکێتی، کەسایەتی و شۆڕشگێڕی باشوور و هەموو کوردستان، ڕێیان کەوتە ئەو ماڵە، پەنا دران، عیلاج و مداوا و بەڕێ کران بۆ هەندەران.

### دەسپێکردنەوەی چالاکییەکانی دێموکرات

ئەوکات تەنیا حیزبی سیاسیی کورد کە ناوی هەبوو، حزووری سیاسیی زۆر کەم بوو، هەشبا زۆر بە نهێنی بوو، حیزبی دێموکراتی کورستانی ئێران بوو، زۆربەی کادر و سەرکردەکانی لە بەغدا و وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بوون.

دەگوترا چەند کادری وەک سەید ڕەسووڵی بابی گەورە و مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەنزادە و... بە نهێنی لە گوندەکانی دەوروبەری سەردەشت و سابڵاغ دیتراون. چەند کەسی دیاری شار وەک سیمای دێموکرات دەناسران، نموونەی جەلیل گادانی، عومەر قازی و چەند کوڕە ئاغایەک.

### عەزیز یوسفی

کاک عەزیز یوسفی خۆشەویست و جێی ڕێز بوو بۆ خەڵکی سابڵاغ و بە تایبەت لاوان. ئەو نەیدەشاردەوە و فڕی بەسەر حیزبی دێموکراتەوە نەبوو، تەنانەت لە ڕوانگەی حیزبی تودەوە لە کۆڕی لاوان و لایەنگرانی خۆی، دژایەتیی ڕابەریی حیزبی دێموکراتی دەکرد، کاک عەزیز ئەندامێکی بەوەفا و لەمێژینەی حیزبی تودە بوو، بەڵام بە حوکمی زیندان و خۆڕاگریی زیاتر لە بیستوپێنج ساڵانی، کۆمەڵێک لاو و بنەماڵەی کۆنی تودەیی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، دواتریش بناغەی تودەییەکانی سابڵاغ هەر ئەوانە بوون، کە لەو سەردەمەدا کاک عەزیز بەرەو حیزبی تودەی بردبوون.

**جەلیل گادانی**

گادانــی کــە چەنـد ســاڵێک زیندانیــی شــا بووبوو، قســەی زۆری هاوڕێیانی خۆی لەســەر بوو، کە لە زینداندا ئیعترافاتی زۆری کردووە و کەســی نەهێشــتووە، تەنانەت دوای ئەوەی بە لیســت ناوی ئەندام و چالاکەکانی حیزبی خۆیانی داوە و دواتر لێپرســینەوە لێی تەواو بووە، بانگی بازجۆکەی کردووە و گوتوویەتی بنووسە! فلان کەس و فیسارم لە بیر چووە! بۆ بەڵگە، بەر لە کۆنگرەی دوو لە ڕۆژنامەی کوردســتان ئۆرگانی حیزبی دێموکرات دەوری ســێهەم، یەکــی گەلاوێژی ۱۳۳۹ی هەتاوی، بیستوســێی ژووئیەی ۱۹٦۰، هاتووە: «جەلیل گادانی (کەریم) بــە تاوانــی ئیعتراف و زەعفی گــەورە لە ڕێبەری حیــزب دەرکرا». بە فەرمانی ســکرتێری حیزب ئەحمەد تۆفیــق لە حیزب دەرکراوە و وەک خائین و ترسنۆک ناسێندراوە.

بە زۆر هۆکاری وەک ئەوانە و ڕابردوویان وەک لقی حیزبی تودە، ئەو دموچاوانە نەیاندەتوانی میراتگرێکی ڕەســەن و بەجێی حیزبەکەی پێشەوا بن و لاوانی تازەپێگەیشتووی شار بەرەوە خۆیان ڕاکێشن.

**وێڵ و سەرگەردان بەداوی حیزبێکی کوردیدا**

لــە ســەردەمی پێش ســەرکەوتنی شۆڕشــی ئێران، گەنــج و لاوی کوردســتان هیچ پێشــەنگ و ڕێبەرێکی عاقڵ و زانا، دڵســۆز و ساغ لە ستراتیژی کوردبوون و خەباتی کوردستانی نەبوو، تاقە حیزبی کوردی ئەوانــە بــوون، ســەرتاپای ژیانی سیاســییان دوای نەمانــی ژێکاف و لەسێدارەدانی قازی، پاشقولگرتن لە یەک، سەر بە تاران و تودەیی، پشت لە ســەرکردەکانی شۆڕشی ٦٨-۱۳٦۷ی کۆمیتەی ئینقلابی، ڕێزنەگرتن لە شــەهیدانی وەک کاک ســولەیمان و مــەلا ئــاوارە و... نەیاندەتوانی لــە فەزایەکــی زۆر ئامادەی مانگەکانی پێش شۆڕشــی ئێــران، خەڵکی کــورد لــە ڕۆژهەلات ڕێک بخــەن و ئامادەی بەرنامەیەکی ســتراتیژی

و نەتەوەییــان بکەن. نــەک تەنیا نەتەوەیی، بەڵکــو زۆربەی چالاکوانی سیاسی و لاوان، بەرەو ئێرانچێتیی زۆر چەواشە و دواتر تێداچوون و ســاردبوونەوە چوون. زۆربەی هەرە زۆری خەڵکانی بە وەجهـ و جێی بــاوەڕ و خۆشەویســت لەنــاو خوێندکار و لاوانی ئامــادەی خەبات بۆ کوردستان؛ خەڵکی وەک مامۆستا شێخ عێزەدین، کاک کەریم دانشیار، شــەهید خەلیل بللوری، ســەلاح شەمســی بورهان، حوسێن سوهێلی و دەیانــی تریــان، نە تەنیــا نەیانتوانی بۆ لای خۆیانیان ڕابکێشــن، بەڵکو کەوتنە بەرەی دژە حیزبی دێموکراتیشەوە.

لەگەڵ ســولەیمان و زۆربەی کوڕەکانی شــاردا بــەدڵ حەزمان لە حیزبایەتــی و کاری ڕێکخراوەیی بوو، حیزبە سەرتاســەرییەکان وەک تــودە و چریکــی فیدایــی، وەلامــدەرەوەی پاکی و بێریایــی داخوازییە کوردییەکانــی ئێمــە نەبــوون، دەمانزانــی درۆمــان لەگەڵــدا دەکەن و تەنیــا بەکارمان دێنن، ئێمە زۆربەمان ســاغ بووین بەرەو ئەم حیزبانە نەچیــن. حیزبــی دێموکرات نوزەیەکــی دەهات و دەمانبیســت زۆر بە نهێنــی پەیوەندی دەگرن بە خەڵکەوە، یەک دوو جار لەگەڵ ســولەیمان و حوســێنی بــرام و چەنــد هاوڕێیەکدا لە چەند دانیشــتنی شــەوانە و ســەرتوخورتیان بەشــداریمان کرد. کۆڕی هاوڕێیانی ئێمە زۆر جار لە جادە و ماڵی مامۆســتا شێخ عێزەدین، کاک کەریم دانشیارمان دەدەیت و وەک مامۆســتای خۆمان پرسمان پێ دەکرد، زانیمان سەرانی حیزب پەیوەندییــان بــە کاک کەریمەوە گرتووە و ئەویــش هیچ مەیلی نەبووە بۆ لایان، ئیتر زۆرتر ســاغ بووینەوە بــەرەوە دێموکرات نەچین. کوڕە چەپەکانی دوور لە تودە و چریکی فیدایی، بەڕاســتی ســەرمان بێکڵاو بوو، ماوەیەک شــتێک پەیدا بوو بەناوی شــەفەقی ســوور، ڕێکخراوی جیهانــی ســێیان پــێ دەگوتن. هیچــی مەعلــووم نەبوو، چەنــد کوڕی خۆشەویستی شار بانگەشەیان بۆ دەکرد، نووسراوەکانیان لە کاغەزی زۆر تەنک و بە نووســینی زۆر ورد بــڵاو دەکردەوە، هەر زوو نەما و قسەوباســی زۆری بەدوادا هات. ئەمڕۆ دوای چل ساڵ لەو مێژووەوە

به دڵنیاییەوە دەڵێم؛ گەر حیزبی دێموکرات بە بەرنامە و شـیعارگەلێکی تـازە و مۆدێرن، بە وەپێشخسـتنی سـیمای چەند خەڵکی خۆشـنێوی وەک کاک کەریـم و خەلیل بللوریان و... هاتباوە بۆ ناومان، زۆربەمان تووشـی سەرلێشـێواوی نەدەبووین و حیزبی سیاسـی بە ستراتیژی خەباتـی نەتەوەیـی خۆمـان دەدۆزییەوە، یان هاتبـا و کۆمەڵەی ئێران ئـەوکات لـە کاری ژێرزەمینی دوور کەوتبـان و هیچ نەبا وەک کوڕ و کچەکانی سەرجادە ئازا و چالاک بان و ڕووی هاوکارییان لەم گەنجانە کردبـا و پۆپۆلیزمی جوتیاری و فلاحیان وەلا نابا، بەرنامەی خەباتێکی نەتەوەیی ڕوون و سادەیان پێشکەش کردبا، بە هۆی چەپبوون و بڕوا بـە خەباتی چەکداری زۆربەی هـەرە زۆری کچان و کوڕانی کوردیان لەم سەرلێشـێواوییە ڕزگار دەکرد و سـاڵێک دوای ڕووخانی شا، ئاوا بە شـپرزەیی، بەرەوپیری شۆڕشـی بەرگریی خەڵکی کورد و هێرشی پاسداری خومەینی بۆ سەر کوردستان نەدەچووین!

# ٧

شـــا، چەنــد ئاخوندێکی شــیعەی بۆ شــارەکانی کوردســتان نەفی کردبوو، شــاری ســابڵاغ وا بزانم مکارم شــیرازیی بەرکەوتبوو، مەلا کەریــم شــاریکەندی شــەوان لــە مزگەوتــی مەولەوی کــۆڕی باس و گفتوگــۆی لەگەڵدا دەکردنــەوە و کۆمەڵێک لە کوڕانی شــار دەچووین و بەشــداریمان دەکرد، باســەکانی مەلا کەریم زۆرتر لەســەر شیعە و ســوننی و کوردبــوون بوون. شــیرازییش پێی وا بوو ئیســلام نەتەوە ناناسێ و هەمووومان ئۆمەتی ئیسلامین بەبێ جیاوازی. کۆڕی مزگەوتی شــەوانی مەلا کەریم و ڕۆژانی مزگەوتی مامۆســتا شێخ عێزەدین، ئەو شــوێنانە بوون بەبــێ حیزبیبوون و خاوەنداریێتیــی هیچ لایەنێک، بەبێ بەرنامــە و ســتراتیژ، ئێمەی لاوانــی بە جۆشــوخرۆش و پڕ لە وزەی ســەرقاڵ و دواتر ماندوو دەکرد، بە کورتی ئێمە لە ڕووی سیاســی و حیزبی، زۆر بێکەس و بێخاوەن بووین.

هەمــوو هێز و وزەی کڵپەســتاندووی دەروونی ئێمــە، دەبوو پێش تەقینەوە بســووتێ و ســەرف ببێت. یەکێتی و خزمەت بە پێشمەرگەی یەکێتــی بــۆ ئێمــە باشــترین هەڵبژاردەی ئــەوکات بوو، بــە تایبەت بۆ ئەوانەی بڕوایان بە سنوورە دەستکردەکان نەبوو.

لە هاوین و پاییزی ٧٨دا شارەکانی کوردستان لە خەبات و چالاکی دژی شــا، تۆڵەی بێدەنگی مانگەکانی پێشــوویان کــردەوە، ڕۆژ نەبوو ئێمەش وەک شــارە شــیعەکان، چلەی شــەهیدێکی یەک لە شــارەکانی ڕۆژهــەلات نەگریــن و ڕێپێــوان، بەردهاویشــتن، تایەســووتان، گازی فرمێسکڕێژ بووبوو بە کاری ڕۆژانەمان بەبێ حیزب و سەرکردە.

### بەس بڕووخێ

زۆربەی هەرەزۆری ڕۆشنبیر و خوێندەواری شار لە کچان و کوڕانی بــەوزە و چالاک، نەیاندەزانی شــا بۆ بڕووخێ، دوای شــا چی دەبێت، خومەینی و ئیســلامییەکان چییان پێیە بــۆ ئێرانی داهاتوو، دواڕۆژمان ئاسوودە و خۆشتر دەبێت یان خراپتر و دەیان پرسیاری دیکە. ئەوانەی لە ئێمە بە تەمەن و ئەزموون و سیاسیتر بوون، یان هەڵاتووی دەرەوە بــوون، یــان لە ترس و ژیانــی نهێنیی حیزبی، تۆســقاڵێکیش خۆیان لە ژێرزەمینە قووڵ و تاریکەکانی شوێنی خۆحەشاردانیان دەرنەدەخست، هەموویان لە خەیاڵدانی خۆیاندا لینین بوون لە حەشارگە و تاراوگەدا!

بۆ ئێمەی کورد، زۆر ســادە بوو تێبگەین چیمان دەوێت و بۆ دژی شــاین و دوای شــا چ دەکەین؛ کۆمارکەمان جوانەمەرگ کرابوو، شــا ســەرکردەکانمانی بە ناحەق لە ســێدارە دابوو، مافــە نەتەوەییەکانمان زەوت[1] کرابــوون، زمانەکەمــان ڕێنــەدراو و مەنع[2] بــوو، خوێندن و نووسینمان بە زمانی بێگانە بوو، زۆر هۆکاری دیکەش هەبوو تێبگەین، بــەس ڕۆشــنبیر و نوخبەی سیاســیی کورد بە هــۆی حیزبگەلی وەک تودە و چریک، ئیتر فێری خەباتی سەرتاســەری و چینایەتی بووبوون و تەنانەت باسی خەباتی کوردایەتی بڤە و دواکەوتوویی و «ئیرتجاع» بوو. سەرانی حیزبەکەی پێشەوای کورد، زۆربەیان تودەیی و لە ئێرانی ئێرانیتر خۆیان دەناساند و تەنانەت پۆزی ڕۆشنبیرییان پێوە لێ دەدا!

### شا دەبێت بڕوات

ڕووداوەکانــی ئێــران و شــەپۆلی خرۆشــانی خەڵک بــە یارمەتیی وڵاتانی بەریتانیا، فەرانسە و ئەمریکا لە مانگەکانی زستان و ئاخری ٧٨ ئەوەندە خێرا بوون، وەک خەون دەهاتنە پێش چاو. زیاتر لە سی ملیۆن خەڵکی ئێــران وەها گەوجێندرابــوون، ئەوەی بیریان لــێ نەدەکردەوە

١- زەوت، داگیرکردن.
٢- مەنع، قەدەغە، مەنعکراو.

داهاتــووی خۆیــان بوو، هەمــوو هەر قســەی ئاخوندێکــی کەللەڕەقی جاهیلــی بەکرێگیــراوی ڕۆژئاوایان دووپات دەکــردەوە و بەبێ فکر و مێشک هەر دەیانگوت، «باید برە» واتا شا دەبێت بڕوات!

بــە ڕادەیەکی[1] زۆر بەرز و مۆدێرن، چاکســازی، ڕیفۆرم و کرانەوەی ئازادییەکان دەســتیان پێ کرد، ســەرۆکوەزیرانێکی سۆســیال دیموکراتی وەک شــاپوور بەختیار دانــدرا، دەرگای زیندانەکان بەبێ مــەرج کرانەوە، حیزبگــەل ئــازاد کران، ســاواک ئــەو دەزگا تۆقێنەرە هەڵوەشــایەوە و لە هەمووی گرنگتر و بۆ نەهێشــتنی بیانوو، شاشــیان وەدەر نا و ڕۆیشــت. ئاخــر ئەگەر ئەو میللەتە دڵســۆز و گــەورە و عاقڵی هەبایە، ســاڵی ١٩٧٩ وڵاتێکــی وەک ئێــران لــە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت کە هەمــوو دەوڵەتەکان دیکتاتــۆری و دواکەوتوو بوون، دەبوو لەوە زیاتر کە دەســتیان کەوتبوو، چیی تریان ویســتبایە؟! نەخێر، ڕۆژئاوا و ئەمریکا بڕیاریان دابوو بە هۆی جاهیــل و ئاخوندێکی وەک خومەینی، نیزامی ئیســتبدادیی ئیســلامی پیادە بکــەن و لەو ئــاوە قوڕاوییەی مەلاکان بۆیان دروســت دەکــەن، ئەوانیش ماسیی خۆیان ڕاو بکەن! خۆ ئەگەر هاتبا و میللەتی ئێران بە ڕیفۆرمەکانی بەختیــار ڕازی بــان و بە وریایی و ژیری، پێشــی پلان و داپڵۆســینیان لە ئەمریــکا و ڕۆژئاوا گرتبایە، بە دڵنیاییەوە ئەمڕۆکە ئاســوودەترین میللەت دەبوون و نە ئیســلامی سیاســییش لە ناوچە و جیهاندا ئەو هەموو تاوانە دژەمرۆڤایەتی و قێزەونەی پێ دەکرا! ئەوان دڵنیا بوون ئاخوند و ئیسلامی سیاسی دەتوانن پێش بە شەپۆلی کومۆنیزم و سۆڤییەت بگرن، یان ئەوەی کە هەر ئیســلامی سیاســییە دەتوانێت کۆمەڵگە لە جەهالەتدا بهێڵێتەوە، ئەو شــتەی ڕۆژئاوا بۆ گەلانی ناوچەکەی دەویســت. بە زمانێکی ســادە ئەوان دەیانزانی تا ئێمە گەمژە و نەزان و جاهیل بین، ئەوان دەوڵەمەندتر دەبن.

لە شــانزەی ژانویەی ٧٩دا ڕۆژنامە گەورەکانی ئیتلاعات و کەیهان پڕ بە لاپەڕەی یەکەم نووسییان «شاه رفت»، واتا شا ڕۆیشت و ئێرانی جێهێشت.

---

١- ڕادە، ئەندازە، چلۆنەتی، حەجم.

### لە فیشەکەکەی هەباسەوە

ئێوارەیەکی درەنگ لە چوارڕێی ئازادی و بەردەرگای ماڵی مامۆستا شـێخ عێزەدین بە سـەدان و هەزاران خەڵک کۆوە بوون و شـادی و هەڵپەڕکێیان دەکرد، بۆ یەکەم جار چەند کەسێک دەمانچەیان دەرخست و تەقەی خۆشـی بەرز بووەوە، هەباسـی برام کە مێرمنداڵێکی ١٦-١٧ ساڵان بوو، زۆر چالاک و نوێنەری قوتابیانی شار بوو، چاوی بڕیبووە کاک کەریم و دەمانچەکەی دەسـتی، کاک کەریم زۆر میهرەبان گوتی: هەبـاس گیان پێت خۆشـە تەقـەی بکەی؟! هەباس لە خۆشـیان گوتی، ئەرێوەڵا کاک کەریم گیان زۆرم پێ خۆشـە. کاک کەریم دەمانچەکەی بۆ ئامادە کرد و دای بە هەباس و ئەویش فیشـەکێکی بە ئاسمانەوە نا. ئیتر لێرەوە خەباتی چەکداری بە دەستی برای هەرە بچووکمان لە ماڵی ئێمە دەستی پێ کرد! ئەوە زیاتر لە چل ساڵە ئاوارە و دوور لە نیشتمان و خاک و شـاری خۆمانین و گوللەکەی کاک کەریم و هەباسـیش وێڵی ئاسمانە و بەدوای حەقدا دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە!

ئەو شـەوە تا بەری بەیان شـایی و لۆغان لە سەرتاسـەری ئێران بەردەوام بوو، زۆربەی پیاوانی میری و دارودەسـتەی شا و حکومەت بە شـوێن سـەرپەنایەکدا دەگەڕان، وا بزانم لە ئاخریدا کوردستان بوو بە سەرپەنا و ڕێڕەوی دەربازبوونی زۆربەیان.

### پیکابێکی شین

هاتوچـۆی پێشـمەرگەی یەکێتـی ئیتر بە ئاشـکرا و بـە بەرچاوی خەڵکـەوە بـوو، خەڵکی وەک من و سـولەیمان بـە ڕۆژی ڕووناک لە ناو بازاڕدا لەگەڵیان لە هاتوچۆدا بووین، چەند لە دیلەکانی کارەسـاتی هـەکاری لە لای قیـادە موەقەت ئـازاد کران، یان هەڵاتن. شـێخ عەلی یان خولە کەشـکۆڵ، حامید حاجی غالی، ئازاد هەورامی، عەلی شـیعە و چەنـدی دی هاتـن بۆ لای ئێمە لە سـابڵاغ. وەک برا و هاوڕێی زۆر

ئازیز پێشــوازیمان لێ کردن. لە تیمارکردن و پۆشــتەکردن و گەڕان و حەوانەوەیان لە ناو ماڵی خۆمان درێخیمان لێ نەکردن، کاک دلێر سەید مەجیـد وەک بەرپرس و پێراگەیشــتن بە هەمــوو کاروباری یەکێتی لە هاتوچۆی ناوزەنگ و مەهاباددا بوو. بە پارەی یەکێتی پیکابێکی شینمان کڕیبوو، پێشتر لە لای دۆستێکی یەکێتی لە شنۆیە بوو، هێنایانە سابڵاغ و درا بــە من. کاکم پیکابێکــی تۆیۆتای دوو تەنیی هەبوو بۆ کاروباری باخ و فەلاحی، زۆربەی کات بەدەســت منەوە لە خزمەت گواســتنەوەی ئەرزاق و چەک و چۆلی یەکێتیدا بوو.

### عومەر شێخمووس

حوســێنی بــرام لــە ناوزەنــگ کاک عومــەر شــێخمووس دەبینێت و بەیەکــەوە تەعــاروف دەکــەن. کاک عومــەر کــە دەزانێت حوســێن خوشــکەزای زەبیحییە زۆری پێ خۆش دەبێت و باســی بۆ دەکات کە کاتــی خــۆی لــە ١٩٥٦دا زەبیحــی لە ســوریا بووە و زۆر بــە گەرمی لەگــەڵ حوســێندا دەدوێت. قــەرار دادەنێن بێت بۆ ســابڵاغ و بێتە لای ئێمە. کاک عومەر وەک سەرکردایەتی و دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی تازە هاتبووەوە لە ســوید و ئاگنێتای هاوسەریشــی لەگەڵدا بوو. دواتر کاک عومــەر چەنــد جار هــات و لەگەڵ ئێمە و ماڵی ســولەیماندا وەک کەســێکی خۆمان دەجووڵایەوە، ئەو خەڵکی کوردســتانی ســوریا بوو، بەڵام کوردســتانییەکی زۆر بە بیروباوەڕ بوو. کاک عومەر لە ســابڵاغ داوای کرد بۆ هاتنی پۆستەکانی لە سویدەوە بچین و سندووقی پۆستی بۆ بکەینەوە، هەموو جار لە ســویدەوە پۆســت و نامــەی کاک عومەر دەهات بۆ ئەم ســندووقە و ئێمەش بۆمان دەنارد بۆ ناوزەنگ. ئێســتا ئەوە چل ســاڵە پەیوەندیی کاک عومەر لەگەڵ خێزانی ئێمە و شــەهید سولەیمان لەوپەڕی گەرموگوڕیدایە و هەموو بە چاوێکی ڕێز و گەورە ســەیری دەکەین، هەردەم لە شــین و شــادی ئەم دوو بنەماڵەیە وەک کەسێکی دیار بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لەگەڵماندا بووە.

**شەهید نەجمەدین بیوک کایا و دیارییەکەی مام جەلال**

مێرخاسێک خەڵکی باکووری کوردستان هەتا بڵێی جوان و باڵابەرز، ڕۆژێک لە ناوزەنگ پێیان ناساندم، میوانی مام جەلال و کاک نەوشیروان بوو، زۆریان تاریفی ئازایەتی و دڵسۆزیی کرد. لەگەڵ خۆماندا هێنامان بۆ سـابڵاغ و چەنـد ڕۆژێک لە ماڵـی ئێمە مایەوە. شـەهید نەجمەدین بیوک کایا، پێمان دەگوت کاک سەلاح. لە ماوەیەکی کورتی چەند ڕۆژە بووین بە برای گیانیبەگیانی، ئەو زۆر لە من گەورەتر بوو، دواتر زانیم یەک لە شۆڕشگێڕ و سیاسییە بەناوبانگەکانی باکوور و هەموو کوردە، بە کاک نەجۆ ناسـراو بـوو. پیاوی مەیدان و خۆلێـدان لە قوڕوچڵپاو، کەمیـن و دەربازبـوون و هێنـان و بردنـی چەک بوو بـۆ یەکێتی، بۆ خۆی سنوورەکانی عێراق و تورکیا و سوریا و ئێرانی ئەوەندە لە ژێر پێی قۆندەرەکانی شـێلابوو، تەواو بێحورمەتی کردبوون، شەهید نەجۆ لەو کەم کەسـانە بوو بە مانای تەواوی وشـە کوردستانی و جیاوازیی پارچەکانـی نەدەکرد، ئەو لە کوێ پێویسـتییان پێـی بایە لەوێ بوو. لە سـەفەرێکدا بۆ لای سـنووری تورکیا لەگەڵ کاک دلێر و عەبوی برای شەهید سولەیمان حەفتا کلاشینکۆف و مەخزەنی زۆر جوانی هێنابوو، بـە پیکابەکـەی کاکم بارمـان کرد و بەنـاو جاش و قیـادە موەقەت و ئاغاواتی سـۆما و تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ و سنووری سەنار مامەدیدا ڕێـک بە ناوەڕاسـتی ڕەزاییـەدا بـەرەو مەهابادمان هێنا، لە پۆلیسـی ڕێی دەرەوەی شـار فەرمانی ڕاوەسـتانیان پێ داین، کاک نەجۆ گوتی، وەنێویـان کـەون و ڕایمەگرن، هەر وامان کرد و گەیشـتینە عاسـتیان پێمـان بـە بەنزینەوە نـا و وەک با بـە تەنیشـتیاندا دەرچووین، چەند تەقەیان کرد فریامان نەکەوتن، هاتینەوە مەهاباد و چەک و فیشـەکمان بردە باغەکەی خۆمان لە تەنیشت شار و شاردمانەوە. ئەو ڕۆژە بۆ من وەک یاریکردن لە فیلمی ئاکشن و شەڕ دەچوو، زۆر سەربەرز و شاد بووم. بەیانی لەگەڵ کاک دلێردا بردمان بۆ نێشکۆلانی لای سەردەشت

و لەوێـڕا باریـان کرد و بردیان بۆ ناوزەنگ، دوای دوو ڕۆژ کاک دلێر گەڕایەوە و کڵاشینکۆفێکی سیخۆی تازە سەربەنێزە و شەش مەخزنی دامێ و گوتـی ئـەوە دیاریی مـام جەلالە بۆ تـۆ، پێم وا بـوو هەموو جیهانیان پێشکەش کردووم.

## نەوشیروان و سروودی شۆڕشگێرانە

کاک نەوشـیروان دەبوو بچێتەوە بۆ سوریا و ڕێگەی ئەمین نەبوو، ئێوارەیـەک بـە پەلـە کاک دلێر هـات و گوتی دەتوانین بـۆ چەند ڕۆژ کاک نەوشـیروان بشـارینەوە و کەس پێی نەزانێت؟ گوتم زۆر ئاسانە، لـە ماڵـەوە ژووری میوانان کە زۆرتر داخـراوە، چۆڵی دەکەم و دەڵێم بـە دایکم کەس نەزانێت. ئیتر ئێوارە کاک نەوشـیروان و کاک نەجۆ و کاک دلێـر پەیدا بوون. دایکم چی لە دەسـەڵاتیدا بـوو ئەم چەند ڕۆژە بـۆ پەزیرایـی و خزمەت، کردی. کاک دلێر و نەجـۆ دەچوونە ناوبازاڕ و دەفکری وردەکاری سـەفەرەکەدا بوون، کاک نەوشـیروانیان بەجێ دەهێشـت. زوو زوو چام بۆ دێنا، تەسـجیلێکی بچووکمان هەبوو یەک بەدوای یەکدا شـریتی[1] شۆڕشگێڕانە و سـروودی کوردیم بۆ دادەنا. جارێکی لەگەڵ ئەوەی خۆی بە کشـتی زۆر شـەرمێون بوو، دیار بوو دوای سـەبرێکی زۆر ئاخـری وەدەنـگ هـات و گوتی، ئـەرێ ئێوە لە ئێران ئەو هەموو گۆرانیبێژ و مۆسیقا دەوڵەمەندەتان هەیە، ئەوە چییە مێشـکی سـەری منت پێ بردووە؟! تۆ نازانی من خۆم سروودەکەم و خۆم شۆڕشم؟! ئیتر بەس نییە، لە شارین و دوو گۆرانیی خۆشی هایدە و گوگوش و ئەوانە دابنێ! ئەوندە تەریق بوومەوە هەر زوو تەسـجیلم کوژانـدەوە و گوتـم کاکە گیان من پێم وا بـوو ئێوە هەر ئەمانەتان پێ خۆشـە و دەبێت هەر ئەم کاسـێتانەتان بۆ دانێم. گوتی، نەخێر نەوەڵڵا هیچ وا نییە و بڕۆ گۆرانیی خۆش دانێ، دەنا هەر بێدەنگی کە. بۆ پێتان وایە دەبێت هەموو شـت هەر «ئینقلابی» بێت؟! بە پەلە چووم بۆ لای

---
١- شریت، نەواری کاسێت.

شـریتەکان و ئیتر وازم لە دانانی گۆرانی و سـروودی نەتەوەیی هێنا و کاک نەوشـیروانیش مێشکی حەسایەوە. یەک بەدوای یەکدا کاسێتی گۆرانیبێژە ناسراوەکانی ئێرانم بۆ دادەنا! دواتر بە پێکەنین و تەشەر و تانـەوە بـە کاک دلێری گوت؛ تۆ دەزانیت ئەم ئاغا عەلییە پێی وایە ئێمە نابێت گوێمان لە مەهەسـتی و گوگوش و ئەوانە بێت، دەنا «ئینقلابی» نابیـن؟! کاک دلێریـش بـە زمانە پسـکەکەی خۆی گوتـی «ئاخر ئەمە عەقڵیانە»!!

## نەوشیروان تووڕە بوو

دۆستێکی دەوڵەمەندی سنەییمان هەبوو، لەگەڵ مێردی خوشکم لە ڕەزاییە شەریک بوون لە کۆمپانیای ڕێگەوبان و بینا دروستکردن. خۆی زیندانیی سیاسیی لەگەل کاک فوئاد و هاوڕێیانی کۆمەڵە بووبوو، تازە ئازاد کرابوو، زۆر کوڕێکی باش و حەزی لە خزمەت و کاری سیاسـی بـوو، تەدبیـر کرا بانگـی بکەم و بێت. ئەو لە گەیشـتنمان بـۆ ڕەزاییە بەرەوپیرمان بێت و لەناو شاردا بە ئاسانی دەربازمان بکات. قەرار بوو بچیـن بۆ ڕەزاییە و لەوێڕا بۆ شـاپوور و ئەوجار بۆ کوێسـتانەکان و گوندەکەی سـەنار مامەدی. کارەکان زۆر بە باشی دەرباز بوون، ئەوە نەبێـت لە نزیک ڕەزاییە کە دەبوو دوو سـێ کیلۆمەتر دواتر تووشـی ئەم هاوڕێ سـنەییە بین، بەنزینی سەیارەکەی من تەواو بوو، لە چەقی جادەی پڕ لە هاتوچۆی مەهاباد-ڕەزاییە ماینەوە، نەمدەزانی لە شـەرم و خەجاڵەتی چ بکەم، دیار بوو کاک نەوشیروان زۆر تووڕە بوو، بەڵام هیچـی بە من نەدەگوت و هەر شـەڕەدندووکەی لەگەڵ کاک دلێر بوو. چەند خولەکی نەبرد سەیارەکەی هاوڕێی سنەیی پەیدا بوو، گەشامەوە و زوو بەنزینمان بەتاڵ کرد و گەیشتین بۆ ناو شار و بەڕێ کراین بۆ لای سـنوور و گوندەکەی سەنار. ئێوارەی درەنگ بە کوێستاناندا گەیشتین، بنی ترۆمبێلەکەمان یەکپارچە تەختە بەفر و سەهۆڵ گرتبووی، شەو لە ماڵی سـەنار ماینەوە، پەزیرایی گەرمیان کرد و کاک نەوشـیروان هاتە

مچلکە[1] و باسی دیموکرات و دەڤەری شکاکان. بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ چەند شارەزا و کاک نەجۆ و کاک دلێر چووین تا ئەودیوی سنوور، گوتیان ئیتر زۆری نەماوە بۆ شاری وان. کاک نەوشیروان و نەجۆ ڕۆیشتن، لەگەڵ کاک دلێر گەڕاینەوە بۆ سابڵاغ، بەداخەوە ناوی دێهات و مێژووی ڕۆژەکانم بیر نەماوە.

## لەگەڵ کاک نەوشیروان و قاچاخی حەشیشەدا

کاک نەوشیروان لە کتێبی «پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن»دا، کە ساڵی ١٩٩٧ چاپی کرد، داستانێکی لە لاپەڕەی ١٢٠دا هێناوەتەوە، کە باسی ئەم سەفەرە دەکات و بەبێ ئەوەی ناوی من و کاک دلێر بێنێت، هەڵبەت لە زۆر دانیشتن و مەجلیسان ئەم داستانەی گێڕاوەتەوە و هەموو جارێک باسی ئێمەشی کردووە:

«ئەو ماوەیە نەجۆ (نەجمەدین بیوک قەیا) گەیشتە ناوزەنگ. وەجبەیەک چەکی بە ناو تورکیادا هێنابوو بۆ گوندێکی سەر سنوور لە ورمێ. لەوێشەوە گەیاندیانە کوردستانی عیراق.

نەجۆ نەگەڕایەوە تورکیا، پێکەوە بەڕێ کەوتین بەرەو ورمێ و لەوێوە بۆ شاپوور و چووینە ناوچەی شکاک. نەجۆ لەگەڵ هەندێکیان ناسیاویی پەیدا کردبوو. سەری گوندەکەی سەنار مامەدیمان دا، خۆی لە ماڵ نەبوو، کوڕەکەی لەوێ بوو، گوندەکە قەرەباڵغییەکی زۆری لێ بوو، بە ڕێکەوت تووشی «بیجان جندی» بووم. ویستم خۆمی لێ هەڵە بکەم، بەڵام بیجان منی ناسییەوە، بە گەرمی چاک و چۆنیمان کرد. پێم وت؛ «لێرە کەس من ناناسێ، ناشمەوێ کەس بمناسێ، تۆش باسی مەکە!». وتی: «باشە». تا ناوچەکەمان بەجێهێشت کەس نەیزانی. لێم پرسی «چی ئەکەیت لێرە؟». وتی: «من خەڵکی ئێرەم، وەختی خۆی بۆ کوردایەتی شوێن بارزانی کەوتم بۆ سۆڤیەت و لەگەڵ ئەویش گەڕامەوە بۆ عێراق، ئێستا هاتومەتەوە ناو کەسوکاری خۆم».

١- مچلکە، گفتوگۆ، دەمەتەقە، وتووێژ.

چووینە گوندێکی نزیک سـنووری تورکیا، لە ماڵی کابرایەک بووین بە میوان ناوی حاجی زنار بوو. دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار بوو. وێنەیەکی مەلا مستەفاشی هەڵواسیبوو. ئەوان نەجۆیان بە سیاسی نەئەناسی، بە قاچاخچیی چەکیان ئەزانی. نەجۆ پێشـتر جارێکی تریش میوانی حاجی زنـار بووبوو. حاجـی کابرایەکی چاو و دڵ فـراوان بوو. بەرخێکی بۆ سـەربڕین. تا ڕێگەکەیان تاقی کردەوە سـێ ڕۆژی پێ چوو. هەر سێ ڕۆژ میوانی ئەو بووین و خزمەتی زۆریان کردین.

حاجی زنار ئێمەی بە باندێکی گرنگی قاچاخچێتی، تێکەڵاو لە عێراقی و تورکی و ئێرانی، ئەزانی. زۆرمان هەوڵ دا قانیعی بکەین هاوکاریمان بـکات بۆ گوێزانەوەی چەک لە دیوی تورکیـاوە بۆ گوندەکەی خۆیان. شـوێنەکەیان زۆر لەبار بوو، حاجی زنار ملی نەدا، بە پێچەوانەوە ئەو ئەیویست ئێمە قانیع بکات بازرگانیی حەشیشەی لەگەڵ بکەین. زۆرمان لەگـەڵ وت و تەماعـی زۆرمان خسـتە بەردەمی، کەڵکـی نەبوو، وتی: «ئێـوە ئەچـن لە لوبنانـەوە بە قاچـاخ تفەنگ ئەهێنن بۆ سـوریا و بە قاچـاخ بۆ ئێـرە و لێرەوەش بۆ عێراق، چەندی لـێ قازانج ئەکەن؟ ئەو پارەیە ئەم هەموو زەحمەت و ترسە ئەهێنێ؟ ئێوە ١٠٠ تفەنگ ئەهێنن، ئەبـێ بۆ هـەر ١٠ تفەنگ وڵاخێک تەرخان بکەن. کاروانەکەتان ئەبێ بە ١٠ وڵاخ و ئەبـێ ١٠ کەسـیش بیپارێزێ. ئەگەر کارەکە بە سـەلامەتی بـڕوات، لە کۆتاییـدا لە هەر تفەنگێ چەند سـەد تمەنێک قازانج ئەکەن، ئەگەر بشـگیرێن، ئەڵێن چەکیان بۆ شـۆڕش ئەوێ و ئیعدامتان ئەکەن! لەباتی ئەوە بۆ نایەن لەگەڵ من هاوکاری بکەن هەموو جار باری یەک وڵاخ دەربـاز ئەکەین و هەریەکەی چەنـد ملیۆنێکتان پێ ئەبڕێ، ئەگەر بشگیرێین، چەند ساڵێکمان حوکم ئەدەن!»

ئـەو ناوچەیە یەکێ لە شـاڕێگەکانی تێپەڕاندنی حەشیشـە بوو بۆ ئەورووپـا. لە ئەفغانسـتان و پاکسـتان و ئێرانەوە، حەشیشـەیان لەم ناوچەیـەوە ئەگوێزایـەوە بـۆ تورکیـا و لەوێشـەوە بـۆ ئەورووپا و سەرانسـەری دنیا. لـەم ناوچەیە حەشیشەشـیان ئەڕوانـد، ڕۆژێکیان

بردینــی بــۆ ســەیری یەکێک لە کێڵگــە گەورەکانی خۆیــان، تازە گوڵی کردبوو، دیمەنێکی یەکجار جوانی هەبوو».

کاک نەوشــیروان هەروەتر لەم دواییانەدا کە دادەنیشــتین و باسی ڕووداوەکانی ڕابردوومان دەکرد، دەیگێڕایەوە و بیری دەخستمەوە، کە زنــار چەنــد کچی هەبووە و هەوڵی دەدا هیچ نەبێت کچێکی بخوازین و بە خزمایەتی کەسابەت و بەردەوامی کار و قاچاخمان پتەوتر بکەین و متمانــەی زۆرتر بەیەک پەیدا بکەین. بۆ ڕابواردن هەموو جارێک منیان پێش خســتووە و لەگەڵ نەجۆ خۆیان لێ دەراویشــتووە و بە کابرایان گوتووە عەلی باشە و ئێرانییشە و لە ئێمەش گەنجتر و ئامادەترە!

لــە مــاوەی کورتی، دوو مانگی بەفرانبــار و ڕێبەندانی ١٣٥٧دا واتا مانگی ژانویە و فێوریەی ساڵی ١٩٧٩؛ حکومەتی شاپوور بەختیار هاتە ســەر کار، شــا ڕۆیشــت، خومەینی هاتەوە، بەختیار ڕووخا و هەڵات، شۆڕشــی گەلانی ئێران بە ڕێبەریی خومەینی و لە ژێر ناوی شۆڕشــی ئیسلامیی ئێراندا تەپڵی سەرکەوتنی لێ دا!

# ٨

## تفەنگەکەی شارەبانی

شـــەوێک پێـش بیستوسـێی ڕێبەندانـی ٥٧ (٧٩/٢/١٢)، لــە ماڵــی هاوڕێیەک و بەشــداریی چەند چالاکێکی خۆپێشاندانەکانی شار ئاگادار بووینەوە، بەیانی ڕێپێوانی گەورە دەکرێت و لەوانەیە شـارەبانیی شار بگرین، پلان داندرا نەچین بۆ ناو جەماوەر و لە دەوروبەری شارەبانی لەســـەر هەست بین، دەوری سەعات یانزە، یەک دوو کەس بە چەکەوە وەســـەربانی شارەبانی کەوتن و چەند کەســێک لەگەڵ خەڵکدا چووینە نــاو شــارەبانی. من و یەک دوو هاوڕێم یەکســـەر خۆمــان بە ئەنباری چەکدا کرد و قفڵمان شـکاند، چەکێکم هەڵگرت و هاتمە دەر. ســەرجادە و دەوری شــارەبانی پـڕی خەڵــک بــوو، چەنــد کەس لە کەســایەتییە ناســراوەکانی شــار وەک؛ مامە غەنی بلووریان و کاک ســەید حەسەن هاشــمی و... لــە ناو ژووری ئەفســەری شــارەبانی بــوون و بەتەمای دەوروتەسلیم بوون کە بۆیان نەکرا و هەموو چەکەکان کەوتنە دەستی خەڵک. من کە هاتمە دەر و تفەنگێکی کارابین بە دەســتمەوە بوو، هەر ئەوەندەم زانی بە دەیان کەس وەســـەرم گــەڕان و بە هەموویان لێیان دەدام و خەریــک بوون تفەنگەکە لە دەســتم بفڕێنن، من وەک چەقە بە تفەنگەکەوە نووســابووم، دەیان شەپ و مســتم لێ درا و خەریک بوو لــە هۆشــی خۆم دەچووم، لە عــەرز درابووم و تفەنگم لە باوەشــدا لە بنخۆگرتبــوو، لەنــاکاو وەک پاڵەوان ناســیاوێکی دوورم پەیدا بوو، پڕ بــە جادەکە گوڕاندی و جنێوی ســووکی بە هەمــوان دا، جەعفەر زۆر بەخۆوە بوو، هەر شەق و مست بوو دەیهاویشتن، یەکودوو هەموویانی لە من دوور کردەوە و دوو کەســی تریــش هاتن بۆ یارمەتی، لە زمان کەوتبــووم و زۆری گوت، تفەنگەکە بدە بە من بۆت هەڵدەگرم، باوەڕم

پــێ نەکــرد و تفەنگم نەدا. گوتی، متمانەم پێ بکــە، هەڵی گرتمەوە و لە ســەر شــانی خۆی دانام و تا بەر دەرگای ماڵــی خۆمانی بردمەوە، لە بــەردەرگا کاکم لە دڵەڕاوکێی ڕووداوەکان دەهات و دەچوو، منی دیت لــە ژێر باڵــی ئەم جوامێــرە، گرتمی و زۆر سوپاســی جەعفەری کرد، بەســەرهاتی گێڕاوە و گوتی بەخوا کاک حەســەن نەگەیشتبام عەلییان کوشتبوو، بەڕاستییش وا بوو!

هــەر دەســتبەجێ بردیانمــە ژوور، ئــاو و شــەربەتیان پــێ دام و دەموچاوی خۆم شوشــت. تفەنگم لە شان کرد و یەکسەر بۆ چوارڕێی ئازادی. کاڕابین تفەنگێکی زۆر سووک و بچووک بوو، تایبەتی شارەبانی بوو، فیشــەکم نەبوو، دەگەڕام بە ناو خەڵکدا، هەرکەســە نەوعێکی پێ بوو، هەر دوای شــارەبانی، ژاندەرمەریش گیرابوو، پڕ لە تفەنگی م١ و ژ٣ و بڕنەو و دەمانچە. یەک بڕنەوی پێ بوو، فیشەکی کارابین و یەک ژ٣ی پێ بوو، فیشــەکی م١ و ئیتر کەس بە کەس نەبوو. دەستمان کرد بە گۆڕینەوە، لە هەموو لایەکەوە تەقەی خۆشــی و تفەنگ تاقیکردنەوە بوو، ئیتر هێندەی نەبرد بازاڕی ئەسلەحەفرۆشان لە مەهاباد دامەزرا!

### دامەزراندنی چاپەمەنیی کۆمەڵە

کاک دلێــر دوو کادری باڵای کۆمەڵەی هێنابوو، لە ماڵی ئێمە بوون، کاک حەمەســەعید قەڵەویــان پــێ دەگــوت و هاوڕێ جەبــار، هەردوو کادرانــی ئیعــلام و چاپەمەنی بوون. قــەرار بــوو دەزگای چاپییان بۆ بێنــن، زیراکســی ناو بوو، لە لای ئێمە فێریان بکــەن و هەر لە مەهاباد دەســت بکەن بــە چاپەمەنی بۆ کۆمەڵە و یەکێتی. دوای هەڵســەنگاندن و قســەلێکردن هەمــوو هاتینە ســەر ئەو باوەڕە کە ئــەو کارە لە ماڵی ئێمە ناکرێت و ناگونجێت، بۆیە بڕیارمان دا بە بیانووی ماڵجیاکردنەوە خانوویــەک پەیدا بکەین. هاوڕێی ســنەییمان ئامادە بــوو بە ناوی ئەو خانــوو بگریــن و هەر خۆشــی وەک یارمەتی گوتی، کرێکــە دەدەم. لە کۆڵانی هەشــت مەتری خانوویەکم گرت، بە حەوشــە و ژێرزەمینەوە.

کاک دلێر و حەمەسەعید و هاوڕێ جەبار نیشتەجێ بوون لەم ماڵە و نەدەبوو کەس پێی بزانێت. ژێرزەمین ئامادە کرا بۆ دەزگای چاپ. چەند ڕۆژ دواتر کاک دلێر گوتی، بە پیکابی کاکت بچۆ لای قاوەخانەی کەریم جووجوو ڕاوەستە و عەلاقەی هیچت نەبێت. چووم و وەستام، لەپڕ کوڕێکی جوان بە کەوا و پانتۆڵێکی ئەفسەرییەوە، زۆر لەناکاو دەرگای پیکابەکەی کردەوە و سوار بوو، گوتی، لێخوڕە و بڕۆ، بەقسەم کرد و هەر دوو هەنگاو دواتر گوتی، بچۆ بۆ ئەم کۆلانە، شارەزا بووم کۆلانی سابوونی بوو، لەبەر دەرگای ماڵێک ڕامانگرت و بە پیکابەوە چووینە ژوور، یەک دوو کەسی لێ بوو نەمدەناسین، پشتی سەیارە بار کرا بە مەکینەی گەورە و دەبەی جەوهەر و کاغەز و شتومەکی چاپ. گوتی، بڕۆ هەرچی بینیوتە باسی مەکە، تۆ جێی متمانەی ئێمەیت و کاک دلێر باسی تۆی بۆ کردووین، پیاوێکی لەگەڵدا ناردم گوتی یارمەتیتان دەدات چۆن دایمەزرێنن.

گەڕامەوە ماڵەکە و هەر بە پەلە و کەس نەمانبینێت بارەکەمان گواستەوە ژێرزەمین. دواتر زانیم ئەم کوڕە کە سواری پیکابەکە بوو لەبەر قاوەخانە، کاک عەبدولڵای موهتەدی بوو، ئەوەی لەگەڵی ناردم کاک عەبدوللای بابان بوو.

تا ئەوکات و تەنانەت دوای ڕووخانی ڕژیمی پەهلەوی کەسمان ناوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕمان نەبیستبوو، هەر نەماندەزانی شتی وا هەیە. ئەوان زۆر بە نهێنی و ژێرزەمینی کاریان دەکرد، تەنانەت دوای نەمانی شا و ساواکیش. ماوەیەکی کەم دوای ئەم دیدارە زانیم ئەوانە ئەندامانی کۆمەڵەن و زۆر لە یەکێتی و مام جەلال نزیکن، یارمەتیی ماڵی و ناردنی کەلوپەلیان دەکەن و تەنانەت ئەندامیان ناردووە بۆ سەرکردایەتیی یەکێتی و کاک خانەی موعینییش هەر ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بووە.

دەزگای چاپی زیراکس لە ژێرزەمین دامەزرا و کاک حەمەسەعید و هاوڕێ جەبار لەوێ دەمانەوە. یەک دوو ڕۆژ دواتر هەر کاک دلێر

کوڕێکــی ڕەشەســمەری بەخۆوەی لەگەڵ هــات، زۆری تاریف کرد لە ناساندنی و وەک سەرکردەی عەسکەری هێنایە ناساندن، کاک ئەنوەری مەجیـد ســوڵتان. زۆرمان ڕێز لێ گــرت، کوڕێکی مەتیــن و بەحەیا و شــەرمێون بوو، زۆر زوو عەلاقاتی هاوڕێیەتی و برایەتی لە نێوانماندا دروست بوو.

### پادگانی گەورەی شار

هەشــت ڕۆژ دوای گرتنی شــارەبانی، لە یەکی ڕەشەمەی ١٣٥٧دا، واتا بیســتی فێوریەی ٧٩، خەڵک هێرشــی کردە سەر پادگانی گەورەی شار. حیزبی دێموکرات ماوەی چەند ڕۆژێک بوو بە ئاشکرا بانگەشەی بوونــی خۆی و هاتنەوەی لە عێـراق و هەندەران کردبوو، کۆمەڵێک لە خەڵکی شــار و لاوانی چــالاک لەگەڵیاندا کەوتبوون. لــە گرتنی پادگان بــە چالاکی بەشــدارییان کرد و بەشــێکی باشــی چــەک و تەقەمەنی و موڵک و ماڵی پادگانیان گواســتەوە بۆ خۆیان. هەرچەند شووورای شار دامەزرابوو و قەرار بوو ئەوان کۆنترۆڵی شار و هەموو شتیان بەدەست بێــت، بــەڵام بە کردەوە بێدەســەڵات کرابــوون. ئێمە وەک ســەربەخۆ ڕوومان کردە پادگان و بەشداریمان کرد. بە درێژایی ڕۆژ کاک ئەنوەر مەجید ســوڵتان لەگەڵ من و ســولەیمان بللوری بوو، ئێمە ناشارەزا و چەک و تەقەمەنیمان نەدەناســی، بەڵام کاک ئەنوەر بە باشــی دەیزانی چی بە چییە و چ شــتێک بێنین. دوو دۆســتی زۆر باش لە بەردەرگای پادگان وەک ئەندامانی شــوورا کۆنترۆڵی خەڵکیان دەکرد، دوو تفەنگم پێ بوو، یەکیان گوتی، چەکێکیان بشــارەوە دەنا تووشی کێشە دەبیت. ڕوانیمــە دەوروبەر هاوڕێیەکی گیانیبەگیانیی کاکم لە بنەماڵەیەکی زۆر بەناوبانگ و ناســراوی شــار لەوێ بوو، تێکەڵاویی زۆرمان بوو، وەک کــوڕی ماڵ هاتوچــۆی ماڵمانی دەکرد، گوتم دەتوانیــت تا دێینەوە ئەم تفەنگەت لا بێ؟ یەکســەر بەدڵ و گیان لێی وەرگرتم، هاتمەوە دەر ئەو نەمابوو. شــەو لەگەڵ کاکمدا چووین بۆ ماڵیان، ســوێندی خوارد لێیان

ستاندووه و لەوانەش بوو بیکوژن، هیچ! عیلاج نەما و تفەنگ تێدا چوو. چەند ڕۆژ دواتر بیستم هەر خۆی لە مەیدانی ئەسلەحە فرۆشتبووی!

### تفەنگی ١٠٦

کاک ئەنوەر زانیی چەکی سووک هەمووی بردراوە و مەنگوڕێکی زۆر هاتبوونە ناو حەوشەی پادگان و تەنیا بەدوای تفەنگی بڕنەوەوە بوون. چووینە سەر عەمبارەکان (زاخەیان پێ دەگوتن) و دەستمان کرد بە ڕاگواستنی مین، بازوکا، فیشەکی دۆشکە و ئەم جۆرە شتانە، کە خەڵک نەیاندەزانی چین و موشتەری نەبوو. هەموویانمان بە چەند کەڕەتی پیکاب بردەوە ماڵی خۆمان. لە یەک لە کەڕەتەکاندا، لە دوورەوە قەرەباڵغیی زۆر وەک خۆپیشاندان، لە بەردەرکی ماڵی خۆمان دیت، چەند جیرانێک و خەڵک دەرگایان بەر شەق دابوو، داوای چەکیان دەکرد. نزیک بووینەوە و گوتمان بڕۆن و ئێرە بێخاوەن نییە، فایدەی نەبوو، یەک غاری دا بۆ ماڵی مامۆستا شێخ عیزەدین و مامۆستای تێگەیاندبوو، فریا نەکەوێت دەرگای ماڵمان لە ڕێسمە دەردێنن، مامۆستا دەسبەجێ مەلا سەعیدی نارد و گوتی بڕۆن ئێرە ماڵی مامۆستایە و هەرچی هێناویانە جەنابیان ئاگای لێیە و دەگەیەندرێتە شوێنی مەبەست و بۆ پێشمەرگەیە. هەر خەڵک ئەوەی بیست یەکسەر بڵاوەی کرد و دەستیان کرد بە باوەش و ماچکردنمان. هەر بۆ ئێوارە لەگەڵ سولەیمان و کاک ئەنوەر بە پیاسە بە چوارڕێی ئازادیدا دەهاتینە خوار، دوو سێ مەنگوڕ لوولەیەکی قورس و گەورەیان ڕادەکێشا، کاک ئەنوەر گوتی ئەوە (تفەنگی ١٠٦)ە، زۆر شتی چاکە، بزانە لێیان ناستێنن. چووینە پێش و چاک و چۆنی؛

- خاڵە گیان ئەوە چییە؟!

-هەی لە دایەو بەم سابلاغی هیچیان نەهێشت و هەموویان تاڵان کرد، هەر ئەو لوولە کوورەیەمان بەرکەوت!

- دەی بۆ نایدەی بە ئێمە؟

- با بێنە وێتدەم!
- بە چی و بە چەندی؟!
- بە بڕنەوێکی.
- جا کاکە کێ ئەوەندە کەرە بڕنەوی بدا بەم لوولە کوورەیە؟!
- دە باشە شتێکم وێدە و بیبەن!
- چاومــان لــە کاک ئەنوەر کرد، ٥٠٠ تمەنــی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی بیدەنێ!
- کاک ئەنوەر زۆرە، کوا ئەوەندە دێنێ؟!
- قەی چی دەکا بیدەنێ؟!

تفەنگــی ١٠٦مــان بــە ٥٠٠ تمەن کــڕی و ســواری پیکابمان کرد و مەنگوڕەکانیش بە پەلە چوون بۆ بڕنەوکڕین!

بەداخــەوە، کاک ئەنــوەر ئەو پێشــمەرگە ئازا و نیشــتمانپەروەرە، دوای ماوەیەک لە ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵات و دەســپێکی شــەڕ لە ڕێی بانــە، لە چواری ئەیلوولی ١٩٧٩دا، چەند ڕۆژ دوای فەرمانی شــوومی جیهــادی خومەینــی بۆ ســەر کوردســتان، شــەهید بوو. هاوســەنگەر لەگەڵ پێشــمەرگەکانی ڕۆژهەڵاتدا وەک دەیان پێشمەرگەی تێکۆشەری باشــوور بە خوێنی خۆی نیشانی دا کوردستان یەک وڵاتە و سنووری دەستکرد بۆ ئەوان هیچ مانایەکی نییە.

### ئەبوو شەهاب

کاک ئەبــوو شــەهاب (ئیحســان نەجــم محێدین) ماوەیــەک بوو لە قەندیلــەوە بــە هــۆی نەخۆشــییەوە هاتبوو بــۆ لامان و لــە لای من و ســولەیمان دەمایەوە، کاک دلێر یەکەم جار ئەبوو شەهابی هێنا و زۆر بە حورمەتەوە باســی بۆ کردین، وەک ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و لە دەســتەی دامەزرێنەر و هاوڕێی شــەهید شــەهابی شــێخ نووری هێنایە ناســاندن. ئەبوو شــەهاب یەکەندەردوو لەگەڵمانــدا کەوتە گاڵتە و جەفەنگلێــدان و گفتوگــۆی برایانــە و نامۆیی لە نێوانماندا نەهێشــت.

لــە ماوەیەکی کورتدا لە ماڵی ئێمە و ســولەیمان بــوو بە کوڕی ماڵ و هەســتی بە میوان بــوون و بێگانەیی نــە تەنیا نەدەکــرد، بەڵکو کەوتە فشقیات و قسەی خۆش لەگەڵ هەموو ئەندامانی ماڵەوەمان. سولەیمان تازە لە ئیدارەی «بێهداشــت» دامەزرابوو، نیوەڕۆیان کە دەگەڕاوە بۆ نانخواردن، ئەبوو شــەهاب کە لە ژوورەکەی ســولەیمان دەنووســت، هێشــتا هەڵنەســتابوو. قاچە درێژەکانی ڕادەکێشــا بۆ ناو حەوشە، ئەو هەر خەبەری نەدەبووەوە، ئەوجار ئاوی پێدا دەکرد و ئەبوو شــەهاب دەکەوتە پاڕانەوە: قوربانت بم ســولەیمان گیان، تەنیا دوو دەقەی ترم لێگەڕێ، ئێســتا هەڵدەســتم، ئیتر دەبــوو بە شــەڕەجنێو و قدیلکەدانی ئەبوو شــەهاب. کەماڵ بــرای هەرە بچووکی ســولەیمان، تەمەنی هەر حەوتهەشــت ســاڵ دەبوو، هەتا خوا حــەز بکا شــلۆق و بە حەرەکە و بزۆز بوو، لەگەڵ ســولەیماندا دەکەوتە ســەروگیانی ئەبوو شەهاب، کەمال هەتا لێیان دابا هەڵدەســتاوە و زۆرتر ئامبازیان[1] دەبوو، ئەبوو شــەهاب پێی دەگوت قیــادە، ئەویش هەرچیی پێتگوتبا بــەس نەتگوتبا قیادە، زۆری پێ تووڕە و ئیهانە بوو. جارێک ئەوەندەی ئەبوو شەهاب تووڕە کرد و نەیهێشــت بنوێت، ئەبوو شــەهاب هەڵیهێنا و لەسەر سەر بــە عەرزی دادا، کەچی وەک تۆپ هەڵبەزیوە و هەڵات. ئەبوو شــەهاب لــە هەردوو ماڵ بە کــردەوە بووبوو بە کوڕی مــاڵ. تێکەڵاوی هەموو کوڕەکانی شــار بووبوو، بۆ زۆر چالاکی و کردەوەی نیزامی یارمەتیی دەداین و ڕێنیشــاندەرمان بوو. لەناو بازاڕ کوڕێکی برادەرمان جگەری دەفرۆشــت، بەیانیان یەک دوو جگەری دێنا و لەسەر مقەڵێکی بچووک تا لای سەعات دە و یانزە تەواو دەبوو، ڕۆژێک ئەبوو شەهابمان برد، دیتــی ســیخەکان زۆر بچووکن، گوتی کاکە دایخــە و کەس ڕێ مەدە، هەمووی بۆ من دانێ! دەســتی کرد بە جگەرکێشــان، حەفتا بۆ هەشــتا ســیخی بۆ لێ دا، برادەرەکەمان گوتی ماشــاڵلا، ڕۆژانە موشتەرییەکی وەک تۆم هەبێت، هیچم ناوێت. کاکە تووخوا هەموو ڕۆژێک بیهێنن!

[1]- ئامباز، تێکهاڵان و تێکگیرانی دوو کەس، بۆ یەکتر چوون.

## خانەی جەوانان

دوای هاتنەوەم لە تەوریز و قەرباڵغیی زۆری ماڵەوەمان، هاتوچۆی زۆر و هاوڕێکانمان و میوانی پێشـمەرگە، چوار برا و هەمووشـمان بە دۆسـت و برادەرەوە، خانووەکەی تەنیشـت خۆمان کە بە کرێ دەدرا، باوکم بە کرێی نەدا. کاکم چوو شـتومەک و سـەماوەر و سـەلاجە و نوێنوبانی ماڵەکەی تەوریزی هێناوە و لەم خانووە دامانناً. زیاتر لە سێ چوار هۆدە و دوو نهۆم بوو، ناومان نا «خانەی جەوانان». مەقەڕێکی تەواو و پڕ لە میوان و پێشـمەرگە بوو. خاڵە شـێخ سـەدیقی چۆخماغ هـات بۆ عیـلاج، دوای ناردنی بۆ تەوریز و حەکیـم و دەرمان، دەبوو ماوەیـەک بمێنێتـەوە و هەمـوو ڕۆژێک دەرزی هەبـوو، فێرم کردبوو خـۆی بچـێ ئێواران لە دوکانی باوکم دەرزی لـە خۆی بدا، ڕۆژێک بە بابـم دەڵێ بەیانی ناتوانم بێم، هەر لە ماڵەوە دەرزییەکم لێ بدە، باوکم دەڵێ، کاکە هەموو خەڵک دەزانێت من ناچمە ماڵان، خەڵک دێ بۆ ئێرە! خاڵە شـێخ دەڵـێ، ماڵانی چی، ماڵـی خۆتان دەڵێم؟ باوکـم دەڵێ کاکە نەخـۆش نایەتـە ماڵی مـن و چوزانی ماڵم لە کوێیـە؟! دەڵێ، کوڕە من ئەوە مانگێکە لە ماڵی ئێوەم، لە لای عەلی و کوڕەکان لە قاتی سەرەوەم!

## پێشمەرگەی گیرفانبەتاڵ و مەسئوولی خوشگوزەران

ڕۆژێـک کاک دلێـر و کاک مـولازم عومـەر و حیمایەیەکی هاتن و قـەرار بـوو ماوەیەک لـە مەهاباد بمێننـەوە، ژوورێکمان لـە «خانەی جەوانـان» بـۆ ئامادە کـردن، بۆ نیـوەڕۆ چووین بـۆ چلۆکەبابییەکی ناسـراو و بـاش لە مەیدانی مەلا جامی، لەپێشـدا سـوپ هـات و ئێمە سـوپی خۆمان خوارد، بەس ئەم کوڕە زۆر گەنج و جوانەی حیمایەی کاک عومەر سـوپەکەی ڕاگـرت، وام زانی حەزی لێی نییە، دواتر برنج و کەباب هات، یەکسـەر سـوپەکەی بە سەر برنجەکەدا کرد و لێکی دا، کاک عومەر زۆر بە توندی بەسەریدا هات و گوتی حەیوان بۆ حەیامان

دەبەیــت، بــۆ نازانــی لە مەتعەم نــان بخۆیت؟ زۆر تەریقــی کردەوە و قسەی ناشیرینی پێ گوت؛ گوتم کاک عومەر هیچ نەبووە هەرکەس بۆی هەیــە چــۆن دەخوازێت نان بخوات، ئەم کوڕە فەقیرەش وای حەز لێیە، ئێمــە نابێــت تەداخول بکەین و دیاریی بکەیــن خەڵک چۆن نان بخوات، ئیتــر نانخواردنەکــە بوو بە ژەهــری مار، بە تایبەت لــەم کوڕە گەنجە فەقیرە، دڵنیا بووم کەســێکی باڵاتر و هاوشــانی خۆی هەر ئەو کارەی کردبا، دەیانگوت وەڵا کاکە ڕەنگە شــێوە خوارنەکەی ئێوە خۆشــتر و بەتامتر بێت! چەند کردەوەی وامان دەدیت وەک تازەمارکســی و دیفاع لە مافی زەحمەتکێشــان لە ســەرکردەکانی کۆمەڵەی مارکســی- لینینی بەڕاستی تووشی حەپەسان دەبووین و نەشدەکرا وەک خانەخوێ ئیراد و ڕەخنەیان لێ بگرین. جیاوازیی چینایەتی و خوشگوزەرانیی بەرپرس و پێشــمەرگەکان یەکجــار زۆر بــوو. پێشــمەرگە کە دەهــات گیرفانی تــەواو بەتاڵ بوو، بەڵام مەسـئوولەکان نە تەنیا بێپــارە نەبوون، بەڵکو ئەو تەخشانوپەخشــانەی ئەوان دەیانکرد بە ئێمەی خەڵکی شــارەکەش نەدەکــرا، لە شــتکڕین و بۆنــی خۆش و گرانبەها، لە قات و شــاڵکڕین، بەرپرسەکان وەک شازادە و بەبێ ئەژمار پارەیان سەرف دەکرد. هەر ئەو ســەردەم مەلا بەختیار وەک تازەزاوا بە بووکەوە هات بۆ «شــهر العســل- مانگــی هەنگوینی»، ئەوەی ئەوان کردیان لە گەشــتوگوزار و ســەردانی شیراز و ئیســفەهان و مانەوەیان بۆ زیاتر لە مانگ، تەنیا لە لای خۆمان خەڵکی زۆر دەوڵەمەند دەیانکرد، نەک پێشەنگی پێشمەرگە و ڕابەری کۆمەڵەی مارکسی- لینینی!

### محێدین ئاغای فریادڕەس

ئێوارەیــەک لەگــەڵ ســولەیماندا گوتمــان دەبێــت مــەلا بەختیار لە شوێنێکی زۆر باش دەعوەت بکەین، ڕستورانتێک هەبوو شا لە زۆربەی شــارەکان دایناوبوو، مهمانســەرایان پێ دەگوت، لە خزمەت و خواردن هاوتــای نەبوو، زۆر بورژوازی و مســتەوای لەبان بوو، بەڵام گرانیش

بــوو. ئێواره چوویــن و کاک دلێریش بوو، شــەوێکی خۆش، ئەوە چل ساڵە لە یادم ناچێت، کاتێک شەو درەنگ بوو، سولەیمان بۆ لای دەرەوە چوو بۆ پارەدان، بەدوایدا ڕۆیشتم و زۆر بە هێواشی خەریکی بژاردنی گیرفانمان بووین، بۆمان دەرکەوت بیست تمەنمان کەمە، ئەی چ بکەین چ نەکەین و زۆر عەیبە، لەناکاو محێدین ئاغای بابانزادە لە لای پێشخان قوت بووەوە و گوتی مێزی ئێوە دراوە و داینێ بە حیسێبی کاکە برایم، خــۆم لەگــەڵ بابتدا پێک دێم. محێدین ئاغا، پیاوێکی خاوەن موڵکی زۆر دەوڵەمەندی ســابلاغ بوو، زۆر جلی جوان و ســەیارەی جوان و گرانی بەکاردێنا، لە کۆنەوە دۆســت و جیرانی باوکم بوو، زۆر ســەخی بوو، تا ئەو ئاخرییانەش هەر لە ناوشــار و لە ماڵی خۆیان مانگا و کاڕانیان بوو، زۆر جار ماســت و دۆیان بۆ دەروجیرانان دەنارد. ئیتر نازانی لە خۆشیان چمان کرد، هەرچەند نابێت و قبووڵی ناکەین و فشەمان کرد، بەس گوتی، لەســەری مــەڕۆن و میوانی مامی خۆتانن. فریشــتەیەکی نەجات بوو پەیدا بوو.

### جیاوازیی مەسئوول و پێشمەرگە

کوڕێکــی هاوڕێمــان بــوو، ئەویش ناوی ســولەیمان بــوو، باوکی ترۆمبێلێکــی جــوان و گرانــی بــوو، لێی وەرگــرت و مــەلا بەختیار و هاوســەرەکەی پــێ برد بۆ سەرتاســەری ئێــران و گــەڕان. لە خودی مەقەڕەکانــی ناوزەنــگ و قەندیل و توژەڵەش زۆر زوو هەســتمان بەم جیاوازیی «چینایەتی» نا! بەڵکو مەسئوول و پێشمەرگەی سادە دەکرد. ئەو کاتانەی مەســئوولێک دەســتی لــە پێشــمەرگەیەک هەڵدێناوە و بە قســەی خۆیان دارکارییان دەکرد، بۆ ئێمەی شۆڕشــگێڕی ڕۆژهەڵاتی کارەسات بوو، بەس زۆر کەم قسەمان دەکرد!

## میوانی عەلی و مولازم عومەر!

باوکــم نیوەڕۆیان بۆ نانخواردن و پشــوودان دەهاتەوە ماڵ، نێوان دوکان و ماڵەوەمان تەنیا کۆلانێکی دووســەت بۆ سێسەت مەتری بوو، هەر وەک باســم کرد دەرگای ماڵی خۆمان و ماڵەکەی ترمان لە کۆلان بــەدوای یەکدا بوون، باوکم بە بــەردەرگای یەکەمدا تێدەپەڕیت و کلیل لــە گیرفان دەردێنێت بێتەوە ژوور، یەکی تریش کلیل لە دەرگای یەکەم دەنێت، باوکم دەوەستێت و بە سەرسوورمانەوە سەیری دەکات و لێی نزیک دەبێتەوە، دەڵێ:

ئەوە خەریکی چیی کاکە؟!

دەچمەوە ماڵ!

بۆ تۆ کێی کاکە؟! ئێرە ماڵی منە، ئەی بۆ ناتناسم؟!

من میوانی عەلیم و مولازم عومەرم!

بابــم لەبەر خۆیەوە هەتــا حەز دەکات جنێــوی ڕەوانە کردبووم و دواتر شــەڕێکی باشــی لەگەڵدا کردم. مانەوەی کاک مولازم عومەر و هاتوچــۆی زۆری، دەبوو کلیلێکی خانووەکەی پــێ بدەم بۆ حورپییەتی خۆی، بەس بابم ئەوەی نەزانیبوو، نەشیدەزانی کێ دێ و کێ دەڕوا و میوانمان کێیە؟!

## نارنجۆکئەندازەکەی پۆلا

یەکێتــی کاک عەلیــی ئامەخانــی ناردبــوو بۆ پەیداکردنــی چەک و تەقەمەنــی، پۆلای نانەوا کە چریکی فیدایی بوو، زۆرمان لێ نزیک بوو، لەبەر مەدرەسەی گەلاوێژی کچان بە کەواوپانتۆڵێکی جوان و شەدە و پشتێند، نارنجۆکئەندازێکی بە چەند گوللەی زەرد و سوورەوە لە خۆی بەســتبوو، تفەنگێکی قوڵەیە و زۆر ســووکە، لە ئەشیای یاریی منداڵان دەچوو، دواتر زانیمان بۆ پارتیزان زۆر چەکێکی بەکەڵکە. کاک عەلی کە زانیی دۆست و ناسیاوی ئێمەیە لێی چووە پێش و گوتی:

- ئەمە چییە؟!

- ئەمە نارنجۆکی فڕێ دەدا، ئەوەتا ئەم زەردانە هەون!

کاک عەلی گوتی: بە چەندی؟

- نایفرۆشم، بەڵام دەیگۆڕمەوە!

- بە دەمانچەی دەدەی؟

-ئا! بە چواردەخۆرەکەی خۆت!

- نا! ئەوەی من باش نییە کۆنە!

- یەکی تازە تازەت بۆ دێنم!

- باشە، با بڕۆین ئەوەتان بۆ تاقی کەمەوە.

هەموو پێکەوە چووینە قەراخ شـــار و پـــۆلا یەک دوو نارنجۆکی بە بەردان دادا!

دوو ڕۆژ دواتر کاک عەلی دەمانچەی دا بە پۆلا و نارنجۆکئەندازی لێ وەرگرت، ماوەیەک دواتر کاک عەلی ڕۆیشتبووەوە، پۆلا هات گوتی کاکە ئەوە دوو فیشەکم پێ هاویشت، دەرزییەکەی شکا!

دواتر زانیی، ئەوە چواردەخۆری تورکییە و زۆر مەرغوب نین. ئیتر درەنگ بوو چی نەدەکرا!

زۆر بەداخـــەوە چەنـــد ڕۆژ دواتـــر کاک عەلـــی لـــە سەردەشـــت لە ڕووداوێکـــی زۆر ناخۆشـــی کۆمەڵایەتـــی و تێکهەڵچوونـــی لەگـــەڵ بنەماڵەیەکی ناسراوی شارەکە کوژرا، بە حیکمەت و عەقڵی کاک دلێر و تەداخولی مام جەلال، زۆر زوو ڕووداوەکە سەرپۆش کرا و نەیانهێشت تەشەنە بکات و خەڵکی سەردەشت و پێشمەرگەی یەکێتی لەگەڵ یەکدا، تووشی هەڵپڕژان بن!

# ٩

## کۆمەڵە و ترس لە خوێندەوار

ئێستاش تێنەگەیشتم هۆکار چ بوو دوای سەرکەوتنی شۆڕش و نەمانی حکومەتی پەهلەوی، کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بۆ خۆی ئاشکرا نەدەکرد؟ هەموو شارەکانی کوردستان پڕ بوون لە مەکتەب و بنکەی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی. چریکە فیداییەکان شوێنێکی زۆر مەرکەز و باشی ناوشاریان گرتبوو، جاران ستادی ئەرتەش بوو، حیزبی دیموکرات لە چەند شوێن مەقەڕی هەبوو، حیزبی تودە بە ناوی لاوانی حیزبی دیموکرات دەفتەری بوو و لە چالاکیدا بوون، ئیتر ڕێکخراوگەلی تریش فرە بوون، سابلاغ پڕ بووبوو لە خەڵکی شارەکانی تری ئێران. خۆشاردنەوەی بێمانای هاوڕێیانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی زۆر لە لاوانی کچ و کوڕ ئەم بۆشاییە بە چوونیان بۆ ناو حیزب و ڕێکخراوی سەرانسەری و ئێرانی پڕ بکەنەوە، کۆمەڵێک لە کچان و کوڕانی زۆر باشی کوردستان کەوتنە داوی چریک و حیزبی تودە و تووشی هەڵدێر و خیانەت بوون لە نەتەوەی خۆیان.

سەرانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ لەجیاتی ئەوەی فرسەت بقۆزنەوە و بێنە ناو خەڵک، ڕێبازی سیاسی و ستراتیژی خەڵکی کوردستان بە بەرنامەوە بەرنە ناو باس و ڕاڤەی خەڵکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار و ڕاکێشی ڕێبازێکی نەتەوەیی پێشکەوتوانەیان بکەن، کەچی لە خوێندەوار و ڕۆشنبیر دەترسان و ڕقیان لێیان دەبووەوە. سەرکردەکانیان کە هەموویان دوکتۆر و موهەندیس و سیاسی و زیندانیی شا بوون، تەنانەت دوای ڕووخانی ڕژێمیش بە هەزاران خوێندکار و ڕۆشنبیری شاریان پێ هیچ نەبوو، دەچوونە گوندێکی بچووک و لەگەڵ ماڵە فەلاحێک خەریکی دەسکەنە و کاری جوتیاری دەبوون، زۆر چووبانە

پێش، دەبوونە کرێکاری ســاختوومانی و کورەخانــەکان. دەیانی وەک من و سولەیمان بەدڵ حەزمان لە ڕێکخراوەیەکی وەک کۆمەڵە بوو بۆ کارکــردن، حیزبی دێموکرات نەیتوانیبوو زۆربەی ئێمەی خوێندەوار بۆ لای خۆی ڕاکێش بکات، کەچی بە پێچەوانەوە ئێمە وێڵ و سەرگەردان بە شــوێن کۆمەڵەوە بووین و نەماندەدیتنەوە، خۆیان پێشــان نەدەداین و بــە دەیــان خوێندەواری زانکۆچــووی وەک، خەلیل و ســولەیمان و حوســێن و کەمال و...ی کورە شاریان بە وڵاغدار و جوتیارێکی میراوا و سیسێر و دەرمان دەگۆڕییەوە!

**مام جەلال هانی دان**

بــەڵام هاتبوون و لە هەر شــارە شــتێکیان دامەزراندبوو، بە ناوی جەمعییەتــی... یــان کۆمەڵــەی... و چەند هاوڕێیەکــی نزیکی خۆیان تێ خزاندبوو، زۆربەی ئەوانەی ڕاکێشــی جەمعییەتەکان بووبوون، لاوانی چەپی سەر بە ئەندێشەی مائۆ و دژی خەتی سۆڤییەت بوون. کۆمەڵەی شۆڕشــگێڕ لەو سەردەمەدا، ئەوەندە شــەرمێون و غللوور و ترسنۆک بــوون، نە ئەوە بوو بڵێــن جەمعییەتەکان هەمان کۆمەڵەیە و وەرن ببن بە ئەندامی کۆمەڵەی شۆڕشــگێڕ، ئەوە ڕابردووی ئێمە، ئەوە خەبات و بەرنامەی ئێمە و ئەوەش ڕوانین و ستراتیژی ئێمەیە بۆ کوردستان، نە ئەوە بوو خۆیان بێبەری بکەن لەو هەموو لاو و خوێندەوارە خوێنگەرم و چالاکە لە ناو ئەو جەمعییەتانەدا وەک ســەروەتێکی گەورەی مرۆیی و ڕۆشــنبیری. بە کــورت و کرمانجی خراپ تــووش بووبوون، عەقڵی جوتیــاری ئیجــازەی فراوانبیــری و ئازایەتیــی نــەدەدان و لــە لایەکی دیکەیشــەوە قســە و لێکدانەوەکانی مام جەلال بۆ هاندانیان بۆ خەباتی چەکداری و بوونیان بە بەدیلی حیزبی دێموکرات و کەڵکوەرگرتنیان لە هەژموونی خەباتی نەتەوەیی، لە ئەنجامدا بوون بەم کۆمەڵەیە و توانییان وەک یەک لە هێزە چەکدارە ســەرەکییەکانی کوردســتان بێنە ناســین. لــەم دواییانەدا بــە هیمەتی ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵە، کاک ســاعد

وەتەندوست، یادداشتەکانی یەکەم کۆنگرەیان لە شارەکانی نەغەدە و سنە بڵاوکرایەوە. ئەم کتێبە[1] زۆرێک لەم گومان و پشتپەردەی، ڕووی ڕاستەقینەی پێکهاتەی کۆمەڵەمان بۆ شەنوکەو و ڕوون دەکاتەوە. لە کاتێکدا هەموو خەڵکی کوردستان خرۆشاوە و بە دەیان سازمان و ڕێکخراوی ئێرانی هاتوون بۆ ڕاوی لاوەکانی کوردستان، ئەوان لە ناو کولەکەدا بانگ دەدەن. بە دە کەسەوە، هەمووی ژێر تەمەنی سی ساڵ، لە ماڵی مامۆستا مەلا ساڵح لە نەغەدە بە سەدان سەعات و دەیان ڕۆژ خەریکی ڕەخنە لەخۆگرتنن، دانیشتوون و ڕەوشت و ڕەفتاری وردەبۆرژوای و ئاغاوەتی یەکتر لەقاو دەدەن. دە کەس بۆ ماوەی سیوحەوت ڕۆژ تەنیا قسە و ڕەخنەگرتن لە یەکتر، لە دەرەوی ئەم کۆڕە بچووکەش کۆمەلانی خەڵک خەریکی دەرکردنی شا و سەرکەوتنی شۆڕشن! لە دواڕۆژێکی کورتدا ئەو دیمەنە دەبێتە هەژموونێکی گەورە و بە ناوی «کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران»، مل دەبەر ملی پاسدار و بەسیج و ئەرتەشی ولاتێکی وەک ئێران دەنێت، تەنانەت شەڕی ناوخۆی چەند ساڵە و زۆرانبازیی لەگەڵ حیزبەکەی قازی و قاسملوو لە ئەرشیفی کارنامەکەیدا تۆمار دەکات! لە چوون و شەهیدبوونی هەزاران لاوی خوێندەوار و بەحەماسی ئەم کوردستانە، بۆ ڕیزی ڕێکخراوێکی ئاوا، عەقڵ و مەنتق دەستەوەستان دەبن لە بەرامبەری، بۆ ڕانان و شیکردنەوەیەکی ڕامیاری و کۆمەڵناسانە، لەمەڕ ولاتەکەی ئێمە!

پانزەی فێوریەی ١٩٧٩ و لە بیستوشەشی ڕێبەندانی ١٣٥٧ هەتاویدا و دوای تەنیا چوار ڕۆژ بەسەر سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران و هاتنە سەرکاری حکومەتی ئیسلامی، لە تێکهەڵچوونێکی خەڵکی سەقز و

---

١- ئەم کتێبە، «مباحث کنگره اول کومەله» پاییز ١٣٥٧ویراستاران: ملکه مصطفی سلطانی و ساعد وطن دوست- ساڵی ٢٠١٦ بڵاو کرایەوە، زۆر نهێنی و پشتپەردەی چۆنێتی و ڕووی ڕاستەقینە و هاتنەمەیدانی کۆمەڵە بۆ ناو خەبات لە ئێران و ڕۆژهەلاتی کوردستانمان لە سەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێران لە ١٩٧٩دا بۆ ڕوون دەکاتەوە.

شارەبانیدا، ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە کاک حەمەحوسێن کەریمی بە نەناسـراوی و ڕێکەوت شەهید دەبێت، ئەوجار کۆمەڵە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسـانێک لە خۆی بێنێتە ناسـین و ئاشـکراکردن، بوونی خۆی و کاک حەمەحوسـێن وەک دامەزرێنەر، تەنیا بە چەند دێڕێک لە بەیانێکدا ڕادەگەیەنێت!

## ڕوخساری خومەینی دەرکەوت

بەداخـەوە هەر لـەدوای هاتنـەوەی خومەینی و هاتنە سـەرکاری حکومەتـی بـازرگان، زۆر زوو دەرکـەوت خومەینـی و حکومەتەکەی بڕوایـان بـە مافی گـەلان نییە، بە تایبـەت قبووڵیان نەبـوو کە خەڵکی سـابڵاغ و شـارەکانی دی، دەستیان بەسـەر پادگان و ژاندەرمەری و چەکوچۆڵی حکومەتدا گرتووە. بۆیە لە هەر شوێنێک بۆیان کرا هەر لە دەسـپێکەوە بەرەنگاری کوردەکان دەبوونەوە. لە سـنە وەک زۆربەی شارەکان شورای شار و خەڵک ویستیان دەست بەسەر پادگاندا بگرن، سـەرباز و بەرپرسـانی پادگان بەرگرییان کرد و شـەڕێکی خوێناوی وماڵوێرانکـەر لـە یەکـەم نـەورۆز و تەنیا دوای سیوهەشـت ڕۆژ لە سـەرکەوتنی شـۆڕش، بەرۆکی کـوردی گرت. لە هەموو کوردسـتان لاوان بـە چـەک و یارمەتیـی خـواردن و جلوبـەرگ و پەتـوو، ڕێـی سـنەیان گرتەبـەر. هەبوون شۆڕشـگێڕی چەپی ئێرانی لە شـارەکانی ئێران بەرەو سـنە دەهاتن و لە گەڕەک و جادەکان بۆ بەرگری لە شار دەچوونە سـەنگەر. دوای سـەرکەوتنی شـۆڕش، ئاخوندێکی شیعە بە ناوی سـەفدەری کە شـا تەبعیدی کردبوو بۆ سنە و خەڵکی ئەم شارە زۆریان حورمەت گرتبوو، بووبوو بە نوێنەری ئیمام. ئاخوند سەفدەری دژایەتیـی لەگـەڵ کورد و چالاکانی سیاسـی و خۆشـنێوی وەک کاک سـەدیق کەمانگەر، سـەید ئەیووب، شـوعێب زەکریایی و کاک یوسف ئەردەلان کە تازە لە زیندانی شا ڕزگاریان بووبوو دەست پێ کردبوو، ئەوان بە مانای تەواو نوێنەرایەتیی خەڵکیان دەکرد و زۆر مایەی ڕێز و

حورمەت بوون. لە لایەکی ترەوە ئەحمەد موفتیزادە بە ناوی ئیسلامەوە قوت بووبووەوە و حەولی دەسەلات و چەکدارکردنی لایەنگرانی خۆی دەدا. ناکۆکی و ئاژاوەی سەفدەری و موفتیزادە سەرەنجام شەڕی بەرپا کرد و لە ماوەی کەمتر لە حەفتەیەکدا زیاتر لە دووسەت شەهید و چوارسەت بریندار لی کەوتەوە. هەوڵ بۆ گرتنی پادگانی سنە هەبوو، ئەوانیش لەناو پادگانەوە بە تۆپ و هاوەن و دۆشکە و قەناسە، زۆربەی شاریان وێران کرد و خەڵک زەرەر و زیانی زۆری بەرکەوت. زۆر زوو هەیئەتی دەوڵەت لە تارانەوە بە ڕێبەریی ئایەتوڵلا تاڵەقانی و لە کوردستانەوە هەیئەتی کورد بە ڕێبەریی مامۆستا شێخ عیزەدین لە شاری سنە بەیەک گەیشتن. بڕیاریان دا کاروباری شار و پادگان و بەڕێوەبەری دامودەزگاکان بدرێت بە شورایەکی هەڵبژێردراوی خەڵک.

### تفەنگەکەم فرۆشرا

خەڵکی سابڵاغ بە تایبەت لاو و خوێندکار بە خۆبەخشی شتومەکی وەک خواردن و دەرمان و پەتوویان کۆ دەکردەوە و بە کاروان بەرەو سنە وەڕێ دەکەوتن. چەند دەستەیەکیش بە چەکەوە چوون بۆ یارمەتیی براکانیان، هەرچەندە شەڕ زۆری نەخایاند و تەواو بوو. ئێوارە سولەیمان هات، گوتی ئەوە یوسف و براکەی ئامادەن بە خۆبەخش بچن بۆ سنە، تفەنگیان نییە، بزانە تفەنگێکیان بۆ پەیدا ناکەیت؟! ژ٣ یەکی بێقۆنداغی تازەم هەبوو، دامێ گوتم هاتییەوە بۆم بێنەوە، قەولی دا لەسەر دەستی سولەیمان. شەڕ تەواو بوو ئەوان هەر نەگەیشتبوون و زانیم هەر نەچوون، گوتم سولەیمان، پێیان بڵێ با تفەنگەکە بێنەوە، هەر ئەمڕۆ بە سبەینێیان کرد و دیار بوو فرۆشتبوویان. لە چوارڕێی ئازادی پێشمان پێ گرتن و سوێند و پاڕانەوە دەیهێنینەوە، لەو دەمەدا شەهید تەها کەرباسی هات و گوتی، یوسف تۆ قەولت بە سولەیمان و عەلی داوە و ئەوانیش متمانەیان پێ کردوویت. ئیتر یوسف تەحەمولی نەما و بە گریانەوە گوتی، بێشەرەفی برام هەر ئەو شەوە کە وەرمانگرت

بــردی فرۆشــتی! تەها لێکــی کردینەوە و ســولەیمان کــە زۆر تووڕە بووبوو، ئارامی کردەوە و گوتی، چەکم زۆرە و ڕەشاشێکم هەیە بۆتان دێنم. ڕازی بووین لەســەر قسەی تەها و ڕۆیشتین. هێندەی پێ نەچوو تەها لە شەڕی نەغەدە شەهید بوو. ئیتر منیش تفەنگم هەر نەدیتەوە و فرۆشــرا و خورا بە دەستی دۆست، ئەوەش دووەم تفەنگ بوو دۆست لێی دەفرۆشتم و دەیخوارد!

### ئەشرەفی دێهقان

لــە ســەرەتای بەهــاری ٧٩دا دوای ڕووخانــی ڕژیمــی پەهلــەوی، بەهارێکی خۆشــی ئازادی و شــادی باڵی بەســەر هەمــوو کۆمەڵگەی ئێران و بە تایبەت کوردســتاندا کێشــابوو، ئازادییەکی بێسنوور هەبوو بۆ خەڵک، لە هەر کەلێن و قوژبنێک کتێب و ڕۆژنامەفرۆشــی، مەقەڕی حیزب و ســازمانێکت دەهاتە ســەر ڕێ. ڕۆژێک ســولەیمان تەلەفۆنی کــرد گوتــی ترومبێلێک بێنە و وەرە بۆ ماڵ، کە چووم یەک دوو فارس دیار بوو بە دەمانچەوە لە حەوشــە بوون و خانمێک لە ژوورەوە بوو. ناســاندی، ئەشــرەفی دێهقان بەرپرســی شــاخەیەکی چریکەکان بوو. ئەشرەف لە سەرتاسەری ئێران زۆر ناسراو و مەشهوور و مەحبووب بــوو. ئەو، لە زەمانی شــادا وەک یەک لە کچە هــەرە گەنج و ئازاکانی ســازمانی چریکــەکان لــە ڕووبەڕووبوونــەوەی دەســتەویەخە لەگەڵ پۆلیســی شــادا گیرابوو، خوشــکی بەهروزی دێهقان لە سەرکردەکانی ڕێکخراوی چریکەکان و دۆســتی نزیکی ســەمەد بەهرەنگی بوو، دواتر شــا ئیعدامی کرد. ئەشــرەف بە دە ساڵ زیندان مەحکوم کرابوو، دوای دوو ســاڵ توانیی هەڵبێت و تا ســەرکەوتنی شۆڕشی ئێران بەشداریی شەڕی چریکی دەکرد و لە حەشارگەدا بوو.

ســولەیمان گوتی، ئەشــرەف زۆر بە نهێنی هاتووە و میوانی ئێمەیە و قــەرارە لە مێتینگێکی ســابلاغ قســە بکات. ڕۆژانــە دەبێت دەرزی لە خــۆی بدات. قەرارمان دانا هەموو ڕۆژ بچم لەگەڵ ســولەیماندا بیبەین

بـۆ لای بابم و دەرزییەکەی لێ بدا. بابم لەگەڵ سـولەیماندا زۆر گاڵتە و جەفەنگیـان هەبوو، سـولەیمان بـە بابمی گوت، ئەو خانمە ئاشـنایە و دەرزیـی لێ بدە. بابیشـم بردیە پشـت پـەردە سـپییەکە، لەناکاو بە دەنگی بەرز گوتی، کوڕە سـولەیمان ئەوە دەمانچەی لە پشـت قونێتی! سـولەیمان گوتی، کاک برایم ئەوە خەتەرە، باسی مەکە، لەو ژنانە نییە کە جەنابتان بینیوتانە، بە تەنیا سەد پیاو دەرەقەتی نایەن!

ئیتر چەند ڕۆژان هەموو ئێواران بە سـەیارە دەمانبرد بۆ لای بابم و هەر لە ناو سەیارە گەڕانی شارمان پێ دەکرد، زۆر ئاسوودە بوو لە ماڵی سولەیمان و لەگەڵ دایک و خوشکەکانیدا زۆریان خزمەت کرد.

چەنـد ڕۆژ دواتـر لە مێتینگێکی گـەورە لە مەیدانی مـەلا جامی لە باڵکۆنـی بینایەکـەوە، ئەشـرەف نوتقێکـی گەرموگوڕی کرد و باسـی خەباتی خۆیانی کرد لە سـەردەمی شـادا. یەک دوویەک لە کوڕەکانی هاوڕێ بە بەر دوکانی بابمدا پیاسە دەکەن و دەڵێن، میرزا برایم نازانی ئەشرەف چیی کرد، حەیف لەوێ نەبوویت! بابم دەڵێ بڕۆن ڕۆڵە، ئێوە لە دوورەوە دیوتانە، من قونیشیم دیوە! ئیتر سینگ لێیان دێنێتە پێش و بۆیـان باس دەکات، ئەوە هەفتەیەکە هەموو ڕۆژێک هاتووە و دەرزیی لـێ داوە. کوڕەکان لەسـەر جادە بە گاڵتەوە هاواریـان دەکرد: هەتێ[1] عەلی، بابت ڕەفیقی ئەشرەف بووە و نەمانزانیبوو!

### یەکەم شەهیدی یەکێتی لە ڕۆژهەڵات

لە بەهاری ٧٩دا ڕۆژانە دەستەدەستە پێشمەرگەی ماندوو، نەخۆش و تامەزرۆکانـی یەکێتی بۆ دیتنی شـارەکانی ڕۆژهـەڵات و بە تایبەت سـابڵاغ زۆر بە ئازادی پەیدا دەبـوون. تێیاندا بوو وەک ئێمە لە گرتنی پیاوخراپ و ساواکی و کێشکگرتنی شار و چالاکی و تەنانەت بەشداریی شەڕی سنە و کەرەفتووی سەقز و هاتوچۆی ئەولا و ئەملاشیان دەکرد.

---

١- هەتـێ، کورتکـراوەی هەتیوەیـە، مناڵەسـابڵاغی بـۆ بانگکردنی یەکتر بەکاریان دینا.

شەهید حەمە نەگرەیی خەڵکی گەرمیان، یەکەم شەهیدی یەکێتی بوو لە شەڕی ئاغاکانی کەرەفتوو گیانی خۆی فیدای شۆڕشی ڕۆژهەڵات کرد.

## سیروان تاڵەبانی

مانگــی گوڵانــی ٧٩، کاک دلێر چەند کەســی لەگەڵدا بــوو، هاتن بۆ ماڵــی ئێمــە، گوتی، ئەوە فەرماندەی عەســکەری و زۆر بە حورمەت و گەورەیی باسی سیروان تاڵەبانیی بۆ کردین. وەک برا لە لای خۆمان بۆ چەند ڕۆژێک مایەوە، پێشمەرگەی ئازا و قارەمان کاک حەسەن خاوێی یەک لە هاوڕێکانی بوو لەم سەفەرەدا. گوتیان، هاتووین بۆ تفاقی شەڕ و چەککڕین و هەرێمەکەمان پێداویستییەکی زۆری سەربازیی گەرەکە. بەیەکەوە کەوتینە بازاڕ و کۆکردنەوە و کڕینی شتومەکی جەنگی.

کاک سیروان، جوامێر، پیاوێکی بە زیپکوزاکوون[1]، لەسەرخۆ، مەند[2] و جێی ڕێز بوو. هەر کە بۆ یەکەم جار دەتدیت هەستت بە کەسایەتیی بــەرزی دەکرد. ڕۆژی پێش ڕۆیشــتنەوەیان بــۆ هەرێمەکەی خۆیان و ماڵئاوایی، ئێوارەیەکی خۆشــمان بۆ ڕێکخســت، ئەبوو شــەهاب، عەلی ئامەخان، سولەیمان و چەند برادەری دی بۆ بەڕێکردنیان لەوێ بوون. زۆر بەداخەوە چەند ڕۆژی نەبرد خەبەر هات لە ڕێی چوونەوەیان، لە شارەزوور سیی مانگی نیسانی ٧٩ بەسەر کەمینی جاشدا کەوتوون و کاک ســیروان و کاک حەســەن و چەند پێشمەرگە شەهید بوون. داخ و حەسرەتێکی زۆری بۆ جێ هێشتین.

## شەڕی کورد و ئازەری

حیزبی دێموکرات دوای سەرکەوتنی شۆڕش لە ئێران، ڕۆژانە کادر و ئەندامەکانی لە هەندەران و عێراقەوە دەهاتنەوە، لە ســەر قەڵاندۆش و بــە باوەشــی گەرمی خەڵــک، بەخێرهاتــن دەکران. هــەر ڕۆژە و لە

---

١- زیپکوزاکوون، تێگەیشتوو، ژیر و عاقڵ.
٢- مەند، سەنگین و لەسەرخۆ.

شـــار و شـــارۆچکەیەک بە ڕێپێوان و کۆبوونەوەی جەماوەری، خۆیان دەناســـاندەوە و خەڵکێکـــی زۆر بـــە تایبەت لە ناوچەکانـــی موکریان و شکاک و شنۆ، لایەنگریان بوون.

ڕۆژی بیســـتویەکی نیسانی ۱۹۷۹ سەرەی شـــارۆچکەی تێکەڵاوی کـــورد و عەجـــەم لە نەغـــەدە بـــوو. دوکتۆر قاســـملوو نیـــازی بوو لە کۆبوونەوەیەکـــی گـــەورە لـــە مەیدانـــی وەرزشـــی ئەم شـــارە حیزبی دێموکرات بە کۆمەڵانی خەڵک بناســـێنێتەوە. پاســـدار و بەکرێگیراوانی ئاخوند حەســـەنی بە هانـــدان و دنەدانی ئازەرییەکانـــی نەغەدە، هەلیان قۆســـتنەوە و شـــەڕێکی بێبزەیانـــە وماڵوێرانکەریان بەســـەر ئەم دوو نەتەوەیە، کە ســـاڵیانی ســـاڵ بوو بە ئاشـــتی و برایەتی پێکەوە دەژیان، ســـەپاند و نیوەی شـــارەکە وێران و سەدان کەس کوژران و بریندار و ئاوارە کران. لێکدانەوەی هەڵەی کادرانی حیزب و ڕاوێژکارانی ناشارەزا و دوور لـــە فەرهەنگـــی پێکەوەژیانـــی کورد و ئـــازەری و دیاریکردنی کاتـــی هەڵە لە لایـــەک و دوژمنایەتی و دەمارگرژیی ئاخوندێکی جاهیلی وەک حەســـەنی وای کرد کارەســـاتێک لەم شـــارۆچکەیە ڕوو بدات کە پاشـــماوەی برینەکانی بە دەیان ســـاڵیش ســـاڕێژ نەبنـــەوە. ژن، منداڵ، پیرەپیاو، وردودرشـــت، دار و بەرد، لە بەرامبەر تووڕەیی و غەزەب و قینلەدڵی خەڵکی بێویژدان و بێڕەحم و ئاژاوەچیدا، نەکرا لە ئەماندا بن.

خەڵک لە شارەکان و بە تایبەت لە سابڵاغەوە پۆل پۆل بە کەرەسەی شەڕەوە وەڕێ کەوتن بەرەو نەغەدە، عەقڵ و مەنتق نەمابوون و جێی خۆیـــان دابوو بـــە ڕق و کینە و دەمارگرژی کورد و عەجەم، شـــیعە و ســـوننی، ئیتر دڵســـۆز و بەمشوور قســـەی نەدەڕۆیشت و کەس گوێی بـــۆ نەدەگرتـــن، ڕۆژ ڕۆژی جاهیـــل و نەفامەکان بـــوو، ئەنجام بوو بە کەوتنی ســـەدان جەنازە و بریندار و تالان و ڕووخانی ماڵ و کاشـــانە، گۆڕســـتانی بوداق ســـوڵتان لە سابڵاغ لە ڕۆژی حەشر دەچوو، سیمای شاری نەغەدە وەک پاشماوەی لەشکری مەغۆل بوو.

تەها کەرباســـی بە ترۆمبێل لەگەڵ هاوڕێیەکی وەڕێ دەکەون بچن

بۆ سێ ڕای نەغەدە لە جادەی ڕەزائییە، زۆر بێڕەحمانە بەر دەستڕێژی گوللەی بەسیجییەکانی حەسەنی دەکەون و هەر لەوێ شەهید دەبن. تەها کوڕێکی خۆشەویست و ئازا و مێرخاسی سابڵاغ بوو، لەم دواییانەدا بە هۆی ئەوەی ئەویش هاتوچۆی پێشمەرگەکانی لە قەندیل دەکرد، زۆر لێک نزیک بووبووینەوە، تەها لە حەولی کۆکردنەوەی چەکوچۆڵدا بوو و دەیزانی زوو یان درەنگ شەڕ بەربینگمان پێ دەگرێت، نەیدەزانی خۆی بە یەکەم فیشەکی شەڕی ئاخوندەکان لەگەڵ کورد دەبێتە قوربانی.

کاک ئەحمەد خاتەمی پیاوێکی سەرسپی و ناسراو و کارمەندی کۆنی ئیدارەی سجیلی سابڵاغ، بە پەلە بە خەبەری شەڕ لە نەغەدە، وەڕێ دەکەوێت بچێت کچەکەی بێنێتەوە، هەر لە سێ ڕای نەغەدە ئەویش بەسەر چەکدارەکانی ئاخوند حەسەنیدا دەکەوێت، بێگوناح و بێچەک، پیاوێکی بەم سەر و سیمایە، بەوپەڕی بێڕەحمی شەهید دەکەن و بە ئاوێیدا دەدەن. بە دەیان نموونە ئەم یەک دوو ڕۆژە دیتران و قرچەی لە هەموو دڵێکی پاکی مرۆڤە بە وێژدانەکان هێنا. کوردە قینلەدڵ و شەڕخواز و بێکەرامەتەکانی بەرامبەر بێدەسەڵات شێر و بەرامبەر زۆردار خوێڕی و ڕێوی سفەت، لە بەکرێگیراوەکانی حەسەنی نەمانەوە و لە کوشتنی خەڵکی بێدیفاع و دەستڕێژی بە کچانی ئازەری و دزی و تاڵان و شەڕەخۆری کۆتاییان نەکرد. ئێوارەی ڕۆژی دوایی لەگەڵ دوو هاوڕێدا بە سەیارە بە جادەی پەسوێدا ویستمان بچین بۆ دەوروبەری نەغەدە و یارمەتیی خەڵک و بریندار بدەین بۆ هێنانەوەیان، لە جادە خۆڵ و تێکەڵەکە سەردەکەوتین، لەناکاو لە قەراغ جادە جەنازەمان دیت، دابەزین و دیتمان دوو چێوداری مەزلوومی ئازەری ڕووت کراون و هەر لەوێ کوژرابوون، دواتر لە خەڵکمان بیست کێ ئەو تاوانە نامرۆڤانەیەی کردووە؟! زۆر بێسووچ و گوناح، تەنیا لەبەر ئەو برە پارەیەی گیرفانیان، ئەو کردەوە قێزەونەیان ئەنجام دابوو.

# ١٠

## نامەیەک بۆ زەبیحی

کاک زێـڕۆی بەرپرســی هەرێمــی قەڵادزێی یەکێتــی چەند جارێک هاتبــوو بــۆ لامان و زۆر هەســتی بــە نزیکی دەکــرد. ئێوارەیەک هاتە ناوماڵ و لەگەڵ دایکمدا قســەیان دەکرد، دایکم باســی کاکی بۆ دەکرد، دیــار بوو لــە زووەوە و ســەردەمی جەلالــی، کاک زێڕۆ لــە نزیکەوە زەبیحیی دەناسی. دایکم گلەیی بەختی خۆی لا دەکرد و دەیگوت، ئەوە هەمــوو هاتنەوە، مامۆســتا هێمن، کاک حەمەدەمین ســیراجی، دوکتۆر قاســملوو و هەر هەموویان؛ کاکم لەگەڵ مامۆســتا هەژاردا ڕۆیشــت، ئەوە هەژار چوار پێنج ســاڵە لەگەڵ مەلا مســتەفادا هاتووەتەوە، ئەدی بۆ کاکم ئێستا کە شاش نەماوە ناگەڕێتەوە؟! تووخوا ماوە؟! کاک زێڕۆ سوێندی بۆ خوارد و گوتی دایە گیان مامۆستا زەبیحی زۆر لەم قسانە گەورەتــرە و دڵنیــا بە ماوە و ئێمە خەبەرمان لێی هەیە، هەر ئێســتا با عەلــی نامەیەکی بۆ بنووســێت، شــەرت بێ من بە دەســتی بگەیەنم و وڵامیشتان بۆ بێنمەوە. دەستم کرد بە نووسینی نامە بۆ یەکەم جار بۆ زەبیحی و خۆم ناســاند و گوتم ئەوە ئەم نامەیە لە زمان دایکم و هەر هەموومان دەنووســم، تکایە گەر پێتگەیشــت وەڵامان بدەوە، تەلەفۆنی ماڵی خۆمانم بۆ نووسی و نامەم دا بە دەست کاک زێڕۆ.

## زەماوەندی کاکم

لــە پانــزەی پوشــپەڕی ١٣٥٨ (شەشــی جــولای ١٩٧٩)دا، کاکــم زەماوەنــدی کــرد. بە هۆی شــەهیدی زۆر و شــەڕ لە ســنە و نەغەدە و هەمــوو ڕووداوەکان، قەناعەت کــرا زەماوەندی زۆر گەورە نەکرێت و بە یەک دوو ڕۆژ شــادی و ناندان و دواتر گواســتنەوەیەکی ســادە

تێیپەڕێنن. سـولەیمان و دەسـتەی هاوڕێیانمان گەرموگوڕیی زۆریان دابوو بەم ئێوارەیەی کاکم دەچووە ناو ژیانی نوێوە. سولەیمان دەوری زۆر چـالاک و برازاوایانـەی گێـڕا بـۆ گەرموگوڕیـی داوەتەکەمان[1]. سیمایەکی شۆڕشگێڕانە درا بە زەماوەند و جۆری میوانەکان. زۆربەی ئەو کوڕە خۆشـنێوانەی شـارەکەمان بە جلی جوانـی کوردانە، ڕیزی چۆپیکێشانیان بە زرمەی قاچ و دروشمی کوردانە، زەماوەندی کاکمیان لە زەماوەندەکانی سـەردەمی شـا جیا دەکردەوە. جەمال موفتی، قادر سـەیاحی، کەریـم بللـوری، مینـە قەڵەو، مەحمـوود کەرکـوژ، مەمەد سـەبزەچی، عەبـوو و فاروق و خوشـکەکانی سـولەیمان هەر هەموو بەشـێک بوون لە ماڵ و کەسـوکاری زاوا. ئوستادی فلوت کاک عەزیز عابد کوڕی پوورم، دوای چەند سـاڵ دیسـان دەسـتی بـۆ فلوتەکەی بـرد و بە تێچریکانی مەقامەکانی جەمـال موفتی و کیژەکەی کافرۆش، بەخوا خۆشـم دەوێ و دەنگی بە سیحری قەرەنییەکەی قادر سەیاحی و سـەمای جوان و نەرمی مینە قەڵەوی خۆشەویسـتی هەموان، شیعر خوێندنـەوەی کاک محەمـەد کەریمیی بێژەر، هەر هەمـووی پڕ بوون لـە بۆنی خۆشەویسـتی و یەکڕەنگی. لـە زەماوەندی کاکـم بە بۆنەی فـەزای سیاسـیی سـابلاغ و ڕۆحی شۆڕشـگێڕیی خەڵـک، فەقیری و دەوڵەمەندی، یان شاباشی زۆری دەوڵەمەندەکان هیچ نرخ و شوێنێکی بـۆ نەکرابـووەوە، بـە پێچەوانەوە، ئـەوەی زۆرتر جێی ڕێـز و چای دووڕەنگ و کورسـی و شـوێنی تایبەتی بوون، دەوڵەمەندەکانی شـار و بنەماڵـە بەفیز و دەعیەکانی شـار نەبوون، بەڵکـو هەموو میوانەکان و لاوەکان وەک یـەک بوون و هـەر هەموو بەدڵ و گیان وەک هاوڕێ و دۆسـتی خوشک و براکانی حەسـەن خۆیان بە بەشێک لە ماڵی زاوا دەزانی. ئەوە دایک و باب و پوور و خاڵ و مام بوون، شـوێنکەوتووی ئێمـەی لاوان بوون، نەک بـە پێچەوانەوە، ئەوە ئەوان بوون گوێیان بۆ دەگرتیـن و ئەوە ئێمە و بە تایبەت سـولەیمان و دەسـتەی هاوڕێیانی

---

١- داوەت بە مانای شایی و زەماوەندە.

بوون بڕیاریان دەدا چۆن و چ بکرێت و کێ بانگهێشت بێ و کێ نەبێ؟!

ســـولەیمان سەرتۆپ و گوڵی مەجلیس بوو، ئەو بە خۆی و هاوڕێ و خوشــک و بـــرا و خزمەکانی شـــادی و خۆشەویســـتیی بـــۆ هەموان هێنابـــوو، لـــە چرکەیەکدا لـــە دە لاوە گوێت لە ناوی ســـولەیمان دەبوو، هەموو بانگیان دەکرد، دەمێک لە سەرچۆپی بوو، چاوتروکانێک دواتر لە گاوانی، ســـەرچۆپیی کز و داماو کردبوو، تێهەڵدەچوویەوە و لەپڕ لە بەژنی هەڵپەڕکێ هەر هەموویانی وەجووڵە و سەما دەخست. ئەو چاوی لـــە هەموان بوو، خزمەتـــی هونەرمەندەکان، پەزیرایی لە پێشـــمەرگەی یەکێتـــی، بردنـــی کچان و شـــەرمێونەکان بۆ ڕیـــزی هەڵپەڕکێ، گاڵتە و جەفەنـــگ لەگـــەڵ دایکی زاوادا، نـــە وەعەرد دەکەوت و نـــە لە حەرەکە دەوەســـتا، ســـمێڵی زەرد و سووری، شەدە و مشـــکیی سپی و ڕەشی، فەقیانەی دەســـتی، پشـــتێندی پەشـــمینەی گرێگرێی، جامانەی سەوز و شین و قاوەیی، هەمووی هەر هەمووی بەیەکەوە، هەر لە خۆی دەهات و هەر لە خۆی جوان بوون. هەر بۆیەش کە شـــەهید کرا تەنیا دایک و بـــاب، خوشـــک و برا، خزم و کەس و هاوڕێکانـــی نەبوون کە دەگریان، هەموو شـــارەکە بەیەکەوە گریان و ئاســـمانیش بە هـــەورە چڵکنەکانی ڕێبەندان، سەری بۆ دەقوڕ نا!

## چیرۆکی یەکەم دڵداری

لـــە زەماوەنـــدی کاکم و لە هەڕەتـــی شۆڕشـــگێڕی و لاوێتیم وەک لاوێکی ٢٠ ساڵان بۆ یەکەم جار بە تێکگیرانی دووچاوی ڕەش و قژکاڵ، خورپـــە کەوتـــە دڵم، دەیان جارم دیبوو، هەرگیـــز وا بە زەقی چاوم لێ نەکردبوو، ئێستاش پێم بە گوناحێکی گەورە بوو، بۆ وا چاوم لێ کرد؟! بۆ پێشی ئەو دڵەکوتەیەم پێ ناگیرێت؟! هەزار جنێوم بە خۆم دا؛ بەسە عەلی وەرەوە سەرخۆ، تۆ هەرگیز وا نەبوویت، تۆ بۆ دڵداری نابێت، تۆ چۆن بەم چاوە سەیری ئەم کچە دەکەیت؟! ئیتر ئەم نیگایە بوو بە سڕ و ڕازێک بۆ چەند ساڵ تەنیا خۆمم پێ دەخواردەوە! لە نێو ئەو حەوشە

و حەشـــیمەتە بەبــێ ئەوەی هیچ چەشــنە ئیجازەیەکم لــێ وەرگرێت و بە دەســت خــۆم بێــت، بیلبیلەکانی چــاوم زۆر بە کزی و شــەرمی و نهێنی گرگر دەچوونەوە سەر هەمان نیگا، ئای کە بێزار بووم لە خۆم، دەمگوت باشە خۆ تۆ دەیان جار قسەت لەگەڵ کردووە و زۆر هێمن و بە ســادەیی تێپەڕیوە و هیچ هەســتێکی وا وروووژێنەرت نەبووە، ئەدی بۆ ئەمڕۆ وا دەکەی و خەریکی ڕۆژەکە لە خۆت تێک دەیت؟! خۆ ئەوە لەگەڵ نەرمینی خوشکم لەو قوژبنە دانیشتووە، بۆ نەرمین دەیناسێت؟! هەرچــی دەمکرد و دەهاتم و دەچووم نیگایەک هەر دەچووەوە بۆ لای ئــەو، هیچ پێم خــۆش نەبوو، لە خۆم بێزار دەبــووم. بەڵام دیار بوو و نەدەشــاردرایەوە ئەم نیگای چاوانە، بێخەبەرانە نقورچێکی وای لە دڵم گرتبوو هەڵیقرچاندبوو.

بە درێژایی ئەم ســێ چوار ســاڵە لە تەورێز و هاوینەکانی ســابلاغ و کــۆلان بە کۆلانی حەزلێکردوویی حوســێن و برایــم لەگەڵیاندا بووم و دەیــان چاوڕەشــی جوانم دیبــوون، ئەوان بە تاریکیی شــەوان و لە پشــت دەرگاوە دەچــوون بــۆ ژوان، نامەیان بۆ کچان فــڕێ دەدا و لە ڕێــی هاتوچۆی مەدرەســەیان لەدوای ســێبەریان دەڕۆیشــتن لە ماڵ بــۆ مەدرەســە و لە مەدرەســەوە بۆ ماڵ دوایان دەکەوتــن بە ئومێدی زەردەخەنەیەک. ئەوان وا بوون و کۆڵیان نەدەدا، شــەوانی هاوین هەر کۆلانە جێژوانی ســێ چوارێکان بوو، حوسێن لەم سەر کۆلان و برایم لەوی تر، کێشکم بۆ دەکێشان و هەرگیز بیرم لە دڵداری و خۆشەویستی نەدەکردەوە، پێم دەگوتن چۆن لە ڕووتان دێ وا خۆتان زەلیل بکەن و بپاڕێنــەوە لەبەریان؟! بــە گاڵتەوە دەیانگوت عەلی جارێ لێی نازانێت و عەقڵی بە شتی وا ناشکێت! غروور و لەخۆڕازی بوون بوو، یان شەرم و پێعەیبە بوون و بێغیرەتی و ترس بوو؟! بۆم نەکرا هەرگیز دڵداری و جێژوان بکەم، هەر کە هەســتم جووڵا و کەوتمە ڕۆژانی لاوێتی، حەزم لــێ بوو گەورەتر بم لــەوەی کە هەم، عاقڵتر، سیاســیتر، دەوڵەمەندتر، کوێخاتــر، هەر هەمووی زیاتــر لەوەی کە بووم، زۆریم لە خۆم دەکرد

زیاتــر بم. بە کورتی هەرگیز ئیجــازەم بە عەلی نەدا وەک خۆی بێت و وەک ئەوەی کە هەیە بڕوانێتە خۆی و چاوەڕوانی لە خۆی هەبێ!

وردەوردە هــاوڕێ و هاوتەمەنەکانــی خــۆم و کــردەوە و عاداتی سروشتی تەمەنی خۆمم بیر دەچووەوە و جێ دەهێشت. هیچ پێویست نەبوو من ژوانکردن و دوای کچان کەوتنم پێ عەیب بێ و بە شایستەی خۆمی نەزانم، هەر لێم حاڵی نەبوو ترســنۆکی و شــەرم بوو یان لەخۆ ڕازی بــوون، ئیجازەی نەدەدا بە پاڕانــەوە و لاواندنەوە بە کیژۆڵەیەک بڵێم خۆشم دەوێت، خاکی بەر پێتم، شێت و شەیداتم، بۆ ماچێکت سوێم دەبێتــەوە و ئامــادە بم تا بەری بەیانی لەبەر شــۆقی کزی دارتێلەکەی بەرماڵیان بێم و بچم و پاکەتە جگەرە بەتاڵ کەم و بە دەیان لاپەڕە ڕەش کەمەوە بە شیعر و پەخشانی درۆی عاشقانە، بوێرم بە سەربانەکەیاندا سەرکەوم و بۆی دە ژوورەکەی باوێم!

**بۆ یەکەم جار گوێم لە دەنگی زەبیحی بوو**

گــەڕی هەڵپەڕکــێ گــەرم بوو، لەنــاکاو بە دەنگی بــەرز نەرمین لە ژوورەوەڕا هــاواری کرد عەلی، عەلــی دەوێ، تەلەفۆن لە ڕێی دوورە، نازانــم چیی گــوت، بە زمانی عێراقی قســە دەکات! بە پەلــە ڕامکرد و گوشــیم لە نەرمین وەرگرت، ئەلۆ کێی؟! خاڵە گیان تۆی؟ قوربانت بم، نامەکە گەیشــت؟ هەر ئەوەم گوت و پەلاماری گوشییان دا لە دەستمی بفڕێنــن، ئــەو دەیگوت بیدە مــن و ئەوی دی گوشــیی دەفڕاند، پڕ بوو لــە خزم و تایفە، لەم فــڕان فڕانەدا وایەری تەلەفۆنیــان پچڕاند، ئەلۆ، ئەلــۆ، دەنگ نەمــا، زۆر تووڕە بووم و هەموویانــم دەرکرد و دەرگای ژوورەکەم داخســت، بە ددان وایرم ڕووت کرد و لێکم بەستنەوە، قرتە قرتێک هات، ئەلۆ؟ ئەوە چی بوو عەلی؟! خاڵم هەر لە پشــت گوشــێکە بوو، وەڵا خاڵە گیان قەومگەل لە خۆشی تۆ گوشییان فڕاند و پساندیان. قســەمان کرد و تێگەیشــتم نامەکەی بە کاک زێڕۆدا ناردم کاری خۆی کــردووە و ئەویــش تەلەفۆنــی کردووە. گوتی دێمــەوە و فلان ڕۆژ بە

خانێدا دەگەمەوە، گوتی ئەوە بۆ وا قەرەباڵغە؟! گوتم، زەماوەندی برای گەورەمانە، زۆری پیرۆزبایی کرد. شـادی لە دایکم بوو بە دوو، دوای سیوسـێ سـاڵ لە دووری، برای گـەورەی خەبەری هـات و مزگێنیی هاتنەوەی بۆ نیشـتمان و باوەشـی خوشـک و برا پەیدا بوو، ڕێک لە ڕۆژی زەماوەندی کوڕی گەورەی.

## گەڕانەوەی زەبیحی

لە مانگی گەلاوێژ و سـەرەتای ئابـی ۱۹۷۹دا چەند ترۆمبێل لەگەڵ خـزم و دۆسـتاندا وەڕێکەوتیـن بۆ لای خانێ، لە سـەر سـنوور زۆر وەسـتاین و چاومان گێڕا هیچ خەبەر نەبوو، وردەوردە درەنگ دەبوو، گەڕاینەوە بۆ سابڵاغ. لە کۆلانی ماڵی باپیرم سەرکەوتین، دیتمان خەڵک و قەرەباڵغـی هەیە، نزیک بووینەوە دایکم و پوور و کەسـوکار هەموو لە حەوشـەکە و لە بەردەرگا ڕاوەستابوون، گوتیان وەڵا خاڵە ڕەحمان خۆی هاتووەتەوە بەردەرگای ماڵی خۆیان، بە پیکابێک و پڕ لە کتێب.

بـۆ یەکەم جـار ئەو خاڵەی هەرگیـز نەمبینیبوو، بەڵام شـەووڕۆژ لـە زمـان دایکـم دەمبیسـت و گوێم لە لاواندنـەوەی دەبـوو بۆ برای دوورەوڵاتـی، لە نزیکەوە بینیم و باوەشـم پێدا کـرد. خەڵکێکی زۆر لە هاتوچـۆدا بـوو، گوتی کاکـە عەلی، خۆم بە ئانقەسـت ڕێگەم گۆڕی و بەم شوێنەدا نەهاتم، کە بە تەلەفۆن پێم گوتی. دوای تەلەفۆنەکە بۆیان باس کـردم خەڵکی کە دەچن بەرەوپیری خەڵکی وەک ئێمە، قەرەباڵغی دروسـت دەکەن و لەسـەر قەلاندۆشـان بە شایی و خۆپێشـاندان، بە چەندیـن سـەعات دەیانبەنەوە ماڵەوە، من ئەو شـتانەم پێ خۆش نییە و زۆر بێـزارم لـە خۆدەرخسـتن، بە باشـم زانی خۆم بە ئەسـپایی و ئارامـی بێمـەوە، پیکابێکم بـە کرێ گرت و هاتین بۆ مەهاباد، ماشـاڵڵا زۆر گـەورە بووەتەوە، بە سـایەقەکەم گوت، دەرمانخانـەی تەهازادە شـارەزای؟ گوتی دەیدۆزمەوە، هاتە بـەر دەرگای دەرمانخانە و ماڵی خۆمانم ناسـییەوە، دایکت و پوورت لە بەردەرگا بوون و ئەوە لێرە لە

خزمەتوودا دانیشـتووم. زۆر زوو دەنگی دایەوە زەبیحی دوای سـی و چەند سـاڵ بۆ خۆی هاتەوە بەردەرگای ماڵی باوکی، ئیتر تا درەنگانی شـەو دەستەدەسـتە پیرەپیاوەکانی ناسـراوی زەمانـی زووی دەهاتن و یەکتریـان لە بـاوەش دەگرت، لاوان و خەڵکی تریـش دەهاتن پێمان دەناسـاند. چوارمشقی لەسەر فەرشەکە دادەنیشـت و دوو سەرینیش پاڵی وێ دەدا، تەپڵەکی جگەرەکەی لە تەنیشـت خۆی دادەنا و بۆ یەک چرکەش جگەرەکەی نەدەکوژاندەوە.

پیاوێکی زۆر ئارام و لەسەرخۆ بوو، زۆر کەمی قسە دەکرد، هەستت دەکرد دائیم لە بیرکردنەوەیەکی قووڵ دایە. بەو هەموو گەنج و چالاک و هاتوچـۆی ئەحـزاب و ئیعلامییە و بەیان و کتێب لە سـەر جادەکان وڕوکاس بووبوو. سولەیمان زۆری خۆش دەویست و ڕۆژانە سەردانی دەکرد، ئەویش بە هاتنی سـولەیمان دڵخۆش دەبوو، پرسیاری ناوبازاڕ و سیاسـەتی ڕۆژی لێ دەپرسـی، مامۆسـتا هێمن و کاک حەمەدەمین سیراجی و ئەدیب و شاعیرانی سابڵاغ بە بەردەوامی سەردانیان دەکرد. خۆی لە سیاسەتی ڕۆژانەی حیزبگەلی حازر لە ناو شار نەدەدا و هەر پێی سـەیر بـوو ئەو هەموو خەڵکـە بۆ هەر هەمووی سیاسـەت دەکا و هەمووشـی وا دەمارگـرژ و بە ئیحسـاس و گەرموگـوڕن. دەیگوت باوکەکـەم؛ خۆ ئێوە موناقەشـە و بەحس ناکەن، ئێوە شـەڕ دەکەن و مسـت ڕادەوەشـێنن! بۆ بە هاتوهاوار و قسەی ناشـیرین لەگەڵ یەکدا دەدوێـن. بەو مـاوە کەمەی کە هاتبـووەوە زۆر باش تێگەیشـتبوو و نیگەران بوو بە هۆی سیاسەت و حیزبایەتی خەریکە قەڵشتێکی گەورە دەکەوێتـە ناو خەڵک و باب و کوڕ، تەنانەت لە یەک ڕاسـت دەبنەوە و برایەک ئەو حیزب و ئەوەی دی حیزبێکی ترە.

## لەگەڵ زەبیحی-دا بەرەو بۆکان و مام جەلال

هاورێیانی یەکێتی دەهاتن و سـەردانی زەبیحییان دەکرد، کاک دلێر زوو زوو هـەواڵ و نامـەی بـۆ دێنا. وەکی تر ڕۆژانـە یەک چەمەدانی گەورە فیشی قامووسەکەی لە تەنیشت خۆی دادەنا و پێیاندا دەچووەوە. کە هاتەوە دوو بەرگی ئەلفوبێی قامووسـی پێ بوو، بە یادگار بەشـی زۆربەمانی دا، گوتی بە زوویی دەچمەوە و بەرگی سـێهەم ئامادەیە بۆ چاپ.

ماڵی خەزووری کاکم دەعوەتیان دابوو، زەبیحی و هەموانیان بانگ کردبـوو بۆ نانـی ئێوارە. من لە ماڵەکەی چاپخانـە بووم، کاک دلێر بە پەلـە هات و گوتی، مامۆسـتا زەبیحی لە کوێیـە؟ گوتم هەموو لە ماڵی خەزووری کاکمن و دەعوەتن. گوتی، دەبێت بچی پێی بڵێی زوو هەستێت و بێ لەگەڵماندا، دەیبەین بۆ بۆکان و مام جەلال هاتووە. گوتم جا بەم شـەوە چۆن دەبێت، بچم هەڵیستێنم، زۆریان پێ ناخۆش دەبێ؟! گوتی عیلاج نییە و داوای کردووە، هەر ئەمشەو و بەیانی لەوێ دەبێت. چووم بـۆ لای لەو ماڵە و هەموو بە دەور لە حەوشـە دانیشـتبوون و نانیان دەخوارد. فەرموو، فەرموو، ئەوە بۆ زووتر نەهاتی؟! گوتم، ناوەڵا ئێوە فەرمـوون من کارم بە خاڵـە. چوومە بن گوێی و گوتم دەبێت بڕۆین، مام جەلال هاتووە. ڕاچڵەکی و گوتی کەی؟! لە کوێیە؟! گوتم نابێ کەس بزانێت و بەبێ ئاگاداری هاتووە. گوێی هەموویان لە لای دەمی من بوو لە سـەر گوێی خاڵم، ئەرێ کاکە ئەوە چ باسە؟! هیچ نییە ئێستا دێمەوە و دەبێ خاڵم تا شوێنێک بەرم. ئەرێ بابم بۆ دەست هەڵناگری و لێمان گەرێ با ئەمشەو لەگەڵ خاڵە بە ئارامی دانیشین. هەموو دەستیان کرد بـە بۆڵەبـۆڵ. گوتم خاڵە دەچم سـەیارەکە دەگـۆڕم و دێمەوە و تۆش چـا و میـوە بخـۆ و ڕێ دەکەوین. کاکـم بانگ کرد و بـۆم باس کرد، پیکابەکەی خۆمان بۆ ئەوە نەدەبوو زەبیحیی پێ بەرم بۆ بۆکان. کاکم گوتی وەرە. چووین بۆ لای برادەرێکی خۆی و پیکابەکەی خۆمانی پێ دا، پیژۆیەکی جوانی تازەی هەبوو لێی وەرگرت و دایە دەستم.

### هەتیوە کۆمۆنیستە بۆ لێمان ناگەڕێی ئاسوودە بین

خاڵــم دەبــوو بچێتەوە ماڵ و خــۆی بگۆڕێت، لە بــەردەرگای ماڵی باپیــرم ڕامگرت و خاڵم چووە ســەر و مــن و کاک دلێر لە بەردەرگاکە چاوەڕێمان کرد، من چواردەخۆرێکم پێ بوو، خاڵە محەمەدم کە پیاوێکی ســۆفی و زۆر بێدەنگ بوو، لەناکاو لە تاریکیی پاشــخانەکە دەرکەوت، گوتی ئەوە چ باســە عەلی؟ بەو نیوەشەوە بۆ لێرەی؟! گوتم خاڵە گیان، خاڵە ڕەحمان ســەفەرێکی بچووکی هەیــە دەیگەیەنم. هەر ئەوەم گوت و پەلاماری دەمانچەکەی دام لە بن پشــتێندەکەم، دەنگی بەرز کردەوە و دەمانچەی بەرامبەرم ڕاگرت و گوتی: «هەتیوە کۆمۆنیستە بۆ لێمان ناگەڕێی ئاســوودە بین. دوو ڕۆژە کاکم دەســت کەوتووەتەوە، بۆ لێی ناگەڕێی»؟! گوتم خاڵە گیان بۆ وا دەڵێی من هیچکارە نیم و لە خزمەت ئەودا دەڕۆم. بوو بە دەنگبەرزکردنەوە و دەستلەرزینی خاڵە محەمەدم بە دەمانچەوە. گوتم خاڵە تکایە لەسەر پێیە، وریا بە دەردەچێت، بیدەوە بە من. کاک دلێر ویســتی تەداخول بکات، خاڵــە ڕەحمان لە پلیکانەکان هاتە خوار و زۆر بە گرژی گوتی، محەمەد ئەوە چییە؟! ئەو دەمانچەیە دانــێ، بــە تۆ چی؟ خۆ من منداڵ نیم و تا ئێســتا کەس کوێخام نەبووە. خاڵە محەمەد دەســتی کرد بە قسان؛ کاکە گیان وەدوای منداڵەورتکە و کۆمۆنیســتان مەکەوە، ئەوانە ســەرت بە فەتەڕات دەدەن و ئەم قسانە. ئیتر خاڵە ڕەحمان بە توندی بە سەریدا گوڕاند و دەمانچەی لە دەستی ستاند و دایەوە بە من و گوتی با بڕۆین.

خاڵــم زۆر تێکچووبــوو، هەر لە بن خۆیەوە قســەی دەکرد و وەک شتێک بێزار بوو لەم تەداخولەی برای بچووکی، کە زیاتر لە سی ساڵ بوو هیچ لێی نەپرسیبوو. یەک دوو جار منی دواند و دڵخۆشیی دامەوە. بەڕاستی من زۆر پەشۆکاو بووم و ماشێنەکەشم لێدەخوڕی و زۆریش جــادە تاریــک بوو. هەر قســەی لەگەڵــدا دەکردم و دەیویســت خەیاڵم نەڕوات و ئاگام لە جادە بێت. لەگەڵ کاک دلێردا دەستیان بە قسە کرد

و باسوخواستی مام جەلالی لێ پرسی، ویستی مەوزووعەکەمان لە بیر بچێتەوە، ئیتر بە قسە و بیرەوەریگێڕانەوە ئارامی کردینەوە.

لەگەڵ خاڵم و کاک دلێردا سێقوڵی بە جادەی میاندواودا چووین بۆ بۆکان و شەو درەنگ بووبوو. گەیشتینە ماڵی کاک سەلاح موهتەدی، چەند پێشمەرگە لە بەردەرگا بوون، وەژوور کەوتین، هەموو بەرەوپیری زەبیحی هاتن و لەگەڵ مام جەلالدا یەکتریان لە باوەش گرت، کاک سەلاح و کاک سەعد و کۆمەڵێک خەڵکی دی لەوێ بوون، پەزیرایی چا و میوە کراین و خاڵم و مام جەلال چوون بۆ ژوورێکی تر و ئێمەش لە دیوەخانی ماڵی کاک سەلاح تا بەری بەیان بە دیشلەمە و جگەرەکێشان و قسەوباسی ئەو ماڵە پڕ لە سیاسەت و ناوەندە، شەومان لێ ڕۆژ بووەوە.

بۆ بەیانی، هەموو لە ماڵی کاک سەعد میوانی کرابوون و سفرەی شاهانە لە بەردەمیان داندرابوو، مام زوو زوو بە زەبیحیی دەگوت، مامۆستا ئەوە بخۆ، ئەوە زۆر خۆشە، ئەوە بۆ ناخۆیت؟! زەبیحی گوتی، مام جەلال کایەکە ئی خۆم نییە، بەس کادێن ئی خۆمە. من ئاگام لە سیحەتی خۆمە، کارت پێم نەبێ و بۆ خۆت بخۆ! زەبیحی لە خواردن و خواردنەوە زۆر لەسەرخۆ بوو. زۆر کەمی دەخوارد، لەسەر نانخواردن جگەرەکەی نەدەکوژاندەوە و زوو دەکشاوە، ڕۆژانە دەبوو هەمیشە دیشلەمەی لە پێش بێ، زۆر گوێی نەدەدا بەوەی خواردنی شاز و نایاب بخوات.

دوانیوەڕۆ هاتینەوە بۆ مەهاباد و لە ڕێگە پێی گوتم؛ گەیشتینەوە بچۆ بۆ لای مامۆستا شێخ عیزەدین، سەلامی منی لێ بکە و عەرزی بکە خاڵم دێت بۆ لات. کەی باشە؟! یەکەم جار بوو بڵێ دەچم بۆ دیداری مامۆستا. پێشتر نە مامۆستا هاتبوو و نە خاڵم چووبوو بۆ لای!

# ١١

وڵات زۆر شڵەژا بوو، لەملاوئەولا دەنگی هەڵایسانی شەڕ دەهات، چەند جارێک هەوڵ درا کورد و تاران ڕێک بکەون، سەری نەدەگرت، تەنانەت مامۆستا شێخ عێزەدین لەگەڵ کۆمەڵێک مەلا و کەسایەتی چوون بۆ تاران و خومەینییان دیت. ئەوان، مەلاکانی تاران لە بنەڕەتەوە بڕوایان بە کێشەی نەتەوەیی نەبوو، دەیانگوت ئەوەی بۆ چییە و هەمووومان وەک یەک ئۆمەتی ئیسلامین، دیاریش بوو درۆیان دەکرد، ئەگینا گەر جیاوازیمان نییە بۆ دوو سوونی، یان کورد لە دەسەڵاتی تاران جێ ناکەنەوە و بەروبووم و دەسەڵاتەکان وەک یەک دابەش ناکرێن؟! هەڵبەت ئەمە ئێستاش وایە کێشەکە عەزەمەتخوازی فارسەکانە و هەر هەموویان کە دێتە سەر مافی نەتەوەکان و بە تایبەت کێشەی کورد، بڕوبیانوویەکی هیچوپووچی لەم چەشنە دێننەوە، کوردی پێ سەرکوت بکەن و ئیجازە نەدەن کورد و نەتەوەکانی دی بە مافە سیاسی و کولتوورییەکانی خۆیان بگەن لە ترسی ئەوەی ئێرانەکەیان لێ دابەش دەکرێت. مێژووی ئەم سەد ساڵە نیشانی دا بە چەپ و ڕاست، بە ئیسلام و کۆمۆنیست و لیبراڵی ئێرانی، ناسیۆنالیزمێکی زۆر بە هێزی شۆڤێنییانە بەرۆکی گرتوون و پێی گرفتارن. تەنانەت ئەوەندە دەمارگرژن، هەرگیز ئیجازەیان نەدا تاقە مزگەوتێکی کوردەکان یان سوونی لە تاران بێتە چێکردن، کەچی باسی هەمەلایەنەبوونی ئیسلام و یەک ئۆمەتی دەکەن، بەڵام ئەگەر بڕۆن و سەیر بکەن لە زۆربەی پایتەختەکانی جیهانی مەسیحی بە دەیان مزگەوتی شیعە و سوونی هەیە، هەرچەندە ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر بنەماکانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ لە وڵاتانی پێشکەوتوو، نەک تەنیا هێمنایەتی و کراوەیی دنیای مەسیحییەت!

تاران و حکومەتی تازە بە ڕێبەریی خومەینی، ساغ بوون و بڕیاریان دابوو هیچ بۆ کورد نەکەن و وڵات تووشی شەڕێکیماڵوێرانکەر بکەن. لە سایەی ئەم شەڕە، دەمی خەڵکی ئێرانی پێ داخەن و ئیجازە بە میللەتی ئێرانیش نەدەن بە بیانووی تەجزیە و کوفار و ئەم بڕوبیانوانە، ئەو داواکارییانەی پێش شۆڕش لە شایان هەبوو، وەک ئازادی، خۆشگوزەرانی، عەدالەت، یەکسانی و هەموو مافەکانی تریان، لە مەلایانیشی بکەن. شەڕ باشترین هۆکار و بیانوو بوو بۆ دەمکوت و سەرکوتی کۆمەڵانی خەڵک، هەر واشیان کرد.

### ئیتر جەللاد هات

کابرایەکی جەللادی وەک مستەفا چەمران، خەبیر و پسپۆڕی شەڕی چریکی و خاوەنی ئەزموونێکی زۆر لە ڕێکخراوی ئەمەلی لوبنانی، کرا بە وەزیری بەرگری و بەرپرسی ڕاستەوخۆی شەڕەکانی ورمێ و پاوە. چەمران لە لایەن شەخسی خومەینییەوە ڕاسپێردرابوو هەر چۆنێکی بۆی دەکرێت کێشەی کورد سەرکوت بکات و ڕەحم بە کەس نەکات. ئەو توانیی سوپای پاسداری تازەدروستکراو ڕێک بخات و دەورەی سەربازییان بدات، ئەرتەش و پاسداری بەیەکەوە بەکارهێنا. ئەو بوو فانتۆم و شکانی دیواری سەوتی[1] بەکارهێنا و هێلیکۆپتەری بۆ دابەزینی هێز لە ناوچەرگەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە بەکارهێنا، وەک لە شەهید بوونی کاک فوئاد مستەفا سوڵتانی کردی و کەس چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد لە سەر ڕێی کاک فوئاد لە گەڕانەوەی لە مەریوانەوە بۆ بانە ئەو هێزەی پاسدار لەم شوێنە بن، یان لە ئەربابای بانە لەناکاو ئەم هێزە دابەزێت. چەمران لە سەرکوتی خەڵکی پاوە لە

١ - دیواری سەوتی، کاتێک خێرایی جووڵێنەرێک لە سەر عەرز یان هەوا لە خێرایی دەنگ (صوت) تێپەڕێت، دەنگێکی گوێکەڕکەری لێ بەرز دەبێتەوە و دەبێتە هۆکاری ترس و تۆقان. فانتۆم و تەیارە شەڕکەرەکان بۆ تۆقانی خەڵک ئەم کارەیان دەکرد.

هاوینی ساڵی ١٩٧٩ و بەدوای ئەوەدا، فەرمانی مێژوویی خومەینی لە بیستوهەشتی گەلاوێژی هەمان ساڵ، واتا فەتوای «جیهاد» و بە «کوفار» ناوبردنی خەڵکی کورد دەوری سەرەکی و شەیتانی گێڕا.

### بەهاری کورتی شۆڕش

بە دەسپێکی شەڕی پاوە و مەریوان و فەتوای ئیمام خومەینی بۆ جیهاد دژی «کوردی کافر» بە فەرماندەیی ڕاستەوخۆ و بەشداریی خودی چەمڕان لە شەڕەکان، میللەتی ئێران و بە تایبەت کورد، ئەنگوستی پەشیمانیی خۆیان گەست بۆ هاتنەسەرکاری مەلای «شۆڕشگێڕ» و گرتنەدەستی حوکم لە ئێران.

بەدوای شادا بەهاری کورد و هەموو ئێرانیش زۆر کورت و تەنیا شەش مانگی خایاند. کورد جارێکی دی لە ڕۆژهەڵات لە لایان کاربەدەستانی تاران حاشا لە بوونی کرا و دیسان پەنای بردەوە بەر شاخەکان.

لە ماوەیەکی کورتدا زۆربەی شارە کوردییەکان کەوتنە بەر پەلاماری مەغۆلئاسای لاتولووت و سەرسەری و خەڵکی بێکار و «موستەزعەف» لەژێر ناوی ڕێکخراوی تازەپێکهاتووی میلیشیای تایبەت بە مەلای شیعە، «سوپای پاسدارانی جمهووریی ئیسلامی ئێران».

### دروستکردنی سوپای پاسداران

سوپای پاسداران هێزێکی چەکداریی جەنگی بوو، هەر دوابەدوای هاتنەسەرکاری خومەینی، ئاخوندەکان دروستیان کرد و لە ترسی ئەرتەش، پشتیوانیی گەورەیان لێ کرد. ئاخوندەکان متمانەیان بە ئەرتەشی شا نەبوو، کە وەک خۆی مابوو، تەنیا لە سەرەتای شۆڕشدا چەند فەرماندەیەکیان لێ ئێعدام کردبوون و بەشێکیشیان هەڵاتبوون بۆ دەرەوەی وڵات. خومەینی سوپای پاسدارانی لەژێر ناوی پاراستنی

دەستکەوتەکانی شـۆڕش دروست کرد، ئەو دەزگایەکی سەرکوتکەری دەویسـت کـە متمانەی پێ بـکات و هەمـوو فەرمـان و کردەوەیەکی نامرۆڤانـەی پـێ بـکات، بۆیە هەموو ئـەو خەڵکانەی لـەم دەزگایە کۆ کـردەوە، کـە هیچ پرنسـیپێکی ئەخلاقی، ئینسـانی و شارسـتانییان لە بـاردا نەبـوو، چونکە لـە لایـەن ئاخوندەکانەوە گرنگییان پـێ درابوو، بـۆ یەکـەم جار دەسـەڵاتێک پەیدا بـووە دەیانخوێنێتـەوە و بە زمانی ئەوانیش دەدوێت، ئەوان ئامادە بوون کۆیلە و گوێلەمستیان بن و وەک دەزگایەکی بێموراڵ و ویژدان، لەژێر ناوی ئیسـلامدا، دەسـت بکەن بە جێبەجێکردنی ئەوەی پێی دەڵێن، کردەوەی وەحشی و قێزەون.

سـابلاغ و ماڵی ئێمە پڕ بوو لە سـەرانی یەکێتی، هێزی ئاسـمانیی ئەرتەش دوای ڕووداوەکانی پاوە و مەریوان تەواو چالاک بووبووەوە، هەر تاوناتاوێک دەهاتنە سـەر ئاسمانی شارەکە و لە دوورەوە لە ڕێی ڕەزاییـە و میانـدواو دەنگی کۆپتەر دەهات، خەڵک تـەواو ورووژابوو، زۆر بـوون ئەوانـەی شـاریان چۆڵ دەکـرد و دەچوون بـۆ لادێکان، هەبوون دەچوون بۆ شـارەکانی ئێران، بە پێچەوانەوە هەبوون خەڵکی چەپ و سەر بە ڕێکخراوە مارکسییەکان لە شارەکانی ئێرانەوە دەهاتن بۆ مەهاباد. ماڵی ئێمە چەند کچ و کوڕی مەشـهەد و تاران و تەورێزی سەر بەم ڕێکخراوانەی لێ بوو. کەس ئەجێندایەکی ڕوونی نەبوو، بەس دەیانزانی بکەونە دەست پاسدار و حاکمی شەرعیی خومەینی، ڕەحم بە کەس ناکەن و لە کەمتر لە چەند خولەکێک حوکمی ئیعدامیان بۆ دێتەوە و دەستبەجێ دەیانکوژن.

**چمان بەسەر دێ؟**

ئێسـتا کە دانیشـتووم و ئـەم دێڕانە دەنووسـم و ناو حەوشـە و ژوور و ناوماڵـی خۆمـان و هەڵسـوڕانی دایکـم و نەرمینی خوشـکم دەێتەوە پێشـچاو، دەڵێم و لە خۆم دەپرسـم تۆ بڵێی دایکی نیشـتمان لێمـان ڕازی بووبێـت؟! بەیانییەکم لە بیرە لەناکاو ماڵ پڕ بوو، ژووری

گەورەی میوانان ڕیزاوڕیز دانیشــتبوون، یەک چای دێنا و یەک پیاڵەی بەتاڵی دەبرد و پڕی دەکردەوە، ســەرم بە مەتبەخدا گرت، دایکم لەبەر تەباخەکە زیاتر لە نەوەد هێلکەی شکاندبوو، تاوە بە تاوە بەتاڵی دەکرد و یەکی بۆ ژووره بچووکەکە و یەکی بۆ حەوشــە دەنارد. یەک قاپشی پســابوو، یەک دەرزی و دەزووی دەویست و یەک کۆڵەپشتی تێداخنی و یەک پڕ بە ژوورەکە فیشەکی ڕۆ کردبوو و مەخزەنی پڕ دەکرد. سێ ســەیارە لەناو حەوشــە بوو، چەند دانە لە کۆڵان بــوون، یەک بەدوای یەکدا جیرانەکان دەهاتن و دەیانپرسی چی دەبێ و چمان بەسەر دێ؟! پێیان وا بوو ئەوە هەموو ســەرکردە و مامۆســتا زەبیحی لە ژوورەوە دانیشــتوون، ئاگاداری هەموو شــتێکن و ئەوە ئەوانن دیاریی دەکەن چ بکرێت! ماڵی مامۆســتا شــێخ عێزەدین زۆر لێمــان نزیک بوو، هەردەم یــەک بەڕێوە بوو لەناو ئەو دوو ماڵە، بەردەرکی ماڵی وانیش بە دەیان چەکدار و خەڵکی لێ ڕاوەســتابوون، یەک لە یەکی دەپرســی مامۆستا شــار چۆڵ دەکات؟ پێشــمەرگە و دێموکرات دەڕۆن؟ بزانن جەمعییەت چ دەکەن و دەیان پرســیار. دەســتەیەک پێشــمەرگە و چەند بەرپرسی باڵای یەکێتی لە ماڵی ئێمە بوون و بەتەما بوون زەبیحی بەرن و بڕۆن؛ مامۆســتا شــێخ عێزەدین چەند جاری نارد بۆ لای خاڵم تاوەکو بزانێت چی بکەن و قەراری چی بدەن؟!

لــەم جەنجاڵییــەدا کاک دلێر، کــە زەبیحی جێ نەدەهێشــت و هەر لــەوێ بوو لەگەڵ کاک عومەر شــێخمووس و دوکتــۆر کەمال فوئاد و ئازاد هەورامی و چەندی دیکە بۆ ئەوەی بزانن چی دەکەن، هات گوتی، دەبێ چاپخانەکەش بەرین! پێم ســەیر بوو قەرار بوو هەر بە نهێنی لە شــار جێی هێڵین و کاک حەمەســەعید خۆی بە دیاریەوە کاری لەسەر بــکات. گوتی، ناکرێت و کۆمەڵەی ڕەنجدەران پێی باشــە بینێرینەوە بۆ ناوزەنگ. ئیشوکار کەم بوو ئەوەشی هاتە سەر.

چاپخانە بار کرا و لەگەڵ کاک حەمەسەعید و یەک دوو کەسی دیکە، بردیان بۆ نێشکۆڵان و لەوێشەوە بە باری ئێستران بردبوویانە ناوزەنگ.

دوو هاوڕێکەی ئەشرەف دێهقان هاتبوونەوە و دوای هاتنی یەکەمجاریان لەگەڵ ئەشرەفدا، زۆر تێکەڵاوی ماڵی ئێمە و سولەیمان بووبوون، حەمید و سیروس دوو کوڕی زۆر ئازا و خوێنگەرم و بەوەفا بوون. لە تارانەوە لەندرۆڤێرێکی جوانیان هێنابوو بۆمان. ئەمە باو بوو لە شارەکان دەچووین سەیارەی دەوڵەتیمان دێنا، پێمان دەگوت «مصادرە»مان کردووە بۆ شۆڕش!

### هاتنی کاک فوئاد

بە ئاگادارکردنەوەیان لە شەڕی جادەی میاندواو و شکانی دەنگی فانتۆمەکان، بڕیاریان دا مامۆستا شێخ عێزەدین لە شار بچێتە دەر و بۆ لای سەردەشت و مەقەڕەکانی یەکێتی بڕۆن. برادەرانی یەکێتی هەر هەمووی زەبیحییان برد و ڕۆیشتن. لەناکاو ماڵەکە چۆڵ بوو و تەنیا چەند فارسێک مابوون، چاوەڕێی هەڤاڵانیان بوون بزانن بەرەو کوێ بڕۆن و لە کوردستاندا لەگەڵ کام هێزی کوردی بکەون، دیار بوو هەموویان چەپ بوون و تەبیعی دەبوو ڕوو لە جەمعییەت و کۆمەڵە بکەن. خەبەرمان بوو ئەوێش بە سەدان کەسی تێدایە لە ئەنواعی گرووپی مارکسیستی و کۆمۆنیستی دژەسۆڤییەت. هێزی سەرەکی و دیار زۆرتر هاوڕێیانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بوون، کە تا ئەو کاتیش هێشتا بە تەواوی خۆیان نەدەناساند و خەڵک تەنیا دوو سێ لاپەڕەی بەیاننامەکانی لێ دیبوون. هەڵبەت چەند ڕۆژ پێشتر بۆ یەکەم جار کاک فوئاد مستەفا سوڵتانی وەک ڕێبەری ناسراوی کۆمەڵە هات بۆ جەمعییەتی مەهاباد و بۆ چەند سەعات قسەی بۆ کردین، وەڵام و پرسیاری زۆر کرا، ڕووداوەکانی مەریوان و یەکێتیی جوتیاران و خواستی کۆنترۆڵی مەریوان لە لایەن سوپای پاسداران کە مەقەڕیان کردبووەوە لە مەریوان، بە یارمەتیی قیادە موەقەت و مەکتەبی قورئانی ئەحمەد موفتیزادە و جاشەکان، باسی گەرموگوڕ بوون. کاک فوئاد بە ئاشکرا دەیگوت، دەبێت خۆ

ئامادە بکەین بۆ بەرگری. ئەم هاتنە و قسەکانی ئەو ڕۆژی کاک فوئاد لە جەمعییەتی مەهاباد زۆریک لەم خەڵکانەی ناو جەمعییەتی ساغ کردەوە لەگەڵ کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بکەون. شەو کاک فوئاد لەگەڵ هەباسی برام هاتەوە بۆ ماڵ، پیاوێکی خۆمانی و دڵسۆز و زۆر متەوازع و لەخۆبردوو، سەرکردەیەکی مەیدانی و ئازا، زۆر زوو لەگەڵ هەموو ئەندامانی ماڵەوە بە تایبەت دایکم کەوتە قسە و بەو ماوە کورتە زۆر لەبەر دڵانمان دیت، وەک ئەوە وا بوو چەندین ساڵە یەک دەناسین و ئێستاش دایکم ئەم دیدارە کورتەی لە بیر ناچێت.

**پیکابەکەی یەکێتی**

پەیکار، ڕەزمەندەگان، ئەشرەف، ئیتحادییەی کۆمۆنیستی، وەحدەتی کۆمۆنیستی، و... سازمان گەلێک بوون هەمووی لە دەوری جەمعییەت لە جادەی پشتقەڵا لە ناو جەنگەڵی مەسنووعی لە هاتوچۆ و خۆتەیارکردندا بوون. شار چۆڵکردن و نەکردن، شەڕکردن و شەڕنەکردن و کام هێز لەگەڵ کام هێزدا بڕوات و نەڕوات، باس و گفتوگۆیان بە گەرمی و بەرزی و تینی فانتۆمەکانی ئاسمان بوون. کێشەکە ئەوە بوو کەس گەورەیان نەبوو، هەر هەموو خۆی گەورە بوو! چریکە فیدائییەکانی خەڵق خۆیان مەقەڕیان بوو و جیاواز بوون لە قەرار و نەزم و دسپلیندا و دەیانزانی چ دەکەن و لە تارانەوە هەموو فەرمان و ڕێوشوێنیان بۆ دەهات.

کاک دلێر گوتی:

ئەم پیکابەی یەکێتی چی لێ بکەین؟

گوتم: کوڕەکانی ئەشرەف لەندڕۆڤێرکی تازەیان بۆ هێناوین، گەر پێت باش بێ پیکابەکە دایک و بابی هەیە و قانوونییە و سەنەوەی و هەموو شتی لای منە، دەڵێی چی بچم هەوڵ بدەم بیفرۆشم؟!

- دەکرێ لەم ڕۆژەدا؟

- دەچم هەوڵێک دەدەم. چووم بۆ سەرجادە و ڕووم لە مەیدانی

ئاسنگەران کرد و گوێم قولاغ کردبوو لە خەڵک، کابرایەکی نەجار هاتە پێش و گوتی:

- ئەم پیکابە ئی خۆتە؟

- بەڵێ ئی خۆمە.

- دەیفرۆشی؟!

- گـەر پارەی چاک بدەی و هـەوڵ نەدەی بەم ڕۆژە بە هەرزان لە دەستمی دەرهێنی، پێک دێین!

- بەخـوا تەماحـم نییـە و تـۆش دەناسـم کاکە عەلی گیـان، ئێوە بـۆ فێڵلێکردن نابن، ئێمـە دەبێ خزمەتی ئێوە بکەیـن، وەک چۆن ئێوە خزمەتی میللەت دەکەن.

تـەواو عەتفی جوولاندم و گوتم پێک دێین، کەسـێک یان شـوێنێک بدۆزەوە بۆت ئیمزا کەم، دەبێ بڕۆم و شـار چۆڵ دەکەین، پێشـمەرگە چاوەڕێمە. چوو برادەری نووسـینگەیەکی هێنا و بە بیسـتویەک هەزار تمەن پیکابم دایە دەست و سەنەویەکەم بۆ ئیمزا کرد. کاک دلێر باوەڕی نەدەکرد لەم ڕۆژەدا بەم سـیعرە پیکابەکە کرابێتەوە پارە. ئێستا دوای ئـەو هەموو سـاڵە دەزانم ئەمە زیرەکی و شانسـی مـن نەبوو، بەڵکو نێوچـاوان و ئیقبالـی کاک دلێـر بوو، ئەوە نییە سـەروەت و سـامانی یەکێتی لە هیچەوە گەیاندە ئاستی دەوڵەمەندیی وڵاتان!

### مەلا بەختیار و فێربوونی شۆفێری

یـەک دوو ڕۆژ لە فەرمانی جیهـادی خومەینی گوزەرابوو، مەهاباد هێشـتا نەگیرابـوو، لەگەڵ کاک دلێردا بـە لەندرۆڤێرکە وەڕێکەوتین بۆ بانـە، گەیشـتین و گوتیـان هەموو لە ماڵی شـێخ جەلالـن. مام جەلال، مامۆستا شێخ عیزەدین، زەبیحی، کاک فوئاد و هەموو سەرانی کۆمەڵە و پێشمەرگەیەکی زۆری یەکێتی. مەلا بەختیار لە مەریوانەوە بە هێزێکەوە هاتبـوو بۆ بانـە. لەگەڵ کاک دلێردا لە بۆیەنی دەرەوەی بانە تووشـی مەلا بەختیار بووین، هاتە ناو سـەیارەکە و گوتی با من لێیخوڕم. هاتە

پشــت ســوكانەكە و لە جادەی بەرەو بانە چەند كيلۆمەترێک ڕۆيشتين. لەگەڵ كاک دلێردا ڕۆحمان هاتە سەر كونی لووتمان، كەچی ئەو زۆری پــێ خوش بوو، ســوكانی بۆ ڕاســت نەدەگيرا و چەندجــار كوژايەوە، چەند خولەكێكی لێخوڕی، نزيک شار بووينەوە و قەرەباڵغيی سەرجادە زۆر بــوو، ئيتر ســەيارەكەی دامــەوە و چووينەوە ماڵی شــێخ جەلال. خەبەر هاتبوو لە مەريوان خەڵخاڵی كۆمەڵێک ڕۆشــنبير و خەڵكی زۆر خۆشەويســتی شــاری ئيعدام كردوون، دوو برای كاک فوئاد مســتەفا ســوڵتانی كــە خۆی لەو كاتەدا لە بانە بوو، لە نــاو ئيعدامەكاندان. كاک حوسێن و ئەمين مستەفا سوڵتانی لە مەريوان، لەگەڵ ٩ كەسدا يەكجێ بە ئەمری خەڵخاڵی ئيعدام كرابوون. كاک فوئاديان لەگەڵ مامۆستا برايم جەلال، كە پێشــتر هەر لە ناوزەنگ و مەهابادەوە دەمناســی و خاوەنی دوو برای شــەهيد بوو لە ناو يەكێتی، لەگەڵ ســێ چوار پێشــمەرگەی دەستەكەی ناردەوە بۆ مەريوان بۆ خەبەری براكانی.

خاڵــم هاتــە دەرەوە، مــن و كاک دلێــری لە حەوشــە ديــت زۆری پــێ خۆش بوو، گوتی ســەيارەت پێيــە؟ گوتم بەڵێ. گوتــی دەچين بۆ سەردەشــت. لەگەڵ مام جەلالدا هاتنە ناو ســەيارەكە و چەند ســەيارە و پێشــمەرگەيەكی زۆر بەدواماننــدا، ڕێمان گرت بەرەو سەردەشــت و لەوێشڕا بۆ بەردەپان. پاسگايەكی كۆنی زەمانی شای لێ بوو.

لــە بەردەپــان مام جەلال و خاڵم لە پشــت قەلاكــە نانيان دەخوارد، چەنــد ســەيارەی حيزبــی دێموكــرات گەيشــتن، دوكتــۆر قاســملوو، مامەغەنی بللوريان، حەمەدەمين ســيراجی و چەند كەســی ديكە بوون. ئيتر زانيمان سابڵاغ بە تەواوی چۆڵ كراوە و گيراوەتەوە و بەرگريی لە شار نەكراوە. تەنيا لە ڕێی مياندواو و ڕەزائييە چەند پێكدادانێک لەگەڵ پێشــمەرگەی تازە و خۆبەخش و ناتەكووزيی[1] مەشــق پێ نەكراو، كە زۆربەيان لاو و گەنجی بەئيحساسی چەكبەدەستی شاری بوون ڕووی داوە. خەڵكێكــی زۆری مەهابــاد ڕووی لە سەردەشــت كردبوو. خەڵک

١- تەكووز، ڕێكوپێک، لەبار و بێ كەمايەسی، بەنەزم و تەرتيب، ديسپلين.

زۆر لە دەنگی فانتۆم و شـکانی شووشــە پەنجەرە و فڕەفڕی کۆپتەر ترسابوون.

هەر لە بەردەپان، زەبیحی کە خۆی بە جەماعەتی دێموکرات نیشان نـەدا، بەڕێیـان کردە سەرسـنوور و بۆ سـەفەرێکی کـورت بۆ بەغدا گەڕایەوە، کاک زێڕۆ تا قەڵادزێی برد.

# ١٢

## کەمپی گۆڕەمەڕ

بـە تەنیا بـەرەوە سەردەشـت چوومـەوە، ئێوارە بـوو، یەک دوو ڕۆژێک لەو ناوە بووم، چوومەوە گۆڕەمەڕ و میراوا و تەنگەی گرژاڵی. زووتر لە مانگەکانی هەوەڵی هاوین بە هۆی هاوڕێیانی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بۆ سەردان چووبووم بۆ کەمپی مەشق و ڕاهێنانی کادری نیزامی لە گۆڕەمەڕ.

لە جادەی سەردەشـت-خانێ لە پشـت میراوا، شـوێنێکی چڕی پڕ لـە دار و جەنگەڵی لێ بوو، گۆڕەمەڕیـان پێ دەگوت، کۆمەڵە کەمپێکی کردبـووەوە بـۆ ئەندامانـی خـۆی و دەورەی نیزامی. مـن پەیوەندیی حیزبیم نەبوو لەگەڵ کۆمەڵەدا، بەڵام بە هۆی یەکێتییەوە چەند کەسێکم لێیـان دەناسـی. یەکەم کەس کە بـۆ یەکەم جار بەیەکەوە هاوسـەفەر بوویـن لە ناوزەنگـەوە دوکتۆر عەزیز یان جەعفەر شـەفیعی بوو. من جارێکیان دەهاتمـەوە لە ناوزەنگ، گوتیان دوکتۆریش هاوڕێیەتیی بکە و تـا بۆکانـی لەگەڵدا بچووەوە. هەر وامان کـرد و هەرگیز هاوڕێیەتی ئەم پیاوە خوێنگەرم و متەوازعەم بیر ناچێتەوە. زانیم لە سەرکردەکانی کۆمەڵەیە و ماوەیەک بۆ یارمەتیی پزیشـکیی دوای کارەساتی هەکاری چووەتە قەندیل و لەناو پێشـمەرگەی یەکێتیدا بووە، لەگەڵ کاک سـاعد وەتەندوسـتدا کـە لە شـاخ پێیان دەگوت، مامۆسـتا برایـم. قەرار بوو کاک خانـەی موعینییـش هـەر بچێتـە لای وان، کەچی لە ڕێ شـەهید بوو. پێشـتریش باسـم کرد کاک عەبدوڵڵای موهتەدی و بابانم ناسـی، لـە وەرگرتنـی دەزگای چاپ بـۆ کۆمەڵەی ڕەنجـدەران. نازانم بۆ چی بـوو چەند ڕۆژێک لە هاوین ڕێم لەم کەمپەی کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕ لە گۆڕەمەڕ کەوت و چاوم بە کۆمەڵێک دۆسـت و هاوشاری خۆم کەوت

و زانیم ئەوانە پەیوەندیی حیزبیان هەیە لەگەڵ کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕدا، کـە ئەوکات ناوی خۆیان ئاشـکرا نەکردبوو. سـمایل پایەندە دواتر لە نـاو کۆمەڵەدا بوو بـە کاک ڕزگار و فەرماندەی نیزامی، داود خورەمی کە دواتر لە زیندانی مەهاباد خۆی سـووتاند، سـەید ڕەحمان، مامۆستا حوسێن، سولەیمان ڕەحیمی کە وەک فەرماندەیەکی زۆر ئازای کۆمەڵە لە شەڕی دێموکرات و کۆمەڵەدا شەهید بوو، خدرە سوور کە فەرماندەی کۆمەڵە بوو لە ناوچەی ڕەبەت و دواتر چوو بۆ ناو حیزبی دێموکرات و وەک فەرماندەیەکی ئازا لە هێزی پێشەوا شەهید بوو، جەمال خۆمپارە لە کوڕەکانی سنە بوو و چەند کەسی دی، بەم چەند ڕۆژە لە گۆڕەمەڕ ناسـیمن، دوو جوامێری خوزسـتانی کە لە فەلەستینەوە هاتبوونەوە و ئەندامی ڕێکخراوی «گرووپی وەحدەتی کۆمۆنیسـتی» بوون، چەندین ساڵ لە زەمانی شا لە فەرماندەکانی فەلەستین بوون، ئێستا هاتبوون و یارمەتیی پەروەردەی نیزامیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕیان دەکرد، فەریدون و ئەبـوو شـاهین. زووتـر لـە کاتی هاویـندا یەک دوو جـار ئەم دوو فەرماندەیەم هێنابوو بۆ مەهاباد و لەگەڵ ماڵەوەماندا لە نزیکەوە ئاشنا بووبوون. سولەیمان زۆر لەگەڵیاندا نزیک بووبووەوە و هاتوچۆی ماڵی سولەیمانیشیان دەکرد.

### فەرماندە فەلەستینییەکە

لـە هاویـنی ١٩٧٩دا، ئەبوو شـاهین یەکەم فەرمانـدە و ڕاهێنەری یەکەم دەسـتە پێشـمەرگەی کۆمەڵە بـوو لە گۆڕەمەڕ، چەند سـاڵ لە فەلەستین و لوبنان فەرماندەی شەڕەکانی ناوشار بوو، زۆر ناسراو و خۆشەویست بوو لای فەلەستینییەکان، هاتبوو بۆ کوردستان بۆ کار و ڕێبازی شۆڕشگێڕی و زۆر لە کۆمەڵەوە نزیک بوو.

لەگەڵ ئەبوو شـاهین دۆسـتایەتیمان لە برایەتـی نزیک دەبووەوە، کوڕێکی خۆشقسـەی لەهجەشیرین بوو، لە چەند شوێن لەشی بریندار بووبوو، شـوێنبرینەکان یادگاری بەنرخیان بۆ جێ هێشـتبوو، نە تەنیا

پەشیمان نەبوو لەو عومرەی لە فەلەستین گوزەراندبووی، بەڵکو هەمیشە بۆی وەک شانازی بوو. ئەبوو شاهین پسپۆڕ و شارەزایەکی گەورە بوو لە بواری چەکی قورسدا، بە تایبەت تەقینەوە، واتا ئینفیجارات. بە ماوەیەکی کورت لە هاوینی ۷۹دا، فەریدوون و ئەبوو شاهین بوونە دوو دۆست و هاوڕێی زۆر نزیکمان. ئەبوو شاهین زۆر حەزی لە یاریی تاوڵە بوو، هەموو جار بەیەکەوە یاریمان دەکرد، زۆر حەزی لە کوردی بوو، فێرم دەکرد چۆن بنووسێت و قسە بکات.

### شەهید بوونی کاک فوئاد

سێ چوار ڕۆژ لەو ناوە مامەوە و چوومەوە سەردەشت، لە جەمعییەتی سەردەشت خەبەر بڵاو بووەوە کاک فوئاد لە ڕێی هاتنەوەی لە مەریوانەوە بۆ بانە تووشی کەمینی هێزەکانی چەمڕان بووە و لەگەڵ برایم جەلالدا شەهید بووە. چووم بۆ توژەڵە، شەو لای مام جەلال بووم و خەبەرەکەم پێ گوت، زۆری پێ تێکچوو، زۆری لێ پرسیم، گوتم هەر ئەوەندە خەبەر هات کە کۆپتەریان بۆ دابەزیوە و هەردوو شەهید بوون. بۆ ڕۆژی دوایی هاتمەوە بنوخەڵەف، لەندرۆڤێرم لەوێ جێ هێشتبوو، ڕێی سەیارە هەر تا ئەوێ هەبوو، دەبوو لەوێڕا بە پێ بچیت بۆ توژەڵە یان ناوزەنگ.

هاتمە ناو شاری سەردەشت، یەکەم کەس برایم جەلالم دیت! خۆم پێدا دا و ئۆخەی خەبەرەکە درۆیە!

- فرمێسکی هاتە خوار و گوتی، خۆزگە درۆ بایە!
- ئەوە نییە زیندوویت!
- نا، بریا مردبام! بۆ کاک برایم؟!
- کاک فوئاد شەهید بوو، بەس من زیندووم!

دانیشت و هەموو بەسەرهاتی وەڕێکەوتنیان لە مەریوان و ئاڵمانەوە (دێی ماڵی کاک فوئاد) تا شەهیدبوونی گێڕاوە. گوتی، بەداخەوە من بەرنەکەوتم و دەرچووم. پارچە شیعرێکی پێ دام و گوتی، دوێشەو تا

بەیانی شـــینم بۆ گێڕا و ئەم شیعرانەشـــم بۆ نووسی با بە تۆ بێت! کاک فوئاد لە نۆی خەرمانانی ١٣٥٨ (١٩٧٩/٨/٣١)دا لە نێوان بانە و مەریوان و سەقزدا، بە دەستی جاش و پاسداری حکومەتی ئێران شەهید دەبێت.

گوتم ئێســـتا من بە مـــام جەلال و برادەرانم گوتووە تۆش شـــەهید بوویت، دەبێ زوو بچی و هەواڵەکە ڕاست بکەیتەوە.

## ئەگەر چەند ساڵ شۆڕش هەبێت، دەبێ چی بکەن؟

خەبەری شـــەڕ لە هەمـــوو لایەکەوە دەهات، ســـەقز، بانـــە، جادەی دارســـاوێن، فانتۆم دەهاتوچۆ و شکانی دیواری ســـەوتیدا بوو، دیعایە بـــە تونـــدی هەبـــوو سەردەشـــت دەگیرێتەوە، پـــڕ بوو لە ســـابلاغی و پێشمەرگەی یەکێتی.

لەناکاو لە ناو بازاڕ ئەوجار تووشـــی سولەیمان بللوری و حوسێنی برام بووم، لە خۆشیان باوەشمان بەیەکدا کرد، چووین بۆ تەلەفۆنخانە واتـــا موخابرات، ڕێڕێداری نەبوو، ســـەدان کەس لە نـــۆرەی تەلەفۆندا بـــوون، گوێمـــان لێ بوو ئیـــی وا بوو دەگریـــا و هەبـــوو دەیگوت تازە ناتانبینمەوە، یا دەینالاند لە غەریبی، هەشـــبوو گلەیی دەکرد سێ ڕۆژە حەمامـــی نەکردووە و ڕۆژ ڕۆژی حەشـــر بوو. گوتمـــان بابە با بڕۆین بەرمان ناکەوێت، ئەوە دوو ڕۆژە دوور کەوتوونەوە وا دەکەن، ئەگەر چەند ساڵ شۆڕش هەبێت و بەردەوام بێت دەبێ چی بکەن.

## جەعفەری کوڕەپوور

بیر کەوە، بیر کەوە، بۆ شـــەو چ بکەین و بچین بۆ کوێ؟ حوســـێن گوتـــی، خۆ جەعفەری کوڕی پوورمان تازە دامەزراوە و ماڵیان لێرەیە، دەچین بۆ لایان، تازەی ژن هێنابوو. باشـــە ماڵیان لە کوێیە، پرســـیمان خانووی ســـازمانی بۆ کارمەنـــدان هەبوو، گوتیـــان هەرچی کارمەندی غەیرە سەردەشـــتییە لەوێ ماڵیان پێ داون. سەردەشـــت زۆر بچووک بـــوو، خانووەکانـــی دەوڵەتیمان دیتەوە، یەک قات و لە شـــوێنێکی بەرز

دروســت کرابوون، بە پرســیار شــەو درەنگ چووینە ماڵــی جەعفەر. هەموو شــت زۆر باش بــوو، بەخێرهاتن و پەزیرایــی، لەندرۆڤێرەکەم لــە بەردەرگاکەیان ڕاگرتبوو، تفەنگ و تاقمەکانمان هەر پێوە بوو، لەپڕ شریخەی دەنگی فانتۆم لە ئاسمان بەرز بووەوە، دار و دیوار و پەنجەرە لــەرزی. گوتمان هیچ نییە دوورە بۆ خەڵکترســاندن وا دەکات. چوومە بەر پەنجەرەکە چاو لە دەرەوە بکەم بزانم هیچی خراپی جێهێشــتووە؟! جەعفــەر گوڕاندی و هــاواری کرد: ئەریَ بابە بۆ ماڵــم خراپ دەکەن، ئــەو قایــش و تفەنگەت دەبینیَ و بڕۆ ئەو ماشــێنە لابە، ئەی هاوار من تــازەم ژن هێنــاوە بۆ هاتوون ماڵــم خراپ دەکــەن؟! جەعفەری فەقیر بــەم نیوەشــەوە زراوی چووبوو و وای دەزانــی فانتۆم ئێمەی دیوە و هەر ئێســتا ماڵەکەی بــەر بۆمبا دەدرێت، هەرچی ســولەیمان بە گاڵتە و فشــقیاتی تایبەت بە خۆی ویســتی ئارامی بکاتەوە، حوســێن زۆری دڵخۆشــی داوە، ئێســتا ماشــێنەکە دەبەینە پشــتەوە و چی و چی، هیچ فایدەی نەبوو. جەعفەر نە لێوی خۆی دەگرت و نە شەقشــەقەی ددانی بۆ ساتێک بێدەنگ دەبوو. سولەیمان بە سرتە گوتی؛ کاکە دڵی دەتۆقیَ و بەســەرمان دادیَ با بڕۆین. گوتم، سەعات دووی نیوەشەوە بۆ کویَ بچین؟! گوتی، کاکە با لێرە بچینە دەر بیرێکی لیَ دەکەینەوە.

هەرســێک هاتینە دەر، جەعفەر لە ترســان هیچ هۆشی نەبوو، هەر خودا خودای بوو بڕۆین و ون بین.

دواتــر لە ڕەشــبگیری و زیندانیکردنی خەڵکی شــارەکان لە هاوینی ١٣٦٢ واتا هاوینی ١٩٨٣دا زۆر بێگوناح ئەم کاک جەعفەرە بە دەســتی ســوپای پاسداران لە مەهاباد گیرا، دایکم چووبوو بۆ دیتنی لە زیندانی ورمــیَ، دەیگــوت وەک منداڵێــک دەپاڕاوە و دەگریا و هــاواری دەکرد: پــوورە گیان بەقوربانت بم ڕزگارم کە. دایکم دەڵیَ جەعفەر گیان بۆ وا بێتاقەتی، خۆ تۆ هیچت نەکردووە و ئازادت دەکەن؟ دەڵیَ پووریَ گیان بە زۆر ئیعترافیان پیَ کردووم و گوتوومە نۆ پاسدارم بە دەستی خۆم کوشتووە! لە شاخ بووم دایکم هات و بۆی گێڕامەوە کە چۆن جەعفەری

بەستەزمانیان ئیعدام کردووە و پێیان گوتووە گەر بێتو ئیعتراف بکەیت، ئیسـلام زۆر گەورەیە و دەتبەخشـێ. ئەویش بە گریانەوە گوتوویەتی هەرچی بڵێن ئیمزای دەکەم. کاغەزی پێ پڕ دەکەنەوە لە شـەڕدا بووە و نۆ نەفەری بە دەسـتی خۆی کوشـتووە. بەبێ گوناح جەعفەرێک کە نەیدەتوانـی تەنانـەت مێروویەک بکوژێت، ژنێکی جـوان و دوو منداڵی ساوای لە دوای خۆی بەجێهێشت!

### دێی پاراستان

لەگەڵ سـولەیمان و حوسـێندا بە تاریکـی و چراکوژاوەیی لە ماڵی جەعفەرەوە ڕوومان لە جادەی سـابڵاغ و پردی بریسوێی سەردەشت کـرد و بەرەو زمزیران ڕێمـان گرتەبەر. تاریک و هـەر تاوناتاوێک[1]، شـەوقێک لە ئاسـمانەوە وڵاتـی ڕووناک دەکـرد و دەنگـی فانتۆمێک تاریکیـی شـەویان دەدڕانـد. نەماندەوێـرا گڵۆپـەکان هەڵکەین و زۆر بە هێواشـی و زەختێکی زۆر لە ماشـێنەکە بەرەو سـەر دەڕۆیشـتین، ڕەبەتمان جێهێشـت. سـەیارە کەوتە پرتەوبۆڵە و دووکەڵی ڕەشـی لێ دەهـات و بۆنـی ڕۆن. گوتم، پێم وا نییە سـەیارەکە زۆر دەوام بێنێت. سولەیمان گوتی، کاکە دەچین بۆ پاراستان، دۆستی خۆمی لێیە و ئاغای ئەوێـن، ڕێم لار کردەوە و لـە جادە لامان دا و ڕوومان لە دێ کرد، لە ترسی فانتۆم هیچ چرایەک دانەگیرسابوو، تڕە تڕە تڕ، دووکەڵێکی زۆر لـە قونێ لەندڕۆڤێرە نازدارەکەم هـات و ڕێک لە بن ماڵان کوژایەوە و مانی گرت لە ڕۆیشـتن و ورکەئاسـنی ماتۆڕەکەی لە ناو هەناوی هاتە خوار و مەکینەی تەقی.

سـولەیمان شـارەزا بـوو، چوو بۆ ماڵـی دۆسـتەکانی و خەبەری کردنەوە، یەک و دوو چەند مێرخاسـێک پەیدا بوون و زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیـان کردیـن، زۆریان پێ سـەیر بـوو بەم شـەوە تاریک و فانتۆم بەسـەرمانەوە گەیشـتووینە ئەوێ. گوتیان، ئێوە زۆر شـەکەت

١- تاوناتاو، تاو.تاو، جاروبار، بەین-بەین.

و ماندوون، با ئێمە ماشـێنەکە بە پاڵ بەرین بیشارینەوە، لەبەر ئەوەی بەیانی، کە ڕۆژ دەبێتەوە دیار نەبێت. بە هەموان پاڵیان نا و ماشـێنمان لە بن کلۆش و پەنایەک شاردەوە و ڕێنمایان کردین بۆ دیوەخانێکی پڕ لە فەرشی زۆر گەورە و خۆش، دەستبەجێ چا و نان و مرەبا و پەنیر و ماستی زۆر خۆش هات. جێوبانیان بۆ پان کردینەوە و تاکو خۆر لە تۆقی سەرمان و تەغەرەی پشتی نەدابن خەبەرمان نەبووەوە.

دموچاو شۆرا و دیسان نانی بەیانی هات، چوومە دەر، زۆر دەفکری سـەیارەکەمدا بووم، لێی نزیک بوومەوە و سـەری مەکینەم هەڵدایەوە، یەک دوو سایەق تراکتۆر و میکانیک پەیدا بوون و سەیریان کرد، دیار بـوو ماتۆڕەکەی بە تەواوی لەناو چووبـوو، دەبوو ماتۆڕی تازەی بۆ پەیـدا بکەیـن، ئەوەش دەو ڕۆژەدا هەر نەدەکـرا، ناعیلاج گوتمان جێی دێڵین و دواتر بزانین چیی لێ دەکەین. ئەو ڕۆژەش ماینەوە و خزمەت و پەزیرایـی ماڵی کاک بایزی دۆسـتی سـولەیمان و گەرموگوڕیان و باوەشـیان لەم ڕۆژە سـەختەدا کە خەڵک پێی وا بوو فانتۆم مێرووش لە سـەر عەرز دەبینێ، چ بگات بە پێشـمەرگە و تاقم و تفەنگ و جێبی پێشـمەرگان، جێی ڕێز و پێزانین بوو، ئەوەتا دوای چڵ سـاڵ ناکرێت بیر چێتەوە.

## کوڕی شاخ کەم و کوڕی تاران و ئەورووپا زۆر

حوسـێنی بـرام قەرار بـوو لەگـەڵ کاک عومەر شێخمووسـدا بۆ خوێندن بچێت بۆ سـوید و دەبوو خۆی بگەیەنێتە تاران، پاسـپۆرت و شـتی سـەفەری پێشتر لە هاوین دروست کردبوو. خاڵم و کاک عومەر ئەو ڕۆژەی ڕۆیشتن و سابلاغیان چوڵ کرد زۆریان گوت و حەول دا بمێنمەوە و بڕۆم بۆ تاران و دواتر بە هۆی کاک عومەرەوە لە سـوید دانیشم و بخوێنم. دایکم دەگریا و یەخەی خاڵم و کاک عومەری گرتبوو ڕازیـم بکەن و نەڕۆم، لە بیرم ناچی خاڵم گوتی، عەلی ئەم پۆسـتاڵ و قایشوقڕوشە دانێ و واز لە شاخ بێنە، بڕۆ بۆ دەرەوە و بخوێنە، خەڵک

بۆ شــاخ زۆره بۆ خوێندن کەمە، گوتم خاڵە گیان ســەرێکە و هێناومە و ناگەڕێمــەوە، بــە پێچەوانــەوە کوڕی شــاخ کەمە و کــوڕی تاران و ئەورووپا شــوکر زۆرن، بە دایکمی گــوت؛ ڕەعنا فایدەی نییە، عەلیمان تازە بۆ ناگەڕێتەوە و دەڕواتە شاخ.

لەگەڵ ســولەیماندا، حوســێنمان تا نزیک شــار هێنا و لەوێڕا لەگەڵ چەند ئاشنای سابڵاغی چوونەوە ناوشار و یەکسەر بۆ تاران چووبوو، ئیتــر من حوســێنم نەدیتــەوە و لە خەزەڵــوەری پاییزی هەمان ســاڵ گەیشتبووە سوید و لە شاری ئۆپسالا دامەزرابوو.

# ١٣

**كوڕانی سلێمانی**

لەگـەڵ سـولەیماندا ڕوومان کـردەوە خوار و بە پێ گەیشـتینەوە توژەڵـە. لە مەسـیری ڕێمانـدا هەر لـە ئاغەڵانەوە کە پێیدا ڕۆیشـتین بەرەو بەردەسـوور، هەر خێمە و پۆلی کوڕانی هەڵاتووی شـار بوو لە بن دارەگوێزاندا، باریان لێ خسـتبوو. دەماندیت یەک دەسـتەنوێنی بە پشتەوە بوو، کتری و چادان و ئاغڵەوییەکی[1] بە خۆیەوە هەڵاوەسیوە، تفەنگێـک بـە شـانەوە، هەرچی حیزب و سـازمان بوو لـەم دۆڵە، یان بـۆ خۆیـان، یان مام جەلال خێمـەی بۆ لێدابوون، یـەک ئاردی هەبوو خوێـی نەبوو، ئـەوی تر هێلکـەی هەبوو ڕۆنـی نەبوو، یـەک تفەنگی هەبوو، قایشـی نەبوو، ئەوی دی یەک دوو قەتارە فیشـەکی بەسـتبوو بە سـینگەوە تفەنگی نەبوو، دە دوازدەیەک لە بن دارگوێزەکانی سـەر ڕێی بەردەسـوور باسیان گەرم بوو لەسـەر هەلومەرجەکانی خەباتی چەکـداری، لینیـن دەڵێ ئامادەیە و ترۆتسـکی پێی زوویـە، مائۆ دەڵێ لـە دێهاتـەوە بۆ شـارەکان و چێ گیڤارا دەڵێ پارتیـزان دەبێ بۆگەنی تـا دوور بـڕوات و با حەمام نەکەین، یەک دەڵێ، سـێ ڕۆژە هاتووینە دەر و دەبـێ ئـاو گەرم کەین، ئەوی دیکە دەڵـێ، لە چیدا؟! ڕۆژ ڕۆژی قۆشمە و کوڕانی سلێمانی و ناو یەکێتی بوو، کە دەگەڕان و لە خودایان دەویست بماندوێنن و پێمان ڕابوێرن و قاقا پێبکەنن، زۆر کوڕە شاریی ڕۆژهەڵاتـی بێئەزمـوون و نازداری لێ بوو، هەلیان بۆ دەرەخسـاندن بۆ بەزمی ڕابواردن و گاڵتەپێکردن. دوکتۆر کەمال خۆشـناو لە توژەڵە هەر کـە ڕۆژهەڵاتێکی دەدەیت، ناوێکی بـۆ دەدۆزییەوە؛ کاک جوتیار،

---

١- ئاغڵـەوی، تـاوە بۆ شـت تێـدا سـوورکردنەوە، تاوەیەکـی بچووکی سەربازیی بوو.

کرێـکار، ســەپان، فەلاح، پرۆلیتــەر و ئەم جەفەنــگ و گاڵتانەی لەگەڵدا دەکردیـن، پێیوابوو هەرچـی کوڕانی ڕۆژهەڵاتییە، مارکســی و ماویی و کۆمۆنیســتن! هەموو جارێ دەیگـوت، تۆ وەرە هەرچی کوڕە ئاغا و دەرەبەگ و دەوڵەمەندە مارکسی و شۆڕشگێڕ و کۆمۆنیستە!

## مولازم عومەر و دۆڵی ئەحزاب

لەگـەڵ ســولەیماندا بە هۆی ناســیاوی و نزیکیمــان لەگەڵ مولازم عومەردا مەقەڕی هەر لە ســەر ڕێیەکە بوو، لە لای خۆی گلیداینەوە و نەیهێشــت بۆ مەقەڕەکانی سەرتر بڕۆین و گوتی، هەر لێرە باروبنەتان بخەن و هەر ئێرە بکەن بە منزڵی خۆتان. چەند پێشمەرگەی خوێنشیرین و قسەخۆشــی لا بــوون، زۆرمــان پێ خوش بــوو، لە لایــانماینەوە. جۆگە ئاوەکە ڕێک بە بەردەمی خێمەکەی مولازم عومەردا دەڕۆیشت و سۆندەی ئاوی خواردنەوە لە بەردەستمان بوو، لەم ڕۆژەدا و لەم هەوا و جەنجاڵ و پڕ لە حەشامات و نەبوونییەدا، ئێمە وەک سوڵتان بووین لە خواردن و شوێنی خەودا. کاک عومەر ئێمەی بە میوانی خۆی دەزانی و ئیجازەی نەدا بۆ هیچ لایەک بچین و لە هەرچی خزمەت بوو کۆتایی نەدەکرد. شوێن خێمەکەمان لە بەرزایی بوو، خوار دۆڵەکە و توولەڕێ بـۆ نـاو مەقەڕەکانی تری توژەڵە لە بەردەممــان بوو، هەموو خەڵکمان دەدیت چ سەروخوار و چ سەروژوور دەبوونەوە. بەیانییەکی سولەیمان لــە قەراغ جۆگەکە قاچەکانــی لەناو ئاو نابوو، لە دوورەوە یەکێکی دی، گوتــی، خودام نەبێ هۆو باربەکۆڵەوە کاک فەتاحە، ســولەیمان و کاک فەتــاح کاویــان لە دایکــەوە خزمایەتییان هەبوو و تێکــەڵ بوون. نزیک بووەوە، ئەو بوو. کۆڵەپشــتێکی گەورەی، ئەوانەی بۆ شاخەوانی بەکار دێـن و پەیژەیەکیــان بۆ ڕاگری پێوەیە، زیاتر لە چـل بۆ پەنجا کیلۆ لە بالینج و پەتوو و قاپوقاچاغی لە پشتی خۆی قایم کردبوو، بەم گەرمایە سەرکڵاوەیەکی گوڵینگەدار و پووزەوانەی مەرەزی تا ئەژنۆ هەڵکشاو، لە دوورەوە هانکەی دەهات، سولەیمان هاواری کرد:

- هۆ کاک فەتاح هۆ!
- ئەوە کێیە؟
- سولەیمانم، ئەوە چ دەکەی؟
- هەتیۆ سولەیمان ئەوە تۆش لێرەی؟!
- بە زوویی دەچمەوە دەوری سابلاغ کارت نییە؟!
- ئەگەر چوویەوە بە ئامینێ بڵێ فەتاحم دیت، تەرسی بەڕێوە دەکرد! باری ئێستریکی لە خۆی نابوو! (ئامینە خانم خێزانی بوو، کاک فەتاح بە قسەخۆشی بەناوبانگ بوو).

مامۆستا شێخ عێزەدین مەقەڕی لە خوار خێمەی مام جەلال بوو، کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ، چریکی فیدایی و دێموکرات لەولاتر هەر هەموو خێمەیان هەبوو. تۆژەڵە خاکی ئێرانە ڕێک لەسەر سنووری ئێران و عێراق، هاوینەهەواری سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی بوو، زستانان دەگەڕانەوە ناوزەنگ. ئەم هاوینە هەرچی ڕێکخراو و حیزبی کوردی و ئێرانی هەبوو بە هۆی هێرشی دەوڵەتی ئێران بۆ سەر کوردستان هەموو هاتبوونە ئەم دۆڵە و پێیان دەگوت، «دۆڵی ئەحزاب».

**مام جەلال گوتی، ئێوە چ دەکەن؟**

لەگەڵ سولەیماندا دەگەڕاین بەسەریاندا و قسەوباسی سیاسی زۆر گەرم بوو، جەماعەتێکی لاوانی دێموکرات و سەر بە حیزبی تودە چووبوون بۆ لای قەڵادزێ و لە سەربازگەیەکی دەوڵەتی بەعس، گوتیان دەورە دەبینن. سەرلێشێواوی و کەسبەکەسی بە زۆربەی ئەو خەڵکەوە دیار بوو، وردەوردە زۆریان کە نەیاندەزانی بۆ هاتوونە دەر، یەکیەک و دوودوو دەگەڕانەوە شارەکان. خالید سمێڵ و مستەفا سوور پاسەوانەکانی مامۆستا، گەرمیی بازاڕی قسەی شەوانمان بوون، زوو زوو دەماندیتن. ئێوارەیەک مام جەلال بانگی کردین و گوتی، ئێوە چ دەکەن؟ لەگەڵ سولەیماندا گوتمان، وەڵا پێمان خۆشە بچین بۆ قووڵایی کوردستانی باشوور و بۆ لای ئەبوو شەهاب کە بەرپرسی لق

بوو له شارباژێر و زۆر نزیکی هەردووکمان بوو. مام جەلال گوتی، بۆ کوێ دەچن و ئێوەش وەک ئێمە کۆمەڵەی خۆتان هەیە و بچن ببنە پێشمەرگەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ و دەبێ بچنەوە دەوروبەری شارەکان و پێشمەرگایەتی دابمەزرێنن، من بەرپرسی عەسکەریتان لەگەڵدا دەنێرم و دەڵێم فێری پێشمەرگایەتیتان بکات و وەک ئێمە خۆتان مەفرەزە و کەرت دروست بکەن و دەست بکەن بە شەڕی پارتیزانی، زۆری بۆ باس کردین ئەوان چۆنیان دەست پێ کردووە، زۆر بە فەقیری و نەبوونی و تەنیا بە چەند پێشمەرگە. گوتی، ئێوە زۆر لە ئێمە باشتر و زۆرترن، بۆ دێن بۆ عێراق و بڕۆن ناوچەکانی خۆتان ڕزگار بکەنەوە. کاک عەبدوڵلای موهتەدی و کاک شوعێب زەکەریایی هاتن و دوکتۆر کەمال خۆشناو و مولازم عومەریش لەوێ بوون. مام جەلال ڕووی لە کاک عەبدوڵلا کرد و گوتی ئەم دوو کوڕە ئازا و چی و چی لەمێژە لەگەڵ ئێمەدا کار دەکەن و زۆریان یارمەتی داوین، لە ئێستاوە بە ئێوەیان دەسپێرم و بۆ ئێوە!

هەر لەوێ بووین بە پێشمەرگەی کۆمەڵە و مام جەلال، کاک شێخ عەلی (خولە کەشکۆڵ)ی بانگ کرد و گوتی، تۆ ئیتر لە خزمەت کۆمەڵەی ئێراندا دەبیت و لەگەڵ عەلی و سولەیماندا بڕۆ.

### ئازاد هەورامی خۆی فێری فارسی دەکرد

کە حوسێنمان بەڕێ کرد و لەگەڵ سولەیماندا گەڕاینەوە بۆ توژەڵە، لە کیتکە شارەدێی سەر ڕێی سەردەشت چەند کوڕی شار پێشیان پێ گرتین و گوتیان ئەم پاسدارەمان گرتووە، ئێمە نازانین چیی لێ بکەین، ئێوە دەچن بۆ لای سەرەوە لەگەڵ خۆتاندا بیبەن. ئێمەش هیچ عیلاجمان نەبوو هێنامان و ئەو ماوەیەی لای مولازم عومەر بووین لە سجنەکەی مەکتەبی عەسکەریی یەکێتی بوو. کاک ئازاد هەورامی خۆی فێری فارسی دەکرد، ڕۆژانە دەچوو دەیدواند. کامێرایەکی کانونی زۆر باشی پێ بوو، دەیگوت من ڕۆژنامەنووسم و پاسدار نیم.

ئـــەو ئێوارەیەی کە مام جەلال ئێمەی تەســلیمی هاوڕێیانی کۆمەڵە کــرد، لەگەڵ کاک عەبدوڵڵا و جەماعــەت کۆبووینەوە و کۆمەڵێک نامە و ڕاســپاردەمان وەرگرت و قەرار درا ئەگەر بکرێت و بتوانێت، جارێ ســولەیمان بچێتەوە بــۆ ناوشــار و تەنزیماتی ناوشــار ڕێکخەنەوە و منیش شــێخ عەلی بەرم بۆ لای ئەو هاوڕێیانەی کۆمەڵە، کە لە دەوری مەهاباد لە قزڵجە و دەرمان خۆیان حەشــار دابوو. شــوێن و نهێنییان پێ دام و گوتیان لەگەڵ ئەو کوڕانەی لەوێن و کادرەکانی کۆمەڵە ببمە پێشــمەرگەی ناوچەی ســابڵاغ لە هەرێمی موکریان لەژێر فەرماندەیی شــێخ عەلــی و بــە زوویی دوکتــۆر جەعفەر شــەفیعی دێــت و دەبێتە مەســئوولی هەرێمەکەتــان. وا دیاربوو داڕشــتنی زۆربــەی تەنزیماتی نیزامیمــان وەک مەفــرەزە، کەرت، تیپ، هەرێم و...، بــە چاولێکەری لە ڕێکخستنەکانی یەکێتی دەبوو.

### ئیعدام بە سوعبەت

گوتیان ئەم کوڕە پاســدارەش با کاک ســەلاح موهتەدی، کە ئەویش هەر لەوێ بوو، دادگایی بکات. لەگەڵ سولەیماندا کابرامان بردە خێمەی کاک ســەلاح، وەک قازی دانیشت و مەحکەمەی کرد و زۆری هەڕەشە و مەحکــوم بــە ئیعدامی کرد، کە ئیعتراف بکات و بڵێ بۆچی هاتووە بۆ کوردستان، هیچ فایدەی نەبوو. کاک سەلاح حوکمی ئیعدامی بۆ بڕیەوە و گوتــی، ببیــەن لەگەڵ خۆتان لە ڕێ ئیعدامی بکــەن. هەڵبەت بۆ ئەوە وای گوت بەڵکو شتێک بڵێت.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر شێخ عەلی لەگەڵ خوشکەزایەکیدا، حەمە عەلی، پێشمەرگەیەکی خۆی دلێر، هەروەتر سولەیمان و خۆم و کابرای پاســدار بە پێیــان ڕێمان بڕی بەرەو سۆســنایەتی و لەوێشــڕا بەرەو گەورک و مەنگوڕان و محاڵی دەوروبەری مەهاباد.

لە ناوەڕاســتی مانگی خەرمانانــی ١٣٥٨ هەتاوی و هەوەڵی پاییزی ١٩٧٩دا بە ڕەســمی و لەســەر دەســتی مــام جــەلال و کاک عەبدوڵڵا

موهتــەدی و کاک شــوعێب، بە چەکی خۆم و ویســتی خــۆم، بووم بە پێشمەرگەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران.

**پێخەفمان ناوێ**

ڕۆژی پاییز کورتە، لای ئێوارە لە ڕەشــماڵێکی سۆســنایەتی و پاڵ چیا، فەرماندەمان گوتی، دەمێنینەوە و شــەومان بەســەردا دێ. شەش کەس بەســـەر ئــەم ڕەشــماڵەماندا دا، ژن و مێردێکی جــەوان بوون و حەیوانەکانیان لە دەرەوە بوو. فەرموو فەرموو، نان و چامان خوارد و پێیان وا بوو هەر ئێستا ملمان دەشکێنین و دەڕۆین، کەچی فەرماندەمان بــە زمانێکــی زبــڕ و تــووڕە ڕووی لە من کــرد و فەرمانــی دەرکرد، حەرەســیات دەربکەن ئەمشــەو لێــرە دەمێنینەوە. تۆزێــک وڕ بوون و پرتەوبۆڵەیەکیان لێ هات. خۆ پێخەفمان هەر بەشــی خۆن هەیە و چی و چی و... فەرماندە دیســان بە دەنگی بەرز و ئامرانە گوتی، پێخەفمان نــاوێ و تاقــم و تفەنگەکانمان ســەرینمانن و پشــتێند و جامانەکانمان لێفەمانن. ئیتر پیاوی ماڵەکەش بێدەنگ بوو. تاریکی تەواو باڵی بەســـەر کەژوکێودا کێشــا و دار و بەردی ئەم ناوە، چارشێوی ڕەشی پۆشی و ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە کەوتنە چاوشارکێ و خۆنواندن.

شــێخ عەلــی ئەمری کــرد، ئاخــر حــەرەس بانگی کەیــن و لە لای ســەرووی خێمەکــە جێیەکی بۆ خۆی خۆش کرد و لبادێکی ڕاخســت، تاقم و تفەنگی لە بن سەری نا، لەسەر پشت لێی درێژ بوو، جامانەکەی بە دەموچاوی خۆیدا دا. کابرای دیلیش ئەوەندە ماندوو بوو لە پەنایەک خەوی لێ کەوت، لەگەڵ سولەیمان و حەمەعەلی و دلێردا دەستمان بە قســە کرد، لەولاتر ژن و مێرد لە تەنیشــت یەک جێیان ڕاخست و بۆی نوستن. گوتمان با چاو لە دیلەکە هەڵنەگرین، من حەرەسی یەکەم دەبم و دوای خۆم سولەیمان خەبەر دەکەمەوە و حەمەعەلییش دواتر و...

### سێکسی ژێر ڕەشماڵ

وردەوردە هەمــوو نوســتن و منیــش لەبەر زارکی ڕەشــماڵەکە بە حەرەس وەســتام. کزە سەرمایەک هەبوو، مشــکییەکی پان و گەورەم بە ســەرەوە بوو، لــە ملم هاڵاند و جگەرە بەدوای جگەرەدا دەمکێشــا. وڵات کشــومات و شــەو خەریکــی زرینگانــەوە بوو، جارجــار پرمەی گوێدرێژەکەیــان و جارجاریــش مرخــەی چوارپێــی ڕایدەچڵەکاندم و سەرم دەژوورەوە دەنا و سەیری دیلەکەم دەکرد.

لەناکاو گوێم لێ بوو دەنگێک گوتی:

- دادەی ماڵەکەم دایکەنە با سوار بم.

- کوڕە پیاوی چاک بە، ئەم کوڕە جحێڵانە وەخەبەر دێن!

- هەی لە دایە کوڕانت نێم!

- کوڕە گوێیان لێ دەبێ بەخودا حەیبە!

- کچێ دایکەنە دەتگێم حەیبی چی؟! بۆ ئەوان حەیبەی دەزانن هەر لەخۆوە و وەخت و بێوەخت وەژوور دەکەون؟!

- دە تووخوا پیاوەکە دەڵێم توندی دامەگرە، با دەنگم دەرنەیەت!

- کچێ گاندەری خۆم کەی هێشتوومە بێشێت؟!

- دە باشە دەی تێینێ ڕۆحم دەرهات!

- دەک دەبەر قوزێت مرم، بەخودا تا گونانمی دەبەم، گەر بە تفەنگان بێنە سەرم!

- کوڕە زوو کە دەبەر کیرێت مرم!

هەموو گیانم وەسەر ئاو کەوت، ئەی! خۆ ئەوە خەریکن، هانکەهانک و هێنانوبــردن، هــەر هەمووشــیم گوێ لێیە و لە یــەک مەتری من ئەم عەملیــات و چالاکییــە ڕوو دەدات! ئــەوەی شــەرمە نایکــەن و هەر بە پیاویشم نازانن!

ئەوەنــدەم زانــی ســولەیمان بە فرقــە و پێکەنین خۆی لــە دەرەوە هاویشــت و هاتە لام، لەبەر پێکەنین و هەی بە قوربانتان بم، حەجمینی نەبوو. گوتم ســولی یەکەم شەوی پێشمەرگایەتی عەجەب عەمەلیاتێکە،

خوا بکا تا ئاخری هەر ئەم جۆرە چالاکییانە ببینین!

هەمـوو ئـەم حـەرەکات و گرتن و چوونە ناو پاسـگا، سـێ چوار خولەکی برد و کابرا ماندوو و هەناسەبڕکێ بۆی پاڵ کەوت و یەکسەر قونی دە ژنێ کرد و لە پرخەی خەوی دا و حیسێبی توورێکی قوڕاویی بۆ من و بۆ سولەیمان نەکرد، کە وا بە فرقە و پێکەنین، هاتە دەر و بە دڵنیاییەوە گوێیان لێ بوو من و سولەیمان پێدەکەنین!

من ئەو حیکایەتەم چل ساڵە لە لایە و کاتی خۆی بۆ ناسر ڕەزازیم گێڕایـەوە، گوتی دەینووسـم و بڵاوی دەکەمـەوە. نازانم کردی یان نا. هەموو ئەو کەسـانەی لە سۆسـنایەتی و مەنگوڕان و ناوچەی شێنێ و بەردەسـوور و ئەو دەڤەرە پێشـمەرگە بوون، دەزانـن و دیویانە، ئەم کولتـوور و عاداتـی نێـوان ژن و پیـاو و ئازادیی بێوێنـەی ژنان لەم ناوچانە وای کردووە بە دەگمەن کێشەی ژن و پیاو بە شەڕ تەواو بێ و ژنکوشـتن باو نییە. من بە گوێی خۆم لێم بیسـتوون و گوتوویانە جا تووخـوا کونێ میـزی ئەوەی دێنێ پیاو یان ژنی لەسـەر بکوژرێت! لە گاگـەش بـووم، گوێم لێ بوو دوو ژن لە کانیی ژنان بە شـەڕ دەهاتن، یەکیان بە وی دیی گوت، «دە بڕۆ قاعبە، ئەگەر ژن بای تا ئێسـتا دوو جـاران هەڵگیرابـووی»! من زۆر کەڕەت دیومە و هەسـتم پێ کردووە ژنان و پیاوانی پیری ئەم دەڤەرانەی کوردستان هەر وەک چۆن سەیری سێکسـی گوێدرێژ و ئەسـپ و ماین یان سـەگ دەکەن، هەر واش بە لایانەوە سێکسی ژن و پیاویان پێ ئاساییە و بە کردەوەیەکی سروشتی سـەیری دەکەن. لـە لای زۆربەیان خوازبێنی لە پیـاو نە عەیبەیە و نە ئیراد. بە پێشمەرگەیان دەگوت، بۆ ئەم کچەمان ناخوازی؟ ئەگەر شێنێ لە ناوچەیەکی دیکە بوایە و سـەرکردایەتی و ئەو هەموو پێشـمەرگەیە هاتوچۆی کردبا، بەبێ شک دەیان پیاو و ژن کوژرابوون، بە چەند ساڵ پێشمەرگە لەم دێیە بوو کەچی نە کچێک کوژرا و نە پێشمەرگەیەک لێی لە قاو درا! ناوچەی میراودەلی لە هەناوی ئەم ناوچانەدایە، کەچی ساڵ نییە چەند ژن نەکوژن. لە لەندەنی پایتەختی شارستانی، جیرانە ئاغاوەتە

میراودەلێکانمـان بە باب و دوو مام و سـێ ئامۆزا کچە بەسـتەزمانی خۆیان، «بەناز»یان[1] لەتوپەت کرد، لەسـەر سـۆزی خۆشەویستی بە کوڕێک، ئەویش کورد!

## کەس نە بای دیبوو نە باران

لەگەڵ سـولەیماندا یەکەم شەوی پێشـمەرگایەتیمان بە حەرەسیات و گوێگرتـن لـە نـەوای عاشـقانە و هەسـت و دەروونبزوێنـی ژن و پیاوەکەی سۆسـنایەتی، لە داوێنی چیا و ناوجەرگەی دارسـتانی چڕ و مەندی کوێسـتانی کوردەواری، ڕۆمانسییانە تێپەڕ کرد. بوومەلێڵ بوو فەرماندەمان شـێخ عەلی بە خۆکێشـانەوە هاتە دەر و گوتی: ئەوە بۆ نەنوستن و کەستان خەبەر نەکردەوە؟! گوتمان حەرەسیاتی ئەمشەومان بـۆ ئـەوە نەدەبوو کەس بەشـدار بێت! ژن و پیاوەکـەش هاتنە دەر و کـەس نـە بای دیبوو نە بـاران، زۆر بە گەرمـی دواندمانن و ئەوانیش گوتیان: هەر ئێسـتا نانی بەیانی حازر دەکەین. شێخ عەلی گوتی: دەڵێم تا زووە بڕۆین و لەو گوندانەی خوارەوە نان بخۆین، گوتمان، هەر زۆر باشـە و دواتر کە بە ڕێدا ڕۆیشتین و ماندوو بووین نان و چاخواردن خۆشتریش دەبێت. جەماعەتمان دەنگ دا و لەگەڵ دیلەکە بەرەو خوارتر و ڕووو لە جادەی سەردەشت-خانێ شۆڕ بووینەوە.

لە ئاغەڵان مەقەڕێکی کۆمەڵەی لێ بوو، تەنیا چەند کەسـێک بوون، سولەیمان گوتی، ئەم دیلە لێرە بەرەڵا دەکەین و پێم وا نییە شتێکی وا بێت. گوتمان بە مەقەڕی ئاغەڵان، کاکە ئەم پیاوە تەسـلیمی بەرپرسانی ناوچەی سەردەشت بکەن.

---

[1]- بەناز مەحموود، کچە کوردێکی بیسـت ساڵانەی میراودەلی بوو، ساڵی ٢٠٠٦ لە لەندەن بە دەستی باب و مام و دوو ئامۆزا لەسەر خۆشەویستی کوژرا و مەیتی لەتوکوتکراوی لە شارێکی تر، لە باخچەی ماڵەدۆستێکیان شـاردرایەوە. ئەم کارەسـاتە دوای چەند مانگ، پۆلیسی لەندەن لەقاوی دا و هـەر هەموو گیران. کاردانەوەی زۆر خراپی لەسـەر ڕەوەندی کوردی هەبوو، دەنگدانەوەی گەورەی لێ ساز بوو.

### هەر ئاغام

هاتینە نەلاس و لە چەم پەڕیینەوە، بە وەلگێڵ و وەلیودا بۆ نیوەڕۆ خۆمان گەیاندەوە پاراســتان. لەندرۆڤێرەکە بە داپۆشــراوی هەر لەوێ بوو. گوتم بە ســاحێب ماڵ چیتــان لێ کرد بۆ خۆتان، گەردنتان خۆش و ئــازا بێــت، ئێمە تازە بۆمــان تەعمیر ناکرێــت و دەڕۆین بۆ ناوچەی مەهاباد.

بــە مێونــە و هەمراندا چووین بــۆ هەمزاوا، ماڵــی کاکەلاغا و بابی حەســەن، دۆســتمان بوون، بەخێرهاتنێکی گەرموگــوڕ، کاکەلاغا زۆر فەقیر و نەدار بوو، بەڵام خۆی هەر بە ئاغا دەزانی، دادەنیشــت و لاقی لەسەر لاقی دادەنا و دەیجوولاند و تەسبێحی هەڵدەسووڕاند و دەیگوت سێ بە سێم تەلاقی دایکی عەسەنی کەوتبێ هەتا چلەگیایەکم مابێ هەر ئاغــام. لەگەڵ ســولەیماندا نێوانی زۆر خۆش بوو، ســوێندی خوارد و گوتی: دەبێ بمێنەوە. نان و چێشــتێکی بەلەزەتمان بە قسە خۆشەکانی کاکەلاغا خوارد و بەڕێیان کردین.

بەرەو زمزیران، کانی ڕەش، سوێناس، گلێنان، شارەزوور، خەلیفان، دێ بە دێ و بە پرسیاران ئەوجار بۆ بەیرەم و قزلجە و دەرمان.

### مەشقی پارتیزانی

بــە درێژایــی ئــەم ڕێگەیــە بە پێیــان، شــێخ عەلــی وەک پارتیزان هەڵســوکەوتی لەگەڵدا کردین، هەرچەند تەنیا من و ســولەیمان بووین وەک پێشمەرگەی تازە و حەمەعەلیی خوشکەزای و دلێری پێشمەرگەی خۆی ماوەیەک بوو لە دەرەوە بوون و پێویستیان بەو هەموو تەکووزی و ڕێوشــوێنگرتنی پێشــمەرگایەتییە نەبوو، کەچــی ئەوانیش بە ئێمەوە ســووتابوون. لە توژەڵەوە تا بن دێهاتی مەهاباد، ئێمە بە پێ ڕۆیشتین،

نــە پاســدارێک و نــە کۆپتەرێک و نە ســتوونێکمان[1] دیــت، کەچی بۆ فێربوونمان مەســافەی پێ ڕادەگرتین و تفەنگ لە شــانی ڕوو بە خۆر نەبــێ و ناوی شــەو هەبێ و هەر هەموو ئەلفوبێیەکانــی پارتیزانیی بە کــردەوە پــێ دەکردین. چوونی نــاو دێهات و ماڵان و دابەشــبوونمان و حەرەســیاتدەرکردن و هەموو ئەو شــتانە. جــار هەبوو هەم خۆمان شــەرممان دەکرد و هــەم خەڵکی دێهاتەکان پێیان ســەیر بوو، نێوەڕۆ دەچوویــن بــۆ دێیەک، یەکمانی دەنارد بڕۆن نان بێنن، ئەوانی تر لە بن تەپۆڵکەیەک و لە دەرەوی دێ دەمانەوە، کۆمەڵێک شــتی لێ فێر بووین لەم چەند ڕۆژەدا تا گەیشتینە ناوچەی مەهاباد هەمووی بەسوود بوون بۆ داهاتووی پێشمەرگایەتیمان.

### بۆ دەچنە مزگەوت؟

دەبــوو بــەم ناو و نیشــانانەی پێیان دابووین، لــە قزڵجە و دەرمان هاوڕێیانــی کۆمەڵەی مەهاباد بدۆزینەوە. دوو ســێ جار نێوان دەرمان و قزڵجەی خوار و ســەرێمان کرد، کەس دیار نەبوو لە فەلاح و شــوان زیاتر، زۆرم حەول دا کەس هیچی نەدەزانی و پێیان نەدەگوتین. شــێخ عەلــی دەیگوت، کەس نەهاتووە و هەموو تەســلیم بوونەوە. دەمانگوت نابێت شــتی وا و برادەرانی ســەرکردایەتی لە توژەڵە لەخۆڕا قســەیان نەکــردووە. بە ڕۆژ جەولەی پــێ دەکردین و بەرپێمان وەک ئاگری تێ بەربووبێ وا بوو. شەوانە لەم دێهاتە جێوبانی خۆشیان بۆ ڕادەخستین، کەچــی دەیگــوت، ســەرو بەتانــی وەرگــرن و دەچین بــۆ مزگەوت و حەرەسیات دەردەکەین. خەڵک دەیانگوت باوکم بەخوا هیچ باس نییە و پاسدارمان هەر نەدیوە، بۆ دەچنە مزگەوت؟!

هەســتان و دانیشــتن و دواندنی شــێخ عەلی لەگەڵ خەڵکی فەقیر و فــەلاح بــە لامانەوە زۆر خــۆش نەبوو، منیش و ســولەیمانیش زۆر بە

---

١- ســتوون، لەگەڵ ئەوەی بە مانای کۆڵەکەی ناو بینا دێت، لە حەرەکاتی ئەرتەش و جەیش بە مانای قافڵە و کاروانی کەرەسەی ئەرتەش دێت.

حورمەت و شـــەرمەوە دەمانڕوانییە خەڵک، بەڵام ســێیەکەی دیکە زۆر لە ســـەرەوەڕا تێیان دەخوڕی و زۆر جار قســـەی ناخۆشیان بە خەڵک دەگوت. لەگەڵ شـێخ عەلیدا شـــەڕەدەنووکەمان دەکـرد، بە پێکەنینەوە گاڵتـــەی پێ دەکردیـــن و دەیگوت ئێوە جارێ فێر نەبـــوون ئەم میللەتە دەبێت بە شەق بیدوێنی، دەنا سواری سەرتان دەبن!

دوای دوو ڕۆژ گـــەڕان لـــە نێوان ســـێ گونـــدی زۆر نزیک لە یەک، سەرەنجام کوڕەجوتیارێک هاتە بن گوێم و گوتی ماوەیەکە جەماعەتێک لە کوڕی شـــار لە ئەشکەوتی چەکوچدان. ئەشـــکەوتی چەکوچ لە سەر شاخی پشت قزڵجەی خواروو بوو.

لێی ســـەرکەوتین و نزیک ئەشـــکەوت بووینەوە، یەک دوو دەنگ و خشـــپە و جووڵەمان بەدی کرد، هاوارمان کرد خۆمانین، چەند کەسێک لە زارکی ئەشکەوتەکە هاتنە دەر، لە مەدرەسە خوێندبووم «ئەسحابی کەهـــف» خودا بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ دەخـــەوی کردبوون و دواتر وەخەبەری هێنانەوە، گوتم سولەیمان ئەوە ئەوان نین؟!

بە بیســـتنی دەنگمان هەموو لە ئەشـــکەوت هاتنـــە دەر، ماچومووچ و بـــاوەش، هەمـــووی هاوڕێ و دۆســـت و خزم بـــوون، خەبەر و باس و گێڕانەوە، ســـەید ئەندامی کۆمەڵە و بەرپرســـی یەکەم بوو، عەبوو و فاروق و ســـولەیمان مودەڕەســـی برا بوون، حوسێن سوهەیلی، ڕەحیم قادری، ســـولەیمان خورەمی، محەمەد میســـری، جەعفەر حەسەنپوور، عەلی موتەهەری، ســـەعید گەوهەری، قادر قـــادری، قادر غازی، کەمال وەلیانی، یونس پاڵەوانی، جەعفەر پیرەهەڵۆ، ڕزگار، سەید ڕەحمانەدرێژ، ســـەید ڕەحمانە چکۆل، مینەی دەرمان، مەلا مســـتەفا، فارووق بللوری برای سولەیمان و چەندی تر لەوانەیە بیرم نەمابێ، یان پێویست نەکات ناویان بێنم و لە شار بن.

یەکەندەردوو جاڕی کۆبوونەوە لێ درا و بە حەڵقە لە دەوری یەک لە بن زارکی ئەشـــکەوت لێی دانیشتین. نامەی کاک عەبدوڵڵا موهتەدیم دایە دەســـت ســـەید و ئەویش بـــۆ هەموانی خوێندەوە. شـێخ عەلی بە

هەموان ناسـێندرا و ئیعلان کرا لەمەودا بەرپرسـی نیزامیمان دەبێت و ڕزگار هاوکاریی دەکات.

### ئیدی بۆڵەبۆڵ

ڕەخنە دەستی پێ کرد، بۆڵەوپرتە و دەردی دڵ لە یەک، بە پای فیلان بوو. هەر هەموو ڕەخنەکان لەسـەر خوو و ڕەوشـتی وردەبۆرژوازی بـوو، جەماعەت نەیانتوانیـوە ئەم ڕەفتارانە لە خۆیـان دوورکەنەوە و فێری دیسپلینی پرۆلیتاری بن، نموونە، قادر دەیگوت، حوسێن سوهەیلی وردەبـۆرژوازی بەری نادا و لە نێو ئەشـکەوتەکەدا جـێ نەرمەکە بۆ خۆی دادەنێ و لەسەر کەمرەکان[1] دەنوێت، کە نەرم و خۆشە. فاروق مودەڕەسی لەبەر ئەوەی سەربازیی کردووە بووەتە مەسئوولی دانانی نگەهبان و هەموو سەعاتە خۆشەکان بۆ خۆی دادەنێت. سەید وەستای دیـوار بـوو، ماوەیـەک پێش ڕووخانـی شـا، وەک زەحمەتکێش، کاک حەمەحوسـێن کەریمیی ناسـیبووی و کردبووی بە کۆمەڵە، بەرپرسی هەر هەموومان بوو، بە دوکتور و موهەندیس و دانشـجووی زانکۆکان و هەر هەموو کوڕانی شـارەوە، بە باشـی نە نامەی پێ دەنووسـرا و نـە بۆی دەخوێندراوە، ڕزگار شـاگرد میکانیک بوو تاقە «پرۆلیتەری» ناومـان بوو، کرابوو بە مەسـئوولی نیزامی، لەبەر ئەوەی سـەربازیی کردبـوو. هەمـوو ئەوانـی دی، کە بە ویسـتی خۆیـان و ڕەخنەیان لە حیزبـی دێموکـرات و نامۆیـی ڕێکخراوەکانـی ئێرانـی، هاتبوونە ناو کۆمەڵـە، دەبـوو لەژێر فەرمانی ئەم دوو کەسـەدا بن، کە پێشـتر کاک سـەید برایم عەلیزادە پەیوەندیی لەگەڵ ڕزگاردا هەبووە، حەمەحوسێن کەریمییش لەگەڵ سەیدا.

---

١- کەمرە، ڕیخی بەرپێدراوی ڕەقهەڵاتوو.

**شێخ عەلی ناسازێ**

هەر لە سەعاتی یەکەمەوە دیار بوو شێخ عەلی لەگەڵ ئەم کولتووورە ناسازێ و هەموو شتێکی زۆر پێ منداڵانە بوو، لە لای ئەو تەبیعی بوو مەسئوول لە جێی خۆش بێ و حەرەسیات نەگرێ و دوو کەس لە پشتەوەی برۆن و بچێتە ماڵە خۆشەکان لە کاتی دابەشبوون لە گوندەکان. ئەو دەیزانی ئێمە هەمووومان نە ئەزموونمان هەیە و نە لە شۆڕشدا قاڵ بووین، تازەین و زۆرتر کتێبی بیردەکەینەوە تاکو مەیدانی و عەمەلی، ئیتر دەستی کرد بە ئەمر و نەهیکردن بەسەرماندا و تەنانەت تووڕەش دەبوو لێمان.

سولەیمان بڕیاری دا هەمان ڕۆژ بچێتەوە شار و لە دائیرەکەی خۆی بێهداشت دەوام بکات و کاری ڕێکخستنی ناوشار و یارمەتیی پێشمەرگە بکات. شێخ عەلی هەر وەک تەنزیماتی یەکێتی هەموومانی لە دوو دەستە پێشمەرگەدا جیا کردەوە، وەک بزانم مەفرەزەی شەهید خانە و مەفرەزەی شەهید حەمەحوسێن، هەر ئەم دوو شەهیدەمان ئەو کاتی لە ناوچەی موکریان لە کۆمەڵەدا هەبوو. دەستی بە قسە کرد و ژیانی پێشمەرگەیی بۆ باس دەکردین و شێوەی خۆپاراستن و کەمین و نەمانەوە بە ڕۆژ لەناو دێیەکاندا و چۆنیەتیی ڕێگەڕۆیشتن بە مەسافە و لەسەر هەست و هەر هەموو ئەم شتانەی خۆیان لە پێشمەرگایەتیدا فێری بووبوون، وەک محازرە پێشکەشی ئێمەی دەکرد.

قەرار داندرا هەر مەفەرەزەیەک ڕوو لە ناوچەیەک بکات و دەست بکەن بە جەولە و شەوانە لە مزگەوتەکان بەرپرسی سیاسیی مەفرەزە قسە بۆ خەڵک بکات و چالاکیی عەسکەرییش دەبێت دەست پێ بکەن و لەسەر جادە گەورەکان کەمین داندرێت. هەفتەی جارێک لە شوێنێکی دیاریکراو هەر دوو مەفرەزە کۆبنەوە و ڕاپۆرتی چالاکیی خۆیان بدەن و ڕەخنە لەخۆگرتن بکەن.

حەمەعەلی خوشکەزای شێخ عەلی، کوڕێکی ئازا و قسەخۆش بوو، ئەو تەنیا کاری پاراستنی خاڵی بوو، وەکو سەربازێکی چاک هەمیشە

لــە خزمەتیدا بوو، لە هەســتان و دانیشــتنی ئێمــە و حەرەکاتمان هەر تەقەی سەری دەهات و گاڵتەی پێ دەکردین، دەتوانم بڵێم لە ئیشوکاری ڕۆژانەدا بەردەســتیی شێخ عەلی دەکرد، تەنانەت ئاوی بۆ دێنا و چای بــۆ تــێ دەکــرد و پێخەفی لە ماڵان بۆ دێنا، کە ئــەو کارانە لە لای ئێمە نەبوو بۆ مەسئوول، دلێرەکەش بە هەمان شێوە لە خزمەتی حەمەعەلیدا بوو، بە حوکمی ئەوەی تازە هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی. حەمەعەلی دواتر یەک لە پێشــمەرگە ئازاکانــی یەکێتیی لێ دەرچوو، لــە دووی ژوئیەی ساڵی ١٩٨٠ بە ماوەیەک دوای چوونەوەیان لە موکریان و لای ئێمە، لە چیای کۆسرەت لە شەڕ لەگەڵ جاش و سەربازی بەعسدا شەهید بوو.

## ١٤

**دیسان کەرگاین**

ڕۆژێکیـان لە دێیەکەوە دەچووین بـۆ دێیەکی تر، هەموو بە ڕیز و مەسـافە بەدوای یەکدا دەڕۆیشـتین، حەمەعەلی لە پێشـەوە بوو، شێخ فێری کردبووین هەرچی نەفەری یەکەم گوتی، دووهەم و سـێهەم و تا ئاخر بە نەفەری دوای خۆیانی بڵێنەوە و پەیامەکە بگەیەنن. بستوویەک لە پێشـمان بوو ئەودیوی دۆڵ و مەزرایەک بوو، حەمەعەلی گەیشـتە سـەری بسـتووکە، بە دەنگی بەرز و زاراوەی هەڵەبجەیی گوتی: «خوا قووەتت بدا برا»، نەفەری دوای ئەو، فاروق بللوری بە هەمان لەحن و بەرزی دووپاتی کردەوە و ئیتر هەر هەموو دوابەدوای یەکدا گوتمانەوە، هاتینە سـەر بستووکە و ڕوانیمان؛ کوڕێکی شوان، شەرواڵ لە دەلینگ، لـەم چۆڵاییـە خەریـک بـوو کارە ناشـەرعی و سێکسـییەکەی لەگەڵ گوێدرێژەکەیدا تەواو بکات، ئیتر ئەم دە دوازدە پێشـمەرگەیە وامان لێ کرد لە شـەرمان بۆی جێبەجێ نەدەبوو شەرواڵەکەشـی هەڵکێشێتەوە و هەر هەموو بە تەنیشـتیدا گوزەرمـان کرد و دوعامان بۆ کرد «خوا قووەتت بدا برا»!

من لەو مەفرەزەیە بووم شـێخ بەرپرسـی بـوو، بە حوکمی ئەوەی پێشـتر دەیناسـم و لەگەڵ ئێمەدا هاتووە بۆ ناوچەی مەهاباد، شـەرتی میواندارییـش وای دەخواسـت من لە مەفرەزەی ئـەو بم بۆ زیاتر لێک تێگەیشـتن لەگەڵ ئەوانی دیدا، پەیوەندیی نێوانیشیان بم. مەفرەزەکەی دی ڕزگار و سەید بوون، وەک بەرپرسی نیزامی و سیاسی، سولەیمان مودەڕەسـی داندرا بە مەسئوولی سیاسی لەگەڵ ئێمەدا، هەرچەند شێخ حیسێبی هیچی بۆ مەسئوولی سیاسی نەدەکرد و کولفیکول هەر خۆی بوو.

جگه له سـەید و ڕزگار و عەبوو مودەڕەسـی، کەسـی تر ئەندامی کۆمەڵە نەبوو، یەک دوو بەرئەندامیش بوو، وەک برای سـەید و سـەید ڕەحمان، ئەوی تر هەر هەموو تەنیا پێشمەرگەی سادە بووین و هەموو بڕیـار و ڕاز و خەبەری حیزبی لێمان دەشـاردرایەوە و بۆمان نەبوو تەداخولی کاری سازمانی بکەین.

## یەکەم چالاکیی پێشمەرگە

یەکـەم چالاکیـی کۆمەڵـە لـەم هەرێمـەدا، مەفرەزەکـەی ئێمـە بە فەرماندەیی شێخ کردی. چەند ڕۆژێک گوزەرابوو لە جەولەکردنمان بە نـاو دێهات و هەموو وەڕەز و ماندوو بووبووین و دەمانپرسـی ئەرێ پێشـمەرگایەتی هەر ئەوەیە؟ ئەدی شـەڕ ناکەین؟! شێخ دوای پرس و ڕا و هەڵسـەنگاندنی ڕێگەکان، گوتی: باشـە با بچیـن بۆ نێوان ڕێگەی سـابلاغ و میاندواو، سـەیارەکان ڕادەگرین و قسـەیان بـۆ بکەن و با بزانن پێشمەرگە هەیە و دڵی خەڵک خۆش بکەن و لەم قسانە. بەڕاستی فیکرەکـەی زۆر بـاش بوو، ماوەیەک بوو لەم دێهاتە بووین، کەم کەس پێمانـی دەزانـی و هیچ پەیوەندیمان بە خەڵکی شـارەوە نەمابوو، یەک دوو سـەعاتی ڕۆژ مابـوو نزیک جـادە بووینەوە، خـۆی دووربینێکی پێ بوو لەسـەر تەپۆڵکەیەکی تۆزێـک دوورتر لە جادە، گوتی: من لێرە دەبم، فەرماندە دەبێت لە دوورەوە ئاگای لێتان بێت، دوو پێشـمەرگەی نارده لای ڕاسـت ڕوو لە میاندواو و دووشـی نارده لای چەپ ڕوو لە مەهاباد. بە من و یەک دوو پێشمەرگەی دیکەی گوت، لە ناوەڕاست بن و سەیارەکان ڕاگرن، قسەیان بۆ بکەن و تەبلیغ بکەن بۆ کۆمەڵە. گوتی: هیچ سەیارەیەک بۆی نییە بگەڕێتەوە، یان دەرچێت بەرەو شار، دەبێت ڕاوەسـتن تا کەمین کۆ دەکەینەوە، ئەوجار با بڕۆن، دەنا پیاوخراپیان تێدا بێت، ئیخباریمان دەکەن و هێز دێتە سـەرمان. بەڕاسـتی ئەم شتە وردانـە هیچمـان نەماندەزانی و زۆریـش گرنگ بوون. هـەر ئەوەندە هاتینە خوار و جادەمان گرت و یەکودوو، هەرکەس شوێنی خۆی گرت،

دەیان سـەیارە لە چەند خولەکێکدا وەسـتێندران، خەڵکەکە دادەبەزی و زۆربەیان خەڵکی شـار بوون، یەکسـەر خۆیان پێـدا دەدایین و ماچیان دەکردین و خۆیان بە قوربان دەکردین، لەناکاو پێکابێکی درێژی سوپای پاسـداران، سـیمورغیان پێ دەگوت، هاتە ناوجەرگـەی کەمینەکەمان، تەقـە بـەرز بووەوە، خۆیان خزانـدە بن پیکابەکە و سـەنگەریان گرت و ئەوانیش تەقەیان کرد، دەسـتیان بە قومبەلەهاویشـتن کرد، لە کەمتر لـە خولەکێکـدا هەرچیی تێیدا بوو کوژران. بـۆ یەکەم جار وەک یەکەم مەفـرەزە دەسـکەوتی چەند تفەنگ و پیکابێکـی تازەمان بوو. خەڵکمان بەجێهێشـتوو و خۆم هاویشتە پشت سـوکان، سیمورغم هەڵکردەوە و ڕوو بە شاخەکان هەموو سواربووین و تفەنگ و دەسکەوتمان بار کرد، بەداخەوە دواتر زانیمان کوڕێکی باشی سابلاغی بە ناوی خالید نەبەوی، کە پێشتر ڕامانگرت و هاتە خوارێ و ماچی کردم و یەکترمان دەناسی، بە تەقەی وێڵ لە دوورەوە لە ناو سەیارەکەی خۆی پێکراوە و شەهید بووە. ئەمە یەکەم شەڕی دەستەویەخە و لە نزیکەوە ئەم مەفرەزەیە بە سـەلامەتی کردمان و تا چەند ڕۆژ لە دێهاتی دەوروبەرمان شـادی و پێشوازیکردن بوو لە پێشمەرگە. بۆ هەر دێیەک دەچووین خەڵک لێمان دەهاڵان و سـەیری پیکابەکەیان دەکرد. ئەم چالاکییە زۆر دەنگیدایەوە و پێشـمەرگەکانی تری کۆمەڵە و دێموکراتیشـی وا لێ کرد یەکبەدوای یەکـدا چالاکی بکەن لەسـەر جـادەکان و ورەی خەڵک بەرز بووەوە و ئیی پاسدار زۆر دابەزی.

مەفـرەزەی ئێمـە لە بە پێ ڕۆیشـتن ڕزگاری بـوو، وەک کوڕێکی نازداری خۆم سیمورغم دەپاراست و پێی ڕادەگەیشتم، بەنزینم بۆ پەیدا دەکـرد، ڕۆنـم دەگۆڕی، لە چەم دەمشـۆری، هەموو ڕۆژێک سـەیری مەکینەم دەکرد، سـیمورغیش هەر ئەوە بوو باڵی نەبوو، دەنا بەڕاستی لە ڕێوبانان سیمورغ بوو، بەبێ باڵ دەفڕی!

**دوو ڕەش**

چەنـد ڕۆژ پێشـتر، بـۆ جەولـە چووبووین بـۆ کۆنـەدێ، لە کاتی ڕۆیشـتنمان دوو لاوی خوێنگەرمـی بەحەمـاس دوامانکەوتـن، نەدەگەڕانـەوە و داوای چەکیـان دەکرد ببن بە پێشـمەرگە. چەند ڕۆژ بەبێ چەک بە دوامانەوە بوون، سەرەنجام یەک دوو چەکمان بۆ پەیدا کـردن و عەلـی ڕەش و عومەرە ڕەش بوون بە پێشـمەرگەی کۆمەڵە. عەلـی مایـەوە و بـەردەوام بـوو، دوای ماوەیەک عومـەر ژنی هێنا و چووەوە ماڵ. دوای ئەم شـەڕە حەوتهەشـت تفەنگی زیادەمان هەبوو و خەڵکی دەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی و ئێمەش دوای لێکۆڵینەوە چەکمان پێ دەدان، وردەوردە دوو مەفرەزەکەی سابڵاغ نزیک سی پێشمەرگەی هەبوو.

خەبەر هات دوکتۆر جەعفەر شـەفیعی بووەتە بەرپرسـی بۆکان و سـەقز و مەهاباد بە ناوی ئامر هەرێمی موکریان. دەبوو هەموو بچین بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ بەرپرسی هەرێم لە قەرەگوێزی بۆکان.

**حەوت دەروێشەکەی سەقز**

کوڕانی بۆکان وەک کاک مینەی حیسـامی، هاشم ڕەزایی، ڕەحمان یەکشـەوە (حوسـێنزادە)، ڕەحیمـە ڕەش، حەسـەن ئارپیجـی، فاروق بابامیـری و چەنـدی دی هاتبـوون، ئێمـە وەک مەفرەزەکانی سـابڵاغ زۆربەمان چووین. سەقز حەوت کەس بوون هەمیشە بەیەکەوە بوون، لـە مزگـەوت، لە ماڵان، پێیم دەگوتن دەروێشـەکانی سـەقز و لێک جیا نەدەبوونەوە، زۆر ئارام و سەنگین و ڕۆشنبیر بوون. دوکتۆر جەعفەر، کە زووتر ئاشـنایەتیمان هەبوو، زۆری حەز لە گاڵتە و قسـەی خۆش بـوو، ئەویـش هەر وای بانگ دەکـردن، کاک موعتەسـەم تاتایی، عەتا قورئانی، شاباز شەهلایی، سیروان کاوسی، ڕەحمان ئەرغەوانی، تاهیر ئادەمی و مەحمود کەیوان، لە سەرەتای شۆڕشی بەرگریی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، حەوت دەروێشەکەی سەقز بوون. بەداخەوە عەتا قورئانی

دوای دوو جار برینداربوون، له کاتی دروستکردنی بۆمبێکی دەستی له ئاوایی قڕووچه، له یەکی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦١ هەتاوی (١٩٨٢-١١-٢٢)دا شەهید بوو.

لە کۆبوونەوەکەدا کۆمەڵێک بڕیار و ڕەخنە و ڕاسپاردەکانی سەرکردایەتی، کە ئەوکات مەقەڕیان چووبوو بۆ بێژوێ لە ئالانی سەردەشت، خوێندرایەوە. دوکتۆر جەعفەر مرۆڤێکی خاکی و متەوازع و میهرەبان بوو. هەموو بە دڵ خۆشمان دەویست و مایەی قبووڵ بوو بۆ بەرپرسی ئەم هەرێمە. من پێشتر لە ناوزەنگەوە دەمناسی.

### ئێلین باکسی و مێشوولەکانی لای مام جەلال

هەر لە هاوینی پێشتردا، بەر لە هێرشی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر کوردستان، هەر وەک باس کرا کوردستان و بە تایبەت مەهاباد، کە بووبوو بە سەرچاوەی ڕووداو و هاتوچۆی هەموو لایەک، سێ کەسی ئالای ئازادی هاتبوون لە سویدەوە وەک ڕۆژنامەنووس بۆ ڕاپۆرت و هەواڵ و دیتنی کوردستان و چوونیان بۆ یەکێتیی نیشتمانی. بە هۆی کاک عومەر شێخمووسەوە، کاک مەحمود باکسی و ئێلینی هاوسەری و مەمەد ئوزوون، پێیان دەگوت فەرزەند، هاتن بۆ مەهاباد و ماڵی ئێمە. پێشوازیمان لێ کردن و بۆ زۆر شوێنمان بردن. ئێلین ژنێکی سوور و باڵابەرزی گۆشتنی جوانی سویدی بوو، کە چووین بۆ ناوزەنگ مێشوولە زۆر بوو، زۆریان پێوە دابوو. گەڕاینەوە ماڵی خۆمان حەجمینی نەبوو، سینگ و باسکی هەموو سوور هەڵگەڕابوون. دایکم لێی چووە پێش و هەر بە کوردی دەیلاواندەوە دەیگوت ئەم فەقیرەتان بۆ وا لێ کردووە؟ ئێلینیش بە ئیشارە بۆ دایکم، پەنجەی لە سەر شوێن مێشوولەکان دادەنا و دەیگوت: جەلال تاڵەبانی! جەلال تاڵەبانی! واتا لە لای مام جەلال وام لێ هات! دایکم بردی بۆ حەمام و هەموو گیانی بە عەتر و ئودکولون بۆ شۆری و دەستێک جلی جوانی ژنانی موکریانی لە بەر کرد، زۆری پێوە جوان بوو. لە هاتنەوەمان مام

جـەلال گوتی بیانبە بۆ بۆکان و لای دوکتۆر جەعفەر با وەک نوێنەری کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕ وتوویژیان لەگەڵدا بکات. ئەوکات هێشـتا کۆمەڵە خۆی ئاشکرا نەکردبوو، بەس مام جەلال بە لایەوە گرنگ بوو کە ئەمانە دەچنەوە بۆ سـوید قسـە و ڕاپۆرت لەسەر کۆمەڵەش بکەن، نەک تەنیا حیزبی دیموکرات وەک حیزبی کوردی! لەگەڵیاندا چوومە بۆکان و ماڵی دوکتۆر. نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی دوکتۆر خوارد، وتوویژێکی تەواویان لەسەر چۆنێتیی دروستبوونی کۆمەڵە و بەرنامە و ستراتیژییان لەگەڵدا کـرد. دوای چوونەوەیان ژمـارەی ڕۆژنامەکەیان، کە لاپەڕەی یەکەمی وێنەی دوکتۆر بوو بە سـندووقی پۆستی کاک عومەر شێخمووسدا بۆ ناردین. دەتوانم بڵێم یەکەم کەس بە ناوی کۆمەڵە و بە ئاشـکرا قسەی بـۆ ڕۆژنامەنووسـان کردبێت، دوکتۆر بوو لەگەڵ مەحموود باکسـیدا کردی، لە نێوان بەهار و هاوینی ١٩٧٩دا.

### حەمامی ناو ئەشکەوت

دوای کۆبوونـەوە لەگـەڵ دوکتۆر جەعفەر، لە ڕێگـەی گەڕانەوەدا گوتیان، با بچین بۆ ئەشـکەوتی سەهۆڵان، کونەکوتریشیان پێ دەگوت، بـۆ خۆشـۆرین. ئەشـکەوتی سـەهۆڵان گۆمێکی گـەورەی لەناو بوو، بـە هەزاران کۆتـر و شەمشـەمەکوێرە لەمبەر و ئەوبـەری ئاوەکە لە فڕیـن و گەمەکردندا بوون، ئاوێکی زۆری بێبن هەموو ئەشـکەوتەکەی داگرتبـوو، زۆر پیس و پڕ لە پاشـماوەی حەیـوان و کۆتر بوو. (دەڵێن ئێستا بووەتە شوێنکی خۆشی گەشتیاری، بەداخەوە من هەر بە پیسی و وێرانـی دیومـە) مـن ناوبانگم بوو بەوەی کە خۆم ناشـۆم و دەڵێم، پارتیـزان دەبێت لە حـەوت کیلۆمەتری بۆگەنی بێت و گیڤارا وا دەڵێت! هەڵبـەت دوکتۆر جەعفەر ئەو قسـانەی بۆ سـاز دەکـردم و لە کۆڕ و کۆبوونەواندا مەجلیسی پێ خۆش دەکرد و دەیگوت پێشمەرگەی وامان هەیـە وەک عەلی دەڵێ گیڤارا وای گوتووە. یان «عەلی کوێر» دوکتۆر بەسـەریدا بڕیـم و حەقیقەت شـتێکی دی بـوو؛ ئێوارەیەکـی درەنگی

تاریـک هــەر من و پێشــمەرگەیەک و دوکتۆر لە گونــدی ئاجیکەندەوە دەچووین بۆ شــەرەفکەند، کێڵەکانی گۆڕســتانی پێش شــەرەفکەند بۆ بــەرزی زۆر بەناوبانگن، چراکانی ســیمورغەکەم بۆ بــاری ئەمنییەتی کوژاندبــووەوە و بــە تاریکی دەمئاژوانــد، لەپڕ دوکتۆر هــاواری کرد ئەوانە کێن؟ بەڕاستی وەک زەلام دەچوون. دابەزیم و هاتمەوە سەر و گوتم: دوکتۆر گیان کێڵن، ئەوە بۆ کێڵت لێ بووەتە پاســدار؟! ئیتر زۆر پێکەنین. دەچووینە هەر شــوێنێک دەیگوت، عەلی لە کێڵەکان هاتووەتە خوار و هەر هاواری کردووە: «زەلام کێی؟!» کەس جوابی نەداوەتەوە و تــووڕە بووە چووەتە پێش و دەســتی لــێ داوە «ئەرێ کاکە کێی بۆ جواب نادەیتەوە»! دوکتۆر بەڕاســتی چــاوی زۆر زەعیف بوو، کەیفی دەکــرد و دەیگوت چاکم پــێ کردی عەلی، کوێرایەتیی خۆم کردە عەلی کوێر؟! بەڵام بەڕاســتی لە خۆشــۆریندا زۆر تەمەڵ بووم و ئێســتاش هەر وام. چووینە ناو ئەشــکەوتەکە بە هەڵتروشــکاوی و قونەخلیســکە لە زارکی ئەشــکەوتەکە چووینــە ژوورەوە. لە پەنایەک دانیشــتم و بە تەمای خۆشــۆرین نەبووم، جەماعەت خۆیان تێ هاویشــت و دەستیان بە جلشــۆرین کرد. لەناکاو دوو سێ لە هاوڕێیانم لە پشتەوەڕا گرتیانم و تێیان هاویشــتم، بە زۆرەملی و ئینکارێکی زۆر ئاخری جلەکانیان پێ شۆریم و خۆشم شوشت.

## ناڵەی مەکینە دەگەیشتە ئاسمان

دیســان چالاکێکمان لە سەر ڕێی بۆکان و میاندواو لە نزیک گوندی مەلالــەڕ هــەر وەک جاری پێشــوو ئەنجام دا، خەڵکــی زۆرمان لێ کۆ بوونــەوە و زیلێکــی گــەورەی تایبــەت بە مووشــەکی تــاو کەوتە ناو کەمینەکەمان و چەند ســەرباز و بەرپرســی گەوەری ئەرتەشی بە دیل گیــران. ئەوانەی ئەمجارە کەوتنە ناو کەمینەکەمان ئەرتەشــی بوون و پاسداریان دەناودا نەبوو. زیلەکە زۆر گەورە بوو، گوتیان بیسووتێنن و بۆمان دەرناچێت، گوتم چۆن بیسووتێنین ناوەڵا حەول دەدەم لێیخوڕم

و کەسێک با سیمورغەکە ببات من ئەوە دێنم. هاواریان کرد گوتیان، فریا نەکەوی دێنە سەرمان. نیگەران نەبووم، چونکە زەردە پەڕیبوو، تاریکی خەریک بوو باڵ بکێشێ بەسەر وڵاتدا، چووم و خەریکی گێڕ و هەڵکردنەوەی بووم، هەڵکرا بەس لە گێڕەکانی نەدەگەیشتم، دوای دەستتێوردان چوو بۆ ناو گێڕ و جووڵا، مەفەرەزەکەمان لە چۆم پەڕیبوونەوە و ڕوویان لە وەتەمیش کردبوو، پێشمەرگەیەکم لەگەڵدا بوو، بریا ناوەکەیم بیر کەوتبایەوە، بەرەو چەمەکە چووم زۆر بە هێواشی دەڕۆیشت و ناڵەناڵی مەکینە دەگیشتە ئاسمان، هەر بە شوێن تایەی سیمورغەکە لە چەمەکەم دا و بە ئارامی پەڕیمەوە، ئیتر خەتەر نەما و بە ئاسوودەیی دەمتوانی بیئاژۆم. هەموو گەیشتینە ناو دێی وەتەمیش و بوو بە شایی و شادی و پێشوازیی گەرمی خەڵکی ئەم گوندانە، بە تایبەت کە گوتمان ئەمە سەیارەی مووشەکی تاوە، هەر یەکجار زۆری پێ شاد بوون.

دوای گەشتی درەنگی ئێوارە و ئەم شەوە بە گوندەکاندا و بەرزکردنەوەی ورەی خەڵک، گوتیان دەبێ هەر ئەمشەو ئەم زیلە گەورەیە بشاردرێتەوە، بەیانی کۆپتەر و فڕۆکە بۆی هەڵدەستن. باشترین شوێن گوتیان شاخی چەکووچە لە پشتی قزڵجە. بە پێی ڕۆیشتنی زیلەکە زۆر دوور بوو، سیمورغ و پێشمەرگەکان پێشکەوتن تا نزیک ئاوایی دەرمان بووینەوە، لەوێڕا بەبێ لایت و بە نهێنی و بە چەند سەعات گەیشتینە شاخی چەکووچ. سەرکەوتنی لەم شاخ و کێوە زۆر زەحمەت و گران بوو. لە شوێنێکی باش و لە بن بەرد و گیا و خێمە دامانپۆشی و وەک دەڵێن بە دار و چرپی ئیستتارمان کرد.

ڕۆژ بووبووەوە گەڕاینەوە، زۆرمان سەر دەرنەکرد لەو هەموو جیهاز و گڵۆپ و پێچ و برغووەی ناو زیلەکە. گوتیان نامە دەنووسین و سەرکردایەتی ئاگادار دەکەینەوە چیی لێ بکەین. هەر دەهات و داواکاریی پێشمەرگایەتی زیادی دەکرد و چەکمان نەبوو، مەیدانی جەولەکردنمان بە تایبەت دوای گرتنی سیمورغەکە زۆر فراوان بووبوو،

دەچووینــە زۆربەی ناوچەکانی دەوری مەهاباد، لە مەنگوڕان، گەورک، مەحال، ســندووس، شــارویران، چۆمی مەجیدخان و شــاماتەوە بگرە تا دەگەیشــتە دەوروبەری ڕەبەت و سەردەشــت. ئەوەنــدە بە خێرایی هاتوچۆمان دەکرد، خەڵک سەری سووڕ مابوو و پێیان وا بوو هەموو دار و بەرد و وڵات پێشمەرگەی کۆمەڵەیە و هەر لەناکاو زاهیر دەبن!

# ١٥

**بێژوێ لە ئالانی سەردەشت**

ڕۆژێکـی خۆشـی پاییزی بـوو، دوکتـۆر جەعفەر گوتی، سـاز بە دەچینە شوێنێکی خۆش و کەسێک دەبینی زۆرت پێ خۆش دەبێت، پێی نەگوتـم بۆ کـوێ دەچین و کێ دەبینین. لە ناوچـەی بۆکانەوە بەرەوە بانـە و لەوێشـەوە تەوای ئەم گوندانـەی نێوان بۆکان و سەردەشـت و بانـە، بـە ڕێی ئارمـردە تا گەیشـتینە نیهایەتی ئەم ڕێگـە نیزامییەی زەمانی شـا لە سەر سـنووری ئێران - عێراق لێیان دابوو بەرەو ئالان و لە سـەر چەمی دووئـاوان، بە هۆی ڕووخانی ڕژیمـی پەهلەوی، بە ناتەواوی جێیان هێشـتبوو. جادە نەما و سەیارەمان جێهێشت و بە پێ سـەرەوژووربیەکمان بڕی و گەیشـتینە بێژوێ لە ئالانی سەردەشـت، یەکەم جار بوو بێژوێ ببینم، ماڵەکان هەموو لەسـەر یەک و لە داوێنی شاخێک، هەر خانوویەک سواری خانووەکەی پێش خۆی بووە، تا بڵێی دێیەکـی جـوان و قەرەباڵغ بوو، حەوشـەی هەر ماڵێـک بانی ماڵەکەی پێش خۆیەتی، هەموو بانێک باگردێنی لێیە بۆ سـەربان شێلان و پێشی دڵۆپەگرتن، بەر هەر ماڵێک ئێسترێک بەستراوەتەوە، بەسەدان گوێدرێژ و ئەسپ و ئێستر لە هاتوچۆدان، زۆربەیان خەریکی کاسبیی ولاغداری و هێنانوبردنی بار بوون، قەیاسـەکێ، لغاوەکێ، کورتانەکێ وشەگەلێک بـوون بە زاراوەی خۆیـان زۆرترین جارت گوێ لـێ دەبوو. زۆربەی ماڵـەکان هـۆدەی نهۆمی خوارەوە، ناوماڵ و مدبەق و تەویلە و ئاغەڵی لەخۆدەگرت و هۆدەی سەرەوە دیوەخان بوو.

لەگەڵ دوکتۆردا بە کۆڵانی سەرەوژوور و تەنگەبەردا سەرکەوتین، ماڵێکـی دووقات و لە دوورەوە کاک عەبدوڵڵا و مامۆسـتا برایم هاتنە سـەر پلیکانـەکان و بەخێرهاتنیان کردین، کاک شـوعێب زەکەریایی و

یەک دوو هاوڕێی دی لەم ماڵە بوون. کاک خەلیل بللوریان، دۆستی بنەماڵە و هاوڕێی نزیکی کاکم بوو، ئەویش لەوێ بوو.

نان و چامان خوارد، دوکتۆر گوتی، ئێستا تۆ بڕۆ و ئەو کەسەی گوتم ببینە، خاڵت لەگەڵ مامۆستا شێخ عیزەدین لێرەیە. زۆر خۆشحاڵ بووم و نەمزانیبوو دوای ئەوەی لەگەڵ کاک زێڕۆدا بەڕێمان کردەوە بۆ عێراق گەڕابێتەوە. گوتی، ئێمە سەرکردایەتیی کۆمەڵە یەک دوو ڕۆژ کۆبوونەوەمان دەبێت و تۆ بچۆرە لای خاڵت، کە تەواو بووین بانگت دەکەم و دەگەڕێینەوە بۆ موکریان. پێشمەرگەیەکی بانگ کرد بمبات بۆ خوارەوەی بێژوێ «پاوێ»یان پێ دەگوت، دیار بوو مەقەڕی مامۆستا لەناو ڕەزەکاندا بوو.

## چارەنووسی شێخ عێزەدین

مامۆستا زەبیحی و مامۆستا شێخ عێزەدین، کاک سەعد و سەلاح و محەمەد موهتەدی برای بچووکی کاک سەلاح لە ئەورووپاوە هاتبووەوە، کاک ئەحمەد ئەسکەندەری، کاک فاتیح شێخولئیسلامی و کۆمەڵێک مەلای دەفتەری مامۆستا وەک مەلا عومەری عەسری و مەلا محەمەد و ڕەحمان شکاک و... لێ بوون. خاڵم و کاک سەعد خێمەیەکیان هەبوو، منی دیت زۆری پێ خۆش بوو، پرسیار و وەڵامی زۆری لێ کردم و باسی ئەو ماوەیەم بۆ کرد و گوتم، ئێستا پێشمەرگەی کۆمەڵەم.

گوتی، باشە خراپ نییە، بەس پێم وا بوو هەر لەگەڵ یەکێتیدا ماویتەوە، بۆم باس کرد مام جەلال پێی باش بوو بچینە ناو کۆمەڵە و ئێمەش قسەمان لەگەڵدا کردن و بووین بە پێشمەرگە.

شەو لە ناو خێمەکەی خاڵم مامەوە، تەنیا لایتی دەستی و لامپا هەبوو، هەر دە هاتوچۆدا بوون و یەک دەهات و یەک دەچوو و قسەوباسی خێمەی مامۆستایان بۆ دێنا، لە قسان حاڵی بووم زۆرتر لە شێخ جەلال نزیک بووەتەوە و زۆرتر باسی ئەوە، هەرچەند شێخ جەلالیش بە ناو هەر ئەندامی دەفتەری مامۆستا بوو و تا ئەوکات

حیزبـی خۆی دروسـت نەکردبوو، بەس یەک دوو جارم بیسـت خاڵم زۆرتری باس دەکرد و گوتی ئازایە! تێگەیشتم لە قسەکانی کاک سەعد و خاڵم، لێناگەڕێن مامۆسـتا شـێخ عیزەدین حیزبێکی بۆ خۆی هەبێت، بـە بیانـووی ئەوەی ئـەو ڕابەرە و حیزبـی ناوێ، هەرچـی خاڵم بوو دەیگـوت، بەیانـی دوو بەیانی سـەری بێکڵاو دەمێنێتـەوە، هەر حیزبە بۆخۆی نوێنەرایەتیی خەڵکی خۆی دەکات و ئەمڕۆ کاریان بە مامۆستا و جەماعەتەکەیەتـی، بەیانـی فڕێی دەدەن. کۆمەڵە ناخوازێ مامۆسـتا ئیی کەسـی دیکە بێت و تەنیا بۆ خۆیانیان دەوێت. زەبیحی پێی وا بوو لەسـەر ڕێنوێنیی مام جەلالیش، مامۆسـتا حیزبێک بۆ خۆی دروسـت بـکات و هێـزی خـۆی هەبێت، کـە ئەویش ڕەقـەم بێ و حیسـێبی بۆ بکرێـت و بەیانی هەر وا بە ئاسـانی کە کاریان پێـی نەما فت نەکرێت. دیـارە زەبیحی ئەزموون و ژیانێکـی دوورودرێژی لە ململانێی حیزبی و ئەستۆشـکاندنی یەکتـر دیبـوو، دەیزانی ئەم شۆڕشـە بـەردەوام و درێژخایـەن دەبێـت و دواڕۆژ گەر مامۆسـتا هەر خـۆی و چەند مەلا و فەقێیـەک بمێننەوە، لە لای کەس، نە دۆسـت و نە دوژمن سـەنگ و قورسایی نامێنێت. دیار بوو ئەم بەرنامەیە هەر لە هاوین و دوای دیتنی زەبیحی و مام جەلال لەگەڵ مامۆستادا لە ئارادا بووە و گفتوگۆ و ڕا و تەدبیری لێ کراوە. تێگەیشتم کاک سەعد و خاڵم لە پەشیمانکردنەوەی مامۆسـتا زۆر نیگـەران بوون، چەنـد جارم لێ بیسـتن دەیانگوت لێی ناگەڕێـن و خۆشـی ناوێرێت، ئـەم خەڵکەی دەوروبـەری تەنیا بیر لە خۆیان دەکەنەوە و سـەری بە قوڕدا دەکەن، کاری خۆیانی پێ ڕاسـت دەکەن و دواتر بەجێی دێڵن، بەڵام شـێخ جەلال ئازا و بوێرە. ئەوە ئەم قسـانە بوون؛ ئەم شـەوە لەبەر شـەوقی لامپایەک و لە ناو خێمەیەکی چوار پێنج کەسـیدا کە زیاتر لە دە کەس لە سـەر چۆک دانیشـتبوون، پـڕ لە دووکەڵـی جگەرە، بە خێرایی بەرگوێـم دەکەوتن. بە کورتی لێم حاڵـی بوو زەبیحی، مامۆسـتا بـە پیاوی ئەم بـوارە نازانێت وەک مام جەلال ببێتە چەترێک و هەموو حیزبەکان لە سـایەیدا، ڕابەری بکات و

بیانجوولێنێت. خۆی ئەوەی پێ ناکرێت و ناشهێڵن و ئیجازەی پێ نادەن کەسێکی وەک زەبیحی بە ئەزموون، ئەم کارەی بۆ بکات. دیار بوو هەموو ڕۆژەکان کۆبوونەوەیان کردووە و مامۆستایان ڕازی کردووە و دواتر ئیدیکە چوون و پەشیمانیان کردووەتەوە. باسی پڕۆگرام و مەرامنامەی حیزبەکە دەکرا کە زەبیحی ئامادەی کردووە و مامۆستا لەسەری دوودڵ و لە دڵەڕاوکێ دایە و ساغ نابێتەوە. لە لایەکی ترەوە شێخ جەلال زۆری حەز لە حیزبێکی سێهەم بوو، نە دێموکرات بێ و نە کۆمەڵە، خەتی گشتی بێ وەک ئەوەی مام جەلال و زۆربەی خەڵک و چالاکی سیاسی بگرێتەوە، هەر ئەوەی زەبیحی دایڕشتبوو، تەنیا هەنگاو و بوێری و ڕەزامەندیی مامۆستا شێخ عێزەدینی دەویست، بەڵام شێخ جەلال هەم برای بچووکی مامۆستا بوو و هەم ئەو هەژموونی و کاریزمایەی مامۆستای نەبوو بۆ ڕابەریی حیزبێکی خەتی گشتیی لەم چەشنە، دەکرا مامۆستا شێخ عێزەدین ڕابەر با و شێخ جەلال باسکی بەهێزی با، گرفت لە خودی شێخ عێزەدین و کەسایەتیی ئەودا بوو کە خۆی بۆ شتێکی وا هەرگیز ئامادە نەکردبوو، نەک هەر ئەو، بە ڕای من زۆربەی ئەو خەڵکەی دوای فەرمانی جیهادی خومەینی لە مانگی گەلاوێژ هاتنە دەر و ڕوویان لە شاخ و پێشمەرگایەتی کرد، هەرگیز بە بیریشیاندا نەدەهات کۆماری ئیسلامی زیاتر لە ٤٠ ساڵ عومر بکات. ئەوان پێیان وا بوو چەند ڕۆژێک لە شاخ دەمێننەوە و سەروەری بۆ خۆیان تۆمار دەکەن و دەچنەوە بەروبوومی ئەم چەند ڕۆژەی پێشمەرگەبوونیان دەدروونەوە.

## شەڕی شڕەخۆری و خۆخۆری

شێخ عێزەدینی حوسێنی مرۆڤێکی ڕۆحانی، ئارام و سادە، ئاشتیخواز، بێتەماح و پێشکەوتووخواز بوو. ڕوحیات و خدە و ڕەوشتی کەسایەتیی ئەو هەر لە بنەڕەتەوە ئیجازەی نەدەدا ببێتە سەرکردەیەکی مەیدانیی شۆڕشێک بە دەیان هەزار چەکدار و ڕۆشنبیر، دۆست و

دوژمن و پڕ له ڕووداو و ملشکاندن و سیاسه‌تبازی و فێڵ و یاریکردن بـــه هه‌ســـت و ئازاره‌کانی کۆمه‌ڵانـــی خه‌ڵکی تێدا بێـت. زۆر دواتر له‌م مێژووه له وتووێژێکی خۆمدا، به ڕوونی و به‌بێ شـــاردنه‌وه و زۆر به ساده‌یی ده‌یگوت:

«ئه‌من قه‌د نه‌مده‌زانی ئه‌ســڵه‌ن جه‌ماعه‌تێک که هاوڕامن، ده‌شتوانن نســـبه‌ت به یه‌کتر ئه‌وه‌نده خراپه بکه‌ن!... خۆ من ئه‌و شتانه‌م نه‌ده‌زانی، من ته‌نیا کوردایه‌تیم کردووه... ئه‌سڵه‌ن زۆر ساده و سه‌تحی بووین،... ئه‌من پێم وا نه‌بوو سیاســـه‌ت ئاوایه و...»[1]. شه‌و دره‌نگ بووبوو، لامپا کــز کــرا و به‌تانی دابه‌ش کران، تاقم و تفه‌نگه‌که‌م له بن ســـه‌رم نا و و له‌به‌ر زارکی خێمه‌که درێژ بووم، هێشـــتا چاوه‌کان گه‌رم دانه‌هاتبوون، ته‌قوتوقێکـی زۆر و زرموکوت په‌یدا بوو، به په‌له خۆم به‌ســـت و هاتم ڕاکه‌مـــه ده‌ر و بـــه‌ره‌و ته‌قه‌کان بچم، خاڵم تونـــد گرتمی و به تووڕه‌یی گوتی:

- دانیشه بۆ کوێ؟!
- ئه‌ی ئه‌وه نییه ته‌قه‌یه، شه‌ڕه، ده‌چم بزانم چییه!
- ناچی، ئه‌مه شه‌ڕ نییه، نه دوژمنی لێیه و نه هیچ!
- چۆن ده‌بێ خاڵه لێره دانیشین؟ ده‌بێ بچم بزانم چ بووه!
- لێره نابزووی، ئێستا خه‌به‌ر دێ!

هاتینه ده‌ر له خێمه‌که، هه‌ر فیشــک بوو به ئاســـمانه‌وه، دیار بوو له ســـه‌رووی ئێمه و به‌ره‌و دێ بوو، ڕووی ته‌قـــه‌کان له ئێمه دوور بوون، له خێمه‌که‌ی مامۆســـتاوه به ده‌نگی به‌رز داوای خه‌به‌ر و ســـه‌لامه‌تییان ده‌کرد، گوتمان هیچ نازانین و هه‌موو ســـه‌لامه‌تن. یه‌ک دوو خوله‌کی پێ چـــوو ته‌قه کز بـــوو، هاواریان کرد له مه‌قه‌ڕی کاک ســـمکۆی عه‌لیاریان داوه و ده‌یانه‌وێت چه‌کی بکه‌ن، نه‌مانزانی کێ هێرشی کردووه‌ته سه‌ریان.

---

١- بڕوانه، ژیان و به‌سه‌رهاتی عه‌بدولڕه‌حمان زه‌بیحی (مامۆستا عوله‌ما)- له وتووێژی شـــێخ عێزه‌دینی حوسێنی، لاپه‌ره ٣٤٣ له ڕۆژی ١٩٩٥/٨/٤دا، زۆر زیاتر له‌وه باسی تێگه‌یشتنی خۆی له سیاسه‌ت ده‌کات.

خالّم گوتی، پێت دەڵێم ئەمە شــەڕی دوژمن نییە، شــەڕی شڕەخۆری و خۆخۆرییە، ئەوە من دەزانم؛ سمکۆ چەکی لە عێراق وەرگرتووە و حیزبی دێموکــرات بۆ شــڕەخۆریی خۆی هاتووەتە ســەری بۆ ئەوەی شــتێکی دەســت بکەوێت. بەیانی ڕۆژ بووەوە، خەبەر هات، ڕووداوەکە هەر ئەوە بــوو خالّم گوتــی، جەماعەتی دێموکرات چووبوونە ســەر مەقەڕی کاک ســمکۆ زۆریــان تەقە لــێ کردبــوو، کاک ســمکۆ و جەماعەتەکەی لێیان هاتبوونە دەســت و بەرگرییان کردبــوو، هەموویان ڕاو نابوون، هیچیان پێ نەچووبوو، وا بزانم یەک کوژراو، یان بریندار هەبوو.

## سنووری باشوور

بەیانی هاتمە دەر و بۆ سەردانی ماشێنەکە ڕووم کردە سەر ئاوەکە و ئەم شوێنەی زێی بچووک بە دوو فەرعەوە تێکەڵی زێی گەورە دەبێتەوە و بــە گرڤەگــرڤ ڕوو لە باشــوور دەکات و دوو پارچە لە جەســتەی کوردستان لێک جیا دەکاتەوە، ڕووبارێکی جوان و بەجووڵە، پڕ لە وزە و ســەدا، ناویان لێ ناوە ســنوور. ئەوێ، ئەم ســنووورە دەستکردە بوو ئالانی ئەمدیوی لە ئالانی ئەودیو جیا کردبووەوە، بە جوانی ناو مووچە و مەزرا و هەموو گوندە سووتاوەکانی ئەوبەرم دەدیت، سەدام هەموو ئەم سەر سنوورانەی لە خەڵک چۆڵ کردبوو، هەموو کانیاوەکانی کوێر کردبــووەوە و بە کۆنکرێت داپۆشــیبوون، دارهەنارەکان هەناری دوو ســێ ساڵیان هەر پێوە بوو، زۆربەی داربەڕوەکان گەڵی[1] کۆنیان هەر لەنــاودا مابوو، گەڵاکان لە ناو لق و پەلکــی دارەکان مابوونەوە و هیچ خاوەن بزن و حەیوانێک نەیبردبوونەوە ماڵ لە زســتاندا. مزگەوتەکان ڕووخابــوون و دیــوارە ڕووخــاوەکان بە حاڵ بە پێوە بوون. ســەدام هەمــوو ئــەم وێرانییــەی بۆیە کردبــوو پێشــمەرگە شــوێنی نەبێ بۆ حەسانەوە و نانخواردن.

---

١- گــەڵ، گــەڵا و پەلکی دار، کە بۆ خواردنــی حەیوانات هەر لەناو خودی دارەکەدا هەڵدەگیرێت.

**سابلاغ پڕە لە پێشمەرگە**

جێبێک پەیدا بوو، چەند مامۆستای سابلاغی تێدا بوو، دەمناسین، یەک لەوان کاک سەدیق شێخانی بوو، دابەزین و پرسیاری مەقەڕی مامۆستایان دەکرد، چاکوچۆنی و هەواڵپرسین، زۆر تووڕە بوون و گوتیان ئەوە لێرە چ دەکەن، سابلاغ پڕە لە پێشمەرگە، پاسدار زاتی نییە سەر بێنێتە دەر و ئێوەش لەم سنوورە خۆتان شاردووەتەوە. زۆر بە خەبەری چالاکیی پێشمەرگە لەناو سابلاغ شاد بووم و حەجمینم نەما، بەدەست خۆم بایە بۆ چرکەیەک نەدەوەستام و دەگەڕامەوە. ڕوویان کردە لای خێمەکانی مامۆستا و باس و خەبەری شاریان بۆ گێڕاوە، داوای ئەوەیان دەکرد لە زمانی خەڵکی شار و بە نوێنەرایەتیی خەڵک ڕاسپێردراون مامۆستا لەگەڵ خۆیاندا بەرنەوە و هەموو بێنەوە ناوشار، ڕۆژی هەینی کە پێم وا بێت ڕۆژی دواتر بوو، دەبێت مامۆستا لە مزگەوتی سوور پێشنوێژیی خەڵک بکات، گوتیان چەند کەسی وەک فروهەر و ئەوانە هاتوون لەگەڵ خەڵکی شاردا قسەیان کردووە. هەڵبەت پێش ئەوەی ئێمە بێین بۆ ئالان گوتیان وەفدی حکومەت چووبوو بۆ بنوخەڵەف و بێوران و قسەیان لەگەڵ مامۆستا و دیموکرات و کۆمەڵەدا بە بەشداریی مام جەلال و کاک نەوشیروان کردبوو.

بەم هاتنەی مامۆستاکان و گێڕانەوەی خۆشیی کەشوهەوای سیاسیی ناوشار، مامۆستا شێخ عیزەدین زۆر خۆشحاڵ بوو، ئەویش لە من بەپەلەتر بوو بۆ چوونەوە، یەک دوو لە مامۆستاکان گوتیان، بێ مامۆستا شێخ عیزەدین ناچینەوە، دەبێت لەگەڵماندا بگەڕێتەوە. بوو بە کۆبوونەوە و سرتوخورت و ڕاوێژ و چ بکەین و چ نەکەین، زۆربەیان لەگەڵ ئەوەدا بوون مامۆستا ساز بێ و بچێتەوە و لە مزگەوتی سوور خەڵکێکی زۆر کۆکەنەوە و ببێتە پەیامێک بۆ تاران و بۆ خومەینی، کە کورد وا یەکدەنگ داوای مافە ڕەواکانی خۆی دەکات و مامۆستا ڕابەری دینی و سیاسیی گەلی کوردە.

## دیموکرات ویستبووی هەر خۆی بێت

هەر لــە کۆبوونەوەکانی بنوخەڵف لەگەڵ وەفدی دەوڵەتدا، گەلاڵەی دروســتکردنی دەســتەی نوێنەرایەتیــی خەڵکی کورد شــرۆڤە کرابوو، گیروگرفتەکە ئەوە بوو کێ بەشدار بێ و کێ نەبێ. لە دەستپێکدا حیزبی دیموکرات ویســتبووی هەر خۆی بێت و تەنانەت گفتوگۆشــی کردبوو، دواتر مامۆســتا گوتبووی دەبێت هەموو ببن لە دەســتەی نوێنەرایەتی، دوکتۆر قاسملوو ڕازی بووبوو کۆمەڵەی تێدا بێت بەس چریک پێویست نییە، ئیتر هەرچۆنێک بێت بە پێداگریی مامۆستا و تەداخولی مام جەلال هەیئەتــی نوێنەرایەتیی کورد بە بەشــداریی مامۆســتا وەک ســەرۆک، دوکتۆر قاســملوو وەک سوخەنگوو (قســەکەر)، کۆمەڵە و چریک وەک ئەندام، دروست کرابوو.

## ئێمە عەلاقەی نوێژی جومعەمان چییە؟

مامۆســتا خۆی کۆدەکردەوە وەڕێ کەوێت بەرەو مەهاباد، زەبیحی زۆر دژی وەســتایەوە و گوتــی، نابێ ڕێبەرەکان بچنەوە شــار و نابێ ئاگربەس قبووڵ بکرێت، با وتوویژ هەبێ و پێشمەرگە درێژە بە شەڕ و چالاکیی خۆی بدات، تاکو پێشمەرگە زیاتر سەرکەوتن بەدەست بێنێت، ئێمە لە ســەر مێزی دانوســتان بەهێزتر دەبیــن و دەتوانین داواکاریی زیاترمــان لێیــان هەبێــت، ئێمــە عەلاقەی نوێــژی جومعەمــان چییە؟! هاتووین سیاســەت دەکەین و مافەکانی خەڵکی کورد دەستەبەر بکەین، یــان هاتووین بۆ نوێژکــردن؟! زۆر تووڕە بوو، بەس زۆر تەنیا بوو لە بۆچوونەکانــی و هەمــوو جەماعەتی دەفتەری مامۆســتا لەگەڵ ئەوەدا بوون مامۆســتا بچێتەوە، ئیتر زەبیحی زانیی قســەی ناڕوات، بێدەنگیی لێ کرد و گوتی، کەیفی خۆتانە.

دوکتــۆر جەعفەر گوتی دەبێــت ئێمەش زوو بڕۆینەوە و دەنگوباس زۆرە، بچینــەوە لای کــوڕەکان باشــترە. بەرەو بــۆکان هاتینەوە، دیار

بوو پێشــمەرگە لە ناو بۆکان بوون، چووینە ناو شــار، پێشمەرگەکانی کۆمەڵــە لــە پێشــەوە بەرەو جــادەی میــراوا مەقەڕێکیان لــە بینایەکی دووقات کردبووەوە. دوکتۆر گوتی زۆر بێ وەســیلەین و ســەیارەمان لازمــە، گوتم دەچــم بۆ میاندواو، یان ســەقز ماشــێنێک دێنم، دوو دڵ بــوو لە ناردنم، گوتی دە باشــە ئەم کوڕە هاتووە بۆ پێشــمەرگایەتیی خەڵکی ســەقزە ببە و بچن. ڕەحمان غولامی کوڕێکی جەوانی بەزەوق و بەهێز، خۆم گۆڕی و جلی پێشــمەرگانەم دانا و بە کراس و شەرواڵ و دەمانچەیەک ڕۆیشــتین بۆ ناوشــار، لە جادەی ســایلۆ جیبێکی زۆر تازەی ئیدارەی کەشــاوەرزی بە بەردەماندا ڕۆیشــت، لــە گەڕانەوەیدا ڕامانگرت و بەزۆر شــۆفێرمان هێنایە خــوار، بە خێرایی جادە و جادە بــەرەو بۆکان لێمخوڕی و کەس پێی نەزانــی. هاتینەوە بۆکان و جیبی تازەی شابازمان تەسلیمی دوکتۆر جەعفەر کرد.

# ١٦

### مەقەڕ لە سەقز

بـۆ ڕۆژی دوایـی ئەبوو شـاهین هاتـەوە بـۆکان، کۆبوونەوە کرا «حـەوت دەروێشـەکەی سـەقز» جیا لە موعتەسـەم تاتایـی هەموو چووبوونە تورجان بۆ مەقەڕدانان، بۆیە بڕیار درا هەموو مەفرەزەکەی ئێمە و موعتەسـەمیش، بە فەرماندەیی ئەبوو شـاهین بچینە سەقز و لە ناوشار چالاکی بکەین. ئێوارە درەنگ بە تاریکی لە ساڵحئاواوە، دێیەکی نزیک شارە بە پێیان چووینەوە ناوشار، موعتەسەم شارەزایی تەواوی هەبـوو لـە مەقەڕی پاسـداران و گوتی لە شـوێنە کۆنەکەی سـاواکە، جێی چاکە و مەجالی زۆرە بۆ لێدانی. لەگەڵ ئەبوو شـاهیندا لێی نزیک بووینەوە بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە. شەو درەنگ دوو مووشەکی بازوکامان پێوە نان، ئاگر لە بینا و ناوەوە هەسـتا و دەسـتمان کرد بە تەقە و هەموو خەڵکی شـار لێمان کۆبوونەوە. دوای پێشوازیی گەرمی خەڵکی سـەقز لە ناو کۆڵان و شـەقامەکان گوتمان بـا نەچینە دەر. وا دیارە پاسـدار ورەی نەماوە. چووینە ماڵی موعتەسەم، ماڵێکی خانەدان و بەحورمەت و دڵسـۆز و میهرەبان، زۆریـان خزمەت کردین، بەیانی هەوادارانی شـار هاتن و گوتیان شـار زۆر ئارام و خۆشـە و پاسدار هیچـی دیار نییە، لەگەڵ کوڕەکانی سـەقز و مەفرەزەکـەی مەهاباددا؛ حوسـین سوهەیلی، سەعید گەوهەری، سـولەیمان مودەڕەسی، ڕەحیم قـادری، عەلی ڕەش و... چەند هـەواداری کۆمەڵە هاتینە مەیدانی هەڵۆ، وەک ڕۆژی شـادی و جێژنـی لێ هـات، بینایەک لە سـووچی مەیدان بەتـاڵ بـوو، ئیـی ئیدارەیەک بوو، گوتیـان زۆر جێی باشـە با بیکەین بە مەقەڕ. دەسـبەجێ هەر خەڵک و هـەوادارەکان خاوێنیان کردەوە و شـتومەکیان بۆ هێنا و بۆ یەکەم جار مەقەڕی کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕ لە

سەقز کرایەوە. یەک دوو ڕۆژ لە سەقز لەگەڵ ئەبوو شاهیندا بەیەکەوە شەو لە ماڵی موعتەسەم بووین.

شێخ عەلی و حەمەعەلی و دلێر و فاروق بللوری چەند ڕۆژێک بوو لە بۆکان بوون و مەفرەزەکەی ئێمەیان جێ هێشتبوو. کوڕگەلی سەقزی ئیدارەی مەقەڕیان گرتە ئەستۆ و ژمارەیان هەر لە زیادبووندا بوو. خۆمان بەرەو مەهاباد کەوتینە ڕێ.

ئێوارە درەنگ بە لای کۆنەدێ و لاچین و سەیداوادا خۆمان بە مەجبوورئاوادا کرد، مەجبوورئاوا گەڕەکێکی دەرەوەی شار بوو، لەو ئاخریانەی سەردەمی شادا، خەڵکی هەژار زەوییان لێ دەکڕی و خانووی فەقیرانەیان لێ دروست دەکرد، واتا ئەوانەی مەجبوور بوون دەچوونە ئەو گەڕەکە، بووبوو بە گەڕەکی ئاخری شار و ئێی فەقیر و هەژاران. کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی شار و پاڵی وەگوندی سەیداواوە داوە و ئێستا یەک لە گەڕەکەکانی شارە.

سیمورغمان لە ماڵی دۆستێکمان لە سەیداوا جێهێشت و بە پێیان و بە حەزەر و کەمیندەرکردن کەوتینە ناو گەڕەکەکانی شار؛ بە مەجبوورئاوادا بۆ سێئاشان، بۆ مەلا جامی و سەربەرداشان و لەوێڕا بۆ لای کورتانفرۆشەکان، ئەوجار بۆ لای مزگەوتی حاجی ئەحمەد و مزگەوتی عەجەمان و مەیدانی ئاسنگەران. لە ڕۆژهەڵاتی سابڵاغەوە تا ناوەڕاستی هەر هەمووی هاتین و هیچمان نەدی. لە زارکی ناوبازاڕی مەنگوڕان شوێنی کۆنی کەبابی حەمەشەل یەک یەک پەڕینەوە بۆ کۆڵانی دەرمانخانەی ئەیووبیان بۆ لای ماڵی خۆمان.

### ڕەحمان لەناو قوڕەکەدا

پاییزان خەڵک قوڕی سواغیان دەگرتەوە بۆ سواغی بان و دیواران، چەند ڕۆژ کایان تێ دەکرد و لە ناو کۆڵان جێیان دەهێشت بۆ ئەوەی بترشێت، پێش هەورازی ماڵی دوکتۆر داود و باپیرم کۆڵانی سینەما ئومێد هەبوو، لە سەرووی کۆڵانەوە شۆقی لایتی سەیارە پەیدا بوو،

هەمــوو بڵاوەمــان پــێ کــرد و هەریەکەمان لــە بندیــوار و دەرگایەک سـەنگەرمان گـرت و دەسـت بە تفەنگ خۆمـان ئامادە کـرد، پیکابێک بە تەنیشـتماندا تێپەڕی و ڕۆیشـت، هاتینە دەر و خۆمان کۆ کردەوە، ڕەحمان تەڕەغە دیار نەبوو، بە تاریکی گەڕاین بەدوایدا، کۆڵانی سینەما ئومێد پڕیان کردبوو لە قوڕی سواغ، ڕەحمان نەیدیبوو بە دەمەوە خۆی فڕێ دابووە ناو قوڕەکە و دەرنەدەهاتەوە، هەرچۆنێک بێ هێنامانە دەر بەس تەواوی گیان و جل و تفەنگی قوڕێکی خەسـتی وەسـەر کرابوو. گوتم، ئێسـتا دەگەینەوە ماڵی خۆمان و لەوێ دەیگۆڕین و دەیشۆرین، تا کاتی گەڕانەوەمان بۆ دەرەوە ویشک دەبێتەوە.

### نازانی کێ لێرەیە؟!

لــە دەرگای خۆمانم دا و کوڕەکان هەریەک لە پەنایەک خۆیان مات کرد، شـەهید نەرمینی خوشـکم دەرگای کردەوە و لە خۆشـیی ئەوەی منی دیت باوەشی پێدا گرتم و لە پرمەی گریانی دا، بە بێدەنگی هەموو چووینــە ژوور، دایکـم و بابم هاتنە دەر و زۆر شــاد بوون، ڕەحمانی سواغکراومان ناردە حەمام و جلەکانی داندرا بۆ شۆرین، خەریک بوون نــان و چامان بــۆ ئامادە بکەن کاکم هاتەوە و سـەیارەکەی هێنایە ناو حەوشــەکە، ئەویش لەخۆشـیی ئەوەی من و پێشـمەرگەکانی بینییەوە زۆر خۆشــحاڵ بوو، بۆم گێڕاوە لە کۆڵانی خۆمان چمان بەســەرهات و ڕەحمــان چیــی لێ هات، گوتی ئەم پیکابەی لێی ترســاون، من بووم، ســولەیمان لێرە بوو گەیاندمــەوە ماڵی خۆیان، هەر ئەوەمان پێ مابوو هەمــوو لــە قاقای پێکەنیــن بدەین، دەســتی بۆ تەلەفۆن بــرد و گوتی، سولەیمان حەیف چووەوە، نازانی کێ لێرەیە؟!

### هەر پێشمەرگە بوو لە باوەش دەگیرا

بە بیســتنی فــەزای ناوشــار و هاتوچۆی پێشـمەرگە، قەرارمان دا نەچینەوە دەر و ئەو شەوە لە ماڵی خۆمان بین، بەیانی زوو سولەیمان

هات و بە وردی خەبەری ناوشاری بۆ گێڕاینەوە، وەک شەڕی حیزبی دێموکرات لە لای حەمامی مەولەوی، ڕۆژی پێشـــووش لە دەبابەیەکیان دابوو و هەتا ئێستا بە سووتاوی لە سەر جادەیە. گوتمان با ئێمەش لە ناوشـــار چالاکییەک بکەین، ســـولەیمان ڕۆیشت و لەگەڵ ئەبوو شاهین گەڕایـــەوە، لێـــدان لە ژاندەرمەری مەهاباد بۆ شـــەو بە مووشـــەک بوو بـــە بەرنامەمان. بۆ ئێوارە هەموو ســـاز بووین و بە فەرماندەیی ئەبوو شاهین بە کۆڵانەکاندا چووین بۆ دەوری ژاندەرمەری لە جادەی خانەی جەوانـــان، دوور و نزیـــک ســـەرمان بە چەنـــد ماڵ و ســـەربانێکدا کرد، ئەبوو شـــاهین لە شوێنێکی باش دەگەڕا بۆ دامەزراندنی مووشەکەکان، سەربانێکی دیتەوە و چووین دوو مووشەکەمان دامەزراند و وایرەکانی هێنا خوار بۆ ئەوەی بە باتری وەســـڵ بکەین، هەموو شـــت ئامادە بوو، وەســـتاین کەمێکـــی دی شـــەو درەنـــگ بێـــت. ئەبوو شـــاهین هەر دوو مووشـــەکی یـــەک بەدوای یەکدا تەقاند و هـــەر دوو وەناو ژاندەرمەری کەوتـــن، دەنگی مووشـــەکەکان تەواوی شـــاری هێنایە لـــەرزە، ئاگر لە ژاندەرمـــەری بـــەرز بـــووەوە و تەقوتۆق و دۆشـــکە دەســـتی پێ کرد، ئێمـــەش دەســـتمان کرد بە تەقەکـــردن لە دار و دیـــواری ژاندەرمەری. خەڵکی هەمووی هاتبوونە دەر و هەر پێشمەرگە بوو لە باوەش دەگیرا، نان و شـــەربەت و شـــیرینی و میوە دەهات بۆ پێشـــمەرگەکان، خەڵک ترســـی ڕەوییبـــووەوە و زۆر ئـــازا بووبوونەوە و دروشـــمی مەرگ بۆ خومەینی هەموو شاری گرتەوە.

گەڕاینـــەوە مـــاڵ و ئیتر قەراری مانەوەمان لە شـــار درابوو. بەیانی ســـولەیمان هاتـــەوە و گوتی چەند لـــە کوڕەکانی ســـەرەوەش هاتوون و لـــە ماڵی عەبووی برامن. باســـی ناوشـــاری بۆ کردیـــن، وا دیار بوو پێشـــمەرگەی دییش لەناو شـــاردان و دێن و دەچن. گوتـــم، مادام وایە من دەچمە سەیداوا و سیمورغەکە دێنمەوە. سولەیمان زۆری پێ باش بـــوو و گوتـــی دێم لەگەڵتدا و بێتوو بەم ســـیمورغە کە ئیی پاســـداران بووە جەولەیەکی ناو شـــار بکەن بە پێشـــمەرگەکانەوە زۆر بانگەشەی

بـاش دەبێـت بۆ کۆمەڵە. لەگەڵ سـولەیمان و یەک لە پێشـمەرگەکاندا کاکم ئێمەی گەیاندە سەیداوا، کاک حوسێن سوهەیلی و پێشمەرگەکانی دیکەمان جێهێشت بۆ خۆئامادەکردن بۆ جەولەی ناوشار.

دوانـزە یـان سـێزدەی مانگـی خەزەڵـوەری پاییـزی ١٩٧٩ بوو، خۆرێکی گەرم و خۆش، ئاسـمانێکی شین و ساف سابڵاغی داگرتبوو، سـیمورغمان هێنایـە ناو حەوشـەی خۆمـان، هەموو سـوار بووین و بۆ ناو شـار. پێشـمەرگەکان لە پشت سـەیارەکە و بە چەک و ڕەختی پێشـمەرگانەوە هەر هەموو شـانازیمان بە خۆمانەوە دەکرد و خۆشی و شـادی هەمووهانـی داگرتبـوو. هەر ئەوەنـدە هاتینە سـەر خیابان و چوارڕێـی ئـازادی، ئیتر بوو بە شـایی و لۆغان، سـەدان کەسـمان لـێ هالان و بـە باوەش و ماچکـردن کۆنترۆڵمان بەسـەر وەزعەکەدا نەما، سـولەیمان زۆر بە پەلە چەند لە کوڕەکانی ڕێکخسـتنی ناوشاری ڕاسـپارد لە دەورمان بن و ئـاگاداری بارودۆخەکە بن. خەڵکم دیت لە خۆشـیان سـیمورغەکەی ماچ دەکرد، پرسیار بەدوای پرسیاری لاوان؛ چەند کەسی تێدا بوو؟ هەموو کوژران؟ چەند تفەنگ و...؟!

دوای وەسـتانمان لە شـوێنە شلوقەکانی ناوشـار، ڕێمان گرتە بەر بەرەو ماڵی کاک حوسێن سوهەیلی لە لای فەلەکەی تەلەفزیۆن، دایکێکی میهرەبان و خۆشەویسـت، نانی بۆ هەموان ئامـادە کردبوو. قەرارمان دا ببینە دوو دەسـتە و نەچینە دەر و پەیوەندی بە پێشمەرگەکانی دیی ناوچەی سابڵاغەوە بگرین و بەشێک لە ماڵی ئێمە و بەشێکیش لە ماڵی حوسێن سوهەیلی بمێنینەوە.

سولەیمان ئاگادار بوو سـەرکردایەتیی کۆمەڵە وەک کاک عەبدوڵڵا موهتەدی، سەید برایم عەلیزادە، دوکتۆر جەعفەر، کاک سەدیق کەمانگەر و یوسف ئەردەڵان لەگەڵ سەید و ڕزگار و پێشمەرگەکان هاتوون و لە ماڵی عەبووی برای نیشتەجێی کردوون. لەگەڵ سولەیماندا چووین و لە ماڵی عەبوو لە گەڕەکی «بێگی» لە یەرغوو هاوڕێیانمان دی و زۆریان گەڕانەوەی ناو شار و چالاکیی لێدانی ژاندەرمەریان پێ باش بوو.

گوتیان جەماعەتی مامۆستا و دەفتەرەکەی هاتوون و لە ئاجیکەندن، بەیانی چواردەی خەزەڵوەری ١٣٥٨ (پێنجی نۆڤەمبەری ١٩٧٩) دێن بۆ شـــار و مامۆستا دەچێتە مزگەوتی سوور، دەبێت هەموو خەڵک ئامادە بن و بچن.

## مەقەڕی ڕەسمی

دیـــار بوو وەفدی حکومەت دێن و لەگەڵ دەســـتەی نوێنەرایەتی لە ســـابڵاغ کۆ دەبنەوە، هەر بۆیـــە هاوڕێیانی ســـەرکردایەتیی کۆمەڵەش هاتبـــوون. گوتیـــان، دەبێت دەفکـــری مەقەڕدا بین و لەومـــاڵ و ئەوماڵ ناکرێـــت. هەمـــوو وەدوای شـــوێنێک کەوتین گونجاو بێـــت بۆ مەقەڕی کۆمەڵـــە. پاش پـــرس و ڕا و وەدواکەوتن، ماڵـــی کابرایەکی عەجەم کە هەڵاتبـــوو، کازم ئاغایـــان پێ دەگوت، چۆڵ و کەمێکیـــش وێرانکرا بوو. پێشتر لە شەڕی ناوشار فیشەک و ئار پی جی و هاوەنی بەرکەوتبوو، لە پشـــت ئیدارەی تەربێـــت بەدەنی بوو. هەرەوەزمان دەســـت پێ کرد و مەقەڕمـــان، کـــە بینایەکی دوونهۆمـــی بوو، ئامادە کـــرد. ئەوە یەکەم مەقەڕی ڕەسمیی کۆمەڵەی شۆڕشـــگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بوو لە مەهاباد.

ئیشوکاری ئەم دوو دەستە پێشمەرگەیەی مەهاباد ئێتر زیادی کرد و دەبوو شەو و ڕۆژ مەقەڕ ئاوەدان و حەراسەت بکرێت.

دیسان مەهاباد بوو بە مەرکەزی ڕووداوەکان و بڕیارە سیاسییەکان. پڕ بووەوە لە بنکەی حیزب و ڕێکخراو و سازمانەکان.

## خومەینی نەیهێشت بانک ببڕین

دوکتـــۆر جەعفەر گوتـــی؛ لەگەڵ ئەبوو شـــاهیندا خۆمان بگۆڕین و بچین بۆ سنە و بانکی میللیی سنە تاڵان بکەین. قەرار لەگەڵ ڕێکخراوی ناوشاری سنەدا داندرابوو، دەبوو من و ئەبوو شاهین بچین و جێبەجێی بکەین. بە جلگۆڕاوی و بە نهێنی چووینە ناوشار و بۆ سەر قەرار، شار

لەژێر کۆنترۆڵی حکومەت و پاسداردا بوو. نازانم بیرم نەماوە سەی عەلی بوو یان عەلا بەرپرسێکی باڵای ناوشار و نهێنیی کۆمەڵە بوو لە سنە، هات و ئێمەی زۆر بە گەرمی بەخێرهاتن کرد و بردمانی بۆ ماڵێکی کۆن بە حەوز و حەوشەیەکی گەورە و کوڵەکە و پەنجەرە و دیواری خشتی قەدیمی. چەند کەسی دیکەش هاتن و باسی پلانەکەیان کرد، ئێمەیان برد بۆ ناو بانک و ئەبوو شاهین بە چاوی موشتەری و زۆر پسپۆرانە تێی روانی و بە زمانە فارسییەکەی خۆی گوتی، «ئاسونە»، واتە ئاسانە و بەیانی زوو ئەنجامی دەدەین. شەو لەو ماڵە چەند ئەندام و هاورێی کۆمەڵە هەموو لێمان کۆ بووبوونەوە، ئەگەر هەڵەم نەکردبێت یەکیان دواتر زانیم ئیرەج فەرزاد بوو. قسەمان دەکرد لەناکاو لە تەلەفزیۆن و رادیۆ قسەکانی خومەینیی بۆ مەزڵوومییەتی خەڵکی کورد بڵاو کرایەوە، باسی ئاشتی و دانی مافەکان بە میللەتی کوردی کرد، رێک پێچەوانەی فەرمانی جیهادی بیستوهەشتی گەلاوێژی سێ مانگ پێش. لە رۆژی حەڤدەی مانگی نۆڤەمبەری ٧٩ (بیستوشەشی خەزەڵوەری ٥٨) بەم وتارەی خومەینی شەر وەستا و کۆتایی بە شەری سێ مانگە هات. کۆمەڵەش بریاری دا لێدانی بانک راگرین و لەگەڵ ئەبوو شاهیندا بگەرێینەوە مەهاباد.

لە سنە و هەموو شارەکانی دیکەی کوردستان بنکە و مەقەراتی هێزە سیاسییەکان و پێشمەرگە بە ئازادی کرانەوە و دەستەی نوێنەرایەتی گەلی کورد و حکومەت لە مەهاباد کەوتنە دانوستان.

## ١٧

**گەڕانەوەی شێخ عێزەدین**

هاتنەوەی مامۆستا شێخ عێزەدین و دەفتەرەکەی، سەرکردایەتیی حیزبی دێموکرات، کۆمەڵە و چریکی فیدایی، دیسان سیمای شاری مەهابادی تەواو گۆڕی. کۆبوونەوەی جەماوەری و کۆنگرە و خۆپێشاندان دەتوانم بڵێم ڕۆژانە هەبوو. ڕۆژی چواردەی مانگ، کە مامۆستا هاتەوە، زەبیحیی لەگەڵدا بوو، ئەو نەچووبوو بۆ مزگەوت و ناو کۆبوونەوە فراوانەکەی خەڵک، یەکسەر هاتبووەوە و لای دایکم بوو. گۆیا زۆر بەم هاتنەوە و ئاگربەستە ڕازی و شاد نەبووە. ئەمە دابڕانی پەیوەندیی نێوان مامۆستا و زەبیحی بوو، کە زۆریشی نەخایاندبوو، تەنیا دوو سێ مانگ بوو، لە ماوەی چەند مانگی پێشوودا پەیوەندیی نێوان مامۆستا شێخ عێزەدین و دەوڵەتی عێراق هەر وەک لەگەڵ حیزبی دێموکراتیشدا هەبوو، دروست بووبوو. زەبیحی بۆ عیلاقات و کاری سیاسی لەم ماوە کورتەدا کە لەسەر ڕاوێژی مام جەلال کردی، دەفتەری مامۆستای زۆر بەدڵ نەبوو، زۆرتر شێخ جەلالی برای بە لاوە بۆ سیاسەت لا پەسەند بوو. هەر بۆیەش بەیەکەوە دواتر بە بێ دەفتەری مامۆستا چەند جار هاتوچۆی بەغدایان کرد و یارمەتیی ماڵی و چەکوچۆڵیان وەرگرت. زۆربەی ئەم یارمەتییانەی وەریان دەگرت بەشێکی باشی بۆ یەکێتیی نیشتمانی و مام جەلال دەچوو.

بەدوای گەڕانەوەیان بۆ شار، زەبیحی زۆرتر لە ماڵەوە دادەنیشت و خۆی بە فیشی وشەکانی قامووسەوە مژووڵ دەکرد. خەڵک و کەسایەتییەکانی ناوەوە و دەرەوە سەردانیان دەکرد، دوو بەرگی «ء» و «ب» بڵاو کرابوونەوە، بەرنامەی بوو بچێتەوە بەغدا و بەرگی «پ» و سێهەم بە چاپ بگەیەنێت. هەوڵی دا لە ڕێگەی دووبارە تازەکردنەوەی

شوناسنامه کۆنەکەی لە ئیدارەی سجیل، پاساپۆرتی ئێرانی وەرگرێت و بەم ڕێگەیە بچێتە ئەورووپا و دەرەوە. لەگەڵ کاکم چوون بۆ ڕەزاییە و داوای پاسپۆرتیان کرد، وا بزانم پێیان نەدا، یان دەبوو چاوەڕێ بکات. یەک دوو جار هەر بە لای شـێخ جەلال و قەڵادزێدا هاتوچۆی بەغدای کـرد. جارێکیـان خەبەر هات بۆ مەهاباد و دەفتەری مامۆسـتا؛ شـێخ جـەلال و زەبیحی لـە مەریوان حیزبی دێموکرات گرتوونی و دەسـتی بەسـەر ئەو چەکانەدا گرتووە کە پێیان بووە. ئێمە کەوتینە جموجووڵ و مەعلـوم بوو زەبیحی خۆی بەدەسـتەوە نـەداوە و بۆیان نەگیراوە، بەڵام شێخ جەلالیان گرتبوو بە هەموو بارە چەکەکەوە. دواتر مامۆستا شـێخ عیزەدین تەداخولی کرد و گەڕانەوە بۆ مەهاباد، گوتیان بەشـێک لـە چەکەکانیـان تالان کردبـوو، ئەم ڕووداوە هێندەی تر نێوانی شـێخ عیزەدین و زەبیحی و حیزبی دێموکراتی شلوێتر کرد.

حیزبـی دێموکـرات وەک حیزبێکی کۆن خۆی بـە تەنیا بەرحەق و درێژەپێـدەری ڕێگەی کۆماری کوردسـتان و قـازی محەمەد دەزانی، پێـی وا بـوو خەباتی گەلـی کورد لە ڕۆژهـەڵات تەنیا بۆ ئـەوان تاپۆ کـراوە و هیـچ کەس و لایـەن و حیزبێک بۆی نییە بەسـەر ئەواندا باز بـدات و ئیدعای نوێنەرایەتیـی خەڵکی کورد بکات. ئـەم بەرچاوتەنگی و بڕوانەبـوون بـە فـرە حیزبی و مافـی ئەوانی دی وای کـرد ڕۆژانە بەریەککەوتن لە نێوان حیزبی دیموکرات و هەر هەموو لایەنەکانی دیکە ڕوو بدات. تەنانەت پەیوەندیگرتن بە دەوڵەتێکی جیرانی وەک عێراق لە ڕوانگـەی ئەوانـەوە تەنیا بۆ خویان ڕەوا بوو، زۆریان پێ ناخۆش بوو خەڵک و گرووپی وەک سـمکۆ عەلیار، دەفتەری مامۆستا، شێخ جەلال، یـان کۆمەڵە و چریک فێری ئەوە بن، پەیوەندی بگرن و بچن بۆ عێراق بۆ وەرگرتنی یارمەتی و چەک و پارە.

ئـەم بیروبۆچوونەی حیزبی دێموکرات لەسـەر سـنووردار کردنی ئـەم هێـز و لایەنانە دواتر چەندیـن ڕووداوی دڵتەزێنـی لێ کەوتەوە، وەکهێرشـی سـەر سـمکۆ و کـوڕی ڕەش (عەلـی قـازی محەمەد)،

هێرشـــی سەر مەقەڕی ســـازمانی پەیکار لە بۆکان و کوشتنی ئەندامان و ئاگرتێبەردانـــی مەقەڕەکەیـــان و دواتریـــش شـــەڕی ماڵوێرانکـــەر و چەندساڵە لەگەڵ کۆمەڵەدا.

## حامد بەگی جوانڕۆ

کەســـایەتییەکی کۆنـــی یـــادگاری کۆمەڵەی ژێکاف، بـــە ئەزموون و ئاشـــنا بە هەموو وردەکاریی پەیوەندیی ســـەرانی حیزبی دێموکرات و دەوڵەتـــی عێراق، دیپلۆماتکار، لێزان لـــە وەرگرتنی یارمەتی و عیلاقات وەک ئۆپۆزیســـۆن، تـــەواو حیزبی دێموکراتی نیگـــەران کردبوو. ئەوان پێیان خۆش نەبوو جیا لە خۆیان کەس فێری عیلاقات لەگەڵ دەوڵەتێکی وەک عێراقـــدا ببێـــت بە بیانـــووی «دوژمنی دوژمنم دۆســـتمە» و بچن چـــەک و پارە وەرگرن، کە ئەم دوو شـــتە دوو هۆکاری باش بوون بۆ بەهێـــز بوون. ئەوان دەیانزانی خەبیرێکـــی دیپلۆماتکاری وەک زەبیحی بۆ ئەم کارە زۆر زیاتر لەوان شارەزا و لێزانترە، هەر بۆیە هەرگیز بە بوونی لە مەهاباد و لە تەنیشـــت مامۆســـتا شێخ عیزەدین و مام جەلال و هەروەتر کۆمەڵە، نە تەنیا شـــاد و ڕازی نەبوون بگرە زۆری تووڕە دەکـــردن. کاتێک چریکی فیدایـــی وەک ڕێکخراوەیەکـــی غەیرە کورد و تەنانـــەت میـــوان، زۆر لەناکاو بەخـــۆی ڕادەپەڕموێ بچێـــت لە هۆتێلی ناوشـــاری مەهابـــاد، حامد بەگی جوانـــڕۆ، میوانی تایبەتـــی زەبیحی و دۆســـتی کۆنی مـــام جەلال لـــە ژووری هۆتێل بێنێتـــە دەر و دواتریش بـــە نێوی پیـــاوی بەعس بیگرێ و ئیعدامی بـــکات، حیزبی دێموکرات نە تەنیا هیچی نەگوت، بەڵکو هەر ئەوکات پەیمانی ســـتراتیژی و هاوکاری لەگـــەڵ چریکەکان ئیمزا دەکرد! چریکی فیدایی پشتئەســـتووریی حیزبی دێموکراتـــی نەبایە، ئەوە نەبوو لەو کاتەدا لـــە ناوجەرگەی مەهاباد، کە مەکۆی ســـەرەکیی دێموکرات بوو، دەســـت بۆ کاری وا بەرێت و پێ لە بەڕەی خۆی درێژتر بکات!

چریکەکان بەیاننامەیەکیان بڵاو کردەوە و تێیدا هاتبوو:

(حامـد بەگ پیاوی «دوکتـۆر عەبدولڕەحمانی زەبیحی» سـەر بە بەعسی عێراق بە فەرمانی چریکە فیدائییەکان گیرا).

دوای نزیک بە چل ساڵ ڕەنگە حەق بێت بپرسین؛ تۆی چریک تەنیا چەند مانگێکە هاتووی بۆ کوردسـتان، خەریک بوو تەسلیم دەبوویەوە بە خومەینی، جگە لە چەند لاوێکی کوردی بە لای خۆتانەوە «ناخودی»، دەنـا هەر هەمووتان غەیرە کوردن، ئەوە بۆ نەتانزانی زەبیحی دوکتۆر نییـە و حامـد بەگ بۆ پیاوی ئەوە و بۆ دەبێـت ئیعدام بکرێت؟! چریک بەبێ ئەوەی بزانێت ئەم مرۆڤە کێیە و پەیوەندیی بە زەبیحییەوە چییە، زۆر بێتاوان و بەبێ بەڵگە و دادگا، لەوپەڕی ناجوامێریدا کوشتیان.

تـرس و بێئەزموونیـی شـێخ عیزەدیـن و کۆمەڵـە، لـە دەنگـۆی بانگەشـەی بەعسـیبوونیان، لە لایـان دەوڵەت و تـودە و چریک، وای کرد ئەوان بێدەنگ بن. دیموکرات بە ئاشـکرا لە بەغداوە هاتبووەوە، لە سەردەمی شەڕی سێ مانگە و دواتریش پەیوەندی و هاتوچۆی بریندار و کادرەکانـی لەگـەڵ دەوڵەتی عێراقدا نەدەشـاردەوە، کەچی زۆربەی وتار و هێرشـی ئیعلامیی کۆمەڵە بۆ سـەر حیزبی دیموکرات، وابەستە بـوون و پەیوەنـدی لەگەڵ بەعسـدا بوو. هەرچەنـد زۆری نەبرد هەر هەموو ئەوانی تریش بە کۆمەڵە و تەنانەت کەسایەتییەکانیشەوە، بەرەو بەغـدا چوون و تیـۆری پەیوەندی بە «دوژمنـی دوژمنمەوە» زۆر بە گەرمی وەرگیرا!

### بێهیوابوونی زەبیحی

لـە ئاخروئۆخـری پاییـزی ١٩٧٩دا و دوای شـەڕی سـێ مانگە و وەستانی تەقە لە نێوان کورد و تاراندا، کردنەوەی مەقەڕەکانی پێشمەرگە و هاتنەوەی سـەرکردایەتیی حیزبەکان بۆ شارەکانی کوردستان، دیار بوو لە کەس شاراوە نەبوو، تاران درۆی دەکرد و دیسان خۆی ئامادە دەکردەوە بۆ هێرشی سەر کوردستان.

بەدوای ئەم ڕووداوانە و کەس بە کەسـی سیاسـەت و سـتراتیژ و

بەرنامــەی کورد لــە بەرامبەر دوژمنێکی وەک تاران و هێزی شــیعەی دەمارگرژ، ڕوخســاری بێئەمەل بوون و نائومێدی بە زەبیحییەوە دیار بوو، لە مەیدانی شەڕ و سیاسەت و هەڵەشەبوونی نەوەی تازە و دنیای موزایدە و درۆ و فشــەکردن بۆ کوردایەتی کەس حیســێبی بۆ پیاوێکی وەک ئــەو، کــە قاڵبووی ژیانی حیزبی و سیاســی و دیپلۆماســی بوو، نەدەکــرد. لاوانی حیزبــی تودە و دێموکرات زۆریــان دیعایە و تۆمەت و ناتۆرە بڵاو دەکردەوە لەمەڕ بەعســی و ســەر بە مام جەلال بوونی. زەبیحی زۆر زوو بە ماوەیەکی کورت، کە دوای ٣٣ ساڵ لە پاش ژێکاف و کۆمار گەڕابووەوە مەهاباد، تێگەیشــت ئیتر ئەو فەرامۆشکراوە و لە دنیای سیاسەتی منداڵەورتکە و هاتوهاواری حیزب حیزبێنەی سەردەم جێی نابێتەوە، هەر بۆیە بە هاتنەوەی لە ئالان و وەســتانی تەقە، خۆی دوور کردەوە و وازی لە دەفتەری مامۆســتا شێخ عێزەدین هێنا، خۆی لە نیشــتمان و شــاری خۆی غەریب دەدیت، ئیتــر دەیزانی ڕۆژهەلاتی نیشــتمانەکەی، ئەو بە بێگانە و نامۆ دەزانێت و شــوێنێ بۆ ئەو نییە و دڵیشــی زۆرتر لای کۆنە هەوار و دۆستانی گەرمیانی بوو. گەڕایەوە و هەرگیز نەگەڕاوە بۆ کەونە نیشتمانی خۆی سابلاغ.

فێـڵ و تەڵەکــەی سیاســەتباز و ترســەنۆکی و نەزانــی دۆســتانی ڕۆژهــەلات، تەمــاح و بەکارهێنانی خراپی کۆنەهاوڕێ و ســەرکردەی باشووری، هەر هەموو بەیەکەوە زەبیحییان نادرە باوەشی ئەهەریمەن و جەللادی زەمانە ســەدام حوســێن. زەبیحییەک کە بە درێژایی ســی چـل ســاڵ بە تاقی تەنیا لــە دەیان بواری دابوو، لە ســەدان ژێرزەمین و حەشــارگە، لــە نــاو قــوڕ و چڵپــاوی کوردایەتیدا ڕۆحــی دانابوو و بــە ســەلامەت دەرچووبــوو، ئەمجارە تەیــرە ژیر و وریاکــەی ژێکاف بــە دەندووک پێوە بوو و سەریشــی لەســەر دانا! دەبــوو گومانی نەبا و زۆرتــری زانیبــا، هەن کــوردی ئێران لەگــەڵ عەجەمدا هەســتان و دانیشتنیان کردووە و فێر بوون لەوان فێڵاویتر و موئامەرەچیتر بن.

بــە درێژایــی زیاتر لــە ٧٠ ســاڵ دوای جوانەمەرگبوونی کۆماری

کوردســـتان، ژیانـــی کوردانی ڕۆژهەڵات، دەتوانم بڵێـم تەنیا دە دوانزە مانگێک، بەهار و ئازادیی تێدا بەدی دەکرێت. لە ١٩٤٦ەوە بۆ ١٩٧٩ ئەوە یەک پشـــوو زیندان و تاریکســـتانی ساواکی شـــا بوو بەسەر کوردەوە، لە ڕێبەندانی ٧٩وە شۆڕشـــی گەلانی ئێران شـــای دەربەدەر کرد و بۆ کورد بەهاری ئازادییەکەی تەنیا دوو سێ مانگ تا بەهاری هەمان ساڵی خایاند. ئەوجار شەڕی سێ مانگە و لە پاییزی ٧٩وە دیسان ئازادییەکی کورت بە بۆنەی دانوستانەوە، هەتا هاوینی ١٩٨٠.

# ١٨

## پێشمەرگەبوون

بە هەڵگرتنی چەک و چوونی شـاخ، بووم بە شۆڕشـگێڕێکی تەواو و بیسـتوچوار عەیاری حیرفەیی، پێـش ئەوەی عەلی بم، کوڕی داک و بابم بم، برای خوشـک و برایان بم، هاوڕێ و هاوشـاری شارەکەم بم، پێشـمەرگەی خۆبەخش و بیستوچوار سـەعاتەی حەوت ڕۆژی حەفتە و ساڵ دوانزە مانگەی گیانلەسەردەستی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بووم.

«پێشـمەرگایەتی و کۆمەڵەبوون» لای من؛ سیاسەت، مارکسییەت، دیـن و مەبدئـ نیشـتمان، کوردبوون، هاوڕێیەتی و هەر هەموو شـت تەنانـەت دڵداری و خۆشەویسـتییش بوو. هەر هەمـووی ئەوانە دوای ژیانی پێشمەرگایەتی و کۆمەڵەبوونم دەهاتن. گیانلەبەرێکی ڕۆبۆتئاسا بووم، هەردەم و لە هەر شوێن ئامادەی فەرمان و ئەرکی حیزبی بووم. نەمدەزانی بۆ، زۆر قووڵ نەدەمخوێندەوە لەبۆ بەرنامە و سیاسـەت و دواڕۆژی نە تەنیا کورد و کۆمەڵە، بەڵکو بۆ ژیان و چارەنووسی خۆشم. نەشـە و سەرخۆشی تفەنگەکەم، جلی پێشـمەرگایەتی و سیمورغەکەم بـووم. فەرمـان و بڕیارەکانـی کۆمەڵە لە هەموو ئایـەت و دەقێک لام پیرۆزتر بوو، وا تێگەیشتبووم حیزبایەتی و کۆمەڵەبوون پێش نیشتمان و خاک و کوردبوون دێت!

## یادێک لە دڵدارەکەم

لـە قوژبنێکی هێلانەی دڵمدا جاربەجـار کیژۆڵەی قژکاڵی چاوڕەش دووراودوور و بـێ ئیـزن و ئاگاداریـی خـۆی، چاوشـارکێی دەکرد. سـەرهەڵبڕین و چاولەچاوکردن، هەڵڕشتنی دەردی دڵ، گەیاندنی سۆز و عیشـق، تەنانەت بە تاکە وشـەیەکیش، ناردنی نامەیەک، ڕاوەستان و

نیگایـەک و چرپەیەک، هەمــوو ئەوانە لە مەحاڵ مەحاڵتر بوون، هەموو چرکە و ســاتێک دڵەخورپەی ئەوەم بوو داواکاریی زۆرە، بە زۆر یان بە مەیلی خۆی بە شــووی بدەن و هەرگیــز بە ئاگری دەروونی من لە عیشقی خۆی پێ نەزانێ و وەک ڕووداوێکی نەخوازراو، کۆرپەی ئەڤینم لەناکاو و بەبێ ئیشــارە و هیچ مەبەستێک لەبەر ترسنۆکی و شەرم لە دار و بەردی شــارەکەم و ســەرنەویکردن بۆ کولتــوور و دابونەریتی مەردی و پیاوسالاری، مندار بێتەوە و لە کەلاوەکانی ناو شارەدێیەکانی ئەڤینــداری لەمــەڕ مەملەکەتی خۆم بە ئاهـ و ناڵەی بێفریادڕەس لە ژێر خــەرواری زوڵــم و بێدادیدا لە گــۆڕ بندرێت، تەنانــەت وەک چیرۆکی مەم و زین و ئەوانی تریش، دوو دێڕە شــیعر، یان بەیتێکیشــی پێ ڕەوا نەبینن. موستەحەق بووم گەر ئەوەم بەسەر هاتبا، ڕاستە شەرم و حەیا و مەردانەگــی لــە ئارادا بــوو، بەڵام خۆ ئازایەتــی و بوێرییش هەردەم هەبووە! بیر دەکەمەوە لە لایەک ترس و لە لایەکی دیکەوە لووتبەرزی و قســەی پیاو لە عەرزکەوتن، هەرگیز بواری نەدەدا تاقە هەنگاو بچمە پێش و هیچ نەبێت مافی ئەوەی پێ بدەم ئاگادار بێت، کەسێک هەیە شەو و ڕۆژ دەســووتێ و دەتوێتەوە لەپێناو تەنیا نیگاهـ و زەردەخەنەیەکی ئەودا.

### پێشمەرگەیەکی گەڕۆک

لە کەشوهەوای ئازادیی سیاسی، پێشمەرگە لەناو شار، بە کێشێکی پەنجا بۆ پەنجاوپێنج کیلۆیی بە دەموچاوێکی ناسک و جوان و منداڵانە، نێوبانگی ئازایەتی، بە ســیمورغ و جلی خاکی بە شــەدە و مشــکییەوە، جووتێک عەینەک، جوانترین کلاشــینکۆفی باجەڕی مزەلی و دەمانچەی نێرگانــی قووڵەوە، لە زۆربەی هەرە زۆری شــار و گوند و ناوچەکانی کوردســتان بــە «عەلی کەریمی، عەلی کوێر و عەلی ژاپۆنی» ناســراو بووم.

لــە پاییــزی ٧٩وە تا هاوینــی ١٩٨٠، لە ماوەی ئەو حەوت هەشــت

مانگـەی شەڕوەسـتان و دانوسـتان و بوونی مەقەڕاتی پێشـمەرگە و حیزبـەکان لەنـاو شـارەکاندا، بـە چەنـد هـۆکاری وەک توندوتۆڵـی، شـۆفێری شارەزا، متمانەی سەرکردایەتی، سەڵتبوون و چەند هۆکاری دیکە، بە کردەوە بووم بە پێشـمەرگەیەکی گەڕۆک و جۆکەر، بەدەست سەرکردایەتیی کۆمەڵەوە.

لـە مانـەوە لە مەقەڕی ئاغـەلان، دروسـتکردنی زیندانی مەرکەزی کۆمەڵە لە بەردەسـووری لای سەردەشـت، چوون بۆ تاران بە نهێنی، ئامادەییم بۆ لێدانی بانک لە تاران. هەروەتر لە سنە و دزلی و مەریوان، توریوەر و حەسـەنئاوا و کێلانە و مەلکشـان و کانیمشکان، گەردەنەی گاڕان، چواررێیانی چاپان، سـەقز و فەیزوڵلابەگی و تورجان، تیکانتەپە و سـاینقەلا و تیکاب، دیواندەرە و سەرا و کەلیخان، بانە و سەردەشت و ڕەبەت، دارسـاوێن و شـندرە، سیسـێر و نەسـتان، تەنگەی گرژاڵ و خانـێ و چیانە، کێلەشـین و دەشـتی قوڕێ، ترکـەش و جانداران و مەنگوڕان، لە ئالان و بێتوش و بێژوێ و دەرماناوێ، لە شنۆ و سۆما و برادۆست، لە ڕەزاییە و شیرینبلاغ و حەیدەرئاباد، نەغەدە و سندووس و محەمەدیار، چۆمی مەجیدخان و شـامات و شاروێران و زۆر شوێن و مەڵبەنـدی ڕۆژهەلاتی کوردسـتان، گەڕام بە ئاژۆتـن و بە پێیان، بە شـەڕ و کەمین، بـە بریندار و مەیتی هاوڕێ بە کوڵـەوە، دەیان چەکی گیراو بە شـانەوە، بە ڕیزێک دیلەوە، بە شـاخ و دۆلانەوە، بە نانەڕەقە و زگی برسـی، بە چاوانی خەوتێزڕاوەوە، بە شـان و پیلی شـەکەت و قاچ و ڕانی گیراوەوە، بە خورپەی دڵ و نێوکی کەوتووەوە، بە ئەژنۆی شـکاو و کۆچی یارانەوە، بە سـروود و گۆرانی، بە هەناسەی سارد و گەرمـەوە، گـەڕام و قاڵ بـووم لە کوورەی خەبات و گـەورە بووم لە ئامێزی خۆشەویستی و فەرهەنگی کوردەواری و «هەواری باسەفام».

### کەشی مەهاباد

کەشــوهەوای سیاســیی شــارەکان و بــە تایبەت مەهابــاد بە هۆی دانوســتان و هاتوچــۆی زۆری خەڵــک و وەفد و ڕۆژنامەنووســان و حیزبگەلــی سیاســی، زۆر دەگمــەن و نــاوازە بوو. زیاتر لــە دە پانزە حیــزب و ڕێکخراوی سیاســی و مەدەنــی مەقەڕیان هەبــوو، لە کورد و غەیــرە کورد. حیزبــی دێموکرات، کۆمەڵە، چریکــی فیدایی، ئیتحادی کۆمۆنیســتەکان، پەیکار، یەکێتیی لاوان، پیشــگام، ...و دەیان بۆتکەی[1] ڕۆژنامەفرۆشــان دیمەنی ناوشــارەکانیان بە چەشــنێک بارگاوی و بە سیاسی کردبوو، ئەستەم بوو تەنانەت بێگانە و غەیرە کوردێکیش ڕێی کەوتبایــە چوارڕێی ئــازادی، تەداخول و دەمەتەقەیەکــی حیزبایەتی و سیاسیی نەکردبایە!

دێموکــرات و تودە بە هاتوهاوار و نووســینی گەورەکراو، لەســەر دیــوار و جــادەکان، کۆمەڵەیان بە ئەمریکایــی، ئاژاوەچی و چەپڕەو و توندڕۆ ناوزڕاو دەکرد، کۆمەڵەش حیزبی تودەی بە خائین و دێموکراتی بە سازشــکار و بەعســیبوون تاوانبار دەکرد. چریکی فیدایی، ئاهەنگی چوونە ناو حکومەت و ناســینی خومەینیی بە دژەئیمپریالیستی دەژەنی و ڕێگەی خۆش دەکرد، تەسلیمی کۆماری ئیسلامی ببنەوە.

### ململانێی کۆمەڵە و دێموکرات

لە دانوستانەکاندا حیزبی دێموکرات لایەنگری سازان و شەڕنەکردن لەگــەڵ تــاران بوو، کۆمەڵە دژی ســازش و لێقبوولکردن بوو، دەیگوت ماهییەتــی کۆماری ئیســلامی ئەوە نییە هیچ مافێــک بۆ ئازادی و مافی گەلان دەســتەبەر بکات و دێموکرات گومانی هەیە و کۆماری ئیسلامی نەناســیوە. دێموکــرات خۆی بــە حیزبی یەکەم و پاشــماوەی کۆمار و قازی محەمەد دەزانی و بە لایەوە ئاســایی و ڕەوا بوو حاکمی یەکەمی

١- بۆتکە، خانووی بچووک لە دار و تەنەکە لەبۆ ڕۆژنامە و ئایســکریم و وردەواڵە. فرۆشی، سەرپەنای پاسەوان، کیوسک.

کوردستان بن. کۆمەڵەش خۆی بە نوێنەری چینی زەحمەتکێش و هەژار دەزانـــی و دەیگــوت هەموو خوێنــدەوار و کرێکار و جوتیــارم لەگەڵە، هەردوو لا ئەم ئیدعایانەیان بەبێ پشتبەســتن بە هەڵبژاردن و ڕاپرسی دەکرد. کۆمەڵە تەنیا بە شــەڕی ســێ مانگە و زەقکردنەوە و هەڵگرتنی دروشــمی خەباتی چەکداری لە ماوەیەکی کەمدا توانیبووی بە هەزاران ڕۆشــنبیر و خوێنــدکاری زانکــۆکان و خەڵــک لە خۆی کــۆ بکاتەوە و هێزی پێشــمەرگە بۆخۆی چێ بــکات و قەرە لە قەرەی حیزبێکی کۆنی وەک دیموکرات بدات. لە لایەکی تریشەوە مامۆستا شێخ عێزەدین وەک ڕابــەری دینیــی خەڵکی کورد، بە ئاشــکرا و بە کردەوە پشــتیوانیی لە کۆمەڵە دەکرد، ئەوە وای کردبوو کۆمەڵە ببێتە سەرئێشــەیەکی گەورە و ڕەقیبێکــی تەواو بۆ حیزبی دیموکــرات. بۆیە ڕۆژانە بەریەککەوتن و شــەڕەجنێو و بەیاننامە لە هەردوو لاوە لە ئارادا بوو. ســەرانی حیزبی دیموکرات بە هیچ کلۆجێک بۆیان هەزم نەدەبوو، کۆمەڵەیەک بە قەولی خۆیــان هەر هەموویان بە مەنجەڵێــک دۆڵمە تێر دەخۆن، چۆن لەناکاو بووەتە ئەم ملۆزمەی خەوی لە چاوان زڕاندوون و بەربەرەکانی لەگەڵ حیزبــدا دەکەن. هەر بۆیە بــە تایبەتی لە مەهاباد کە بە لانکە و مەکۆی حیزب دادەندرا بۆیان زۆر قورس بوو بوونی کۆمەڵە بێتە قبووڵکردن، حیســێبیان بۆ بکرێ و لە ســەر مێزی دانوستان گوێیان لێ بگیرێ، یان لە حاکمیەتی شاردا بەشدار و خاوەن ڕا بن.

## ١٩

### شوورای نیزامی مەهاباد

هەرچەند بە هۆی چەمکگەلی وەک ئازادی و دیموکراسی و کراوەیی فەزای سیاسی و میدیای ئێرانی و جیهانی لە کوردستاندا، بەرپرسانی حیزب دەست و پێیان بەستراببوو، هەموو شتیان بۆ نەدەچوو سەر، بە دەیان و سەدان ڕۆشنبیر و خوێندکار ڕۆژانە هێرشیان دەکردە سەر و بەر ڕەخنەیان دەدان و تێگەیشتبوون سەردەمی تێخوڕین و خەڵک بە هێندوەرنەگرتن دوایی هاتووە، بەڵام دیسان لە بەکارهێنان و ڕووبەڕووکردنەوەی خەڵکانی شەلاتی و سەرسەری و چەقۆکێش و بێ ئاوەز[1] و دوور لە نەزاکەت و ئەدەبی ناو کۆمەڵگە؛ بەرامبەر بە لاوانی خوێندەوار و خەڵکانی خاوەن فەرهەنگی شارستانی و حەیابەخۆ، دەستیان نەدەپاراست. شوورای نیزامی شاری مەهابادیان دامەزراندبوو، پڕ بوو لەم بابەتە خەڵکە، کۆمەڵێک شارلاتان و هەتیووباز و چەقۆکێشی بەردەرگای سینماکانی زەمانی شا، کۆنە گروهبان و ڕوکنی دووی ئەرتەش، بەناوی پیرۆزی پێشمەرگەوە، کە باوی تازە بوو بۆیان، لەژێر ناوی شوورای نیزامی شار، لە مەهاباد و دەوروبەری دامەزراندبوو، تەنیا بۆ چاوترساندنی هەوادار و لایەنگرانی کۆمەڵە و پەیکار و ڕەزمەندەگان و ئەم خەڵکانەی دەستیان لە ڕەخنە لە حیزب هەڵنەدەگرت. کۆمەڵێک خەڵکی گومانلێکراوی سەر بە حیزبی تودەیان لە یەکێتی لاوانی حیزبی دیموکرات کۆ کردبوووەوە، خەریکی نووسین و کاری نەزەری بوون لەسەر کۆمەڵە، کە گۆیا ئەمریکا و سی ئای ئەی دروستیان کردووە، کەچی هەموو ئەوانە دواتر لەژێر ناوی کۆنگرەی چوار و تودەیی، بوونە پیاوی خومەینی و لە بەرەی

---

١- ئاوەز، بەئەدەببوون و تێگەیشتوویی.

دەوڵەت بە بیانووی دژەئیمپریالیســت، هەرچی خراپ بوو کردیان دژی جووڵانەوەی بەرگریی گەلی کورد و پێشمەرگە لە ڕۆژهەڵات.

## مامە غەنی هاتەوە

لــە نۆزدەی مانگی دووی ١٩٨٠دا حیزبی دێموکرات لە ناوەڕاســتی شــاری مەهاباددا کۆنگرەی چواری خــۆی بە فراوانی و خەڵکی تازەی بەحیزبیکراو گرت.

غەنــی بلووریــان، کە زیندانیی ســەردەمی شــا بوو، لە ســەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێراندا، ساڵێک پێشتر، دوای زیاتر لە بیستویەک ساڵ ئازاد کرابوو، زۆر خۆشەویســت و خاوەنی هەژمووونی و کەســایەتیی کاریزمایی بوو. کاتی ئازادبوونی هەموو خەڵکی سابڵاغ هاواری دەکرد «مامە غەنی هاتەوە، یاخوا بەخێر بێتەوە». ئەو زۆر زوو کەوتە بەر ڕق و تووڕەیی خەڵک، بە هۆی هەڵوێست و لایەنگریکردنی لە حیزبی تودە. تەنانەت وای لە خۆی کرد خەڵک و منداڵ لە ســەر جادەکان هاواریان دەکــرد «مامە غەنی هاتــەوە، یاخوا بگیرێتەوە». لــە کۆنگرەی چواردا دوکتــۆر قاســملوو بە ڕەقیبی خــۆی دەزانی و گەر مامــە غەنی خۆی ویســتبای و چاوی لــە ئەندام پەرلەمانی ئێــران نەبوایە، بێگومان پێش قاســملوو دەکەوت و زۆربەی دەنگی کۆنگرەی دێنا. قاسملوو دەیزانی مامە غەنی هیچی لە باراندا نییە و ئەم بیست و چەند ساڵەی زیندان، نە تەنیا لە بواری خوێندنەوە و تیۆری و ڕۆشنبیری هیچ فێر نەبووە، بەڵکو دێموکراتبوونەکەشی دوای تودەییبوونی دێت. بە وەبەرخستنی تەماحی چوونی پەرلەمان، مامە غەنی شــەڕی ســکرتێربوونی لە کۆنگرە لەگەڵ قاســملوودا نەکرد و ســازی ســازش و چوونە ژێر ڕکێفی خومەینیی لــێ دەدا و لەژێــر چاودێــری و تەکلیفی ســۆڤییەت و کرەملین، بوونە لایەنگــری تــاران و کۆماری ئیســلامی و دژی خەباتی پێشــمەرگە لە ڕۆژهەڵات وەســتانەوە. ئەوە بۆ قاسملوو گەورەترین دەستکەوت بوو، کە نەیارێکی بەهێزی وەک غەنی بلووریان ئاوا بە ئاســانی و لە ڕووی

نەزانیـن و گەمژەییـەوە خۆی بخاتە دەرەوەی بازنەی دەسـەڵاتداریی حیـزب. بە کۆنگرەی چـوار و ڕێبـازی تودەییبوونی غەنـی بللوریان، هەرچـی توودەیی ناو حیزب بوو هەر لـە کۆنەوە تا ڕۆژی کۆنگرە بە کۆن و تازەوە لە حیزبی دیموکرات هاتنە دەر، یان وەدەرنران، تەنانەت بە مامۆستا هێمنیشەوە، هەرچەند مامۆستا هێمن دواتر خۆی لە تاقمی حەوت کەسـی «پەیڕەوانی کۆنگرەی چـوار» کە دواتر بوونە تودەیی، جیـا کـردەوە و چوو لـە ڕەزاییە دانیشـت و سەرپەرشـتیی گۆڤاری سروەی دەکرد.

### قاسملوو بە یەک شەو

لـە کۆنگـرەی چـواردا قاسـملوو زۆر زیرەکانە، لە کەشـوهەوای ئازادی سەردەم کەڵکی وەرگرت و بە شەو و ڕۆژێک بە دەیان خەڵکی بەبـێ ڕابردوو و بناوانی، کردە ئەندامی حیزب و بەتەماحی پۆسـت و گەیاندنیان بە سەرکردایەتی و دواتریش گەیشتن بە دەسەڵات، خۆی لە کۆڵ زۆربەی ئەو کۆنە دیموکراتانە کردەوە کە هەردەم بۆی سەرئێشە و موشـکیلە بـوون. قاسـملوو توانیی بە چەکی دیموکراسـی کە خۆی بە یەک شـەو دروسـتی کرد، هەرچی نەیار و دەسـتەمۆنەکراوەکانی خۆیەتـی بێدەنگ بکات، یـان دەریانپەڕێنێت و جێگەیان بە جەماعەتێکی گوێلەمسـت، بێڕابردووی حیزبی و سیاسـی، ئەرتەشی و پاشەڵپیس، چـاو لە پۆسـت و پایـە بڕیو، بە وەعد و وەعیدان پـڕ بکاتەوە، ئیتر بە ئامراز و کەرەسـتەی دیموکراسـی و دەنگـدان، دیکتاتۆریی حیزبی و سکرتێر دابین کرا.

ماوەی هەشـت مانگەی تەقەوەستان (لە پاییزی ١٩٧٩وە بۆ هاوینی ١٩٨٠)، فـەزای سیاسـی و کۆمەڵایەتیی کوردسـتان، ڕۆژانە بارگاوی بـوو بە هەواڵی لەناکاو، وردەشـەڕ و جووڵـەی هێزەکانی حکومەت لە پایەگا و ناوەندە سەربازی و پادگانی ناو شارەکان، کێشە و کێبەرکێی هـەواداران و حیزبەکان، جیاوازیی تێڕوانین لە دەسـتەی نوێنەرایەتیی

خەڵکی کورد، کێشــەی دەســەڵاتداری لە شــار و لادێـکان، هاتوچۆی پێشــمەرگەی باشوور و پێشگرتن بە پێشــمەرگەکانی یەکێتی لە لایەن حیزبـی دیموکـرات و داوای ئیجازەوەرگرتــن و بەرگریلێکردنیــان لە لایـەن کۆمەڵــەوە، هاتوهــاواری هەڵبژاردنەکانــی پەرلەمانــی ئێران لە دەســتپێکی بەهــاری ١٩٨٠ و کاندیدێکی زۆری کـورد لە لایەن حیزبە سیاســییەکانەوە، بانگەشــەی گرژاوی و کێبەرکێی ناسالم، هەر هەموو ئەوانــە و دەیان دیــاردەی نوێی سیاســی و کۆمەڵایەتی دوای گۆڕانی ڕژێمی پاشــایەتی و هاتنەکایەی ژینگەی شۆڕشگێڕی، دنیا و فەزایەکی پڕ لە سەیروسەمەرەی خولقاندبوو.

## ڕێککەوتنی سەرزارەکی

دەســتەی نوێنەرایەتیـی خەڵکـی کـورد، لەگەڵ حکومەتــی ئێراندا ڕێککەوتنێکی سەرزارەکییان کردبوو، کە جموجووڵی سەربازی نەکرێت و پادگانــەکان و بنکەکانــی ســەربازیی حکومەت بەهێــز نەکرێن، تەنیا بۆ ڕاگواســتنی خۆراک و نەخۆش و ئیجازەی پشــوو بۆ سەربازەکان نەبێت. حکومەت هەر لە دەســپێکی دانوســتان دیار بــوو خەریکی فێڵ و کاتکوشــتنە بۆ بەهێزکردنی خۆی، بۆیە زۆری هەوڵ دەدا پادگان و بنکەکان بەهێز بکات و بۆ شەڕ ئامادەیان بکات، ئەم کارەی بە یارمەتیی ئەو باڵەی حیزبی دیموکرات دەکرد، کە لێیان نزیک بوون. تاقمی حەوت نەفــەری پەیڕەوانی کۆنگرەی چوار، کە تودەیــی بوون و لەناو حیزبدا هــەردەم بەتەمــای ســازش و خۆتەســلیمکردن بە کۆماری ئیســلامی بــوون، ئــەم کارەیان بۆ حکومەتی تاران دەکــرد. تەنانەت دەیانگوت با خودموختاری واز لێ بێنین و مامە غەنی شتێکی تری هێنابوو بە ناوی «خودگەردانــی» لــە جێی خودموختاری، کە تاران پێی حەســاس بوو. باڵی تودەیی حیزب کە ئەوکات بە ڕابەریی مامە غەنی بە ئاشــکرا جیا نەبووبوونەوە، بە کردەوە و نووســین، سازی ناسازی تەسلیمبوون و چوونەبنباڵی خومەینییان دەژەنی و دووبەرەکییەکی تەواو و ئاشکرایان

بــە تایبەت لە نێــوان ڕیزەکانی حیزبــی دێموکرات بە گشــتی لە نێوان هەموو خەڵکی کورددا ساز کردبوو.

**مینەی کاکە سواریان سواری کەر کرد**

لــە ئەنجامــی ئــەم ناپاکــی و سازشــی توودەییەکانی نــاو حیزبی دێموکرات، لە سیناریۆیەکی زۆر قێزەون و دوور لە حورمەت بۆ عێل و عەشیرەیەکی گەورەی وەک مەنگوڕ، بەبێ ئاگاداری و سەربەخۆ مامە غەنی و تاقمەکەی بە فێڵ و تەڵەکە لە ڕووی ســادەیی و بێسیاســەتی، مینەی کاکە ســواری ڕابەر و خۆشەویســتی عێلی مەنگوڕیان فریو دا و بــە تەماحــی چەند بڕنەو و تفەنگەشــکاو بردیان بۆ ڕەزاییە و لەگەڵ ئاخونــد حەســـەنی نوێنەری خومەینــی و ئیمامی جومعــەی ڕەزاییەدا، دایاننا و هەر لەوێ کردنی بە جاش و لاپەڕەیەکی پڕ لە شەڕمەزارییان لــە ماوەی چل ســاڵی ڕابردوودا بــۆ خۆیان و عێلی مەنگــوڕان تۆمار کــرد. ئەوە بوو بــە هۆی ئەوەی بەشــێکی هەرە زۆری عەشــیرەت و تایفەکانیــان بە خڕی پاڵ بدەنە دەوڵەت و جاشــایەتیی بۆ بکەن. دوای ئــەوەی بە فێڵ و فریودان تفەنگیان پــێ وەرگرتن، دواتر باڵەکەی تری حیزب و خەڵک هێرشــیان کردە ســەر مەنگوڕان و مینەی کاکە ســوار و چەنــد کەســیان گرت و ســواری کەریان کــردن و تەماتە و هێلکە و دار و بەردیــان پێدا دەدان و دەیانگێڕان، بــە کوردی ئابڕوویان بردن، لە ئەشــکەوتێک حەمەدەمینیان قانگ دا، ئیتر ئەوە بە یەکجاری وای لێ کردن بە پانەوە بینە جاش و هاوکاریی حکومەت بکەن. جارێکیان دوای دەســپێکردنەوەی شەڕ و چوونەوەمان بۆ شــاخ، بۆ جاری دووهەم و ئاخر، مەقەڕمان لە حاجیاڵیکەند بوو، ســیامەند کوڕی کاک ســولەیمان موعینــی، کە پێشــمەرگەی کۆمەڵە بوو، لە دایکــەوە خزمایەتیی لەگەڵ مەنگــوڕدا هەبــوو و زۆر لایــان خۆشەویســت بــوو، گوتــی مەنگوڕە جاشــەکان و حەمەدەمینی کاکە ســوار ڕایانســپاردووە بچــم بیانبینم، فکــری لــێ کراوە و ڕێوشــوێن داندرا، ســیامەند گوتی ئەوانە لەســەر

قسەی خۆیان زۆر پیاون و خیانەتمان لەسەر میزی گفتوگۆ لێ ناکەن. من و کەریم ئەفسەر دلێر کە خۆی مەنگوڕ بوو و پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو، لەگەڵیدا چووین. بە نیوەشەو لە گەڕەکی مەجبوورئاوای سابڵاغ لە ماڵێک دانیشتین، لەگەڵ سیامەند ڕێککەوتن بەشێکیان بچن بۆ ناو حیزب و مینە و جەماعەتێکی تر بێنە ناو کۆمەڵە، دوای ماوەیەکی کورت مینە لە خانێ لە شەڕی پێشمەرگەی دێموکرات کوژراو و پلانەکەی سیامەند ئیتر سەری نەگرت.

**قافڵەی ئەرتەش بەرەو مەهاباد**

لــە کردەوەیەکــی تــری ئــەم تاقمــی حــەوت کەســییەدا، پیاوێــک هەبــوو بەکاریان دێنا بۆ هەرچی ئیشــی قێــزەون و دووبەرەکی لەناو کوردەکاندا. خەڵکی ســابڵاغ بوو زەمانی شا گروهبانێکی زۆر بێزراو و لە ناو ئەرتەشدا ڕوکنی دوو بوو، ئەم بەشەرە لە ناو ئەرتەشدا زۆرتر کاری ســاواکی دەکرد، دوای شــۆڕش و هاتنــەوەی حیزبی دێموکرات بە یەک شــەو ســەت و هەشــتا دەرەجە گۆڕا و بوو بە حیزبی و خۆی بە خەبیری نیزامی لەناو حیزب ناســاند. کەم کەســم پێ شــک دەهات تەنانــەت لەنــاو حیزبیشــدا خۆشــیان ویســتبێت، بۆ ئەو، هیــچ موهیم نەبوو، شــا ڕۆیشــتبوو، حیــزب هاتبوو. ڕۆژێک لە ســەردەمی ماوەی دانوســتان لــە مەقەڕی کۆمەڵەدا کێشــک بووم، ڕەحیــم بابەتاهیری لە ئەمریــکاوە هاتبووەوە ببێتە پێشــمەرگە، دانیشــتبووین، یەکێک هات و بــە هاوار گوتی، ئەوە بۆ دانیشــتوون، خۆ ئەرتەش گەیشــتە ســێڕای نەغــەدە! بــە تەنیــا لەگــەڵ ڕەحیم ســوار بوویــن و لێمخــوڕی بەرەو جــادەی ڕەزاییە، نزیک ســێڕای نەغــەدە بینیمان ســتوونێکی گەورە و دووروودرێژ دێت و ئەم پیاوە لە پێشــی پێشــەوە لە زیلێکدا دانیشتووە و ســتوون بــەرەو مەهاباد دەبات. نیوەڕۆ بوو لە بەرپرســان کەس لە مەقەڕ نەبوو، سەربەخۆ بڕیارمان دا بچین بۆ مەدرەسەکان و ناوبازاڕ خەڵک ئاگادار بکەین، کە بە چاوساغیی حیزبی دێموکرات ئەوە ستوون

بەرەو مەهاباد دێت. لە هونەرستانی سەنعەتی کوڕان دەستمان پێ کرد، من هیچ هۆشم نەبوو جلی پێشمەرگانەم دەبەردایە و تفەنگم بە شانەوەیە، یەکسەر چوومە دانە بە دانەی پۆلەکان و گوتم، ئەوە حیزب ستوونی هێنا، ئیتر دواتر مەدرەسەی کچان و کوڕان و سێ چوار دەبیرستانی گەورەی سابڵاغمان، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ورووژاند و خۆمان یەکسەر گەڕاینەوە بەرەو جادەی مەهاباد–ڕەزاییە. لەو ماوە کورتەدا کۆمەڵە مەفرەزەیەکی ناردبوو بەرەو مەحمودکان لە دەروازەی شار و چاوەڕوان بوون ستوون بگات، شەهید ڕەحیم قادری، سیامەند موعینی، سولەیمان مودەڕەسی و... دە بۆ دوازدە پێشمەرگەی دیکەی کۆمەڵە لەوێ چاوەڕوان بوون، گوتم خەڵکمان ئاگادار کردووە و مەدرەسەکان وەڕێ کەوتوون بۆ ئێرە. زۆریان پێ باش بوو کە خەڵکمان بەشداری پێ کردووە. ستوون بە چاوساغیی ئەم پیاوە لە مەحمووڕکان و دەروازەی شار نزیک بووەوە، چووینە پێش و وەک کۆمەڵە گوتمان بۆتان نییە بڕۆن، ڕێککەوتن کراوە جموجووڵی ئەرتەش نەکرێت، ئەم چاوساغەی دێموکرات لە فەرماندەی ستوونەکە پێداگرتر بوو کە دەبێت ئەم ستوونە بیات بۆ پادگان، ڕێک لەم کاتەدا کە شەڕەقسە بوو لەگەڵ ئەم بەناو بەرپرسەی دێموکرات، بە هەزاران کەس بە دروشم و هۆتافکێشان وەدەرکەوتن. کاک سەدیق جیهانی، کە لە خۆپیشاندانەکاندا دەنگێکی بەرزی هەبوو و زۆر چالاک بوو، کارمەندی هونەرستانی سەنعەتی بوو، هەموو تەلەبەکانی پێش خۆی دابوو و دەیگوڕاند و هاواری دەکرد؛ «سازشکار، سازشکار، دێموکرات سازشکار و...» ئیتر لە ماوەیەکی کورتدا هەموو ئەوانی تریش گەیشتن و سینگیان هێنایە بەرامبەر ستوونەکە. سەدیق هاواری کرد هەموو لەسەر جادەکە ڕابکشێن لە پێش ستوونەکە، با بەسەر جەستەماندا بڕۆن! هەرچی سووکایەتی و جنێو بوو بەم بە ناو بەرپرسەی حیزب درا، گوتیان لە پشتەوەڕا خەڵکی وسوکەند و ئیندرقاش هاتوون و خەریکن ستوونەکە لەگەڵ چەند پێشمەرگەی دێموکراتدا تالان دەکەن،

زۆربــەی پێشــمەرگەکانی حیزب لەگەڵ هاتنی ســتوون و بەهێزکردنی مۆڵگەکانی ئەرتەش نەبوون و زۆریشــیان ڕق لەم گروهبانەی زەمانی شــا و تــازە بە حیزبییــە دەبووەوە. لــە ماوەیەکی کورتدا ســتوون بە دەســتی خەڵک تاڵان و تەفروتونا کرا. لە ئاخردا، ئێمە پێشــمەرگەکانی کۆمەڵــە تەنیــا یەک تفەنگی «یوزی»مان دەســتکەوت. چاوســاغەکەی حیزب کە بە قەڵافەت ســێ هێندەی من دەبوو، لەحەیبەتان و لەداخان، پەلامــاری دام و دەســتی لە ملم قایم کرد و هەڕەشــەی کوشــتنی لێ کردم، سیامەند و سولەیمان مودەڕەسی هاتن گوتیان، خوێڕی بکشێوە، بە خاتری براکەت، کە پێشمەرگەی کۆمەڵەیە، نەبێت هەر لێرە بەدەستی ئەم خەڵکە تووڕەیە لەناودەچیت، لە شەرمەزاری و ترسی لێدانی خەڵک ون بوو نەمانزانی چیی بەسەرهات، باڵای سولەیمان مودەڕەسی لەوی کورتی نەدێنا، بەســەریدا نەڕاند و گوتی، ئای فڵان کەس هەموو کەس ڕابردوو و فایلی خوێڕێتی و ترســەنۆکی و شاپەرســتیی تۆ دەزانێت، لە پێش چاوم گوم نەبیت ئیتر خاتری براکەشــت ناگرم. باوک برایەکی هەبوو، ســەعید گەوهــەری هاوڕێی هەمووومان بــوو، بەداخەوە دواتر وەک پێشــمەرگەی کۆمەڵــە زۆر قارەمانانە شــەهید بــوو، هەموو جار شــەرمی دەکــرد و زۆری پێ عەیب بوو، کــە دەیانگوت فڵانی برایەتی، هەرگیز نەیدەدواند و زۆر جار باســی سەرســەرێتی و زوڵم و لێدانی لــە خوشــک و براکانــی بــۆ دەکردین، کە بــرا گەورە بــووە و بووەتە مایەی نەنگی بۆ هەموو ئەندامانی ماڵەوە لە ســەردەمی گروهبانبوونی لە حکومەتی شادا.

### پاراستنی پارتی بۆی چاپ کردووە

ئــەو ئێوارەیە بــە یارمەتیی خەڵک، پێشــمان بە ســتوونی ئەرتەش گرت، کە بۆ بەهێزکردنی پادگانی مەهاباد دەچوو. ئەم چاوساغە، سەر بــە باڵی غەنی بلووریان لە ناو حیزب لە ســەردەمی شــەڕی کۆمەڵە و دێموکراتدا، بوو بە فالانژ و موریدی قاســملوو، دواتر چوو بۆ ســوید

و نزیـک بـووەوە لـە بارزانی و پارتی، لەم سـاڵانەی دواییـدا گوتیان کتێبی نووسـیوە و پاراستنی پارتی بۆی چاپ کردووە، ئەم ڕووداوەی بـاس کردووە تەواو بە پێچەوانـەوە و تێکەڵوپێکەڵ لەگەڵ ڕووداوێکی ڕۆژی پێشـتر لە بەردەم شـیرکەتی نەوتی سابلاغ، من نەمدیوە و گۆیا هەڕەشەی لە من کردووە و یەکسەر هەڵاتووم! ڕەنگە خوێنەر بپرسێت ئەی کە وا بوو بۆچی ستوون تێکوپێک شکا و تەنانەت بەتانییەکیشیان بۆ دەرنەچوو؟! ئەدی هەر بۆ سـبەی ڕۆژی دوایی، ئەوە حیزبی تودە و کۆنگـرە چواری نەبوون بەیانیان لەسـەر کۆمەڵە و عەلی دەرکرد و بـە هۆکاری چەککردن و تاڵانی سـتوونیان ناسـاند، ئەوەندەیان لەناو شـار و بـە گەورە نووسـی هاتوهاوار کرد کۆمەڵەیـان مەجبوور کرد بۆ ڕازیکردنی مەدرەسـەکان و خوێندکاران لە خۆی، کاک سـولەیمان خورەمـی یـەک لـە بەرپرسـانی کۆمەڵە لە مەهابـاد لەگەڵمـدا بێت و بچین بەرامبـەر خوێندکاران لە هەموو مەدرەسـەکان، داوای لێبوردن بکـەم، لەبەر ئـەوەی بە چەکەوە چوومـە ناو مەدرەسـەکان. ئەوە بۆ مـن زۆر ناخۆش بـوو، بەڵام بۆ ناوبانگ و خۆشەویسـتیی کۆمەڵە لە ناو خوێندکاراندا کردم، هەرچەندە کۆمەڵە دەبوو ئەم فشـارەی حیزبی دێموکرات و تودەییەکان قبووڵ نەکات! چوونم بۆ مەدرەسەکان و داوای لێبوردن لە خوێندکاران، ئەوەندەش خراپ نەبوو، لێیان تێگەیشـتین، کە زۆربەیان هاتن و بەشـدارییان بۆ سـەرجادە و ڕاوەستانیان بەرامبەر ستوونی ئەرتەش بە سەرکەوتن دەزانی. ئەوان کردەوە و ڕای ئێمەیان زۆر پـێ باش بـوو، بۆیە هەر هەموویان یەکسـەر بەقسـەیان کردین و هاتـن و بەڕاسـتی ئەوان نەبان شـەڕێکی ناخۆش و دەسـتەویەخە لەگەڵ ئەرتەش و ئەم کابرایەی چاوساغ، دەخوڵقا. هەموو جارێک و لە هەموو ڕووداوێکدا کە خەڵک بە پانەوە موداخلە و بەشداری دەکات، لە بەرژەوەندیی میللەت تەواو دەبێت. دوای ئەم ڕووداوە و سـەرکەوتنی خەڵک لە تێکشـکان و نەهاتنی سـتوون بۆ پادگان، خەڵک زۆر چالاکتر بوون و بە لایانەوە زۆر گرنگ بوو ئەرتەش لە پادگانەکان و مەکۆکانیان

بەهێز نەکرێن و ئەو چاوساغەش ئەوەندەی دیکە بێزراو و بێحورمەتتر کـرا. ئێسـتاش بەداخەوە وەک زۆری تر، پیسـایی ڕابردووی خۆی بە خۆقایمکردن لە پشـت بارزانی و پارتی بە خەیاڵی خۆی دەشواتەوە و وا خۆی لە هەولێر و سـوید وێنا دەکات لە هەر بارزانییەک بارزانیترە و خەڵاتی بارزانی لە سـینگی خۆی هەڵواسیوە و ڕۆژ تا ئێوارە فشەی پێوە دەکات!

### دەرسمان لە مێژوو وەرنەگرتووە

بەداخەوە یەک لە تایبەتمەندییەکانی شـۆڕش و ڕاپەڕینی بەکۆمەڵ ئەوەیە خەڵکی نەشـیاو و هەلپەرسـت دێنە ڕیزی شـۆڕش و وەدوای نیازە گڵاوەکانی خۆیان لەژێر ناوی شۆڕشگێڕی دەکەون، بەبێ ئەوەی هیچیـان لـە باراندا بێ و خاوەنـی هیچ مەبدئـ و بیروباوەڕێک بن. بە کورتی زۆربەی ئەم کەسـانە شـۆڕش و شۆڕشـگێڕی تەنیا بۆ تاکی خۆیـان بەکار دێنن، هەرگیز خۆ لە هیچ ئاوێکی خوڕێن نادەن، کە بوار نەدا، خۆ لە هیچ ئاورێک نزیک ناکەنەوە کە بسـووتێنێت و فرسـەت بە هیـچ گوللەیـەک نادەن گەر بزانـن دەیانبڕێـت و دەیانکوژێت. بە جێی ئەمانە وەسـتای ماستاو و پێهەڵگوتن و خۆنزیککەرەوە و خۆتێخزاندن لـە بەرپرس و بـارەگا و دیوەخانی کاربەدەسـت و سـەرۆکەکانن. لە زۆربـەی جـاران و ئەزموونەکانی جیهان بەداخـەوە ئەوانە بەروبووم و دەسـکەوتەکانی سـەرکەوتن دەخـۆن و ملـی لێ ئەسـتوور دەکەن و ئەوانـەی بـە حەق خەباتیان کـردووە و بە ماڵ و کەسـوکارەوە لە خزمەت شۆڕشـدا بوون، یان شەهید بوون و بریندار و کەمئەندام، یان ئەوەتا لە سـبەی دواڕۆژی سـەرکەوتن ئەوان بە تەوازوع و هەژاری ژیانی کولەمەرگیی خۆیان دەبەنە پێش و تەنانەت باسی قارەمانیەتی و فیداکاریی خۆشیان لە ڕۆژە سەختەکانی سەردەمی شۆڕش ناگێڕنەوە و ئەوەشـیان بۆ ئەم نەشیاو و فشەکەرانە جێهێشتووە، کە بە هەزاران لاپەڕە بە پارەی ئەم خەڵکە هەژارە، بە فشە و درۆهۆنینەوەی داستان،

بۆخۆیـــان تۆمار بکەن و بە چەواشـــەکاری دەرخـــواردی نەوەی نوێی بـــدەن. ئەمە تەنیا تایبەت بە کوردســـتان و شۆڕشـــەکانی ئێمە نەبووە و نییـــە، ئەگـــەر ســـەیرێکی مێـــژووی وڵاتێکـــی وەک فەرانســـا بکەین، دوای ڕووخانی پاشـــایەتی و حوکمی شۆڕشـــگێڕی بە سەدان داستان و ڕووداوی وەک ئـــەم کاکـــی گروهبانەمان بۆ وێنـــا دەکات، بەداخەوە ئێمـــە زۆر کەم دەرســـمان لە مێژووی ئەم وڵاتانـــە وەرگرتووە و هەر ئێســـتا خەڵکی باشـــووری کوردستان، دوای ســـاڵانی ساڵ لە شۆڕش، کەوتوونەتە دەســـەڵاتداری و حوکمی خۆماڵی، ئەوەتا لە هەموو کەلێن و قوژبنەکانـــی ئیـــدارەی دەســـەڵات بە ســـەدان و هەزاران نەشـــیاو و شارلاتانی وەک ئەم کابرایە دەبینین، ڕۆژانە خەریکی ملئەستوورکردن و خوێنمژینی خەڵکی فەقیر و هەژار و ســـتەمدیدەی ئەنفال و هەڵەبجە و پێشمەرگەی فیداکارن.

# ٢٠

## مەرجی بوون بە کۆمەڵە

بۆ ئەوەی ببیتە ئەندامی کۆمەڵە دەبوو لە دەیان بوارت دابا و دەیان جار هەڵیاندەسەنگاندیت، دەبوو پێشتر دوو ئەندام داوای پێش عوزوی یــان بەرئەندامیــت بۆ بکــەن، بەڕاســتی زۆربەمان بیرمان لەم شــتانە نەدەکردەوە، بە تایبەت جیلی خۆم و هاوڕێ و هاوتەمەنەکانم ئەوەندە ســەرخۆش و شەیدای خەباتی پێشمەرگایەتی بووین، بەبێ هیچ تەماح و خۆپێگەیاندن وەک ســەربازێک تەنیا چاومان لە دەمی بەرپرسەکانی کۆمەڵە بوو، کە ئەمر بکەن و ئێمەش جێبەجێی بکەین. سەرانی کۆمەڵە هەر وەک ســاڵانی زەمانی شا لە کەشوهەوای نهێنی و پۆلیسیدا بوون و متمانەیــان زۆر کەم بەم خەڵکە فیداکارەی خۆیان دەکرد. بازنەیەکی داخراوی خۆیان وەک بنەماڵەیەک هەبوو زۆر زەحمەت بوو خەڵکی تر لێی وەژوور بکەوێت. هاوڕێمان هەبوو ئامادە بوو بچێتە زاری شێرەوە، خەڵکیان بۆ بکوژێت و شــەڕی دنیایان بۆ بکات، بەڵام لە لای ســەرانی بنەماڵەی کۆمەڵە بۆی نەبوو ببێتە ئەندام و لە باری ڕوتبەی تەشکیلاتی، هەر پێیان دەگوت هەوادار، کەس گوێی پێ نەدەدا، ئاخر کاکە ئەم کەسە هەمــوو کارێک بۆ کۆمەڵــە دەکات و هەموو ژیانی خۆی و بنەماڵەکەی لە خزمەت کۆمەڵە ناوە، بۆچی نابێت وەک ئەندامی کۆمەڵە حیسێبی بۆ بکرێت؟! نموونە شەهید سولەیمانی بللوری کوڕێکی چالاک و دڵسۆز و وەفادار، هەموو ئەندامانی ماڵەوەیان تەنانەت بە دایک و باب و هەموو خوشــک و براکان، پێشمەرگە و چالاکی کۆمەڵە بوون، هەتا بڵێی لەناو خەڵک و لاوان و بگرە ژن و پیاوانی بەساڵداچووشــدا خۆشەویســت و جێی ڕێز و حورمەت بوو، ئەگەر بڵێم خەڵکێکی زۆری شــار بە بۆنەی ســولەیمانەوە بووبوونە کۆمەڵە، لە ڕاســتی لام نــەداوە، خەڵکی پێیان

وا بـوو سـولەیمان لە هەرە گەورەکان و بەرپرسـی بـاڵای کۆمەڵەیە، شـەو و ڕۆژ خـۆی و ماڵەوەیـان لـە خزمەتی میوان و پێشـمەرگە و بەرپرسـانی کۆمەڵەدا بـوون، لەوپەڕی قارەمانیەتی و شـەڕی قورس وەک یەکەم شـەهیدی سەنگەر لە ناوچەی مەهاباد شەهید بوو، کەچی ڕۆژنامـە و خەبەرنامـەی کۆمەڵە نووسـیبووی «سـولەیمان بللوری هەواداری کۆمەڵە شـەهید بوو»! بەڵام خەڵکی شـار بە سەرکردایەتیی کۆمەڵەیان دەزانی، یان تێکۆشەرێکی گەورەی وەک حوسێن سوهەیلی، موهەندیسی کانزایی لە زەمانی شادا، لە بنەماڵەیەکی ناسراو، بە هەموو تواناوە و بەوپەڕی تەوازوعەوە پێشمەرگەیەکی سادە بوو، پێیان ڕەوا نەدەدیـت گۆڤارێکی ناوخۆ هەبوو «مەشـعەل» چەنـد لاپەڕە بوو، ئی ناوخـۆی ئەندامـان بوو، پێی بدەن بیخوێنێتـەوە، چونکە نە ئەندام بوو و نە بەرئەندام! یان کاک خەلیل بللوریان، نابغەیەکی سـەردەمی خۆی بوو، لە زانکۆی عیلم و سەنعەتی تاران، یەکەم و باڵاترین زانکۆی ئێران بە نمرەی باڵا لە زەمانی شـادا دەرچووبوو، چەند ساڵ لە زیندانەکانی شـادا بوو، بـە جلوبەرگی خۆی هاتبـوو، بووبوو بە پێشـمەرگەیەکی سادەی کۆمەڵە، بە هەموو بەرپرسانەوە دژایەتییان دەکرد و دەیانگوت «مەحفلگەرایـی» (تەکەتـول) دەکات، هەموو «مەحفلگەرای»یەکەشـی ئەوە بـوو، ئێمەمانـان و پێشـمەرگە نەخوێندەوارەکانی نـاو مەقەڕی شـاری لە شەوانی درێژی پاییز و زسـتاندا کۆ دەکردەوە و کتێبی پێ دەخوێندینەوە و فێری شیکردنەوە و دەقە مارکسییەکان دەکرد. ڕۆژێک بـە منیـان گوت تـۆ ئـەوە داوای بەرئەندامیمان بـۆ کردوویت، کەچی شەوانە لە مقەر گوێ لە خەلیل دەگریت. هەرچی گوتم و کراندم نەچوو بە مێشکی دێهقانی کاکی بەرپرسی کۆمەڵەدا لە مەهاباد، وەڵا بیلا تەنیا کتێبمـان بۆ دەخوێنێتەوە و شـیی دەکاتەوە، لـە هەمووومان کۆمەڵەترە و ئەو شـایانی ئەندامبوونە نەک من و تۆ، نەچوو دەمێشـکییەوە و ئیلا و بیلا سـوور بوو لەسـەر قسـەی خۆی، خەلیل کار بۆ خۆی دەکات، نـەک بـۆ کۆمەڵە! گوتیان بۆ ئـەوەی تـۆ داوای بەرئەندامیت بۆ کراوە

و دەبــێ ڕەفتــار و ئەداوئەتواری بورژوازی لە خــۆت دوور بکەیتەوە، یاڵا بڕۆ بۆ بەردەســوور لە ســنووری عێراق و دروستکردنی زیندانی مەرکەزیــی کۆمەڵە. بۆ مراندن و لەناوبردنی خوڕەوشــتی بورژوازیی، هەرچی هاوارم کرد قەرارە حوســێنی برام لە ســویدەوە بگەڕێتەوە و لەمێژە نەمدیوە، با چەند ڕۆژ لەگەڵیدا بم و ئەو دەبێت زوو بگەڕێتەوە، فایدەی نەبوو، کە زانییان چاوەڕێی حوسێنم، ئەوەندەی تر داواکەمیان پێ بە ڕەوشتی بورژوازی بوو، گوتیان مادام وایە هەر دەبێت بچیت و ئەم شتانە لە خۆتدا بکوژی!

## ڕۆڵە بۆ وات لێ هاتووە؟

گەیشــتمە بەردەســوور، دارودەوەن و دارســتانی چــڕ و بــەردی زۆری سەرچەم و پڕ لە دارەگوێز، ئاسمان بەدیارەوە نەبوو، بە دەیان پێشــمەرگە و دیلی سەرباز و پاســدار خەریکی دیوار و دارەڕاکردن[1] بوون. زیاتر لە ٢٠٠٠ مەتر دەچووین بۆ سەر چەمەکە و بەردی گەورە و قورسمان بۆ دانانی دیوارەکان دێنا. هەمووممان کورتانی حەمباڵیمان بە کۆنەبەتانی و پووش و کا دروست کردبوو، بەردی سیچل کیلۆییمان بە هەوڕازییەکی ئەژنۆشکێن لە دەم چەمەکەوە دێنا بۆ سەرەوە، نازانم چەند مامەوە، بە ســێ یان چوار هەفتە زیندان دروســت کرا و گوتیان وەرە بــڕۆ، ئێســتا دەزانــی دەردی زەحمەتکێش چۆنــە! بەداخەوە، کە گەیشتمەوە ســابڵاغ حوسێن هاتبووەوە و گەڕابووشەوە بۆ سوید. کە دایکــم دەرگای لێ کردمــەوە بەبێ ئەوەی لە باوەشــم گرێ لە پرمەی گریانی دا و هاواری کرد ڕۆڵە بۆ وات لێ هاتووە؟ بە خۆم نەزانی بوو نیوە بووبووم ئەوەندە کێشــم دابەزیبوو، تەنیا پێســت و ئێسقانم پێوە مابوو، کەچی نیو ســەعات بەدیار ئەم دایکە دڵســۆز و شەمئاســایەوە دانەنیشــتم و یەکســەر چوومــەوە مەقەڕ بۆ ڕاپەڕاندنــی کار و ئەرکی کۆمەڵە. تازە ئەو ســەردەم ناگەڕێتەوە، بەڵام ئێســتا بە پیری و دوای

[1]- دارەڕا، داپۆشینی میچی خانوو بە کاریتە و چرپی و دەستەک.

دەیان ســاڵ هەموو کاتوســاتێک فرمێسکەکانی چل ســاڵ پێشی دایکم ئازارم دەدەن.

بەهمەنی مەلازادەی هاوڕێم پێشــتر باوکی لە ترســی ئەوەی دەبێتە پێشمەرگە، بەزۆری بۆ هیندوستانی بەڕێ کردبوو بۆ خوێندن، لەناکاو گەڕابووەوە و چەکی لە شــان کردبوو، لە بەردەرگای مەقەڕی کۆمەڵە چاوم پێی کەوت. باوەشــێکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی و برایانەمان بە یەکدا کرد.

– بۆ هاتییەوە و ئەوە چییە بە شانتەوە؟!

– «لــەو ڕۆژەوە ڕۆیشــتووم هیــچ ســاتوکاتێک نییــە بیرتــان لێ نەکەمەوە و خۆم ســەرکۆنە نەکەم بۆچی ئێوەم بەجێ هێشــت، شــەو و ڕۆژم لــە خــۆم حەرام کردبــوو، ئاخری تاقەتم نەهێنــا و گوتم چی دەبێ با ببێ، چیتر بە قسەی بابم لێرە بە حەسرەتی کوردستان و ئێوە چاوەڕێی مەرگی خۆم نابم، ئێســتاش ئەوە چەنــد ڕۆژە هاتوومەوە و وا دەزانــم تازە لەدایک دەبم»، ئیتر بە هاتنەوەی بەهمەن ئەوەندەی تر کۆڕی هاوڕێیانم خۆشتر بوو.

### کوا ئەم قوزەڵقوڕتە؟

ئێوارەیــەک لە بەردەرکی مەقەڕ، لە کۆڵانی پشــت تەربێت بەدەنیی ســابڵاغ، پڕ لە لایەنگر و دۆســت و هەوادار لەناکاو لە بن ســەنگەری بەردەرگا کەمال خۆی بە کارتۆنێکدا دا، فراندی و فڕێی دایە ناوەڕاستی کۆڵانەکە، دیار بوو لەوێ داندرابوو و جێیان هێشــتبوو، کەمال هەست دەکات بۆمبــە و هەر لە ڕێوە تەقی و هەموو کۆڵان و گەڕەکی لەرزاند و شووشــە پەنجــەرە هاتنــە خــوار، خوێــن و دووکەڵ تێکــەڵ بوون، سەرشێواوی و هاتوهاوار، چەند بریندار لە بەردەرگای مەقەڕ کەوتبوون، ئێمــە لەگــەڵ چەند هاوڕێیەکــدا چەند هەنگاو دوورتر بەدەم پیاســەوە قســەمان دەکرد، حوسێن ســوهەیلی، کەمال وەلیانی و یونس پاڵەوانی کەوتبوون و بریندار بوون. بە خوشییەوە دواتر لە خەستەخانە زانیمان

برینی هەموویان سووکە و تەنیا پەردەی گوێی حوسێن و کەمال دڕاوە و چاویـان بریندارە. سـولەیمان بللوری هەموویانـی بردە ماڵی مینەی خەیـات (قەلـەو) و لەوێ کێشـک و خزمەتگوزاریمان بـۆ دابین کردن. مـاوەی چەند ڕۆژ ئەمانە لە ماڵی مینە لەوپەڕی خزمەت و میهرەبانیی ژن و منداڵـی مینـەدا بوون، ئێـواران لەگەڵ سـولەیماندا دەچووین بۆ سەردانیان، کاک حوسێنم تووڕە دەکرد، بە هۆکاری ئەوەی بە دەنگەکە چاوی خوێنڕێژی کردبوو، دوکتۆر بەستبووی و هیچی نەدەدیت، منیش گاڵتەم لەگەڵدا دەکرد و لە پەنای دادەنیشـتم و شـۆرباو و نان و شـتم بە زارییەوە دەکرد، زاری دادەپچکڕی و منیش کەوچکەکەم وردەوردە دوور دەکـردەوە، ئەویـش بە زارداپچکڕاوی ملی دێنـا پێش و لەناکاو تـووڕە دەبـوو دەیگوت کوا ئەم قوزەڵقوڕتە؟! یان زۆر جار شـیرنی و قەنـدم دەزاری دەنـا لەناکاو قونچکەسـیغارێکم لەجیاتی قەند بۆ زاری دەبـرد، ئیتر دیـن و ئیمانی نەدەما و دەیگوت کوێرەی سـەگ ڕۆژێکم مابێـت بۆ تۆم ماوە، خۆ چاوم هەر دەکەنەوە تۆ ڕۆحی خۆت بۆ کوێ دەبـەی؟ یان لەگەڵ سـولەیمان، مینەمان عەزیـەت دەکرد و قدیلکەمان دەدا و گازمان لە ڕان و باسـکە نەرمەکەی دەگرت، مینە تووڕە دەبوو و پەلامـاری دەدایـن و هەڵدەهاتین. جارێکی سـولەیمان ئەوەندەی بە زللان لە تەختایی باسکی دا، سوور سووری کردەوە، مینە هەر قسەی نەکرد و سولەیمان هەر دەیگوت «دە وەرە گیانە» «دە وەرە با کەبابت لەم باسـکە نەرم و لووسـانەت بۆ سـاز کەم» هەر لێی دا و پێکەنی، بریندارەکانیـش لەوێ کەوتبوون و سـولەیمان هـەر وای دەکرد دڵیان خـۆش بێ و ئـازار فەرامۆش بکەن، لەناکاو مینـە دەرهەڵبوو، پڕی بە سـولەیماندا کرد و هەڵی هێنا و لەسـەر تەپڵی سـەریڕا بە عەرزیدا دا. خێزانی مینە سـولەیمانی زۆر خۆش دەویسـت، مینەی شـڕی جنێوان کـرد و مینە لە ماڵ چووە دەرەوە، کەچی سـولەیمان هەر پێدەکەنی و دەیگـوت «دە وەرە گیانە». ئەم چەند ڕۆژە پەرسـتاری و تیماری ئەم عەزیزانەم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە.

**لەجیاتی سەری، کلکیم بڕیبوو**

بە تاوانی بۆمبەکەی بەردەرکی مەقەڕ، کۆمەڵە چەند کەسێکی گرت و گوتی، دادگایی خەڵکیان دەکەین. ڕۆژێکیان ئیعلان کرد لە تەربێت بەدەنی هەموو خەڵک ئامادە بن بۆ بەشداری لە دادگا. ڕۆژی پێش، کۆمەڵە نامەیەکی دامێ و گوتی بچۆ بۆ بەردەسوور و ئەم نامەیە بەدە دەست مامۆستا ساڵە و زوو بگەڕێوە. لێی سواری لەندرۆڤێر بووم و بە تەنیا بەرەو سەردەشت و ئاغەلان چووم، هاوڕێیانی کۆمەڵە لە مەقەڕی ئاغەلان گوتیان تۆ ماندوویت، بگەڕێوە ئێمە نامەکەی پێدەگەیەنین. مامۆستا ساڵە (کاک یەدەی بیگلەری) لە زیندانی بەردەسوور قازی کۆمەڵە بوو، منیان ناردبوو بۆ ڕۆژی دادگای خەڵکی ئەو تاوانبارانە، بیهێنم بۆ مەهاباد. من خراپ حاڵی بووم و پێم وا بوو تەنیا دەبێت نامەکە بگەیەنم و ئەو خۆی دێت. لە ئاغەلانەوە بۆ بەردەسوور زیاتر لە دوو سەعات ڕێ بوو بە پێیان و ماشێن نەدەچوو. کە هاوڕێیانی مقەر گوتیان، ئێمە نامەکە دەگەیەنین، لە خۆشیی بە هەورازدا هەڵنەگەڕان، یەکسەر گەڕامەوە. چوومە مەقەڕ لە شار و گوتیان ئەدی کوا مامۆستا ساڵە؟! گوتم نازانم من نامەکەم گەیاند، ئیتر شێت بوون و گوتیان سبەی دەبێت لێرە بێت، تۆ چۆن نەوەستاویت تا لە بەردەسوور دێتە خوار و لەگەڵ خۆتدا بیهێنیت؟! زۆریان سەرکۆنە کردم و شکاندمیان، زیاتر لە حەوت بۆ هەشت سەعات بە تاقی تەنیا ماشێنم ئاژۆتبوو، هەمووی جادەی خوڵ و پڕ لە گەردەنە و زینوو. من دەمزانی ئەو بەرپرسە منی خراپ حاڵی کرد و تەنیا گوتی، ئەم نامەیە بەرە بۆ بەردە سوور، بەڵام ئیتر هەر وایە مەسئوول غەڵەت ناکات و دەبێت خەتاکانی بەسەر خوارەوەی خۆیدا بێنێت. لەداخان بوغز گرتمی، ئێوارە بوو خەڵکی زۆر لە مەقەڕی سابلاغ بوون، گوتم ئەوەی ناوێ و دەگەڕێمەوە و بەیانی مامۆستا ساڵە لێرە دەبێت! کاک حامیدی مایلی دۆست و نزیکی کۆمەڵە بوو لەوێ بوو، گوتی من لەگەڵیدا دەچم، عەلی زۆر ماندووە. زۆرم

پـێ خۆش بوو، سـولەیمان بللوریش لـەوێ بوو گوتی دیم، سـێقوڵی سـواری لەندرۆڤێر بوویـن و بەرەو جادەی سەردەشـت، کاک حامید دیتی چاوەکانم هەڵنایەن، گوتی، عەلی من لێدەخورم، تۆ زۆر ماندووی. لەگەڵ سـولەیماندا لە پێشـەوە کردیان بە قسـەی خۆش و فشـقیات و منیش لە دواوە لەسـەر چوار کورسـی بۆی پاڵکەوتم و لەگەڵ هەموو هەڵبـەز و دابـەزی جـادە و خۆڵ و سـووڕان بـە دەوری گەردەنەدا، زرەخـەو دەیبردمەوە و وەنـەوزم دەدا. لە زمزیـران هاتبووینە خوار لـە تەختایی بەرەو ڕەبەت بووین، لەناکاو سـتۆپێکی زۆر قایمی گرت، ڕاچڵەکیم و بە پێشدا کەوتم، کاک حامید گوتی، عەلی غاردە خەنجەرت پێیـە، کەروێشـک بوو با مردار نەبێتەوە سـەری ببـڕە، بە خەواڵوویی دەرگام کردەوە و هاتمە پێشـی سـەیارەکە، هەمـوو وڵات تاریک بوو، بە شـۆقی کزی سەیارەکە کەروێشـکم بینی لەسەر جادەکە بەس زۆر ڕوون نەبـوو، هەرچۆنێک بێ سـەرنێزەی کلاشـینکۆفەکەم دەرهێنا و لـە کەروێشـکم قایم کـرد و بڕیم، هاتمەوە سـەر و کەروێشـکم هێنا، سـولەیمان گوتی ئێسـتا دەگەینە مەقەڕی ڕەبەت دەیدەم بە کوڕەکانی مەقەڕ و ژەمەگۆشـتێکی باشـە بۆیـان. لە بـەردەگای مەقەڕی ڕەبەت ڕامانگرت و سـولەیمان بە زبانەکەی خۆی «چۆنن گیانە وەرن گۆشتم بۆتان هێناوە و لێیدەن لەم گۆشتە ناسکە» کەروێشکی لە بن قاچەکانی من هێنادەر و لەبەر شۆقی گڵۆپەکانی مەقەڕ هەڵیهێنا، هاواری لێ بڵیند بوو: هەتیوە کوێرە ئەوە چت کردووە؟! دیم لەجیاتی سەری کەروێشک، ڕێـک کلکیـم بڕیبـوو! ئیتر بوو بە بـەزم و فشـەی ماوەیەکی درێژ بۆ هەموو کوڕەکان و ئەوەندەی تر «عەلی کوێر»م بەسەردا سەپا.

گەیشـتینە ئاغەڵان، شـەو درەنگی کردبوو، یەک لە پێشمەرگەکانی مەقەڕ پێشـمان کەوت، بـە تاریکی و هەورازدا زیاتر لە دوو سـەعات ڕۆیشـتین و چووینـە مەقـەڕی زیندان لـە بەردەسـوور. کاک یەدەی بیگەریمان ساز کرد و بەم نیوەشەوە لەگەڵ خۆمان هێنا. بەری بەیانی هەر چوار گەیشتینەوە مەقەڕی سابلاغ. دەبوو سەعات سێ و چوار لە

هەوای ئازاد و لە حەوشەی تەربێت بەدەنی دادگای خەڵک بۆ تاوانباران بەڕێوە بچێت.

**ڕجای دایکی کاک سولەیمان و خانەی موعینی**

هەموو جادەی مەقەڕ و شوێنی دادگامان (جادەی پشقلا) تا دەگەیشتەوە مەیدانی مەلا جامی گرتبوو و پێشمەرگەی لێ دامەزرابوو، بە سەدان خەڵک لەم حەوشەیە کۆ بووبوونەوە، لە باڵکۆنی سەرەوە کاک یەدە وەک حاکم و چەند پێشمەرگە و تاوانبار و بەرپرسانی کۆمەڵە وەستابوون. هاتن گوتیان چەند پێشمەرگەی حیزب چەند جارمان پێ گوتوون ئەم جادەیە جارێ بەستراوە بێرەدا هاتوچۆ مەکەن جواب نادەنەوە و گاڵتە بە پێشمەرگەکان دەکەن و جڕتیان بۆ لێ دەدەن، لەگەڵ ڕەحیم قادریدا چووینە سەر جادەکە و وەستاین، بە سواری جیبێکی سەرئاوەڵە محەمەد زەنگەنە، زێنەبە ڕەش و عەبووی عیمادی بە خێرایی ویستیان تێپەڕن، بە میل هێنانەوە بۆیان دامەزراین و بەرەو مەیدانی مەلا جامی لە جیبەکە هاتنە خوار و دەستیان کرد بە میلهێنانەوە و جنێو و هەڕەشە، گوتیان ئێوە هیچ کارە نین لە شار و بۆتان نییە جادە بگرن. لێرە ئێمە دەسەلاتین و لەم قسانە، دیار بوو هەر لە پێشەوە هاتبوون دادگاکە تێک بدەن و بۆ شەڕ هاتبوون. من و چەند پێشمەرگە چووینە ناو جۆگەی قەراغ جادە و سەنگەرمان لێ گرتن، ڕەحیم سینگی هێنا پێش و چوو بۆ لایان، هەرچی هاوارم کرد ڕەحیم نەکەی ئەوانە بۆ ئەوەی نابن بە قسە حاڵی نابن، فایدەی نەبوو، ڕەحیم کەوتە ناویان و دەیویست لەم ساتوکاتەدا بە میهرەبانیی خۆی، تێیان بگەیەنێت و بڵێ شەڕ خراپە و لەم قسانە، ڕۆڵە گیان ڕۆڵە گیانی ڕەحیم هیچ گوێی نەبزواندن و یەکسەر گرتیان و بە مست و شەق تفەنگیان لێ کردەوە. ویستمان پەلاماریان بدەین و بە تەقەکردن ڕەحیم و تفەنگەکەی وەرگرینەوە، کەچی بەبێ تفەنگ ڕەحیمیان لە سەر جادەکەی مەیدانی مەلا جامی بەجێ هێشت و بۆی دەرچوون. دادگا

بە سـەرکەوتوویی، بە ڕجای دایکی کاک سـولەیمان و خانەی موعینی حوکمی ئیعدامی نەدا و تاوانباریان ڕەوانەی زیندان کرد. دوای دادگاکە کاتی شـەو، سـیامەند کە زۆربەی پێشـمەرگەکانی دیموکرات زۆریان حورمەت دەگرت، بە تایبەت کوڕەکەی شەهید مەلا محموودی زەنگەنە کـە هاوخەبات و پێشـمەرگەی کاک سـولەیمانی موعینیی باوکی بوو، چـوو بۆ لایان و تفەنگی ڕەحیمی هێناوە. ئەمە یەکەم جار و ئاخر جار نەبوو ورکەشـەڕ و پێکهەڵپڕژان لە نێوان کۆمەڵە و دیموکراتدا ڕووی دەدا لەسەر حاکمییەت.

## ٢١

### تاران و ئەرکی نهێنی

چەنـد مانگێک بـوو مەقەڕی کۆمەڵەمـان لە مەهابـاد کردبووەوە، ڕۆژێـک دوکتـۆر جەعفـەر گوتی، عەلی دەڵێی چی خـۆت بگۆڕی و تا تـاران بچیـت بۆ کارێکـی زۆر پێویسـت؟ گوتم تاران چـووم زووتر، بەڵام زۆر شـارەزا نیم. گوتی دێن بەدواتدا هەر کە گەیشتی هاوڕێیانی کۆمەڵـە لە تاران دێن و وردەکاریی ئیشـەکەت پـێ دەڵێن. من کۆمەڵە بـووم و بۆ هەر کار و ناردنی شـوێنێک، ناگوتنم نەبوو. بەڵێ، ئامادەم و چـۆن و کـەی بڕۆم؟ گوتی، سـازمانێک وەک کۆمەڵەی خۆمان و بە هەمان بیروباوەڕ هەیە لە ئەفغانسـتان، ناویان «ئەخگەر»ە، تۆ دەبێت لە ڕێی هاوڕێیانی تارانەوە بچی و پەیوەندی دروست بکەیت و یەکیان بێنە بۆ کوردستان با لێیان نزیک بینەوە. عەقڵم نەیدەبڕی بچم بۆ تاران و لەوێشـڕا بۆ ئەفغانسـتان و ئەم سازمانە بێنم بۆ لای خۆمان، بەڵام گوتم بە چاوان و سـاز بووم بڕۆم. خۆم گۆڕی و وەک لاوێکی پۆشتە و جوان سـواری پاسـی تـاران بـووم، نەدەبوو کەس پێـم بزانێت. وا داندرابوو لە تاران لە مەیدانی ئازادی (شـەهیادی جاران) چاوەڕێ بم، کاک ئیقبالێک دێ بە ماتۆڕسیکلێت، دوای ئەدای وشەی نهێنی نێوانمان، لەگەڵیـدا بـڕۆم. گەیشـتم و خـۆم گەیانـدە مەیدانی شـەهیاد و زۆرم چاوەچاو کرد و کەس نەهات، وردەوردە ترس و وەڕەزی بەسـەرمدا زاڵ دەبـوو، لەناکاو ماتۆڕێک بە سـەریعی هات و لـە بن پێم ڕایگرت، ناوە نهێنییەکەی درکاند و لە پشـت خۆی سـواری کردم، وەک فیشەک لە نێوان ئەو هەموو ماشێن و ماتۆڕانە دەڕۆیشت و ڕۆحم سپاردبوو. دوای ماوەیـەک لە بـەردەرگای نەخۆشـخانەیەکی گـەورە ڕایگرت و دەسـتی بە قسـە کرد، تێگەیشتم ئەمە ئیقبال نییە و کاتی هاتنی بۆ لای

مــن، ئیقبال لە ماتۆڕ کەوتووە و قاچی شــکاوە. دواتــر بە پەلە ئەویان ناردووە، ئەم درەنگهاتنەش هۆکاری شکانی قاچی کاک ئیقباڵ بووە.

چووینە ناو نەخۆشخانە و لە ژوورێک دیم ئەوە کەسێک کە هەرگیز نەمبینیبوو بە قاچێکی هەتا ڕان لە گەچگیراو لەســەر تەختێک ڕاکشاوە و بە دیتنی من ویســتی خۆی تەکاندا، چوومە پێش و ماچم کرد، گوتی هاوڕێ عەلی زۆر ببوورە، چاوەڕێی ئەم ڕووداوەم نەدەکرد. ئەم کارەی بــۆی هاتوویــت بە هۆی ئەم حاڵەتەوە مومکیــن نییە ئەنجامی بدەین و دەبــوو خۆم هاتبام لەگەڵتدا و تا ســنوور بەڕێــم کردبایت. ئیتر لەگەڵ ئەمــە هیــچ نەدەکرا و منیــش وەک کەڕ و لاڵ دەبوو گــوێ بە فەرمان بــم، هەرچەند بەدڵ پێم خۆش بوو ئــەم خەیاڵ پلاوەی لەمەڕ گرووپی ئەخگەر ســەری نەگرت و بە خۆشییەوە دەگەڕێمەوە ولات. هاوڕێیانی کۆمەڵــە لــە ســەرەوە ئەوەندە خۆیان لــە باری نــەزەری و تیۆری بە ماڵوێران و نەزان دەزانی دەســتیان بۆ هەر پووشــێک دەبرد. ســەیری ئەم گێژاوی فکرییە بکەن؛ لە مەهابادەوە جلی پێشمەرگایەتی بە لاوێکی بێئەزمــوون و ناکامڵــی وەک من دابنێی و ڕەوانەی تاران و ســنوور و ئەفغانســتانی بکەیت تەنیا گۆیا کۆمەڵێک هەیە وەک ئێمە بیر دەکەنەوە و دژی سۆڤییەت و لایەنگری مائو و خەباتی چەکدارین لە ئەفغانستان، تەواوی مەعلومات و زانیاریی کۆمەڵە لە ســەریان تەنیا بلاوکراوەیەک بــوو بە ناوی ئەخگەر. ئاخریەکەشــی هەر بە هــۆی ئاتاجی[1] تیۆری و خۆبەکەمزانین لە ئاســت ڕۆشنبیرانی نەتەوەی فارس، خۆیان تەسلیمی تەڵەی مەرگی مەنســوور حیکمەت کــرد، کۆمەڵەیەک کە خۆی یەک لە دەسەلات و حیزبە گەورەکانی کوردستان بوو، هات و لە هیچوخۆڕایی پەتای پۆپۆلیزم و لاوازی تیۆری گرتی و هەرچی بەرووبوومی پێشمەرگە فیداکارەکانی بوو، دوو دەستی هەر زۆر بە بەلاش و حەلاش تەسلیمی مەنســووری حیکمەت و جەماعەتێکی ســێ چوار کەســی، کە ئەوانیش هاوســەر و بــرای بــوون، کــرد و لە ماوەیەکــی چەند ســاڵێدا کۆمەڵە

١- ئاتاج، ئاتاجی، هەژاری و نەداری.

وردوخاش کرا و هەر کوتەی بە دەست کەسێکەوە، ئێستاش سەودا و مامەڵەی پێوە دەکرێت.

## پلانی تاڵانکردنی بانک

دوای ئەم سەفەرە کورت و بێئەنجامە گەڕامەوە و گوتیان دەبێت بە زوویی بچیتەوە بۆ تاران، ئەو جارە لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێی زۆر خۆشەویستی خۆمدا، وەک شەهیدان کەمال وەلیانی، یونس پاڵەوانی، ئەحمەد خاکی (ئەلفیدە) و هەمزەی چابووک، ئەوەیان بە خۆشییەوە ماوە، قەرار بوو زۆر بە نهێنی هاوڕێیانی تاران چەک و کەرەسەمان بۆ دابین بکەن و ئێمەش ئەو شەش کەسە بانکێک کە هاوڕێیانی تاران دەستنیشانیان کردبوو، تاڵان بکەین و بیگرین. کۆمەڵە زۆر بە خێرایی گەورە بووبوو، هەر دەهات و پێشمەرگەی زیاد دەبوو، لە باری ماڵی و چەک و تفاقەوە زۆر لە قەیراندا بووین و بە قەوارە و گەورەیی، خۆمان لە قەرەی حیزبی دیموکرات دەدا، بەڵام زۆر بێپارە و ئیمکانات بووین، لە لایەکی دییەوە دەمانزانی بە زوویی سەردەمی دانوستان تەواو دەبێت و تاران دەست بە شەڕ دەکاتەوە و بەم حاڵەش کە لە هیچ کوێ و وڵاتییەکەوە پشتیوانی و یارمەتی ناکرێین، بۆمان تا سەر ناڕوات. حیزبی دیموکرات ئەم موشکیلانەی نەبوو، بە ئازادی و بە کەیفی خۆی یارمەتیی لە عێراق وەردەگرت و تفەنگ و فیشەک و ئەرزاقیان بە پایفیلان هەبوو، تەنانەت ئەوان مووچەی پێشمەرگەیان دەدا، بەڵام ئێمە نە تەنیا هیچیان پێ نەدەداین، بەڵکو ئەوەی دایک و بابەکانیش بۆیان دەناردین، لەگەڵ کۆمەڵەدا بەشمان دەکرد. ئەو جارە چوونی تاران و لەگەڵ ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەم زۆر پێ خۆش بوو، پەلەم بوو کەی دەڕۆین و دڵنیا بووم بە دەیان ملیۆن تمەن دەگەڕێینەوە.

ئێمە هەموو لە خۆئامادەکردندا بووین و چاوەڕێی هاوڕێیانی تاران بووین وەڕێکەوین، ڕووداوی ستوونەکە لە دەروازەی سابڵاغ قەوما. هەر وەک پێشتر گوتم، حیزبی توودە و کۆنگرە چوارییەکانی حیزبی

دیموکــرات زۆریان لەســەر من بــە قەولی خۆیان ئیفشــاگەری کرد و ڕۆژنامــەی «مردم» ئۆرگانی حیزبی توده بە پێشــمەرگەی ئاژاوەچیی کۆمەڵــە، بە ناوی خۆمەوە ناوی بردم و نووســیبووی بە زۆری چەک خوێندکاری بردووەتە ســەر جادە. لاوان و لایەنگرانی ســەر بە حیزبی توده لە ســابڵاغ بە بەربڵاوی گەورەنووســینیان بــۆ کردبوو، لە دار و دیواریان دابوو.

دوو ســێ ڕۆژ دوای ئــەم ڕووداوە کۆیان کردینەوە و گوتیان ئیتر عەلی نابێت بچێت و ناســراوە. لە حەســرەت و دڵپڕبوونم وەک ئەوەی بە دوو کەس دەســت بخەنە ملم و گەرووم ڕێک گوشــن، هەر ئەوەندە بوو لەبەر عەیبە و گاڵتەی هاوڕێیان نەدەگریام، وام دەزانی گەورەترین زوڵمــم لێ دەکەن، زۆرم هــاوار کرد خۆ ئێمە بە نهێنی دەچین و کەس نازانێت و نامانناسن، فایدەی نەبوو. بڕیار درابوو لە ترسی تودەییەکانی سابڵاغ، کە زۆر هاتوچۆی تارانیان دەکرد، من نەچم و نەبمە مەترسی بۆ سەر ئەم چالاکییە و هاوڕێیان.

پاش چەند ڕۆژ خەبەر هات هەموو هاوڕێیان لە ماڵێکی تەشــکیلات لــە تــاران گیــراون و لە زیندانن. هەمــوو زۆر نیگــەران بووین و دڵنیا بووین بە زوویی ئیعدام دەکرێن و هەر هەموو بە چەکەوە لەناو تاران گیرابوون.

ئەو کارەســاتە بەوە تەواو بوو دوای گیرانەوەی شارەکان و دوایی هاتن بە فەترەی دانوستان، شەڕی قورس و گران لە جادەی سەردەشت-بانە و بەدیلگیرانی چەندین پلەباڵای ئەرتەش لە ئاخری هاوینی ١٩٨٠دا، دواتــر لە بەهــاری ١٩٨١دا حکومەت ڕازی بوو گۆڕینەوەی دیلەکانمان لەگەڵــدا بکات، بە سەرپەرشــتیی دوکتۆر جەعفــەر چووین و لە نێوان بۆکان و ســەقزدا، لەمبەر و ئەوبەری چەمێــک دانە بە دانە دیلەکانمان گۆڕییــەوە و بــە بینینــی ئــەم عەزیزانە بوو بە شــادی و خۆشــی، کە بەڕاست لە مەرگ و ئیعدام ڕزگاریان بووبوو.

**خەسڵەتەکانی شۆڕشگێڕ**

دڵڕەقــی و ئاوڕنەدانــەوەم لە دایک و باب و خوشــک و برایان لەو مــاوە هەشــت نۆ مانگەی ناو شــارمان، جیا لە ســووکی و هەرزەگیی فیکری چیی تر نەبوو. دایکم بە حەسرەت بوو بچمەوە ماڵ و جەمێکی نــان لــە لا بخۆم، لە باوەشــم بگرێت و تێرتێر بۆنم پێــوە بکات. باوکم مرازی شەڕەقســە و فشــقیات و پڕبەگیرفانیداکردنی لێم هەبوو، کاکم بــە ئاوات بــوو وەک جاری جاران دیســان ئێوارەیەک لە قەراغ شــار پیاڵەیەکی لەگەڵدا فڕ بکەم و بەزمی گۆرانی و مەجلیســی خواردنەوەم بــۆ دانێت، ئەدی نەرمینی جوانەمــەرگ چەندی مەراقی بوو، وەک کچە شۆڕشــگێڕێکی پێگەیشــتووی تازە و جوان حیسێبێکی بۆ بکەم و هیچ نەبێ جاربەجار دەســتی بە ســەردا بێنم و باسی ئەو هەموو سەفەر و هاتوچۆی پێشــمەرگانەی خۆمی بۆ بکەم و بۆ جارێکیش بێت لە خەڵک نەیبســتێت و خۆم بۆی باس بکەم. نیشانی بدەم، ئەوەتا منیش دەیبینم و هەســت بە هەموو هەســتەکانی کۆمەڵایەتی و دەروونیی ئەو دەکەم. نەرمیــن لە نێوان چوار بۆ پێنج ســاڵ لە من منداڵتــر بوو، تەبیعی بوو ســەرنجی بۆ لای کوڕگەلی هاوتەمەنی من ڕاکێشــرێت، ئەو بە عادەتی کۆمەڵگەی ئەوکات دەبوو وەک بنەماڵە و براکانی سیاسی و شۆڕشگێڕ بێت و حەتمەنیش کۆمەڵە، ڕێک هەر واش بوو. بێچارە نەیدیت جارێک دەســتی بگــرم و ببیــەم بۆ گەڕانی ناوشــار و لەگەڵ خۆمــدا ببیەم بۆ مەقەڕ. بە گشتی ئەو شتانە هەر باو نەبوون و بە تایبەتتر لە لای منیش نــە عەقڵم پێی دەشــکا و نە چاوەکانم ئەوانــەی دەدیت. هەر نەیدیت بە دڵی خۆی و بە گەرمی باوەشم پێدا بگرێت و منیش بە سۆزەوە دەست بە پرچ و قژیدا بێنم و لە ســەر ســینگم هەناسە ساردەکانی بلاوێنمەوە و فرمێســکی خوشــکانەی بە کراســە ئارەقاوی و بۆگەنەکەی خۆم، بۆ وشــک بکەمەوە. من دەبوو وا بم، دایک، باب، خوشک، برا، کەسوکار و خزم، ئیهمال بکەم و ئاوڕیان وێ نەدەم. ئاخر من شۆڕشــگێڕ بووم و ئەم شــتانە هەموو عادات و فەرهەنگی بۆرژوازی بوون و دەبوو ئێمە،

«خەسڵەتە پیسەکانی بۆرژوازی» لە خۆمان دوور بکەینەوە! دەبوو ئەو شۆڕشگێڕە بم کە لینین لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا «شۆڕشگێڕانی حیرفەیی» باسیان دەکات. پێوانەکە ئەوە بوو؛ هەرچەند بێهەستتر، بێوەفاتر، ڕەقتر، بێعاتفەتر، پیستر، تووڕە و مۆنتر، قیرسیچمەتر، نەترستر و دوورکەوتنەوە لە بنەماڵە و گوێپێنەدانیان بای، ئەوەندەش شۆڕشگێڕتر دەبوویت.

## بوون بە بەرئەندام

پێش ڕۆیشتنیان بۆ تاران، من و کەمال وەلیانی و یونس پاڵەوانی و یەک دوویەکی تریان لە ماڵێک لە مەهاباد کۆ کردینەوە و شەرەفی گەورە و چاوەڕواننەکراوی بەرئەندامی (واتا جاریٚ ماومانە بۆ بوون بە ئەندام) یان، پێبەخشین. لە هەموو ناوچەی سابڵاغ تەنیا یەک دوو ئەندام و چەند بەرئەندامێک هەبوون، کە بە پەنجەی دەستێک دەژمێردران. مەجلیسێکی خۆفهێنەر و دڵەکوتە بە هەموومانەوە دیار بوو، بەرپرسی ناوچەی سابڵاغ سەید دەستی پیٚ کرد، خۆی فەلاح و گۆیا بووبوو بۆ کۆلکەوەستای دیوار لە زەمانی شا و لە ژێردەستی کاک حەمەحوسێن کەریمیدا کاری کردووە و هەر ئەویش لە سەروبەندی ڕووخانی شا یان کەمێک دواتر، کردوویەتی بە کۆمەڵە. تازە فێری نامەخوێندنەوە و نووسین دەبوو. گوتی، دەبێت پێش بوون بە بەرئەندامی هەمووتان بە سەرە دەست بکەن بە «ئینقلابی دەروونی»! ئەمە چەمکێک بوو لە ئەدەبیاتی لینین و ستالینەوە کۆمۆنیستەکان هێنابوویان، بەو واتایە دەبێت لەناو دەروونی خۆتەوە دەست پیٚ بکەیت و بە بێڕەحمانەترین شێوە خۆت سەرکۆنە بکەیت و ڕەخنە لە ڕابردووی خۆت و کردەوە قێزەونەکانت بگریت و بە تەواوەتی خۆت لە هەموو کردەوە و ڕەوشتی بۆرژوازی پاک بکەیتەوە. ئەوەش وای لیٚ هاتبوو هەرچەند دڵڕەقتر بیت، بەرامبەر خۆت و زۆرتر لە ڕابردووی خۆت ڕەخنە بگریت، زۆرتر جێی متمانە و شۆڕشگێڕتریت. ئەم بەرئەندام بوونە و کۆبوونەوەی

«ئینقلابـی دەروونی» ئێمەی ئەم سـێ چوار کەسـە، دەیان سـەعاتی خایاند. بۆ ئەو بەرپرسـەی ئێمەی هەڵدەسـەنگاند، کە هەرگیز بیریشی لـەوە نەدەکردەوە کوڕە جوان و دەوڵەمەنـد و خوێندەوار و بنەماڵەی ناسراوی شـار، لەسەر ئەژنۆ بەرامبەری دانیشـین وەک مەسیحییەک بەرامبەر قەشـە دەست بکەین بە ئیعترافات، زۆرتر لەزەت و ڕابواردن بـوو بـۆی تاکـو ئەرکـی حیزبـی و شۆڕشـگێڕانە. حـەزی دەکرد بە سـەعات هەر کام لە ئێمە باسـی تایبەتیترین و نهێنیترین شتی خۆمان و بنەماڵەمان بکەین و لەناو ئەم کوڕەدا و لای ئەو، خۆمان وردوخاش بکەیـن. هەر واشـمان کـرد. ئـەو پرسـیارگەلی زۆر ورد و تایبەت بە ژیانی تاکی ئێمەی دەورووژاند و کەیفی پێ دەکرد، سەیر بوو زۆربەی پرسـیار و سـەرنجەکانی لە دەوری سـێکس و پەیوەندیی کچ و کوڕ دەخولانەوە، کەی یەکەم جار هەستت بە ناوگەڵی خۆتان کرد؟ هەرگیز بینیت باوکتان لە کاتی جووتبوون لەگەڵ دایکتاندا؟ خۆت بە کەسـەوە ناوە؟ دایک و خوشـکتان بە ڕووتی دیوە؟ کەی فێری دەسـتپەڕ بوون و ئایـا ئێسـتا دەیکەن؟ لەگەڵ ژن و کچدا سێکسـتان کـردووە و گەر کردووتانە بە وردی بیگێڕنەوە. چوون بۆ قەحبەخانە؟ حەزلێکردوویی، نامەنووسـین، عەرەقخواردنـەوە، تـەوەری بەخالـەت و درۆکـردن، ترسـەنۆکی، خیانـەت بە هـاوڕێ و دزی و دەیان شـتی وردی دی بە سـەعات دەبوو باس بکرێن و هەر هەموو ئارەقەی شەرممان دەڕشت و کاکـی بەرپـرس فیکەی سـمێڵانی دەهـات. ئەوەی زۆرتـر و تۆختر باسـی خۆی کردبا، ئەوە زۆرتر شۆڕشـگێڕ بوو. لە بیرمە کەمال وا بە خەسـتی باسـی خۆی دەکرد، دڵنیا بووم ئەو وا نەبووە و درۆ دەکات. لـە نێوان کۆبوونەوەکاندا جارێک پێم گـوت کەمال بۆ وا دەکەیت، ئەم شـتانە بـۆ باس دەکەیت، خـۆ تۆ وا نەبوویت و تەمـاح لە کچە جیران و خۆگرتـن لە چوونی ئاودەسـت و ئەم شـتە قۆڕانـە. پیاوی چاک بە باسـی مەکە. کەچـی کەمال دەیگـوت، دەبێ بە بێڕەحمانەترین شـێوە ڕەخنـە لـە خۆمان بگریـن و غروور و کەسـایەتیی خۆمـان بەرامبەر

حیزب و ئایدیۆلۆژیای حیزبی تێکوپێک بشکێنین. کەمال لە هەموومان شۆڕشگێڕتر وەدەرکەوت. ئێستا بیری لێ دەکەمەوە، بە دەیان کەسی وەک شەهیدان خەلیل بللوریان، حوسێن سوهەیلی، ڕەحیم قادری، سولەیمان ڕەحیمی، ڕەحمان زاهیدی، سولەیمان بللوری، کەمال وەلیانی، یونس پاڵەوانی، جەمال موفتی، عەلی موهاجیری، بەهمەن مەلازادەگان، قاسم مام ڕەحیمی، سەعید گەوهەری، محەمەد سەبزەچی، ئەحمەد خاکی، جەعفەر پیرەهەڵۆ، ئەحمە شەعبانی و زۆری دیکە و بە دەیان زیندوو، هەر هەموو کوڕی شار و بنەماڵە و خوێندەوار و زانکۆچوو، دوکتۆر و موهەندیس و کارمەند، بۆچی پیاوێکی نەخۆشی ئۆقدەیی و ئۆمی[1] ئاوامان بە نێوی پرۆلیتار و ئینقلابی کردبووە بەرپرسی خۆمان و بە فەرمانی ئەو بەرەوپیری مەرگ دەچووین؟ تۆ بڵێی ئەو هۆکاری ئەم کارەساتە بوو، یان خودی خۆمان ڕێک کارەساتەکە بووین و ئەم داماوەشمان پەلکێش کردبوو؟!

## ئاساییبوونی سێکس بۆ بەرپرسان

چەند مانگ دواتر زانرا ئەم عەقڵگوندییە زۆر لەوە خراپتری لە کۆبوونەوەی کچانی ناوشار کردووە، مەسئوولبوونی خۆی بەکار هێناوە بۆ لەڕێبەدەرکردنی چەند لە کچانی ڕێکخستنەکانی ناوشاری کۆمەڵە و بەکاری هێناون بۆ دامرکاندنی حەزە گڵاو و بێشەرمانەکانی خۆی، بە ناوی ڕەخنەلەخۆ و «ئینقلابی دەروونی»، هەموویانی بە ڕیز داناوە و خۆی لە لای سەرەوە وەک سەرۆک و بەرپرس بە سەعات قسەی پێ کردوون، بە نێوی «خۆئامادەکردن بۆ کادری پێشکەوتوو و حیرفەیی» و دابڕان لە هەموو گیرۆدەیی و بەندوباو، قەناعەتی پێ کردوون بە ئاساییبوونی سێکس و جووتبوون. دەبێت بڵێم ئەم کچانە زۆربەی هەرە زۆریان زۆر جەوان و تازەپێگەیشتوو بوون و هەموویان لە پۆلی ئامادەیی و دەبیرستاندا بوون، ئەوان بەرپرسی کۆمەڵەیان وەک

---

١- ئۆمی، نەخوێندەوار و بێسەواد.

پێغەمبەر و قسەکانیان وەک ئایەت و فەرمایشـاتی ئاسمان دەدەیت، چووبـووە مێشـکیانەوە ئەم کردەوانـەی بەرپـرس و ئەندامی کۆمەڵە جێی مشـتومڕ نین و وەک فیداییەکانی حەسـەن سـەباح دەبێت قبووڵ و جێبەجێ بکرێن. دانیشـتبوون لەژێر ناوی کۆبوونەوە و ڕەخنەلەخۆ، وردورد هەرچی کەلێن و قوژبنی زۆر تایبەتی ژیانی کچێنی و جەوانیی خۆیان لە نیگاهـ و نامەگۆڕینەوە هەتا ماچ و سێکسیان بۆ باس کردبوو، کاکی مەسـئوول دەسـت لە ناو گەڵ، پەتی داوی بۆ شـل کردبوون و هەر وەدوای دابوون و دەی دەی دواتر... چ بوو... باسـی بکە و شەرم مەکـە...، دانـە بە دانە هەڵیسـەنگاندبوون و دواتر پـاش کۆبوونەوە بە یەکیانی گوتووە تۆ جارێ بمێنەوە کارێکی تەشکیلاتی هەیە دەبێت باسی بکەین، کە دیوێتی شـەرم دەکات و بەرەنـگاری ناکات، پێی داکەندووە و ئامـادەی کردووە بۆ بەئەندامبوون! چەنـد جار براژنی خودی کاکی بەرپرس لە ژوورەکەی دیکەوە ئەم شـتانەی دیوە و نەیوێراوە باسـی بکات، چونکێ یەکسـەر کۆمەڵە دەیگوت شـتی وا مەحاڵە و بۆی سـاز دەکەن. ئەندامی سـەرکردایەتیی کۆمەڵە شـتی وا ناکات! کارەسات ئەو کاتە بوو کۆمەڵێک لەم دایک و بابانە بە پیری دەگیرێن و بۆ سنووری ئەفغانسـتان، یان دامغان دوور دەخرێنەوە، یەک لە دایکەکان بە نهێنی دەگەڕێتـەوە بۆ ناوچەی مەهاباد بۆ سـەردانی کوڕەکانـی، لەناکاو لە مەقەڕەکانی کۆمەڵە ئەم داستانە دەبیستێ و دەچێتەوە بۆ هەموو دایک و بـاب و زیندانییەکانـی دامغانی بـاس دەکات! بزانە کەسـێک بابێکی کوردەواریـی ئەوسـا بێت، کچی لـە زیندانی ئاخونـدان بێت و ئەمەش ببیستێت، دەبێ حەتمەن سەکتەی کردبێت!

بە خۆشـییەوە دوای یەک دوو مانگ لە دەسـپێکی دووبارەی شەڕ و هاتنە دەری بەشـێک لەم کچانە بۆ شـاخ، بوێری و ئازایەتیی یەک لە کچەکان، ئەم گەندەڵەیان لە قاو دا و ڕەوانەی زیندانی کۆمەڵە کرا، بەڵام برینێکی لە جەسـتەی چەند لەم کچانە جێ هێشتووە، ئێستاشی لەگەڵدا بێـت تیمار نابێتەوە و زۆربەی کچەکانی فیداکار و سـالم و دڵسـۆزی

ئەوکاتی کۆمەڵە تووشی مایەپووچی و خەمۆکی هاتن. هەر ئەوکات لە زیندانــی ڕەزاییــە کە چەند لە کچەکانی کۆمەڵە بەند بوون، بە بیســتنی ئەم کارەســات و گیرانی کاک ســەید و قەومانی ڕووداوی وا، ئەویش لەناو کۆمەڵەدا، تووشــی نەخۆشــی و نائومێدی بووبوون لە خەبات و تێکۆشان و تەنانەت خۆڕاگری بەرامبەر جەللادەکانی زیندان و کۆماری ئیسلامی.

# ٢٢

### ئامادەکاری بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ

ئیتر لە بەهار و هاوینی ١٩٨٠دا، پەڵپگرتن و شـــەڕ، شـــار بە شار و یەک بەدوای یەکدا دەســـتی پێ کرد، «فەرمایشـــاتی» خومەینی لەمەڕ مەزلوومییەت و بە ئاشـــتی چارەســـەرکردنی کێشەی کوردستان، هەر ئـــەم چەند مانگـــەی خایاند، تاکو ســـەرانی کۆماری ئیســـلامی ناوماڵی خۆیان هەڵوەژارد و پاکوپیسی ناوخۆیان کرد. ئەوجار ئامادە بوون بۆ بەرەنـــگاری و لەناوبردنی «کوفار» و «زیـــددی ئینقلاب» کە نازناوی ئێمەی کورد بوو.

لە یەکەم مانگی بەهارەوە لە ســـەقز و ســـنە و مەریوان و بانە یەک بـــەدوای یەکدا شـــارەکان کەوتنە بـــەر تۆپباران و خۆمپـــارەی پادگان و مۆڵگەکانـــی ئەرتەش و پاســـدار. ئـــەوان بەوپـــەڕی بێبەزەیی تۆپ و هاوەنیان دەگرتە ناو گەڕەکەکانی شار، بەبێ ئەوەی منداڵ و ژن و پیر بپارێزن، ڕۆژانە سەدان بریندار و شەهید لە خەڵکی بێتاوانی شارەکان دەکەوتنـــەوە. زۆربـــەی شـــارەکان ســـیمای کۆنەکـــەلاوە و ڕووخاو و وێرانەیـــان گرتبـــوو. نەبوونی ئـــاو، کارەبا، خـــواردن و دەرمان چۆکی بە شـــارەکان دادابوو. باقیی شـــار و ناوچەکانی کوردستان بە هەزاران ئـــاوارەی تێدابوو، بـــە دەیان ژێرزەمین لەم شـــارە وێرانانەدا کرابوونە نەخۆشـــخانە و بە ســـەدان کـــوڕ و کچی خۆبەخش شـــەووڕۆژ کاری پەرســـتاری و تیمـــاری برینداراتیـــان دەکرد. بە دەیان هـــەزار تەلیس[1] لە چەو و لم پڕ کرابوون، ســـەنگەریان پـــێ لێ درابوو، تاقە پارچەیەک شووشەت بە ساغی بە دەرک و پەنجەرانەوە نەدەدیت. خەڵک بە گشتی و بـــە پانەوە لەگەڵ پێشـــمەرگە بەرگریی دەکرد و بەتەمای پاراســـتنی

---

١- تەلیس، گوونی، گۆنی، گوێنی.

شـــارەکانیان بـــوون. زۆر بوون پیـــاوە ماقووڵ و ئایینـــی و فەرهەنگی شـــارەکان چوون و حەولی زۆریان دا لەگەڵ تاراندا، بەڵکو دەســـت لە کاولکاریی شـــارەکان هەڵبگرن و خەڵکی بێتاوان و مەدەنی بپارێزرێن، تەنانـــەت لـــە لایـــان حیزبـــی دیموکـــرات پەیامی سازشـــیان بـــە گوێی کاربەدەســـتانی تـــاران و خومەینیدا کـــرد، گوتیان باشـــە چ قەیدییە، با خودگەردانی بێت، با بیستوشـــەش مادده نەبێ و شـــەش مادده بێ، با خودموختاریی ئیسلامی بێ و هەموو دەرگایەکی پێشگرتن لە شەڕیان کـــردەوە، کەچـــی خومەینی و کاربەدەســـتانی تـــاران بڕیاریـــان دابوو کوردســـتان لە خوێندا بگەوزێنن و کاولـــی بکەن. دەرکەوت ئەوان هەر لـــە ڕۆژی هەوەڵەوە بـــە هیچ ئیمتیاز و مافێکی کـــورد قائیل نەبوون و نین. لە هەر کام لەم شارانە، سێ بۆ پێنج حەفتە لە ناو جادە و کۆڵانان شـــەڕ کـــرا و ژیانی هاوبـــەش و بەیەکەوەیی لە خـــواردن، تیمارکردن، حەشارگە، نوستن و تەنانەت گۆرانیگوتن و شادییش، لەناو دانیشتوانی گەڕەکەکان کەشـــوهەوایەکی شۆڕشگێڕانە و پڕ لە عەتف و لێبوردەیی و یەکدڵـــی خولقاندبـــوو. غروور و خۆبەزلزانیی شـــوێنی خۆیان دابوو بـــە تەوازوع و خاکیبوون، پیاوە دەوڵەمەند و ماقووڵی شـــارت دەدیت، ورکەنـــان کـــۆ دەکاتەوە، یان گۆنـــی پڕ دەکات لە لـــم، خانمە بە پۆز و لووتبەرزەکانت دەدیت بەرەڵبێنەیان بەســـتووە و لە ناو کۆڵانان بابۆڵە و چا دابەش دەکەن بۆ پێشـــمەرگە، یان بە خڕ دانیشـــتوون و لە ســـەر ســـاج نان دەکەن. ڕۆحی پێکەوەبوون و پێکەوەژیان، ئەو دەسکەوت و دیارییە بەنرخە بوو لە بەرگریی ئەم چەند حەفتەی شـــارەکان، خەڵکی کوردستان فێری بوون و وانەیان لێ وەرگرت، کە دەبێت دەست لەناو دەست، پشتوپەنای یەک بن و نابێت متمانە بە دوژمن بکرێت.

بـــە درێژایـــی مانگەکانی بانەمـــەڕ و جۆزەردانی بەهـــار، بە خۆم و ســـیمورغەوە بە شـــەووڕۆژ بەڕێـــوە بـــووم، دەمێک ئاژۆتـــن، دەمێک ســـەنگەر، دەمێک هەڵاتن و هەناســـەبڕکێ و دەمێکیش بە ســـەر مەیتی هاوڕێیان، چاو بە فرمێسک و هەناسەی سارد.

ئێســتا کە بیر لەم پێنج حەفتەیەی ئەو بەهارە لە تەمەنی ٢٢ ســاڵی خۆم دەکەمەوە، شــریتی سەرگورشــتە و ڕووداوەکانم بە چەند ساڵی دوورودرێژ دێتە پێش چاو و هەرچی دەکەم بۆم ناچێتە عەقڵی تەنانەت خۆشــمەوە کە چۆن بــەم فەترە کورتە ئەو هەمــوو ڕووداوەم دیوە و ئەو گشــتە شــار و دێ و ڕووبار، دۆڵ، شــیو، دەشت و هەڵدێرم چۆن تێپەڕاند و ئەرێ بەڕاست ئێستاش، بۆ هەر زیندووم؟!

**شەڕ لە سەقز**

لە ڕۆژەکانی ســەرەتای مانگی دووی بەهاری ١٩٨٠دا شەڕ لە سنە و سەقز گەیشتە ئاستێکی زۆر خوێناوی و وێرانی، بە سەدان ئاوارەی ئــەم شــارانە هاتبوونە ســابلاغ و مەقــەڕی کۆمەڵە ڕێڕێــداری نەبوو. مەفەرەزەی ئێمەیان ناردە ســەقز بۆ یارمەتیی نیزامیی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە. ســیمورغ پڕ لە پێشــمەرگە گەیشتینە ناو شار و مەیدانی هەڵۆ و مەقەڕی کۆمەڵە. یەک لەو پێشــمەرگانەی بیرم ماوە خەلیل بلووریان بــوو بە خۆی و تفەنگــە ئێمیەکەکەی، بەوپەڕی تــەوازوع و خاکییەوە وەک پێشــمەرگەیەکی هەرە سادە ناردبوویان، ئەو دەیزانی بەرپرسانی کۆمەڵــە ڕێــزی ناگــرن و خەریکن بــەم کارانە دەریپەڕێنــن و لە کۆڵ خۆیانــی بکەنــەوە، دەنا خەلیل زۆر جێگەی لە ســەرکردایەتیی کۆمەڵە باڵاتر بوو، من شەرمم لێ دەکرد و وەک برای گەورە و ئوستادی خۆم چــاوم لێ دەکرد، هیچ بە لامەوە گرنگ نەبوو ڕەدەی حیزبی ئەو چەند لــە خــوارەوەی منە، گرنــگ ئەوە بوو خەلیل زۆر لــە من و هەموومان زاناتــر و شۆڕشــگێڕتر و کامڵتر بــوو. بە درێژایی ســەفەرەکەمان بۆ ســەقز لە ڕاوێژ و ورەبــەرزی و ئامۆژگاریی تیۆریی ئەو کوڕە نازدار و بلیمەتــە بێبەری نەبووم. لە بیرم نییــە چەند ڕۆژ ماینەوە، عادەت وا بوو پێشــمەرگە خۆماڵییەکانی هەر ناوچەیەک، هەرچی کاری ســەخت و حەرەســیات و ســەنگەرلێدان بوو بە پێشمەرگە میوانەکانیان دەکرد. ڕۆژانە لەســەر ســووچی کۆڵانەکان و ســەرڕێی مەقەڕی پاسدارەکان

یەک یەک و دوو دوو لە سەنگەردا بووین، کۆڵان بە کۆڵان و سەنگەر بە سـەنگەر لە شەڕدا نەبووین، بەڵام چرکە و سات نەبوو پەنا نەگرین و هاوەنێک، تۆپێک یان قەناسەیەک نەتەقێتەوە.

جـادە و کووچـەکان پڕ بوون لە کچـان و کوڕانی لاو و خوێنگەرم و چالاک، بە دەیان ماڵ و ژێرزەمین کرابوونە خەسـتەخانە، بریندار و پیـر و منداڵیان لێ جێ کرابوونەوە. میواندۆسـتی و ڕێزی ئەم شـارە بۆ پێشـمەرگە و بە تایبەت ئێمە کە لە شـارەکانی دیکەوە بۆ یارمەتی هاتبووین، لە گوتن نایە، میوە، گۆشـت، شـیرینی، ساردی و شەربەتی دەسـکردی ماڵان و هەموو خزمەت و پێڕاگەیشـتن بە پێشمەرگە زۆر بـە زیادەوە دەکـرا. دەور و ڕۆڵی ژنان و کچـان بەرچاو و دیار بوو، شـەهید و کوژراوەکان زۆربەیان هەر لە مزگەوت و حەوشـەی ماڵان دەشـاردرانەوە. بە هۆی ناسـراویی من هەر لە سـەرەتای شـۆڕش و گرتنەوەی سەقز لە کەڕەتی هەوەڵدا، لەگەڵ کوڕگەل و «دەروێشەکانی سەقز»ی من و دوکتۆر جەعفەر، کە ئێستا ئیتر هەموویان لە بەرپرسانی کۆمەڵە بوون، لەوپەڕی خاوەن ماڵیدا خۆم دەدیتەوە، لەگەڵ هەموویان و کەسـوکاریاندا ئاسـوودە بووم، بە جەفەنگ و فشـقیات، سـروود و گۆرانـی شـەوەکانمان تێپـەڕ دەکرد و بـە پێ یان بە لایتـی کوژاوەی ماشـێنەکانمان، بـۆ حەرەسـیات بـە ناو شـاردا دەخولاینـەوە. من لە لای وان بـە «عەلـی ژاپۆنـی بانگ دەکرام، لە شـەڕەجنێو و ڕابواردن شـانم لە شـانی هەموو کوڕگەلە زۆڵەکانیان دەدا و لە جوابەجەنگی و گاڵتەپێکردنیان نەدەمامەوە، هەرچەند سـەقزی بە گشـتی زۆر سادە و ئـارام و بێوەیتـرن بەراورد بە هەتیمگەلی سـنەیی، کە هەرچی جنێو و ڕابواردن بەوانی تر، لایان دەست دەکەوێت.

## کوڕەسەقزی و شەڕ

ئێـوارەی ڕۆژێـک، بەرپرسـەکان مەفرەزەکـەی ئێمەیـان نارد بۆ ئەوبـەری چەم، لە باشـووری سـەقز، چوویـن بۆ «حەماڵئـاوا»، کە

پارێزگاری لەم گەڕەکە بکەین و ڕەنگە پاسدار بەوێدا بۆ ناوشار دزە بکات. کوڕێکی سەقزیی زۆر دانشمەند و خوێندەوار، ئەهلی تیۆری و باس و جەدەلیان، لەگەڵدا ناردین. هەموو شتی پێ خۆش بوو، تەقە نەبێت، ڕۆحی لە شەڕ چووبوو، نازانم بەم حاڵەی بۆ بووبوو بە پێشمەرگە، هەرچۆنێک بێت ئەو چاوساغ و شارەزای سەقز بوو، پێم وایە هەر بۆیە لەگەڵ ئێمەیان نارد تاکو هەر وەک باو بوو لە کۆڵ خۆیانی بکەنەوە. لەم هەموو شەڕ و ئەحواڵی ناوشار و بوون و نەبوونەدا، تاقەتیان لە پرسیار و تەحلیل و مەحلیلی دانشمەندی ناڕازی چووبوو، هەر کە دەیانگوت بۆ فلان سەنگەر بچۆ، یەکسەر تیۆرێکی دروست دەکرد بۆ ئەوەی نەچێت. ئێمەی غەریب و ناشارەزا پێی ڕازی بووین و پێش خۆمان دا، ئێوارە درەنگ، بوولێڵە بوو، گەیشتینە ناو مزگەوتی حەمالئاوا. پێشمەرگەکان هەمووی ماندوو، شەکەت و تەڕ بووین، بەبێ ڕوخسەت لە مزگەوت خۆیان کردەوە و خەریکی تفەنگ و خۆ وشککردنەوە و قاچ درێژکردن و پشوودان بوون. لەناو مزگەوت، لەگەڵ کاک خەلیلدا دانیشتبووم و قسەمان دەکرد، لەناکاو شەوقی گڵۆپ و گرەگری دەبابەمان وا هەست پێ کرد، ئەوە وەناو مزگەوت دەکەوێ. یەک بە پێخواسی، ئەوی دی پشتێند و ڕەخت بە دەستەوە، بە خەوالوویی و زۆر شپرزە هەموو دەرپەڕیین و بە پێچەوانەی دەبابەکان و پشت لەوان بۆ ناو شیوەکە، بە ڕاکردن و دوورکەوتنەوە لە مزگەوت و دەبابەکان. دەستیان کرد بە تەقە و دۆشکەیان وەکار خست و بە گوترە و شێتانە دەیانپرژاند. چاوم گێڕا لە هەموو پێشمەرگەکان تەنیا خەلیل بللوریان بە ئێم یەکەوە و ڕەحیمی خەڵکی ئێندرقاش ئار پی جی لە شان لە کۆڵانی پشت مزگەوتەکە بەیەکەوە وەستاون و ڕایاننەکردووە، تەدبیرمان کرد هەرچۆنێک بێت لە سەری کووچەوە ئار پی جی-یەکیان پێوە نێین. ڕەحیم خۆی قایم کرد و تەقاندی، ئاگری ئار پی جی بە شەو زۆر دیارە، نازانم لە سووچێکی یەک لە تانکەکان کەوت و دەنگێکی زۆر بەرز شریخەی لە تاریکیی شەو هەڵستاند.

بــە پەلە تانکــەکان پاشەکشــەیان کرد و لــە مزگەوت و نــاو گەڕەکی حەماڵئاوا دوورکەوتنەوە، ئەم تەقەیە بۆ من و خەلیل و ڕەحیم یەک لەو خۆشــییانە بوو هەرگیز بیرم ناچێتەوە، بە تایبەت ســیما و ڕوخساری خەلیل سەرکەوتن و شانازیی پێوە دیار بوو، دەمزانی خەلیل لە بواری نیزامی و ئازایەتی ئەمەی بە مەحەک زانی بۆ خۆی، کە لە پێشمەرگەی ئازا و ناو ســەنگەر، نە تەنیا دوا ناکەوێت، بگرە ئەگەر بێتە ســەری لە هــەرە ئازاکانیــش دەردەچێت، مــن دواتر و لە گەڕانــەوەدا هەموو ئەو شــەوە و خۆڕاگریی خەلیل و ڕەحیمم بۆ کۆمیتە ناوچە و بەرپرســانی کۆمەڵە ڕاپۆرت کرد، ئەوەی خەلیلیان هیچ پێی خۆش نەبوو.

هاتینــەوە نــاو مزگەوت، زۆر شــتی پێشــمەرگەکان جــێ مابوون، وردەوردە یــەک یەک و دوو دوو گەڕانــەوە، زۆربەیان تەڕ و قوڕاوی بووبــوون، دیــار بوو بە تاریکی کــە ڕایان کردبوو بــەرەو چەمەکە و دارستان، هەر وەنێو کەوتبوون، زۆریان شەرم کرد بۆچی نەوەستاون و گوێیــان لــە بەرپرســی خۆیان نەگرتــووە. دیارە لە کاتــی وادا یەک نەفەر دەتوانێت ورەی پێشــمەرگە بەرز کاتــەوە، یان دایبەزێنێت. دڵنیا بوومەوە هاوڕێی دانشــمەندی ســەقزی یەکســەر ڕای کردووە بەرەو چــەم و شــیوەکە و ئەوانەی ئێمــەش هەر هەمــوو دوای کەوتبوون و لەســەر ئێمە نەوەســتابوون و وایان زانیبوو ئێمــەش بەدوایاندا بەرەو چەمەکە دەچین.

### شەڕ لە سنە

ئێمە ئەو چەند ڕۆژەی بۆمان دیاری کرابوو لەگەڵ هاوڕێیانی سەقز لەناو شــار ماینەوە و دواتر بە ســواری سیمورغ و سروودخوێندنەوە بەرەو ســابلاغ گەڕاینەوە، شــەڕ نــا، بەڵکو شــەڕی بەهیلاکگەیاندن و عەســەبیکردنی خەڵــک و پێشــمەرگە بە هاوەنهاویشــتن و قەناســە و تۆپبارانی ناو شار و وێرانکردنی، زیاتر لە مانگی خایاند، تا سەرەنجام کۆمەڵە و دیموکرات بڕیاریان دا لە شار بێنە دەر و تەحویلی پاسدار و

ئەرتەشی بدەن و هەتاکو ئێستاش کە ئەم دێڕانە دەنووسم ئەوان حاکم و ئێمەش ئاوارەین.

هەر بەو توندوتیژی و وەحشـیگەرییە، لە شارەکانی سنە، مەریوان و بانە شـەڕ بـەردەوام بوو، لە هەموان خوێناویتر و پڕ لە داسـتان و حەماسـە سـنە بوو. مەقەڕی کۆمەڵە لە سـابڵاغ پڕ بوو لە هاوڕێیانی کۆمەڵە، کە زۆربەیان لە سنەوە هاتبوون. دوای گەیشتنەوەمان گوتیان دەبێ بەرەو سـنە بچێ و داوای گوللەتۆپ و ماتۆرسـیکلێتی سووک و توندئاژۆیـان کـردووە بۆ گەیاندنی پەیک و هاتوچۆی ناو شـار. چەند گوللەتۆپـی ١٠٦ و پێنج ماتۆڕمان لە سـیمورغە بـۆرەی نا و ڕێکەوتم بەرەو بۆکان، لەوێش سـەرکردایەتی چەند نامە و ڕاسپاردەیان پێ دام بۆ مامۆسـتا برایم (سـاعد وەتەندوست) و سـەرکردایەتیی کۆمەڵە لە سـنە. جادەی بۆکان- سـەقز و لەوێشەوە سەقز- دیواندەرە، نائەمن و شیاوی هاتوچۆی پێشمەرگە نەبوون، دەبوو بچمەوە سەدی بۆکان و بە گوندەکان و لای تیکانتەپە و هەموو ئەم دێهاتانەی نێوان سەقز و بۆکان و فەیزوڵڵا بەگی دەور لێدەم و لە شوێنێک کە پێیان دەگوت چوارڕێیانی چاپان و دەهاتەوە سەر جادەی سەقز بۆ دیواندەرە، کەمێن دەرکەین و دوور بکەوینەوە لە جادەی ئاسفاڵت و بەرەو دێهاتی مەریوان بچینەوە و دواتـر لە جادە خۆڵەکەی مەریوان- سـنە سـەر دەرهێنین و بەرەو سـنە بچینەوە. لە بۆکانەوە کەسێکی زۆر شـارەزام لەگەڵدا هاتبوو. لە ماوەی شەڕی سنە و مەریوان و بانە وا هات من دوو سێ جار بە شەو هەڵبـەت هەر دەبوو بە شـەو بێت، ئەم چوارڕێیانـم کە بە چوارڕێیانی مەرگ ناسـرابوو، تێپەڕاندبوو، جارێکیان کە زۆر ماندوو بووم و چەند پێشمەرگەشـم لەگەڵدا بوو، کەسیان تاقەتی کەمیندەرکردنی نەبوو بێنە سـەر جـادە قیرەکە و بزانن جاش و پاسـدار دامـەزراوە یان نا، گوتم مـادام وایە تـا دەتوانن خۆتـان بگرن و قایـم بکەن، تفەنگـەکان با لە سـەر پێ بن. سـەت مەترێکمان مابوو بۆ سـەر جادەکە بۆ پەڕینەوە. سـیمورغ باڵی گرت، گەیشـتینە سـەر جادەکە و تەقەمان لێ کرا، وەک

بـازدان سـیمورغ بـازی دا و چووینە ئەوبەری جـادە و لەناو خوڵ و تەپوتـۆزی دوای خۆماندا ون بووین، دوای لە خەتەڕتێپەڕین ڕامگرت، بە خۆشـییەوە هەموویان لە پشتەوە ساغ و سەلامەت بوون، دوو سێ فیشەک وە سیمورغ کەوتبوو.

### شەهیدبوونی فوئاد (ئەبوو شاهین)

هەر لەم ڕۆژانەدا لە مەریوانەوە دەچوومەوە سنە، لە چایخانەیەکی سـەر ڕێ بۆ نانخـواردن ڕامگرت، حەمیدی کادری ئەشـرەفی دێهقانم دیت، هەر لە دوورەوە دەسـتی بە گریان کرد و لە خۆشـیی دیتنەوەی من توند توند ڕێکی دەگوشیم و هەنیسکی دەدا، بە فارسی گوتی: "عەلی جان فوئاد چند روز پیش در سـنندج شـەهید شـد" واتا فوئاد عەرەب چەند ڕۆژ پێش، لە سـنە شـەهید بوو. ئەو دەیزانـی من و فوئاد چەند لێک نزیک بووین و وەک کوڕیماڵەوەمان بوو. بۆی باس کردم چەند ڕۆژ پێشـتر لە یەکێک لە گەڕەکەکانی سـنە، دۆشـکە لە کەلەکەی داوە و لە لاکەی دیکە دەرچووە و شـەهید بووە. هەواڵێکی ناخۆش و پڕ لە ئازار بوو. فوئاد نە تەنیا بۆ من خۆشەویسـت بوو، بەڵکو بۆ شەڕەکان بە تاقی تەنیا هاوتای لەشـکرێک بوو. زۆر دانیشـتین و لە سـەر جادە خۆڵەکـە دوو بە دوو شـینمان بۆ گێڕا، دەسـتی لـە گیرفانی نا، پارچە کاغەزێکـی خوێناویـی دەرهێنا و گوتی عەلی تەنیا ئـەوەی لە گیرفاندا بوو. چاوم لێ کرد خەتی خۆم بوو، کە ئەلفوبێی کوردیم بۆ نووسیبوو بـۆ فێربـوون و خەتی خۆی کە تەمرینی لەسـەر کردبـوو. حەمید ئەو کوتەکاغەزەی دا بە من و ڕۆیشـت، تا ئێسـتاش هەرگیز نەمبینیوەتەوە و وا بزانم جارێک خەبەری هات لە شـەڕێکدا شەهید بووبێت. ئێستاش دوای چل سـاڵ کاغەزی خوێناویی فوئادم هەر پاراسـتووە، لە ماوەی دەربەدەری و هەموو شـەڕ و ڕاکردن و کوێرەوەری و بەرێدارۆیشتن و هەندەران، چەند شـتێکم پاراستوون، وەک نامە و وێنە، ئەمەش یەک لەم یادگارییە زۆر عەزیز و بەنرخانەیە لام.

فوئاد عەرەب یان ئەبوو شاهین ناوی خۆی مورتەزا سەید ئیسماعیلە، لە ئاوارەکانی ئەفغانستان بووە و دواتر لە ئێرانەوە ئاوارەی عێراق بووە و لەوێشـەوە چووەتە فەلەسـتین و سـاڵانی حەفتای زایینی لە خەباتی ئەواندا بەشـداریی کـردووە، بووەتە یەک لە فەرمانـدە بەناوبانگەکانی شـەڕی خیابانی و هۆتێلەکان لە لوبنان و فەلەسـتین، بووەتە ئەندامی ڕێکخـراوی وەحدەتی کۆمۆنیسـتی. لەدوای شۆڕشـی ئێران و نەمانی شا، گەڕاوەتەوە ئێران و لە کوردستان وەک فەرماندەیەک لە سەرەتای شۆڕشـدا یارمەتیی زۆری کادر و پێشمەرگەی نیزامیی کۆمەڵەی داوە. ١٣٥٨/٢/٦ هەتاوی (١٩٨٠/٤/٢٦) لە ناو شاری سنە شەهید دەبێت.

عەلـی شـیعە پێشـمەرگەی یەکێتیـی نیشـتمانی کە لە کارەسـاتی هەکاری و دیلی قیادە موەقەتە ڕزگاری بووبوو، ئەویش دوو ڕۆژ پێش فوئاد عەرەب، ١٣٥٨/٢/٤ هەتاوی (١٩٨٠/٤/٢٤) لە بەردەم مەدرەسەی خەدەمات لە جادەی ئەردەڵان لە ناو شاری سنە شەهید بوو.

## چوونە مەریوان

بـە کردەوە خۆم و سـیمورغەکەم بووینە بەشـێک لە شـەڕەکانی سـەقز، سـنە، مەریوان و بانە، تا کۆتایی ئەم شەڕانە نەکرا بگەڕێمەوە مەهاباد. جارێکیان مامۆسـتا برایم لە سـنەوە لەگـەڵ جەمال خۆمپارە و مەنسـوور قەشـقایی ناردمانی بۆ مەریوان، کە جەمـال بە خۆمپارە یارمەتیی هاوڕێیانی مەریوان بدات. شاری مەریوان وەک سنە و سەقز بە هـەزاران هاوەنی بەرکەوتبوو، کۆڵان و سـەرجادەکان بە دەسـتی پێشمەرگەوە بوون، خەڵک لە نانکردن و دەواودەرمانی بریندااران شەو و ڕۆژیـان نەبوو، ئێوارەیەک لەگـەڵ جەمالدا چووینە ماڵی کاک فوئاد، بە وردودرشـتەوە کاریـان دەکرد و یارمەتییان دەگەیاندە سـەنگەری پێشـمەرگەکان، خەریکی کەلانەدروستکردن بوون، ئێستاش دوای ئەو هەموو سـاڵانە تامی ئەو کەلانانەم بیر نەچووەتەوە. مەریوان یەک لەم شـارە کوردییانەیە بە کەلانەی خۆش ناوبانگی هەیە. دیسـان ڕۆژێکی

تر کوڕگەل منیان بردە زرێبار و بە زۆر خۆم شۆری، جەمال خەریکی جلەکانم بوو، هێندەی ئەسپێ تێدا بوون تاقەتی چوو. چەلەنگی هێنا و هەموو جلەکانی کوڵاند. چەند سەعاتمان لە قەراغ ئەو گۆمە خۆشەی زرێبار پێ چوو، بە سەعات بە ڕووتی هەڵتروشکام تا جلەکانم وشک بوونەوە. کەم کەسی ئازا و توندوتۆڵ و جۆکەری هەموو ئیشەکانم، وەک جەمال خۆمپارە دیبوو. وەستا و پسپۆڕی خۆمپارە بوو، هاوەنی ١٢٠ی لە سەر شان دەبردە سەر تەپۆڵکەکان و هەر خۆی دەیهێنایەوە خوار، زۆر دڵسۆز بوو کە دیتی وا پیس و ئەسپێ لێی داوم، نەوەستا تا خۆم و هەموو جلەکانمی پاک و خاوێن کردەوە، کوڕگەلی مەریوانی بە پێچەوانەی سنە و سەقز زۆر جیددی و نیزامی و زۆربەیان مرچ و مۆن بوون، گاڵتە و فشقیاتیان زۆر کەم بوو، جەمال تۆڵەی هەموو ئەوانەی بە باوەحیزەکەی خۆی بۆ دەکردمەوە. لەو هاوڕێیانە بوو لە سەفەراندا دڵت پێی خۆش دەبوو، پیاوی تەنگانە و لێقەومان بوو. دوای چەند ڕۆژ دەبوو بگەڕێینەوە سنە، گوتیان خەریکن سنە چۆڵ دەکەن، ڕێگەی سنە و مەریوان بەشێکی گیرابوو، ناعیلاج بە ڕێی دێهات و دزڵیدا دەبوو چووباینەوە، لە دزڵی لە کەمینی قیادە موەقەتە کەوتین، بە خێرایی و ڕێک بە ناویاندا بە تەپوتۆز بە سەریاندا ڕزگارمان بوو، جەمال نەیدەزانی ترس چییە!

### قیادە موەقەت کێ بوون و چییان کرد؟!

دوای چل ساڵ گەلی کوردیش حەقی خۆیەتی لە ڕاستییەکان ئاگادار بکرێتەوە. لە ١٩٧٥دا شۆڕشی ئەیلوول هەرەسی هێنا و بانگی ئاشبەتاڵ لێدرا. سەرکردایەتیی کورد کە تەنیا مەلا مستەفا و کوڕەکانی بوون و هیچ ئەندامێکی پارتی و مەکتەبی سیاسی حیسابی بۆ نەدەکرا، بڕیاریان دا بەبێ هیچ چەشنە گفتوگۆ و بەرهەڵستێک خۆ تەسلیمی شای ئێران بکەن و چەکەکان فڕێ بدەن، یان تەسلیمی شا و سەدام بکرێن.

بە دەیان هەزار کوردی باشوور و بارزانییەکان کە نەیانویست

تەسلیمی سەدام ببنەوە، ئاوارەی شار و گوندەکانی ئێران بوون، بەبێ سەرپەنا و مافە سەرەتاییەکانی پەنابەری، وێڵ و سەرگەردان کران بەسەر هەموو ئێراندا و لە خراپترین ژیاندا و ئەوپەڕی هەژاری و بێکەسیدا چاوەڕێی چارەنووسی نادیار بوون.

تەنیا بنەماڵە و کەسە نزیکەکانی مەلا مستەفا لە شاری کەرەج لە ڤێلا و خانووی خۆش جێگیر کران و نزیک بە ٥ ملیۆن تمەنی ئەوکات وەک نەسریە (کۆمەک هەزینە) بۆیان بڕایەوە، جگە لە ٤٧ ملیۆن دیناری شۆڕش، کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان. (هەر دینارێک ئەوکات زیاتر لە ٣ دولار بوو)

بەدوای دەسپێکی شۆڕشی نوێدا بە سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٧٦دا، قیادەی موەقەت (سەرکردایەتیی کاتی) لە لایەن بەشێک لە سەرکردایەتیی کۆنی شۆڕشی ئەیلوول و بنەماڵەی مەلا مستەفا بارزانی دامەزرا.

لە دزلیی مەریوان، شنۆ، کەرەج، زێوە و گوندەکانی دەوروبەری ورمێ و سەرسنووری تورکیا و هەکاری مەقەڕاتیان بڵاو کردەوە. لە یەکەم چالاکی و کاردانەوەیان بە دژی یەکێتیی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٧٨دا کارەساتی هەکاری قەوما و زیاتر لە ٧٠٠ پێشمەرگەی یەکێتی لە شەڕی قیادە موەقەتە تێداچوون و سەرکردە گەورەکانی یەکێتی وەک بابە شێخ، دوکتۆر خالد و عەلی عەسکەری بە دیلی ئیعدام کران و دەیان سەرکردەی تریش بە دیل گیران.

زۆربەی زۆری خەڵکی ڕۆژهەڵات و ڕۆشنبیران و نوخبەی سیاسی، دڵسۆزی و عەتفێکی زۆر و سەمپاتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و پێشمەرگە و مام جەلالیان هەبوو، بە دەیان لاو لە شارەکانی شنۆ، بۆکان، سەقز، سنە و مەهاباد وەک ڕێکخستن کاریان بۆ پێشمەرگەی یەکێتی دەکرد و تەنانەت کۆمەڵەی شۆڕشگێر کە ئەوکات نهێنی بوو، کادری وەک دوکتۆر جەعفەر شەفیعیی ناردبوو بۆ قەندیل و کەسێکی خۆشەویستی وەک خانە موعینی لە ڕێگەی چوونی بۆ لای یەکێتی شەهید بوو. بە

دەیان لاوی وەک شـەهید سـولەیمان بللوری شـەو و ڕۆژ لە هەوڵی یارمەتـی و پـارە و شـتوومەک کۆکردنەوەدا بوو بۆ پێشـمەرگەکانی یەکێتی و وێنە و پۆسـتەرەکانی مام جەلال و سەرکردەکانی تری چاپ و بڵاو دەکردەوە.

لـە بەرامبەردا سـەرانی قیادە موقەت لە ورمی و کـەرەج لە لایەن شای ئێرانەوە یارمەتی دەدران و نەسریەی باشیان پێ دەدرا.

زۆری نەبـرد شـای ئێران ڕووخا و حکومەتی تازەی ئیسـلامی بە ڕابەریی خومەینی هاتە سەرکار و دەسەڵاتی ئێرانیان گرتە دەست.

لە زسـتانی ١٩٧٩دا شۆڕشـی ئێران کرا و لە هاویندا هێرش کرایە سـەر کوردسـتان و لە پـاوە و مەریوان شـەڕی خوێنـاوی لە لایەن پاسداری خومەینییەوە بەسەر کورددا سەپا.

کەسـێکی زۆر نزیک و خزمـی مەهابادیم لە حکومەتەکەی بازرگان و بەنی سەدری سەرۆککۆمار، جێگری وەزیر بوو. گێرایەوە «لە تاران لـە مەکتەبی بەنی سـەدر لەگەڵ چەند وەزیرێکدا یـەک لەوان داریوش فروهەر دانیشـبووین، لەنـاکاو گوتیان ئاغای ئیدریـس بارزانی داوای دیدار دەکات و لێرەیە:

گوتی هاتە ژوور، من یەکسەر ناسیم، بەس ئەو منی نەناسی.

بەنی سەدر بەخێرهاتنی کرد و دانیشت. ئیدریس بارزانی بە فارسی قسـەی کـرد و گلەیی و گازەنـدەی هەبوو لەوەی کە دوای شۆڕشـی ئیسلامی و نەمانی شا کەس پێیان ڕاناگا و لەوپەڕی خراپیی ماڵیدان.

بەنـی سـەدر لێی وەدەنـگ هات و زۆر بە توندی بـە گژیدا هات و پێی گوت ئێمە ناتوانین هەر وا بە بەلاش بەخێوتان بکەین، باشـە ئێمە یارمەتیـی ئێـوە دەدەین و بەخێوتان دەکەیـن و مەقەڕەکانتان بە دژی جەلال تاڵەبانی و سەدام پۆشتە دەکەین، ئەدی ئێوە چیمان بۆ دەکەن؟!

خۆتـان بـاش دەزانن دنیـا دوژمنایەتیمـان دەکات و ئێمـە تازە لە شـۆڕش سـەرکەوتووین، سـەدام کوردەکانی ئێرانی لێ هان داوین و ئەوەتا بەنیازن ئێران لەتوپەت بکەن، ئەرتەش شـەڕ ناکا و پاسـداریش

تــازە و بێئەزمــوون و زۆربەیان منداڵن. ئەگەر ئێوە خۆتان بە دۆســتی ئێمــە دەزانن دەبــێ لــەم ڕۆژەدا یارمەتیمان بدەن بۆ ئــەوەی ئێمەش یارمەتیی ئێوە بدەین!

ئیدریس دەڵێت: جا ئێمە هەمیشە ئێرانمان بە دۆستی خۆمان زانیوە و خۆشمان بە ئێرانی دەزانین و فیداکاریمان هەر کردووە بۆ ئێران!

بەنی ســەدر دەڵێ ئێســتا ئێمە لە کوردســتان کێشەی دێموکرات و کۆمەڵەمان هەیە، ئێوە دەبێ بچن و ئەوانەمان لە کۆڵ بکەنەوە، چونکێ ئەوانە دۆستی دوژمنی ئێوەشن، واتا سەدام!

ئیدریس هەر لەوێ سۆزی پێ دەدات و بەنی سەدریش ئەمر دەکات ئەو نەسریە ٥ ملیۆن تمەنەی ڕایانگرتووە بۆیان بگێڕنەوە و هەر وەک زەمانی شا یارمەتی بە بنەماڵەی مەلا مستەفا بدرێ».

ئــەو جێگــری وەزیــرە لە درێــژەی گێڕانــەوەی ئەم ڕاســتییە تاڵە مێژووییەدا گوتی: چیی وای نەبرد داســتانی قەبردانەوەی مەلا مستەفا ســاز بوو، دواتر شــەڕی دێموکــرات و کۆمەڵە لە لایەک و پاســدار و قیــادەی موەقەتــە لە لایەکی تــرەوە زۆربەی کوردســتانی ڕۆژهەڵاتی گرتــەوە و لــە یەکەم هەنگاودا شــەڕی جــادەی سەردەشــت-خانێ و شەڕی گرتنەوەی شاری شنۆ و زۆر شەڕی دیکەش.

### کشانەوە لەناو شارەکان

مامۆســتا برایم و بەشــێک لە هاوڕێیان، وەک جــەلال و حەبیبوڵڵا کێلانە و بەشــێکی زۆر لە خەڵک و مامۆســتا و پێشــمەرگەی تازە، بە فەرماندەیی مامۆستا برایم گەیشبوونە کێلانە و مەقەڕێکی گەورەیان لەم گوندە خۆشە دانابوو. لە بن شاری سنە دێیەکی لێیە ناوی حەسەنئاوایە، بەشــێک لە پێشمەرگەکان لەگەڵ حەبیبوڵڵا لەم دێیە دامەزرابوون و لە کەمیندا بوون بۆ ئەوەی ئەرتەش و پاسدار پێشڕەوی نەکەن بۆ دێهاتی ســەرووتر و شــوێنی ســەرکردایەتی لە کێلانە. جارێکی دەســتەیەکی پێشــمەرگەم برد بۆ حەســەنئاوا و ڕێک کەوتمە شــەڕێکی قورس، کە

هێرش کرابووە سەر پێشمەرگەکان لە قەڵای حەسەنئاوا پێش ئێمە، باش بوو بە هەمووومان وەستاین و پاشەکشەیان پێ کرا و بوو بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ پێشمەرگە. ڕۆژانە لەو گوندانەی سەر ڕێی سنە و کێلانە وەک دەربەندە، کانی مشکان، کەرجۆ، مەلکشان و...، زۆریان چووم، بەڵام ناوەکانیانم بیر نەماون، مەترسیی هاتنەپێشی پاسدار و حکومەت هەبوو، پێشمەرگە شەو و ڕۆژ لە کەمیندا بوو، کاک یەدوڵڵای گوڵچینی (دلێر) برای شەهید سەلاح گوڵچینی فەرماندەی ئەم ڕێگەیە بوو، لە کانی مشکان لە سەنگەردا بوون. دیار بوو تا ئێمە لە مەریوان گەڕاینەوە هەموو کۆمەڵە بە دوو ڕێی جیاواز شاریان چۆڵ کردبوو، بەشێکی زۆر لە خەڵکی مەدەنی و شار و هەوادار و پێشمەرگە بە فەرماندەیی کاک شوان، بەرەو باکوور و ڕێی دیواندەرە پاشەکشەیەکی مێژوویی و زۆر سەلامەتیان کردبوو بۆ دەرەوەی شار و دێهاتەکان. بەشێکی تر هەر بەم چەشنە بە سەرپەرشتیی مامۆستا برایم و جەلال کێلانە بەرەو باشوور و کێلانە هاتبوون و لە زۆربەی گوندەکان مەقەڕ و پێشمەرگەیان بڵاو کردبووەوە. من لە ڕێگەی مەریوان تەنیا ئەم بەشەم ئاگا لێ بوو و زورتر لە ژێر فەرمانی مامۆستا برایمدا بووم.

کوڕگەلێکی زۆر هاتبوونە دەر و چەکیان هەڵگرتبوو، خوێنشیرینی وای تێدا بوو هەر بە لێوان دەخوران، زۆربەیان لاو و کەمتەمەن بوون، زۆرتر لەگەڵ مامۆستا برایمدا دەهاتن و دەچوون، کوردییەکیان قسە دەکرد بۆ منی سابڵاغی و تێکەڵ بە باشوور، بووبووە جێی بەزم و فشقیات و پێڕابواردن. ئەو باوەحیزانەش وەک خۆیان دەبێژن قسووریان نەدەکرد لە نوکتە و ڕابواردن بە من و سابڵاغی، دەیانگوت ئەم هەتیمگەلە مەهابادییانە بە هەموو شت ئێژن «وانێک»، تەنانەت بە قاسملوو ئێژن «وانێکلوو». منیش وەڵامم دەدانەوە و دەمگوت ئێوە بە «جەولە» ئێژن «پێکنیک» و بە دایە ئێژن «ماما» و بە پشیلە دەڵێن «کتک» و بە بێچوکەی ئێژن « بەچکە پشیلە»! من بۆ خۆڕێکخستن و تێکەڵاوی لەگەڵ هەموان زۆر باش بووم، لە هەموو مەقەڕەکان،

که وەژوور دەکەوتم شــەرم و شــتی وا نەبوو، یەکەندەردوو دەبوومە خاوەن ماڵ و بە شەڕەجنێو و فشقیات، دۆستی زۆر باشم دەدۆزینەوە. ماوەی وەستانم لەم مەقەڕانە بۆ من زۆر خۆش بوو، کۆمەڵێک دۆستی باشم پەیدا کردن، کە ئێستاش هەر شانازییان پێوە دەکەم و ئەزموونێکی گەلێک باش و بەنرخ بوو، بۆ ئاشــنابوونم بە جۆگرافیا و کۆمەڵناســیی ئەم ناوچە گرنگ و بەپیتەی کوردستان.

## مەقەڕی تازە

ڕۆژێکیان لە کێلانە مامۆستا برایم گوتی لەگەڵ جەمال و مەنسووردا بڕۆ بۆ تەوریوەر و ئەو کۆمەڵە مامۆستا و فەرهەنگیی شاری سنە کە هاتبوونە دەر با بچن لەم پشــت شــاخانە لەم دێیە مەقەڕێک بکەنەوە و فشــار لێرە کەم بێتەوە. هەرچی هەبوو بار کرا لە پێداویســتیی مەقەڕ و خۆیان لە پشــتەوە سوار بوون، گەیشتمە کاک دلێر لە کانی مشکان، ڕێک لە سەر جادەی سنە بوو، ئاگادارم کرد دەچم و ئەوانە دادەنێم و دەگەڕێمەوە، لە خوار کانی مشــکان بەرەو حەســنئاوا و سنە ڕێگەیەک جیــا دەبووەوە بــەرەو ناوچەیەکی پڕ لە دێهات و چڕ و شــاخاوی، بە ڕێگەیەکی دوورودرێژ و پڕ لە مەزرای شــلک (توو فەڕەنگی) گەیشتینە تەوریوەر، دێیەکی جوان لە بەرزایی و ناوەڕاستی کۆمەڵەشاخێک. ئەو شــەوە ماینەوە و یارمەتیی مامۆستایانمان کرد بۆ کردنەوەی مەقەڕ و دامەزراندنیان.

## ڕۆیشتن بەناو ئاگردا

پێشــتر لەگــەڵ جەمالدا لــە هاتنەوەمان لــە مەریوانەوە بۆ ســنە و کێلانــە، بە خێرایی بە ڕێی دزڵیدا، ئەم ناوچە و دێهاتەم بینیبوو و پێیدا گوزەرم کردبوو. گەر بچیتە موسەلەسی نێوان ڕێگەی مەریوان بۆ سنە و ســنە بۆ کامیاران و کامیاران بۆ مەریوان و پانتایی نێوان ئەم ســێ ڕێگەیــە، ئــەوە ناوچەیەکی پڕ لە شــاخ و هەڵدێر و زەویی پڕ لە پیت و

بەرهەم، چەم و کانیاوی فێنک، دەتهێننە سەما و سەرمەستی لە بەشێک لە بەهەشتی کوردستان. لە مەریوانەوە بە ڕێی سەوڵاوا بەرەو دزڵی، ئەوجار شۆڕ دەبێوە بەرەو هەورامانی تەخت، لەوێشەوە بۆ ژیوار، چەشمیدەر، ژان و بێساران، هۆیە و ئەویهەنگ، هەشەمێز و حەلوان، تەوریوەر، تەختە و زنان، کێلانە و مەلکشان و دەیان لادێی بچووک و خنجیلانە، کۆکەرەوە و ناوی بنێ ژاوەرۆ.

بەیانی زوو هاتین بڕۆینەوە بەرەو خوار و کانی مشکان تەتەرێک بە پشت شاخاندا بە پێ گەیشت، مامۆستا برایم لە کێلانەوە ناربووی بە پەلە کە بە جادە و بە ماشێن نابێ بگەڕێینەوە و شەوی پێش، ئەم جادەیە پاسدار گرتوویەتی. کاک دلێر لە کانی مشکانەوە بۆ لای کێلانە مینی چاندووە و لە کەمین دایە بۆ هاتنی ستوون. گوتیان باشترە هەر بە پێ بە شاخەکانی پشت تەوریوەردا سەرکەوین و ڕوو لە کێلانە بکەین. گوتم، سیمورغ بە جێ ناهێڵم و دەبێت ڕێگەیەک بدۆزینەوە. بە شاخ و دۆڵ و هەڵدێر تۆق درابووین و تەنیا ڕێگەی سەیارە ئەوە بوو کە پێیدا هاتبووین. لەگەڵ جەمال و یەکیدیدا وا بزانم مەنسوور بوو، وردەوردە هاتینە خوار، هەموو وڵات بۆنی ترس و شەڕ و چۆڵکردنی لێوە دەهات، بە هەزاران دۆنم شلک خەریکی پێگەیشتن بوو، هەر بە تەتەرەکەی کێلانەدا جوابمان بۆ کاک دلێر نارد شەوانە جادەکە پاک بکاتەوە و ئاگای لێمان بێ وەسەر مینی خۆمان نەکەوین. وا دیار بوو حکومەت لە حەسەنئاواوە هاتبووە سەر سێڕاکە بەرەو کانی مشکان و نیازی گرتنی مەقەڕ و مەکۆکانی پێشمەرگەی هەیە لە مەلکشان و کێلانە و کەرجۆ و هەموو ناوچەکە. بەجێهێشتنی سیمورغەکە بۆ من بە ڕوانینی ئەوکاتم، لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆ ناوچەی مەهاباد، وەک حەیاچوون بوو. لەم هەست و پەژارەیەم جەمال ڕێک وەک هاوڕێیەکی دڵسۆز هاوڕای من بوو، هەموو ڕێگەیەکی تاقی کردەوە بۆ ئەوەی ماشێنەکە جێ نەهێڵین. لە زۆر شیو و دۆڵ و شاخی بێجادەمان دا و ڕێ نەبوو. هێندەمان شلک خواردبوو تووشی زگەفیرە و ژانەزگ بووبووین، وا

بزانم سەرەنجام دوای دوو ڕۆژان و دوای چاودێریی ورد لە دوورەوە لە مۆڵگەکانی دوژمن و جووڵەیان بە ڕۆژ و شەو، بڕیارمان دا هەر کە تاریکی داهات، هەتا هێزی تێدایە سیمورغ وەنێو خەین و تەنیا چەند مەترێکە و بە ناویاندا دەرباز بین، یان ئەوەتا دەپێکرێین، یان دەرباز دەبین و خۆمان لەم گەمارۆیە ڕزگار دەکەین. تفەنگ لە سەر پێ، بە تاریکی وردەوردە لێیان نزیک بووینەوە، هاتین بەرەو مۆڵگەکەیان و بەبێ گلۆپداگیرساندن وەنێویان کەوتین، بەڕاستی سیمورغ دەفڕی، بە سەدان تەقەمان لێ کرا، نەوەستاین و خۆمان گەیاندە جادەکەی کانی مشکان، ئەوجار دڵەڕاوکێی پاکیی جادەکە لە مین و مەنجەڵی تەقەمەنیی خۆمان، هیچ عیلاج نەبوو نەدەکرا چرا هەڵکەین یان دابەزین، دیسان ئاسانترین و مەترسیدارترین ڕێ وەنێو کەوتن بوو، نزیک کانی مشکان کاک دلێر و پێشمەرگەکان ڕایانگرتین و دەباوەشیان گرتین، تاریک بوو نەماندەزانی سیمورغ چیی بەسەر هاتووە، دلێر گوتی ئەوە دوو ڕۆژە ئێواران دێم و لەبەر ئێوە جادەکە پاک دەکەمەوە. بەجێمانهێشتن و گەڕاینەوە کێلانە، مەقەڕی سەرەکیی مامۆستا برایم، کە بۆ دانانی مەقەڕی مامۆستایان ئەم بەڵایەی بەسەر هێنابووین. بەیانی بە بینینی سیمورغ بە ڕووناکی، کەس باوەڕی نەدەکرد ئێمە سێ کەس لەناو ئەو ماشێنەدا بووین و هیچمان بریندار نەبووین، بە دەیان فیشەک سیمورغیان پێکابوو، بەس ئێمە نا!

**شەڕ لە بانە**

لە سەقز و حەمالئاوا، لە فەیزوڵڵا بەگی و چوارڕێی چاپان، لە سنە و ئاوێر و حەسەنئاوا و کێلانە و تەوریوەر، لە مەریوان و زرێبار و گەردەنەی گاڕانەوە یەکسەر بەڕێ کرام بە خۆم و سیمورغەوە ئەوجار بۆ بانە. بانە چ بانە، بەڕاستی وێران بوو بانە.

شار بە هەزاران تۆپ و هاوەنی بەرکەوتبوو، گەڕەکەکان بۆنی دووکەڵ و خوێنی لێ دەهات، شووشە پەنجەرە بە ساغی، بە کەمی

دەبینــدران، زۆربــەی ماڵەکان بــە ئاوەڵەیی بەجێ هێشــترابوون، کاک حەمــەی شــافعی بەرپــرس بــوو، وا بزانم هــەر ماڵەکــەی خۆیان یان هاوڕێیەکیــان لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا شــوێنی دامەزران و حەوانەوەی دەستەیەک لە پێشــمەرگەکان بوو. لە پادگان و کونەڕێوییەوە ئەمانیان لە شــار و گەڕەکەکان هەڵگرتبوو، دەنگی ناخۆشــی قەناسە هەردەم لە بــن گوێت دەزرینگایەوە، گرمەی تۆقێنەری هاوەن هەر لەناکاو لادیوار و پەنجەرەیەکی دێنا خوار. قەرار بوو تەنیا پەیامێک بگەیەنم و بڕۆمەوە بۆ مەهاباد، کەچی چەند ڕۆژ هێشــتیانمەوە. کۆمەڵە و پێشــمەرگایەتی وا بوو؛ هەموو شــوێن ماڵە خۆت بوو، هەموو بەرپرســێک مەسئوولی تــۆ بوو، هەمــوو پێشــمەرگەیەک هاوڕێت بوو، چــوون و گەڕانەوە لە دەســەڵاتی تــۆدا نەبــوو، هیــچ هەڵبژاردەیەکت بــۆ دیاریکردنی جل و خــواردن و چوونــی حەمام نەبوو، لە هەر شــوێنێک کــراس و پانتۆڵ و پشــتێندت ڕزیبــا و دڕابــا، لەونــاوە چــی هەبا ئیی خــاوەن ماڵ یان پێشــمەرگەی تر یەکســەر بــەکارت دێنا و دەبوو بە ئیــی تۆ، خواردن هەرچی داندرابا و هەبا دەبوو بیخۆیت، خۆشۆرین دەبوو هەڵکەوتبا و تۆش بیقۆزیتەوە، کە من هەموو جار ئیهمالم دەکرد و دەمدا بە کەسی تر. بیرم ناچێت لە زرێبار کە جەمال بە زۆر جلەکانمی لە بەر داکەندم و خۆم شوشــت، پشتێندەکەم قەف قەف هەڵدەوەری و ڕزی بوو. ئەسپێ بە دەیان جار نیوەی بەسەر چووەتە ناو پێستی قاچ و ڕانم و نیوەکەی تری لە قونەوە لە دەرەوە بووە، ڕامکێشاوە و هێناومەتە دەر، لە ئاست نەخۆشــی پێســت و ئەم شــتانە زۆر بەختم هەبوو، زۆر کەم نەخۆش دەکەوتم و بەرگریی سیستمی لەشم زۆر کارا بوو.

کورگەلــی بانە باســیان لە گرتنــی کونەڕێوی، یان پــادگان دەکرد، پلانیان دادەڕشــت هێرش بکەنە ســەر پــادگان. ئێــوارەی ١٩٨٠/٥/٢٤ بەرامبــەر بە ســێی جۆزەردانی ١٣٥٩ پێشــمەرگەکان وەڕێ کەوتن و خۆیان لە پادگان نزیک کردبووەوە تا ئەودیوی تەلە دڕکدارەکان و ناو حەوشــەی پادگانیــش چووبوون. زۆر بە خەســتی تەقەیان لێ کرابوو

و بە پەلەپروزکێ پاشەکەشـــەیان کردبوو. حەمەفیشـــەک پێشـــمەرگەی زۆر ئازا و بوێری بۆکان بریندار دەبێ و دوو پێشـــمەرگە بە ناوەکانی ڕەحمان ســـەباری (فەیزی) و مەنســـوور ئەحمەدی هەر لەوێ شـــەهید دەبـــن و بەجێ دەمێنـــن، دواتر حەمەی شـــافعی بەرپرســـی کۆمەڵە لە بانـــە خـــۆی و یەک دوو کەس دەچن و هەرســـێکیان هێنـــاوە بۆ مەقەڕ و حەمەفیشـــک هـــەر زیندوو بوو، حاڵی زۆر شـــپرزە بـــوو، گوتیان با عەلی بە ســـیمورغ بیگەیەنێتە بۆکان و خەستەخانە، کە مردیش لە ڕێ، مەیتەکە بەرەوە بۆ بۆکان. جێیەکی نەرم و پڕ لە بەتانی لە پشتەوە بۆ حەمە خوش کرا و بە دوو پێشمەرگەی بۆکانەوە ڕێمان گرت بە دێهاتی پشـــت جادەی بانە – سەردەشـــت و سیســـێر و گەورگایەتی گەیشتینە بۆکان و حەمە هەر زیندوو بوو. دامانگرت و تەسلیمی نەخۆشخانەمان کرد. دوای ســـێ چوار ســـاڵان لە باشـــوور لای یەکێتی بووم، بیستم لە ناوچەی بۆکان حەمە بووەتە جاشـــێکی زۆر گیان ســـەخت و دڕندە و چەند پێشـــمەرگەی شـــەهید کردووە، دواتر بە دەســـتی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە دەکوژرێت.

ڕۆژی ســـێی مانگی ٦ی ١٩٨٠ بانە بە یەکجاری گیرا و پێشـــمەرگە بانەی چۆڵ کرد.

## ٢٣

### گەڕانەوە بۆ سابلاغ

دوای زیاتــر لــە مانگ و نیوێک لە ناوەڕاســتی مانگی جۆزەردان و ئاخـری بەهاری ١٩٨٠دا، پاش ئەو هەموو گەڕان و بینینی وێرانبوونی چـوار لە شــارە جوانەکانی کوردســتان و تۆماری دەیان حەماســە و فیداکاریی خەڵک و پێشمەرگە، شەڕی کۆڵان بە کۆڵان و دەستەویەخە، گوزەر بەسەر ئەو هەموو ناوچە و مێرگ و دەشت و هەزار بە هەزاری شــاخ و جادەوبانی کامیاران، مەریوان، سنە، سەقز، بانە و سەردەشت بە خۆم و ســیمورغە شــەکەت و بریندارەکەم گەیشــتمەوە ســابڵاغی مەکۆی یارانی وەلفەت[1] پێگرتووم.

تەمومژ بەشــێکی جیانەکراوەیە لە مێژووی کەشــوهەوای ســابڵاغ، ئەمجارە خەمیشــی هاتبووە ســەر، خەریک بوون بەیەکەوە سابڵاغیان دەخنکاند. دوای گرتنەوەی ئەم شــارانە هەمــوو دەیانزانی ئیتر نۆبەی ســابڵاغە و درەنگ یا زوو دەبێت چاوەڕێی ناشــتنی خۆی بێت. دار و دیوار، وردودرشت، تۆزی ترس و وەحشەتی بەسەردا بارییبوو. پڕ بوو لە ئاوارەی ســەقز و ســنە، دەوڵەمەند و ئەوانەی بۆنی شەڕ لە حەوت لاوە دەکــەن، یــان باروبنەیان کۆ کردبووەوە بۆ تــاران و تەورێز، یان بەتەمای جێهێشتن بوون.

### سەلاح شەمسی بورهان

بــە شــەو و ڕۆژ، زۆر بــە وردی خەریکی کێشــک و حەرەســیات بووین، نەک لەپڕدا بێنە دەر لە پادگان و هێرش بکەنە ناوشار. شەوانە تــا ڕۆژ، بــە ســەرە بە ســواری لەندرۆڤێرێک دوو دوو بە ناو شــاردا

---

١- وەلفەت، ئۆگری، خووپێوەگرتن، ئۆلفەت.

دەسـووڕاینەوە و گەشـتیمان هەبوو. یەکەم مانگی هاوین بوو شەوی دوازدەی پووشپەڕ لەگەڵ یەکی دیکەدا حەرەس بووین و بە ماشێنەکە ئەوبـەر و ئەمبـەری شـارمان دەکـرد، خەڵـک خەبـەری پـێ داین لە گەڕەکی فەرهەنگیان تەقە بووە. گەیشـتین گوتیان، تەقە لە کاک سەلاح شەمسـی بورهان کراوە و ڕفاندیان بۆ شێرەخورشـید (خەستەخانەی سـابڵاغ)، چوویـن بەداخـەوە کاک سـەلاح تیـرۆر کرابوو و شـەهید بووبـوو، خزم و کەس و ئامۆزاکانی بە دیارییەوە بوون. کاک سـەلاح یـەک لە خوێندکارەکانی دەرەوەی وڵات بوو، ئەندامی کۆنفدراسـیۆنی دانشـجووەکانی ئێران بوو لە ئەورووپا، لە ڕووخانی شـا گەڕابووەوە وڵات، لـە بنەماڵەی ئایینی شەمسـی بورهان و شـێخانی بورهان بوو، برای کەسایەتیی ناسراو حاجی شێخ عەولای کولیجە بوو، کۆمۆنیست و ئەندامـی بـەرزی سـازمانی ئیتحادیـەی کۆمۆنیسـتی و هـاوڕێ و هاوخەباتـی نزیکـی کاک ئەمیر حەسـەنپوور بوو، کـە ئەویش هەر لە ئەمریکاوە هاتبووەوە، بەشـدارییان دەکرد لە شۆڕشـی بەرگریی گەلی کـورد دژ بـە حکومەتی خومەینی. وا بڵاوکرایـەوە لەبەر دژایەتی و لە قاودانی سیاسـەتی سازشکارانەی حیزبی تودە و دێموکرات بە دەستی چەند بەکرێگیراوێک تیرۆر کراوە. مەرگی کاک سـەلاح وەک کۆستێکی گـەورە وا بوو بۆ هەموو ئازادیخواز و مرۆڤێکی چەپ و عەدالەتخواز، ڕێوڕەسـمی ناشتن و بەخاکسپاردنی لە (١٩٨٠/٧/٣) نیشانی دا سابڵاغ هەر هەمووی بۆی بە پەرۆش بوو.

**«مامۆستا هێمنی شاعیر جاشی میللییە»**

لـە مانگەکانـی پووشـپەڕ و گەلاوێژ ئیتر سـەرکردایەتی و دەفتەر سیاسیی حیزب و کۆمەڵە لە شار چووبوونە دەر، حیزب لە دۆڵی شێخان بوو، کۆمەڵە لە ئاجیکەند و خوراسانە و عیلمئاباد بوون، حیزب حەولی دەدا بە هەر جۆرێک، کە بووە شـەڕ نەبێت و لەگەڵ حکومەت بسازێن، گەلاڵەی خودگەردانی، شەش مادەیی، خودموختاریی ئیسلامی، هیچیان

قبـوڵ نەکـران و حکومەت بڕیاری خۆی دابوو تەنیا کاتی دەکوشـت بـۆ گرتنەوەی سـابلاغ، کـە بە سـەری مارەکە و فیتنەکەیـان دەزانی. سـازمانگەلی دیکە زۆربەیـان بە تایبەت کۆمەڵە، حیزبـی دێموکراتیان بـە سازشـکار دێنا ناسـاندن و ڕۆژانە شەڕەقسـە و بەیاندەرکردن و جاروبار بەریەککەوتنی هەواداران و تەنانەت پێشـمەرگەکانیش ڕووی دەدا. تاقمـی حەوت کەسـی جیابـووەوە لە دێموکـرات کەوتبوونە بەر شـاڵاوی ئیهانە و لێدان و گرتنی سـەران و پێشمەرگەکانی دێموکرات، تەنانەت مامۆسـتا هێمنی شـاعیریان بە جاشی میللی ناو دەبرد و مامە غەنـی و ئەوانـی دی هەموو لە حەشـارگە و لە شـارەکانی ئێران و لە پەنـای حیزبـی تودەدا بەسـەریان دەبرد و بە ئاشـکرا خومەینییان بە دژەئیمپریالیسـت دەزانی و دیفاعیان لێ دەکرد، بە تایبەت کە شـەڕی ئێران-عێراق دەسـتی پێ کردبوو، ئەو شەڕەشیان بە شەڕی نیشتمانی دەزانی و بە ڕای ئەوان دەبوو بەرگری لە ئێران بکرێت و تەنانەت بۆی بچنە بەرەی شـەڕیش. هەڵبەت چیی وای نەبرد، لە پاییزدا چریکەکانی فیداییـش چوونە بەرەی دیفاع لە «شـەڕی میهەنی» واتا نیشـتمانی و کوردسـتانیان چۆڵ کـرد و چوونە پاڵ حکومـەت. بوونە دوو بەش و ئینشـقاقێکی گەورەیان بە ناوی زۆرینـە و کەمینە لێ کەوتەوە. چریکە فیداییەکانی ئەکسەرییەت چوونەوە لای حکومەت و چریکە فیداییەکانی ئەقەلییەت هەر لە کوردستان مانەوە و درێژەیان بە شەڕ دژی کۆماری ئیسـلامی دا. بەشی زۆرینە دەستیان نەپاراست لە لێدان و بێهێزکردنی بزووتنەوەی بەرگریی گەلی کوردسـتان و لە لێدان و لەقاودانی هێزی پێشمەرگە و لایەنگرانی ناوشار و ڕێکخستنەکانی هێزگەلی وەک کۆمەڵە و دێموکـرات، چـی خراپ بوو بە دژی ئـەوان و بەرگری لە حکومەت، کردیان و چوونە بنباڵی حکومەتی ئیسلامیی خومەینی.

قسـە و مقۆمقۆیکردنـی شـەڕ لەناو شـار، لە لایـەن دێموکرات و کۆمەڵەوە، بووبوو بە جەمسەری جیاوازیی بیر و بۆچوونەکان، دەبوو هەموو وێکڕا بڕیار بدەن شـەڕ لە ناو شـاردا بکرێت، یان بۆ دەرەوەی

شـــار بگوازرێتـــەوە؟ ئەمە بڕیارێکی ئاســـان نەبوو، لە دەســـتی لایەکدا نەبوو، حیزب یەکدەســـت نەبوو، هەبوو دەیگوت با وەک ســـتالینگراد و لینینگرادی لێ بکەین، هەشـــبوو دژی ئەم شـــەڕە بوو، بە تایبەت لەناو شـــار. هەرچی کۆمەڵەشـــە دیار و ئاشـــکرا هەر وەک لە شارەکانی دی کردبووی، لایەنگری بەرگری و دیفاع لە شارەکان بوو، هەرچەند ئەوەی وەک موزایـــدە بـــەکار دێنا، دەنا کۆمەڵە بە تەنیا نـــە توانای مادی و نە هێزی پێشمەرگەی ئەوەی هەبوو بەرامبەر دەوڵەت، شارەکان بپارێزێت و ئەزموونـــی ئـــەو دوو مانگـــی ڕابـــردووش ئەوەی بە ڕوونی نیشـــان دابوو، بەرگری لە شارەکان تەنیا بە خوێن و لەناوچوونی خەڵکی شار، چ لەباری گیانی و چ مادی، تەواو دەبێت.

### دارساوێن و شندرە

دیســـان مەفرەزەکەمانیان کۆ کردەوە و گوتیان ســـتوونێکی گەورە و بەهێـــز لە ١٣٥٩/٦/١٤، (١٩٨٠/٩/٥) لە بانەوە ڕووی لە سەردەشـــت کردووە بۆ پاڵپشـــتی پادگانی سەردەشـــت و گرتنەوەی شـــار. بە پەلە بەڕێیان کردین هەر هەموو بە ســـواری ســـیمورغ بۆ لای دارساوێن و ناوچەی بانە.

بە سیسێر و گەورکایەتیی بۆکان و مەهاباددا، گەیشتینە دێی شندرە لە پشتی دارســـاوێن. ڕەحیم قادری بەرپرسی سیاسیی مەفرەزەکەمان بوو، مامەڵە و هەڵســـوکەوت لەگەڵیدا زۆر خۆش بوو، هەرگیز کەســـی نەدەڕەنجانـــد و زۆر خاکـــی و بێدەعیَ بوو. فڕەفڕی کۆپتەر و تەیارەی شـــەڕ، خەڵک و پێشـــمەرگەیان هەراســـان کردبوو. دەرکەوت لە ســـەر جـــادەی بانە-سەردەشـــت لە خوار دارســـاوێن بەرەو سەردەشـــت لە ســـتوونەکەیان داوە و ڕایانگرتـــووە و بەرگرییەکی ســـەخت لە خۆیان دەکـــەن و وا دیـــارە بە تەمـــای یارمەتیگەیشـــتنن، دەبێـــت خۆڕاگر بن. چەند هێرشی پێشـــمەرگەکانیان وەڵام دابووەوە و تێکیان شکاندبوون. لەســـەر جادە خۆڵەکەی بانە بۆ سەردەشت، مۆڵگەیەکیان دامەزراندبوو

و دەوری خۆیان بە سەنگەر قایم کردبوو. لە شندرەوە سەرکەوتین بەسەر ئەو یاڵەی ڕووی لە جادە و پشتی لە شندرە بوو. لە ئاسۆی ڕوانین بە هەردوو دیودا دامەزراین، پێشمەرگەی زۆربەی لایەنەکان، حیزب، پەیکار، چریکی فیدایی و کۆمەڵەی ناوچەی بانە و سەردەشت، دەستەی ئێمە لە مەهاباد و دەستەیەکی سەقز لەم ناوە بووین. خەڵکی ئەم ناوە زۆر هەژار و نەدار بوون، لەگەڵ ئەوەی هیچمان لەماڵیاندا نەهێشتبوو، هەر بە ڕەحم و بە خزمەت بوون بۆ پێشمەرگە. بە هۆی ئەوەی مەڕیان نییە و تەنیا دوو سێ سەر بزن نەبێ، لە شیرەمەنی و گۆشتدا زۆر بێحاڵومال بوون. گوێز و بادام زۆر بوو، لە دارسێوەکانی ناو دارستانەکان مرەبایەکی زۆری سێویان هەبوو، هێندەم مرەبا و گوێز خواردبوو، شەوانەش خەونم پێوە دەدیتن.

### تابلۆیەکی تۆقێنەری دۆزەخییانە

دەبوو شەو و ڕۆژ بە پانی ئەم یاڵە و ڕوو لە جادە و مۆڵگەی دوژمن لە سەر جادەکە، چاو و گوێمان کراوە بێ و لە کێشکگرتندا بین، نەکا لەناکاو سەرکەون و بێنە سەرمان و دێی شندرە کە پڕ بوو لە پێشمەرگە، بیگرن. هەر شەوەی دەستەیەک دەچووین و تا بەیانی چاومان لە خوارەوە دەبڕی و چاودێریی جووڵە و هاتوچۆیانمان دەکرد. بە ڕۆژ شەڕەتفەنگ و هاوەن و دۆشکە دەستی پێ دەکرد، چەند جار بە هاوەن، هێزی پێشمەرگە شپرزەی کردن و ویستمان بۆیان دابەزین و بیانگرین، بەڵام هەرجارە کۆپتەر و تەیارە لێی دەداین و دەکشاینەوە ناو چڕەدار و سەر شاخەکە. ئێمە بۆ چەند ڕۆژ چووین و ئەوە نزیک بە مانگە لەم سەر چیا و لە سەر زگی ئەم چەند ماڵە فەقیرەی شندرە بەبێ خۆشۆرین و خواردنێکی باش شەومان ڕۆژ دەبووەوە، نە ئەوە بوو ئێمە دەروەستیان بین و نە ئەوەش بوو ئەوان بە لایەکیدا بخەن و ڕزگارمان بێت لەم شەڕە تاقەتپڕووکێنە. نازانم دوای نزیک بە مانگ بوو؛ کە ئێمە لەوێ بووین و داوای گۆڕینمان لە

کۆمەڵەی مەهاباد کردبوو، پاشـنێوەڕۆ سەردەکەوتین بۆ سەر یاڵەکە، فڕۆکەیەکی زەبەلاحی ڕەش پەیدا بوو، شتی فڕێ دایە خوار لە بەرمیل گەورەتر و گوتیان ناپاڵمە، ئاگر و دووکەڵ، چاو چاوی نەدەدیت، کۆخە و پژمە و ڕشانەوە، هەموومانی بێتاقەت کردبوو، نەوعێک فسفۆڕ بڵاو بووەوە بەم شـاخەدا بە پێڵاوەکانمانەوە دەنووسـا و گیا و فریزووی دەسـووتاند. حەمەی شافعی، سالار ئاشناگەر، وەستا عەوڵڵای ڕەبەت، عەتـا قورئانـی، تاهیر شـەعبانی، ڕەحیم قـادری، چەند پێشـمەرگەی چریکـی ئەشـرەف و سـازمانی پەیکار لەسـەر یاڵەکە بـوون، ئێمەش گەیشـتین، لەبەر تەقە و هێرشـی پیادەی پاسدار سـەر هەڵنەدەهات و تەقە زۆر بوو، وەک گەلاڕێزان ئەوان کە هەڵدەگەڕان بە دیوی جادەوە بـۆ ئەوەی یاڵەکـە لە ئێمە بگـرن، هەڵدەورین. بە چـاوی خۆم دیم بە دەیان پاسـدار لە داوێنی شـاخەکە کەوتبوون، کەچی هەر دەهاتن و بە الله اکبر و هاوارکردن سـەردەکەوتن. کۆپتەر و هاوەن دیوی شندرەی وێران کردبوو، گۆڕستانەکەی تەنیشت ئاوایی، پڕ لە داربەڕوو و گوێز و بادام، گرگڕ دایسـا و لەم سـەرەوە، کە سـەیرت دەکرد، تابلۆیەکی تۆقێنـەری دۆزەخییانە بوو لە کێـل و دارە کورتەباڵا و بەرزەکانی ناو گۆڕسـتان، کە مردووەکانی دێنە سەما و زیندوو دەبنەوە لەناو ئاگری جەهەننـەم، بە بڵاوبوونەوەی پزوسـکە وردودرشـتەکان، ئەو لەشـە بێڕوحانـە وێنـا دەکران، بـە ڕژاندنی جۆگەلەی ئاور بـە کونەلووت و دەم و گوێـدا، بە چەقلە سـەما و هـاوار و پێکەنینی ئەهریمەنی بانگیان دەکردین بۆ بەزم و شایی و لۆغانی نەفرینکراوەکان. هەر ئێستا، زۆرم حەز دەکرد نیگارکێش بام و دوای چل ساڵ گۆڕستانی شندرەم لە ناو ئاگر و بەسـۆتەک[1] کراوی، نەخشـاندبایە و لەجیاتی ئەم نووسینە بە جیهانم ناساندبایە.

١- سۆتەک، زەویی ئاگرتێبەردراو، سووتک.

**تابلۆیەک لە دووکەرتبوونی مرۆڤێک**

هێرشـــی پاســـدارەکان بە یارمەتیی کۆپتەر و تەیارە بۆ گرتنی سەر شـــاخی شـــندرە، دوای زیاتر لە چل شـــەو، وا دیاربوو ئیتر بە لایەکدا دەکەوێـــت، ئەوان نازانم هێزی تازەیان بۆ هاتبوو یان پشتئەســـتووری پاراستنیان بوون لە ئاسمانەوە، کشانەوەیان نەبوو، کەمیان نەدەکرد و یەک دەکوژرا، یەکی دی دەهات، تەنیا چەند کەسـێکی کەم مابووینەوە لە ســـەر دوندی شـــاخەکە، عەتا قورئانی بریندار بـــوو، ناردیانە خوار. دوو پێشـــمەرگەی نازانـــم چریک یـــان پەیکار و ڕەزمەنـــدەگان تەرمی بێگیانیان لەوێ کەوتبوو، شـــەهید بووبوون. لەناکاو هاتنە ســـەر و هەر مابوو بە دەست بمانگرن، کەس ئاگای لە کەس نەما و ڕامانکرد بەرەو بەرکاوی[1] کێوەکە و لەوێشرا بۆ ناودێ و چەم و گۆڕستانەکە. کوڕێکی خوزســـتانی بە ناوی حەمید لە پشـــت ســـەرمەوە بوو، تەنیا ڕاکردن و خۆحەشـــاردانمان بەدەســـتەوە مابـــوو، کۆپتـــەرەکان وەک ڕاوکردن و تانجی بەسەرمانەوە بوون و ئەوەندە نزم بوون کەسەکان و ناوەوەمان دەدیـــت، هەڵگـــری نەوعێک ڕاکێـــت بوون درێژ و باریک، ڕێک بەســـەر مـــن و حەمیـــدەوە بوون و ڕامان دەکرد. من لـــە پەنا جۆگەکە بە قەراغ دیوارەکەیەوە کونێک بوو ئاو دایدڕیبوو، خۆم خزاندە ئەو کونە و سەر و نیوەی لەشم بەدەرەوە بوو، حەمید بە ڕاکردن خۆی لە قەفی دارێکی ناو چەمەکە لە دوو ســـێ مەتری من هاڵانـــد، هەر ئەوەندە دیم کۆپتەر وەک ڕاوەســـتان لەنگەرێکی گرت و بەســـەر ســـەرمانەوە وەستا، وەک ڕاوچییەکی سەرکەوتوو زەقزەق چاوی تێ بڕین و ڕاکێتێکی لە حەمید و دارەکە گرت، ئێســـتاش لەپێش چاومە حەمیـــدی وەک لەتکردن، لەت کـــرد و بـــە کەمتر لە چرکەیەک ئەو ناوە بە خوێنی حەمید خوزســـتانی نەخشێندرا و سوور هەڵگەڕا، تابلۆیەک لە دووکەرتبوونی مرۆڤێک، بۆنی دووکـــەڵ و بارووت و ســـووتانی دارەگوێزێک، ئـــەو دیمەنەی تەنانەت فڕۆکەوانەکـــەی وا لـــێ کـــرد من لە بیـــر بەرێتەوە، یاخـــود دەموچاوی

١- بەرکاو، دامێنی چیا و کێو.

زەندەقچــووی منی بە جووتێک عەینەکی ڕەشــی گــەورەوە دیت و بە بزەیەک بەزەیی پێمدا هاتەوە، وەرسووڕا و باڵی گرت و لەپێش چاوانم ون بوو. کێ دەڵێ تەقەمەنییشی تەواو نەبووبوو؟!

لە خوارەوەڕا دیمانن، ئەوان ســەر شــاخەکەیان گرت و دەســتیان کرد بە دامەزراندنی هاوەن و دۆشــکە و ســەنگەرلێدان، ئیتر شکســت و پاشەکشــەی ئێمــە و ســەرکەوتنی ئەوان لەم شــەڕە دووروودرێژ و نابەرانبــەر و ماندووکــەرە بە زیانێکی زۆری ماڵــی و گیانی بۆ ئەوان بەئەنجام گەیشــت. تەقە و هێرشی کۆپتەرەکان کز بووبوو، پێشمەرگە هەر کەسە لە شوێنێک و لە بن دار و دەوەن و بەردێکدا بوو، کەس هۆش و ئیلتزامی بە بەرپرس و مەفرەزەکەی خۆیەوە نەمابوو، هەموومان لەم چەند ســەعاتەی ڕابردوودا بەرپرسی پاراســتن و قوتاربوونی خۆمان بووین.

وردەوردە جووڵە و ملەقوتەمان دەست پێ کرد و هاواری یەکترمان کــرد کــێ ماوە، کــێ برینــدارە؟ لە ڕەبەت و سیســێرەوە دەســتەیەک پێشــمەرگە پەیدا بــوون، دیار بوو خەبەریان پێ گەیشــتبوو، کە وەزع و حاڵمان زۆر شــڕە، دوکتۆر شاکری و دەواودەرمانیان هێنابوو، عەتا قورئانی هەر زیندوو بوو، سیمورغ کە شاردرابووەوە ساغ بوو، دوکتۆر شــاکری و یــەک دوویەکــی دی بریندارەکانیان دەرمان کــرد، گوتیان؛ دەبێت عەتا بگەیەنین بۆ خەســتەخانەی بۆکان، دیســان ســیمورغ باڵی گرت و بەم شــاخ و کێوەدا شــەو درەنگ گەیشتینە بۆکان و گەڕامەوە لای پێشمەرگەکانی خۆمان لە لای سیسێر و دێهاتی گەورکایەتی.

## ٢٤

### شەڕ لە مەهاباد

ناوچەی بانەمان جێ هێشــت و دەمانزانی لە مەهاباد لەناو شــاردا، شەڕ دەستی پێ کردووە و خەڵک بەر تۆپ و هاوەن دراون. پێشمەرگە بە پارتیزانی لەناو شــاردا ماون و مەقەڕەکانی ناوشــار کۆ کراونەوە. مۆڵگەی داشــامەجید، شــاخەکەی بە پاڵ شــارەوە کە هەر لە ئەوەڵەوە بنکەیەکی پاسداری لێ بوو، بە قەناس و خۆمپارە هیچ شاری نەهێشتووە و پادگانیــش کوێرانە بــە تۆپ و خۆمپارە هیچ ناپارێزێت. چەند لە مەلا و پیاوانی نزیک لە حکومەت هاتوچۆی پادگانیان بۆ پاراســتنی گیان و ماڵی خەڵک کردووە، بەڵام هیچیان پێ نەکراوە.

پێشــمەرگەی دێموکرات و کۆمەڵە بە بڵاوی و لابەلا تەقە دەکەن و زۆرێک لە ماڵەکان زەرەریان وێ کەوتووە، یان ڕووخاون.

نزیــک بووینەوە و زانیمــان کۆمیتە ناوچە لە زگدڕاوە و مەقەڕی سەرەکیی ناوچە لەم گوندەیە. چووین بۆ ئەوێ و مەفرەزەکەی ئێمە لە شەڕی شندرە و دارساوێن هەموو بە ساغی دەرچووبووین.

زگــدڕاو پــڕ بوو لــە خەڵک، ئەم گونــدە بچووکە فشــارێکی زۆری لەسەر بوو، دەیان کچ و لایەنگری ناو شارمان هاتبوونە دەر، جێوڕێی خەوتــن و خــواردن زۆر کەم بوو، دەســتەیەک نێردران بــۆ قزڵجە و بەشێک بۆ حاجیاڵیکەند.

### خانووە وێرانەکەمان

هەر زوو کاریان پێ ســپاردم و گوتیان بڕۆ بۆ ناوشــار و تا زووە فریای شیرکەتی نەوت بکەون تا شار بە تەواوی نە گیراوە، تا دەتوانن بەنزیــن و نــەوت و گازاویــل بێنن با پاشــەکەوتی بکەیــن. هەر وامان

کرد، دەستەیەکی گورجوگۆڵ لەم هەموو خەڵکەی هاتبوونە دەر پێک هات و بە سواری سیمورغ ڕۆژانە دەیان کەڕەتمان دەکرد لە هێنانی سووتەمەنی و خواردن و پێداویستیی مەقەڕەکان و پێشمەرگە. گوتیان پێشمەرگەکان چوون بۆ سەر دوخانیات و تالانیان کردووە، دیواری ماڵی ئێمە لە پشتەوەڕا ڕێک بە حەوشەی دوخانیاتەوە بوو، تاقەتم نەگرت بۆ سەردانی ماڵەوە و هێنانی کەڕەتێک سیغار، لەبەر ئەوەی ماڵی ئێمە و دوخانیات لە مەرکەزی شار بوون و ئەگەری هێرش لە پادگانەوە زۆر بوو، بە کەمین و حەزەرەوە لێمخوڕی بۆ کۆڵانی خۆمان. کە ماڵە خۆمانم بە ڕووخاوی دیت و هیچی بە پێوە نەمابوو، تێکچووم و زۆر پەرۆشی ئەو ماڵەم بوو کە تێیدا لەدایک بووبووم و تێیدا ژیابووم. چوومە حەوشە و ناو ژوورەکانەوە، کزە لە دڵم هات و قوڕگم گیرا. فەرشی بەقیمەتی تەوریز هاوەن کوونی کردبوو، لە قاتی سەرەوەی لای خانووی کاکم سەقف نەمابوو، پەنجەرە و دیوار بە نیوەڕووخاوی، خانوو و شارە وێرانەکانی شەڕی جیهانیی بیر دەخستیەوە. قاپوقاچاغ و شووشەواڵە خۆشەویستەکانی دایکم هەر پارچە و لەتێکی لە لایەک کەوتبوو، ژێرخانەکە ئاخندرابوو بە کارتۆنە سیغاری دوخانیات و پێشمەرگەکان ئەوەی بۆیان دەرنەچووبوو، لەم کەلاوەیەی ئێمە شاردبوویانەوە. کوپە ترشیات و ئەنواعی مرەبا کرابوونەوە و دەستیان تێ وەردرابوو. پێشمەرگەی ماندوو دەستیان لێ نەپاراستبوو، تا توانیبوویان مرەبا و ترشیاتیان سەر هەڵگرتبوو و خواردبوویان. ماڵەکە زۆربەی ڕووخابوو، گوتیان لە شەڕەکان دەستەیەک پێشمەرگەی دێموکرات چوونە قاتی سەرەوە و لەوێڕا تەقە و شەڕیان کردووە و پاسداریش دەستی نەپاراستووە لە هاوەن و تۆپپێداداندا. پێشمەرگەی کۆمەڵەش دەستی بەسەر دوخانیاتدا گرتووە و هەموو سیغارەکانیان بۆ دەرنەچووە، لە ژێرخان شاردوویانەتەوە. بە حەسرەت و غەمباری چاوم دەگێڕا و یادگارییەکانی ناوماڵ و ئیی تایبەت بە خۆم بە شکاوی و بە سووتاویی دەدیت، کتێب و وێنەی کۆن

و ئەلبوومی بنەماڵە بە پەرپەڕ کراوی، نوێنووبان و پێخەفی داک و باب و خوشـــک و براکان هەمووی لە ناو کەلاوەکەدا کەوتبوونە ژێر خاک. چەند کارتۆن ســیغاری زۆر باشـــی وینســـتۆن و ڕۆزمەن و دانهێڵمان هەڵگــرت، هاتینـــە دەر، لە بەردەرگا دایکم بە بــاوەش و گریانەوە پڕی پێدا کردم. دیاربوو هەموو گەڕەک لە ماڵی میرزا عەلی ئەڵاوەیســـی لە ژێرزەمیـــن پەنایان گرتبوو، دایە گیــان ئەوە لە کوێ بوویت؟! بۆ کەس بەدیــار ئەو ماڵە وێرانەوە نییە؟! ئەدی بابم؟ کاکم؟ نەرمین و هەباس؟! بە پرسیاران دایکمم داگرتەوە.

### شەڕ و بێماڵی وای کرد تەنیا یەکتریان خۆش بوێت

دایکم لە خۆشیی ئەوەی من هاتوومەوە لە شەڕی بانە و دارساوێن هەر هەنیسکی دەدا و دەیگوت، هەمووی بە قوربانی تۆ بێت، توند توند ڕێکی دەگوشـــیم و بۆنـــی پێوە دەکردم، هەمووی دروســـت دەکەینەوە هەر تۆ ســـەلامەت بی، تووخوا بریندار نـــی؟! هیچت خواردووە؟ ئەدی بۆ هەر وا زەعیف و کز و لاوازی؟! پرســـیار بەدوای پرسیار و گریان. دەســـتی ڕاداشـــت بۆ ماڵی عەتاری دیواربەدیواری خۆمان، پڕ بە چاو و کۆڵمەکانی ئەســـرین جۆگەلەی هەڵبەســـتبوو، گوتی بە دەستی خۆم دۆێنێ پێنج کەســـیانم لە ســـەر ســـفرەکەیان کۆ کردەوە و شـــۆریمن و پیاوەکانی گەڕەک لە مزگەوت بە خاکیان سپاردن. کارەسات بوو، پێنج ئەندامی خێزانی ماڵی حاجی عەتاری لەوەتی هەیە جیران و دیواربەدیوار بووین، بە ژن و کچ و پیاوی پیر هەر هەموو لەسەر سفرە بە خۆمپارە لەتوکـــوت بووبوون. وردەوردە بەدەم گریان و قســـەکردنەوە چووینە ئەوبەری ماڵی خۆمان و لە ژێرزەمینی ماڵی میرزا عەلی ئەڵاوەیسی و ئامینە خانمی خێزانی وەژوور کەوتین، چ ببینم هەرگیز باوەڕم نەدەکرد پیاوان و ژنانی بەســـاڵداچووی گەڕەک، کوڕان و کچان وا بە تێکەڵاوی لەژێـــر میچـــی ژێرخانێکی بچـــووک و تاریکدا ببینم. جـــاران ژنان، بابم یان فلان میرزا عەلی و میرزا مەجیدیان دەدیت ســـەریان دادەخســـت و

لەژێر چارشێو خۆیان دەشاردەوە، کەچی ئیحتیاج بە یەک و لێقەومانی وای لـێ کـردوون هەر هەمـوو لە خوشـک و برا لەیـەک نزیکتر بن، تەنانەت بە بێجامەوە لای یەک دانیشـن و نان و چا لە یەکتر وەرگرن، لـە تاریکیـی شـەو لە لای یـەک قاچ درێـژ بکەن. شـەڕ و بێماڵی وای لـەم خەڵکـە کردبوو، بیـر لە هیچ نەکەنـەوە و تەنیـا یەکتریان خۆش بوێـت و هەرچـی هەیانە بەیەکەوە بەشـی بکەن. چەنـد برینداڕێک لە لایەک کەوتبوون و چەند کچێکی گەڕەک خەریکی تیمارکردنیان و ژنان سەرگەرمی نان و پێخۆر بوون. بابم بە دیتنی من شاگەشکە بوو، هەر ئەوەنـدە گوتـی ڕۆڵە تووخوا ئاگات لە خـۆت بێت، زۆرت باس دەکەن و کەمێک لەسەرخۆ و ئارام بە کوڕم. لەو دەمەدا کاکم کە چووبوو بۆ نانپەیداکـردن و خەبەروباس هێنانـەوە هاتەوە. لە چوار برا تەنیا کاکم بوو خێری دایەوە بۆ دایک و بابمان، بە درێژایی هەموو ئەو ساڵانە تا ماڵئاوایی لە ژیان هەر خزمەتی کردن. کاکم وەک سەرپەرشتیاری ئەو کۆمەڵـە ژن و پیـاوەی گەڕەکی لێ هاتبوو، دەهات و دەچوو کێشـە و گرفتەکانـی چارە دەکـرد و بژێویی پەیدا دەکرد، بە تایبەت ئارد و نان. بە دیتنی یەک، هەموو دەموچاوی یەکترمان لێسـتەوە، دەستی گرتم و دوور کەوتینـەوە، سـیغاری هەڵکـرد و دای بە منیـش، ژنی هێنابوو و گەورە بوو، بەڵام لای باوکم سـیغاری نەدەکێشـا، کەچی من زۆر لەو بچووکتـر بووم دەمکێشـا و زۆر جار بۆ ئەوەی شـەرم نەکەم و لێی دوور نەکەومەوە، بە بیانووی جگەرەکێشـان، بابم خۆی دەیگوت، ئەوە بۆ ناکێشی؟!

دایکـم گوتـی، هەباس دێ و دەچێ و زۆری ئاگا لێمانە، بەڵام خۆی زۆر مەشـغووڵی کاری ناوشـار و ڕێکخسـتنەکانی نهێنیـی کۆمەڵەیە. نەرمین و کۆمەڵێک لە کچەکان کە ناسراوبوون، چووبوونە دەرەوە و لە قزڵجە، مەقەڕێکیان لە ماڵی فەلاحێکی لایەنگری کۆمەڵە بۆ کردبوونەوە.

**سەرەنجام بەبێ شار گیرسامەوە**

تا توانیمان کارتۆنەسیگارمان بار کرد و بە هەڵگرتنی کۆڵێک خەم و داخ و حەسرەت بۆ چارەنووسمان و عاقیبەتی شار و کەسوکار، بۆ ماڵ و ئاشییانەی ڕووخاو و تەپیو مان، ملی ڕێگەمان گرت و گەڕاینەوە.

سابلاغ بۆ ماوەی زیاتر لە بیست ڕۆژان لە ئاخر مانگی هاویندا بە تۆپ و هاوەن و قەناسە و تانک وێران و کوشتاری لێ کرا، چوارسەت بۆ پێنجسەت کەس شەهید بوون و لە هەزار زیاتر بریندار.

سەرەتای مانگی ڕەزبەر، دوای کاولکارییەکی زۆر، ئەرتەش و پاسدار شاریان گرت و پێشمەرگە شاری بەجێ هێشت، هەرچەند گوتیان هەر لە دەسپێکەوە دوای ئەزموونی شارەکان، پێشمەرگە نەیویستووە لەناو شاردا شەڕ بکات، کەچی پادگان و داشامەجید هەر لە خۆوە دەستیان بە هاوەن و تۆپباران کردووە و شەڕەکە زیاتر لە بیست ڕۆژی خایاندووە و هاتنەوەی ئێمە لە دارساوێن ئاخر ڕۆژەکانی شەڕی سابلاغ بوو.

دوای ئەم گشتە سەفەر و شەڕی شار بە شار، سەرەنجام بەبێ شار لە ناوچەی سابلاغ گیرسامەوە. کۆمەڵە خەریکی خۆڕێکخستن و تەنزیماتی شار و پێشمەرگە بوو. هەموو ڕۆژێک کۆبوونەوە و دابەشکردنی مەفرەزەکان بوو. سەید بەرپرسی بەڕ و بەحر بوو، خۆی بە تەنیا حاکم و مقەستبەدەست بوو، دەیبڕی و دەیدرووی و لە بەریشی دەکردن. لە زگدڕاو دادەنیشت، مەقەڕێکی سەر ڕێگە و نزیک لە شار و جادەی بۆکان. لە هەموو کوردستان تەنیا بۆکان و شنۆ وەک شار بە دەست پێشمەرگەوە مابوون، بەڵام زۆربەی لادێ و ناوچەکان ئازاد و شوێن بنکەی پێشمەرگە بوون. تەنیا چەند کیلۆمەترێک لە شارەکان دوور کەوتبایەوە ئیتر ناوچەی ئازاد بوو. بۆ ئێمە ناوچەی سابلاغ، بۆکان گرنگیی زۆری هەبوو، لە خواردن و دەرمان و خەستەخانە و هاتوچۆی شارەکانی ئێران و سەرووی کوردستان، بۆکان شارێمان بوو، تەبعەن جاربەجاریش کەباب و بەستەنی و پاڵوودە و حەمامیش هەر بەنسیب دەبوو.

## حیزبەکان ئەو کەسانە وەخۆ دەگرن، گوێلەمست و سەر بە بنەماڵە بن

ڕۆژێک لە زگدڕاو هەواڵی خەلیل بللوریم پرسـی بۆ دیار نییە و بۆ کوێیان ناردووە؟ گوتیان ئێوە لە بانە بوون، کۆبوونەوەیەکی گەورەمان گرتووە بە سەرپەرشـتیی سەید و هەموو بەشـدار بوون، محاکمەمان کـرد، بە تۆهمەتی مەحفەلچێتـی[1] و خەڵک سـاردکردنەوە لە کۆمەڵە، زیاتر لە ١٧ کەس دەنگیان بە دەرکردن، یان ئیعدامی خەلیل داوە، تەنیا ڕەحیم بابەتاهیری گوتوویەتی جا دەری بکەن، بۆ ئیعدامی دەکەن؟!

هـەر دوای کۆبوونەوەکـە خەلیـل دەردەکـەن و بەتـای پانتۆڵ و کراسـێکەوە وێـڵ و سـەرگەردانی ئـەم دەشـت و کێوانـەی دەکەن. دواتر زانیمان شـار بە شـار و بـە پەنجە هەڵێنان لە جـادەکان، خۆی دەگەیەنێتـە تاران و تێکەڵی گرووپـی ئیتحادی موبارزین دەبێت، دواتر لە خانەی تیمی دەگیرێ و لە زیندانی ئەوین وەک سـەربازێکی گومناو لە ١٩٨١/١١/٢٩دا ئیعدام دەکرێت.

دوای چـل سـاڵ وەک دۆسـت و نزیکێکـی خەلیـل بللوریـان، لـە بەردەرگای ویژدان و عەدالەت سـەر نەوی دەکەم و دەڵێم خەلیل یەک لـە کوڕە پـاک و بلیمەتەکانی ڕۆژهـەڵات بوو، کۆمەڵـەی زۆر خۆش دەویست، تەنیا گوناح و نەهاتییەکەی ئەوە بوو لە باقیی سەرکردەکانی دیکـەی کۆمەڵـە، زیاتـری دەزانی و سـادقتر و بەئیمانتر بـوو. تۆڕی جاڵجاڵۆکەیـی سـەرکردایەتیی کۆمەڵـە و تەنانـەت حیزبەکانی تریش، تەنیا ئەو کەسـانە وەخۆ دەگرێت گوێلەمسـت و سـەر بە بنەماڵە بن. هەر بۆیەشە لە کوردەواریدا حیزب دیوێکی تری دیوەخان و سیستمی عەشیرەتە.

---

[1]- مەحفەل، تەکەتول، دەستەگەرایی.

# ٢٥

**ئاغاکەی دێموکرات**

مەقەڕێکــی هەمیشــە ئامادە و نزیک لە شــار، بــۆ چالاکیی خێرا و گورج و پەیوەندیی ڕۆژانە بە شــارەوە لە گوندی کۆنەدێ کرابووەوە. شەهیدان حەمە بازوکا، حوسێن سوهەیلی، عەلی موهاجیری، سولەیمان بللوری و ڕەحیم بابەتاهیری بە خۆشــییەوە ماوە و چەند پێشمەرگەی دیکە. هەموو پێشــمەرگەکانی ئەم مەقــەڕە تایبەتمەندیی خۆیان هەبوو، ســولەیمان بــە هــۆی ناســراویی زۆری هاتبــووە دەر و بووبــوو بە پێشــمەرگە، هەموویان پێشــمەرگەی چاوکــراوە و ئــازا و خوێندەوار بوون. عەلی موهاجیری ڕقی لە دەوڵەمەند بوو، هەمیشــە قەڵســەی لە ڕەحیم دەگێڕا، دار و ئاوردوو و ســووتەمەنیی زۆر کەم بوو، بە هۆی گەمارۆکانــی دەوڵەتەوە خەڵک لە قەیرانی ســووتەمەنیدا بوون. ڕەحیم کرابوو بە بەرپرســی پێداویستیی مەقەڕ، زوو زوو فەرمانی دەردەکرد کــەم دار بســووتێنن. عەلییش تەنیا لە داخی ئــەوەی ڕەحیم وا دەڵێت، سەرتاسەری شەو وەخەبەر بوو بۆ ئەوەی هەرچی دارە لە زۆپاکەی[1] باوێت، هەموو لە گەرمان لەم ژوورە بچووکە، کە لە قوڕ و سواغ بوو، وەســەر ئاو دەکەوتن، هاواریان لێ هەڵدەستا؛ عەلی مردین لە گەرمان. عەلی لە داخی ڕەحیم گوێی نەدەبزووت. عەلی ڕۆژانە کێشــەی هەبوو لەگــەڵ ئاغــای دێیەکەش، هەرچەند هــەر عەلی نەبوو کێشــەی لەگەڵ ئاغادا هەبوو، هەموو کۆمەڵە و خەڵکیش لەگەڵ ئاغادا بە هۆی ملهوڕی و زۆرداری هەر نەدەگونجان. زۆربەی بەرپرســانی حیزب وەک مەقەڕ زۆرتر لە ماڵی ئاغا بوون، عومەر قازی یەک لە بەرپرسانی حیزب، کە دواتر گیرا و خۆی بەدەســتەوە دا و لە شــار دانیشــت، دایمەودەرهەم

---

١- زۆپا، کوورەی ئاگر.

لەوێ بـــوو. عەلی دەچوو بۆ داربڕین و شـــەوتک[1] پەیداکردن، عومەر دەیگـــوت دار بـــۆ کۆمەڵە نییە و تەنیا بۆ ماڵـــی ئاغایە و موڵکی خۆیانە، ئاغا خزمی بوو هەر لە تایفەی قازی بوو، عەولاغای قازیان پێ دەگوت، ڕۆژێک کە منیش بۆ کارێک چووبووم بۆ کۆنەدێ، عومەر قازی پێشی بە دوو پێشمەرگەی کۆمەڵە گرتبوو، هاتوهاواری زۆری ساز کردبوو؛ «دەرتان دەکەین و کوردســـتان جێی کۆمەڵە و مۆمەڵەی تێدا نابێتەوە، ئاخـــر چتان لێمان دەوێ، هەمووتان بە قابڵەمەیەک دوڵمە تێر دەخۆن» خەریـــک بوو کێشـــەکە گـــەورە دەبـــوو، خەڵک کۆ دەبوونـــەوە و چەند پێشـــمەرگەی دێموکراتیـــش ســـمکۆڵی شـــەڕیان دەکرد. عومـــەر قازی نیـــازی گەمارۆدانی ئەو مەقـــەڕە بچووکەی هەبـــوو. عەلی موهاجیری لە ســـابلاغ لە زەمانی شـــادا خەڵک دەیناسی و کوڕی بنەماڵەیەکی زۆر خۆشەویســـت بوو، بە باب و براکانیەوە، کاک یونســـی براشـــی کۆمەڵە بوو، شەهید بوو. کاک یوسف زۆر جوامێر و ناسراو و عەزیزی خەڵکی شار بوو. زەمانی شا لەسەر ماتۆڕ تووشی ڕووداو بوو، کۆچی دوایی کرد، خەڵک زۆر بۆی بەداخ بوون. کاک مســـتەفا هەر لە سابلاغ کاسب و یارمەتیدەری باوکی بوو لە دوکانی چاککرنەوەی کوورە و سەماوەر، لەم ســـاڵانەی دواییدا بە نەخۆشـــیی شـــەکرە کۆچی دوایـــی کرد. کاک فەتاحی باوکیان یەک لە پیاوە ماقووڵ و کۆنەکانی سابلاغ بوو. عەلییش کوڕێکی بە دەســـت و پەنجە و شـــەڕکەر، بالابەرز و بەخۆوە بوو، زۆر جـــار لـــە گروهبان و ئەرتەشـــی و خەڵکی داوێنپیســـی بێگانەی زەمانی شـــای دەســـرەواند و هەتا خوا حەز بکات جوامێر و دەستوەشێن بوو، بە دژی زاڵم و زۆردار، پارێزەری مەزڵووم و بێدەسەلات بوو، لەسەر جادە ڕۆیشتبا و دیبای دوو کەس گەڕ یان بەربینگیان بە منداڵێک، یان کەســـێک لـــە خۆیان زەعیفتر گرتـــووە، یەکســـەر بەرەنگاریان دەبوو و بەرگریی لە زوڵملێکراوەکە دەکرد. عەلی پشتوپەنای بێکەس و هەژاران بـــوو. لەناکاو عەلی لـــە مەقەڕ هاتە دەر و یەک بەخۆی گوڕاندی، گوتی

---

١- شەوتک، سووتەمەنی.

گـوێ بگرە عومەری قازی، زەمانی نیگەڵەی[1] نییە، دەســت هەڵگرن لە ئاغاوەتی و کەڵەگایەتی لە خەڵک، بێتوو دەست هەڵنەگریت لەم زوڵم و سەرەڕۆییەت، بە هێزی خەڵک و شەپان دەرت دەکەین. تۆ بۆیە بووت بە دێموکرات بە نیـازی ئاغاوەتی و فیۆدالی زیندوو بکەیتەوە، خەیاڵت خاوە هێزی فەقیر و زەحمەتکێش ســەرتان پان دەکەنەوە. ئەم قسانەی بــە حەماس و دەنگێکی وا بەرز گــوت، هەموو خەڵک گوێی لێ بوو، لە بەرچاوی خەڵک بەرپرســی دێموکرات و یــەک لە بنەماڵەی قازیی ورد کرد و شکاند.

بوونــی عەلی لە جەولــە و ڕووبەڕووبوونەوە لەگــەڵ خەڵکی وا و تاقمێک لە پێشــمەرگەکانی هێزی پێشــەوای دێموکرات، کە پڕ بوون لە خەڵکانــی وەک عەبــووی عیمادی و کەریم خاڵــدار، عەولا قونچکۆل و کوڕانی هاشــمەکەچەڵ و سازواریی و چرچە و چەندی لەم بابەتە هێز و توانا بوو بۆ پێشمەرگەکانی کۆمەڵە.

### کچە نازدارەکانی شار لە دێ

دوای ئــەوەی بــە تــەواوی شــارمان چــۆڵ کــرد، لــە گوندەکانی دەوروبــەری نزیــک لە شــار، زگــدڕاو، ئیندرقــاش، قزڵجــە، کۆنەدێ، شیلاناوێ، حاجیاڵیکەند و ئاچیدەرێ مەقەڕمان کردەوە. بە هۆی نزیکی لــە جادەی ســەرەکیی مەهاباد-میاندواو، مەقەڕی زگــدڕاو زۆرتر بوو بە مەقەڕێکی نیزامی و ئامادە لە هاتنە پێش و هێرشــی هێزی دوژمن. کۆمیتەی ناوچە زۆرتر لە قزڵجە بوو، چەند لە کچەکانی کە زۆر ناسراو بــوون، هاتبوونــە دەر و لە قزڵجە دایاننابــوون، زۆرتر بە کاری ژنانی گوندەکــەوە خەریــک بوون. هەمــوو ڕۆژێک ئەم کچە جــوان و نازدار و دەســتوپێ ســپییانەی شــار، دەبوو لەگەڵ ژنانی ماڵێکدا بچنە بژار، مەڕدۆشــین، پشکڵ کۆکردنەوە، ڕیخشێلان، دەوە و قەڵاغ دروستکردن

---

١- نیگەڵە، نیکۆلای، لە موکریان و ناوچەگەلی کوردســتان، بە ســەردەمی نیکۆلای قەیسەری ڕووس دەڵێن.

و کاروبــاری نــاودێ. هــەر وەک ژنانی لادێ دەچوونــە کانیی ژنان و هــەر وەک ئــەوان زۆرتــر نان و ماســت و پەنیر و شــۆرباوی لەپە[1] یــان دەخــوارد، هەموویان تووشــی لێوبەباری و نەخۆشــی و لاوازی بووبوون، چاودێری و ڕعایەتی بێهداشــتیان وەک پێویست بۆ نەدەکرا و ئیمکاناتیــان زۆر کــەم بــوو. کە هاتمــەوە لە بانە نەرمینــم لە قزڵجە دیتەوە، کچێک لیپاولیپ لە سۆز و عاتیفە، بە باوەڕ، سەنگین و بێدەنگ، دەموچاوێکی ئەســمەر و ورد و هێمن و فریشتەئاســای هەبوو، خۆی ناوەکەش «نەرمین»، ناوێک بوو دەبێ بڵێم تەواو لێی دەهاتەوە.

لــە قزڵجــە بــووم، چــووم بــۆ لای، بەیەکــەوە دانیشــتبووین و باسوخواســتی ماڵــەوە و داهاتووی خۆمان دەکرد. لەناکاو کەنیشــکی چاوڕەشــی قــژکاڵ، ئەوەی تارمایــی و خەون و خەیاڵــی، بە چرکە لە مێشک و دەروونم، دوور نەدەبووەوە، تەلیسی بە دەرگا هەڵاوەسراوی لەتوپەت و کونکونکراوی، بە جێی پەردەی ئەتڵەسیی سەرسەرای پەری و شازادەکان لادا و بە خۆنوشتاندنەوە دەرکەوت، نیگایەک بۆ لای من و نەرمین و بزەیەکی شــەرمین، دیســان ناودڵ لەرزین و پەشــۆکاوی باڵی بە سەرمدا کێشا و سەرم لەناو خۆم نا. هاتە پێش:

- سەلام!

- سلاو باشی؟

- تۆشیان هێناوە بۆ دەرێ؟

- [سەر لە خوار و چاو لە عەرز]؛ بەڵێ! گوتیان بۆ ماوەیەک باشترە بێم بۆ شاخ،

بەندنەبوو، نەرمینیشــی برد و ڕۆیشــتن، من مامەوە لە ناو خەیاڵی قووڵ و دووری ناو هەور و ڕەشەبا و زریانی ژیان!

---

١- لەپە، لەتکەنۆک.

## خۆشەویستی خەڵک بوو، مەسئوول ڕقی لێی بوو

شـــوێنێک و کارێکـی تایبـەت و دیاریکـراو، جاریێ بۆ مـن نەبوو. لـە نێوان زگـدڕاو و قزڵجە و کۆنـەدێ لە هاتوچۆدا بـووم، زۆرتر بە بۆنـەی کۆمیتە ناوچە لە قزڵجە دەمامەوە، زۆربەی ڕۆژان بە عیشـقی سـولەیمان بـە پێیان هەر بە شـاخەکەدا بـە تەنیا ڕێم دەبـڕی بەرەو کۆنـەدێ، لـەوێ هەرچی لێی بـوو نزیک و هاوڕێی خـۆم بوون. زۆر جاریـش سـولەیمان دەهات بۆ قزڵجە و بەیەکەوە قسـەمان لە ژیان و داهاتوومان دەکرد، سولەیمان ئەداوئەتواری کۆمەڵێک مەسئوولی بەدڵ نەبـوو، ئەوانیش بە پێچەوانەی پێشـمەرگە و خەڵک، کە سـولەیمانیان زۆر خۆش دەویسـت، هیچ حەزیان لە کەسـایەتیی سـولەیمان نەبوو، ڕقیان لێی بوو، چونکێ لەناو خەڵک خۆشەویسـت بوو، هەر سولەیمان نەبوو، ڕەحیم قادری، حوسـێن سـوهەیلی و... خۆشەویستی ئەم یەک دوو بەرپرسەی ناوچەی مەهاباد نەبوون، بیانوویان پێ دەگرتن ئەوان کار بۆ کۆمەڵە ناکەن، بەڵکو کار بۆ خۆیان دەکەن و ئەوەتا لەناو خەڵک لەجیاتی کۆمەڵە، خۆیان خۆشەویسـت کردووە! دەمانگوت، جا چ بوو، ئێوەش گەر دەتوانن خۆتان خۆشەویسـتی ناو خەڵک بکەن. دەیانگوت نـا، ئەوان لەسـەر ناوی کۆمەڵە خۆشەویسـت بـوون. دەمانگوت دەی باشـە واتا خۆشەویسـتییەکە هەر بـۆ کۆمەڵە دێتەوە. بـە کورتی ئەم بەرپرسـانە حەسـوودی و ئێرەییان پێ دەبردن، چ لە ئاسـتی بنەماڵە و خوێنـدن و شـاریبوونیان و چ کۆمەڵایەتیبوونیـان، بروبیانوویـان پ ێدەگرتـن و گەورەبوونـی خۆیـان لە بچووککردنـەوەی ئەم کادرە خەڵکی و خۆشەویستانەدا دەدیت. سـولەیمان هەتا بڵێی پاکوخاوێن و تەکـووز بوو، لـەم لادێ و بێ ئیمکانی، جلوبەرگی هەمیشـە خاوێن و تەنانەت بەبێ بوونی ئوتوو ڕایدەخسـتن و بەتانیی بەسـەردا دەدان بۆ ئەوەی چرچولۆچیان ساف بکات، هەمیشە دەستێکی تەواوی شۆراوی

لــە بوخچەیەکدا بە کاریتــە[1] و دارەڕاکانی ژوورەکەدا هەڵاوەســیبوو، دەیگوت با کێچ و ئەسپێ زەفەریان پێ نەبن.

**سەرکۆنەم دەکەن، چونکە خەڵکی دێم فێر کرد دەستیان بشۆن!**

جارێکیان گوتی، عەلی من لەگەڵ ئەوانەدا هەڵناکەم و زۆر دوورین لە یەک. تۆ لێرە نەبوویت کۆبوونەوەیەکی زۆر قوڕ و بێتامیان بۆ ساز کردم، کۆمەڵێک خەڵکی بێسەواد و عۆقدەلەدڵ، من مەحکەمە دەکەن بۆ ئەوەی لە کانی دێ بە مســواک و خەمیر، ددانم شۆریوە و بە سابوون بەیانیان دموچاوم دەشــۆم، من نە تەنیا ئەوە دەکەم، خەڵکی دێشم فێر کردووە هەموو جارێک، کە دەچنە ئاودەســت جوان دەستیان بە ســابوون بشۆن، خەڵک دەبێ لە ئێمە فێر بن نەک ئەوەی ئێمە بچینەوە دواوە و وەک ئەوان بکەین. سولەیمان لە تاران موختەبەری واتا زانستی ئازمایشــگایی خوێندبوو، لە ئیدارەی بێهداشــتی ســابڵاغ کاری دەکرد، دەیزانی ســەلامەتی بۆ پێشــمەرگە و خەڵکی لادێ چەند گرنگە، لە شار بووین ڕۆژانە دەستەدەســتە پێشمەرگەکانی کۆمەڵەی دەبردە تاقیگە و کارتی دیاریکردنی گرووپی خوێنی پێ دەداین، دەیگوت ئەگەر کەسێک برینــدار بوو بە خێرایی بزانیــن چ گرووپێکە و خوێنی بۆ دابین بکەین، ئێســتاش ئەو کارتەی ســولەیمانم ماوە کە گرووپــی خوێنی بۆ دیاری کردووم. ســولەیمان دەیگوت، ئاخر کەســێکی وەک حوسێن سوهەیلی بۆ دەبێت لێرە بە هیچەوە خەریک بێت. حوســێن وەکی پێشمەرگەیەکی زۆر ســادە، کــە دوێنێ لە گوندێکــەوە هاتووە بۆ کۆمەڵــە گرنگیی پێ دەدەن و کەس حیســێبی بۆ ناکات. دیارە تەنیا حوسێن نەبوو، خۆشی و ئەوانی دییش لە لایەن بەرپرسەکانی ئەوکاتی کۆمەڵە هەمان نرخیان هەبــوو، کــە شــوانێکی لادێ لەبــەر ماندووبــوون و گوزەرانــی ژیان ڕوویان تێ دەکردین. ئەزموونی چل ســاڵم لە باشــوور و ڕۆژهەڵات، پێــم دەڵێــت زۆربــەی قارەمان و ئەوانــەی بە ئاگاهی و زانســتەوە لە

---

١- کاریتە، شاتیر، دیرەک.

پێشـمەرگایەتی بـەرەورووی مـەرگ بوونـەوە و داسـتانی گەورەی حەماسـییان خوڵقانـدووە، ئەم کوڕگەلـە خوێندەوار و شارسـتانییانە بوون و بە چاوی کراوە و عەقڵ و زانستەوە، بەرەوپیری مەرگ چوون. لە هەموو ناوچەی سـابڵاغی مەکۆی ئەدیب و سیاسەتمەدار و وەرگێر و هونەرمەنـدی ناسـراو، کە هەموویان دەبوونە بـاب و باپیر و برا و دایک و خوشـک و کەسوکاری ئەو پێشمەرگانەی ئەوێ ڕۆژێ، کەچی تەنیا سـێ ئەندامی کۆمەڵە هەبـوو، ئەوانیش نەخوێنـدەوار و هیچیان کوڕی شـار نەبوون و بەرپرسـی ئەو هەموو دوکتۆر و موهەندیس و خوێندەوارە بوون.

سولەیمان دڵی پڕ بوو، دەیگوت بەوە سەرکۆنەم دەکەن جامانەکەم وەک پێشـمەرگەکانی یەکێتی و باشوور دەبەسـتم و دەڵێن سولەیمان کوردایەتی دەکات و کۆمۆنیست نییە! دەبێ بێی بەیەکەوە بڕۆین بۆ لای هاوڕێیانی یەکێتی و خۆمان دەچینە ناو قووڵایی ناوچەکانی باشوور و لەوێ پێشـمەرگایەتی دەکەین. من لەگەڵ زۆربەی قسـەکانیدا بووم، بە تایبەت دوای ئەوەی خەلیلیان بەم دەردە بردبوو. گوتم ڕاوەسـتە ئەوە باسـی کۆنگـرە و دوو بۆچوونی جیا لەیەک لەنـاو کۆمەڵە دەکرێت، با بزانیـن کۆنگرە بڕیاری چی دەدا و چی بەسـەر کۆمەڵە دێنن. ئەوکات ئیتر بە بەرچاوڕوونی بڕیاری خۆمان دەدەین. ڕازی بوو جارێ لەگەڵ کوڕەکاندا هەر لە کۆنەدێ بمێنێتەوە و چاوەڕێی کۆنگرە بکەین.

### باوکی ماتۆڕسکلێتی بۆ نەکڕیبوو، هاتە شاخ

ئیشیان بۆ دۆزیبوومەوە، ڕۆژانە پەروەردە و ڕاهێنانم بە پێشمەرگەی تـازە دەکـرد، مێرمنـداڵ و لاوی شـاری دەهاتـن بۆ پێشـمەرگایەتی، بەشـێکیان بە هۆی عیشـق بۆ پێشـمەرگە و بیروباوەڕی ئازادی، یان بوونـی بـرای گـەورە، ئامۆزا، مـام و خاڵ، کـە لەناو کۆمەڵـە بوون، چەندیشان بۆ حەز لە تەقە و تفەنگ و لەزەت لە ژیانی پڕ لە ڕووداو و کوشـتن و ڕاکەڕاک بوو. هەشبوو لە ماڵەوە تووڕە دەبوو بۆ ترساندن

و ڕازیبوونی باب و ماڵەوەیان دەهات و دەیکردە هەڕەشــە بۆ گەیشتن بە داواکارییەکانی، جا گەر ژنهێنان بێت یان کڕینی ماشــێن و شــتی وا. کوڕێکی مێرمنداڵ هاتبوو دوو ســێ ڕۆژ بوو لە دەورەکەدا بەشــداریم پــێ دەکرد، هەرچــی دەمهێنا و دەمبرد و بە ناســینی بنەماڵەکەشــیان دەمزانــی ئەم مەخلوقە بۆ پێشــمەرگایەتی و ڕێبازی کۆمەڵە ڕووی لە ئێمــە نەکردووە، کە باســی زەحمەتکێش و عەدالەت و سۆســیالیزم لە کاتەکانی وانەی سیاسی دەکرا، ئەو گێرەی لە هەولێر دەگەڕا و هیچیی لێ نەدەزانی. ڕۆژێکیان، قاوەڵتوون بە جێبێک کاکم و خەزووری لەگەڵ پیاوێــک لەبــەر دەرگای مەقەڕ پەیــدا بوون، ئای بەخێــر بێن و وەرنە ژوور. گوتیان هەم دەترســێین بمانبینن و هەم دوکانمان داخســتووە و دەبێــت زوو بگەڕێینەوە. گوتیان ئــەم پیاوە خزمی خەزووری کاکمە و کوڕەکەی دەڵێن هاتووە بۆ پێشمەرگایەتی و لای تۆیە. ناونیشان ڕاست بۆ خۆی بوو، لە خودام دەویســت بینێرمەوە. باوکی دەســتی بە گریان کــرد و هەزار ســوێند و هەر ئەم کوڕەم هەیــە؛ ئاغای کەریمی بیکە بە خاتری جەنابی باوکت و کاکت و خەزووری، لەم کوڕەی من خۆش بە و شــوکور خەڵکی دیکە زۆرن بۆ پێشــمەرگایەتی، بە خوا براله ئەوەی من هەر بەکاری پێشــمەرگایەتی نایە و ئێســتاش شەوانە دەترسێت و دەبێــت دایکی لەگەڵیدا بچێتە مســتەڕاح. گوتم ڕاوەســتە بزانم، تۆ پێت وایە بەدواماندا ناردووە؟! دیســان دەســتی پێ کرد: خودا شاهیدە ئەوە چەند ڕۆژە بەزمی ماتۆرسکلێتی پێ گرتووم و ناوێرم بۆی بکڕم، دەڵێم بەردەبێتەوە و خودانەخواســتە شتێکی لێ بەسەر دێت! ئیتر نەوەستام و هاوارم لێ کرد لە ژوورەوە و گوتم لە ماوەی یەک دەقەدا خۆت کۆ بکەرەوە و تەشــریفت لەگەڵ جەنابی باوکتدا فەرموو بڕۆوە بۆ شــار، وا دیارە کوشــتن و شــەهیدبوون لە ڕوانگەی باوکتەوە تەنیا بۆ کوڕی خەڵکە. باوکی دەستی کرد بە سوپاسکردن و ماچکردنم و گوتی، ئاغای کەریمی قەد بیرم ناچێت پیاوەتی و لوتفی جەنابتان. کاک حەسەنیشمان ئەزیــەت دا لەگەڵمان هات. هەمووی نیو ســەعاتی نەبــرد کوڕە لەگەڵ

باوكدای سوار بوو و ڕۆیشتەوە و هەرگیز نەمبینینەوە.

ڕۆژێـک كچەكان كە تەنیا كاریان یارمەتیی ژنانی دێ بوو بۆ كاری ڕۆژانــە، نەرمیـن هات بــۆ لام، كە بۆچــی دەورەی تفەنــگ و ڕاكردن و لەســـەر سینگ ڕۆیشـــتن و ئەم شـــتانە فێری ئێمەش ناكەن؟ كۆمەڵە ئەوكات ڕوانگەی لەسەر بەشداریی كچان هیچ ڕوون نەبوو، منیش هەر هیچم لەم بوارەدا نەدەزانی. پرسیارم لە بەرپرسان كرد، گوتیان باشە، هەرچەند نایانكەینە پێشـــمەرگە، بەڵام خۆ ئەم شتانە بزانن لەپاڵ كاری ژنانــی دێدا، شــتێكی خراپ نییــە. چەند ڕۆژێـک دەمانبردنە دەرەوەی دێ و بە بازنەیی دادەنیشـــتین، تفەنــگ و دەمانچەمان بۆ دەكردنەوە و فێـری ناوزگی چەكەكانمان دەكردن، بە تەپۆڵكەی بەرمالاندا ســـەرمان دەخســـتن و وەرزش و ڕاكردن، ســـرووودگوتن، ئەوجــار تەقەكردن بە كلاشـــینكۆف و ژ٣ و برنـــەو و هەرچــی هەمــان بــوو، زۆر بــاش فێر دەبوون و تێیاندا بوو لە كوڕەكان باشتر بوون.

## هاوسەرگیریی تەشكیلات و نەرمینی خوشكم

هـــەر لــە قزڵجــە نیوەڕۆیــەک دوای نانخــواردن نەرمینــم دیت، لە دوورەوە هـــەر چــاو لە مەقــەڕ دەكا و دێ و دەچێ و نینۆكی لە دەمی دایە و خۆی پێوە مژووڵ كردووە، بانگم كرد و لە دێ دوورم خستەوە، چاوەكانی پڕ لە گریان و ســوور بووبوونەوە، كوڵمەكانی بە فرمێسكی وشــكبووەوە چرچ بووبوون. نەرمین لە مــن زۆر نزیک نەبوو، زۆرتر لــە هەباس كە بە تەمــەن زۆریان فەرق نەبوو نزیک بوو، ئەویش لەناو ژێرزەمینەكانی ڕێكخستنەكانی ناوشار، لە خۆیشی ون بووبوو. زۆری شــەرم دەكرد و نەیدەوێرا قســە بكات، زۆرم دەســت بە سەر و قژیدا هێنــا و وام كــرد بۆ یەكەم جار كچێک بتوانێت لێم نزیک بێت و قســەم بۆ بكات، ئەمە هونەرێک بوو من هیچم لێ نەدەزانی و زۆری تێدا كڵۆڵ بووم.

گوتی:

- ناوێرم، تووخوا توورە نابی؟!

- دایکـە گیـان ئێمە ئێسـتا هەر کاممـان وەک یەک، پێشـمەرگەی کۆمەڵەیـن و بۆمان نییە بەسـەر یەکـدا تێخوڕیـن و دوور لە قەدر و حورمەت بجووڵێینەوە!

- تووخوا تۆ وا بیر دەکەیتەوە؟!

- ئەدی چۆن خۆ وەحشی نیم!

- نـا کاکـە، پێم وایە هەمـوو کچەکانیش وا بیـر دەکەنەوە ناکرێت لەگەڵ تۆدا قسە بکەین، ئەتۆ زۆر توورەی! هەر دەگریا و گوتم:

- چ بووە، دڵنیات دەکەم گوێت لێ دەگرم و هەرچی هەبێت قبووڵی دەکەم و یارمەتیت دەدەم.

باوەشی پێدا گرتم و

- تووخوا ڕاست دەکەی؟!

- بە سەری تۆ.

- ئـەوە دوو ڕۆژە سـەید دێ بـۆ لامـان و کۆبوونـەوەی ڕەخنە و ڕەخنــە لەخۆمانــی بۆ داناویــن، دەبێت هەموو شــت بڵێین، دەنا پاک نابینەوە لە خوو و ڕەوشتی وردەبۆرژوازی!

- پێکەنیم، دەی چت گوتووە؟ نەکەی درۆت بۆ خۆت هەڵبەستبێ و زۆرت قسە کردبێ؟!

- با هەموو شتێکم پێ گوتن!

تەزوو بە لەشمدا هات، هەموو شت! لە نێو خۆمدا گوتم، دەبێ چیی کردبێ ئەم کچەتیوە!

-هەموو شت چییە دادە گیان؟ پێم بڵێ بزانم، با عیلاجی بکەم.

- یەک دوو ساڵ پێش، کوڕێک تۆش دەیناسی و ئێستا لە ڕێکخستنی ناو شــارەکانی کۆمەڵەیە، هاتە بەردەرگا و لە تۆی پرســی و تۆ لە ماڵ نەبوویت، بەڵام بۆ ئەوە نەهاتبوو، نامەیەکی فڕێ دا و ڕۆیشت، نامەکەم خوێندەوە و باســی عاشـقبوونی خـۆی دەکات و نووسـیبووی زۆرم

خۆش دەویێ و بە کورتی حەزی لێ کردووم.
- جا ئەوە چییە ڕۆڵە؟! حوسێنی برات ڕۆژانە ئەوەی دەکرد لەگەڵ کچان! ئەوەم بۆیە گوت، ئاســوودە بێ و هەموو وردەکاریم پێ بڵێت و گەر بزانم شتەکەیان جیدییە بەیەکیان بگەیەنم.
- بــە پێکەنینەوە، ئاخر حوســێن زۆر جوانــە، کچان زۆریان خۆش دەویێــت، مــن دوای ماوەیەک وەڵامی نامەکــەم داوە، بەڵام هیچ وەعدم پێ نەدا و نووســیم دەبێت زۆرتر یەکتر بناســین و زۆر دەترسم عەلی بزانێــت. یەک دوو نامەی تری لــە ڕێگە بۆ فڕێ داوم و لە وەڵامدا بۆم نووســی ئەگەر ڕاســت دەکەیت، دەبــێ خانەوادەکان ئــاگادار بکەین و ئاشکرای بکەین.
- باشە بەڕاست تۆش سۆزت بۆی هەیە و خۆشت دەوێ؟!
- نازانــم بــە خودای! ڕەفیقی تۆ بوو ڕقم لێی نەبوو، ئەگەر هاتبا بۆ داوام لەوانە بوو مێردی پێ بکەم!
- ئەگەر ئێستا دەخوازی زۆر ئاسانە و جێبەجێی دەکەین!
-نــا، بــە خودای عەلی گیان، هیچ ئیحساســم نەماوە و ئێســتا تەنیا بیر لە شــۆڕش و ســەرکەوتنی کۆمەڵە دەکەمەوە و ئەسڵەن ئامادەیی ئیــزدەواج و ئــەم جــۆرە شــتانەم نییە، ئەویــش هەر خەبــەری نییە و بیستوومە لە تەشکیلاتی شارەکانی ئێران کار دەکات.
- من باشی دەناسم و کوڕی باشە.
- نا عەلی تووخوا! دیسان فرمێسک و گریان.
- باشە بۆ دەگریی؟! چۆنت پێ باشە وا دەکەین.
- ئاخــر ئەو شــتانەی بــە تۆم گوت، بــە کچەکان و سەیدیشــم لە کۆبوونەوەکــە هــەر وا گوت! ئێســتا ســەید دەڵێ تەشــکیلات موافقی هاوســەرگیریی ئێوەیــە و دەبێ زەماوەند بکەن، بــەڵام من نامەوێت و وەک کوڕێک و هاوڕێیەکی باش قبووڵمە، بەڵام ناتوانم هاوســەرگیریی لەگەڵدا بکەم!
- دەی باشــە، شــتەکە حەلە و بە کەیفی خۆت بکە، لە هەر جێیەک

بووم، تەنیا خەبەرم کە من چۆنت پێ خۆش بوو وای لێ دەکەم.
- من زۆر دەترسم و تازە هەموو پێیان زانی و نازانم چ بکەم، دایکم و بابم بزانن چ دەکەن؟!
- ماچم کرد و باوەشــم بۆ کردەوە، دادەکەم ئەمانە هەموو حەز و خولیای ســەیدە، دەنا ئەو شــتانە عەلاقەی بە کەسەوە نییە، من بۆخۆم بۆ ژیانی تایبەت و خسووســیی خۆم نە بە کەس دەڵێم و نە ئیجازەش وەردەگرم، ئەم شــتانە شــتی تایبەت بە خۆتن، ئەوجار تۆ هێشتا تەنیا حەڤدە ســاڵی، زۆر زووە بۆ ئەم شــتانە، ئەگەر هەستێکیشــت بووبێت تەنیا هەستێکی خێرا و زووتێپەڕ بووە.
- بەخوا هەر وا بووە، تووخوا عەلی کۆمەکم بکە، من لەوانەیە خۆم بکوژم!
- نا! خوشــکی خۆم ئەدی منت بۆ چییە، تۆ بڕۆ جوابی تەشــکیلات و کۆمەڵــە مــەدەوە و تەنیــا پێیان بڵێ مێردی ناکەم و هەموو شــتم بە عەلی گوتووە، با بێن بۆ لای من، شێتیان دەکەم و بە شاخانیاندا دەبەم، بەوان چی کچی خەڵکی چۆن و کەی و مێرد بە کێ دەکات؟!
نەرمیــن لەســەر جیددیبوون و هەڵوێســتم زۆری ئیمــان پێم بوو، دەیزانی لە پشتی دەوەستم، بەرپرسان ناتوانن شتی وا بەسەر خوشکمدا بســەپێنن، بۆیە زۆر ئارام بووەوە و توند توند باوەشــی پێدا گرتمەوە. وەعدمان دانا تا لەوێ بم زوو زوو بەیەکەوە قسە بکەین و بچێت دوای ئەم گفتوگۆیەمان یارمەتیی کچەکانی تریش بدات لە ڕووی دەروونی و ئەم باسانەی تایبەت بە خۆیان، کە بۆ کاک سەیدیان کردبوو!
بەداخــەوە دواتــر زانیــم چەند لە کچــەکان هەر بە هــۆی نەبوونی کەسێکی خەمخۆر و یارمەتیدەرەوە تووشی هەڵە و خەمۆکی و دابڕان هاتوون، یان لەســەر بڕیاری تەشکیلات و ئەم مەسئوولانە گەورەترین هەڵەی ژیانیان کردووە و تووشــی شووکردنی ناسەرکەوتوو بوون و کێشە و گرفتی زۆر گەورەی کۆمەڵایەتیی لێ کەوتووەتەوە.
ئێستاش هەر نەمزانی لە کام کتێب و تیۆری چەمکی هاوسەرگیریی

تەشکیلاتییان داهێنا و تەنانەت لە ژیانی ئەندام و لایەنگرانیان، تەداخولی ئەم ئەرکە گرنگە و تایبەتەیان دەکرد.

**ئامین بۆ ڕەزامەندی هات و بە خاکمان سپارد**

مینــە قەڵەو برا و هاوڕێی نزیک و زۆر خۆشەویســتمان، بە ماڵ و ژن و منداڵــەوە خزمەتــی کۆمەڵەیان دەکرد، زۆر لە ســولەیمان نزیک بوون، دوای گرتنەوەی ســابلاغ، مینەش بوو بە پێشمەرگە و لۆرییەکی گەورەمــان بــوو، ئەو شــۆفێری بــوو. ئامینــی خوشــکی کیژۆڵەیەکی نەشــمیل و تازەپێگەیشتووی ١٥ ســاڵانە هاتبوو بۆ لای کاکی لە شاخ، خوازبێنــی هەیــە و ئیجــازە لە کاکــە مینەی وەربگرێت و شــوو بکات. چووبوو بۆ قزڵجە و بەتەمای دیتنی کاکی لەگەڵ ســولەیمان و ســەید سوار دەبێ بێت بۆ حاجیاڵیکەند بۆ دیداری برا و ڕاسپاردنی سولەیمان بۆ ڕازیکردنی باوکی. بەهمەن شــۆفێری لەندرۆڤێرەکە دەبێت، لە ڕێگە ســەید بە بەهمــەن دەڵێت، فێرم بکە بــا لێیخوڕم. بەهمــەن بە نابەدڵی ســوکانی دەداتە دەســتی. هەرچی دەڵێت خەڵکی تێدایــە فایدەی نابێت، مەســئوولە و دەبێت بەقســەی بکات. پێش ئــەوەی بگەیتە حاجاڵیکەند، ســەرەوژێرێک بــوو، دەهاتە خوار بەرەو دێ، ڕێک کە دەگاتە ســەری لێژییەکە، لەجیاتی ســتۆپگرتن و خاوکردنەوە، پاڵ بە بەنزینەوە دەنێت، بەهمەن و ســولەیمان هاوار دەکەن تورموز، تورموز، ســەید شــپرزە دەبێــت و زیاتر بەنزین دەشــێلێت، لەندرۆڤێر بە تەنیشــتدا دەکەوێت و یەک دوو سەرەمەقولاتان لێ دەدا، سولەیمان و بەهمەن بریندار دەبن، ئامیــن فڕێ دەدرێ و ســەری وەبەردێک دەکەوێــت و لە جێوە ڕۆحی دەردەچێت، ســەیدیش بە ســاغ و سەلامەتی لێی دەرباز دەبێت و خۆی فێری ماشــێن ئاژۆتن دەکات! کارەساتێکی یەکجار ناخۆش، بۆ مەرگی ئــەم کیژۆڵە نازدارە، هاتبوو بۆ شــووکردن ئیجازە لە کاکی وەرگرێت، هەر لە گۆڕستانی حاجیاڵیکەند بەجێی مێرد، بەخاکیان سپاردبوو. تاقە یەک کەســیش سەرکۆنە و ڕەخنەی لە سەید نەگرت و بەرپرسیارەتیی

مەرگی ئەم کیژۆڵەش کەسی نەگرتەوە!

ڕۆژی بیستوپێنجی خەرمانانی ساڵی ١٣٥٩ بەرامبەر بە ١٩٨٠/٩/١٦ ئامیـن خەیـات بـەم ڕووداوە دڵتەزێنـە، ماڵئاوایـی لـە ژیانی هێشـتا دەستپێنەکردوو کرد.

# ٢٦

**فەرماندە بڕیاری بۆ نەدرا**

لــە ســەرەتای مانگــی دووی پاییزدا، دوو دەســتە ســاز بووین بۆ چالاکیی نیزامی لە جادەی ڕەزاییە. چاودێری کرابوو، کازیوەی بەیانییان ستوونێک دەهات بۆ کۆنترۆڵ و حەرەسیاتی جادەکە. پلانمان دانا پێش ڕووناکی بچین لە باغەکانی ئیندرقاش و وسووکەند لەناو کاناڵ و کەند و جۆگەکانــی نزیــک جادە خۆ حەشــار بدەین و کــەس پێمان نەزانێت تا ســتوون دەگاتە ئاســتمان، ئەوجار لێی بێینە دەر و هێرشــی بکەینە سەر. پێش شەبەقی بەیانی هەموو لە نزیک جادە بەرامبەر دریاز لەناو باخێکدا خۆمان حەشــار دا، زیاتر لە بیســت بۆ بیســتوپێنج پێشمەرگە دەبووین، چاوەڕێمان دەکرد ڕۆژ بێتەوە و بە هاتنی خۆر گەرم بینەوە. شەوانی پاییزی موکریان زۆر سارد بوو، ستوون نەهات، بەڵام لەناکاو ســەرمان هەڵێنا لە تەپۆڵکەی بەرامبەرمان ئەوبەری جادە، ڕەشــایی و هاتوچــۆی نەفەرات پەیدا بــوو، بە ڕوونی دەماندیــت خەریکی تۆپ و هاوەندامەزراندنــن بەرامبــەر ئێمە، ئیتر زانیمان بە دڵنیاییەوە کەســێک پلانەکەمانی زانیوە و ئیخباری کراوین. دوژمن بە جێی هاتنی ڕۆژانەی ســتوون یەکسەر بە پشتەوەدا تەپۆڵکەکەی بەرامبەری گرتووە و ئەوە چەکی قورســمان بۆ دادەمەزرێنێت، ئیتر کــێ کوڕی باوکی خۆی بوو دەبوو خۆی دەرباز بکات. دوو دەقەی نەبرد باخ و سەنگەرەکانی ئێمە هەر هەموو بوو بە ئاگر، بە ســەدان هاوەن و تۆپمان بەســەردا باری، ســیامەند و ڕەحیم قادری، ســولەیمانە ســوور و زۆربەی پێشــمەرگە ناســراوەکانی ناوچەی مەهاباد لەوێ بوون، فەرماندە کاک ڕزگار بوو، ئەویــش نەیدەزانــی چ بکات و وەک ئێمە، لە خۆحەشــاردان و ڕاکردن بەمــلا و ئەولادا بوو. چالاکییەکی زۆر ناســەرکەوتوو، چەند ســەعات

هیلاک و شەکەت کراین، بەبێ ئەوەی بتوانین بچووکترین دەستکەوت، یــان زەرەرمــان بۆ دوژمن بووبێــت. دواتر ســیامەند گێڕایەوە، لەگەڵ ڕەحیــم قادریدا لــە بن جۆگەیەک خۆیــان مات کردووە، دوو پاســدار وردەوردە هاتوون بۆ لایان، ســیامەند دەڵێ دەنگ مەکەن بە زیندوویی دەیانگریــن، یــان لەناکاو لێیــان دەدەین، کەچی نزیــک دەبنەوە ڕەحیم دەسرێژێک بە حەوادا دەکات و هەردوو هەڵدێن، سیامەند تووڕە دەبێت؛ بۆ وات کرد ڕەحیم! نەمانگوت بێدەنگ بن تا دێنە بن دەستمان؟! کەچی ڕەحیم دەڵێت گوناح بوون، حەتمەن دایک و بابیان هەیە و چاوەڕێیانن، پێــم زوڵــم بوو بکوژرێن. ئیتر ســیامەند هیچی پــێ ناگوترێت و دەڵێ، کــە وا بەڕەحمی بۆ هاتووی؟! ڕەحیم وا بوو ســەری چۆلەکەیەکی پێ نەدەبڕدرا! ســولەیمانە سوور بە قایش و مەخزنەوە، خۆشی ئەستوور و قەڵەو بوو، بۆریی ئەســتوور و زلی چیمەنتۆ بۆ ئاوداشــتنی لێ بوو، هەمــوو یەک یــەک بە نــاو بۆرییەکەدا پەڕینــەوە و چووینــە ئەوبەر، ســولەیمانە سوور لەمسەرەوە بەڕێکرا و لە قەدی لوولەکە گیری کرد، ڕزگار بــە لاق پاڵــی پێوە دەنــا و ئێمە کە پەڕیبووینەوە و لەوســەری بووین ڕاماندەکێشا، کەچی گیری کردبوو نەدەهات، پاسدار بۆ پێشەوە دەهــات و هــاوەن ڕاوەســتانی نەبــوو، ڕزگار مابوو بێتــە لای ئێمە و بپەڕێتەوە، کەچی ســولەیمان ناولولەکە و تاقە ڕێگەی گرتبوو، گوتمان سولەیمان تاقم و مەخزەنەکان لە خۆت بە جۆرێک بکەوە و تفەنگەکەت بەڕێ بکە بۆ لای ئێمە، ڕزگار هەر جنێوی دەدا و لەوانە بوو بە دەست بگیرێــت، یان بکوژرێت، عاقیبەت ســولەیمان بە شــپرزەیی قوتار بوو، بەڵام لە زمان و حەرەکە کەوتبوو. هەتا لای ئێوارە تۆپباران و قەناسە و دۆشــکە و خۆمپــارە بەردەوام بوو، ســێ بریندارمان بوو، دیســان ســیمورغ فریامان کەوت و هەرســێکیانمان گەیاندە مەقــەڕی زگدڕاو، گەڕامەوە و هەموو پێشمەرگەکان لە دەور و ناو دێی ئیندرقاش شەکەت و شپڕێو لێی کەوتین، کەچی سیامەند ملی ڕێی گرت، بۆ کوێ دەچی؟! دەچمــەوە ناو باغەکە! تۆمەز پێشــتر کۆترێکــی زۆری کەوڵ کردبوو،

خەریکی برژاندنیان بوو کە ئەو بەزمەمان بەسەرهات و هەمووی جێ هێشتبوو، گەڕایەوە دەستی کردەوە بە برژاندنی کۆترەکان. لەناو هاورێ و ئەوانەی ناسیومن کەم کەسی خوێنسارد و بێمبالات و لەسەرەخۆم، لە شەڕەکاندا وەک سیامەند دیوە. ئەگەر فەرماندەکەمان هەر بە پەیدابوونی یەکەم ڕەشایی لە تەپۆڵکەی بەرامبەرمان عەقڵی پێ دەشکا و شک و گومانی ئەوەی کردبا، ئیخباری کراوین، ئەم بەزم و بریندارانەشمان تووش نەدەبوو، دەمانتوانی تاکتیک و ڕەوشێکی دی بگرینە پێش، کەچی لە بیرمە پێش دامەزراندنی تۆپ و خۆمپارەکان زۆرمان گوت کاکە کەشف بووین و دەبێ بە زوویی بڕۆین، کەچی کاکی فەرماندە هەر بڕیاری بۆ نەدرا و پێی وا بوو فەرمانی پاشەکشە بە واتای ترسنۆکی ئەو لێک دەدرێتەوە. هەرچەند لە کەشوهەوای ئەوکاتی ناو پێشمەرگە ڕەنگە زۆریشی ناحەق نەبووبێت!

### مەسئوولی مندالّباز

گوتیان، ناوچەی سندوس پێشمەرگەی کەم بۆ چووە، پاییزێکی خۆش بوو، دەستەیەکیان ساز کردین و (س.س)یان کردە مەسئوولی سیاسی. بۆ جەولە ڕەوانەی سندوس کراین، بە سیمورغەکە چووین و جارێ ڕێگە و هاتوچۆی پێشمەرگە بە ماشێن هەبوو، هەرچەند بۆ سندوس بە هۆی نزیکی لە نەغەدە و عەجەمی سەر بە ئاخوند حەسەنی زۆریش بێخەتەر نەبوو. بەرەو مەمەلیان و خەلیفان، شاولێ، محەمەدشا، محەمەدیار و دەشتی قوڕێ چووین، چەند دێیەکی عەجەمانی لێ بوو نەماندەوێرا لێی بمێنینەوە، زۆرتر لە ماسوێ و دایماو، کە دوو دێی بەخزمەت و خۆش بوون، دەماینەوە. یەک دوو پێشمەرگەی تازەی منداڵکارمان لەگەڵدا بوون. فاروق بللوری بە هۆی نزیکیی زۆرمان پێی گوتم ئەوە چەند جار شەوانە لە مزگەوت و ماڵاندا (س.س) ئەو کوڕە فەقیرە ناوی حوسێن بوو لەگەڵ خۆیدا دەنوێنێت و لە لای من گریاوە و دەڵێ خۆم پێوە دەنێت و دەست بۆ دۆخینەکەم دەبا و...، گوتم فاروق

بزانــە قســەی لەگەڵدا بکــە با زۆرترمان لــێ حاڵی بێت، ئەوە شــتێکی خەتەرە و بە ئاســانی کۆمەڵە بڕوا بە قســەکانی حوســێن ناکات، هەم منداڵە و هەم تازە، دەبێت لە شوێنی خۆی بە بەڵگەوە بیگرین، دەنا هەر قســە فایدەی نییە. کاکی بەرپرس گومانی لا دروست بووبوو، حوسێن لای ئەم و ئەو قسە دەکات. لەناکاو و بەبێ بەرنامە گوتی دەڕۆینەوە و جەولە تەواو بوو، گەڕاینەوە قزڵجە، شەو پاسبەخش بووم و حەرەسم خەبــەر دەکردنــەوە، لە بــەردەرگای مەقەڕ بووم، نیوەشــەو فاروق و حوســێن هاتن بۆ لام و حوســێن دەگریا، گوتی وەرە چاو لێ بکە ئەوە لەســەری شەو جێگەکەی هێناوە بە جێگەی منێوە نووساندووە و توند خۆی لێ قایم کردووم. گوتم ســبەی شــەو خۆتی بۆ شــل بکە و هیچ مەکە من ئاگام لێت دەبێت. بەیانی بە سەیدم گوت و قەرارمان دانا شەو هەردووکمان کێشکیان بکێشین، هەر وامان کرد و شەو چووم بەدوای ســەیدا لــە ماڵێکی دێ ژوورێک هەبوو بۆ کۆمیتــەی ناوچە لەوێ بوو، هات بۆ مەقەڕ و لە دەرەوە وەســتاین، لە نیوە شــەو فاروق لەسەرخۆ هاتوو گوتی وەرن، ئیتر هەموو شــت ئاشــکرا بوو. بەیانی زوو سەید، فــاروق و حوســێنی بانگ کرد و گوتی نابێــت کەس پێ بزانێت، بە منی گوت لەندرۆڤێرەکە ساز بکە دەیبەین بۆ ناوەندی، کوڕێکی تری خەڵکی دەرمانــی لــێ بوو، نزیک بوو لە کۆمەڵــە و ئەویش بەرئەندامی کۆمەڵە بــوو، کاتــی خــۆی هاوڕێی شــەهید حەمە حوســێن کەریمــی بووە لە شانەی زەحمەتکێش و کرێکاری ساختوومانی. بەویشی گوت ساز بێت و لەگەڵماندا هات. بە ســواری ماشــێن لە پشــتەوە دەســتمان بەست و چووین بۆ ناوەندی کۆمەڵە. دوکتۆر جەعفەر لە بۆکان بوو، چووین بۆ لای، دوکتۆر هەر سەری ڕادەوەشاند و باوەڕی نەدەکرد ئەم بەرپرسە ئەوەندە پەست بێ و تەماح لە منداڵێکی وا بکات و مەسئوولیش بێت. دوو ڕۆژ لەماڵی مام ڕەسووی لە بۆکان ماینەوە، بە شەو و ڕۆژ حەرەسی بووم، تا شــتێکی قوڕ نەکات، دوو جار پەلاماری کلاشــینکۆفەکەی دام خــۆی بکوژێت، نەمانهێشــت. دوای دوو ڕۆژ دوکتۆر هاتەوە و گوتی،

کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری دا بە گرتنی لە ناوچەی سەقز. ئیتر (س.س) گیـرا و ڕەوانەی زیندانی ناوچەی ســەقز کرا، کە برا گەورەکەی خۆی لــەوێ کۆمیتەی ناوچە بوو. نەیانهێشــت لە ئێمــە زیاتر کەس بەم کارە بێئەخلاقییە بزانێت و سەرپۆشیان لەسەر دانا.

پاییز و زستانی ١٣٥٩ (سەرەتای ساڵی ١٩٨٠) ئەوان سەردەم بوو، کۆماری ئیســلامی بە چنــگ و ددان، بە وەحشــیگەری و کۆمەڵکوژی، تــرس و تۆقانــدن و ئیعــدام و وێرانکــردن و هەرچی پێــی دەگوترێت ئاکاری قێزەون، دەیویســت دەسەڵات و فەرمانڕەوایی خۆی بە تایبەت بەسەر کوردستاندا بسەپێنێت. «کوردستان» لە ڕوانگەی مەزهەبیی (چ شـیعە و چ سوننی)، سیاســی، یەکپارچەیی خاکی ئێران، ناسیۆنالیزمی مۆدێرنــی ئێرانــی و کێشــەی کۆن و مێژویی «کــورد و عەجەم»، ئەم چەمک و بابەتە بوو زۆربەی جاران بە ڕاست و چەپ، عەلمانی و دینی، پێشــکەوتوو و دواکەوتــوو زوو لەســەری ڕێک دەکەوتــن و زۆربەی جــاران لە مێــژووی ئێــران، هەموویان هــاوڕا بوون بۆ ســەرکوت و داپڵۆسینی گەلی کورد.

### جیهاد لە گوندەکان

هێشــتا برینەکانــی هەزاران کوژراو و برینداری شــارەکانی ســنە، ســەقز، مەریــوان، بانــە و مەهابــاد قەتماغــەی نەگرتبــوو، لاتولوت و چەقۆکێش و قەمەبەدەستەکانی ئاخوندێکی بێشعوور و نەخوێندەواری وەک مەلا حەسەنی لە گوندەکانی نەغەدە، میاندواو، ڕەزاییە و مەهاباد، مەغولئاســا کەوتنە گیانی خەڵکی بێگوناح و هەژار. بە ســەدان کەسیان لە گوندەکانی ســۆفیان، ئێندرقاش، وســوکەند، ســەروکانی، سەوڵاوا، ســەرچنار و شــینئاوێ و دەیــان گوندی تری ئەم مەڵبەندە کوشــت و برینــدار و کەمئەنــدام کــرد، حاســڵ و بەروبووم و ماڵ و کاشــانە و تەنانەت مزگەوتەکانیان ســووتاندن و دەســتدرێژیان کردە سەر کچان و ژنان، بە ناوی ئیســلامەوە جیهادیان ڕاگەیاند و ســەدان لاوی کچ و

کـوڕ بەبـێ دادگا و پارێزەر، لە ماوەی کەمتـر لە چەند خولەکدا حوکم دران و ئیعدام کران.

### تفەنگی لوولەشۆڕ

ڕۆژی سێزدەی خەزەڵوەری ١٣٥٩ (٤-١١-١٩٨٠) لەگەڵ دەستەیەک لـە پێشـمەرگەکانی کۆمەڵە و چەندی حیزبی دێموکـرات دوای ئەوەی ئاگادار کراین لە کارەساتی ئیندرقاش و وسوکەند، ویستمان بچینە ناو دێ و شـەڕ بکەیـن، خەڵک داوایان کرد نەچین بـا لەوە خراپتر نەکەن، هەرچەنـد هەمـوو ڕێگەکانیان هەر لە سـەری بەیانییـەوە گرتبوو، بۆ لای ئێـوارە چووینـە ناو دێ و بەر مزگەوت، هەرگیز بیرم ناچێ دار و بەرد و تەنانەت میچی بەرزی مزگەوتی ئیندرقاشیش خوێن بوو، چەندماڵیان سـووتاندبوو، زیاتر لـە پەنجا کەس کـوژراو و مەیتەکانیان لە نـاو کۆڵانـی دێدا بوون، دەیان بریندار کەوتبـوون و خەڵکێکی زۆریان لەگەڵ خۆدا بردبوو. ئەوان دەیانویسـت کێشەی کورد و ئازەری قووڵ بکەنەوە و هیچ کوردێک شەو بە ئاسوودەیی سەر نەنێتە سەر سەرین، لە بەرچاوی دایک، کچێکی لاویان بە چەند پاسدار لاقە کردبوو. ئێوارەی سـێزدەی مانگ لە ئیندرقاش بۆ من و هاوڕێکانم ئەو ڕۆژە ڕەشـە بوو بە چاوی خۆمان دیمان، لەجیاتی باران خوێن باریبوو. لە ناو مزگەوت و بـە بەرچـاوی خوداوە بە تەور ژنانیان پارچـە پارچە کردبوو، ماڵی خـودای بـە فەرش و دیوار و سـەقفەوە بە جێی قوڕ، خوێنی وەسـەر خۆی کردبوو. دەبێ چ هەسـت و کارەسـاتێک بێ پێشـمەرگەی پڵینگی هەردی وڵات، بەم چەشـنە دۆش دامابێ و بە بەرچاویەوە، کوشـتن و سـووتان، وێرانی و ئەتک بەم خەڵکە بکرێت، کە ئەو لەپێناویاندا چەکی هەڵگرتووە. ئێمە، هەموو ئەو پێشـمەرگانەی بە دێموکرات و کۆمەڵەوە، ئەم دوانیوەڕۆیە گەیشتینە ئیندرقاش، هەر ئەوەمان لەدەست هات وەک خەڵـک و پیرەپیاوەکان ئەژنۆمان لەناو دەسـتانمان بگرین و بە ڕیز لە بەر سـێبەری گوێسـەبانی مزگەوت بە لارەملی و هەناسـەی سارد و

تفەنگی لوولەشــۆڕ، ڕوو لە خۆری ســەرمابردووی ئــەم ئێوارە پاییزە شوومە بکەین.

چەنـد ڕۆژ دواتــر و لە هەڤدەی خەزەڵوەردا، بەســیج و پاســداری ئاخوند حەســەنی، هێرشێکی وەحشییانە و دوور لە مرۆڤایەتی دەکەنە سەر گوندی سۆفیان لە ناوچەی شنۆ و لە چەند چرکەدا سێزدە کەس بــە تــەور و چەقــۆ دڕندانە دەکوژن و زیاتر لە بیســت کــەس بریندار دەکەن. ڕەشــبگیری و قەتلوعامی خەڵکــی گوندەکان و ئیعدام و گرتنی لاوان لــە شــارەکان یەک بــەدوای یەکــدا و دوای ماوەیەکی کورت لە گرتنەوەی شــارەکان، سیاسەتێکی شوم و پڕ لە ترس و تۆقینی خەڵک بوو بۆ وێناکردنی دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی و تەسلیمبوونی خەڵکی ئازادیخوازی کوردستان. بەداخەوە لە پیادەکردنی ئەم سیاسەتەدا چریکە فیداییەکانی ئەکســەرییەت و حیزبی تودە، ئەوەی توانییان لە هاوکاری و کەشــف و ئاشــکراکردنی ئەنــدام و لایەنگرانی هێــزە کوردییەکان و کەسوکاری پێشمەرگە نە تەنیا درێخییان نەکرد، بەڵکو بە تیۆریزەکردن و نووســینی وتار، ئاوی پاکیان بە ســەر دەســتی مەلاکانــدا دەکرد و بــە بیانــووی شــەڕی «میهەنــی» و بەرگری لە نیشــتمان، لە شــەڕی ئێران-عێراقــدا شــەرعییەتیان دەدا بــە خوێنخۆری و لێــدان لە کوردە ئازادیخوازەکان. ئەوان لەبەر ڕۆشــنایی سیاســەتی کرەملین، کە بۆیان نوســخە[1] دەکــرا، چوونە پاڵ سیاســەت و بەرنامــەی کاری دەوڵەتی ئیسلامی و لە بیر خۆیان بردەوە، وەک ڕێکخراوگەلی چەپ و مارکسی، دەبوو بەرگری لە مافی میللەتان، ژنان، ئازادیی ڕادەربڕین، جیایی دین لــە دەوڵەت، ئازادیی ئەحزاب و هەموو ئەو چەمکگەلەی ســەردەمانێک بانگەشە و بەرنامەی حیزبەکەیانیان لەسەر دانابوو، بکەن.

---

١- نوسخە، نوسخە نووسین، ڕاچێتەنووسین، مەبەست لێرەدا فەرمانپێدان و لە سەرەوەڕا ئەمرپێکردنە.

## ڕوخساری تودەیی و چریک

ئێمــە، پێشــمەرگەکانی کۆمەڵــە لــە دوو هەنــگاوی شــار بووین و تینی هەناســەی گەرمی پێشــمەرگانەمان دەگەیشــتە خەڵکی ناوشار و ڕۆژانــە ئەم تینە، ڕوخســاری ئەنــدام و لایەنگرانی چریــک و تودەیی هەڵدەقرچاند. ئەوان زیاتر لە حکومەت دژایەتیی پێشمەرگە و بنەماڵەی کۆمەڵەیــان دەکــرد و دەتوانــم بڵێم بەتایبەتتــر لە شــارەکانی دی، لە مەهابــاد زۆر قینلەدڵتــر بوون. تەنانەت بێشــەرمییان گەیاندە ئاســتی خیانەت بۆ ڕاپۆرتدان لە جیران و کەســوکاری پێشــمەرگە و چالاکانی ناوشار. تودەیی و چریک بە ڕۆژی ڕووناک لەگەڵ پاسدار و ئیتلاعاتدا دەگــەڕان بــەدوای هــاوڕێ و خزمــی خۆیاندا، یــان بە پــۆل لەجیاتی ئــەوەی بێن بــۆ پێشــمەرگایەتی، دەچوون بۆ بەرەی شــەڕی ئێران و عێراق بۆ باشــووری ئێران و دەیانگوت، خەباتی دژی ئیمپریالیستی بە ســەرۆکایەتیی خومەینــی لە ئەمڕۆدا لە هەموو ئەرکێکی دی لەپێشــتر و بەحەقتــرە! خــۆش ئەوەیە لە ئەمــڕۆدا زۆربەی ئــەم کارەکتەرانەی ئەو ســەردەم کە دەیانگوت ناسیۆنالیزم و خەباتی پێشمەرگە چەواشە و دواکەوتوانەیــە و دەبــێ فریــای نەجاتی ئێران بکەویــن لەژێر ئالای ئیسلامدا، زۆربەیان کە بۆ ئێمە ناسراو و تەنانەت سەردەمانێک هاوڕێ و خــزم بوون، ئەمڕۆکە لــە هەموو کەس کوردترن و لەژێر جامەدانیی بنەماڵــەی بارزانیــدا کوردایەتییەکی زۆر «خەســت» دەکەن و ئەمجار بارزانــی بــە باوکی کورد و ئالاهەڵگــری کوردایەتی دەزانن. لە پشــت چەمکــی کوردایەتــی و «دەوڵەتــی کوردی»ی بارزانــی، تەنیا بۆ ئەوە خۆیان شاردووەتەوە کە پیسی و بۆگەنیی ئاکار و خیانەتی ڕابردوویان بشــۆنەوە. بارزانییــش بەوپەڕی لێزانی و ئاگایــی وەک چۆن بە عەتف و ڕاکێشــانی موستەشار و جاشەکانی کوردستان لە ڕاپەڕینی ١٩٩١دا توانیــی بــە دەیان قەزوانی هێزگەلی شۆڕشــگێڕ و فیداکاری باشــوور بــە خواردنی گوێزێــک بگرێتەوە و هەموو خیانــەت و هاوکاریی خۆی لەگەڵ شای ئێران و سەدامدا بشواتەوە و لە یەکەم هەڵبژاردنی خەڵکی

باشـووردا زیاتر لە سـەتا پەنجای دەنگەکان بەدەست بێنێت، ئێستاش خەریکە بۆ خزمەت بەم سیاسـەتە چەواشـەکارانەی، باشـترین کەڵک لـەم خەڵکە دۆڕاو و خۆپیسـکردووی دوێنێی ڕۆژهـەڵات و بە تایبەت دەڤەری موکریان وەربگرێت، کە ئێمە لە هەموو کەس باشـتر ڕابردوو و ئێستای مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتییان دەزانین.

# ٢٧

## مەترسیی ناو شار

پێشـتر گوتـم، نەرمین بە هۆی ناسـراوی و کچبوونـی، هاتبوو بۆ شـاخ، بـەڵام هەبـاس وەک یەک لە ڕێکخەرانی ڕێکخسـتنەکانی شـار و خوێنـدکاران ژیانـی ژێرزەمینیی هەبوو، یەک لە هـەرە چالاکەکانی کۆمەڵە بوو لە ناوشـار و لە نزیکەوە لەگەڵ شەهید ئەحمەد شەعبانیدا بەرپرسی ناوشـاری مەهاباد، یارمەتیی زۆری پێشمەرگە و تەنزیماتی پێشـمەرگەی ناوشـار و لایەنگرانـی کۆمەڵەیان دەکرد. ئەو سـەردەم ئیتلاعاتی سـوپای پاسداران ئاشـنایی و زانیاریی لەسەر خەڵکی کورد و کادرە سیاسـییەکان نەبـوو، نەیاندەزانـی کـێ چ دەکا و ڕابردووی سیاسـی ئەنـدام و چالاکەکانیـان نەدەزانـی، مەگەر یارمەتـی درابان. جاشـی عەشـایر و نەخوێندەوار زۆرتر کاریان بە شـەڕ و پێشمەرگە بوو، ئەوەی لە باری سیاسی یارمەتیدەری لە قاودانی کادر و ئەندامانی هێزگەلی کوردی بوون، تەنیا ئەندام و لایەنگری ڕێکخستنەکانی چریک و تـودە بوون. هەباس لە کاتی مەدرەسـەدا چەند هـاوڕێ و هاوپۆلی هەبوون، هاتوچۆی ماڵەوەیان دەکرد و هەموومانیان دەناسـی. هەباس بووبـوو بـە کۆمەڵە و ئـەوان بە چریـک و تودەیی. هـەر بۆیە ژیانی هەباس لە ناوشـار لەوپەڕی مەترسـی و ئاشکرابووندا بوو. چەند جار دایکم هات و هاواری کرد هەباس دەگیرێ و دەیکوژن، زۆرمان حەول دا بێتە دەر بە عیشقی ئەحمەد شەعبانی، کە خەڵکی سنە بوو، هەرچەند موهەندیس بوو، بەڵام وەک کرێکارێک بۆ شوێنونکردن فەعلەیی دەکرد، هەباس دڵی نەدەهات لە ناوشار بەجێی بێڵێ و خۆی بێتە دەر.

ئێسـتاش نەمزانی بۆ، ئـەوکات کۆمەڵە بە تایبەت بۆ شـاری وەک سابڵاغ، کادری سنەیی بۆ ڕێکخراوی ژنان و بەرپرسی یەکەمی کۆمەڵە

دەنارد، ئەوان لە سـنەوە دەهاتن بۆ مەهابـاد و وەک نانکەر و کرێکار و... کاریان بە زاهیر دەکرد، بەڵام بەرپرسـی کۆمەڵە بوون. خۆ ڕەنگە بڵێن کچ و کوڕی سنەیی لە مەهاباد نەناسراون و درەنگ ئاشکرا دەبن، بەڵام نەمدیت کوڕ یان کچێکی سابڵاغی ببەن بۆ سنە و مەسئوولییەتی شـارێکی وەک سـنەی پێ بسـپێرن. من ئەوە بە بەشـێک لە نائاگایی و ناوچەگەرایـی، یـان عەشـیرەیی مۆدێـرن لێک دەدەمـەوە، کە لەناو کۆمەڵەدا فرە بوو!

ئەحمەد شـەعبانیم لە نزیکەوە دەناسی و براکەشی شەهید حەسەن هەر ئاشـنام بوو. ئەحمەد، خەڵکی سـنە بوو، زانکۆی لە موهەندیسـی کەشـاوەرزی تەواو کردبوو، کادرێکی بەتوانا و فیداکاری کۆمەڵە، زۆر خاکـی و بێفیـز، شـارەزا و بوێـر و میهرەبان و خۆمانی بـوو، دوای گرتنەوەی سـابڵاغ بە دەستی پاسـداران، ئەحمەد کرابوو بە بەرپرسی ناوشـاری کۆمەڵـە و ژیانی نهێنیـی هەبوو. ئەحمـەد زۆری یارمەتیی ئێمە وەک پێشـمەرگە دەدا بۆ هاتنەوە و چالاکیی ناوشارمان، هەباسی برام زۆرتر لە پەیوەندیی ئەو و کورگەلی چالاکی مەدرەسـەکاندا بوو. هێزێکی چەکداری ناوشاریشـیان دروسـت کردبوو، کوڕی لاوی زۆر ئـازا و دڵسـۆزی وەک شـەهیدان خـدر محەمەدی و هـەژار کەریمی و...یـان تێـدا بوو. هەموو جارێک کە شـەوانە مەفرەزەمـان دەکرد بۆ ناوشـار و لێدان لە بنکەکانی پاسدار، ئەم کوڕانە بەرەوپیرمان دەهاتن و چاوساغمان بوون.

ڕۆژی دەی بەفرانباری ١٣٥٩ (١٩٨٠/١٢/٣٠) دوو ڕۆژ پێش سـاڵی تازە، ئەحمەد و هەباس لە کۆڵانێکی ناو شاری مەهاباددا دەناسرێنەوە و بـە کۆڵان و باناندا ڕەپێیـان دەنێن، دوای ڕاکەڕاکییەکی زۆر هەباس لە ماڵێک پەنای دەدەن و دەیشارنەوە، ئەحمە دەگیرێت، دوای سێ ڕۆژ ئەشـکەنجە و داغکـردن سـەرەنجام ڕۆژی ١٣٥٩/١٠/١٣ (١٩٨١/١/٣) شەهیدی دەکەن.

داکـم و بابـم دوای شـەڕ و وێرانبوونـی ماڵەکەمـان لـە ڕێگـەی

مەحموودکان باکووری شــار، لە ماڵێکی کرێـدا دەبن. چەند جار دایکم خالیـدی هاوڕێی مەدرەســەی هەباس دەبینێ لــە دەوری ماڵمان دێ و دەچێ، خالید بە بنەماڵە بووبوونە تودەیی، هەباس پێدەزانێت و تێدەگات چاودێریی دەکەن بیگرن، ئیتر دوای شەهیدبوونی ئەحمەد، هەباس هاتە دەر و بوو بە پێشمەرگە.

گرتن و شــەهیدکردنی بەرپرســی یەکەمی کۆمەڵە و کارەساتەکانی ئەم دوایانەی گوند و ئیعدامەکانی ناوچەی سابڵاغ، پێویستی بە تۆڵە و لێدانی زەبرێکی پێشــمەرگانە بوو لە کۆماری ئیسلامی. کۆمەڵە بڕیاری دا بە ئەنجامدانی دە چالاکی لە ناوچەی سابڵاغ.

## گوللەی وێڵ

دوانیوەڕۆی یەکەم ڕۆژی مانگی ڕێبەندان لە زگدڕاو بووم و سەید هات، گوتی وەرە بچین بۆ کۆنەدێ و ســەردانی پێشــمەرگەکان بکەین، زۆرم پــێ خۆش بــوو. هەردەم ئامــادە بووم بە تایبەت بۆ ســەردانی ســولەیمان. لە ڕێگە گوتی، لەگەڵیاندا بچووەوە شــار و بزانن لە تۆڵەی شەهید ئەحمەد چالاکییەکی چاک بکەن. چووینە کۆنەدێ و نزیک بە دە پانزە پێشــمەرگە ساز بووین بەرەو لاچین و سەیداوا. بە پێیان خۆمان گەیاندە سێئاشــان ماڵی خوشک و خزمانی سولەیمان، مەفرەزەی شار هاتن و باســی دۆخی ناوشار و هێزی پاســدار و چەکدارەکانیان کرد. وا دیــار بــوو حکومەت لەو گەڕەکانەی وەک سێئاشــان و ئاشــی مام ئەحمەد، یەرغو و باخی سیسە بە ڕۆژ هیچ دەسەڵاتیان نییە. بڕیارمان دا نەچینە دەر و شــەو بمێنینەوە و بەیانی بە ڕۆژ هەڵسەنگاندن بکەین بــۆ لێدانێکــی گورج و بەزەبر. حوســێن عەجەم بەرپرســی هەســتەی نیزامی شار بوو، دەموچاوی دادەپۆشی و لەگەڵماندا لە هاتوچۆدا بوو. پێشــنیاری کــرد دوو دەســتەی تریش لە دەرەوەڕا بێــن و پلانی لێدان لە بنکەی پاســداران، لە دوخانیاتی مەهاباد داڕێژین. بۆ بەیانی بوو بە دووی ڕێبەنــدان، بەم بۆنە پیرۆزەوە وەک یادی کۆماری کوردســتان،

له زۆربەی گەڕەکەکانی ناوشـــار دەســـتمان بە جەولە کرد و قســـەمان بۆ خەڵک کرد، شیرینی خورا و ئاگر لەسەر شوێنە بەرزەکان بۆ یادی کۆمار هەڵکرا. خەڵک دەســـتە دەســـتە دەهاتن و بەخێرهاتنیان دەکردین و زۆر کەس وایان دانابوو ئیتر پێشمەرگە شاری گرتووەتەوە، سروود و هەڵپەرکـێ بە دەوری ئاوردا، پێشـــمەرگە و خەڵکی هێنابووە جۆش، حەماســـەتێکی تەواو خەڵک و پێشـــمەرگە و هەموو شاری گرتبووەوە. هەمـــوو ڕۆژەکـــە، نـــە تەنیا بە دیداری خزم و دۆســـت شـــاد بووین و خواردنی زۆر باشـــمان خوارد، بگرە زۆربەی پێشمەرگەکان حەمامیان کرد و جلیان گۆڕی. نامە ڕۆیشتبوو بۆ دەرەوە پێشمەرگەی دیمان بۆ بنێرن، ڕۆژی دواتر دیســـان هاتینەوە ســـەر زارکـــی کوڵان و جادەکان و تـــا مەیدانـــی حەیوانان و نزیک گومبەزان و لاشـــانی پادگان چووین، بەفرێکی قورس و درشت دەباری، جادە و بانەکان هەمووی پڕ لە بەفر بوون، خەڵک لە ســـەربانان بانیان دەماڵی. ئێوارە دۆست و هاوڕێیەکی کۆنی کۆمەڵەمان کاک جەعفەری مرادی، خەیات بوو لە گوزەری شار، لە ســـەربان بەفری ماڵیبوو، فیشەکی وێڵ پێکابووی و شەهید بووبوو. مەرگی کاک جەعفەر بۆ هەموومان و بە تایبەت سولەیمان، کە هاوڕێی نزیکـــی بوو، هەواڵێکی دڵتەزێـــن بوو. چەند کەس چووین و لە نزیکەوە لـــە لای مەیدانی حەیوانان بەشـــداری خـــەم و پەژارەیان بووین. تەقەی کوێرانە لەناو شار و هاوەن و قەناسە بووبووە کاری ڕۆژانەی سوپای پاســـداران لە زۆربەی شارەکان و کەس خۆی بە بەرپرسی ئەم جۆرە لە کوشتار و خوێنڕژاندنە نەدەزانی.

### زۆرانبازی لەگەڵ پاسداردا

ڕۆژێکـــی دیکەیـــش لە شـــار ماینـــەوە، پێشـــمەرگەکان و ئەوانەی شـــاریش بە دەموچاو داپۆشـــراوی هەموو لە دەوروبـــەری دوخانیات و مەیدانی چوارچرا، مزگەوتی ســـوور و نێو گوزەر[1] و بازاڕی شـــار

١- گوزەر، ڕاســـتەبازاڕی سەرداپۆشـــراو، قەیســـەریی ناوشار، گوزەری

پەنایـان گرتبوو، مەبەسـتی ئێمـە چاودێریی تەواو و هەڵسـەنگاندنی دۆخی پاسـدارەکانی نـاو دوخانیات بوو، تاکو پێشـمەرگەکانی دی لە دەرەوەڕا دێـن بۆ یارمەتی، ئەوجار بـە زانیاریی تەواو لێی دەین و بە تـەواوی بیگرین. حوسـێن عەجەم گوتی، دەگیرێ و بە گرتنیشـی هیچ بنکەیەکیان لەناو شـاردا نامێنێت، ئێمەش هەموو ڕامان وا بوو، جارێ هیچ نەکەین تا هێزمان زیاد دەکات. دوانیوەڕۆ من لە هاتوچۆی نێوان گەڕەکی جوولەکان و نێوبازاڕ و سێ ڕای فەرەح و مزگەوتی سووردا بووم، سـولەیمان لـە دەوروبەری مزگەوتی سـوور و قوڵکەی کەران سەرپەرشـتیی دەکرد، عەلی موهاجیـری زۆر تووڕە بوو دەیگوت، ئار پی جی-تان داوە بە من. لە حەوشـەی مزگەوتی سـوور ئامادە بوو لە ئەگەری هاتنەدەری دەبابە، سەعید سەرهەنگی، حەمە بازۆکا، سولەیمان حەوتەوانە، سـەعید گەوهەری، مستەفا (شینە) شێخ محەمەدی، مەناف بەدیعی، سـاڵە قۆیتەل و مەحمـوود کەرکوژ و زۆری دی بوون، لەناو کۆڵانەکانـی دەوری چوارچـرا هەمـوو لـە سـەنگەردا بـوون. هەموو پێشمەرگەکان نانیان خواردبوو، لەگەڵ سولەیماندا دۆستێکی هەبوو لە خوار سـەنگەکخانەکەی گەڕەکی مزگەوتی سـوور، لە بەیانییەوە چەند جاریـان بانگهێشـت کردبوو، چووین سـەریان لێ بدەیـن و لەگەڵیاندا نـان بخۆین. لەبەر هەیوانەکە خەریکی نانخـواردن بووین، دەنگی تەقە بەرز بووەوە، ڕامان کردە دەرەوە، سـولەیمان بەرەو مزگەوتی سوور و مـن بەرەو سـێڕای فەرەح، لە زارکی کۆڵانی مزگەوت و سـێڕا، دیم لـە چوارچـراوە تەقە دەکرێت و هاتوچۆی ئەوبەر و ئەمبەری سـێڕای سـەخت کردبوو. پێشـمەرگەکانی سـەری کۆڵان گوتیـان، تۆیۆتایەک هاتووە و ڕای نەگرتووە، پێشـمەرگەکانی دەوری چوارچرا لێیان داوە و ئێستا ئەوە ئەوانن تەقەی دەکەن. هەر جۆرێک بوو پەڕیمەوە بۆ لای

---

سابڵاغ بازاڕێکی کۆن و ئاوەدان و زۆر خۆش بوو، لە ساڵەکانی بیدایەتی ١٩٧٠دا بە ڕووداوی ئاگرکەوتنەوە هەمووی سـووتا، زەمانی شـا دیسان دروستیان کردەوە.

مەیدانی ئارد و لەویشەوە بە کۆلانەکاندا خۆم گەیاندە پشتی بانکی سپە و کۆلانی دوکانی کاسێتفرۆشی کەریمی چیرە، لەوێرا هەموو شت دیار و ئاشکرا بوو، مێکزەمینییەکی دۆشکەلەسەر و چەند پاسداری کۆماندۆ لە پادگانەوە بە خیابانی شێرەخورشیددا دێنە خوار بۆ ئەوەی بێنە ناو شـــار و چوارچرا، پێشمەرگەکانی سەرکۆلانی حەمامی بللور و دەوری چوارچرا تەقەیان لێ دەکەن، شۆفێری مێکزەمینی لێی دەدرێ و پیکاب لــە جۆگەی بەردەم مەیخانەکەی شـمۆیلی دەکەوێت، پاســداری ســەر پیکاب بڵاو دەبنەوە و ڕووبەڕووی تەقەی پێشـــمەرگەکانی چوارچرا و ئەم کۆلانە دەبنەوە. من کە گەیشتم بۆ زارکی کۆلان و سەر خیابانەکە تەقــە زۆر گەرم بوو، حوســێن عەجەم وەک بەرپرســی پێشـــمەرگەی ناوشـــار خۆی گەیاندە ســـەری کۆلانەکە و لای من و دوو پێشمەرگەی دی کە هەر لەوێ بوون. لە بن پیکاب و پایەی دوکانەکانی ئەوبەر چەند پاســدار بە خەستی تەقەیان دەکرد، ئێمەش نیازمان بوو بچین پیکاب و دۆشـــکەکە بێنین بۆ ناو کۆلانەکان، بۆ چرکەیـــەک دەرفەتیان نەدەدا و وەک ڕێژنەباران فیشەک دەهاتودەچوو، تاوێک خۆشی کرد، پاسدارێک وێڵ و حەپەساو لە بن پایەی دوکانی کەریم خومایزی وەک گێژوکاسان وەدەرکەوت، حوسێن عەجەم کە کوردی و تورکی وەک یەک دەزانێت، بە تورکی بانگی کرد و گوتی، ئەوە منیش دەچمەوە بۆ دوخانیات و ڕێم نییە وەرە بۆ لای من با بەیەکەوە بڕۆینەوە. بە تورکی دوو سێ جنێوی خەســتی بە کورد و پێشمەرگە دا، پاسدارەی بەم تورکییە بێ لەهجەیە وەشک خست و گومانی لا پەیدا بوو، باوەڕی پێ بکات، دیسان حوسێن بــە تورکــی گوتی، وەرە مەترســـە ئـــەم کۆلانە دەچێتـــەوە ڕێک بۆ ناو دوخانیات، باوەڕی پێ کرد و وردەوردە بە ناوەڕاستی جادەکەدا بەرەو حوسێن و ئێمە و ئەم کۆلانەی ئێمەی تێدا بووین، هات. نزیک حوسێن بووەوە، لە سووچی بن دەرگایەک ئێمە خۆمان نەدیو کردبوو، حوسێن نیـــازی بوو بـــە زیندوویی بیگرێت و تەقەی لێ نەکات. لەناکاو پاســـدار نازانـــم چیی دی و دەســـتی بۆ تفەنگەکەی برد تەقە لە حوســێن بکات،

حوســێن زانیی زوو نەجووڵێت پاسدارەکە دەیکوژێت، تفەنگی هەڵێنا و بەرامبەر سینگی پاسدار چرکاندی، فیشەک دەرنەچوو، فریا نەدەکەوت میـل بێنێتەوە و دیســان تەقەی لێ بکاتەوە، تفەنگی پاسـدارەکە ئامادە بـوو، ئەوەی چاوەڕێ نەدەکرا لەم یەک دوو چرکەدا ڕوو بدات ڕووی دا. حوسێن تفەنگی شانی فڕێ دا و ئامبازی پاسدارەکە بوو، لە عەرزی دا و گەوزانـدی، وەبن خۆی دا و دەیویســت تفەنگەکەی لێ وەرگرێت. ئێمــە نەدەکرا تەقــە بکەین بەر حوســێن دەکــەوت، دوای چەند چرکە تەقە بەرز بووەوە و پاســدار پەنجەی بە ســەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی داگرتبوو، یەک ڕیزی لە بنەوەڕا کرد و حوســێن بە لاتەنیشــتدا کەوت. پاسدار لەسەر عەرز بوو، مەجال ڕەخسا تەقەی لێ بکەین.

حوســێن چوار فیشــەکی بە ڕان و باســک و زگی کەوتبوو، بە پەلە لاقمان ڕاکێشــا و هێنامانە ناو کۆڵانەکە، هەموو ئەمانە لە یەک تا دوو مەتــری و لــە بەرچاومان ڕووی دەدا. پاســدار و تفەنگەکەی لە ســەر شۆســتەی بەر دوکانی کەریم، بەبێ گیانی کەوتبوون. بە پەلە ســەعید گەوهەری و یەک دوو پێشــمەرگەی دی حوســێنیان بــەرەو مزگەوتی حاجــی ئەحمەد برد. لە هەمان کاتدا، ســاڵە قۆیتەڵ دەســتی لەســەری کــۆلان هێنابــوو دەر و فیشــەکێک لە لەپی دەســتی درابوو، لە پشــتی دەســتی هاتبووە دەر. کچێکی دە دوازدە ســاڵان فیشەکی وێڵی دۆشکە کەلەکەی کوناودیو کردبوو. مزگەوتی حاجی ئەحمەدمان وەک شــوێنی پشــتی جەبهــە بەکار دێنا و هەمــوو برینداری خۆمــان و خەڵک لەوێ بوون، کچێکی جاســووس پێیــان دەگوتن، «خواهــر زەینب» گیرابوو، ئەویشمان هەر لەوێ دەستبەسەر کردبوو.

### کوڕانی وێڵ و سەرگەردان

مێکزەمینــی بــە دۆشــکەوە لە جۆگە کەوتبوو، لاشــەی پاســدار و تفەنــگ هــەر وا لە ســەر عەرز بــوون، چەند جار حــەول درا پیکاب و دۆشــکەکە بێنین، بە تەقــە مەجالیان نەدەدا، یــەک دوویەک لە کوڕانی

شــار هەر لە ڕۆژی یەکەمی هاتنەوەمان بۆ شــار لە دەورمان بوون و وەک پێشــمەرگە وا بــوون، یەک لەوان یونس بــرای عەلی موهاجیری دواتــر لــە زیندانی ڕەزاییە ئیعدام کرا، شــاتر ڕەحمــان، عەبووی برای ســولەیمان بللوری، تەواوی ئەو ماوەیە وەک قاسد و گەیاندنی هەواڵی کۆڵانەکان و جەبهەکان لە هیچ نەدەپرینگانەوە و بە ڕاکردن و پەڕینەوە لە جادەکان بۆ خزمەت بە ئێمە، یارییان بە گیانی خۆیان دەکرد. ناوشار ئــەوکات، کوڕانی وێڵ و ســەرگەردان و موعتادی تێدا بوو، برســی و هەژار، بەبێ ماڵ و پارە، هەموو شتێکیان دەکرد بۆ بەدەستهێنانی یەک مســقاڵ دەرمانی بێهۆشــی و هێرۆین. مزگەوتی ســوورمان پڕ لەوانە کردبوو، عەلی موهاجیری کە بەرپرســی ئار پی جی بوو، لە حەوشەی مزگەوت هەموویانی گرتبوو، لە ترســی گەیاندنی زانیاری لەسەر ئێمە بۆ پاسدارەکان. لەناکاو یەکیان پەیدا بوو، بە زمانی تریاکخۆران گوتی:

- کاکە بچم تفەنگی ئەو پاسدارە کوژراوەت بۆ بێنم؟

- دەکوژرێی و ئەرزشی نییە، شەو کە داهات دەیانهێنین.

- برا ناکوژرێم، ئیجازە بدە دەچم.

- (لــە دڵــی خۆمدا گوتم، بــا ئەوانەش خزمەتێکی کــورد بکەن، خۆ بشکوژرێت لە کۆڵ بنەماڵە و کۆمەڵگە دەبێتەوە). بڕۆ بیهێنە، بەس وریا بە و پەلە بکە لێت نەدەن!

- دەچم. تفەنگەکە بۆ تۆ، گیرفانی بۆ من.

- پێکەنیم و گوتم جا وەرە بەم حاڵەوە تووشی چ بووین. باشە چیی تێدا بوو بۆ خۆت!

- بــە چاوتروکانێــک قەڵەمبازێکی دا و تفەنگ و ڕەختی لە پاســدار کردەوە و هێنای!

- ئەوجار با بچم بزانم چیی بۆ من پێیە؟!

دیســان چوو لە ســەری هەڵنیشــت و گیرفان بە گیرفان و تەنانەت ئەوانــەی ژێرەوەشــی گــەڕا، منیــش ئەوە ســەیری دەکەم، هەســتا و هەنگاوێــک دوور کەوتــەوە و بە هەموو هێزی خۆی شــەقێکی لێ دا و

گوتی:

-خۆ سەگباب لە من سواڵکەرترە، قرانێکی پێ نییە!

هاتم بچم بۆ لای بریندارەکان لە مزگەوت، لەوبەری سێرای مەیدانی ئاردی لە کووچەی مزگەوتی سوور، عەبوو هاواری کرد عەلی؛ کاکم ئەتۆی دەوێت!

پەڕیمەوە بۆ لای عەبوو و پرسیم چ باسە؟ سولەیمان دەزانێت چمان بەسەرهات و حوسێن بریندارە؟! گوتی، چووم پێی بڵێم مەجالی قسەی پێ نەدام و گوتی برۆ عەلی بێنە. بەرەو مزگەوت و لەوێشرا بەرەو قوڵکەی کەران و کۆلانی حەمامە کۆنەکەی بللور چووین. زارکی کۆلان لەسەر مەیدانی چوارچرا سەعید و حەمە بازوکا و سولەیمان حەوتەوانەی لێ بوو، گوتیان ئێمە لە دۆشکەکەمان دا. دوو مەتر بەرز بانێکی بچووکی حەمامەکەی لێ بوو، نازانم پێم وا بوو بانی مۆتۆرخانە و شتی وا بێت، عەبوو و حەمە سەریان خستم و خۆم گەیاندە سەربانەکە، پانایی تەنیا دوو مەترێک دەبوو.

### سولەیمان نەبوو، تابلۆیەک نەخشابوو

ورووژمی پوولەکەبەفرینەکان، لە نزیکبوونەوەیان بۆ عەردەکە، بە چەشنی تاڤگەیەکی خوڕێن بوو. کلووبەفرەکان بە توند و قایمی چنگیان بە عەرزدا دەگرت، وەک ئەوەی بە نیازی مانەوەی هەتاهەتایی بن. بەفرێکی تەڕ و سپی، هەموو چوارچرا و بانەکەی داگرتبوو، کاپشێنێکی خز و کڵاوێکی ڕووسی، سولەیمانیان لەبەر گرتبوو، لە نێو دەریای پوولەکە سپییەکان لە پشت لێواری بانەکە مەتەرێزی گرتبوو، بە درێژایی بانەکە لەسەر زگ تخێل بوو، سەری لەسەر لێوار و نیشانەی تفەنگی ڕوو بە چوارچرا، خرمژنی بۆ تاقە چرکەیەک بێدەنگ نەدەبوو.

- ها! سولی چییەوە؟!

- کوڕە کوێرە نابینی؟! وەرە پێش و فریا کەوە، جەحەننەمم دروست کردووە! سەتم تۆپاندووە!

منیش خۆم خزانده سـەر لێواری بانەکە و شانبەشـانی سـولەیمان خۆم لە ئامێزی بەفرەکە هاویشـت، سـەرم هەڵێنا و ڕوانیمە چوارچرا، چیـم بینـی؟! بە دەیان کەلاک لەنـاو فولکەکە و دەوروبـەری پایەکانی شـارەداری و ناو خیابانەکە کەوتبوون. سـولەیمان یەک بەدوای یەکدا مەخزەنی دەگۆڕی و خرمژنی سـیخۆکەی هەوای سـەرچۆپیی هەبوو، لەپڕ بینیم چەند فیشـەک لە سـەرەوەڕا لە دەوروبەرمان کەوت، سەرم هەڵێنا چەند پاسـدار هاتبوون و چووبوونە سـەر باڵکۆنی فەرمانداری و تەقەیان لە ئێمە دەکرد. پێشتر پاسدارەکان بە جادەی شێرەخورشید بـە بندیوارانـدا دەهاتنـە نێو چوارچـرا، دیار بوو چەنـد دانەیەکیان بە دوخانیات و بە پشـتەوەدا هاتبوونە سـەر باڵکۆنی فەرمانداری. دەنگی تەقـەی خۆمـان و دیتنی خوێن و کەلاک، هەردووکمانی سـەرخۆش و مەسـتی مەسـت کردبوو. تفەنگم وەستا و زانیم دەبێ مەخزەن بگۆڕم، دەستم بۆ کەلەکەی ڕاستم برد و زانیم هەموویان بەتاڵن، بە پەلە ئاوڕم داوە و دەسـتم بـۆ مەخزەنەکانی لای چەپم برد، هەسـتم کرد تفەنگی مـن کە بێدەنگە، ئیی سـولەیمانیش دەنگی لێوە نایـە. بە پەلە مەخزەنم گـۆڕی و ڕووو بـە فەرمانـداری و چوارچرا دیسـان بـەردەوام بووم. بەدەم تەقەکردنەوە بیرم کەوتەوە کاتی دەسـتبردنم بۆ فیشەکلۆخەکەم و گۆڕینـی مەخـزەن، شـتێکم دی، ڕێشکەوپێشـکەی چاوم بـوو؟! نا! کارەسـاتم لێ قەوماوە و نامەوێت باوەڕی پێ بکەم وەڕاسـت گەڕێت. خـۆ گێـل دەکەم و بە خەیاڵـی مۆتەکەبوونی، دڵی خـۆم خۆش دەکەم و لێـی دەگوزەرێـم. بەردەوام دەبم، یەکەڵەچن[1] پاسـدار دەبینم، زاتی ئاوڕدانـەوە و بانگکردنـم نییە، پەنجە لەسـەر پەلەپیتکەکە هەڵدەگرم و هەسـت ڕادەگـرم و گوێ قوڵاخ دەبم، نا! سـولەیمان هیـچ تەقە ناکات! شـانی هەر بە شـانمەوە بوو، زۆر بە ترس و بەکاوەخۆ ملم سـوڕاند، سـولەیمان نەبوو، تابلۆیەک نەخشـابوو لە هەزاران وشـە، ئازایەتی و داستان، شاخ و ورە، عیشق و مراز، بەڵام تەنیا دوو ڕەنگ بوو سوور

١- یەکەڵەچن، لەناوچوونی یەک بەدوای یەکدا.

و سـپی، ڕەنگەکانـی زەماوەند و بووک و زاوا. لای ڕاسـتی، قوولایی نێوان کولمە و کەپوی بە چەشنی کانییەکی زۆر بچووکی لاپاڵ چیایەک قولپێکـی زۆر مەتینی دەدا و شـۆڕ دەبووەوە ناو سـمێڵە بەهەیبەت و ڕازاوەکەی و سـوور سـووری هەڵگەڕاندبوو. لەناو ئەم دەریا حەریرە سپییەدا هەر ئەوە سوور بوو. ملی بە لای شانی چەپیدا لار بووبووەوە، تفەنگەکـەی بـە لادیواری بانەکـە و قۆڵیدا و پەنجەی شـایەتمانی لای ڕاستی، هەر لەسەر پەلەپیتکە بوو.

خۆم بیرم نەماوە، ئەوانی دیکە و عەبوی برای دەڵێن لەپڕ دیمانی بە پێوە، نەعرەتە و جنێو و نفرینت لە هەموو شار و چوارچرا دەنگی داوە و شێتانە هەر وەک ڕێژنەبارانی بەتاوی بەهاری دەتڕژاند.

هـاوارم کـرد سـولەیمان شـەهید بـوو. لەسـەر قەمسـەڵە خـزە ئەورووپییەکـەی تازە بۆی هاتبوو، خزاندم، ئێسـتاش لە بیرمە، هەر دە پەنجەی دەسـتەکانم لـە پووزەوانەکانی قایم کردبوو و ڕامدەکێشـا بۆ سەر لێواری بانەکە، ئەوجارە پاسدار بە تەواوی بە سەرماندا بالادەست بووبـوون، سـەر بالکۆنـی فەرماندارییـان گرتبـوو، هەمـوو لوولـەی تفەنگەکانیـان ڕوو بـەم بانـە بچووکە بوو، تەنیا من و سـولەیمانی لێ بووین، ئەو بەبێ گیان و منیش وەک شێتان. هاتمە سەر لێواری بانەکە و عەبوو دەگریا و هاواری دەکرد، پێم گوت کاتی گریان نییە و دواتر بە کۆ دەگریین. ها تفەنگەکەی بگرە و پشتت بێنە با بیخەمە کۆڵت.

عەبـوو بـە هـاوار و کاکە گیان کاکە گیان و پشـتم شـکا، کاک بە کۆڵەوە ڕووی لە مزگەوتی سـوور کرد. سـەیر بوو، ئاسـمان دەتگوت دەبێ هەرچی پێیەتی هەر لەو کاتەدا هەڵیڕێژێت، ئاوڕم داوە سەربانەکە هیچ شـوێنێک دیار نەبـوو، هەر دەتگوت ئەوەی ئـەم چەند چرکەیەی پێشتر ڕووی داوە هەمووی درۆ بوو. بەفری سپی وای داپۆشیبووەوە دەتگـوت تەنانـەت چۆلەکەش بەسـەریدا نەڕۆیشـتووە و چەند مانگە نەماڵدراوە. شـوێن گەوزان و سـەرچۆپی خۆم و تەرمی سـولی هەر هەمووی پڕپڕ بووبووەوە.

لە سـەربانەوە دیـم پەنجـەرەی ماڵەکانی دەوروبـەری چوارچرا، هەڵماوی بە گەرمای ژوور و سەرمای دەرەوە، دەیان دەموچاوی پێوە نووساوە و بە خۆڕ بۆ سولەیمان دەگرین. چەند خۆشە کەسانێک مابن و ئەو ڕۆژەی سـەربانی حەمامی بللور و چوارچرای شوێن سێدارەی قازییەکان و شێرانە ژیان و تۆڵەی سولەیمانانەیان لە بیر بێت.

وردەوردە هاتمە خوار و سـەنگەرم چۆل کـرد. چەند پیرەپیاوێکی گـەڕەک هاتنە دەر و ماچیان کردین، هەموو سـولەیمانیان دەناسـی و ئاهیان بۆ هەڵکێشـا. گەیشـتمە حەوشـەی مزگەوت و سولەیمان لە بن تاقی دەرگای مزگەوتی سوور داندرابوو، خەڵکیش چووبوون ماڵەوەیان لە گەڕەکی باخی سیسـە ئاگادار کردبوو. عەبوو و چەند کەسـی دیکە، سولەیمانیان بردە مزگەوتی داروغە لە نزیک ماڵی خۆیان.

گەڕامەوە سێڕای مەیدانی ئاردی و پەڕیمەوە بۆ لای بریندارەکان و پێشمەرگەکانی ئەو قۆڵە، بە کەسم نەگوت چ قەوماوە، تەنیا گوتم، دەبێ وردەوردە بڕۆینـەوە بـۆ گەڕەکی سێئاشـان و بریـندارەکان بەرین و بڕۆین. دوکتۆرێکی جوامێر لە بنەماڵەیەکی ناسراو هات و بریندارەکانی بەسەر کردەوە، زۆری ئومێد نەبوو حوسێن بژی، گوتی برینی دەستی سـاڵە هیـچ نییە و تیمـارم کردووە، کەچی سـاڵە خۆی لـێ بەعەرزدا دابووین، وەک ئەوەی هەربینا ڕۆحی دەردەچێت!

یونس موهاجیری برای عەلی گوتی، ئێوە بڕۆن من دەچم دۆشکەکە هەر دێنم.

هەمـوو بـە بریندارەکانـەوە بـەرەو گەڕەکـی مزگەوتـی داروغە پاشەکشـەمان کـرد، ئێـوارەی زسـتانە و وڵات بـەرەو تاریکـی باڵی هەڵدەکێشـا، لە زارکی مەیدانی ئاردی بە کەمین و وریایی پەڕینەوە بۆ لای کۆڵانی مزگەوتی سـوور، ئامبولانس هەمووی لە هاتوچۆدا بوون، لەسەر جادەی سێڕای مەیدانی ئارد یەکیان ڕایگرت و سەری لە دەرگا دەرهێنا، دیار بوو منی ناسـیبوو، گوتی، بەقوربانی دەسـت و تفەنگ و غیرەتتان بم، ماڵتان نەشێوێ چیتان کردووە، بە دەیان کەلاک کەوتوون

و فریای کۆکردنەوەی ناکەوین. نەخۆشخانە بە ڕادیۆی گوتووە و ئەوە بڵاوی دەکەنەوە، بەڵکو هەردوو لاتان دەست ڕاگرن و ئێمە فریای بردنەوەی بریندار و کەلاکی پاسداران بکەوین.

**سولەیمانم ڕۆ**

لە زارکی کۆلانی مزگەوتی سوور بە پێشمەرگەکانم گوت، چ قەوماوە و سولەیمان بوو بە یەکەم شەهیدی پێشمەرگەی ناوچەی مەهاباد. هەموو بۆ سولەیمان گریان و بابەڕۆیان کرد. گەیشتینە مزگەوتی دارۆغە، کاکە مینەی باوکی لە سووچێکی حەوزخانەکە، چەناگەی لەسەر ئەژنۆی دانابوو، بە کوڵ دەگریا و هەر دەیگوت پشتم شکا. لە ماڵەوەیان کەس هۆشی نەبوو، پڕ بوو لە خەڵک، تەنیا گوێت لە «سولەیمانم ڕۆ» دەبوو. هەر لە حەوشەی مزگەوت بە ئەمانەت گۆڕیان بۆ هەڵکەند و بە خاکمان سپارد.

چووین بەرەو مزگەوتی سەعدی لە گەڕەکی سێئاشان، پێشمەرگەکان وەک لەشکری شکاو هەمووی غەمبار و کەساس هەریەک لە کونجێک بوو. خەڵک دوو تابووتی قورسی مزگەوتیان لەگەڵ چەند پەتوو بۆ ئامادە کردین، دوابەدوای هەر هەنگاو و چرکەیەک، بەفر شوێن پێی پڕ دەکردەوە، حەوت هەشت پێشمەرگە ئامادە بوون بەرەو سەیداوا بڕۆین و بریندارەکان بەڕێ بکەینە بۆکان، لە ماڵی سەید لە سەیدئاوا زۆپای دار گرفەی دەهات. حوسێن و ساڵە داندران، بەفر ئامانی نەدەدا، سەرەنجام بە تراکتۆر و سواری گوێدرێژ بریندار ڕەوانەی دۆستاڵی و لەوێشرا بە سەیارە بەرەو بۆکان ڕۆیشتبوون.

«خواهر زینب» کە گیرابوو، بە شەهید مەناف بەدیعی (پێشمەرگەی کۆمەڵە، خەڵکی سابڵاغ بوو، لە ڕووداوی تەقینەوەی بۆمبی دەستی، لە ئاوایی تازەقەڵای بۆکان، لە ٣-٩-١٣٦١ بەرامبەر ٢٤-١١-١٩٨٢دا شەهید بوو) و لایەنگرێکماندا ڕەوانەی حاجیاڵیکەند کرد، هەڵبەت زۆرتر بۆ ناردنی نامە بوو بۆ کۆمیتەی ناوچە و هەواڵەکان و چ بکەین.

تا بەری بەیان لەگەڵ عەبوودا لەماڵی سەید شینمان گێڕا و دڵخۆشیی یەکمان دایەوە، دواتر عەبووم جێ هێشت و بۆ لای پێشمەرگەکان لە ماڵی کاک جەعفەر و باجە ڕەخشندە خوشکی گەورەی سولەیمان، بۆ ناو شار لە گەڕەکی سێئاشان گەڕامەوە.

چەند پێشمەرگەیەکی حیزبی دێموکرات لەناو شار پەیدا بوون و خەبەریان دا هەر دوێنێ ئەوانیش لە مەحموودکان چالاکییان کردووە و لە سەیارەی هەڵگری پوڵ و حقوقی کارمەندەکانیان داوە. چەند دانەیەکیان هاتن بۆ سەرەخۆشی لە ماڵی سولەیمان. دواینیوەڕۆ لە حاجیاڵیکەندەوە نامە هات، نووسرابوو بە گەیشتنی نامە هەر هەمووتان، تەنانەت پێشمەرگەی شاریش خۆتان بگەیەننە دێی ئۆزندەرێ و کۆبوونەوە هەیە.

دوابەدوای دەرکەوتنی ئێمە لە شار، سیامەند و مەفرەزەیەک وەک هێزی یارمەتی دەگەنە شار و دەبیسن چمان کردووە و بەرەو کوێ ڕۆیشتووین، سیامەند ئەو ڕۆژە دەمێنێتەوە و دەچێت بۆ لای دایک و باوکی سولەیمان، یونس موهاجیری شەوی پێش، دوای ناشتنی سولەیمان چووبوو دۆشکەی لە تۆیۆتا کردبووەوە و هێنابووی.

### نامەیەکی پڕ لە لۆمە

ڕۆژی دواتر هەر هەموومان لە ئۆزندەرێ بە بەشداریی زۆربەی بەرپرسان و پێشمەرگەکانی ناوچەی مەهاباد کۆبوونەوەیەکی چەند سەعاتەمان کرد. کەوتینە بەر سەرکۆنە و ڕەخنەی سەرکردایەتی. دوکتۆر جەعفەر لە لایەن سەرکردایەتیی کۆمەڵەوە نامەیەکی پڕ لە لۆمە و ڕەخنەی ناردبوو بۆ سەید و خوێندرایەوە.

لە شوێنی حوسێن عەجەم کە بریندار بوو، شەریف کرا بە بەرپرسی پێشمەرگەی ناوشار. سەرلەنوێ تەنزیماتی تازەیان کرد و مەفرەزەکانی ناوچە گۆڕانکارییان بەسەردا هات. دوکتۆر نووسیبووی عەلی بنێرنە ناوەندی کارمان پێیەتی. زۆر دڵم گیرا و زانیم تەبعید و ڕاگواستنە!

# ٢٨

## ژیان لە بارەگای ناوەندی

گەیشـتمە ئاجیکەند و بارەگای ناوەندی کۆمەڵە، دڵشـکاو و مات و کەسـاس، دڵم وەک دڵـی منداڵێکی بێناز و لێوبەبـار دەچووەوە، کە بە ئاوڕلێنەدانەوەیەک لیچ دەکات و هەنیسک دەدات. شەوان لە بن لێفە و بە ئەسـپایی دڵم ڕێک دەگوشـرا و ها لە سینگم بێتە دەر. سولەیمان لە دە لاوە لــە من مردبوو، بـۆ ناردوویانم بۆ ئێرە؟! خۆ من هیچی خراپم نەکردووە، خوێڕی نەبووم و لە شەڕ هەڵنەهاتووم؟! ئەدی بۆ وا جەزام دەدەن؟! من دەبوو لەناو پێشـمەرگەکانی ناوچەی مەهابادا بم، کەچی ئێسـتێ لەناو ئەو هەموو خەڵکەی سـنە و کامیاران و مەریوانم. دوور لە شــەڕ و چالاکیی پێشمەرگانە، کارمان تەنیا حەرەسیات لە ناوەندی، تەعمیراتــی ماشـێن و مۆلیدە و خـواردن و خەوە، من بـەوە حەتمەن دەمرم. بەوە ڕاهاتبووم، حەجمینم نەبێ و ڕۆژانە دوو سـێ شـوێن و کەمین و چالاکیم هەبێت، خەڵک ببینم و فشـقیات و چوونی ناو خەڵک و مـالان و نانخواردن لە ماڵی جوتیـار و لادێکان، بە نانی مەقەڕ بێزم هەڵدەسـتا و لێی بێزار بـووم، هەرگیز بە لامەوە گرنگ نەبوو لە مالان گۆشـت و پلاوە، یان نان و پەنیر، حەزم لە سـفرەی ناومالان بوو جا هەرچیی لەسەری داندرابا، هێلکە بە ڕۆنی زەنگم[1] لە هەموو خواردنی سەرگۆی زەوی پێ خۆشتر بوو، بە تایبەت ئەگەر دوو کەوچک ماستی مــەڕی لە تەنیشـت بایــە، بەبێ یــەک و دوو دەمگۆڕییەوە بە گۆشـت قەل و پلاو و خۆرشـت. سەرەخۆشــی دەبوو لە دێهات، دابونەریت وا بــوو لە مزگــەوت، هەر ماڵەی کاتــی نانخواردن مەجومعــەی[2] دەنارد

---

١- ڕۆنی زەنگ، ڕۆنەکەرەی داغکراوی مەڕ و مانگا، ڕۆنی کوردی.
٢- مەجومعە، سینی، نانی لەسەر دەخۆن لەبری سفرە.

و بـە چارۆکە دایاندەپۆشـی. جا هەرچـی هەبا، ماڵـە دەوڵەمەندەکان خواردنی گۆشت و پلاو و شتی وایان دەنارد. پێشمەرگە کە دەگەیشتە گوندێک و دەیزانی سەرەخۆشـیی لێیە، یەکسەر بۆ مزگەوت دەچوون، لـە مزگەوتەکانـی لای ئێمـە بۆ پرسـە، خەڵک لە ژوورەوە و لە سـەر فەرشەکان چوارمشقی دادەنیشن و چا دەخۆن و لای نیوەڕۆ زۆربەیان بـۆ نانخواردن دەمێننەوە. لای نیوەڕۆ هـەر مەجومعەیە و دێتە ژوور، خۆت و شانسی خۆت ژێر چارۆکە چیی تێدایە، بۆ من ئەو کاتە خۆش بـوو، دوو هێلکـە لە ناو قاپێک ڕۆندا مەلەیان دەکرد و قاپێکی بچووکی ماسـت لە تەنیشـت و دوو نانی ڕەشـی تـازە لە تەنـوور دەرهاتووی لەسەر دەبوو.

### سەرکردایەتی وەک خودا و پیرۆزی سەیر دەکران

چەند ڕۆژێک لە ئاجیکەند بووم، سەدان کەسی لێ بوو، یەک دەهات و یـەک دەڕۆیشـت، دەیـان ژوور و هـۆدە لە نـاو دێ و دەوروبەری سەرکردایەتی هەبوون، ئەندامانی سەرکردایەتی وەک خودا و پیرۆزی سـەیر دەکران، زۆربەی کات لە ژووری خۆیان بوون و وامان دەزانی ئەوە شـەو و ڕۆژ خەریکی بەرنامە و تیۆری و پلانداڕشتنی شۆڕشن، نەدەبوو ئێمەمانان زۆر پرسـیار بکەین و خۆمان لە شت هەڵقورتێنین. خەڵکی وەک کاک یوسف ئەردەلان، کاریزمای خەڵکی سنە لە سەردەمی شـا و ڕاپەڕیـن، کاک یەدەی بیگلـەری، تاهیر خالیـدی، کەیان فەرزاد، جەمـال خۆمپارە، لالە حەمەی بۆکان و زۆری دیکەی لەوانە لێ بوون، لێم حاڵی نەدەبوو بۆ لەوێن و وەک پێشـمەرگەی سادە هەڵسوکەوتیان لەگەڵـدا دەکرێت، هیچیان سـەرکردایەتی نەبوون و هەمـوو لە مەقەڕ بوون و چاوەڕوان.

وردەوردە تێگەیشـتم بە خۆشمەوە، لێرەین بۆ ئەوەی «عاقڵ»مان بکـەن و بـە خۆماندا بچینـەوە و ڕەخنە لەخۆ بگریـن و ئەم زەعف و کەموکووڕیانە لە خۆماندا بکوژین، ئیتر هەر کەس بە ڕەخنە و عەیب و

ئیرادێکی تایبەت بە خۆی، بۆ شوێندانان لەسەریان، بۆ نزیک ناوەندیان هێنابــوون. جیـا لەمانــە هەر ناوچەیەک لە ســنە و کرماشــانەوە بگرە تا سـۆما و برادۆسـت و شـنۆ، دەبوو بە بەشـی خۆیان، بۆ ماوەیەک دەســتە پێشــمەرگە بۆ پارێزگاری لــە ناوەندی بنێـرن. ئەوانە فەترەی خۆیــان تــەواو دەکرد و دەگەڕانــەوە ناوچەی خۆیان، لــە نێو ئەوانەدا کوڕگەلــی فرە خــاس و جوامێرت تووش دەبوو، هیی واشــی تێدا بوو لە کەکرە تاڵتر و لە ناو پێشــمەرگەی ناوچەکەی خۆی لە ترســی شەڕ هەڵێنەکردبــوو، خۆی لە ناوەندی خزاندبوو. کار و پیشــەی فزوولی و ماســتاو بوو بۆ بەرپرســـان و خۆنزیککردنەوە لێیان، دەریشت کردبان نەدەچوونــەوە و ســەدان هۆکاریان دەدۆزییەوە بــۆ مانەوەی خۆیان، وەک ئەوەی سەرکەوتنی شۆڕش و پارێزگاری لە سەرکردایەتی بەندە بە مانەوەی ئەوان لەوێ.

### جەزا و ڕەخنە لە لایەن دکتۆر جەعفەرەوە

چەند ڕۆژێک تێپەڕی و دوکتۆر جەعفەر بانگی کردم، زۆری قسەی خوش کرد، باسی ئەوەی کرد ئەوان یانی سەرکردایەتی وەک کەسێکی شۆڕشــگێڕ و لازم بــۆ داهاتووی کۆمەڵە ســەیری من دەکەن، باســی زۆربەی چالاکی و هاتوچۆی سنە و مەریوان و سەقز و بانەی بۆ کردم لــە هاوینــی ڕابردوودا، گوتی مامۆســتا برایم نامەیەکــی بۆ ناردووین لەمەڕ چالاکی و هەموو ئەو کارانەی لە جنوب کردووتن، ئەوجار هاتە سەر ئەم چوار پێنج ڕۆژەی عەملیاتی تۆڵەی شەهید ئەحمەد شەعبانی و شەهیدبوونی سولەیمان بللوری، ڕەخنەی لێ گرتم، نەدەبوو مابایەنەوە لە ناو شــار، باسی چەمکی ئەنارشیستیی بۆ کردم و نابێ تووشی ئەم دیاردەیە بین. تێگەیشتم ئەوان وەک بەرئەندامی کۆمەڵە من بە بنەماڵەی کۆمەڵە دەزانن و دەبێ ماوەیەک لەوێ بم، بۆ بەسەرداچوونەوەی خۆم و دوورکەوتنــەوە لە شــەڕ و کردەوەکانی ئەنارشیســتی و فێربوونی تیـۆری و پەروەردەکردنـم. بــە نابەدڵی ملم لار کــرد و گوتم، دوکتۆر

پێم وا بوو خەڵاتم دەکەن نەک جەزا و ڕەخنە! دوکتۆر کەسایەتییەکی تایبەت بوو، بۆ من هیچیان وەک ئەو نەبوون، بە زمانە سادەکەی خۆی گوتی، بە زوویی دەزانی ئەوە پاداشتی تۆیە دەیکەین و ئێمە دەزانین تۆ چەندە کۆمەڵە و شۆڕشگێڕیت.

## مێشک و بیرمەندی کۆمەڵە

نزیک ئاجیکەند بە پێیان تەنیا نیو سەعات یان کەمتر، گوندی خوراسانەیە و هەر ئێی ئاغاوەتی بۆکانە، ماڵێکی گەورەی ئاغا بە حەسارێکی زۆر فەریحەوە، لە دوو ژووری ئەوسەری حەسارەکە، عەبدوڵڵا موهتەدی و شوعێب زەکریایی لێ بوون، ئەم دوانە وا وێنا کرابوون و موقەدەس کرابوون، کە هەموو نووسین و تیۆری و سیاسەتی کۆمەڵە، ئەمانە داڕێژەرن. مێشک و بیرمەندی کۆمەڵە و هەموو شۆڕش، ئەم دوانەن.

گوتیان، تۆ جێی متمانە و باوەڕپێکراوی، دەچی بۆ حەرەس و موحافەزەتی ئەوان، لەم فورسەتە لە عیلم و بلیمەتیی ئەوان کەڵک وەربگرە بۆ عاقڵبوونی خۆت و بەسیاسیبوونت. لە کاتی چوونی سەرئاو و نانخواردن و پیاسەی ئێواران (قەدەم لێدان)ی ناو حەوشە لێیان نزیک بە و گوێ لە قسە و موحازرەکانیان بگرە. بە کورت و کرمانجی کرامە بادیگاردی ئەم دوانە و کۆمەڵە چاک دەیزانی ئێی وەک من بشکوژرێین هەر دەیانپارێزین، واتە من لەوێ بووم بۆ ئەوەی شەڕکەر و چاونەترس، کێمباک[1] و دەروێشی بێ جیرە و مواجب بووم.

## ژیان لە بارەگای ناوەندی

نازانم چەند، بەڵام چەند ڕۆژێک لەوێ مامەوە، باش بوو دەستەیەک پێشمەرگەی مەهاباد بۆ پاراستنی مامۆستا شێخ عیزەدین لەوێ بوون، لەگەڵ واندا خۆم لە تەنیایی و وەڕەزی دێنایە دەر. بانگیان کردمەوە بۆ

---

١- کێمباک، چاونەترس، بێپەروا.

ئاجیکەند و لەخۆڕا خۆم کردە ڕاگری بەشی ماشێن و تراکتۆر، لۆری، بەنزین و گاز و مۆلیدە و ئەم شتانە. جەمال خۆمپارە لەوێ بوو، زۆر بەیەکەوە سازابووین، لە ناو مەقەڕ یوسف ئەردەڵان، یەدەی بیگلەری، کەیان فەرزاد، تاهیر خالدی و زۆری دیکە بوون، هەموویان خەڵکی بەحورمەت و خاوەن ڕابردوو بوون، هەردەم خەڵکی تازە دەهات و دەموچاوەکان لە گۆڕاندا بوون، لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆریان نێوانم خۆش بوو، شۆخی و گاڵتە و ڕابواردن بە یەک، کاری ڕۆژانەمان بوو. شەوان گەڕەلاوژێ و هەڵپەڕکێی ناوچە جیاکانی کوردستان خۆشترین بەزممان بوو، هەڵپەڕکێی گەڕیانی سنەیی، کاک یەدەی بیگلەری و کەیان فەرزاد خەم و پەژارەیان بیر دەبردمەوە، مەریوانییەکان بە جیوجیو و قاچکوتان تەپوتۆزیان بە با دەکرد و مرۆڤی ڕادەکێشا بۆ شەڕ و زرموکوت و حەماسە. سێپێیی سابلاغی و سەقزیش هەموو حەولێکی دەدا خۆی لە قەرەی سنە و مەریوان بدات، ئەوان زۆرتر و کاراتر بوون، پێیان نەدەگەیشتین.

## مەرگی زەبیحی

هەر لەم زستانەدا بوو، مام جەلال ڕایسپاردبوو بێن و پێمان بڵێن بەداخەوە زەبیحی لە بەغدا ونیان کردووە و لەناویان بردووە. خەبەرێکی ناخۆش و جێی داخ و دڵتەزێن بوو، هەمووی ساڵێک نەبوو بە دیداری شاد بووبووین، کەچی وا زوو لەناومان ڕۆیشت. هیچیان لە وردەکاری و چۆنیەتیی مەرگی پێ نەگوتین و هەتا ئێستاش ئەم تیرۆرە سیاسییە هەر بە شاراوەیی و لەژێر شک و گومان و تاریکیدا ماوەتەوە. هەرچۆنێک بێت، کاکم خەبەرەکە لە سابڵاغ بڵاو دەکاتەوە و دایکم ئاگادار دەکات. چەند ڕۆژ سەرەخۆشی و تەعزییەیان بۆ دانابوو. ئەوە بوو بە مەرگێکی بێدەنگ و شاراوەی مەزنە کەسایەتییەکی کورد. کاتێک خەبەری نەمانی گەیشت، نەمانزانی کەی لەناویان بردووە، بە قسەی کاک کەریم حیسامی کە ئەویش ئەوکات لە زیندانی بەعس بووە

و مانگــی ئەیلوولــی ١٩٨٠دا گوێی لێ بووە کە پاســەوانەکانی زیندان، شەوێک باسی ئیعدامی زەبیحییان کردووە!

## ئامادەکاری بۆ کۆنگرەی دووی کۆمەڵە

سەرەتای بەهاری ١٩٨١، بە سەرپەرشتیی کەیان فەرزاد دەستەیەک پێشــمەرگەیان جیــا کردینەوە، گوتیــان ئێوە باوەڕپێکــراوی ناوەندیی کۆمەڵــەن بۆ پاراســتن و حەرەســییاتی کۆنگــرەی دووی کۆمەڵە، کە قــەرارە لــە مانگی خاکەلێــوەدا، لە خانەقــای زەمبیلی ناوچــەی بۆکان ببەســترێت. ســەرەتاکانی مانگی خاکەلێوە بە دەیان کەس لە زەمبیل و نــاو خانەقاکەی لەژێــر وێنەکانی مارکس و ئەنگلــس و لینین لە لایەک و شــاڵ و قورئانەکانی شــێخانی زەمبیل لە لایەکی دی، بە ســروودی ئینترناشــناڵ دەســتیان بە کۆنگرە کرد. زیاتر لە پەنجا کەس بەشــدار بوون، دەتوانم بڵێم هەموو ئەندامانی کۆمەڵە لەوێ بوون. کۆنگرە نزیک بە هەفتەیەک بەردەوام بوو. لە ناوچەی سابڵاغ تەنیا دوو کەس، سەید و ڕزگار بەشــدار بوون. دەیان ڕۆشــنبیر و کادری باشــی سیاســی و نیزامــی چالاکی ناوچــەی مەهاباد، هیچیان ئەندام نەبــوون و لە لایەن سەرووی کۆمەڵەوە جارێ بە خۆیی دانەدەندران.

## ڕوانگەکانی ناو کۆمەڵە

کۆنگرە لە هەڕەتی هێرشی پاسدار و ئەرتەشی ئێران بۆ سەر شار و گوندەکان و شــەڕی ماڵوێرانکەر لە هەموو کوردستان، ڕووکردنێکی بەربــڵاوی لاوان بــۆ پێشــمەرگایەتی لە نــاو کۆمەڵە، ئیعــدام و گرتنی بەکۆمەڵــی لاوەکان و گەمــارۆی ئابــووری و دەیــان قەیرانــی ڕۆژانە و کێبەرکــێ لەگەڵ حیزبی دیموکرات لەســەر دەســەڵات، زۆرتر خۆی سەرقاڵی دوو ڕوانگەی تیۆری-سیاسی کردبوو، ئەویش تەنیا لە نێوان ئەو حەوت هەشــت کەســەی، خۆیان بە خاوەن و سەرکردەی کۆمەڵە دەزانی، ساعد وەتەندوست، حوسین مرادبێگی (حەمەسوور)، عەبدوڵڵا

موهتەدی، سـەعید یەزدیـان، ئیبراهیم عەلیزادە، شـوعێب زەکەریایی، عومەر ئیلخانیزادە، جەعفەر شەفیعی و ئیرەج فەرزاد. ئێستا دەتوانم بە تێرادیوی بڵێم؛ ئەوێ ڕۆژێ جگە لەم چەند کەسە، زۆربەی هەرە زۆری ئێمە، خەڵک و پێشمەرگەی کۆمەڵە، هەر بە لامانەوە گرنگ نەبوو ئەم دوو ڕوانگەیە چییە و قبووڵکردنی ئەو یان ئەوی تر چی لە ژیان و دواڕۆژی خەڵک و شـۆڕش و پێشـمەرگایەتی دەگۆڕێت؟! لـە ڕووی هەموو ئەم بەڵگانەی کە تا ئێستا خۆیان بڵاویان کردووەتەوە، دەردەکەوێت هەر لە ڕۆژی هەوڵەوە و لە تاران و دواتر لە کۆنگرەی یەکیشدا (ساڵی ١٩٧٩ لە نەغەدە و سـنە بە بەشـداریی پانزە کەس گیرا بوو) هەرگیز لەسەر چۆنیەتیی کۆمەڵگەی ئێران ڕێک نەبوون. سـاعد وەتەندوست و سەعید یەزدیان و ئیرەج فەرزاد گوتوویانە ئێران و کوردستان نیمە موستەعمەرە و کۆمەڵگەیەکی فیۆدالییە و سـەرمایەداری بە ڕادەی پێویسـت بەرەو پێـش نەچـووە، بۆیـە دەبێـت پەنا بو میـل و ئامورر و داسـی فەلا و جوتیار بەرین و کۆشکی شۆڕشگێڕیی خۆمان لەسەر شانی جوتیار و زەحمەتکێشـی شـار و لادێ بینا بکەین، لە بەرامبەر ئەواندا بە تایبەت عەبدوڵڵا موهتەدی، حەمەسوور، دوکتۆر جەعفەر و ئیبراهیم عەلیزادە، پێیان وا بووە ئێران سـەردەمی موسـتەعمەرە و فیۆدالی تێپەڕاندووە و تـەواو کۆمەڵگەیەکی سـەرمایەدارییە. پرۆلیتار گەشـەی کردووە و ڕیـزی خۆی جیا کردووەتـەوە، بۆیە دەبێت هەموو هێز و خەباتیان بۆ کرێکار بێت. ئەوانیش تەلاری خەیاڵ و شۆڕشـگێڕییان لەسـەر کوتک و کرێکارانی سـەنعەتی بوونیاد نابوو، دوژمنی سەرەکییان بۆرژوازی بوو، چ لە ئێران و چ لە کوردسـتان. ئەوانە بە دیدگای دوو و «بینشـی نوێ» ناسران.

بە دڵنیاییەوە دەڵێم، زیاتر لە سـەتا نەوەدوپێنجی کۆمەڵانی کادر و پێشمەرگەی ئەوکاتی کۆمەڵە، نە دەیانزانی مەسەلە چییە و نە بۆشیان گرنـگ بـوو، زۆربـەی هـەرە زۆری پێشـمەرگە و کادری بە وەجهی کۆمەڵە لە شار و لادێ، یانی زیاتر لە سەتا نەوەدوپێنجی، نە بەشداری

کۆنگرە بوون و نە پێش کۆنگرە ئاگایان لە دوو ڕوانگەی جیاوازی ناو کۆمەڵە بوو.

**«پۆپۆنیزم»**

لایەنگرانی دیدگای دوو لەبەر ڕۆشنایی تیژ و نووسینەکانی مەنسوور حیکمەت لە تارانەوە لە کۆنگرە پۆپۆلیزمیان ڕەت کردەوە و نفرینیان لێ کرد. ئەوەیان بە گەورەترین دەسکەوتی کۆنگرە دایە قەڵەم، زۆر زوو لە هەموو ناوچەکان و هێزەکانی کۆمەڵە بڵاو بووەوە پۆپۆلیزم لە کۆمەڵە ئیتر ڕەت کراوەتەوە و باوی نەماوە. هەزاران نوکتە لەناو هێزی پێشمەرگە دروست بوو، خۆم لە کۆبوونەوەیەکی ئاسایی ناو مەقەڕ و پێشمەرگەکان بووم، کێشەیەک بوو لەسەر یەک لە پێشمەرگەکان گۆیا ئەرکی خۆی بە چاکی ڕانەپەڕاندبوو، هەموو ڕەخنەیان لێ دەگرت و سەرکۆنەیان دەکرد. یەکێک گوتی: «ئاخر بەڕاستی عەیبە بۆ تۆ کاتێک کۆمەڵە «پۆپۆنیزمی» ڕەت کردووەتەوە و تۆش ئەوە دەکەیت»! مەبەستم ئەوەیە زۆر بوون تەنانەت لە گوتن و مانا لە وشەی پۆپۆلیزم نە تەنیا ئاگادار نەبوون، هەر نەشیان بیستبوو. چەند شتێکی ناکامڵ و سەرەتایی بڵاو بووبووەوە لەسەر ڕابردووی کادرانی کۆمەڵە لەمەڕ ئیشکردن لەگەڵ جوتیار و زەحمەتکێش. ڕەخنە و هەڵەبوونیان لە ڕابردووی خۆیان گرتووە، لەجیاتی ئەوەی جوتیار بێنە سەر ڕێبازی خۆیان، ئەوان چوونە سەر فەرهەنگ و ڕێبازی جوتیاری. گۆیا ئێستێ گۆڕاون و دەڵێن؛ جوتیار بۆ متمانە نابێت و تا سەر لەگەڵ شۆڕش و ئامانجی نیهایی کە سۆسیالیزمە نامێنێت. هەر ئەوە بەس بوو بۆ زۆربەی پێشمەرگەکان، کە تا دوێنێ شەو و ڕۆژ لە خزمەت و خۆبەقوربانکردنی جوتیار و قەرە(1)دا بوون، ئەمڕۆ پشتگوێیان بخەن و تەنانەت بە شەق و جنێو لێیان وەڕوور بکەون بۆ داوای نان و تراکتۆر و... لێ کردن.

---

1- قەرە، ڕەشایی، ڕەعیەتی بێ جووت و گا و زەوی.

جاران كه به سـەيارە بـە جادەی پڕ له تەپوتۆزدا دەڕۆیشـتین، لە دوورەوە دوو کەسی لادێمان دەدیت، خاومان دەکردەوە و بە هێواشی بـە سـلاو و ماندوونەبوونـی لێکردن بە تەنیشـتیاندا تێپـەڕ دەبووین. گێڕایانەوە، پێشمەرگەیەک لەناو ماشێندا دەبینێ چەند کەس لە پێشەوە بەسـەر جادەدا دەڕۆن، پێی پێوە دەنێ و بە خێرایی بە تەنشـتیاندا بە تەپوتۆزێکی یەکجار زۆر تێدەپەڕێت، ئەوەی تەنیشـتی دەڵێت؛ ئەوە بۆ وات لەم فەقیرانە کرد، خۆ هیچی سـەروچاو و جلەکانیانت نەهێشـت؟! دەڵێ، ئەی بۆ نەتزانیوە پۆپۆلیزممان ڕەت کردووەتەوە؟!

## دیاردەکانی دوای کۆنگرەی دوو

کۆمەڵێـک دیـاردە، دوای کۆنگـرە و ڕێنموونییەکانـی مەنسـوور حیکمەت و گرووپی ئیتحادی موبارزان، لە ناو کۆمەڵەدا گەشەیان کرد و بوونـە بـاو. جـاران ئەو خەڵکەی لە شـەڕ دەترسـان و لـە چوونی کەمین و جەبهە زراویان چووبوو، باش بوو ڕووی مەجلسـیان نەبوو، زۆر کەسـاس و مـات، سـەریان لە بن خۆیـان نابـوو. دوای کۆنگرە هەمـوو پەنایـان بۆ دیدگای دوو هێنـا و لەژێر ناوی «بینشـی نوێ» و دژایەتیـی پۆپۆلیزم بە یەکجاری دوورکەوتنـەوە لە کاری نیزامی و زۆربەیان لەژێر ناوی کادری سیاسـی و کۆمیتەی ڕوسـتایی، ئەوجار ئـەوان بە مەسـخەرەوە توانجیان لـە کوڕە ئازا و تفەنگبەدەسـتەکانی کۆمەڵە دەگرت. بە پشتیوانیی سەرکردایەتیی «بینشی نوێ» و دیدگای دوو، سـینگیان دێنا پێش و ئەم پێشـمەرگانەی زۆربەی کات لە شـەڕ و کەمینـدا بوون بە پۆپۆلیسـت و دواکەتـوو تۆمەتبار دەکران. خۆیان بـە جانتایەکـی پڕ لە کاغەز و کتێـب، لە بن باخەڵدا لـە هاتوچۆی ئەم مەقەڕ و ئەو مەقەڕدا بوون، لە کۆبوونەوەکاندا بە وشەگەلی ئەدەبیاتی مەنسـوور حیکمەت و کۆمەڵگـەی بورژوازیی ئێران وا بوو وا چوو بە ژێستێکی تەواو تیۆریسێنانە خۆیان وێنا دەکرد و زاری بوختان و درۆ و ئیهانەیان لە پێشمەرگە ئازا و زەحمەتکێشەکان دەکردەوە و هەرچی

کەموکوڕی و ترسنۆکیی خۆیان بوو لەژێر تێزەکانی تازەی کۆنگرەی دوو دەشاردەوە.

دیاردەیەکی دی، بەشداری و هاتنی زۆرتری ژنان بوو بۆ ناو کۆمەڵە و تەنانەت قبوولکردنیان لەناو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە. ئەمە دیاردەیەکی زۆر باش و تەندروست دەبوو و دەکرا حەماسەی ژنانی ئەمڕۆی ڕۆژئاوای کوردستان، ئەوکات لە کچانی کۆمەڵەدا ببیندرێت و بەدی بێت. سیاسەتی ئەوکاتی کۆمەڵە، بە تیۆری و ڕواڵەت مافی ژنان و عەدالەت بوو، بەڵام بە کردەوە فەرهەنگی عەشیرەتی و ژنبەکەمزانین هەر وەک چۆن لە ناو کۆمەڵگەی کوردی لەبرەودا بوو، هەروەها لەناو کۆمەڵەشدا هەر هەمان عەقڵییەت زاڵ و دابونەریتی شوانکارەیی باڵادەست بوو.

## زەماوەندی ناو مەقەڕەکان

پێشتر تێزی «کادرانی حیرفەیی» بەسەر هەموو سیاسەتی کۆمەڵەدا زاڵ بوو، هاوسەرگیری و پێکهێنانی ماڵ و منداڵ زۆر باو نەبوو، زۆرینە خۆیان بۆ شۆڕش و خزمەت بە ڕێبازەکە تەرخان کردبوو، نەک بۆ ژن و منداڵ. دوای کۆنگرەی دوو و دوورهەڵدانی پۆپۆلیزم تەواو بە پێچەوانەوە کەوتەوە، ئیتر ڕوو کرایە هاوسەرگیری و عیشقی یەک ڕۆژە و ئیعلانی زەماوەندی دوو کەس زۆر بە سادەیی و لەناو مەقەڕەکان. هەر ئەوەندە کچ و کوڕێک دەهاتن و بە دەنگی بەرز دەیانگوت، ئەوە «ئێمە ژن و مێردین». ئێستاش زۆرم پێ شک دێ بە خەونی باب و باپیریاندا نەدەهات لە ماڵی باوکیان وا بە ئاسانی ژنیان بۆ بێت یان شوو بکەن. سیاسەتە تازەکانی لەمەڕ کۆمەڵەی دوای کۆنگرە، هێزی لەبنەهاتووی ژنانی ڕۆژهەڵات و شۆڕشێکی نوێی لە کوردستان، دەستەمۆ، ماڵی و سەقەت کرد. هەر یەکسەر دوای کۆنگرە زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی یەک بەدوای یەکدا فریای کچێکی تازەهاتوو بۆ ناو کۆمەڵە کەوتن و لە جێوە بەبێ مارەکردن، بە ژن و مێرد کران.

لەباتی ئەم هێزە پاک و نیوەی کۆمەڵگە بکرێنە کەرەستە بۆ شۆڕش و سەرمەشقی هەموو کچانی کوردستان، دەسبەجێ هاوسەرگیرییان لەگەڵدا دەکرا و دوای ماوەیەکیش لەم شاخ و کێوە منداڵ بە باوەشەوە، یان ناردنیان بۆ ناوشار لای دایک و بابەکانیان بۆ بەخێوکردن. ژنانی کۆمەڵە، ئەگەر سیاسەتی دروست هەبایە و عەشیرەتی بیریان لەسەر نەکراباوە، دەکرا بکرێنە هەوێن و هێزێکی شۆڕشگێڕی ئەوکات و زۆر کاریان پێ دەکرا، کە پیاو بۆی نەدەکرا. من هەر ئەوکات باوەڕم بەم هاوسەرگیرییانەی ناو مەقەڕەکانی کۆمەڵە نەبوو و پێم بە ئیهانە بوو بە بالای بەرزی ژن و گاڵتەم بە تێزی عیشقی ئازاد و ئەم تێزگەلە دەهات، کە جەماعەتی حیکمەت لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویانە ناو کۆمەڵە. دواتریش دیمان زۆربەی هاوسەرگیرییەکان شکستیان هێنا و هەر ئێستا لە چوار قوژبنی دنیا هەمانە کوڕان و کچانی کۆمەڵە، لە دوو سێ ژن و پیاو خاوەنی منداڵ و چەندین جار هاوسەرگیریان کردووە. کادرێکی کۆمەڵە دەیگێڕاوە جارێک لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵە لە شارێکی ئەورووپا دانیشتووە، پڕ بووە لە ژن و پیاو، گوتی بە سەرنجێکی سەرپێی دیم زۆربەیان ژن یان مێردی یەک بوون و ئەمڕۆ لەگەڵ یەکیداین، خۆش ئەوە بوو ژن یان مێردە کۆنەکانیشیان هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بوون!

### بێ ئیجازە چووەتەوە ناو خێمەکە

چەند ساڵ دواتر، لە مەقەڕی کۆمەڵە لە ئالان بووم، عەلی خەڵکی بانە و بەرپرسی بێسیم بوو، خێزانی وەک هەر کچێکی ئاسایی زەمانی شا، کە شووی پێ کردبوو، ئەویش لەگەڵیدا هاتبووە دەرەوە. ئەوان لەناو دێ بە حوکمی ئەوەی ژن و مێردن، هۆدەیەکیان هەبوو، زۆر میهرەبان و بەیەکەوە شادبوون، زۆر جار بۆ نان و چا خواردن و سەردان دەچووم بۆ لایان، ڕۆژگار هات و من ڕۆیشتم، لە شارباژێر لای ئەبوو شەهاب و یەکێتی بووم. مەقەڕەکانی کۆمەڵە و دێموکرات و مامۆستا شێخ عیزەدین لە دەوری مالوومە و ئەو ناوە بوون، بیستم

شەو درەنگان لە مالوومە عەلی دەچێت بۆ سەر شاخ بۆ نۆرەی بێسیم، خێزانــی لەنــاو خێمەکەیــان جێ دێڵێت، کاری بێســیم تــەواو دەکات و دەگەڕێتــەوە نــاو خێمەکەیــان، دەبینــێ کوڕێکی فارس لــە جەماعەتی حیکمــەت لەجیاتی خۆی، لەگەڵ ژنەکەی لە جێدایە، ژنەکەی دەڵێ چیتر تــۆم ناوێ و ئێســتا لەگەڵ ئــەم کــوڕەم، زۆر تووڕە دەبــێ و دەبێتە دەنگەدەنگ، بەیانی ڕەخنەی لێ دەگرن کە بۆچی مزاحمیان بووە و بێ ئیجــازە چووەتەوە ناو خێمەکە و دەنگەدەنگی کردووە. عەلی هیچ ناڵێ و سەری خۆی دادەخات، دەڕوات و تەسلیمی ئێران دەبێتەوە، ژنەکەی کە زەمانی شــا لە بانە هێنابووی، ئێســتاش وەک ژنێکی بوێر و ئازا و کۆمۆنیست ناسراوە!

### تێزەکانی حیکمەت کۆمەڵەی هەڵتەکاند

ئێســتاش وەک کەســێکی بەشــدار و ئاشــنا بە بنەماڵەی کۆمەڵە و خاوەن شەهید، بۆ زیاتر لە چل ساڵ ئاگاداری سیاسەت و جووڵانەوەی گەلی کورد لە ڕۆژهەلات، بە ئیمانەوە دەڵێم؛ هاتنی جەماعەتی مەنسوور حیکمــەت و بڕیــار و تێزەکانی کۆنگــرەی دووی کۆمەڵە، وەک خۆرکە کەوتە گیانی هێزێکی نوێخواز و پێشــکەوتووخوازی شۆڕشگێڕی وەک کۆمەڵە و لە ماوەیەکی کورتدا ئازای لەشــی ئەم ڕێکخراوەی داڕزاند و تووشــی گەندەڵی و لە ڕێچکەی خۆی ڕێبەدەریی کرد، سەرانی کۆمەڵە زۆر زوو بە ڕەتدانەوەی پۆپۆلیزم کەوتنە ژیانی خۆش و دوورکەوتنەوە لــە خەڵکی فەقیر و زەحمەتکێشــی کوردســتان. ســەرانی کۆمەڵە و بە تایبەت کەسی یەکەمی، عەبدوڵلای موهتەدی، کە شاگەشکە بووبوو بە هاتن و تێزەکانی مەنسوور حیکمەت، بەڵایەکیان بەسەر ئەم ڕێکخراوە نوێ و خاوەن گوتاری ئۆپۆزیســۆنە هێنا، کە هەر ئێســتاکێ هەر بەش و پارچەیەکی بەدەســت کەسێکەوەیە و لەژێر باری نەبوونی ڕابەری و پەرش و بڵاویدا دەتلێتەوە.

# ٢٩

**دوکتۆر زۆراب**

ئاجیکەند، ئاشــی گۆلان، شەرەفکەند، خوراســانە، عیلمئاوا، خانەقا، ســەردەرابات چەنــد دێیــەک بوون لــە دەوری یــەک و زۆربەیان ئیی ئاغاکانــی هیدایەتــی و حیســامی و ئیلخانیــزادە و... بــوون. کۆمەڵە بە پانــەوە لــەم چەند دێیە خــۆی بڵاو کردبــووەوە، کۆمیتــەی ناوەندی، خەیاتخانــە، چاپەمەنی و ئیعلام، نەخۆشــخانە و زۆربەی ئۆرگانەکانی غەیــرە نیزامــی لەم ناوە بوون. خەڵکێکی زۆر بەســەر ئــەم گوندانەوە بــوون، کۆمەڵە خۆی مدبــەق و نانەواخانە و تەعمیرگا و ئەرزاقی بوو، تەنانەت یارمەتیی خەڵکی دەکرد بۆ خەستەخانە و دەواودەرمان.

دوای تەواوبوونــی کۆنگــرە، هەمــوو لــە ئاجیکەند بــوون و منیش خۆم بە لۆری و ســەیارە و تەعمیرگاوە ســەرقاڵ کردبوو، هەر جارە دەمبیســت کوڕانی مەهاباد چالاکییان کردووە و چوونەوە ناوشار هەر ئەوەندە بوو لە حەســرەتان نەدەگریام، چەند جارم بە دوکتۆر جەعفەر و ســەید گوت، دوای کۆنگرە دەبێ بمگەڕیننەوە ناوچەی مەهاباد، هەر دەیانگوت باشە و پەلە مەکە.

بەیانییەک لە لای حەوشی ماشێنەکان خەریکی بەنزین و پێڕاگەیشتنی گەراجەکــە بــووم، عەبدوڵڵای موهتــەدی هات و چــاک و چۆنیی زۆر گەرمی کرد، گوتی:

– ماشێنی چاکمان هەیە، وەک جێپ و لەندرۆڤێر و...

– بەڵێ یەکدوانییەک هەن خراپ نین، فەرموو بۆچی؟!

– دەزانــی دوکتــۆر زۆراب ئەندامــی ســەرکردایەتییە و لە کۆنگرە هەڵبژێــردراوە، یــەک لــە هــەرە زانــا و بلیمەتەکانی کۆمەڵەیــە، دەبێ وەک تــۆوی چاومان بیپارێزین، دەچێتەوە تاران و بووەتە بەرپرســی

تەشکیلاتی هەموو کۆمەڵە لە دەرەوەی کوردستان.

- دەیناسم و زۆر نێوانمان خۆشە.

- ئاخر دەزانم بۆیە تۆ باشی، بە ماشێنێکی باش بیبە بۆ شنۆ و تەسلیمی هاوڕێیانی ناوچەی شنۆی بکە و یەک دوو کەس بەرەو خۆتان بکوژرێن و ئەو هیچی لێ نەیەت!

- بەسەر چاو و دڵنیا بە، ئەو شتێکی لێ بێ، ئێمە خۆمان ناگەڕێینەوە!

ئەوکات شنۆ و بۆکان هەر بە دەستی پێشمەرگەوە بوو، قیادە موەقەتە لەگەڵ حکومەتدا ڕۆژانە خەریکی بەربینگپێگرتن بە دێموکرات و کۆمەڵە بوو، چەند جار کەمین و وردەشەڕیان لەگەڵمان کردبوو، دەوڵەت و قیادە تەواو لە بەرنامەڕێژیدا بوون بۆ گرتنەوەی تەواوی شاری شنۆ.

دوکتۆر زۆراب و هاوڕێیەکی تری کۆمەڵەی تارانمان، لەگەڵ دوو پێشمەرگە بە سواری لەندرۆڤێرێکی گورجوگۆڵ بە ڕێگەیەکی دووورودرێژ، بە سندوس و دەشتی قوڕێ و دێهاتی نەغەدە، شاولێ و قارنا، دوور لە ڕێگە سەرەکییەکان، گەیاندە ناو شاری شنۆ و مەقەڕی کۆمەڵە.

یەک دوو ساڵ دواتر زانیم دوکتۆر زۆراب هەمان سەعید یەزدیانە، لە تاران لە هێرشی سپاه و ئیتلاعات بۆ سەر چالاک و هێزەکانی چەپ و دژی حکومەت گیرا، دوای چەند ڕۆژ هێنایانە سەر تەلەفزیۆن و ئیعترافیان پێ کرد. سەرکردایەتیی کۆمەڵە دوای ئەوەی دوکتۆریان هێنایە سەر تەلەفزیۆن نەوەستا و یەکسەر بەیانی جاشبوونی لەسەر دەرکرد، بەبێ ئەوەی لە حاڵی دیل لە زیندانەکانی کۆماری ئیسلامی تێبگات و ڕاوەستەیەک لە چۆنیەتیی حاڵ و بارودۆخی بکات. دواتر لە شەشی مانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٦٣ی هەتاوی (١٩٨٤-٠٨-٢٨)دا دوکتۆر لە زیندانی ئەوین ئیعدام کرا.

## خوشک و برایەک بە دەستی دیموکرات شەهید بوون

سـەرەتای مانگـی بانەمـەڕ بـوو، (٢٧-٤-١٩٨١) بەیانـی زوو لـە ئاجیکەند یوسـف بە خۆی و ماتۆڕەکەی بە فڕەفڕ پەیدا بوو. یوسـف حەسەنخاڵی کوڕێکی هونەرمەند و چالاکی کۆمەڵە بوو لە بنەماڵەیەکی ناسـراو و زەحمەتکێشـی مەهاباد، لە خەتخۆشی و نووسینی تابلۆکان لە شاردا یەکەم بوو. لەگەڵ کاکی، محەمەد و دایکی و خوشکی شەهید نەسـرین حەسـەنخاڵی، هـەر هەموو کۆمەڵـە بوون، یوسـف یەک لە ماتۆڕسـوارە بەناوبانگەکانـی مەهاباد بوو، وێنەکێش و دەسـترەنگین بوو، تەتەر و پێشـمەرگە بوو. بە پەشـۆکاوی خۆی لە ماتۆڕەکە دوور خسـتەوە و هات بۆ لام، ها عەلی! پەلە بکە و بمبە بۆ لای حەمەسوور، نامـەم پێیـە، دێموکرات لە تیکانلوجە لە پێشـمەرگەکانی داین و سـێی شـەهید کـردووە. عەلی حەبیب پەنـا و عەلی کولیجـە (ڕەحیم نژاد) و لایەنگرێکیش. بە بیستنی ناوی عەلی حەبیب پەنا زۆر تێک چووم. عەلی تەنیا ١٧-١٨ سـاڵی بوو، پێمان دەگوت عەلی سـوور، خەڵکی مەهاباد بوو، زۆر خۆشەویسـت و میهرەبان و لەسـەر دڵان بوو. چووینە لای حەمەسوور و سەرکردایەتی، پاش یەک دوو سەعات بە یوسفدا نامەیان نارد بۆ ناوچەی مەهاباد. حیزبی دێموکرات مەفرەزەیەکی زۆر بەدفەڕ و شـەڕخوازی لە قەرەبـلاغ و تیکانلوجە دانابـوو، دایمودەرهەم دژی پێشـمەرگەکانی کۆمەڵە لە شەڕ دەگەڕان و گەڕیان تێ دەهاڵاندین. ئەو بەیانییە ئەم سێیە بە پێیان هاتبوون بە ناو دێدا بچنەوە زگدڕاو، بە لای مەقەڕی دێموکراتدا تێدەپەڕن، ڕایاندەگرن و قسـەیان لێ پەیدا دەبێت، هەرسێکیان شەهید دەکەن.

یوسـف بـە نامەی سـەرکردایەتی بۆ بەرپرسـانی مەهابـاد بە پەلە گـەڕاوە، شـتێکی وای پـێ نەچـوو خەبەر هـات لە ناو دێی عیسـاکەند لـە جـادەی بورهـان، ئاغاکانـی عیسـاکەند وەک چەکـداری دێموکرات لەسـەر ڕێ، یوسف دەگرن و هەر لەسـەر ماتۆڕەکەی ئیعدامی دەکەن. شـەهیدبوونی یوسف خەسارەیەکی گەورە بوو چ بۆ بنەماڵەیان و چ بۆ

ئێمەی هاوڕێیان و چ بۆ کۆمەڵە. ئەم شەڕەی دێموکرات و کۆمەڵە زۆری تەشنە نەستاند و زوو کەوتنە دانوستان و گۆڕینەوەی دیل و چەکەکان.

بنەماڵــەی حەســەنخاڵی، باوکیــان وەســتا عێزەتی بەنــا و دایکیان زارا خاتــوون، بــە هەموویانەوە تێکەڵی خەباتی شۆڕشــگێڕانەی گەلی کوردستان و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بوون. کاک محەمەدی برا گەورەیان کوڕێکی هونەرمەند و لە زەمانی شــادا، کارمەندی تەلەفزیۆنی مەهاباد بــوو. ئەرشــیفێکی دەوڵەمەنــدی هەیــە لــە تەزاهــورات و ســەردەمی شۆڕشــی گەلانــی ئێــران. هەروەتر بە ســەدان وێنە و فیلمــی هەیە لە چالاکیی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە ساڵانی ئەوەڵی شۆڕشی کوردستان لە ڕۆژهەڵات. وێنەکێشــێکی ناســراوە و بە دەیان تابلۆی بەنرخی تاکو ئێستا هەیە. نەسرینی خوشکیان پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو لە کارەساتی گوردانی بیستودووی کۆمەڵە لە مەرگەوەڕ لە بیستودووی خەزەڵوەری ١٣٦٤ ( ١٩٨٥-١١-١٣) بە دەســتی پێشــمەرگەکانی حیزبی دێموکرات شەهید بوو. واتا خوشک و برایەکی ئەم بنەماڵەیە لە شەڕی نەگریسی ناوخۆ بە دەستی حیزبی دێموکرات شەهید بوون. دایکیان لەناو کۆمەڵە بە «دایە زارا» ناســراو بوو، شەو و ڕۆژ لە هاتوچۆی ڕێکخستنەکانی ناوشــاری کۆمەڵە و پێشــمەرگەکاندا بوو، ماوەیەکی باش بە ســەری پیری لە زیندانی ورمێ گیرابوو.

### بینینەوەی هاوڕێ دیلەکانم

دوکتــۆر جەعفەر لەگەڵ خوشــکی کاک فوئاددا (مەلەکەی مســتەفا سوڵتانی) هاوسەرگیریی کرد. دۆڵی ئاجیکەند و گوندەکانی، زیاد لەحەد شلوق و قەرەباڵغ بووبوو، دوکتۆر لە دێی قەرەڵی لەگەڵ چەند ئەندامی دیکــەی ســەرکردایەتی مەقەڕیان کردەوە، بۆ چەنــد ڕۆژێک لەگەڵیاندا بــووم. دوکتــۆر لەگەڵ مەلەکــەدا لە هەرەی دڵداری و خۆشەویســتیدا بــوو، لــە پێکەنیــن و گاڵتەکردن نەدەوەســتا و یەکجــار میهرەبان بوو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، کە خەمی لێ دەباری، خاوەنی سێ برای شەهید

و دووی تریــش له ســـەرەی ئیعدامدا بوون لــه تەوریز و چیی وای پێ نەچوو ئەوانیش ئیعدام کران.

ڕۆژێک دوکتۆر گوتی، ئەم ڕۆژانە دەچم هاوڕێکانت لە زیندان ئازاد دەکەم. قەرار بوو گۆڕینەوە بکرێت بە دیلەکان و کەمال ولیانی، بەهمەن مـــەلازادە، یونس پاڵەوانی، ئەحمەد خاکی و هەمزە چابووک بگۆڕینەوە بە چەندین پاســدار و سەرهەنگ، کە دیلی ئێمە بوون و یەک دوویەکی زۆر موهیمیــان تێـدا بوون، لە بانە و ئاربابا گیرابوون. خەبەرێکی زۆر خۆش بوو هاوڕێ نزیکەکانم دەبینمەوە.

ڕۆژی ســێزدەی مانگــی جۆزەردانی ســاڵی ١٣٦٠ (٣-٦-١٩٨١) لە جێژنیکانی نێوان ســەقز و بۆکان لەسەر ئاوەکە گۆڕینەوە کرا، هەڵبەت جــاری یەکــەم بەتەمای فێڵ بوون، بە وریایی پێشــمەرگەکان و خودی دوکتۆر بۆیان نەچووە سەر و دواخرا بۆ ڕۆژی دواتر، دیسان کەمالیان بــە بیانووی نەخۆشــی وەدرەنگی خســت و گلیان دابــووەوە، دوکتۆر ئەوەشــی قبووڵ نەکرد و ســـەرهەنگێکی هێشــتەوە و بۆ ڕۆژی دوایی کەمالیش گۆڕدرایەوە. مەفرەزەیەکی سابڵاغ کە بە تازەکی چالاکییەکی گەورەیان لە نێو شــاردا کردبوو، سیمورغێکی بەڵەکبەڵەکی پاسدارانی لەگەڵ چەندین ئەســیر و تفەنگ بە دەســکەوت گرتبــوو، هەموویان لە شــار هێنابــوو دەر، هەر هەموو بە ســیمورغەوە هاتن بۆ پێشــوازیی هاوڕێکانمان، بە نێو شاری بۆکان بە شایی و لۆغان، هاوڕێکان لەسەر قەلاندۆشــان، هاتینــەوە بەر مەقــەڕی کۆمەڵە لە بۆکان. لــە میتینگێکی گــەورەدا هەموویان قســەیان کــرد و کۆمەلانی خەڵک پێشــوازییەکی بێوێنەیان لێ کردن. بە دیتنی ئەم هەموو دەســکەوت و چالاکی لە نێو شــاری ســابڵاغ و هاتنەوەی هاوڕێیانی کۆنم لە زینــدان، ئیتر بڕیاری خۆم دا و گوتم، بە نافەرمانیش بێت دەڕۆمەوە ناوچەی ســابڵاغ. یەک دوو ڕۆژ لــە بــۆکان مانــەوە و هاوڕێیانی زینــدان خەریکی حەمام و چوونی خەستەخانە و ئیستراحەت بوون، بڕیاری خۆم بە دوکتۆر گوت و ڕازیم کرد بمنێرنەوە مەڵبەندەکەی خۆم.

## جەمال موفتی و دروستکردنی حەمامەکە

گەیشتینەوە حاجیاڵیکەند، مەقەڕی سەرەکیی ناوچەی مەهاباد و سەید کە لە کۆنگرە بووبوو بە ئەندامی سەرکردایەتی، بەرپرسی ناوچەی مەهاباد بوو. دوکتۆر جەعفەر بە نامە راپۆرتێکی زۆر باش و پڕ لە پێداهەڵگوتنی لەمەڕ من بۆ کۆمیتەی ناوچەی مەهاباد نووسیبوو.

جەمال موفتی هونەرمەندی دەنگخۆشی سابلاغ زۆرتر لە بۆکان دەبوو، لەگەڵ کۆڕی هونەرمەندانی کۆمەڵەدا بوو، ماوەیەک بوو ناردبوویانەوە مەقەڕی کۆمیتەی ناوچە لە حاجیاڵیکەند. ئەو ماوەیەی حاجیاڵیکەندمان زۆر خۆش بوو، جەمال بە دەنگی خۆش، شەو و ڕۆژی دێنایە جۆش و دەیکردینە سەرخۆش. سروودە پڕ لە وزە و هەستبزوێنەکانی هەردەم ئامادەی مەیدانی شەڕ و هێرشی دەکردین، فوئاد ڕۆڵەی ئاگر و خوێن، سەدەی بیستمە کوردە تۆ ڕاپەڕە، بۆ قەڵای سەرمایەدار، من جوتیارم، گۆرانی و مەقامەکانی تاهیر تۆفیق و کیژەکەی کافرۆشی، هەردەم لە مەقەڕ و لە پشتی سیمورغ ورە و بوێریی دەبەخشی بە پێشمەرگە و خەم و کوڵی قورسی ژیانی پێشمەرگایەتی، نەبوونی و برسێتی لە بیر دەبردینەوە. جەمال وزە و ئومێد و کانگای خۆشی بوو بۆ ئێمە لە مەقەڕی حاجیاڵیکەند. ڕۆژێک هات گوتی، ئەرێ بۆ لەژێر ئەم هەیوانە و لەم ژێرخانی دارانە، حەمامێک دروست نەکەین. تەنیا لم و چەو و کەمێک سمیتمان دەوێ و خۆم هەموو کارەکانی دەکەم و دەبم بە وەستا. تەدبیرمان کرد، لە سەر جادەی ناتەواوی بورهان-بۆکان، هەر لە زەمانی شاوە بۆ دروستکردنی جادەکە چەو و لمیان هەڵڕشتبوو. سولەیمان گردەگرۆیێ، شۆفێر و پێشمەرگەی ئازا، تراکتۆری بە عارەبانەوە ساز کرد و گوتی فەرموون هەرچی پێی خۆشە با سوار بێت و پاچ و پێمەرە تا دەتوانن بێنن. لە خۆشیی حەمام دروستکردن و بەزم و گۆرانی دە پانزە کەس سوار بووین. گەیشتینە سەرجادەکە و کۆگایەکی گەورەی لم و زیخ،

به سـرورودخوێندنەوە و گاڵتە و پێکەنین وەک شـۆڤڵ نەمانزانی چۆن ئەم عارەبانەی پشـت تراکتۆرمان لیپاولیپ کرد، ئەوجار هەموو لەسەر لمەکە پاڵ کەوتن و دیسـان بە سـروودخوێندنەوە بەرەو حاجیاڵیکەند گەڕاینـەوە. پێش حاجیاڵیکەند سـەرەولێژییەک هەیە، هەر لەو شـوێنە ئامین خەیات لە ناو لەندرۆڤێرەکە ساڵی پێش وەرگەڕا و مرد. من لای سـولەیمان لە تەنیشت شۆفێر لەسەر ئاسنی سەر تایەکان دانیشتبووم، سـەید خالید لەوبەر دانیشـتبوو، گەیشـتینە هەوەڵی سـەربەرەژێرەکە سـولەیمان گوتی، خەتەرە و بارمان زۆر قورسە دەترسم هەڵیگریّ! بە هێزی سروودخوێندنەوە و پێکەنین و جەوانی، هۆشمان نەبوو زۆرمان لیّ بار کردبوو لەگەڵ ئیزافەی دە پانزە کەسیش، هەر ئەوەندە تراکتۆر ڕووی کردە سـەرەوخواری ئەم تایە گەورانە، وەک ئاشـی ئاویان لیّ هات و زۆر بە خێرایی دەخولانەوە، سـولەیمان هاواری دەکرد و هیچ کۆنترۆڵی نەما، هاوارمان کرد خۆتان فڕیّ بدەن. ئەوانەی ناو عارەبانەکە خۆیان فڕیّ دا، ئێمە لە سەر تراکتۆرەکە مابووینەوە، لەناکاو ئەو ئاسنە گەورانـەی تراکتۆر و عارەبانەکەیان بەیەکەوە ڕەبت کردبوو، لەت بوو و تراکتۆرەکە دەسـتی کـرد بە تەقڵەلێـدان و عارەبانەکەش کەوتە ناو شـیوی قەراغ جادەکـە. تراکتۆر و ئێمە سـیّ کەس وەکـو گوللەتۆپی هاوێـژراو بەرەو خـوار دەچووین، هەر ئەوەندەمـان زانی تراکتۆر بە تەقلەلێـدان ڕووی لـە ئاسـمان کـرد، ئەوەندە دەزانم کلاشـینکۆف بە دەسـتەوە لە تراکتۆرەکە جیا بووبوومەوە و لە ئاسـمان بەرەو زەوی دەهاتم، بەسەر ئەژنۆی ڕاستمدا خۆم بە عەرزەکەدا کێشا، سەید خالید فڕیّ درابووە قەراغ جادە و سولەیمان لەسەر پشت و سوکانی تراکتۆر لەسـەر سینگی، لە خەرکەمانی[1] عەرزەکە و سوکانەکە دابوو. شانسی هەبوو هەردوو قەپاغی (گلگیر، چەمەلەغ)ی تایەکان نەیانهێشتبوو هەموو

---

١- خەرکەمان، ئامرازی چەماندنەوەی کەللە بێژنگ و کەمەی دەف، جۆلا بە کاری دێنێت بۆ تێکچرژان و پاڵەپەستۆی زیاتری داوەکان، لێرەدا بەکار هاتووە بە مانای فشار و پرێس بوون.

زەختی تراکتۆرەکە بچێتە سەر سینگی. سولەیمان لە نێوان بۆشایی فەرمان و عەرزەکەدا گیری کردبوو، بەڵام ساغ بوو. بە پێشمەرگەکان و خەڵکی ناو دێ کە هەمووی بەپیر ڕووداوەکەوە هاتبوون، سولەیمان بە ساغ و سەلامەتی هاتە دەر. ئەوەی زۆر خراپی بەسەرهات، من بووم. ئەژنۆم شکابوو و یەکسەر ئەستوور بوو، هەڵیان گرتم و بردیانمەوە مەقەڕ، لە حاجیاڵیکەند وەستایەکی زۆر باشی شکستەبەند و هێنانەجێی ئێسقانی قاچ و دەستی لێ بوو، فریام کەوت و دەسبەجێ بە هەویرێک پێک هاتوو لە هەنگوین و هێلکە و ئارد و کۆمەڵێ شتی تر، کە نازانم چ بوون و دوو تەختە لەمبەر و ئەوبەری ئەژنۆم قاچی بۆ هەڵبەستم و دارشەقێکی دایە دەستم. ماوەیەک، زۆریش نا، بە دارشەقەکە ڕۆیشتم، بەڵام بەڕاستی ئەژنۆمی زۆر بە باشی عیلاج کرد.

### چالاکییەکانی کۆمەڵە

لەو ماوەیەدا و بەهاری ١٩٨١ چالاکیی پێشمەرگەکانی ناوچەی مەهاباد، مەفەرزەکردنمان بۆ ناوشار و مانەوەی شەو و ڕۆژێک لە ناوشار، دەستکەوتی زۆر و شەهیدی کەم، لە هەموو کوردستان و ناوچەکانی دیکەی کۆمەڵە دەنگی دابووەوە. داهێنەری ئەوەی شەوێک پێشتر، مەفرەزە بچێتەوە ناوشار و دواتر وا لە دوژمن بگەیەنێت ڕۆیشتینەوە دەر، بەڵام وا نەکەیت و خۆت لەناو کەلاوە و بینای کۆن و تەنانەت ئاودەستی مزگەوتەکاندا تا ڕۆژی دوایی عەسر، واتا زیاتر لە دە پانزە سەعات بە بێدەنگی بشاریتەوە، زۆر جاران بۆ کاری سەرئاو و توالێت سەتڵمان لەگەڵ خۆدا دەبرد، دوو سێ سەعاتی ڕۆژ بمێنێت و لەناکاو لەسەر جادە و کۆڵان و قەرەباڵغیی شار دەربکەویت و هێرش بەریتە سەر پاسدار و بنکەکانی حکومەت، کاری کوڕگەلی نیزامی کۆمەڵە لە ناوچەی مەهاباد بوو. خەڵک تەقەی کۆمەڵەی لە ناوشار دەناسییەوە و دەیانگوت کۆمەڵە دێ و بە دوو سەعات شەڕی خۆی دەکات و دەسکەوتی زۆر دەباتەوە، کۆمەڵە لە غەیب زاهیر دەبن و ون دەبن.

بەرنامەی چالاکییەکی گەورە و چوونی چەندین دەستە پێشمەرگە بۆ ناو شاری مەهاباد دارێژرا، پێشمەرگە لە حەوشەی مەقەڕی حاجیاڵیکەند، خۆی ساز و پۆشتە دەکرد، دەبوو لە سێ شوێن، شەو تا دوانیوەڕۆی ڕۆژی دوایی خۆمان بشارینەوە و ئەوجار سەعات چواری ئێوارە هەرسێ دەستە بەیەکەوە لە سێ نوقتەی جیاوازی شار هاوزەمان بێینە دەر و یەکسەر هێرش بەرین. جەمال دەیزانی شتێک هەیە، دەهات و دەچوو، یەخەی ئەو و ئەوی دەگرت و دەیپرسی چ باسە؟ دەمانگوت هەر سەردانێکی ناوشار دەکەین. دەپاڕاوە بیبەین. سەید ڕەحمانە درێژ دەیگوت نابێت، ڕەخنەی لەسەرە و چەککراوە جارێ. زۆری ئیسراری دەکرد و دەپاڕاوە با بیبەین، لە ئاخر چرکەدا هەموو سواری ماشێنەکان بووبووین، بە پاڕانەوەی جەمال و قسەکردنمان لەگەڵ سەید ڕەحماندا دڵی نەرم بوو، چوو کلاشینکۆفێکی بۆ هێنا و ئیجازەی دا. یەک و دوو جەمال خۆی تەیار کرد و خۆی فڕێ دایە پشتی سیمورغ.

سەدەی بیستەمە کورد دە تۆ ڕاپەڕە
تەواوی مێژووت بە خوێن پەڕپەڕە
تەواوی گەلان هەموویان سەربەخۆن
لە کوردستانا زۆردار خوێنمان دەخۆن
زانا بین تێبکۆشین دەور دەوری مەیە،
وڵات چاوەڕێی شۆڕشی ئێمەیە
لغاوی شۆڕش خۆت بیگرە ئەی کرێکار
ئەتۆی دەچێژی زیللەتی ئیش و کار
بە هیمەتی تۆ کرێکار و جوتیار
بەسە دواکەتن، دەسبەسەر و هەژار
بە درێژایی مێژوو نەمدی ئاڵاکەمان
بە غەیری دواکەوتن، چەوسانەوەی گەلمان
هەزاران شەهید لە ڕێگای ئازادی
گیانیان فیداکرد ئامانجیان بێتە دی

له پشتی سـیمورغ وەک ڕەشەبا، تەپوتۆزی ڕێگە، دەنگی جەمال و گوتنەوەی سروودی «سەدەی بیستەمە» هەموومان بەیەکەوە، جامانە و شـەدە بـە دەوری مـل و دەموچاوەوە، کلاشـینکۆف لە سـەر ڕان، ئێسـتاش دوای چل سـاڵان موچڕک بە لەشـدا دێنێت و چـاوان پڕ لە ئەسرین دەکات. زۆر جاران لەگەڵ هاتنەدەرەوەمان لە حەشارگەکانمان لە شار، یەکەندەردوو پێشمەرگە، یان کوڕگەلی ڕێکخستنەکانی ناوشار، بە شـریتی سـروودەکانی ناسـر و جەمـال و نەجمە و کاڵـێ، خۆیان دەگەیانـدە بڵیندگـۆی مزگەوتەکان و دەنگی سـروود و قرمژنی گوللە هەمـوو شـاری دێنایە جۆش و ئیتـر ئەو کاتە بوو حەماسـە و خۆین تێکـەڵ دەبوو، مـووی لەش هەمووی قرژ دەبوونـەوە و وەک دڕکیان لێ دەهات و هیچ پێشـمەرگەیەک ترسـی نەدەناسی، ئەوە دوژمن بوو خۆی لە کونەمشکاندا دەشاردەوە و کوڕان و کچانی جوانی شار بوون ئامێزیـان بـۆ پێشـمەرگە دەکردەوە و بە کەشـەفی چا و شـەربەت و شیرینی پێشوازیی گەرمیان لە براکانی شاخیان دەکرد.

### شەهیدبوونی هونەرمەندی دەنگخۆش جەمال موفتی

ڕۆژی دواتر بیستوهەشـتی مانگی پووشپەڕ (١٩-٧-١٩٨١) سەری سـەعاتی سـفر لە پەناوپەسـیوەکانی خۆمان هاتینە دەر و بە کەمتر لە چەند چرکەیەک شار کرایە دۆزەخێکی پڕ لە ئاگر و خوێن بۆ پاسدارانی حکومەتی ئیسـلامی. بە دەیـان کەلاکیان هەر لەنـاکاو لێ کەوت، هەتا ئەوان هاتنەوە خۆ ئێمە کاری خۆمان کردبوو، بە داخی گرانەوە جەمال لەبەر هەیەجان و ورەی بەرزی لەسەر سەنگەری خۆی لە لای کۆڵانی سـەنگەکخانەکەی مزگەوتی سـوور، دێتە پێش بۆ سـەر جادەکە و بە ڕاکشـاوی تەقە دەکات و سـەر دێنێتە دەر و گوللەی داگیرکەری گەل و نیشـتمان تۆقی سـەری دەپێکێت و هەر لەوێ شـەهید دەبێت، وەک ئەوەی هەر لە ئێوارەی ڕۆژی پێشووەوە خۆی بۆ شەهیدبوون ئامادە کردبێت.

زۆر وەدرەنگ کەوتین و هاتنەدەرەوەمان لە شـار زۆری پێ چوو، دەسـتەکەی لەگـەڵ جەمالدا بوون مەیتەکەیان بۆ دەرناچێت، شـەریف (ڕەزا مەعرووفی) کە ئەوکات بەرپرسـی دەسـتەی نیزامیی شـار بوو، لـە دەوروبەریان دەبێـت، دەڵێ برۆن من خۆم بەیانی دەربازی دەکەم، شـەریف مەیتی جەمال دەباتەوە مەحموودکان لە گەراجی ماڵی خۆیان دەیشـارێتەوە، بەیانـی بـە ماتۆڕێکی سـێ تایی پڕ لە خشـت و دار و بەرد جەمال دێنێتەوە دەر و تەسـلیمی پێشـمەرگەکانی دەکاتەوە. ئێمە زۆر بە خۆشـی ڕۆیشتین و بە خەمی قورسـی لەدەستدانی جەمالەوە گەڕاینـەوە. بەرەو بـۆکان هەمـوو لەگەڵیدا چووین و لەنـاو ئاپۆڕەی کۆمەڵانی خەڵک لەسەر دەستان بۆ گۆڕستان و بە سرووودەکانی خۆی کە لە هەموو شـاردا دەنگی دەداوە بە خاکمان سـپارد. شـەهیدبوونی جەمـال خەسـارەتێکی گەورە بوو لـە هونەر و مۆسـیقای کوردی، لە فەرهەنـگ و فۆلکلۆر، لە بنەماڵەکەی و لە ئێمە پێشـمەرگەی کۆمەڵە و هەموو بزووتنەوەی کورد.

جەمـال پێشـتر وەک دەسـتەی هونەرمەنـدان و مامۆسـتایانی کۆمەڵە لە بۆکان چالاکیی دەکرد، سـەید حەسـەن شەمسـی بەرپرسی ئۆرگانەکەیان بوو، جەمال کە هاتەوە بۆ ناوچەی مەهاباد بە دەرکراوی و بە هۆکاری سـەرەڕۆیی و خواردنەوەوە، لە لایەن سەید حەسەنەوە دەرکرابوو، بە نامەیەکەوە هاتەوە ناوچەی سابڵاغ، کە تێیدا نووسرابوو جەمال شـایانی ئەوە نییە پێشـمەرگەی کۆمەڵە بێت. ئەم بڕیار و نامە و بێلوتفییەی بەرپرسـانی بـۆکان و ڕاپۆرتەکەیان جەمالی وردوخاش کردبوو، بۆیە پێی دادەگرت بێت بۆ شەڕ و نیشانی بدات فیداکاریی گەل و کۆمەڵەیە، هات و بە خوێنی خۆی سـەلماندی کە بە حەق گیانفیدا و خزمەتکاری گەل و نیشـتمان و کۆمەڵەیە. سـەیر و عەجایب ئەوە بوو هەر چەند ڕۆژ دوای ئەم ڕاپۆرتە بە ناحەقە لە ڕۆژی ناشتنی لە بۆکان لە میتینگی جەماوەریدا، هەر ئەم کاک سـەید حەسـەن و بەرپرسـانی دیکـەی بـۆکان، بە دەنگ و هـاوار و لاواندنەوە، پڕ بـە بڵێندگۆکان لە

تاریـف و پێداهەڵگوتنــی جەمال هیــچ نەما نەیڵێن و وەک شــەهیدێکی گەورە، یاد و ڕێزیان بەرز دەنرخاند، وەک پاڵەوان و پێشمەرگەی ئازا و بەجــەرگ ناوزەدیان دەکرد و لەناو جەماوەری زۆری خەڵک خۆیان پێوە هەڵدەکێشــا. ئێمە چەند لە پێشــمەرگەکانی ســابڵاخ کە هاتبووین بۆ بەخاکســپاردنی جەمال، کە ئەم قسانەمان بە تایبەت لە زاری سەید حەســەن شەمســی گوێ لێ بــوو، خەریک بوو هــاوار بکەین ئەدی بۆ هــەر چەنــد ڕۆژ پێش وا خراپتان لەســەر نووســی و دەرتــان کرد؟! بەڵام کۆمەڵانی خەڵک لە بەڕێکردنی شــەهید جەمال ئەوەندە زۆر و بە ئیحساســەوە بەشدار بوون، کاتی ئەم قســانە نەبوو. دەبێ بڵێم زوڵمی گەورەمان لە هونەرمەندێکی زۆر بەقابیل و دەنگخۆش کرد!

# ٣٠

### هەمیشە لە کەمیندا

کەمال وەلیانی کرا بە بەرپرسـی ڕاهێنانی پێشـمەرگە و گوتنەوەی وانەی چەک و تەقەمەنی بۆ پێشمەرگەی تازە، یونس کرا بە مەسئوولی مەفرەزە و منیش کرامە بەرپرسی مەقەڕی زگدڕاو و پێشمەرگەکانی.

زگـدڕاو کەوتبـووە نزیک جادەی سـابڵاغ-میاندواو، شـەو و ڕۆژ دەبـوو لە حەرەسـیات و کەمینـدا بین، ئەمـە دەروازەی گەیشـتن بە گوندەکانی مەحاڵ بوو، سەررێی هاتوچۆی پێشمەرگە و خەڵک بوو. بە گرتنی زگدڕاو، ئیتر گرتنی بەرزایی سەنگسار و دەرمان و حاجیاڵیکەند زۆر بۆیان ئاسان دەبوو. شاخێکی بەرز بە پشت دێی زگدڕاوەوە هەیە، مەڕغەوڵی پێ دەڵێن، هەموو شەوێک تا ڕۆژی دوایی و خۆر لە پشتی دەداین دەبوو لەناو ڕەوەزە بەردەکانی سەرشـاخی مەڕغەوڵ ڕوو بە جادەی ئاسفاڵتی سابڵاغ لە کەمیندا بین.

دوای شـەهیدبوونی جەمال زۆربەی کات لە زگدڕاو بووم، شەو و ڕۆژ ئەم ڕێگەیەمان دەپاراسـت بۆ ئـەوەی دوژمن زەفەرمان پێ نەبا. چەنـد جارێـک بەری بەیانیان، ئەرتەش و پاسـدار حەولیـان دا بێن و زگدڕاو بگرن، نەماندەهێشـت و هەرجارە تێک دەشـکان و دەچوونەوە دواوە. جارێکیان بەیانی زوو حەرەسـەکانی سەر مەڕغەوڵ ئاگاداریان کردین سـتوون هات بەرەو جادەی زگدڕاو، بە پەلە خۆمان ئامادە کرد و هـەر کەسـە و بۆ لایەک دابـەش کرا، یونس نانەوا ئـار پی جیی پێ بوو، کوڕێکی ناسـک و مێرمنداڵ، جەبار خەدەمەی بوو واتا کۆڵەپشتی گوللەکانی بۆ هەڵدەگرت، گوتم یونس، جەبار بەرە و بڕۆ پێشی پێشێ. یەکەم شـت بە ئار پی جی لێیان دەین ورەیان دەڕوخێنین، مەسـئوولی سیاسیی دەستە لەوێ وەستا بوو. گوتم فڵانی مادام کڵاشینکۆفت پێیە،

تۆش برۆ لەگەڵیاندا و بیانپارێزە، گوتی من مەسئوولی سیاسیم و ناچمە پێش. گوتم جا کاکە خۆ مەسئوول دەبێت لە هەموان لەپێشتر بێت، نەیسەلماند، کات نەمابوو، دەبوو هەموو بچینە سەر شوێنی خۆمان و ئامادە بین بۆ لێدانی ستوون. هەرچی بەسەر زارمدا هات لە جنێوی سووک حەواڵەم کرد و گوتم، گەر وایە چەکەکەت دانێ و بڕۆوە بۆ لای ئەوانەی تۆیان کردووەتە مەسئوولی سیاسی. هەر دەتگوت لەسەر ئەم قسەیە وەستابوو، یەک و دووی لێ نەکرد، ڕوو لە حاجیاڵیکەند و پشت لە ئێمە، دوورکەوتەوە و ڕۆیشت و ئێمە و شەڕەکەی جێ هێشت.

### دەستیان لە یەخەم کردەوە

ستوون هات و شکا و هەمووش سەلامەت دەرچووین، دوای شەڕ و ئێوارە ماتۆڕ و نامەی کۆمیتەی ناوچە پەیدا بوو، بە پێی نامە دەبوو نەوەستم و بچم بۆ ناوچە. گەیشتم و کاکی مەسئوول لەگەڵ بەرپرسانی ناوچەدا چاوەڕێ بوون، خەبەری شەڕەکە و پاشەکشەی هێزەکانی دەوڵەت گەیشتبوو، گوتیان بۆ جنێوت پێ داوە، وەک خۆی بۆم باس کردن، گوتم ئەم پیاوە کوڕی شەڕ نییە و باش نییە لەناو مەفرەزەدا بێت، باشترە هەر چەک بکرێت، ئیتر ڕەخنەیان لە جنێوەکانی من گرت و کە زانییان شەڕی باش کراوە، بەم چەند ڕەخنەیە دەستیان لە یەخەم کردەوە و گەڕامەوە بۆ لای پێشمەرگەکان، هەموویان زۆر خۆشحاڵ بوون کاکی مەسئوول سیاسیی دەستەم بەم دەردە برد و خەڵکی ناو دێ هەموو پێشوازیی گەرمیان لە سەرکەوتنی شەڕەکە کرد، کە لە نزیکەوە بەرگریی پێشمەرگەیان لە بەیانییەوە بە چاوی خۆیان دیبوو. ئەم برادەرە دوای کۆنگرە و ڕەتدانەوەی پۆپۆلیزم و زاڵبوونی دیدگای دوو بەسەر کۆمەڵەدا، بێورەیی و لەشەڕترسانی خۆی بەمە دەشاردەوە، کە ئەو، زۆرتر سیاسییە و دژی دیدگا و تێڕوانینی نیزامییە و بۆ شاردنەوەی کەموکووڕییەکانی لەگەڵ چەندی دیکە لە ناوچە، کە ئەوانیش خۆیان لە کۆمیتەی ڕوستایی شاردبووەوە

و تخونــی شــەڕ نەدەکەوتــن، دژایەتیی خەڵکی نیزامی و شــەڕکەریان بــە بیانووی ســەرکەوتنی دیدگای دوو دەکــرد و زۆربەی ئێمەیان پێ پۆپۆلیست و دواکەوتوو بوو.

بە هۆی نزیکیی مەقەڕمان لە شــار لەو ماوەیەدا چەند جار دایکم و کاکم بۆ ســەردانم هاتن، هەموو جار بە هاتنی کەســوکاری پێشمەرگە دەبووژاینەوە لە خواردن و شــیرینی و جلوبەرگ، هەباس لە بۆکان بۆ دابینکردنی خۆراک و پێداویستیی ناوچەی مەهاباد کاری دەکرد، پێیان دەگوت بەشی «تەداروکات». هێشتا دوکان و بازاڕ و بە تایبەت وەزع و حاڵــیماڵــی ئێمە وەک خــۆی لێ نەهاتبــووەوە، دوکانی کاکم کاری نەدەکرد و بابم زۆرتر لە ماڵەوە دەبوو، خانووەکەمان هەر بە ڕووخاوی جێیان هێشــتبوو و کرێخانووشــیان دەدا. دایکم زۆر بەپەرۆش بوو بۆ خانووەکــەی خۆمــان و هیچ ڕازی نەبوو کرێگرتە بێت، بەس عیلاجیان نەبوو دەبوو بســازێن، لەسەر ئەو حاڵەی خۆیان منیان لە بیر نەدەکرد و هەموو جارێک بە پارە و جل و پێڵاو و پێداویســتییەکانمەوە دەهاتن بــۆ لام و تەنیــا دوعایان دەکرد و دەیانگوت، هەر تۆ و پێشــمەرگەکان سەلامەت بن، هەموو شت باش دەبێت.

مەقــەڕی کچەکانیان لــە قزڵجە کۆ کردبووەوە و هــەر کامەیان بۆ شــوێنێک ناردبوو. نەرمین گەڕابووەوە ناو شــار و زۆرتر لای دایک و بابم دەبوو، کاری ڕێکخستنەکانی ناوشاری دەکرد.

### قرەقرمان لێ پەیدا بوو

لــە ئاخروئۆخری مانگــی خەرمانانددا مەفرەزەکــەی یونس و منیان بانــگ کــرد و ڕەوانــەی بــۆکان کرایــن. دەنگــۆی گرتنــەوەی بۆکان هەبــوو، کۆمەڵەهێزێکــی زۆری لە زۆربــەی ناوچەکانەوە لە بۆکان کۆ کردبــووەوە بــۆ بەرگری لە بۆکان و ئەگەری شــەڕ لەگــەڵ حکومەتدا لــە ئانوســاتدا بوو. هــەردوو مەفرەزە لە حاجیاڵیکەند کــۆ بووینەوە و پۆشــتە و تەیار کراین بە چەکی ســووک و قورسی وەک ئار پی جی و

دۆشــکە و ڕەشــاش. کوڕێکی مێرمنداڵی زۆر جوان خەڵکی ئیندرقاش، ســەعدوون تازە هاتبوو بۆ پێشــمەرگایەتی و تەنیــا دەورەیەکی چەند ڕۆژیی دیبوو، سەید ڕەحمانە درێژ بەرپرسی نیزامی بوو، لە حەوشەی مەقــەڕی حاجیاڵیکەند ئامادەکاریی بــۆ بەڕێکردنی ئەو دوو مەفرەزەیە دەکرد، گوتی با ســەعدوونیش لەگەڵ تۆدا بێت. گوتم کاکە ئەوە جارێ زۆر منداڵــە و بــۆ شــەڕ زۆر زووە و هیچ ئەزموونی نییــە، بینێرن بۆ ئۆرگانەکانــی دی بــا تۆزێک کامڵ بێــت، قرەقرمان لێ پەیــدا بوو، من نەمدەویســت ئەم منداڵە لەناو دەستەکەمدا بێت و زۆرم پێ گوناح بوو. گوتی نەخێر لەســەری مەڕۆ، بیبەن و تەواو. هەر دەبوو من تەســلیمی بم، ئەو مەسئوول بوو!

هەمــوو گەیشــتینە بۆکان و بەرپرســان ئەرک و شــوێنەکانیان بۆ دیاری کردین، زیاتر لە دوو حەفتە ئێمە لە ناڵەشــکێنە و جادەی ســەقز و میاندواو و میراوا ســەنگەرمان لێ دا و تەلیســی پڕ لە لم و زیخمان لەســەر یەک دانان. بە گەرمای مانگی ڕەزبەر، بە ڕۆژ کرێکاری و پاچ و پێمــەڕە، بە شــەویش لەبەر بای پایزی، حەرەســیات بــوو بە کار و پیشــەمان. هەموو ڕۆژەکان چاوەڕێ بووین حکومەت و پاسدار هێرش بکەن و بێن بەرەو بۆکان. هیچ نەماندەزانی لە کام قوڵەوە نیازیان هەیە بــەرەوە بۆکان بێن، بۆیە دەبوو هۆشــمان بێت بە جــادەی میاندواو و سەقزیشەوە.

## پیشمەرگەی خەڵکبەکەمزان

من یەک لەم پێشــمەرگانە بووم لە زۆربەی ناوچەکان و شارەکانی کوردستان و مەقەڕەکانی کۆمەڵە مابوومەوە و پێشمەرگایەتیم لەگەڵدا کردبــوون، ســنە، ســەقز، بانــە، مەریــوان و... بەڵام لــە هیچیان وەک مەســئوول و پێشــمەرگەکانی بــۆکان، ڕۆحزل، خۆویســت، مەغروور، لووتبەرز و خەڵکبەکەمزانم نەدیبوو. زۆربەی بەرپرســەکان هەســتان و دانیشــتنیان لەگەڵ ئێمەدا بە چەشــنی ئاغا و ڕەعیەتی بوو، زۆربەی

هەرە زۆریان وەک یەک قسـە دەکەن و دەسـت ڕادەوەشێنن و لەگەڵ بەرامبەردا ئامرانە دەدوێن، تەنانەت خەڵکی شار و سادەکەش پەیڕەوی و لاساکەرەوەی فەرهەنگی عەشیرەتی و ئاغاوەتی دەکەن. نازانم ئێستا دوای چل سـاڵ پێکهاتـەی کۆمەڵایەتیی بۆکان چیی بەسـەرهاتووە و چەنـد گـۆڕاوە و دەڵێن زۆر گەورە بووەتـەوە و خەڵکی تری زۆر لێ زیاد بووە، بەڵام ئەوکات زۆربەی دانیشـتوان و خەڵکەکەی پێشـینە و نەریتـی دەرەبەگی و ئاغاوەتی و دیوەخانیان هەبوو، یان بەسـەریاندا زاڵ بـوو. زۆربەی بەرپرسـانی ناوچـەی بۆکانی کۆمەڵە لـە منداڵ و نـەوەی ئاغاوەتی؛ موهتەدی، ئیلخانیزادە، عەلیار، حیسـامی، تیکانتەپە، بابامیری، سـیادەت، ڕەزایی و دەوڵەمەندەکانی بۆکان بوون، بەڕواڵەت هـەر هەموویان مارکسـی و کۆمۆنیسـتی تۆخ و لایەنگرانـی فەقیر و هەژاران بوون، لێ بە فەرهەنگ و هەستانودانیشتنی ڕۆژانە و قسەکردن و کرداریـان، زۆرتر فیگۆر و ژێسـتی ڕەئیـس و حاکمانیان پێوە دیار بـوو. هەڵبەت نەدەکرا یان نەیاندەویسـت خۆی لـێ قوتار بکەن و بەم دابونەریتە گەورە بووبوون. لە لای سـەرەوە دانیشتن، زۆر قسەکردن، لە سـەرەوەڕا دواندن، دەستڕاوەشـاندن، زوو زوو لەبەریەکهەسـتان، بـرا گەورەیـی و بچووکـی، دەستبەسـینگەوەگرتن، بە پێوەوەسـتان لای گەورەکانیـان، بە شـیعرهێنانەوە و تەعلیقلێـدان وەڵامی بەرامبەر دانـەوە، قامووسـی تایبەت بـۆ جنێـودان و دەیـان وردە دابونەریتی دی لـە تایبەتمەندییەکانـی ئاغاوەتی و دەرەبەگایەتـی، قورقوڕۆچکەی بەرپرسـانی ناوچـەی بۆکانی بە تونـدی گرتبوو. هەر بۆیـە مامەڵە و هەسـتان و دانیشتنیان بۆ ئێمە منداڵانی سەربزێو و بەدفەڕ و بێدەعێی کووچە و کۆڵانی سابڵاغی و شارەکانی تر زۆر خۆش و ئاسان نەبوو!

## سەنگەری چۆڵ

ڕۆژی یانـزدەی ڕەزبـەری سـاڵی ١٣٦٠(٣-١٠-١٩٨١) کتوپـڕ لە دوو لاوە، هەم جادەی سـەقز و هەم میاندواو، سـتوون بەرەو بۆکان

هاتن. ئێمە و سەدان پێشمەرگە لە سەنگەرەکانمان چاوەڕێی بووین ستوون بگاتە نزیک شار، کەچی لەپڕ و بە بڕیارێکی چاوەڕواننەکراو لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە و دێموکرات ئەمریان کرد تەقە نەکەین و شار چۆڵ بکەین. زۆربەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و دەستەکەی من و یونسیش چووین لە دێی شێخلەر نزیک بۆکان لە ماڵان و مزگەوت بڵاو بووینەوە، بە پرتە و بۆڵە، کە واتان دەزانی ئەو هەموو سەنگەرەتان بۆ پێ لێداین و بەو خۆرەتاوە بۆ هێندە لە سەنگەردا بووین و... کوڵی دڵی خۆمان ڕشت. لە شێخلەر نە ماڵ بەردەکەوت و نە مزگەوت و نە ئاودەست، پڕ بوو لە پێشمەرگە و ماڵەکان تا توانییان خزمەتی باشی پێشمەرگەیان کرد.

**پاسدار هات**

پێش ماڵانی شێخلەر باغە ترێی لێیە، دوو تەپۆڵکەش یەک بەرەو میراوا و ئەوەی تر لە پشت ماڵانە. لەگەڵ یونس و چەند پێشمەرگەدا لە بەر مزگەوت وەستا بووین، زۆربەی پێشمەرگەکان لە ماڵان خەریکی نان و چا خواردن و سەرخەوشکاندن بوون، لەپڕ هاوار بەرز بووەوە و بە دەست ئیشارە بە تەپۆڵکەی سەرجادەکە کرا، پاسدار سەردەکەوتن و خەریکی سەنگەر و هاوەن دامەزراندن بوون، چەند هاوەن ڕێک لەنێو ماڵان و ڕەزەکان کەوت، تەپوتۆز و هاتوهاوار و هەڵاتن، کەس بە کەس نەبوو، بەرپرسانی بۆکانیم نەدەدیت، یونس چەند پێشمەرگەی دەستەکەی خۆی دیتەوە و بەرەو ڕەزەکان و سەرجادە بە نێو دێراوەکاندا ڕوو بە پاسدارەکان ڕۆیشتن. پێشمەرگەکانی دەستەکەی من تەنیا سێ چوارێک دیار بوون، یەکێکیان ئار پی جیی پێ بوو، سەرکەوتین بۆ سەر گردەکەی قەراغ ماڵان، بەردەڵان و پڕ لە گاشە بەرد بوو، بەرامبەرمان ئەو بەرزاییە بوو پاسدار گرتبووی، خوارەوەمان ڕەز بوو، یونس و چەند پێشمەرگە خۆیان قایم کردبوو، لای چەپمان بەرەو ئاختەتەر دەشتایی و شێوەرد بوو، لە سەرەوەڕا دیمان زۆربەی

پێشمەرگەکان لەم دەشتاییە بڵاو بوونەوە و دەڕۆن بەرەو ئاختەتەر. دۆشکەکەی ناوچەی مەهاباد سەعید سەرهەنگی لەسەر بوو، لەناو ئەو دەشتاییە لە سەر سیمورغەکە تەقەی لە کۆپتەر دەکرد، سەعدونم دیت لە ناوەڕاستی کێڵگەکە بەرەو ئاختەتەر دەچوو، لە پشتەوەڕا پێ کرا و لەناو شێوەردەکە کەوت. سەعید لەسەر دۆشکەکە فیشەک وە دموچاوی کەوت و بە زامداری ڕایانگواستن بەرەو ئاختەتەر. لەناو دێی شێخلەر دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کە پاسدار هات، هەر کەسە بۆخۆی بڕیاری مانەوە، یان ڕاکردن بەرەوە ئاختەتەری دەدا. کەس چاوەڕوانی نەدەکرد ستوون یەکسەر بەرەو دەرەوەی بۆکان بێت و ڕوو لە شێخلەر بکات، هەموو پێمان وا بوو لەپێشدا لە ناو شار خۆی قایم دەکات و زەحمەتە عەینی ڕۆژ بەرەوە دەرەوەی شار بێت، هەر بۆیە کە هاتنە سەرمان و لێک بڵاو بووینەوە، هەر هەموو بە ئاسوودەیی لەناو شێخلەر پاڵمان لێ دابووەوە و خەریکی ئیستراحەت بووین.

شپرێوی، سەرلێشێواوی و بێبەرنامەیی بەرپرسانی ناوچەی بۆکان لە لایەک و گۆڕینی تاکتیکی نیزامی دوژمن لە لایەکی دی، لەو ڕۆژەدا بوو بە هۆی ئاڵۆزی و لێکدابڕانی هێزەکانمان و پاشەکشەیەکی ڕەمەکی و هەرچیوپەرچی.

دەستەکەی یونس لە نێو باغە ترێ و ئێمەش لەسەر تەپۆڵکەی بەر ماڵان کراینە ئامانج و بەر تۆپ و هاوەن و قەناس دراین، کۆپتەر لە سەرمان و نەفەربەر و تانک بەرەو ڕوومان و بەرەو دێ دەهاتن. بە سەدان گوللەتۆپ و هاوەن ئەو ئێوارەیە، دەیان جار بەرەو لێواری مەرگی بردین و دیسان هەڵستاینەوە، تەنیا مرازمان کێشانی باڵی تاریکی بوو، نازانم بۆچی لەگەڵ ئەوەی پاییز بوو، ڕۆژ وا درێژ بووبووەوە و خۆر بەرەو شاخە دوورەکان هەڵنەدەکشا، ماڵئاوایی لە ڕووناکی نەدەکرد و بۆ شەوی جێ نەدەهێشت؟!

بەرەو ئێوارە بە ڕووکاری جادە دوو تانک بەرەو ڕوومان ڕوو لە تەپۆلکەکەی ئێمە هاتن، تەنیا چەند مەتریان مابوو بێنە سەرمان،

دوو گوللەی ئار پی جی بەرەو ڕوویان کرایەوە و یەکسەر سوکانیان بادایەوە و لێمان دوور کەوتنەوە، لە دوورەوە بە ناو شێوردەکەی نێوان شێخلەر و ئاختەتەر چەند پێشمەرگە لێمان نزیک دەبوونەوە و دەهاتن بەرەو ئێمە، کاک مینەی حیسامی و کاک حەمەی سوڵتانیان لەگەڵدا بوو. هاتنی ئەوان بوو بە پاڵپشت و بەرزیی ورەمان.

پاسدار و ئەرتەش وردەوردە لە یەک دوو شوێن خۆیان قایم کرد و گەڕانەوە بەرەو شار، ئێمەش هاتینەوە بۆ ناو دێ و لەگەڵ دەستەکەی یونسدا کە سەرتاسەری ئەم دوانیوەڕۆیە لە دوورەوە بۆ یەکمان دەڕوانی و ڕۆح لەسەر کونەلووتمان بوو، یەکترمان لە باوەش گرت. گوتیان، سەعدون لە فەقەراتی کەوتووە و سەعید دۆشکە لە لایەکی ڕوومەتی داوە و لە لایەکەی دیی دەرچووە و هەردوو لە خەستەخانەی کۆمەڵە لە عیلمئابادن.

### بۆن و برین

دوای نزیکەی بیست ڕۆژ، بۆکان بەبێ بەرگری و شەڕی ناوشار لە ڕۆژی یانزدەی ڕەزبەری ساڵی ١٣٦٠ (٣-١٠-١٩٨١)دا گیرایەوە و ئێمەش بە زیانی دوو بریندارەوە گەڕاینەوە ناوچەی مەهاباد لە حاجیاڵیکەند. سەعدون نزیک بە چوار مانگ لەسەر پشت بەبێ جووڵە لەسەر تەختی خەستەخانە کەوت، بە هۆی نەجووڵاندن و هەڵگێڕووەرگێڕ نەکردنی، تووشی برینی سەرجێیی بوو. لەو ماوەیەدا یەک دوو جار لەگەڵ پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆماندا چووینە سەردانی، هەموو پشت و ڕانی برینی گەورەی تێ کەوتبوو و بۆنی گرتبوو، لە بەژن بەرەوخوارەوە جووڵەی نەمابوو، بەداخەوە ئەو مێرمنداڵە جوان و ناکامە، سەعدون عەزیزی، لە یەکەم و ئاخر شەڕی ژیانیدا و لە بیستوهەشتی بەفرانباری ١٣٦٠ (١٨-١-١٩٨٢)دا شەهید بوو.

### سەعاتی سفر

ئاخـری پایز و هەوەڵی زسـتانی سـاڵی ١٣٦٠ و ئاخـر ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٨١ دوو دەسـتە لە پێشمەرگەکانی ناوچەی مەهاباد نێردراین بۆ ناوچەی سـەقز لە تورجان، قەراری شـەڕێکی گەورەی ناو شاریان دابوو، زیاتر لە شەسـت حەفتا پێشمەرگەی مەهاباد و سەقز دەبوو بە شـەو بچینە ناو شـار و خۆمان مات بکەین، تا ڕۆژی دواتر سـەعات سـێی دوانیوەڕۆ، ئەوجار لە حەشـارگەکانمان بێینە دەر و بە گورجی و لەناکاو دەست بوەشێنین لە پاسدارەکانی ناوشار. بە هۆی کۆمەڵێک گرفتـی جوگرافی و مەودای دووری دێهاتی ژێر کۆنتڕۆڵی پێشـمەرگە لەگەڵ ناوشـاری سەقز، دەبوو لە تورجانەوە بە پێ بڕۆین بۆ ناوشار. ئەمە دەبوو بە هۆی ماندووبوونی زۆری پێشمەرگە، بە تایبەت بەشێکی زۆری مەسـیرەکە دەبوو بە تاریکی بڕۆین. ڕێمان گرت و هەرچۆنێک بێـت بـە هیلاکی و شـڕی گەیشـتینە نـاو شـار و حەشـارگەکانمان. دەسـتەکەی ئێمە بە هۆی ناشـارەزاییمان لە ناو شـاردا دەسـتەیەکی سەقزیشـمان لەگەڵدا بوو، بۆ ماوەی زیاتر لە دوانزە سـەعات بە سـی پێشـمەرگەوە لە حەشـارگەیەکی زۆر تەنگ و بچـووک، ماینەوە. کاک هێـرش عەلیـزادە یەک لە مەسـئوول پەلەکانی سـەقز و کاک جەعفەر ئەمینزادە ناسراو بە جەعفەرە سوور وەک فەرماندە لەگەڵدا ئێمە بوون. سەعاتەکان سفر کران و کات دیاری کرا هەر دەستەیە لە شوێنی خۆی دەرکەوێت و شـەڕ دەسـت پێ بکەین. ئێمە لەناو بازاڕی سـەقز نزیک بووین و دەبوو هەر کە خۆمان ئاشـکرا دەکەین دوو پێشـمەرگە بچن بۆ دوکانی جاشـێکی سـەقزی، حاجی سـمایلی گاخۆر و هەر لەسـەر دوکانەکەی خۆی بە سـزای ناپاکی بگەیەنن. ئەو چەند سـەعاتە لەناو حەشـارگەکەمان بە ساڵ دەگوزەرا، هەموو ماندوو بووین و تەنگاو بۆ کاری سـەرئاو، ئێمـە تایبەتی نیگەران بووین بە هۆی ناشـارەزایی لە کووچە و کۆڵانەکانی ناوشار.

**دوو کوڕی پێشکەشی دایکی نیشتمان کرد**

سەری سەعاتی دیاریکراو هەموو لە کۆڵان و جادەکان سەنگەرمان گرت، چەند پێشـمەرگەیەک لەناو بـازاڕ و دوکانەکەی خۆیدا پەلاماری حاجیان دا و یەکسەر کوشتیان بە هۆی ئەوەی دەمانچەی دەرهێنابوو تەقە لەو پێشـمەرگەیە بکات کە حەولی دابوو بە دیل بیگرێت. شەڕێکی کـۆڵان بە کۆڵان و زۆر خوێناوی هەڵگیرسـا، بە دەیان پاسـدار لەناو شاردا، دوکان بە دوکان شەڕیان کرد، بە دەیان کەلاک کەوت و دەیان دیـل و تفەنـگ و تفاقی جەنگی بە دەسـکەوت گیـران. خالید مینەپوور پێشـمەرگەی دەستەکەی ئێمە لەناو شاردا شەهید بوو، ڕەحیم بللوری برینـدار بـوو، وەک لـە بیرم بێ یەکی تریشـمان بریندار یان شـەهید بـوو. شـەوێکی ڕەش بـە زیاتر لە چـل دیل و دەسـکەوتی زۆر، دوو بریندار و شـەهیدێک بە شاخی وەنەوشەدا لە شار دوور کەوتینەوە و ڕوومـان لە تورجـان کردەوە، مەقەڕی کۆمیتەی ناوچەی سـەقزی لێ بوو. دوکتۆر خالید شـەفیعی برای دوکتۆر جەعفەر وەک یارمەتیدەری پزشـکی لەگەڵماندا بوو، بە ڕێگەوە سـێرۆمی بـۆ ڕەحیم گرتبوو و بە چوار پێشـمەرگەش هەڵیان گرتبـوو، دوای ماوەیەک ڕێبڕین بەداخەوە شـەوی ٣٠ی مانگی سەرماوەز ١٣٦٠ (٢١-١٢-١٩٨١) لە نێوان شاخ و کێوەکانی سـەقز و تورجاندا، ڕەحیم شـەهید بوو. کاتی هاتنمان عەینی ڕۆژ، دایکی ڕەحیم لە سـابلاغەوە هاتبوو بۆ لای و کۆمەڵێک شـیرینی و خواردنـی بـۆ هێنابوو، کە خـۆی داوای کردبوو. ڕەحیـم پێی دەڵێ کارێکی بچووکمان هەیە، زوو دەگەڕێمەوە و دواتر دەیانخۆین. ئێمە کە گەڕاینەوە ناوچەی مەهاباد ڕەحیمان بە شـەهیدکراوی خستە باوەشی دایکی و ئەو دایکە جەرگبڕاوە کە کەریمی کوڕیشی شەش مانگ پێشتر (٢٥-٦-١٩٨١) بە دەسـتی جەللادانی کۆماری ئیسلامی ئیعدام کرابوو، ڕەحیمیشـی بە دەسـتی خـۆی لـە حاجیاڵیکەند ناشـت و دوو کوڕی پێشکەشی دایکی نیشتمان کرد.

# ٣١

**پێشمەرگەی دێموکرات مەعاشیشی هەیە**

لە کۆنفرانسی دوای کۆنگرەی دوو، باسی پەیوەندیی دیپلۆماسی و عیلاقاتی دەوڵەتانیان کردبوو، ئێمە نەمانزانیبوو گۆیا باســی پەیوەندی لەگــەڵ عێراقــدا کرابوو، کە حــەرام نییە و پرس بە مــام جەلال کراوە و ئەویــش زۆری پــێ باش بــووە. من و یونس پاڵەوانــی و بەهمەن و چەنــد کەســی تریان بانگ کردین بــۆ ناوچە و گوتیــان بچنە ناوەندی کاریــان پێتانە. چەند ڕۆژێک لە ئاشــیگوڵان بەتاڵ و بێکار دەمانخوارد و دەنوستین، کوڕگەلی وەک ئێمەی دیکەشی لە زۆربەی ناوچەکان لێ بوو، زۆربەیان مەســئوولی نیزامی و ئەندام و بەرئەندام بوون، هەموو لێکمــان دەپرســی بۆ لێرەین؟ کــەس هیچی نەدەزانی، هــەر دەیانگوت لێــرە بــن کارمان پێتانە. بەیانییەک کۆیان کردینەوە و کاک شــوعێب و کاک عەبدولــڵا هاتــن و گوتیان کۆبوونەوەیە. چەند ڕۆژ لەســەر یەک باســی تیۆری و ئەزموونی وڵاتان و دواتر پێداویســتی شۆڕشــەکان، بێپارەیــی، بێچــەک و بێئەڕزاقــی، هەمــووی باس دەکرا. قۆســتنەوەی دژایەتیی خۆبەخۆی دوو دەوڵەتی بورژوازی بۆ بەرژەوەندیی شۆڕش و پرۆلیتاریــا، دوژمنی دوژمنم دەکرێت دۆســتم بێــت و دەیان باس و تیۆریی لینین و ئەدەبیاتی کۆمۆنیســتی ڕۆژانە شرۆڤە دەکران. گوتیان ئەگــەر بــە تێروپڕی چەک و ئــەڕزاق هەبێ ســەدان پێشــمەرگە دێنە نــاو ڕیــزی خەبــات. بریندارەکان لە بــێ دوکتۆری شــەهید نەدەبوون و کرابــا و ڕێ هەبوایــە ناردبامانــن بۆ دەرەوە، زۆربەیــان ڕزگاریان دەبوو. تەنانەت پێشــمەرگەی دێموکرات مەعاشیشــی هەیە، چەند ڕۆژ لــەدوای یەک لەو قســانە کــران. وردەوردە هەموو مانــدوو دەبووین. بەیانییەکــی کاک شــوعێب قســەی بــۆ دەکردیــن، هەســتام گوتم گەر

بەتەمان هەڵمانسەنگێنن و بزانن ئێمە لەسەر پەیوەندی بە دەوڵەتی عێراقەوە چی دەڵێین، ئێمە هەموو پێمان باشە و ئامادەین و لە بنی کولەکەم دا و گوتم، دوژمنایەتیی دوو بورژوازی هەر ئێران و عێراقە و مەبەست ئەوەیە، ئیستفادە لە دەوڵەتی عێراق بکەین و پەیوەندیی پێوە بگرین. بوو بە فڕق و پێکەنین و شتەکەمان ئاشکرا کرد. ئەوە چەند ڕۆژە ئامادەسازیمان بۆ دەکەن پێمان بڵێن؛ ئێمە دەچین بۆ سەرەتای تاقیکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ عێراقدا. ئیتر هەموو هاتنە قسە و بابەتی گرنگ و سەرەکی ئەوە بوو، دەبێت تا دڵنیایی لە پێکگەیشتنی هەردوو لا (دەوڵەتی عێراق و کۆمەڵە) ئەم شتە زۆر بە نهێنی بمێنێتەوە و هەر بۆیەش ئێمە دەستنیشان کراوین، چونکە متمانەیان بە ئێمەیە. کۆمەڵە زۆری بە لاوە گرنگ بوو گەر سەری نەگرت، کەس نەزانێت حەولێکی وا دراوە. ئێمەش هەر هەموو پێمان لەسەر ئەوە داگرت و قسەمان زۆر کرد لەوەی پێشمەرگەمان چەک کردووە لەبەر ئەوەی فیشەکی زۆر تەقاندووە، پێشمەرگەی چاکمان چووەتەوە ماڵ بە هۆکاری ئەوەی ژن و منداڵی هەیە و کەس نییە بیانژێنێت، پێشمەرگەمان زۆرە دایک و بابی فەقیر و هەژارن، لە جەولەکان لەبەر دوکانی گوندەکان، دوو تمەنی پێ نییە نوشابەیەک بکڕێت و سەدان شتی دیمان باس کرد بۆ دروستیی سیاسەتی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتی دراوسێ و دوژمنی ئێران، واتا عێراق!

کراین بە دوو دەستەی پێشمەرگە، بەرپرسی یەکیان یونس و ئەوەی دی من بووم، وەستا عەولای ڕەبەت (خالید فەرهادزادە) کرا بە بەرپرسی هەردوو مەفرەزە و کۆمیتەیەکی سێ کەسییش لە هەرسێکمان دروست کرا. هەموومان خاوەنی کلاشینکۆفی مزەلی و زۆر پۆشتە بووین، سیمورغێک و لەندرۆڤێرێکیشیان پێ داین. گوتیان بڕۆن لە بێژوێی ئالان مەقەڕ بکەنەوە و جەولە بکەن لە ناوچەکانی سەردەشت و بانە و ڕەبەت و باسی هیچ مەکەن و گەر گوتیان چ دەکەن بڵێن پێشمەرگەی ناوەندین و ئێمەش هەموان ئاگادار دەکەین لە هەموو ناوچەکان چیتان

پێویســـت بوو بۆتانی دەســـتەبەر بکەن. خۆتان لە کێشــە لەگەڵ حیزبی دیموکراتدا بپارێزن و بە هیچ کلۆجێک نابێت ئاڵۆزی دروســت بێت، بە تایبەت لە ئالان کە دەبێتە سەرڕێی هاتوچۆمان.

### خانەی موعینی شەهید نەدەبوو

ئــەوەی بزانێــت ئالان و بێــژوێ کوێیە، ناوی محەمــەد مەلا عەلیی بیســتووە. کاک محەمــەد خەڵکی بێژوێ لە کەســایەتییە ناســراوەکانی ئالان و سەردەشــت بــوو. کوردێکی موخلیس و هــەر لە کۆنەوە جێی بــاوەڕی پێشــمەرگە و ســەرکردەکانی کــورد بووە. بــە وڵاغدارییەوە خەریک بوو، شەو و ڕۆژ بە خۆی و خێزان و کوڕان و وڵاغەکانیەوە لە خزمەت شۆڕش و پێشمەرگەدا بوون. ئەو زۆرتر و پێش ئێمە دۆست و ناسیاوی مام جەلال بوو، هەر لە دەسپێکی شۆڕشی نوێوە، لە ١٩٧٦دا بــە هەمــوو تواناوە یارمەتیی شــۆڕش و یەکێتیی دابــوو. بە هۆی مام جەلالەوە، ســەرانی کۆمەڵەی ئێرانیش دەیانناســی، لە ١٩٧٨دا کادرانی کۆمەڵــە بە ڕێگە و یارمەتیی ئەو لە بێژوێڕا ڕەوانەی قەندیل کرابوون، وەک دوکتۆر جەعفەر شەفیعی، ساعد وەتەندوست و حەمەسوور. خۆ ئەگــەر کاک خانەی موعینییش لــە ١٩٧٨دا ڕێگەیان نەگۆڕیبا و هەر بە لای کاک محەمــەددا و لــە بێژوێــوە چووبا بۆ لای یەکێتــی، ئەوە ئەو چارەنووســەی نەدەبوو، کە لە دێی دڕی بە دەســتی جاش و بەعســی عێراق شەهید ببێت.

### شۆڕکردنەوەی غەبغەبە

گەیشــتینە بێــژوێ، کۆمەڵــەی ناوچەی بانــە و سەردەشــت لەناو دێ، مەقەڕێکــی گەورە و خۆشــیان هەبوو. لــەو مەقەڕانە بوو کۆمەڵە کردبوویەوە بۆ ڕۆژی مەبادا، تەنیا دوو پێشــمەرگەی لێ بوو، خەڵکی ئــالان بــوون و عەبدوڵلای ئێقدامــی خەڵکی بانە لە چریکــی فیداییەوە بووبوو بە کۆمەڵە، بە نێو کردبوویانە بەرپرســی ئەم مەقەڕە. نەدەبوو

له لای ئەو باســی هیچ بکەین. گوتمان بۆ جەوله و کاروباری ناوەندی ماوەیەک لێرە دەبین و جەوله دەکەین. زۆری حەول دا بزانێت کێین و بۆ هاتووین، فایدەی نەبوو. کاک عەبدوڵڵا مرۆڤێکی خۆبەزلزان و خۆی بە سەرکردە دەزانی، ئەمری بەسەر خەڵک و پێشمەرگەدا دەکرد، لەناو چریکەکانیـش هــەر بەرپرس بوو، چریکە فیدائییــەکان چەند ڕۆژ پێش خۆتەسلیمکردنیان بە حکومەتی ئێران، حامد بەگی جوانڕۆ، کە لە لایان ئەسـیر بوو، تەسـلیمی عەبدوڵــڵای دەکەن و خۆی لــێ ڕزگار دەکەن، ئــەوکات عەبدوڵڵا بەرپرســی چریکەکان دەبێت لە بانــە و ئیتر هەموو دەزانــن حامــد بــەگ زۆر بە گومناوی و بێکەســی لە بانە بە دەســتی چریکەکان کوژرا. عەبدوڵڵا پێی وا بوو بێتە ناو کۆمەڵە یەکسەر دەبێتە ســەرکردایەتی، کۆمەڵە لە بێژوێی دانابوو و بە ڕەواڵەتیش مەســئوول بــوو، بەوە ڕازیــی کردبوو. ئەویش بــە ڕۆژ ئەم دوو پێشــمەرگەیەی بــەدوای خۆیدا دەگێڕا بۆ بەر مزگەوت و چایخانە و کەبابخانەکەی ناو دێ و دەمانچــەی دەبەســت و غەبغەبی[1] شــۆڕ دەکــردەوە، بە دەنگی بــەرز لەگەڵ خەڵکدا قســەی دەکرد و ئەمر و نەهیــی دەکرد. لە دنیا و خەیاڵــی خۆیدا یەک لە ســەرکردە گــەورە و بەناوودەنگەکانی کورد و ئێران بوو. ئێمە هیچمان نەماندەناســی و ئەویــش هەر نەیدەزانی ئێمە کێین. وەســتا عەولا ناســراو بوو لە ئالان و لەناو کۆمەڵەش، عەبدوڵڵا دەیناســی و دەیزانی مەســئوول و ئەندامی کۆمەڵەیــە، بۆیە دەیزانی و گومانــی نەبوو ئێمە بۆ کارێکی گرنگ هاتووین و زۆری بە لاوە گرنگ بوو ســەر لە هەموو شــت دەربێنێت. زۆری بۆ گران بوو لەناو دێ و خەڵک، بێئاگاهیی خۆی دەربڕێت لەمەڕ ئێمە. خەڵک لەبەر ناکۆکییەکانی دێموکرات و کۆمەڵە پێیان وا بوو ئێمە هاتووین بۆ بەهێزکردنی مەقەڕی ئــالان و هەموو ئەم مزەلی لە شــانانە لەژێر فەرمانــی عەبدوڵڵادایین و ئەویش بە ئێمەوە فیزی دەفرۆشت، نە تەنیا نەیدەگوت ئەوانە عەلاقەیان

١- غەبغەب، گۆشــت یان پێســتی داچۆڕاوی ژێر چەنەی مرۆڤی پیر، یان قەڵەو.

بە منەوە نییە، بەڵکو ئێمەی بە پێشـــمەرگەی خۆی دەناســـاند و ئیتر لە دەســـەڵاتداری بەسەر دوو پێشمەرگەی هەواداری ناو دێوە بووبوو بە خاوەن پێشمەرگە و ئامر هێز!

کاک محەمـــەد مـــەلا عەلی، باوەڕپێکـــراوی ناوەندیـــی کۆمەڵە بوو، دەبـــوو ئەو بە کارەکەمان بزانێت و بەبێ یارمەتیی ئەو هاتوچۆمان بۆ عێراق بۆ نەدەکرا. ســـێقوڵی لەگەڵ وەســـتا عەولا و یونسدا چووین بۆ لای و وەستا عەولا ئێمەی پێ ناساند و کارەکەمانی بۆ باس کرد. بڕیار درا جارێ بۆ حەواندنەوەی پێشـــمەرگەکان هەر لە مەقەڕی بێژوێ بین و حەول بدەین لەگەڵ عەبدوڵلادا بســـازێین، کێشـــەی لەگەڵدا دروســـت نەکەین و خۆمان بە خوێندنەوە و کۆبوونەوەوە مژووڵ بکەین، هەتاکو لە سلێمانییەوە خەبەر دەگات.

مامۆســـتا مەلا ســـاڵحی نەغـــەدە خۆی لـــێ دەرچێت، بـــە کوڕان و کچانیـــەوە هـــەر هەموو کۆمەڵـــە بوون و یەک لە کوڕەکانی موحســـین ئەندامی ســـەرکردایەتی و لـــە کۆنەوە کۆمەڵە بوو، جەمیلەی کچیشـــی هاوســـەری عومـــەری ئیلخانیـــزادەی ئەندامی ســـەرکردایەتیی کۆمەڵە بـــوو. دوای هێرشـــی خومەینی بۆ ســـەر کوردســـتان، وەک پەنابەر و کەســـایەتییەکی ئایینیـــی کورد، لە عێـــراق پەنابەریـــی وەرگرتبوو و لە ســـلێمانی دانیشـــتبوو. کۆمەڵە لە ڕێگەی مەلا ساڵحەوە، چرای سەوزی لە لایەن حکومەتی عێراقەوە هەر لە ســـەردەمی کۆنگرەی دووەووە بۆ هەڵکرابوو، بۆیە ئێمەش هاتبووین تا ئیشەکە بەئەنجام بگەیەنین.

بـــۆ ئێمە، بێژوێ دێیەکی زۆر خۆش بوو، ڕۆژانە لە ناو مزگەوت و دوکانەکان خەڵکی زۆرمان ڕێگوزەر دەدیت، بە تایبەت پێشـــمەرگەکانی یەکێتی. چایخانە و کەبابخانەکەی جێی میوان و ڕێبواران بوو، دانیشتنی زۆر خۆش و پڕ لە خەبەروباس بوو.

خەبەرمـــان بۆ هات بچین بـــۆ ئەودیو، لە ڕەبایەی قورەینتێنان پێش مـــاوەت دەبـــوو چاومان بە یـــەک دوو کاربەدەســـتی حکومەتی عێراق بکەوێت. لە خوارەوەی بێژوێ ئەو شوێنەی دوو شاخەی زێی بچووک

تێکـەڵ دەبنەوە، دووئاویان پێ دەگوت، شـوێنی پەڕینەوەی ولاغداران بوو.

## مۆسیقایەکی بەخۆف

زسـتانێکی وەیشـوومە و تۆف بوو، بەیانی زوو شـەوەکی زۆر بە ئەسـپایی و بێدەنگی لەگەڵ کاک محەمەدی مـەلا عەلیدا بێژوێمان جێ هیشت و ڕوومان کردە سەر چەم. کاک محەمەد ئەسپێکی گورجوگۆڵی ئامـادە کردبـوو، کەرەسـەی ڕێ و خواردنـی لێنابوو، بە موشـەما و خێمەی سەرزین داپۆشراو و بۆ مەلەکردن تەیار کرابوو. بەبێ هەست و ئارامی گەیشـتینە سـەر دووئاوان، گرڤە و هـاژەی تێکەڵبوونی ئەو دوو چەمە بەم بەیانییە شـەوەکییە زووە، پشمینی جاروباری ئەسپ و بەریەککەوتنی تاقم و تفەنگی پێشمەرگەکان، مۆسیقایەکی بەخۆف و پڕ لە هیبەتی بە گوێ دەگەیاندین. ئەم خرۆشـانە و بینینی سـیم و حەبلی ئەمبەر و ئەوبەری چەمەکە بە سـەر ئەم ئاوە لێڵ و سـامناک و گرژ و تووڕەیـە، هەر هەموو بەیەکەوە تابلۆیەکیان نەخشـاندبوو پڕ لە بۆنی مەرگ، تێکەڵ بە ئامانجی شۆڕشگێڕیی ئێمەی لاوی گیانلەسەردەست.

یەکەم جار بوو پەڕینەوە لە چەم بە تەناف و سـیم ببینم و تاقیشی بکەمـەوە. لەگەڵ ترسـێکی لە ڕادەبەدەر لە لایەک، غروور و شـانازی و بیرخەرەوەی فیلمی پارتیزانەکانی شۆڕشـەکانی چین و یۆگوسلاڤی و زۆربەی نەتەوە بندەسـتەکانی هەموو جیهان لە دەیەکانی پێشـوو لە لایەکی ترەوە، لە پێش چاو و خەیاڵدانم، ئاوێتەی یەک دەبوون.

## چیمان لەوان کەمترە؟

دەموچاوی ڕەشـداگەڕاوی بە جامانە داپۆشراو، پوزەوانەی تا ژێر ئەژنۆ هەڵکشـاو، برۆ و سمێڵی لە سـەرما بەستوو، شەش مەخزەن و مزەلی لە شـان، ڕێک ئەو پارتیزانانە بوون پێشـتر لە کتێب و ناملیکەی شۆڕشەکانی گەلانی بندەست لە جیهان، ئارەزوو و حەسرەتی بینینیان

خولیای کات و ساتەکانمان بوون. جێی خۆی بوو بە سەری بەرز و پڕ لە هەست و لەخۆڕاپەڕموون بپرسین؛ ئێمە پێشمەرگەی کوردستان چیمان لە پارتیزانەکانی ماو، تیتۆ، گیڤارا، هۆشیمین و هەر هەموو شۆڕشگێڕانی جیهان کەمترە؟!

دەبوو پێش ڕووناکی یەک یەک بە کەڵەس[1] و پشتێندەکانمان، بەخۆ هەڵاوەسین، خۆ بدەینە بەر قەزاوقەدەر و بە چاوتروکاندنێک هەر وەک دەرچوونی فیشەک لە تفەنگ، خۆ بە گاشەبەردی ئەوبەری چەمدا بدەین.

ئەو ڕۆژە زیاتر لە پانزە پێشمەرگە دەبووین، بە ڕیز لەودیوی سنووری دەستکردەوە، لێوار و لێواری چەم، بە خاکی محەڕەمە[2] و سووتاوی وڵاتی کوردەواری و داگیرکراوی بێگانە، ڕەچەی بەفرێکی تا ئەژنۆمان دەشکاند و دەچووین بەرەو بارەگای داگیرکەر بۆ بەهاناهاتن و یارمەتیدانمان لە چنگی داگیرکەرێکی دیکەی نیشتمانەکەمان!

### قاوەڵتیی ناو بەفر

قەراغ و قەراغ بەرامبەر ئالانی ئەودیو ئالانی ئەمدیومان دەبڕی، بە سەدان جار کەوتین و هەستاینەوە، لە ناو بەفر شەڵاڵی ئارەقە بووین و پەنجەکانی دەست و قاچمان سڕ بوون و تەزین. بە دەیان گوندی سووتاو و خاپوورمان هاتنە سەر ڕێ و کاک محەمەد وەک مامۆستایەکی دیرۆک و جوگرافیا بەسەر زینی ئەسپەکەیەوە لە گێڕانەوە نەدەوەستا. شانەخسێ، چناران، گرگاشە، گوێزڵێ و ئاوکورتێ، گوندەکانی سەر ڕێمان بوون، هەتاکو ماوەت. بە چلەی زستان هەنار بە دارەوە بوو،

١- کەڵەس، پەت و تەناف بۆ ئەمسەر و ئەوسەری چەم ڕادەکێشن و پێی دەپەڕنەوە.

٢- محەڕەمە، خاکی محەڕەمە ئەو ناوچانە بوون لە باشووری کوردستاندا دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ و ڕێککەوتن و پەیمانی ئەلجەزایر لەگەڵ شای ئێراندا، ڕژێمی بەعس قەدەغەی کردبوو لە خەڵک و گوندەکانی ڕاگواستبوو بۆ ئەوەی پێشمەرگە تەریک بکاتەوە لە خەڵک.

گەڵی نێو داران بە بەفر پۆشراو و ئیی چەند ساڵی تێدا بوو، کانییەکان بە کۆنکریت داپۆشـــراو و دیوارە شـــکاو و ڕووخاوەکانی مزگەوتەکان بـــە پێوە بوون، بە پانیی بیســـت کیلۆمەتر و درێژایی ســـنوور، پەیمانی شـــوومی ئەلجەزایـــر ئەم خاکـــەی لە نێوان دوو پارچەی کوردســـتاندا، لە دانیشـــتوانی هەزاران ســـاڵەی کورد بەتاڵ و حـــەرام کردبوو، کورد بـــۆی نەبوو لەم ناوچانەدا ئاوی کانییەکانی خۆی بخواتەوە و هەنار و گوێز و هەنجیری خۆی لە دار بکاتەوە و تەنانەت گەڵای دارەکان بداتە بزنەکانی.

ئەم ڕێیە بە زستان بە ڕۆیشتنی پێشمەرگە زیاتر لە حەوت هەشت سەعات بوو، نیوەی ڕێمان بڕیبوو، لە ماندوویی و لە برسان وەستاین و جووڵە نەما، پیری جیهاندیدە، کاک محەمەد بە قامچی و قاچ و دەستی ئەســـپەکەی وەنێومان کەوت و هاواری لێ بەرز بووەوە؛ نەوەستین و جووڵە بکەین. بێتوو دانیشـــین و تخێڵ بین، تووشی قەرسان[1] و قاچ و دەســـت ڕەشـــبوون دەبین. ئێمە هەموو لە جووڵە وەستاوین و ئەویش لەســـەر پشتی ئەســـپەکەی دەنگمان دەدا و جاروبار قامچێکمان حەواڵە دەکات. وەک بەنزین بە دارێکدا بکەیت لەناکاو گڕ بەرز بووەوە، هەموو دارەکە گڕ گڕ داگیرســـابوو. لە ناو داربەڕوویەکدا گەڵییەکی دۆزییەوە و شـــقارتەی پێوە نا، یەک و دوو گرتی، لە خۆشـــیان و سەرسووڕمان هەموو زارمان داپچڕابوو، تینی ئاگر وردەوردە ژینی پێ بەخشیینەوە و دەموچاومان گەرم داهات، دابەزی و بە وزەی لاوێکی تازەپێگەیشتوو، ئەم پیرە هەڵۆیە لەپێشـــدا جۆرکەی لە ملی ئەسپەکەی کرد و بارەکەی داگرت، ئاوی لە کترییە ڕەشاندا وەسەر نا و نان و پەنیری بۆ هاویشتین، بـــە دەوری داربەڕووی داگیرســـاو دەســـتمان بە نـــان و پەنیر و گوێز خواردن کرد و چایەکەش پێگەیشـــت، ئای کـــە هەرگیز ئەم قاوەڵتوونە بەلەزەت و ســـەفایەم دوای ئەو ماندووبوون و هیلاکییە بیر ناچێتەوە،

---

١- قەرســـان، ڕەوتی سەهۆڵ بەستنی ئاو یان شـــلەمەنی، ویشکهەڵاتن لە سەرمان.

کاک محەمەد بوو هەموومانی لە قەرسان ڕزگار کرد.
بوژاینەوە و وەڕێکەوتین، دوای دوو ســێ سەعات گەیشتینە یەکەم پاســگەی عێــراق لە قوڕێنتێنان نزیــک ئاوکورتێ و مــاوەت. دەیانزانی ئێمە دەچین، لە دەرەوەی بارەگاکەیان، چا و قوتوو گۆشت و ماسی و شلەیەکیان دانابوو، دەیانخوارد، فەرمووی ئێمەیان کرد. کەسمان بێزمان نەهات بچینە پێش، حەوت هەشــت کەس بە دەوری تەشــتێکی لەوانەی جلی تێدا دەشــۆن هاڵابوون، هەر هەموو بەیەکەوە دەســتیان دەخستە ناو شلە و تڵێتەکە و بە مشت پاروویان دەخستە زار، شۆڕاوکەی شلە بە دەست و مەچەکیاندا دەهاتە خوار و بە زمان دەیانلێسایەوە، دیمەنی نانخواردنی ئەم جوندییانە بۆ ئێمەی ڕۆژهەڵاتی نامۆ و تازە بوو.
دوای فەترەیەک، بەرپرسێک پەیدا بوو گوتیان ئامر فەوجی ماوەتە، بەســتەیەکی پێ داین و چەند ڕاســپاردەیەک بۆ ناوەندیی کۆمەڵە. ئێمە زانیمــان بەســتەکە دینار بوو بــۆ یارمەتیی کۆمەڵە. دەبــوو بڕۆینەوە شــوێنی خۆمان بــۆ بێژوێ و واش بڕۆین بە تاریکــی بگەینە ناودێ و کــەس نەمانبینێــت. بە ڕێگــەی خۆماندا و بە خۆقایمکردن لە کەڵەســی سەرچەم، درەنگانی شەو گەیشتینەوە مەقەڕی بێژوێ، هەموو شەکەت و ماندوو و تەڕ.
بەیانــی زوو بەهمــەن و دوو پێشــمەرگە بــە ســیمورغ بــە پارە و ڕاسپاردەکان بەڕێ کران بۆ ناوەندی لە دەوروبەری بۆکان.
زســتان و تا ســەرەتای بەهار چەند جارێک بە هەمان شێوە عەینی ڕێگەمــان بڕی و هەر جارە بە ســاکێک پــارەوە دەگەڕاینەوە، هەرگیز نەماندەکردەوە و نەماندەزانی چەندە، بە نامەکانەوە یەکسەر دەماننارده ناوەنــدی. جارێــک گوتیان، دوکتــۆر جەعفەر بەرن بــۆ موفاوەزات لە کەرکــووک لەگەڵ موخابەراتــی عامدا. هەموو جارێــک داوای چەک و تەقەمەنــی دەکرا ڕەفزیــان دەکرد، دوکتۆرمان برد و هێناوە، شــەو لە بێژوێ شــاردمانەوە و بەیانی زوو بەردمانەوە بۆ ناوەندی. دوکتۆر بە پێکەنینەوە گوتی داوای بینینی ڕەئیســی کۆمەڵەیان کردووە، کە بچێت

بۆ بەغدا و پێیان وایە ڕەئیسی کۆمەڵە کاک سەلاح موهتەدییە!

لــە ناوەندی تەدبیریــان کردبوو، مادام ئەوان وای لێ حاڵین با کاک عەبدوڵلا بنێرن و بڵێین ڕەئیســی کۆمەڵــە، عەبدوڵلای موهتەدییە نەک سەلاح! ئەمە گرتی و کاک عەبدوڵلامان زۆر بە نهێنی چەند ڕۆژ لە ماڵی کاک محەمەد مەلا عەلی شــاردەوە و بە هەمان ڕێدا بردمانە ماوەت و سەیارەی تایبەتی بۆ هات و بردیان بۆ کەرکووک.

بە خۆشــحاڵییەوە گەڕایەوە و هێنامانەوە بۆ بێژوێ. گوتی، وەعدی چــەک و تفاقێکــی زۆریــان داوە و دەبێت خۆتان ئامــادە بکەن، کاری سەختی هێنانەوەی بارێکی قورس و زۆری چەک و ئەڕزاق، دەکەوێتە سەر شانی ئێوە.

**بەتەمای کەڵەگایەتی**

من هەر ڕقم لە چوونی حەمام بوو، ئەو ڕۆژە بە نابەدڵی لە مەقەڕی بێژوێ ئاوم گەرم کرد، یونس و وەســتا عەولا بۆ ئامادەکاریی زیاتری گواســتنەوەی چــەک و ئــەڕزاق، کە قەرار بــوو بە زوویــی بماندەنێ، چووبــوون بۆ ناوەنــدی. منیان جێ هێشــتبوو لەگەڵ پێشــمەرگەکان. ویســتم خۆم بشۆم، لە پشــت دەرگاوە یەکێک هاواری کرد زوو بگەیە خەریکە لەگەڵ پێشــمەرگەی دێموکراتدا ببێ بە شــەڕ! بەپەلە خۆم کۆ کــردەوە و ڕامکــرد بۆ لای مزگەوت و مەقــەڕی دێموکرات، کابرایەکی قەڵەوی سەردەشــتی، حەمەدەمینی مرادی بەرپرســیان بوو، دەیانگوت زەمانی شــا پیاوی چاک نەبووە و زوڵمی لــە توونتەوانەکانی ناوچەی سەردەشــت کردووە. عەبدوڵلای ئێقدامی بە خۆی و دوو پێشمەرگەوە چووبوو بۆ لای مەقەڕی دێموکرات و لەســەر کێشــەیەکی کۆمەلایەتی بە پۆز و فیزەوە بەسەر حەمەدەمینیدا دەخوڕێ. مەقەڕی دێموکراتیش لە بێژوێ تەنیا چەند پێشمەرگەی هەبوو، زۆریان بە لاوە گرنگ نەبوو. دێموکــرات زۆرتــر لە بێتوشــی ئالان لایەنگر و پێشــمەرگە و مەقەڕی گــەورەی هەبوو. لەو ماوەیەدا کە ئێمە وەک هێزێکی پۆشــتە و نیزامی

له بێژوێ بووین، حیزبی دیموکرات لەوپەڕی تەوازوع و سازان لەگەڵ کۆمەڵەدا دەجووڵاوە و هیچ کێشـــەیەکمان نەبوو. عەبدوڵلای بەرپرسی کۆمەڵــە لــە ئالان، کە ئێمە شــک دەبا، بــە خەیاڵی خــۆی و خۆنواندن بەتەمای کەڵەگایەتی لەبەر مزگەوت و مەقەڕی حیزب هەڵا و گرمەیەکی نابووەوە، بۆنی خوێنی لێ دەهات. هەموو پێشـــمەرگەکانی دەستەکەی خۆمـــان چوویـــن بۆ بەر مزگەوت، حەمەدەمینم دیت و زۆر شــڵەژاو و ترسابوو. گوتم، ئێمە بە نیازی شەڕ نین و شەڕ لەگەڵ ئێوەدا ناکەین و هەرچی بووە داوای لێبوردن دەکەین، مەلا و پیاوە ماقووڵەکانی ناو دێ هەموو پێشوازیی گەرمیان لە قسەکانمان کرد و هەر یەکسەر دوای ئەم قســـانە هەموو پێشـــمەرگەکان ســـەری خۆمان داخست و بەرەو مەقەڕ گەڕاینەوە و عەبدوڵلامان لەناو دێ بە تەنیا جێ هێشت. دوای ماوەیەک بە هانکەهانک و ماندوویی هاتەوە مەقەڕ و دەســـتی کرد بە شاتەشـــات و ئێوە ترســـنۆکن، وام دەزانی شـــێری بە گوێیان دەگرن و لەم قسانە، زۆر عەیبە بۆ پێشـــمەرگەی کۆمەڵە لەبەر دوو پێشمەرگەی دیموکرات چۆک دادەن و بترســـێن و بڕۆن! گوتم کاک عەبدوڵلا باشـــترە ســـەنگ و وەزنـــی خۆت بزانی، ئێمە نەهاتووین لێرە شـــەڕ بۆ گەورەخوازی و لەخۆباییبوونـــی تـــۆ بکەین، ئێمـــە لێرە کاری دیکەمـــان هەیە و هەرگیز شـــەڕ بـــۆ تۆ ناکەیـــن و عەلاقەی تۆمـــان نییە و ئیجازە نـــە بە تۆ و نە بـــە دیموکراتیـــش دەدەین، شـــەڕ بکـــەن! گوتی، ئەدی بـــۆ لێرەن و چی دەکەن؟! گوتم ئیتر ئەوە ئیشی تۆ نییە بیزانی، هەموو مەراقی ئەوە بوو بزانێت ئێمە چ کارەین، گوتم بەتەمای ئێمە شـــەڕ لەگەڵ مریشکێکیشـــدا مەکـــە، چونکـــە پشـــتت ناگرین، ئیتر هەر شـــێت بوو، چـــووەوە قاوغی خۆی، خەیاڵیم ڕاحەت کرد کە کۆمەڵە نە تەنیا لەســـەر ئەو شەڕ لەگەڵ دیموکراتدا ناکات، بەڵکو بۆ ئارامبوونی ئالان سازشیش دەکات.

# ٣٢

## گواستەوەی هاوکارییەکانی عێراق

بەهار بوو هەموو پێشمەرگەکان چووین بۆ ماوەت، لە دوو مەخزەنی زۆر گەورە، لە دەشتایی خوار ماوەت بە لێشاو ڕۆن، برنج، چا، ویشکە، چەک و فیشەک هاتبوو، هەمووی تەحویل وەرگیرا و تا گواستنەوەیان ئەو مەخزەنانەیان پێ داین. وا بزانم لەگەڵ کەریم ئیلخانی و پێشمەرگەیەکی دیکەدا بۆ چاودێریی مەخزەنەکان ماینەوە. وەستا عەولا و یونس بە پەلە گەڕانەوە بۆ بێژوێ و کۆکردنەوە و هەرەوەزی ولاغداران بۆ گواستنەوە.

دوو سێ ڕۆژی پێ چوو، بە ڕۆژ جاربەجار یەکمان دەچووین بۆ ناو شارۆچکەی ماوەت، بۆ کڕینی پێداویستی و جگەرە، وەکی تر دەرگای مەخزەنەکانمان لەسەر خۆمان دادەخست و لە ناوەوە کێشکمان دەکێشا و خۆمان کەمتر بە خەڵک نیشان دەدا. بەیانییەکی زوو یونس و پێشمەرگەکان بە دەیان ولاغدارەوە پەیدا بوون، لەبەر دەشتاییەکەی ماوەت هاتوهاوار و بەزمێک بوو، هەر مەپرسە، بە دەیان ئێستر و ئەسپ لەو دەشتە بڵاو بووبوونەوە و خەریکی لەوەڕ بوون لەو سەوزایی و مێرگ و گوڵ و گیایە، ولاغدارەکان خەریکی نان و چا خواردن و خۆئامادەکردن بوون بۆ وەرگرتنی بار و گەڕانەوە، پەلەپەلە و هاتوهاواری ولاغداران بۆ زوو گەیشتن و وەرگرتنی باری زۆرتر، خەریک بوو سەرمان لێ بشێوێت و کۆنترۆڵمان بۆ نەکرێت. وەعدمان بە دەوڵەتی عێراق دابوو، خەڵک بۆ شتکڕین نابێ بچن بۆ ناو ماوەت و تەنیا بێنە مەخزەنەکە و بار وەرگرن و یەکسەر بگەڕێنەوە. دەستمان کرد بە پسوولەی بار و ناونووسین، هەر ولاغدارێک بە وەرەقە بارمان پێ دەدا و بەڕێمان دەکرد بۆ پاوێ لە خوار بێژوێ، لەوێش لژێر خێمەدا

بارەکانیــان لێ وەردەگیــرا و وەرەقەیەکی گەڕانــەوە و بارەکەیان پێ دەدرا و ئیمزا دەکرا. لەپێشــدا دەســتمان کرد بــە ناردنی خواردەمەنی و ئــەرزاق، دەبــوو سیســتمێکی گونجــاو و جێی متمانە بــۆ چەکەکان بدۆزینەوە. بە دەیان وڵاغدار ناوی خۆیان دەنووسی بۆ ئەوەی باریان پێ بدەین. دەستەکەی من لە ماوەت و یونس لە بێژوێ ڕۆژانە خەریکی ناردن و وەرگرتنەوە بووین. ڕێگەی نێوان بێژوێ و ماوەت پڕ لە وڵاغ و وڵاغدار بوو، یەک دەهات و یەک دەڕۆیشت. بۆ پەڕاندنەوەی بارەکان لە دوو شوێن لەسەر چەمەکە، کەڵەسی تر داندران. پێشمەرگەکانی هەر دوو دەســتە کفت و شەکەت بوون، گواســتنەوەی ئەم هەموو ئەرزاقە بە باری وڵاغان تەواوبوونی نەبوو، زۆرم حەول دا لەگەڵ دا بەرپرســانی عێراقیدا، بەڵکو بە زیل و لۆری یارمەتیمان بدەن و تا سەر چەمەکەمان بــۆ بگوازنــەوە، نەیانکرد و گوتیان، دوای مــاوەت خاکی محەرەمەیە و پــڕە لە «موخەڕیب»، بە پێشــمەرگەی یەکێتی و باشــووریان دەگوت، گوتــم لۆرییەکان بدەنە خۆمان قبووڵیان نەکرد، تەنیا ڕێگە گواســتنەوە بــە وڵاغ بــوو، بــۆ زوو تەواوبوون وەســتا عەولا و یونــس لەودیو و دێهاتی دەوروبەر دەیان وڵاغداری تریان نارد، ئیشەکە زۆر بە سستی دەڕۆیشت، لەبەر دووریی ڕێ و کردنەوەی بار و بە کەڵەس پەڕاندنەوە و دیسان بارکردنیان بۆ پاوێ لە بێژوێ. وڵاغدارەکان هەرچەند خۆیان دەپســاند و بەغار دەهاتن و دەچوون، نە ڕەحمیان بە خۆیان دەکرد و نە بە وڵاغەکانیان، تەنیا لە شەو و ڕۆژدا یەک کەڕەتیان پێ دەکرا. ئیتر دوای سێ چوار مانگان، ئیشی ئێمە لە عەبدوڵلا و هەموو خەڵک ئاشکرا بوو، کە ئێمە خەریکی چ بووین و بۆ لەوێ بووین!

### فرۆشتنی هاوکارییەکان

لــە مــاوەی دە پانــزە ڕۆژانــدا بــە دەیان تــەن ویشــکە و ئەرزاق گواسترانەوە بۆ بێژوێ، موشکیلی گەورە کاتێک دروست بوو دەشتایی پساوێ پڕ بوو، بــۆ ئەنبارکردنیان جێ نەما. کۆمەڵە حیســابی کرد گەر

بێتــوو هەموو ئەم ئەرزاقە بگەیەنێتە ناوچە و مەقەڕەکانی کۆمەڵە زۆر گرانتر دەوەســتێت لەوەی هەر لەویَ بیکــڕن، لەوانە بوو کیلۆیەک چا، ڕۆن و برنج دووقاتی تێبچێت تا دەگاتە ناوچەی مەهاباد و ســنە، یان مەریوان و زۆر گرانتر لەسەرمان بوەستێت. پێشنیاریان بۆ ناردبووین گــەر بکــریَ هەر لە بێژویَ بیانفرۆشــین و پارەکــەی بنێرین بۆ مەقەڕ و ناوچەکانــی کۆمەڵە لە کوردســتان. یونس و وەســتا عــەولا لەودیو تــا بۆیان کرا دەســتیان بە فرۆشــتن کرد. بەوە تا ڕادەیەک موشــکلی گواستنەوە بۆ خوارەوەی کوردستان و مەقەڕەکان کەم بووەوە، لەگەڵ ئەوەشــدا وەک شــاخێک لە ژێر خێمە لە پاویَ ئەرزاق هەڵدرابووەوە و شەو و ڕۆژ دەستەکەی یونس لە حەراسەتدا بوون.

### گۆڕی شەهیدێکی غەریبە

ئێوارەیەک لە مەخزەنەکانەوە چووم بۆ ناو ماوەت بۆ شــتکڕین بۆ خۆمان، لە دوکانێک لە ســەرەوەی جادەکەی ناوشــار لام دا، پیاوێکی بەتەمەنــی نێوچاوان جوانــی کەڵەگەت، پێچ و جامانە و کەواوپانتۆڵێکی زۆر جوان و خاوێن لەبەر لەویَ بوو، دەســتی بە قســە و پرســیاران کــرد، دیار بــوو دەیانزانی ئێمە کێین و بۆچی لەوێین. نەمشــاردەوە و گوتم پێشمەرگەی کۆمەڵەی ئێرانین و دەوڵەتی عێراق یارمەتیمان دەدا بــۆ لێدانــی خومەینــی. گوتی، مــن فەتحولاغام. هاتە دەر لــە دوکانەکە و دەســتی ڕاداشــت بۆ کێــوەکان و گوتی خەڵکی هۆ ئــەو دێیەم دڕی ناوە، کوڕێکی ئێوە ســیَ چوار ســاڵ پێش لە ١٩٧٨دا لەگەڵ کوڕەکەی من، ئەحمەد و چەند پێشــمەرگەی دیکەی یەکێتی نیشتمانی لە ناو دێ، بەرێبەیــان جــاش و جەیش هاتنە ســەریان و شــەهیدیان کردن. زانیم مەبەســتی کاک خانەی موعینیە، گوتم؛ ئەدی مەیتەکانیان چیی لیَ هات و ئێمــە هیچ لە مەیتی کاک خانە، کە ســەرکردەی ئێمــە بوو، نازانین؟! لەگەڵمــدا هاتە خوار و گوتی با بڕۆین. دوای کەوتم بەرەو گوڕســتانی ماوەت لە خوارەوە، چووینە ناو قەبرەکان و لەســەر قەبرێک وەســتا،

بەردێکی ڕەشـــی تەنک کێلی بوو، بـــە خەتێکی خواروخێچی منداڵانە بە ڕەنگێکی سپی لەسەری نووسرابوو؛ «گۆڕی شەهیدێکی غەریبە»!

بە پەلە لە ترسی حکومەت و پیاوخراپان بەرەو ماڵان گەڕاینەوە. وا دیارە و بەگوێرەی ئەم زانیارییانەی دواتر لە مامۆسـتا حوسـێن برای شـەهید غەفور ژاژڵەیی و کاک شـوان برای شەهید عوسمانی عەریف مەجید دەسـتم کەوت؛ مەفرەزەیەکی دە دوانزە کەسـی بە فەرماندەیی شەهید ئەحمەد فەتحوڵا کە چەند ڕۆژێک بوو کاک خانە بە نەناسراوی (بـە ناوی قـادر) لەگەڵیـان کەوتبوو، تـا بیگەیەنن بە سـەرکردایەتیی یەکێتی، لە گوندی دڕی شـەو دەمێننەوە و بەیانی زوو جاش و جەیش دەوریـان دەدەن و لـە یەکـەم تەقەدا کاک خانە کە بـێ چەکیش دەبێ، شەهید دەکەن و چەند سەعاتێک شەڕ دەبێ. شەهیدان خانەی موعینی، ئەحمـە فەتحولا، عوسـمان عەریف مەجیـد، فەریدوون حاجـی برایم، جەزا مسـتەفا ماشانی و محەمەد حاجی عەلی سەراوی ماوەت شەهید دەبن و چوار پێشـمەرگەش بە دیل دەگیرێن. ئێوارە دوای کشـانەوەی جەیشـەکە دەنێرن مەیتی عوسـمان عەریف مەجید بێننەوە بۆ ماوەت، بـە هۆی وێکچوونی لەگەڵ کاک خانەدا مەیتی خانە بە جێی عوسـمان دێتەوە ماوەت، دایکی شەهید عوسمان دەڵێ ئەوە کوڕی من نییە. کاک خانە لە ماوەت دەنێژن و پێنج شـەهیدەکەی دی لە داروشەخسـەکەی دڕی بە خاک دەسپێرن. لە خۆشیان کە گۆڕی کاک خانەم دۆزیوەتەوە، بـە پەلە سـەرکردایەتیی کۆمەڵەم ئاگادار کرد، کـە گۆڕی کاک خانەی موعینی لە قەبرسـتانی ماوەتە، دواتر هەموو بەرپرس و پێشـمەرگەی کۆمەڵە دەهاتن و ئێسـتاش گۆڕی کاک خانە لە ماوەت هەموو سـاڵێک لە ڕۆژی پێشمەرگەی کۆمەڵەدا جێژوانی هەموو ڕێبوارانی ڕێگەی ئەم شەهیدە مەزنەی کوردستانە.

دۆسـتایەتیی مـن و فەتحولاغا و دووبارە دیتنـەوەی لەناو بازاڕی سـلێمانی هـەر بـەردەوام بـوو، لەگەڵ دوکتـۆر مەحمـودی کوڕی و کوڕەکانی دیکەشیدا هەر دۆست و ناسیاوی یەکین.

### گواستنەوەی چەک و تەقەمەنی

دوای کێشانەوەی هەموو ئەرزاق و کەلوپەلی تر دەبوو دەست بکەین بە ڕاگواستنی چەک و تەقەمەنی، چ لە باری قورسی و زۆریی حەجم و چ لە باری ئەمنیەوە، کارێکی ئاسان نەبوو بەو ڕێگە دووردرێژەی ناو خاکی محەرەمە چەک و فیشەک بدەینە دەستی ولاغدار، بەم کارە هەم گیانی ولاغدارەکانمان دەخستە مەترسی و هەمیش بارەکانیان. سەرکردایەتی بڕیاری دا هەر ناوچەیە بێت و خۆی بەشی خۆی بەرێ و خۆی بەرپرسی ڕاگواستنی بەشی خۆیان بن، چ بۆ کەرەسەی ڕاگواستن و چ بۆ ئەمنییەت.

هەر ڕۆژە ناوچەیەک بە دەیان پێشمەرگەوە پەیدا دەبوون، بە لیست و ژمارە بەشی خۆیانمان پێ دەدان و لە ماوەی کەمتر لە هەفتەیەکدا، هەموو مەخزەن بەتاڵ کران و ئێمەش گەڕاینەوە بۆ بێژوێ. فرۆشتنی ئەرزاقەکە بە خەڵک و بازرگانەکان بە هێواشی دەچووە پێش و لە پاوێ هەر مابوونەوە. دڵنیام بەس نازانم چەندی، بەشێکی باش لە ئەرزاق و تەقەمەنییش درایە یەکێتی و مام جەلال، هەڵبەت دەبوو زۆر بە نهێنی بێت، سەدام زانیبای ئیتر ئەم خوانە بۆ کۆمەڵە نەک تەنیا نەدەما، بەڵکو تووشی غەزەبیشی دەبووین!

### شەهیدی سەر سنوورە دەسکردەکان

بە درێژایی زستان و بەهاری ٦١-١٣٦٠ (١٩٨٢) ئەم دوو مەفرەزەیە بە سەرپەرشتیی وەستا عەولا و کۆمیتەی سێ کەسی یونس و من، زیاتر لە پێنج مانگ بۆ پەیوەندیی کۆمەڵە و دەوڵەتی عێراق بێ پشودان کارمان کرد و هاتوچۆی پڕوکێنەر لە وەیشوومەی زستان و کار لەگەڵ توێژێکی بڵاوی کاسب و ولاغدار و خەڵکی ئالاندا بوو بە ئەزموون و سەرمایەیەکی گرانبەهای ژیانم. هەموو پێشمەرگەکانی هەر دوو دەستە، یەک لە یەک ئازاتر و پیاوی تەنگانە و خۆشەویست و یەکدڵ و

یەکگیان بووین، هەرگیز هەستمان نەکرد کێ مەسئوول و کێ بەرپرسە، وەستا عەولای ڕەبەت، شەهید خالد فەرهادزادە کە زۆر بەداخەوە، ساڵێک دواتر لە بیستوشەشی مانگی گولانی ١٣٦٢ (١٦-٥-١٩٨٣)دا هەر لە هەمان جێ و مەودایەک سەرتر لە خوار گوندی تییەت لە ئالان، لەو سیمەی دوو سنووری دەستکردی بەیەکەوە گرێ دەدایەوە، کەوتە خوار بەسەر گاشەبەردەکانی چۆمی کەڵوێدا و گیانی بۆ ڕێبازی بەرز و پیرۆزی بەخت کرد. یەک لە مرۆڤە پاک و بێدەعییەکان بوو، هەرگیز لە یاد و بیرەوەرییەکانمدا ون نابێت.

### بەروبوومی حزب بۆ برای سکرتێر

لەو ماوەیەدا کە پەیوەندیی کۆمەڵە و دەوڵەتی عێراق ڕێک خرا، هەر لە دەسپێکدا، پێش ئەوەی هیچ یارمەتییەکی چەک و ئەڕزاق بگاتە لای ئێمە، دوو لە براکانی کاک عەبدوڵلا، محەمەد و عومەر موهتەدی بە عێراقدا بەڕێکران بۆ سوید و دەتوانم بڵێم یەکەم بەروبوومی ئەم پەیوەندییە بەر براکانی سکرتێری کۆمەڵە کەوت.

### تەشکیلاتی نوێنەرایەتی لەگەڵ عێراقدا

دوای گواستنەوەی ئەم کاروانە قورسە و ئەزموونی پەیوەندی بە دەوڵەتێکی بێگانە و داگیرکەری کوردستان، ناوەندی بە تایبەت داوای لە من و یونس کرد لە تەشکیلاتی نوێنەرایەتی لەگەڵ عێراقدا بمێنینەوە و درێژە بە خەباتی شۆڕشگێڕیمان لەم بوارەدا بدەین. وەستا عەولا مایەوە و بە زوویی مەقەڕی کۆمەڵەیان لە سلێمانی کردەوە و کەیان فەرزادیان هێنا بۆ ئەوەی لەگەڵ وەستا عەولا بەرپرسی مەیدانیی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی عێراق و کۆمەڵە بن. لە بێژوێ ئەو چەند پێشمەرگەیەی ناوچەی مەهاباد، یونس، بەهمەن، من و دووی دیکە کۆبووینەوە، داوای سەرکردایەتی، کە لێرە بین و درێژە بدەین بەم کارەمان باس کرد، هیچمان ڕازی نەبووین، پێمان وا بوو بە مانەوە

لــه ســلێمانی و کار لەگەڵ پەیوەندییەکانی عێـراق و کۆمەڵەدا لە ژیانی پێشــمەرگایەتی و شۆڕشــگێڕیمان دوور دەخاتــەوە. دوکتۆر جەعفەر هــات بۆ بێژویَ و زۆر بە تونــدی گوتی، دەبیَ ئێوە بە تایبەت بەهمەن و یونــس و مــن لێرە بمێنینەوە، هەرســێکمان زۆر بە ڕاشــکاوی و بە بڕیار گوتمان، مومکین نییە لەم ئۆرگانەدا کار بکەین و ئێمە حەزمان لە پێشــمەرگەی سەنگەرە و دەگەڕینەوە ناوچەی مەهاباد و ئەوان زۆرتر پێویستیان بە ئێمەیە، لێرە دەیان کەس بە مەمنوونی ئامادەن کار بکەن، بە تایبەت لەمەودا قەرارە بچنە ناو شــار و ئیدارەی مەقەڕی ســلێمانی بدەن. زۆری هێنا و برد هیچ فایدەی نەبوو، ئێمە هەر پێنج پێشمەرگەی ناوچــەی مەهابــاد بــە تووڕەیی و بە پێیــان لە شــاخی هۆملمان دا و بــە گیرفانی بەتاڵ خۆمان گەیاندە جادەی سەردەشــت و لەوێشــڕا بۆ حاجیاڵیکەنــد و ناوچــەی مەهابــاد. نازانم بۆ، بەڵام هەموو هەســتمان دەکرد بارێکی قورس لەســەر شــانمان لاچوو، هەست و چاوشۆڕی لە ئاست هاونیشتمانییەکانی باشــوور، مەبادا بە خەیاڵیاندا بێت هاوکاری جەللادەکانیانین، هەموو ساتێک ئازاریان دەدام!

# ٣٣

**گواستنەوەی ئەقڵی فارسی**

بە گەیشتنەوەمان بۆ ناوچەی مەهاباد و دیداری ئازیزانی گیانیبەگیانی لە لایەک و لایەنگرانی «بینشــی نوێ» و خەتی مەنســوور حیکمەت و دژە پۆپۆلیزم لە لایەکی دی، بوو بە هەوێن و ســەرەتای ژیانێکی دیکە لــە خەباتــی ناو کۆمەڵەمان. لــەو ماوەیەدا کــە دوور بووین لە ناوچە، کۆمەڵێــک گۆڕانکاری ڕوویــان دابوو، لەژێر نــاوی بەگژداچوونەوەی پۆپۆلیزم و بەباوبوونی ڕوانگەگەلی مەنسوور حیکمەت و جەماعەتەکەی، کۆمەڵێک لە هاوڕێیانمان کە باشــمان دەناســین و ئەوانەی بە درێژایی پێشــمەرگایەتی تەقە لە هەر کوێ بایە، ئەوان لەوێ نەبوون و مەنگوڕ گوتەنی: «لە ترســی گێرە بووبوونە وشتر»، مەیداندار و دەم لە پێشی ناوچە بوون.

دوای یەکەم کۆنگرە بە بەشــدارییی تەنیا دە کەس لە ئاخری پاییزی ١٩٧٨دا، ئێســتا ئیتر کۆمەڵە لە ڕێکخراوێکی بچووک و داخراوی چەند ڕۆشنبیری کوڕە دەوڵەمەند و بۆرژوا و دەرەبەگ، کۆنگرەی دووی بە زیاتر لە پەنجا شەســت ئەندام گرتبوو، خاوەنی هەزاران پێشــمەرگە و هەوادار و لایەنگری شار و لادێ بوو، ناوچەگەلی ئازاد و ژێردەسەڵاتی خۆی هەبوو، بەشــدارییی لە وتووێژی میری کردبوو، ســەدان شــەڕی خوێناویی لەگەڵ حکومەت و ململانێ لەگەڵ گەورەترین هێزی چەکداری کوردستاندا واتا حیزبی دێموکراتی تێپەڕاندبوو. وای لێ هاتبوو لەگەڵ دەوڵەتێکــی گــەورە و نەیاری ئێران وەک عێــراق، پەیوەندیی هەبێت و هەمــوو لایەنەکان حیســێبی بۆ بکەن. ئــەم ئاڵوگۆڕییــە گەورەیە هەر هەمووی لە ماوەیەکی کورتی تەنیا سێ ساڵیدا هاتبووە سەر کارنامەی کۆمەڵە و سروشتی بوو ئەو هەمووە گەورە بوونەوە و دەسەڵاتە بەم

چەند کەســەی بەشدار و سەرکردایەتیی یەکەم کۆنگرە هەزم نەدەکرا، ئــەوەی لە ئاخر ڕۆژەکانی پاییزی ١٩٧٨دا بە خەونی شــەوانی ئەم دە کەســەدا نەدەهــات، زۆر زیاتــر و بگــرە بە پانەوە دێوی دەســەڵات و لەخۆباییبوونیان بینی لە بن ڕێسمەی دەرگاکەیان تخیڵ بووبوو.

بۆیە لەم ڕوانگەیەوە، کە لە ماوەیەکی سێ ساڵیدا لە کوێڕا هاتوونەتە کوێ، کەڵکەڵەی ڕابەری و خولیای گەورەی بوون، چیتر بەم ســنوورە بەرتەســکانەی کوردســتان و یــەک دوو شــار و ناوچــەی ڕۆژهەڵات دانەدەمرکا و لەناکاو، بای بڵێندایی سەر و دڵی گرتن و خەونی ڕابەری هەموو ئێران بە سەرکردایەتیی حیزبێکی تەواو کۆمۆنیستی دەستکردی خۆیــان، کەوتــە ڕۆژەڤیــان. بۆ ئەم حــەز و خولیایەش بــە دڵنیاییەوە پێویستیان بە کەرەستە و ئامراز و خوێنی جیاواز و تەنانەت عەقڵییەتی فارسی و ئێرانی بوو.

ئــەوان، ســەرکردایەتیی ئەوکاتــی کۆمەڵە بۆ ئــەم زرەخەونە، زۆر شــتیان هەبوو، هێزی پاڵەوانی پێشــمەرگە، ناوچەی ئازاد، پول و پارە، عیلاقــات و ئیعــلام، خەڵکــی زۆر و پڕ لــە عەتف و لایەنگری شــار و گونــدەکان، بــە کورتی لــە هیچیان کەم نەبــوو. بە خەیاڵــی خۆیان بۆ ڕابەریی گشــت ئێران، تەنیا نەبوونی عەقڵی فارســییان لا حەســرەت و عوقدە بوو. ئەم کەمایەســییەش بە مەنســوور حیکمەت و ژن و برا و خزمەکانــی پڕ دەبــووەوە. بە پەلە ئەم کارەش کــرا و دوو مەفرەزەی گیانلەسەردەســتی کۆمەڵە، لە شــنۆ و شــارویرانەوە بە چلەی زستان و بەفرێکی زۆری موکریان بە کۆڵیان، عەقڵی فارســییان گواســتەوە بۆ ناوەندیی کۆمەڵە. ئیتر وردەوردە ئامراز و کەرەســە و پێشــبڕەکانی[1] ڕابــەری هەمــوو ئێران لــە لادێیەکی چەنــد ماڵیی مێشــکەپە لە ئالانی سەردەشتەوە، بە ناوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ئامادە دەبوو.

دەنگــۆی هاتنەگۆڕینــی عەقڵییەتی سیاســی و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵە زۆر زوو هەموو لەشولاری ڕێکخراوەیی گرتەوە. سەیروسەمەرە ئەوە

---

١- پێشبڕ، بەرایی، پێشەکی، موقەدەمە.

بــوو کۆمەڵــە خەڵکێک زۆر بە پەلە و بە گەرمی بەرەوپیری ئەم تیۆری و ڕوانگەیــە کڵپەیــان ســتاندبوو. زۆربەیان ورەنــزم و نەخوێندەواری نــاو چینوتوێژەکانــی پێشــمەرگەی کۆمەڵە بــوون. مەبەســتم ئەوەیە بڵێــم زۆر بــوون ئەوانەی لە فورســەتێکی وا زێرین دەگەڕان زەعف و کەموکوڕییەکانی ژیانی پێشمەرگایەتییان بە شتێک پڕ بکەنەوە و لە پشت دیواری کۆمۆنیســت و ڕوانگەی نوێی کۆمەڵە نە تەنیا خۆیان حەشــار بــدەن، بەڵکو ببنە هێرشــکەری فکری و تۆڵەســەندنەوە لە هەموو ئەو کادر و پێشمەرگانەی بە ورەبەرزی و ئازایەتیی شۆڕشگێڕانەیان ناو و ناوبانگی باشیان بۆ خۆیان چێ کردبوو، لەمێژ بوو بە حەسرەت بوون وەک ئــەوان بوونایە. لە لایەکی دییەوە زۆر بوون ئەو پێشــمەرگانەی شــەو و ڕۆژ لە خزمەت ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی پێشــمەرگایەتیدا بوون، لە هێرش بۆ سەر مۆڵگەکان، مەفرەزەکردنی ناوشار، کەمینەدەرکردن و شەڕی دەستەویەخە و بەدەمەوەچووی خەڵکی لادێ و هەژارەوە بوون و هیچ بە لایانەوە گرنگ نەبوو موزایدەکردن و خۆهەڵاوەســین بە فکر و ڕوانگەی فڵان ســەرکردە و فڵان تازەهاتووی سەهەندی و ئیتحادی موبارێزان و تیۆریســییەنەکانی حیزبی کۆمۆنیستیی لە تارانەوە هاتوو. ئــەوان پاک و بێڕیا و منەت، ئەرکی شۆڕشــگێڕی خۆیــان ڕادەپەڕاند. ئێســتا دوای زیاتر لە ســی ســاڵ کە ئــەم دێڕانە دەنووســم، زۆربەی ئــەم پاڵەوانانە لە حەیاتــدا نەماون و لە ڕێگەی ئازادیی کوردســتان و پەرەســەندنی هەژمۆنــی ئەوکاتی کۆمەڵەدا شــەهید بــوون و پێیان وا نەبــوو ئەوانەی لە تارانەوە هاتن بە گێلەپیاویی ئەوانەی خۆمان، دەبنە خاوەنــی کۆمەڵە و بە ناوی «ناســیۆنالیزمی پیســی کــوردی» هەموو خەبــات و ڕابــردوو، تەنانەت خوێنیشــیان دەســڕنەوە، بێگانــە دەبێتە خاوەن ماڵ و لەوپەڕی بێشەرمیدا دەفەرموون: «ناسیۆنالیستەکان، کە لە دەرگاوە دەریان دەکەین بە پەنجەرەدا دێنەوە ژوور و لە پەنجەرەوە فڕێیان دەدەین بە دەرگادا خۆی پێدا دەکەنەوە»!

### دەستپێکی تەکەتول لەناو کۆمەڵەدا

دوای سێ چوار ڕۆژ لە هاتنەوەمان بۆ ناوچەی مەهاباد و حاجیاڵیکەند و بیستنی قسە و باسان، بۆ یەکەم جار لەناو کۆمەڵەدا هەستم بە جەناح و تەکەتـول و دووبەرەکی لەناو ڕیزەکانمانـدا دەکرد، ئەو هاوڕێیانەی لە سـەردەمێکدا هەموویان گیانێک بوون لە چەند جەستەدا، ئەوە ئێستا خەریکـی زەمکردن و یەکتر تاوانبار دەکەن بە پۆپۆلیزم و دواکەوتوو، تەنانەت پایگاه فرۆشـتن! تێنەدەگەیشـتم بـە ماوەیەکی وا کورت چۆن دەکرێـت ئەدەبیاتی خۆشەویسـتی و هاوڕێیەتی و فیـداکاری بۆ یەک، جێگۆڕکێـی کردبێت بە ئەدەبیات و زمانـی زبر و ڕق و تاوانبارکردنی یەک؟!

ئێمـە ئاگامـان لە خۆمان نەبـوو، تومەز هەموو چاویـان لە ئێمەیە بزانـن سـەر بە کام بـاڵ و بەرەین و بـە لای کێدا دەکەویـن. لەولا و ئەملا، لە دوکانی حوسـێنی کوێخا سـمایل و لە مەقەڕ، گوێمان لە تانە و قسـەگەلی وەک؛ سـەردەمیان بەسـەرچوو، ناسـیۆنالیزمان ناشت، پۆپۆلیستەکان جێیان نابێتەوە لەناو کۆمەڵە و... دەبوو. هەزاران قسە و قسـەڵۆکی منداڵانە و بێبنچینە و خاو، بووبوو بە ئەدەبیاتی بەشـێک لە پێشمەرگەکان و تەنانەت نووسینیشیان.

کاتێک بۆ یەکەم جار بیستم و دیتم سەید ئەندامی ناوەندیی کۆمەڵە و بەرپرسـی ناوچـەی مەهاباد، لە لای من و چەند کەسـی دیکە، باس و غەیبەتـی ئەندامێکی تری ناوەنـدی و بێئاوەزی و کەموکووڕییەکانی دەکرد، بە واتای وشـە خەریک بوو ئەسـتووندەکی هەر هەموو هیوا و خەونەکانم تێک دەڕما و دەشـکا. ئاخر کاڵفامی و خراپ تێگەیشـتنمان لـە حیـزب وای کردبـوو پێمان وا بێـت حیزب هەرگیز خەتـا ناکات و شەرتی وەفاداری و خزمەت ئەوەیە بە هیچ کلۆجێک ڕێگە بە ڕەخنە لە حیـزب نەدەین، حیزب لای ئێمە لە نیشـتمان و خاک و وڵات و نەتەوە گەورەتـر بـوو، پێمان وا بوو گەر حیزب نەبێـت، هەڵبەت ئەویش تەنیا حیزبەکـەی من، ئەوە ئیتر هەموو هیوا و خەونەکان دادەڕمێن. ئێمە بە

گشتی، تەنیا سەرباز و خزمەتکاری حیزب نەبووین، بەڵکو دەروێشێکی بێمێشک و ڕۆبۆتئاسا بووین کە هەر هەموو چەمکەکانی ئازادی، ڕزگاری، نیشتمان، نەتەوە و تەنانەت پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیشمان لە حیزبدا دەدیت.

## بازرگانی کەشتییەکی شکاو

دووبەرەکی و تەکەتولاتی دوای کۆنگرەی دوو، دەنگۆی تیۆرییەکانی مەنسوور حیکمەت و جەماعەتەکەی، بەرۆکی کۆمەڵەی گرتبوو، خەریک بوو نیشانەکانی دەردەکەوتن و لە هەموو بوارەکانی ژیان و بەردەوامی گەشەی ڕێکخراوێکی خنجیلانەی کوردیی وەک کۆمەڵەی دادەوەشاند و لە بەریەکی هەڵدەوەشاند. گرنگترین چەمک و شەرتی کاری سیاسی واتا متمانە و سەرڕاستی و پاکی لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵک و ئەندامانـدا، خەریک بوون لە دەریای چەواشەکاری، خۆبەزلزانی و تەماح و خۆلەبیرچوونەوە نوقم دەبوو. لە هەڵسەنگاندنییەکی سانا و پێداچوونەوەم بۆ ماوەی خزمەت و پێشمەرگایەتیم لەناو کۆمەڵە، خۆم وەک «بازرگانێکی کەشتیی شکستە» دەهاتە بەر چاو و نائومێدی و بێهیوایی، سەراپای دەروونی گرتبووم. خەریک بوو لەناو خۆم دادەوەشام و دەرووخام و شەشدەرەکانی هیوا و ئاواتی دواڕۆژم یەک بەدوای یەکدا لێ دەگیران.

## هەر من باشم بۆ بەڕێوەبەری ناوچە

کۆمیتەی ناوەندی بەرپرسی تازەی دانا بوو بۆ ناوچەی مەهاباد، کاک موحسین ڕەحیمی و سەید خالید سیادەت وەک بەرپرس و ئەندامی کۆمیتەی ناوچە، خەڵکی نەغەدە و بۆکان بوون. کۆمەڵێک کادری تری نیزامی و سیاسییش لە ناوچەکانی سنە و ڕەبەت و سەردەشت هاتبوونە ناوچەی مەهاباد، کاربەدەست و مەسئوول بوون. سەید ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسی ناوچەی مەهاباد لە هەوەڵەوە،

بەم بڕیارە ڕازی نەبوو، بە بیانووی نەخۆشـی لە ماڵێک لە حاجیالکەند کەوتبـوو، بـە هەموو توانایەوە و بـە یارمەتیی ئێمە کۆنە پێشـمەرگە ناسـراوەکانی ناوچە وەک ڕەحیـم قادری، کەمال وەلیانـی، پیرەهەڵۆ، یونس پاڵەوانی، سـیامەند، ڕەحیم بابەتاهیری، کەریم ئەفسەر، ئەحمەد خاکی و زۆری ترمان، خەریکی بانگەشـە و لێدان بوو لە موحسـین و دەرپەڕاندنـی لە ناوچـە. ئێمە دەچووینە لای و قسـەی بۆ دەکردین و دەیگوت، ئەوانە ناتوانن ناوچە بەڕێوەبەرن و کەسایەتییەکانی ناوچە و پێشـمەرگە کۆنەکان ناناسـن و قابیلی ئەوە نین بێنە جێی من، هەر من باشم بۆ بەڕێوەبەری ناوچە و ئێوە نابێت لە ناوەندیی قبووڵ بکەن بەم ئاڵوگۆڕییە. لە مەخزەنی چەک و تەقەمەنی، کە پیرەهەڵۆ بەرپرسی بوو ڕۆژانە و شـەوانە ئێمە دەسـتەیەک بووین و بەیەکەوە قسەمان دەکرد و بەرنامەمان دادەنا بۆ مانەوەی سەید و دەرکردنی موحسین و سەید خالیـد. ئیتـر بە ئاشـکرا و ئاوەڵەیی بە ئێمە دەگوتـرا ڕوانگەی کۆن و پۆپۆلیستەکان و باڵی نیزامی و لایەنگرانی سەید و ڕزگار. بەوانی دیش بە موحسین و سەید خالید و لایەنگرانیان دەگوترا «بینشی نوێ»!

# ٣٤

## دووبەرەکی ڕۆچووە ناو ژیانی پێشمەرگە

دووبەرەکیی ئەم دوو باڵە، کاری کردبووە سەر هەموو بوارەکانی ژیان و پێشمەرگایەتی، چالاکیی نیزامی کەم بووبووەوە، سەفا و خۆشەویستیی ناو ڕیزی پێشمەرگەکان جێی خۆی دابوو بە ئیهانە و بوختانپێکردن و یەکتر خەتابارکردن. جاران دایکە پێشمەرگەیەک کە سەردانی کوڕەکەی دەکرد و دیاری و خواردن و پولی دێنا، کەس نەیدەشاردەوە و هەر لە جێوە هەر هەموو دابەش دەکرا و بەیەکەوە دەخورا، دیم دایکە پێشمەرگە دێ و نایهێننە مەقەڕ و لەماڵێک لە دێ کوڕەکەی تەنیا ئەوانە دەباتە لای بۆ نان و شیرینیخواردن، کە لە باڵەکەی خۆی نزیکن و بە شاراوەیی دەیانگوزەراند. خەریک بوو دیاردەی مەشرووبخواردنەوە و دڵداری و چاوبڕکێنە سەری هەڵدەدا، زۆربە دەفکری ژنهێناندا بوون، جاران پێشمەرگە گرووی دەگرت بۆ ئەوەی بچێت بۆ چالاکی نیزامی، ئێستا هەن خۆیان دەدزنەوە و تا بۆیان بکرێت ناچن و خۆ لەشەڕ نادەن.

## چالاکیی هەرەمەکی

ناکۆکی و قەڵشتی نێوان ڕیزەکانمان لە ناوچەی مەهاباد، دەنگۆی بەرز بووبووەوە و تەنانەت خەڵکی حاجیاڵیکەند و هەوادارەکان پێیان زانیبوو. لە لایەک سەید بەبێ ئەوەی ئیشی ڕەسمیی هەبێت و دەبوو بگەڕاباوە بۆ ناوەندی، بە بیانووی نەخۆشی لەگەڵ ژن و منداڵی، لە ماڵێک بوو تەنیا چەند هەنگاو لە مەقەڕی ناوچە دوور بوو، لە لایەکی دیکەوە کۆمیتەی ناوچە بە ئەندامێتیی موحسین و سەید خالید و ڕزگار هەبوو، هەڵبەت ڕزگار بە باڵی سەید دادەنرا، بەڵام هێشتا

بەرپرســی نیزامی بوو لە کۆمیتەی ناوچە. ســەید ئۆقرە و هەددادانی لێ بڕابوو کە دەیدیت ناوەندی ســوورە لەســەر گۆڕینی و شەرعییەت بە کۆمیتــە ناوچەی تازە درابوو. تەنانەت بە بوختان و قســەی ناخۆش و دژایەتیکردنی موحســین بە ئاشــکرا و بێ پەردە، ســەید وای لە ئێمە و لایەنگرانی خۆی کردبوو، کاروباری ناوچەمان پەک خستبوو. هەرچەند دوای هاتنەوەمــان لــە ئــالان، بە کاتــی و لە ڕووی بێــکاری کرابوومە بەرپرســی مەقەڕی ناوچــە، بەڵام بە کردەوە زۆربەمــان بەبێ ئیش و بەرپرسیارەتی بووین. زۆربەی چالاکییە نیزامییەکان بەبێ بەرنامە و لە گۆترە دەچوون بەڕێوە، بــۆ نموونە، ماوەیەک بوو هیچمان نەکردبوو، محەمەد حەســەنخاڵی نەقاش و وێنەگر و فیلمبەردار دوای هاتنەدەر و قاچاغبوونی، زۆربەی کاتەکان لە لای پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوو، ماڵ و باروبنەی وێنەکێشی و فیلمی لە حاجیاڵیکەند بوو، زۆر جار دەیگوت، کە چوون بۆ چالاکی دێم، دەبێت بمبەن و فیلمبەرداری دەکەم. پایگایەک تازە کرابووەوە لە دێی بەردەڕەشــانی سەر جادەی میاندواو-مەهاباد. نیوەڕۆ بوو لە حەوشــەی مەقەڕ لەگەڵ شــەریف و کەریمدا بەیەکەوە قســەمان دەکرد، گوتمــان با بچین و بە تۆپی ١٠٦ لــەم پایگایە بدەین. چووین بە دوای محەمەد، کاک سەدیق شێخانی مامۆستای دەرکراو و هەڵاتوو لە شــار، فاروق بللوری بە نەخۆشــی، لەوێ بوون، کە زانییان دەچین بۆ کارێکی وا هەموو هاتن. ســواری جیب بووین و نزیک پایگا و جــادەی مەهابــاد بووینەوە، زۆر زوو بوو خۆر لە ئاســمان بوو، لە ســەر زینوێ عەولاباد تۆپمان دابەســت و دوو تۆپمان پێوە نا، مەمەد فیلمبەرداری دەکرد، نەمانزانی وەکوێ کەوتن، هێشــتا تۆپی ســێهەمان پێوە نەنابوون هەر ئەوەندەمان زانی ئەم شاخ و کێو و باخانە یەکسەر بوون بە ئاگر، وەک تەرزە هاوەن و تۆپبارانیان کردین، لە بەردەڕشان، لــە گوێکتەپــە بە ســەدان هاوەنیان تێگرتیــن و بە قەناســە لێیان داین، لەگەڵ کەریم و شــەریف هەرچۆنێک بێ تۆپ و جیبەکەمان ڕزگار کرد و لەســەر جادەکە پەنامان بردە بن پرد و باخەکانی دێی ترشــەکان. بە

کوردی و کورتی حەشریکیان پێ کردین «با بە دەواری شڕ و سەرما بـە هەتیوی نەکردبوو». ئێـوارە داهات و وردەوردە تەقە کەم بووەوە، فاروق و مەمەد و ســەدیق دیار نەبوون، گەڕاین بە ناو باخەکاندا هیچ فایدەی نەبوو، لەناکاو لەناو چاڵاوی باخی ســەرجادە دەنگێک هات، کە چووینە پێش هەرسێک لەناو چاڵاوەکە و بە پلیکانی شیشی ئارماتۆڕی دەوری کۆنکریتــی چاڵاوەکە خۆیان هەڵاوەســیبوو و پەنایان گرتبوو. هاتنە دەر و گەڕاینەوە بەبێ دەستکەوت و زەرەر و بریندار!

## کۆمەڵە غەدر لە مهابادیان دەکات!

کێشە و ململانێی سەید، گەیشتە ئەوەی چەند جار کۆمیتەی ناوەندی هاتــن بــۆ ناوچە و لەگــەڵ هەمووماننــدا بە جیــا کۆبوونەوە. شــوعێب زەکەریایی، حەمەســوور و دوکتــۆر جەعفەر لە هاتوچۆ و کۆبوونەوەدا بــوون لەگــەڵ هەر هەمــوو تەشــکیلاتی مەهاباد، ئێمە ئەو چەند کەســە هەموو هێلکەکانمان لە ســەبەتەی ســەید نابوون، بە توندی بەرگرییمان لێ دەکرد و دەمانگوت موحسین و سەید خالید بۆ دەبێ بێن بۆ ناوچەی مەهابــاد، کــە بۆخۆی دەیان کادری سیاســی و نیزامیــی هەیە؟! نابێ لە دەرەوەڕا بەرپرس بۆ ئێمە بێنن، هەستێک هەبوو، کە کۆمەڵە وەک خۆی چاو لە ناوچەی مەهاباد ناکات و زۆری بڕوا بە کادر و ئەندامەکانی نییە، ڕەنگە ئەمە لەوەڕا پەیدا بووبێت بۆ سەرکردایەتیی کۆمەڵە، کە زۆربەیان خەڵکی ســنە و بۆکان و لەژێر هەژموونی بیرێکی توندی سەرتاســەری و بێــزار لــە ناســیۆنالیزمی کوردی بــوون. لە کۆنــەوە مەهاباد مەکۆی دێموکرات و ناسیۆنالیزمی کوردی بووە و ئێمە لە نیهایەتدا، نابینەماڵێکی باش بۆ کۆمەڵە و ئەندێشــەی کۆمۆنیســتی سەرتاسەری و فیداکاران و ڕێبوارانــی کرێــکاران و مارکسیســتی تۆخمان لێ پەیــدا نابێت. هەڵبەت ڕەنگــە ئــەم بۆچوونانەم ڕوانگەی ئێســتام بێت و ئــەوکات وا بە قووڵی بیرمان لەم شتانە نەکردبێتەوە، بەڵام بە دەیان نموونە هەن کە بۆچی لە کۆنگرەی یەک و دەستپێکی ژیانی سیاسی و نیزامیی کۆمەڵەدا، هەرچەند

مەهاباد شـــار و مەکۆی ڕووداوەکانی سیاسی و سەرکردەکانی کۆمەڵە و ئەحزابـی تریـش بوو، کـچ و کوڕگەلێکی باش و پێگەیشـتووش زۆر فیداکارانە و بێسنوور لە خەڵکی سابڵاغ و ناوچەکە لە خزمەت کۆمەڵەدا بوون، کەچی هەر نەمدیت بەرپرسـیارەتیی ڕاسـتەقینەیان پێ بدرێت و جێی متمانەی سـەرکردایەتی بن. بە دەیان کەسـی بنەماڵە و ناسـراوی وەک؛ کەریم دانشـیار، خورەمێکان بە کوڕ و کچانیان، سیامەند موعینی، خەلیل بللوریان، حوسێن سـوهەیلی، سولەیمان بللوری، کەمال وەلیانی، ڕەحیم قادری، سولەیمان ڕەحیمی، ڕەحمان زاهیدی و زۆر زۆری دی کە ماون، یان شەهید بوون، لە ترۆپکی ئازایەتی و بڕوا بە ڕێبازی کۆمەڵەدا بوون و گیانیان بۆ ئەم ڕێیە بەخت کرد، کەچی ڕێوشـوێنێکی ئەوتۆیان لە بەرپرسیارەتی و حیسێبیبۆکردن نەبوو. حوسێن سوهەیلی، لە زەمانی شـادا موهەندیسـی مەعدەن بوو، دەوڵەمەند و لە بنەماڵە ناسـراوەکانی شـاری مەهابـاد بوو، خەلیـل بللوریان یەک لە بلیمەتەکانی زەمانی شـا و قارەمانـی زیندان بوو، ڕەحیم قادری مامۆسـتایەکی خۆشەویسـت و ناسـراوی شـار و لادێ بوو، هەمـوو ئەوانی تریش، کەچـی دوای ئەو هەموو فیداکاری و شەهیدبوونیشـیان ئەندامێتییان هەر پێ ڕەوا نەدیتن. سولەیمان بللوری خەڵک پێی وا بوو یەک لە ئەندامەکانی سەرکردایەتیی کۆمەڵەیـە و هەموو بنەماڵەکەی لە خزمەتی کۆمەڵەدا بوون، کە شـەهید بـوو لە «خەبەرنامـە»[1] نووسـرابوو «هەواداری کۆمەڵـە»، خەلیل لە کۆمەڵە دەرکرا. زۆربەی هەرە زۆری پێشمەرگە و شەهیدانی سەنگەر و ئیعدامکراوی تەشکیلاتی شار هەتا ساڵی ١٣٦٢ (١٩٨٣)یش بە هەواداری یان بەرئەندامی لە ئیعلام و خەبەرنامەی کۆمەڵە ناویان هاتووە و یادیان کراوەتـەوە. کچانی کۆمەڵـەی ناوچەی مەهاباد حاڵیـان لەوەش خراپتر بوو، هەمیشـە کچێکی ناشـارەزا و غەریبی سـنەیی و سـەقزیان دێنا و دەیانکردە بەرپرسـی ڕێکخراوی کچانی مەهابـاد، لە بەرامبەردا هەرگیز

١- خبرنامە، بڵاوکراوەیەکی ڕەسـمیی کۆمەڵە بوو، چالاکی و هەواڵەکانی ڕۆژانەی پێشمەرگە و کۆمەڵەی تێدا بڵاو دەکرایەوە.

نەماندیـت کورێـک یان کچێکـی مەهاباد بکرێتە بەرپرسـی ئۆرگانێک لە ناوچەیەکـی دیکە. من بڕوام بە ناوچەگەری و شارپەرسـتی نییە، بەڵام بڕوام بەوەیە دەبێت خەڵکی شـیاو و خۆجێیی و ئاشـنا بە هەموو کەلێن و قوژبنەکانی کۆمەڵگەیەک بەرپرسیارەتیی پێ بدرێت، نەک ئەوەی بۆی هاوردە بکەیت. ڕاستە سەید برایم عەلیزادە هەر لە سەرەتاوە، کارەکتەری بەرچاو و بەدەسەلاتی ناوەندی کۆمەڵە بووە، بەڵام هەموو دەزانین کاک سەید برایم موڵکی ناوچەی مەهاباد نەبوو و زۆرتر لە سیسێر و ڕەبەت بوو لە دەسپێکدا و دواتر لە سەرکردایەتی بوو بە کەسایەتییەکی کاریزما و بەرچاو، هەرچەند ئەویش لە کۆنەوە و بە ئێستاشەوە لەناو کۆمەڵە و باڵی کۆمۆنیستی کرێکاری، بە ناسیۆنالیست تاوانباری دەکەن.

**قسەکانی دکتۆر جەعفەر ڕایانچڵەکاندم**

ئێوارێیەک کاک شـوعێب و حەمەسـوور، هاتن بـۆ مەقەڕی ناوچە، گوتیان دەچین بۆ سـەردانی سـەید، لەگەڵیاندا چووم و زۆریان قسـە کرد و نەسـیحەتی سـەیدیان دەکرد دەسـت هەڵگرێـت و بچێتەوە بۆ ناوەنـدی، سـەید لە جێدا بـوو و هیچ ئەم قسـە و وریاکردنەوانەی کە بۆنی هەڕەشەشـیان لێ دەهـات، بە دڵ نەبوو. بوو بـە دەنگەدەنگیان، شـەو کە هاتینەوە بۆ مەقەڕ، کاک شـوعێب زۆر بـە ئارامی پێی گوتم دیفاع مەکەن لە سـەید. چەند ڕۆژ دواتر دوکتور جەعفەر هات و گوتی سەید دەبەمەوە بۆ ناوەندی، لەسەر قسە و تەحریکی سەید زۆر پێمان داگرت و زۆر بە توندی قسـەمان لەگەڵ دوکتۆردا کرد، کە بەرپرسـی دیمان قبووڵ نییە و دەبێت کەسـێک دابنێن لە خۆمان بێ و ئێمە وەک خۆمان بناسـێت و بتوانین بەیەکـەوە کار بکەین. ڕۆژی دواتر دوکتۆر لەسەر چوونەوە بوو، بانگی کردم بۆ حەوشەکەی مەقەڕ و زۆر خۆمانە گوتی، تکایە بەرگری لە سـەید مەکەن، ناتوانم ئێسـتا زۆر قسـە بکەم، بـەڵام بە زوویی زۆر شـتتان بـۆ ڕوون دەبێتەوە و لـە بەرگریکردنی ئەم پیاوە، پەشـیمان دەبنەوە. من بە تایبەت بۆ تۆ زۆرم پێ ناخۆشـە،

تکایە لەگەڵ هاوڕێیانی تریشـــدا قســـە بکە و لێگەڕێن با ئەم چەند ڕۆژە ناوەندی کاری خۆی بکات. هەر ئەوەندە بزانە سەید زۆر پاک و ساغڵەم نییە! ئەم قســـانە لە زاری یەکـــی وەک دوکتۆر کە یەکجار زۆرم خۆش دەویســـت و متمانەی تەواوم پێی بوو، ڕایچڵەکاندم و باوەڕم نەدەکرد چـــم گـــوێ لێ دەبوو. وەعدی لـــێ وەرگرتم جـــارێ هەموومان بێدەنگ بین تا چەند ڕۆژان و ئەوان ســـەید دەبەنەوە بۆ ســـەرکردایەتی. دەبوو ئێمەش مانەوەی موحســـین و سەید خالید قبووڵ بکەین. لە ژوورەکەی پیرەهەڵـــۆ کۆبوونەوەمـــان کـــرد و زۆربەمان لەوێ بووین، قســـەکانی دوکتـــۆرم بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش پێیان ســـەیر بوو، گوتمان با بزانین و چاوەڕێی دوکتۆر دەکەین و جارێ با کاردانەوەمان نەبێت.

### بە تۆمەتی بێئەخلاقیی سێکسییەوە گیرا

چەند ڕۆژ دواتر دەســـتەیەک لە پێشـــمەرگەکانی پاراستنی ناوەندی جێگۆڕکێیان پێ کرابوو، بەیانی زۆر زوو گەیشـــتنەوە مەقەڕی ناوچە. کوڕێکیـــان تێـــدا بـــوو زۆر بەهاتوهاوار و فشـــەکەر ناوبانگـــی هەبوو، زۆربەی پێشـــمەرگەکان هێشتا لە خەو هەڵنەستابوون، وەژوور کەوت و بە دەنگی بڵێند گوتی: «هەســـتن، هەســـتن، بۆ نوستوون، سەید گیرا، ســـەید گیرا! کارەســـاتی لێ قەوماوە، کچەکانی هەموو خراپ کردووە، هەر خەریکی ســـێکس و ڕابواردن بووە، لەگەڵ کێ نوســـتووە و لەگەڵ کـــێ چیی کـــردووە و براژنـــی خۆی هەمـــووی دیوە و... لـــە بۆکان بە بیانـــووی عیـــلاج و زەخمی مەعیدە هەر گۆشـــتی برژاوی خواردووە و لەگەڵ ئەم کچانە کەیفی کردووە و...»

چووم گوتم ئەوە چییە ئەو قســـە قۆڕانەت لە چییە؟! گوتی بەخوا و بە پێغەمبەر خۆم ئەوشـــۆ لە گوندی ســـلامەت لە بارەگای ناوەندی بە چاوی خۆم بینیم قۆڵبەستیان کرد و ئێستا ئەوە لە زیندانی ناوەندییە!

بەم بەیانییە زووە مەقەڕ شـــێوا و موحســـین و سەید خالید هاتن و گوتیان بە نامە ئاگادار کراوین و ڕاســـتە و ســـەید بە تۆمەتی سێکس و

تەجاوز و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی لە چەند ساڵی ڕابردوودا، گیراوە و بە تازەیی ناوەندیی پێی زانیوە و گرتوویانە و مەحکەمەی دەکەن!

بۆ من و هاوڕێیانی سەر بە باڵی سەید، مەرگ و جەحەنەمی تەواو بوو، ڕووخان و هەڵوەشانی دەروون بوو، بێزاری و نائومێدی باڵی بەسەرماندا کێشا، عیشق و عیلاقە و خۆشەویستی بە ڕێباز کزی کرد، بێمتمانەیی و گومان، زاڵ بوون و خەم و خەمۆکی یەخەیان گرتین. دیارە ئەم حاڵەتانە هەموو نیشانەی سادەیی و بێئەزموونیمان بوو. هەمیشە وا بووە، کە زۆر چووی دە ناخی فیکر و بابەتێکی سیاسی و دینی و... بووی بە دەروێش، بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆژیت لێ بوو بە مەزهەب، بە بچووکترین هەڵە و شاشیی لەم چەشنە، نائومێد دەبی و دەڕووخێی.

### ڤێزەونترین دیدار

من و کەماڵ وەلیانی تەواو بێزار و تووڕە و ئاگر بووین، ئێمە زۆرمان پێداگری کردبوو لەوەی سەید باشترە بۆ ناوچە و دەبێت ئەو بێتەوە، بۆیە بە هەمان ئەندازە ڕقمان لە خۆمان دەبووەوە و هەستمان بە شکانێکی گەورە دەکرد. کەماڵ هات گوتی با بچین بۆ ناوەندی و ببینین، ئەوەی ڕاست بێ ئەوەندە تووڕە بووین چاوەڕوانی هەموو کردەوەیەکمان لێ دەکرا. لەندرۆڤێرێکی سەرئاوەڵەمان بوو، دووبەدوو لێی سوار بووین و بەرەو گەورکایەتی و سلامەت ڕێمان گرتە بەر. کەماڵ ئەوەندە تووڕە و بێزار بوو، هەر تفی لەبەر پێی خۆی دەکرد و بە قینەوە دەیگوت، دەبێ بە دەستی خۆم بیکوژم! لە سەرکردایەتی، دوکتور جەعفەر لە ژووری خۆی بەخێرهاتن و میوانداریی گەرمی کردین، بە هەیەجانە تایبەتییەکەی خۆی گوتی، عەلی چیم پێ گوتی؟! نەمگوت سەبر بگرن و شت دەزانم؟! ئێمە خەمبار و مەلوول بووین، دوکتور زۆری حەول دا و دەیویست ئاراممان بکاتەوە، زیاتر لە سەعات قسەی

بۆ کردین و باسـی سروشتیبوونی ئەم دیاردانەی لەناو شۆڕشێکی وا پان و گەورە بۆ دەکردین و ئەزموونی وڵاتانی تری بۆ باس کردین، نانی لەگەڵدا خواردین و زۆری باسـی هەردووکمان و پێداهەڵگوتنییەکی پڕ لە شـانازیی کردین. گوتم، دوکتۆر دەمانەوێ ببینین. گوتی هەرچەندە کەس بۆی نییە جارێ ببینێت و دەبێ چاوەڕێی مەحکەمە بکەین، بەڵام ناتوانم بە ئێوە بڵێم نا، زۆرمان سوپاس کرد، پێشمەرگەیەکی بانگ کرد و گوتی، بیان بە با سەید ببینن، هەستاین وماڵئاواییمان لێ کرد، لەبەر ڕێسـمەی دەرگاکە بە شەرمەوە گوتی، بمبورن بەس تفەنگەکانتان لای مـن دانێن و وەرنەوە و هەڵیگرنەوە، هەردوومان هەسـتمان پێ کرد و زانیمان لە چی دەترسێت. چووین سەیدمان دی، لە بەردەرگاوە کەمال چەند قسـەی پێ گوت و ئەویش هەر دەگریا و پەشـیمانیی دەردەبڕی. هەتا بڵێی دیدارێکی ناخۆش و قێزەون و نەفرەتلێکراو بوو.

### کارە بێڕەوشتییەکانی سەید

زۆربەی ئەوانەی ژن یان خوشـکیان لەم چەند سـاڵەدا لە هاموشۆ و کاری سیاسـیدا بـوون و کاریان لەگەڵ سـەیدا کردبـوو، ناردمان بەدوایانـدا بـۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی کارەسـاتەکە. مەعلووم بوو تەنیا ئیسـتفادەی نابەجێ و نائینسـانیی لەگـەڵ دوو لە کچەکانـدا کردبوو، نەرمینی خوشکم گوتی: «دەمانزانی و شتێکی لەگەڵ فلانیدا هەیە، بەس هــەر بە مێشـکماندا نەدەهات باوەڕ بکەین، زۆر جـار بەم هاوڕێیەمان دەگوت، زۆری ڕوو مەدەیە و هەرچی گوتی بۆ بەقسەی دەکەی؟! ئەو خۆی زۆری پێ ناخۆش نەبوو هەر دەچوو بۆ لای و زۆر شـەرمێون و بێئیرادە بوو. هاوڕێیەکی ترمان زوو ڕۆیشـت، کە زانیی تەماحی تێ کردووە و قسـەی سـەیر و نامۆی لەگەڵدا دەکات، کۆمەڵە نەما و چوو بۆ تەورێز». دۆسـتێکی سـەید خەڵکی لادێ بوو، هەردووکیان دۆست و شـانەی کاک حەمەحوسـێن کەریمی بوون، پێشـمەرگەیەکی ئازا و خۆشەویسـتی هەموومان بوو، ژنەکـەی خەڵکی دێی خۆیان بوو، دوو

منداڵیان هەبوو، یەکسەر چووەوە ماڵەوە و ژنەکەی خۆی سوێند دا، دەیگوت بە دەیان شەو ژن و منداڵم بۆ ئەم مەلعوونە جێ هێشتووە، شک و گومانم لە بابم بایە لە ئەوم نەبوو، چۆن دەبێ کاری وای کردبێ، ئیتر چەکی دانا و ڕۆیشتەوە لادێکەی خۆیان. هاوڕێیەکی ترمان خوشکی دواندبوو، گوتی جارێک بە جۆرێک قسەی لەگەڵدا کردووە و دەستی لەسەر شانی داناوە، ئەویش ڕۆیشتبوو مێردی کردبوو و کۆمەڵە نەمابوو. براژنی سەید زۆر شتی دیبوو لە ماڵەکەیان لە بۆکان و هەستان و دانیشتن لەگەڵ کچەکاندا، بەس هەرگیز نەیوێرابوو تەنانەت بە مێردەکەی خۆشی بڵێت؛ ئەوە براکەت لەگەڵ کچەکاندا ئاکاری ناشایستی هەیە!

هەرچۆنێک بێ تەقینەوەی کارەساتی سەید زیانێکی گەورەی سیاسی و ئەخلاقیی لە پەیکەری کۆمەڵە و دەروونی دەیان پێشمەرگەی خوێنگەرم و عاشق بە ڕێبازی پاکی و بێڕیایی وەشاند.

هەڵبەت کارەساتبوونی ئەم ڕووداوە لەوەدا نییە، بە دید و پێوەری ئەمڕۆ هەڵیسەنگێنیت، بەڵکو مەبەستم بۆ خوێنەری بەڕێز، ئەوەیە بچێتەوە شەرایەتی زەمان و مەکانی ئەوکاتی کۆمەڵگەیەکی جوتێری کوردەواری و پۆپۆلیستی ناو «کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران» و ئەوکات لە ئێمە تێبگات نزیک بە چل ساڵ پێش چۆن دەبوو بڕوانینە ئەم چەشنە کردەوە و ڕووداوانە. هەر چەند ساڵێکی نەبرد، بە دەیان کردەوەی لەوە قێزەونتر لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵە و بە تایبەت دواتر حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ڕوویان دا و زۆر بە ڕۆحێکی ڕیازی و ئاوەڵەیی و بە ناوی کرانەوەی کۆمەڵگە، بە ڕووی دیاردە تابوو[1] و نامۆکاندا وەردەگیران و کەسیشی لەسەر

١- تابوو، وشەیەکی وڵاتی تونگا لە ئۆقیانووسی ئارام و قارەی ئوسترالیایە، بە واتای ئەو دەستە لە کردار و لێدوان و چەمکانە دێ، کە لە ناو کۆمەڵگە لە ڕووی دینی و مەزهەب و کولتوور یان کۆمەڵایەتی، دەستبردن بۆیان و باسکردنیان بڤە و حەرام کراون، بۆ نموونە ناوهێنانی ئەندامانی جەستەی ژن و پیاو و باسی کرداری جووتبوون لە ناو کۆڕ و مەجلیساندا.

نــە مەحکەمە دەکــرا و نە دووردەخرایەوە! گوناحی ســەید لەوەدا بوو کەمێک زوو دەستی پێ کرد بوو!

## خولانەوە بە دەوری خۆماندا

بە ئارامی و بێدەنگی هەر کام لە ئێمە ملی ئەرکێکمان گرت و بە دڵی شــکاو و نائومێدییەکی زۆرەوە، گفتوگۆی بەردەوامی عەقڵ و دەروون لەنــاو خۆماندا، چی دەکەین؟ ئامانج چییە؟ بۆ شــەڕ دەکەین؟ کۆماری ئیســلامی بۆ ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دێتە پیش و خۆی دادەســەپێنێت؟ ئایا کــورد بــە تەنیا، ئێرانی پــێ دەڕووخێت؟ بەڕاســتی ســەرکردەکانمان ئەوەن کە چاوەڕوانیمان دەکرد؟ بۆ دەبێ کورد حیزبی کۆمۆنیســت بۆ هەموو ئێران دروست بکات؟ ئایا کۆمۆنیستی، لە وڵاتەکەی لەمەڕ ئێمە پیــادە دەبێت؟ بۆچی شــەڕی دێموکرات دەکەیــن؟ عەدالەت هەیە لەناو ڕیزەکانماندا؟! بۆ...و بۆ... و...؟!

بــە ســەدان پرســیاری دی بە تەنیــا و بە دەمەتەقــێ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکــی نزیکدا، ڕۆژان و شــەوانمان پــێ دەگوزەراند و بە کورتی، ئێمە ئەو بەشــە بووین لە ناوچەی مەهاباد لە ئاســت فکر و ئەندێشە و بــاوەڕەوە ڕووخابووین و بێهوودە دەســووڕاین و بە دەوری خۆماندا دەخولاینەوە و شــەپۆلی چ بکەین چ بکەینی دەروون، ســەردەکەوت و دادەبەزی. تا دەهات و درەنگتر دەبوو، لەگەڵ ئەو هەموو قەیرانی فیکری و ساردبوونەوەش، هەر ئەوان هاوڕێیان بوون خۆیان لە شەڕە قورس و خوێناوییــەکان دەدا و یــەک یــەک و دوو دوو دەگەیشــتنە کاروانی شــەهیدانی... نازانم بڵێم چی؟! شەهیدانی دژی ئەمپریالیزم و ڕزگاریی کرێکارانی جیهان؟ شەهیدانی شــەڕی حیزبی دێموکرات و بورژوازیی ناوخۆ؟! شەهیدانی سوســیالیزم و ڕزگاریی ئێران؟! شەهیدانی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان؟! یان شەهیدانی ڕێگەی خەڵک پێگەیشتن بە تموح و خولیا شەیتانییەکانیان؟!

# ٣٥

## زەکات مەدەن بە کۆمەڵە

لە هاوینی ١٣٦١ (١٩٨٢)دا حیزبی دێموکرات لە شـاروێرانی مەهاباد دەسـتی کرد بە بانگەشـە و دژایەتییەکی تۆخی کۆمەڵە. جەلیل گادانی بەرپرسی دەفتەر سیاسیی دووی حیزب، بۆ جەولە و تەبلیغات هاتبوو بۆ شـاروێران، دەگـەڕا بەناو گوندەکاندا و هەرچی بوختان و قسـەی بێمانا و دوور لە ڕاستی، لە بازاڕ و مزگەوتەکان دژی کۆمەڵە دەیگوت و بـە ئاشـکرا خەڵکی هان دەدا؛ یارمەتیی ماڵـی و هاوکاری بە کۆمەڵە نـەدەن، زەکات و سـەرفترە بـە کۆمەڵە حەرامە و نابـێ پێیان بدرێت، ئـەوان بێدین و خوانەناسـن، لـە مزگەوتەکان ڕێیان مـەدەن، گلاویان دەکەن. تەنیا حیزب لە کوردستاندا، حیزبی دێموکراتە و نابێ ڕێ بدرێ بـە حیزبـی دی، زەکات و سـەرفترەکان تەنیا دەبـێ بدرێت بە حیزبی دێموکرات.

شـاروێران ناوچەیەکی ئاوەدان و دەوڵەمەندە، زۆربەی گوندەکانی ڕۆژانە قەسابیی تێدا دەکرا، حەمام و پاکوخاوێنی و جلی جوان هەبوو بـۆ پیـاوان و بە تایبەت ژنان وەک ژنی شـار خۆیـان دەڕازاندەوە، بە پێچەوانەی مەحال و گەورکایەتی تا حەیوانێک مندار نەبووباوە، سەریان نەدەبڕی و گۆشت زۆر کەم دەخورا و ژن و پیاوەکان هەردەم بە جلی کارەوە بوون و سـیمای جوانی، زۆر کەم دیار بوو. شـاروێران هێزی پێشـەوای حیزبی دێموکراتی لێ بوو، بە هۆی خۆشـگوزەرانی و ژن و مەشـروبات و خواردنی باش بۆ کۆمەڵێک لە پێشمەرگەکانیان، حوکمی مۆنتیکارلۆی هەبوو، لە هەرچی گوزەرابان لە شاروێران نەدەگوزەران، بۆیە ئەم هەڵوێست و قسانەی جەلیل گادانی بە کەیفی دڵی وان بوو، لە بیانوو دەگەڕان دەرگای شـاروێران بە ڕووی پێشمەرگەکانی کۆمەڵەدا

بۆ هەمیشــە دابخەن. جەولەی جەلیل گادانی کەشـێکی زۆر بارگاوی و شــەڕی لە شــاروێران خوش کردبوو، ئیتر ئەو تاقمەی هێزی پێشــەوا فەتوایــان لــە لایەن ئەندامی دەفتەر سیاســییەوە بۆ درابــوو، لە یەکەم فورسەتدا لە پێشمەرگەکانی ئێمە بدەن.

### کەسی دڕ بنێرن

موحســین و ســەید خالید وەک کۆمیتە ناوچەی تازە، بەپەلە بوون بــۆ ڕیزکردنــی کارنامەیەکــی پڕ لە چالاکــی بۆ خۆیان و بــەراورد بە ســەردەمی ســەید. دەبوو بە ســەرکردایەتی بڵێن لە دانانــی ئەوان بۆ ناوچــەی مەهاباد نە تەنیا هەڵەیان نەکردووە، بگرە ناوچەکە لە هەموو ڕوویەکــەوە گەشــەی کردووە و ســنووری چالاکیی پێشــمەرگە زۆر بەرینتــر بووەتەوە. ئەوان دەبوو، بیر لــە کۆنگرەی داهاتوو بکەنەوە و بە کارنامەیەکی پڕشــنگدار لە ناوچەی مەهابــادەوە بچن بۆ کۆنگرە و شــوێن و پۆســتی خۆیان بۆ داهاتوو و لەناو ئەو حیزبە کۆمۆنیستەی کە قەرارە دروست بکرێت، قایم بکەن.

کۆبوونەوەیان کرد و پەلێک پێشمەرگە بە بەرپرسیاریەتیی سیاسیی ڕەحیم قادری و نیزامیی ســولەیمان ڕەحیمی وەڕێخران بۆ شاروێران بــۆ جەولــە و تەبلیغی سیاســی و گەر کــرا چالاکیــی نیزامییش. چەند پێشمەرگەیەکی زۆر مێرمنداڵ و تازە، لەگەڵ هێزەکەی کۆمەڵەدا بوون، هەرچەند لە ڕۆیشتندا ڕەحیم و سولەیمان زۆریان بە موحسین گوت با ئەو چەند کوڕە نەبەین و زۆر منداڵن. هیچ گوێی پێ نەدا و ڕازی نەبوو چەند کەسێکی دڕ و کۆن و بەئەزموون بنێرێت، بیانووی ئەوە بوو نابێ مەقەڕی ناوچە کەسی وای لێ نەمێنێت و لاواز بکرێت.

ئەوان ڕۆیشتن و بۆ سبەیشەو درەنگ هاتنەوە، من بەرپرسی مەقەڕی حاجیاڵیکەنــد بووم، چــووم بەرەوپیریان و زۆر بە سەرســووڕمانەوە گوتم:

- بۆ هاتنەوە؟!

- ڕەحیم تووڕە بوو گوتی، من ناچمەوە و کاری وا هەر ناکەم؟!
- باشە چ بوو ڕەحیم گیان بۆ تووڕەی؟!
پێشمەرگەکان هەموو لە حەوشە بڵاو بووبوونەوە،
سولەیمان ڕەحیمی گوتی:
«شـــاروێران چـــوون بـــەم هێـــزە بچووکەی ئێمـــە ناکرێـــت، ئەوانە منداڵەورکەیـــان لەگەڵ مندا ناردووە، لاتولـــوت و هەتیوبازەکانی هێزی پێشـــەوا لە قومقەڵا لەبەر مزگەوتی دێ دۆینێشـــەو کە گەیشـــتووین و لەناو دێ وەســـتا بووین لە دوورەوە چاویان لەو پێشـــمەرگە سوور و کاڵ و مێرمنداڵانـــەی مـــن داگرتووە و تەنانەت هاتوونە پێش دەســـتیان بـــۆ بەرن. ئاخر باشـــە پێشـــمەرگایەتی و ململانێ لەگـــەڵ ئەوانەدا ئاوا دەکرێت؟! بەم هێزە دەکرێت؟!»

## پیشمەرگەی لاتوپوت

چەند کەســێکی وەک کوڕانی گوشــوارە، هاشــمە کەچــەل، عەبوو عیمادی، چرچە، ســازواری و... لەو پێشــمەرگانەی دێموکرات بوون لە ناوچـــەی مەهاباد شـــەو و ڕۆژ لە ڕابواردن و شـــەڕ دەگەڕان بە دژی کۆمەڵـــە و هێزەکانی دیکەی ئەوکاتی، وەک پەیکار و ڕەزمەندەگان و... (تەنانەت کاک کەریم حیســـامی بەرپرسی کۆمیتەی شارستانیی حیزب لە مەهاباد لە بەرگی حەوتی بیرەوەرییەکانی باسی لاتولوتی و لۆمپەنی ئەوانە دەکا زۆر بە ڕوونی)
بە پەلە کۆمیتەی ناوچە ئاگادارکرانەوە کە هێزەکەمان لە شاروێران گەڕاونـــەوە و دەڵێـــن ئاوا ناچینەوە. هەموو ئەو مەســـئوول دەســـتە و پـــەل و نیزامییەکان لە کۆمیتەی ناوچە کۆ بووینەوە و گوێمان گرت لە قسەکانی ڕەحیم و سولەیمان، ئەوان هێمایەکی ڕاست و ڕەوانی واقعی شـــاروێران و هاتنـــی جەلیـــل گادانی لە پێشـــووتر و ئەم پێشـــمەرگە و کەسانەی هێزی پێشەوا کە لە شاروێران جێگیر کراون و زۆر بە وردی باسی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەوانیان کرد، لە قومار، ژن، مەشروبات،

کاسـبی و پارە پەیداکردن. گوتیان بۆ پاراسـتنی ئـەم ئیمتیازانە ئەوان ئامادەن شـەڕی مان و نەمان بکەن و ئەوەش بەمهێزەی ئێمە ناکرێت، دەبێ بە لانیکەمەوە گوردانێک واتا چەند پەل بچین و نومایشـی هێزی خۆمـان بکەین. موحسـین و سـەید خالیـد نەیانسـەلماند و ڕزگاریش دەسـەڵاتێکی وای نەمابوو. دوای قسەوباسـێکی زۆر و نەسـەلماندنی موحسـین بـە هـۆی ئـەوەی هەرگیز پێشـمەرگەی شـەڕ نەبـووە و ڕووبەڕووبوونـەوەی لەگـەڵ دیموکراتـی ناوچەی مەهابـاد نەدیبوو، هیچ لە موعاناتی بەرپرسـی پەلێکی وەک سولەیمان ڕەحیمی و ڕەحیم قـادری کە ئەزموونی دەیان شـەڕ و جەولـە و تێکهەڵچوونیان هەبوو لەگەڵ حیزبی دیموکراتدا، نەدەگەیشـت و هەر تەقەی سـەری دەهات! دوای چەند قسـەکردن و هەڵچـوون و دامرکاندنەوە، هەر هەموو ئێمە لەگـەڵ ئەوەدا بووین با جارێ لە شـارویران گەڕێین و ڕاوەسـتین بە هێزێکی تۆکمە و گەورە بچینەوە و وایان لێ بکەین جارێکی تر هەرگیز جورئەت نەکەن چاو لە پێشمەرگەی کۆمەڵە داگرنەوە! زۆر بووین ئەم بەرپرسە نیزامییانەی کە لە سەرەتاوە دژی هاتنی موحسین بووین، لەم کۆبوونەوەیەدا بۆ نەچوونەوەی سـولەیمان و ڕەحیم، پشتمان گرتن و دژی بۆچوونەکانی موحسـین و سەید خالید وەستاینەوە، ئەوان پێیان وا بوو ئێمە بە مەبەسـت و شـکانی ئەوان لـە بەڕێوەچوونی ناوچەی مەهاباد وا دەکەین و مەڵۆشـەوێنکەیی[1] ئێمە بۆ لێدانی ئەوانە! بۆیە لە ئاخردا موحسـین قسـەی زۆر ناخۆشـی کرد و گوتی ئێوە ترسەنۆکن و لە دەسـتی چەند پێشـمەرگەی دیموکرات هەڵاتوون. ڕەحیم کە هەتا خوا حەز بکات پەپوولە و دڵناسک و پاک بوو بە چاوی پڕ لە ئەسرین و هەناسـەی سـارد هەسـتا دەرکەوت و گوتی، سـولەیمان هەستە با بگەڕێینەوە و پێیان بڵێین کێ ترسەنۆکە؟!

هەموومان هاتینەوە حەوشەی مەقەڕ و بەر سیمورغەکە، موحسین و سـەید خالید نەبێ، کە هەر لـە ژوورەکە مانەوە. تابلۆی خواحافیزی

١- مەڵۆشەوێنکە، کارتێکدەر.

له حەوشـــەی مەقەڕ بەم شـــەوە درەنگە لەگەڵ ڕەحیم و ســـولەیمان و پێشـــمەرگەکان ئەو نیگارەیە، کە پڕە لە شۆڕشگێڕی، پاڵەوانێتی، بوغز و فرمێســـک، غللووری و بابیبوون، بێدەســـەلاتی و شکان، پڕوپووچیی دیمۆکراســـی و دەنگـــی ئـــازاد، دیکتاتۆریەتـــی ڕابەڕانی شۆڕشـــەکان، خۆبەزلزانـــی و خۆپەرســـتی، بێدەعـــێ و خاکیبـــوون، خۆشەویســـتیی هاوڕێکان، دەستلەملانی و فیداکاری، گیانلەسەردەستبوون بۆ ئامانجێک کـــە بـــڕوات پێی نییە، بـــە بەرچاوڕوونی بەرەو پیـــری مەرگ چوون و ســـەدان چەمکی تری دژ بەیەک و ناساز و هەلپەرستی، نازانم چۆن لە تابلۆیەکدا وێنا دەکرێن؟!

**لەپێشدا ژنت بۆ دێنین**

ســـولەیمان ڕەحیمی یەک لە پێشـــمەرگە ســـەرەتاییەکان و ئازاکانی کۆمەڵـــە بـــوو، ڕەفیقدۆســـت و بەوەفا بوو بۆ یـــاران، عادەتی بوو لەپڕ نێوچاوانی لێ گرژ دەکردی و تێکی دەنا و لەناکاو دەستی بە پێکەنینێکی زۆر شیرین دەکرد، بەم حەرەکەتانە باوەشی پێداگرتین، ڕەحیم بە لۆلە گیان لۆلە گیان، کە وێردی زمانی بوو، بە گریانەوە دەباوەشی دەگرتین و یەک دوو جار گوتی، ناتانبینمەوە. گوتم ڕەحیم وا مەڵێ دەبێ لەپێشدا ژنت بۆ بێنین، وردەوردە ئەوە پیر دەبی! زۆر سەیر بوو هەموو پێیان وا بوو ماڵئاوایی ئەبەدییە!

بە ســـواری ســـیمورغ هـــەر وەک دوێنێ دیســـان چوونـــەوە بەرەو شاروێران.

ڕۆژی دواتـــر لای ئێوارەیەکـــی زوو لەگـــەڵ کەریم ئەفســـەردلێر لە حەوشـــی مەقەڕ پاڵمـــان بە جیبی تۆپەکەوە دابوو، قســـەمان دەکرد، لە هەورازی بەرمالان تەپوتۆزێکی ماتۆرسوارێکی زۆر بە پەلە پەیدا بوو، یەکسەر هاتە ناو دێ و خۆی بە حەوشەی مەقەڕدا کرد و بە لەخۆدان و هاتوهـــاوار گوتـــی: هەموو کوژران! کەس نەمـــا! هەموویان قەتلوعام کرد!

کوڕێکــی مام بایز قەیتەرانی خەڵکی حاجیخۆشــی شــارویران بوو دەمناسی هەواداری خۆمان بوو.

- باشە لەسەرخۆ، بڵێ بزانین چ بووە؟ من گوتم.

- کاکە کەســیان نەهێشت! هەموویان کوشت، لە بازاڕی قەرەداغ لە خورخورە لە پشتەوەڕا هەموویان بەر دەسرێژ دان و هەموو مردن!

- هەر هەموو؟!

- ئەرێوەڵا، تاقیان نەهێشت!

- کاکە وا نابێ بۆمان باس کە چی قەوما؟!

- بەیانی زوو پێشمەرگەکان چوون بۆ یەکشەممە بازاڕ لە قەرەداغ، پــڕ بوو لە خەڵک و پێشــمەرگەی دێموکرات، دیار بــوو خۆیان ئامادە کردبوو، ئەولا و ئەملا و چەند بەرزاییان گرتبوو، قســە و قرەقڕ پەیدا بــوو، کاک ڕەحیــم بە باوەشــەوە چوو بۆ لایان و ویســتی بڵێ شــەڕ ناکەین، لە پشتەوەڕا تەقەیان لێ کرد و لە سەریان دا، دواتر هەموویان بەر دەسرێژ دران!

- تۆ خۆت هەمووت دیت و هەموو کوژران؟!

- ئەرێــوەڵا مــن زوو دەرچــووم هاتمــەوە بە کاکم و بابــم بڵێم چ قەوماوە!

ناردمانــە ژووری کۆمیتە ناوچە بۆ لای موحســین و ســەید خالید و ڕزگار، کلیلــی جیبی تۆپەکەم هێنا پێــی بڕۆین هەڵنەبوو، بە هەردوو دەست بە سەری خۆماندا دەدا و گێژ و وڕ بەدوای ماشێنێکدا دەگەڕام، لەو دەمەیدا هیچی بەردەســت نەبوو، ڕووم لە دوکانی حوسێنی کوێخا کــرد و گوتــی، جیبەکەیان لــە ماڵ نییــە. هاتمە دەر لــە دوکانەکە دیم جیبێکی ســیترۆئێنی نەخۆشخانەی عیلمئاباد لەگەڵ دوکتۆر دەرویش و پێشمەرگەیەک دێن، نازانم چۆن و چەند بە پەلە جیبەکەم لێ وەرگرتن، پرسمان بە هیچ کام لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوچە نەکرد، لەگەڵ کەریم و پێشــمەرگەیەکی تر ســوار بووین بەرەو عەولاباد و ترشەکانی سەر ڕێی شارویران.

**بەرەو شەڕی براکان**

گەیشتینە سەر زینوێ عەولاباد لە سەرەوڕا ڕوانیمان، پیکابی تۆیۆتای دۆشکەلەسەری هێزی پێشەوا، کە دەماناسییەوە بە دەستی کوڕانی گوشوارەوە بوو، ناو دێی عەولابادیان جێ هێشت و ڕوویان لە جادەی ئاسفالت و ترشەکان کرد. خۆمان مات کرد تەنیا سێ کەس بووین، تەدبیرمان کرد کەمێک بوەستین و تاریکتر بێ، ئەوجار دەچین بۆ ناودێ. وردەوردە لە سەر زینوێکەڕا هاتینە ناو دێ، گوتیان بەڵێ جەماعەتی دێموکرات بوون ڕۆیشتن بۆ ترشەکان. ڕوومان لە جادە کرد بەرەو باخی ترشەکان، چەند هەنگاوێکمان مابوو بۆ سەر جادەکە، لە ماشێنەکەی خۆمان دابەزین کە کەمین دەرکەین و بە پێ بڕۆینە ئەوبەری جادە، سێقۆڵی بە مەسافە تفەنگ لەسەر پێ بەناو چرپی و دار و جۆگەدا بە هەست و ئارامی هەنگاومان دەنا بەرەو جادە، لەناکاو گوێمان لە دەنگی مەکینەی ماشێن بوو بە چراکوژاوەیی خەریکی پەڕینەوە بوو بۆ لای ئێمە، گوتم کەریم هەمان ماشێنی ئێوارەی دۆشکەکەی حیزبە، کە ڕۆیشتن و گەڕانەوە، گوتی چۆن دەزانی؟! ئەدی ئەگەر ئیی خۆمان بوون؟! گوتم مومکین نییە، کوڕەکانی ئێمە سیمورغیان پێیە و ئەگەر من دەنگی سیمورغ نەناسمەوە چی دەناسمەوە؟! ئەوجار، کاکم هەمیشە پیکابی تۆیۆتای هەبوو، باشی دەناسمەوە، ئەو دەنگەدەنگی وانێتی جەماعەتی ئێوارەی دێموکراتەکانە! زۆر سوور بووم لە بۆچوون و لێکدانەوەکەم، سێ بە سێ لەناو جۆگەیەکی ناوباخ، بە مەسافە سەنگەرمان گرت و پەنجە لە سەر پەلاپیتکە بەرەوڕووی دەنگی پیکابەکە، کە هەر دێ و نزیکتر دەبێتەوە، لێکم داوە گەر ئەوان هەر هەموو پێشمەرگەکانی ئێمەیان شەهید کردبێت، ئێمەش دەستیان لێ ناپارێزین و ڕاست دەکەونە ناو کەمینمان و بە چەند دەسڕێژ شتاقیان ناهێڵین و مەجال نادەین تەنانەت تفەنگ لە شان داگرن، وڵات ڕەش و تاریک بوو، بە ناڵە و دەنگی بەرزی

مەکینە لێمان نزیک بوونەوە، چوومە سەر ڕێیەکە و هەستامە سەرپێ، کەریم و پێشمەرگەکەی تر ئامادە لە سەنگەردا بوون، بە دەنگێکی زۆر بەرز دەنگمدان و بۆ دڵنیایی دیسان میلم هێناوە، دەنگی بەرزی خۆم و میل هێنانەوەم لەیەک عانوســاتا، پیکابی لە عاست خۆی ڕاگرت، دەبوو دەســڕێژ بکەم بە هەموو حیســێبێک و دیتنێک دەبوو دێموکرات بن و دەبــوو منیش تۆڵــەم کردباوە، هێزێکی دەروونی و غایب نەیدەهێشــت پەنجەم لەســەر پەلاپیتکەکە داگرم، بە ماوەی کەمتر لە چرکە لێکمداوە ئەوان کە ئێواریێ ڕۆیشــتن، دۆشــکەکە لە پشــتەوە بــوو و دوو کەس لە پێشــەوە بوون، ئەدی ئێســتێ ئەو هەموو ڕەشــایی و زەلامە چن لە پشتی پیکابەکە؟ بە مێشکمدا هات داوای ناوی شەو بکەم پێش دەسڕێژ، گوڕانــدم کێن و ناوی شــەو. دەنگێک بەرز بــووەوە گوتی کۆمەڵەین و ناوی شەو هەڵۆیە! سەرم دەسووڕا و وڕووکاس بووم، دەنگی حوسێن ســنەییم، کە تازە لە ناوچەی سنەوە ناردبوویان بۆ مەهاباد، ناسییەوە. لایتی سەر باسکم دەرهێنا و تێمگرتن و چوومە پێش، ئای کە چیم بینی! پێشــمەرگەکانی شەوی پێش کە خۆمان بەڕێمان کردن و سێ مەیت لە ناویان، پاشــەوپاش کشــامەوە و یەکســەر بە جنێودان بە خۆم و ئەو هــەوادارەی خۆمــان، تفەنگەکم فڕێ دا ناو قــوڕ و لیتەی ناو جۆگەکە. کەریم گوتی، چ بوو عەلی؟! گوتم هەستن کوڕەکانی خۆمانن.

یەکدوویەکیان هاتن بۆ لای ئێمە و پێشیان کەوتین، بەرەو عەولاباد و دێی ئازاد و حاجیاڵیکەند گەڕاینەوە. گوتیان کەسمان جێ نەهێشتووە، ڕەحیم قادری و ســولەیمان لە پشــتەوەڕا لێیان دان و یەکسەر شەهید بــوون. حامــد نەعلی لەناو بازاڕ لێیان دا و شــەهید بــوو، نادر نەغەدە وەسەری کەوتبوو مابوو.

### دیار بوو شاردرابوونەوە

لەنــاو دێی ئازاد هەوادران هاتــن گوتیان دوو کادری حیزب ئێوارە هاتوون و لە ماڵی ئاغان، شەهید و بریندارەکەمان بەڕێ کردن، دەوری

ماڵی ئاغای ئازادیمان دا، سوێند و قورئان کەسی لێ نییە، زۆر گەڕاین دیار بوو شـاردرابوونەوە و کەسـمان دەسـت نەکـەوت و چووینەوە بۆ حاجیاڵیکەند. هەموو پێشـمەرگەکان لە حەوشـە بـوون، هەموومان دەوری کاک کەریـم قـادری بـرا گەورەی شـەهید ڕەحیممان گرتبوو، براژنـە مریەمـی خێزانـی، ڕەحیمی بە بـرای خۆی دەزانـی، هەموانی وەگریـان خسـتبوو، کەمـال و یونس و ڕەحیم و هـەر هەموو هاتن و خۆیان بەسـتبوو، شـەهیدەکان لە حەوزخانەی مزگـەوت بوون، نادر بەڕێ کرا بۆ عیلمئاباد و خەستەخانە. پێشمەرگەکان هەر هەموو داوای تۆڵەمان دەکرد، ئاخر بەڕاسـتی هەرسێکیان نموونە و تایبەت بوون بۆ خۆشەویسـتی و ئازایەتی. موحسـین و سـەید خالید زۆریان حەول دا ئارامامان بکەنەوە و چاوەڕێ بین، ئەوان سەرکردایەتی ئاگادار بکەنەوە و جارێ هیچ نەکەین، کەمال پلانی دانا و هەر لە سـەر خۆڵی عەرزی حەوشـە بە چیلکەدار خەریتەی شەڕەکەی کێشا و هەموومانی دابەش کردبوو لەسـەر ئەو نەخشـەیەی دایڕشـتبوو. کەس گوێی بۆ کۆمیتە ناوچە شل نەدەکرد و دیار بوو بڕیاری خۆمان دابوو. کەمال بەرپرسە نیزامییەکانـی کۆ کردینەوە و تەنانەت پرسـی بە ڕزگار کە بەرپرسـی نیزامیی ناوچە بوو، نەکرد. هەرچەند ڕزگار خۆی باش دەیزانی ڕاستە ئەویان کردووەتە مەسـئوولی نیزامیـی هەموو ناوچەکە، بەڵام هێندەی سەرەپەنجەیەکی کەمالیشی لێ نازانێت!

**هەر ئەمشەو**

کۆمیتە ناوچە بە بێسـیمێکی کۆڵەپشتی هەر خەریک بوون ناوەندی لە خەو هەسـتێنن و پرسـیان پێ بکەن، نەیاندەوێرا خۆیان بڕیار بدەن، هـەر وەک منداڵ کە خۆیان پیس دەکەن، سـەریان لـە ناوخۆ نابوو لە شـەرمان و باش دەیانزانی بڕیاری دوێنێشـەویان، ئەم کارەساتەی لێ کەوتووەتەوە و هەموومان هۆکاری شـەهیدبوونی ئەم سـێ قارەمانە، بـە ئەوان دەزانین. هەر جاروبار کەسـێکیان دەنـاردە لامان بۆ ئەوەی

بوەستین و پەلە نەکەین، کەمالیش دەیگوت ڕۆژ بێتەوە هیچمان بۆ ناکرێت و دەبێ هەر ئەمشەو دەستی خۆمان بوەشێنین و تۆڵە بکەینەوە.

بەرنامەکە ئەوە بوو، لە نزیک حاجیالکەند و قەمتەرێ دێی دەرمان هەبوو، مەقەڕی ڕاگرتنی چەک و تفاقی نیزامیی حیزبی لێ بوو، دەمانزانی مەفرەزەیەکی دێموکرات لەوێن، ئەگەر بە هۆی ئەم شەڕەوە هێزیان بۆ نەناردبێت. هێزەکانمان بۆ سێ قۆڵ دابەش کران، من و دەستەیەک بۆ پشت مەقەڕەکەیان ڕوو بە قەرەبڵاغ، ئەگەر هێزیان نارد لە قەرەبڵاغەوە پێشیان بگرین، کەریم بۆ ناودێ و یونس و کەمال بۆ ناو مەقەڕەکەیان و دەستەیەکش بۆ سەر ڕێی قەمتەرێ، کە بەرپرسی تەشکیلاتی مەهابادی حیزبی دێموکراتی لێ بوو، لە ئەگەری هاتن و فریاکەوتنیان.

نازانم سەرەنجام پەیوەندی گیرا یان نەگیرا، کە دیتیان ئەوە ئێمە هەموو دەڕۆین و کەمال فەرماندەیی بەدەستەوە گرتووە و ناگەڕێتەوە، گوتیان ئەوە کاک حەمەسوور فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی کۆمەڵە دەڵێ باشە با دەرمان بگرن!

لە ماوەی کەمتر لە دوو سەعات هەموو پلانەکە وەک خۆی جێبەجێ کرا، چەند جار حەولیان دا کوڕانی گوشوارە لە قەرەبڵاغەوە هێرش بکەنە سەر ئێمە، شوێنمان بڵیند و موسەیتەر بووین، ئەوان بە داوێنی شاخەکەی پشت دەرمان، دەیانویست بێنە سەر و بچنە سەربانی مەقەڕەکەیان، مەجالیان پێ نەدرا و هەر حەولێکی دایان شکستی هێنا. ئاگر لە سەربانی مەقەڕی دێموکرات بەرز بووەوە و تەنیا بەرپرسی مەقەڕەکەیان دەستی کردبووەوە و بەرگریی کردبوو، کوژرابوو. زیاتر لە دە دیل و تۆپی ١٠٥ و دۆشکە و تفەنگ، بەیانی زوو بە ڕیز گەیشتنە حەوشەی مەقەڕی کۆمەڵە لە حاجیالکەند و مەقەڕی دێموکرات بە تەواوی سووتێندرا.

**دیموکرات گوتی کۆمەڵە نەماوە**

هەر سێ شەهیدیان شۆردبوون و کفنیان کردبوون. نە کەس نانی خواردبوو و نە کەسمان نوستبووین و ئیستراحەتی کردبوو، لەسەر دەستان ئەم سێ جوانەمەرگە نازدار و خۆشەویستەمان بردە سەر گۆڕستانی شەهیدانی کۆمەڵە لە دەرەوەی دێ و ماڵئاوایی یەکجاریمان لێ کردن. دایکی ڕەحیم و کاک کەریم قادری کۆم بووبووەوە و هەر هێندەی بوخچەیەک دەبوو، ژنێکی پەپوولەئاسا، پاک و بێگەرد و نەجیب و تاقانە بوو لە خۆشەویستی بۆ ئەم دوو کوڕەی، خەڵکێکی زۆر کە بە هەواڵی شەڕەکەیان زانیبوو لە کەسوکاری پێشمەرگەکان بەیانی زوو هاتبوون، هەر کەسە لە نیگەرانی بۆ کوڕی خۆی هاتبوو، دێموکرات بڵاوی کردبووەوە دەیان پێشمەرگەی کۆمەڵەمان کوشتووە و کۆمەڵە نەماوە، بۆیە هەرچی کوڕی پێشمەرگە بوو هاتبوون، یان بەڕێوە بوون بۆ حاجیاڵیکەند.

**تازە ڕوو لە کوێ بکەین؟**

زۆر جار دادەنیشتین و دوای دەنگۆی حیزبی کۆمۆنیست و تێکدانی کۆمەڵە و گەندەڵی و بە تایبەت ئابرووچوونەکەی سەید، هەموو ئەوانەی وەک ڕەحیم قادری، سولەیمان ڕەحیمی، یونس پاڵەوانی، کەمال وەلیانی، ڕزگار، شەریف، ڕەحیم، کەریم ، پیرەهەڵۆ، ئەحمەد خاکی، برایان عوسمان و سولەیمانی گردەگروێ و چەندی دیکە کە هەموو نیزامی بوون و وەڕەز لە بارودۆخی ناو کۆمەڵە، دەیانگوت دەیکەین و چارەمان نییە تا شەهید دەبین تازە ڕوو لە کوێ بکەین؟! ڕەحیم و سولەیمان و دواتر چەندی دیکەش لەم هاوڕێیانە ئەم شەرتەی خۆیان بردەسەر و تا شەهید بوون هەر لەناو کۆمەڵەدا مانەوە!

**چرچە تۆپی ١٠٥ی پێوە نابن**

هاتینەوە حەوشــەی مەقــەڕ و دیلەکان و چــەک و تەقەمەنییەکانمان تاقــەت دەکردن. ئەوەندەمان زانی گرمــە بڵیند بووەوە، تۆپێکی ١٠٥ بەر دەرگای مەقــەڕ کــەوت و چەنــد چرکــە دواتر یەکی دی ســەری کرد و لە کۆڵانی تەنیشــت مەقەڕی دا، ســەرمان بەرز کردەوە لە پشــت باخ و دارســتانی دێ بەرەو خاتووخاس لەســەر بڵیندایيەکــە توپیان بەرامبەر مەقــەڕ و نــاو دێ دامەزراندبــوو، هەر هەموو بە پەلــە و غاردان بەرەو تۆپەکــە و جەماعەتەکــەی ڕۆیشــتین، لە مەقەڕ هاتمــە دەر ڕووم کردە شــوێنی تۆپەکەی حیــزب، لە بن دیواری مەقەڕ ســیامەندی موعینم دی چووەتە بن باڵی دایکم و لەناو تەپوتۆزی تۆپەکەدا بوون، نەمزانی دایکم کــەی لە شــارەوە هاتووە و ئایا هیچیــان بریندار بوون؟ دیم ســیامەند دەشــەلی، ئاوڕێکــی خێرا و سەرســووڕمانەم لە ســیامەند دایەوە و بە ڕاکردنەوە و لە دوورەوە تێگەیشــتم ســەلامەتن. لەگەڵ چەند پێشمەرگە گەیشتینە شوێنی تۆپەکە، پێشمەرگەکانی حیزب لەوێ نەمابوون. چرچە[1] هاتبوو بۆ تۆڵەکردنەوە، دوو ســێ تۆپی بەناو دێی حاجیالکەندەوە نا و ڕووی لە ســونجاق کردبووەوە. بە شــەڕەتفەنگ خاتووخاسمان گرت و هەموو بەرەو ســونجاق پاشەکشەیان کرد، ئاشێک لە خوار خاتووخاس، لەســەر ڕێی ســونجاق بوو، پێشــمەرگەی حیزبی تێدا بوو، بە قەناســە تەقەیان دەکرد، لەگەڵ یەک دوو پێشــمەرگەدا لەناو جۆگەیەک لە حەولی بێدەنگکردنی ئەو قەناســەی، کۆنە ئاشــەکەدا بووین، لەناکاو وەک باڵندە برایم غەریب باوەشــی پێدا کردم و فڕێی دامە ئەولاتر، ڕێک فیشــەکێکی قەناســە لەو شــوێنەی منی دا، بۆیە بۆ ئەوجارەیــان خۆم بە قەرزداری برایم دەزانم. برایم کۆنە هاوپۆلی منداڵیم بوو، لە بیستودووی گەلاڕێزانی ١٣٦٤ (١٣-١١-١٩٨٥)دا لە تەرگەوەڕی ورمێ لە کارەساتی شەهیدکردنی بیســتودوو پێشــمەرگەی کۆمەڵە بە دەســتی حیزبی دێموکرات، شەهید

---

١- چرچە، محەمەدئەمین بارام میرزا، یەک لە فەرماندەکانی هێزی پێشەوای حیزبی دێموکرات بوو لە ناوچەی مەهاباد، ساڵی ١٩٨٤ شەهید بوو.

بــوو. کۆنەئــاش گیرا و بــە نێو دارســتان و چنارەکانــی دەرەوەی دێی سونجاقدا ڕوومان کردە ناودێ بۆ گرتنی مەقەڕی شارستانیان. شەڕێکی قورس، ئەوەندە نزیک و چاولەچاو، لەناو دارســتانەکە بەرپا بوو. ئەوان بە تەواوی هێز و تواناوە بەرگرییان لە مەقەڕەکەیان لە سونجاق دەکرد و ئێمەش مکوڕ بووین لە چوونە پێش و گرتنی مەقەڕی سەرەکیان. لای نیوەڕۆ بوو شــەڕ بێبەزەییانە و زۆر بە گەرمی لە پشــتی دێ بەردەوام بوو، ئاگاداریان کردین دەست ڕاگرن و تەقە وەستانە. حەمەسوور خۆی هاتــووە لــە حاجیاڵیکەنــدە و دەڵێ خۆیان قایم بکەن و تەقە بوەســتێنن، ئێمەش گەڕاینەوە خاتووخاس و حەرەسیات و سەنگەرمان قایم کرد.

چەند ڕۆژ لەسەر یەک لە ناوچەی مەهاباد و گوندەکانی حاجیاڵیکەند، خاتووخاس، ئازاد، ســونجاغ، قەرەبلاغ، دەرمــان و قەمتەرێ، ڕۆژانە لە نێوان پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و دیموکراتدا شەڕ بوو، بەداخەوە کوڕێکی خەڵکــی تەورێز، ئەســغەر تــازە هاتبوو بــۆ ناوچەی مەهابــاد لە نێوان خاتووخاس و حاجیاڵیکەند شــەهید بوو، هەروەتــر کوڕێکی تریش هەر لەوێ شەهید بوو، وا بزانم ناوی عەتا بوو. دواتر ئەم شەڕە بە دانیشتنی ســەرکردایەتیی هەردوو لا و گۆڕینــەوەی دیلەکان، بۆ ماوەیەکی کورت کۆتایی هات.

**باقی برای نادر**

لــە گەرمەی شــەڕدا بوویــن ڕۆژی دووهەم یان ســێهەم بوو، نادر نەغەدە لە قەرەداغ لە ســەری درابوو، لە خەستەخانەی ناوەندی کۆمەڵە بــوو. خەبەرمــان نەبوو ماوە یان نا، گوتیان برایەکی نادر پێشــمەرگەی دیموکراتە، هاتووە داوای تۆ دەکات! من و باقی لە تەورێز هاومەزڵ بووین، کــە چووم باقی دەســتەوئەژنۆ لای فەردەلمەکانی ســەنگەرەکەی مەقەڕ دانیشــتبوو، لە باوەشم گرت و دەگریا، گوتی نادر ماوە؟! گوتم هیوادارم مابێت. نادری برای بچووکی بە دەستی پێشمەرگەکانی خۆیان لە سەری درابوو و لە ئانوساتی مان و نەماندا بوو. پەیوەندیمان بە خەستەخانەی

کۆمەڵـەوە کرد و گوتیان ماوە، دوکتۆر دەروێش عەمەلیاتی سـەری بۆ کردووە، باقیمان لەگەڵ پێشمەرگەی خۆماندا نارد بۆ خەستەخانە بۆ لای نـادر. متمانەپێکردنی باقی وەک کادرێکـی حیزب و تێرادیوی بە هاوڕێ کۆنەکانی لەناو کۆمەڵەدا، لە ڕۆژێکی وادا بە پێی خۆی بێتە بەر مەقەڕی کۆمەڵە، بە شـەرتێک لە هەموو لاوە شەڕ و ڕاوەپێشمەرگەی دێموکرات بوو، تەنیا خۆشەویستیی ئەم برایەی بۆ نادر دەگەیاند. من سەری ڕێزم بـۆ نەوی کرد و ئەسـرینم لەگەڵیدا هەڵوەراند. باقـی دواتر ماوەیەک لە خەسـتەخانەی قویتەڵی حیزب نەخۆش کەوت و تووشی قەیرانی فیکری و دەروونی هات. پاش ماوەیەک تەسـلیم بووەوە و لە شـار دەسـتی بە کارەکەی خۆی وەک ئەندازیاری هەندەسی کردەوە.

**ئاگربەست**

دوای یەک دوو وردەشـەڕی تر لە ناوچەی سەردەشـت و هێرشی حیزب بۆ سـەر مەقەڕی کۆمەڵە لە بەردەسوور، دواتر لە بیستوپێنجی خەزەڵوەری سـاڵی ١٣٦٣ (١٦-١١-١٩٨٤)دا حیزبی دێموکرات ئیعلانی شـەڕی گشـتی و سەرانسـەریی لە هەموو کوردسـتان دژی کۆمەڵە ڕاگەیانـد، ئەوکات بـوو کە دێموکرات و موجاهیدینـی خەڵق بەیەکەوە لە «شـوورای میللیـی مقاومەت»دا بوون. ئەم شـەڕە لە هەورامانەوە دەسـتی پێ کـرد و زۆر زوو هەموو کوردسـتانی تەنییەوە. هەرچەند ناوچە ئازادکراوەکانی هەموو کوردستان بە دەستی پاسدار و دەوڵەتی ئێران گیرابوونەوە و پێشـمەرگەکانی هـەردوو لا لە خاکی ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان کشابوونەوە و لە باشـووری کوردستان جێگیر بووبوون. شـەڕی دوو لایەنی دێموکرات و کۆمەڵە هەتـا حەفدەی گوڵانی ١٣٦٩ (٧-٥-١٩٩٠) بەردەوام بوو هەرچەند کۆمەڵە دوو ساڵ پێشتر یەکلایەنە تەقەی ڕاگرتبوو و بانگەوازی ئاشتیی کردبوو. باڵی ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکـرات، کـە جیا بووبوونەوە، ئەوانیش شـەڕیان لەگـەڵ کۆمەڵەدا ڕاگرتبوو.

# ٣٦

**جەعفەر لەجیاتی شەریفی برای ئیعدام کرا**

شەریف لە ماوەی ڕابردوو کە بەرپرسی نیزامیی شار بوو، ئاشکرا بووبوو هاتبووە دەر، پاسدار برا بچووکەکەی، جەعفەری گرتبوو لە جێی شەریف ئیعدامی کردبوو. شەریف کوڕێکی ئازا و چالاک بوو، ماتۆڕسوارێکی پرۆفیشوناڵ بوو، زۆر شارەزای ئەو ماتۆڕانە بوو کە بۆ یاری و کێبڕکێ و شاخ و کێو بەکار دێن، زۆربەی جاران بۆ ناسین و هەڵسەنگاندنی پۆست و مەقەڕ و پایگاکانی دوژمن، شەریف بە ماتۆر دەچوو تا نزیکیان و چی ناسین و زانیاری هەبا دەیهێنا، بوونی شەریف لە حاجیاڵێکەند بۆ من ئاوەدانی و هاودەنگی بوو.

شەریف پێی گوتم عاشق بووە و دەبێ بچین بۆ خوازبێنی. خەجیج کچی خاڵە ڕەحیمی زگدڕاو، بە باب و برا و بنەماڵە خەڵکی باش و دۆستی نزیکمان بوون، عومەری برای خەجیج، هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی، چەند کەس سوار بووین و چووین بۆ خوازبێنی، زۆر بە دڵێکی گەورەوە خاڵە ڕەحیم میوانداری و بەخێرهاتنی کردین، پیرۆزبایی لە شەریف و خەجیج کرا و چەند ڕۆژ دواتر هەر لە زگدڕاو مارەیان بڕی.

**تەقە بەسەر بووکدا**

لە نزیک مەقەڕ لە حاجیاڵێکەند ماڵێکمان بۆ دیتنەوە و زۆر بە زوویی بە هەرەوەزی دایکان لە شار و بەشی تەداروکاتی مەقەڕ، کاک کەریم قادری و براژنە مریەمی هاوسەری، ماڵێکی بچووک و خنجیلانەمان بۆ شەریف ڕاخست و ئامادەی ژنگواستنەوە بوو. لە ڕۆژێکی خۆشی سەرەتای پاییزی ١٣٦١ (١٩٨٢)دا بە چەند سەیارە و چەند دەستە پێشمەرگە چووین و بووکمان هێنا بۆ مەقەڕی ناوچە، من

وەک برازاوا داندرابووم، کە هاتینە بەر حەوشی مەقەڕ و لە سەیارەکان دابەزیین، دەستی بووکم گرتبوو، دەستی ئەولاشی شەریف گرتبووی، بوو بە هەڵپەڕکێ و دەهۆڵ و زوڕنا، خەجیج تارای سوور و سپیی بە سەرەوە بوو، مەقەڕ و حەوشە پڕ بوون لە خەڵک و پێشمەرگە، لەناکاو کردمان بە تەقە، لە بن گوێی بووک بە کلاشینکۆفەکەم یەک ڕیز فیشەکەم بە ئاسمانەوە نا، بووک بە دەستمەوە لەخۆ بووەوە. ئێستاش کە بیری لێ دەکەمەوە چۆن ئەو تەقەیەم ڕێک لە بن گوێی کرد، شەرم لە خۆم دەکەم و دەڵێم، پەکوو لەم وەحشیگەرییە! ڕزگار وەک ئاغاوەتی کۆن لەسەر باڵکۆن و پەنجەرەی ژووری کۆمیتە ناوچە سێویێکی فڕێ دا ڕاست وەسەری بووک کەوت و ئەوجار بە تەواوی بورایەوە، ئیتر وەک نەدیوبدی بووکمان دابەزاند و دەست گیرا بە سەرچۆپی و هەڵپەڕکێ، هیچ ئاگامان لە وەزع و موعاناتی ئەم کچە بەستەزمان و تازەبووک و غەریبە نەبوو!

### بۆ من ناگونجێت

خەجیج و شەریف لەو ماڵە بچووکە سەرەتای ژیانیان دەست پێ کرد و بووبوو بە مەکۆیەکیش بۆ ئێمەی هاوڕێیان، زۆر جاران دەچووین بۆ لایان و بە چا خواردنەوە و قسەکردن کاتمان تێدەپەڕاند.

لە ماوەی سێ چوار ساڵی ڕابردوودا ڕوخساری کیژی قژکاڵی چاوڕەشی ناو ڕەشبەڵەکی زەماوەندی کاکم، هەرگیز لە پێش چاوم ون نەدەبوو، هێلانەیەک لە قوژبنی دڵم بەردەوام جریوەی لێوە دەهات، هەرخۆم و تەنیا هەرخۆم دەمزانی زامی دڵی بێمارم چەند بە سۆیە. بەڵام هیچ کات و مەودایەک لە ژیانی شۆڕشگێڕیی مندا بۆ ئەم شتانە نەبوو، هەر کات و ساتێک بۆ من شەهیدبوون لە پێش هەنگاوەکانم بوو، باش دەمزانی کردنەوەی ئەم پرێسکەیە بۆ من ناگونجێت و هەر ناکرێت. چەند جارێک خورپەی خستە ناو جەرگ و هەناوم. بە بیستنی دەنگۆی خوازبێنی و ڕەنگە بە شووی بدەن و فشاری ماڵەوەیان بۆ دوورکەوتنەوە

لە کاری سیاسیدا، بۆ من گورەوشارێکی چەند ڕۆژە بوو، کە دەیانگوت کێ و کێ ناردوویانە بۆ داوای، هەڵقرچانی هەناو و دەروونم بوو، لە لایەکی دیکەوە عەقڵ پێی خۆش بوو کە ڕزگار دەبم لە گیرۆدەیی، منی خولیای ئازادی و سەرکەش و بێسوکنایی[1]، چۆن دەبێت «ئەسیری بسکی ئاڵۆزی کیژۆڵەیەکی یەخسیر بم و بە دەستی دیلە و دیل بم»؟! نا دیلی و دەستەوەستان بۆ من دەستی نەدەدا و هەرگیز خووم پێوە نەگرتبوو. هەرچەند، کە لەگەڵ خۆمدا تەنیا دەبووم هەستم بەم ڕاستییە شیرینە دەکرد، دڵم لە بەندی قژکاڵی چاورەشێک دایە و ئەوەشم بە «پاژنەی ئاشیل»ی خۆم دەزانی. هەموو جارەکان دەمبیستەوە بە توندی خوازبێنیکەری جواب کردووە و بە ئیرادەوە بەرامبەر ماڵەوەیان وەستاوە و گوتوویەتی من شوو ناکەم، لەو کاتانە دڵم بە بۆنی خۆش و فێنک ئاوپرژێن دەکرا، دڵی خۆم خۆش دەکرد، ئەمرۆ سبەی حکومەت دەڕوخێنین و بە سەربەرزی وەک پاڵەوانەکان دەچینەوە و شار ڕزگار دەکەین، دەنێرم بۆ داوای و گەر هاتوو ڕازی بوو بە من، ئەودەم بەیەکەوە ماڵێکی بچووک پێکەوە دەنێین. ئەو خەون و خەیاڵانە کاری زۆربەی شەوانم بوو کاتێک لە قوژبنی مەقەرێک، ماڵێک، ڕەشماڵێک یان سەنگەرێک بە گرمۆڵەیی خۆم دەخزاندە بن لێفەشڕەیەکی پڕ لە کێچ و ئەسپێ.

ئەو هاوینە مەقەری کۆمەڵە لە حاجیاڵیکەند زۆر ئاوەدان و پڕ لە میوان بوو، کۆمەڵێک کەس و کاری پێشمەرگە ڕۆژانە سەردانی مەقەریان دەکرد و لەگەڵ خۆیاندا لە خەبەر و باسی شارەوە بگرە تا سەرووپێ و شیرینی و بەستەنی و پاڵوودەشیان لەگەڵ خۆدا دێنا.

### شۆرباوی کوردی

پێشمەرگە بە گاڵتەوگەپ و پێکەنینەوە دەژیا، نەدەکرا هەر شینگێڕ بین، شەهید ڕۆژانە هەبوو، بۆیە بوونی کۆمەڵێک پێشمەرگەی ڕوحسووک و بە پێکەنین و قسەخۆش، بزوێنەری هەست و شادیمان

[1]- سوکنایی، ئوقرە، ئارامگرتن.

بوون، قادر برای باقی و نادر نەغەدە، یەک لەم بە بەزم و قسەخۆشانە بوو. شۆرباو لەپـە یەک لە خواردنـە چەندبارەبووەکانی هەفتانە بوو، پێکهاتەکـەی تەنیـا دۆشـاوی تەماتە و ڕۆن و پیـاز و لەپە و ئاو بوو، جاروباریش لە کاتی نیوەڕۆدا دەسـتەیەک پێشمەرگە، یان میوان پەیدا دەبوون، یەکسـەر ئاشـپەزی ڕۆژ چەند قاپ ئاوی وەسـەر دەکرد بۆ ئەوەی بەش بکات، ئیتر دوو دوو بۆیان تێ دەکردین و تێمان دەگوشی و دەمانخوارد. قادر بەسـەری هەڵدەگوت و هەموو بە مۆسیقای لێدانی کەوچکەکان لە بنی قاپە فافۆنەکان، لەگەڵماندا دەگوتەوە:

شـوورباوی کوردی لەپەی تێدایە
تامـی لەپەکـەی وەك زلووبیایە
دەنگی لەپەکـەی، لە قاپی فافۆن
دەنگدەداتـەوە، وەك گرامافـۆن
زیڕە، زیـڕە، خومایـزی[1] زیڕە
دەچمەوە شـاری، دەبـم بە تودە
بەستەنی دەخۆم، بە کەوچکی داری
زیـڕە، زیـڕە، خومایـزی زیڕە

ڕۆژێک پووری فاروق بللوری لەوێ دەبێت و گوێی لەم هاتوهاواری قادر و پێشمەرگەکان لە سەر سفرە دەبێت، دەست دەکات بە گریان و یەکسـەر دەگەڕێتەوە بۆ شـار، بەیانی بە جێبێک پڕ لە شـیرینیی عەلی خومایـزی و خـواردن و تەنانـەت پاڵوودە، لەگەڵ سـێ چـوار دایکان گـەڕاوە مەقەڕ و لە دوورەوە هـاواری کرد: «بەقوربانوو بم، ها! ئەوە بەسـتنی و پاڵوودە، نەکەن بگەڕێنەوە بۆ شار، دایکوو بەقوربانوو بێ، هەر ئیشـتیاتان کرد بنێرن خۆم بۆتان دێنم، لەسـەرووگەڕێم مەبن بە «دوودە» مەبەستی حیزبی تودە بوو!»

---

١- خومایزی، پاشـناوی بنەماڵەیەکی کۆن و ڕێزداری شـاری مەهابادن، ناوبانگی دوکانی قەنادی و شیرینیدروستکردنیان هەیە.

## کچە قژکاڵی چاوڕەش

هەر ئەو ڕۆژانە بوو، لای قاوەڵتوون جێبێک هاتە ناو دێ و بەرەوە مەقــەڕ هات، چەند ژنێکی لــێ دابەزین، کێ ببینم؟! لەگەڵ دایکی و یەک دوو ژنــی دی بــە دەســتی پــڕ لە خواردن و شــتومەک، کچــە قژکاڵی چاوڕەش بە جلێکی جوانی کوردیی ســابلاغی، بە لەشــولارێکی مەتین و پــڕ لە نەزاکەت و شــەرمی کچانــە نیگای چاوەکانــی هەڵێتەکاندم و لە ئاســت خۆم وڕ و ســڕی کردم. لــەدوای ڕۆیشــتنەوەیان لە قزڵجە ئــەوە یەکەم جار بوو دەمدیتەوە. هاتبوون بۆ ســەردانی برا و خزم و دۆستانی دی، یەک دوو ڕۆژ مانەوە، شەرم و نەوێریم وای کرد لە یەک دوو جار بە سەرپێی نەبێ، نەچم بۆ لایان. ئەوەی ئەم کیژەی لە هەموو ئەوانی دی جیا دەکردەوە، نیگای چاوەکانی بوو، پڕ لە مەندی و شەرم و سەنگینی بوو، هەرگیز هەستت پێ نەدەکرد بەدوای شتێکدا دەگەڕێن، کراسێکی لەخت و شۆڕی موکریانی بە ڕەنگێکی ماتی خاکیی گوڵگوڵی، دەســماڵێک و پشتێندێکی سرکەیی ڕەش و سپی، لەچکێکی یەشمی، کە قژ و گەردنی داپۆشیبوو، وڵێوێک[1] بوو بە چەشنی ئەو وێنانەی مرۆڤ خــۆی ناگرێ لەبەریــان و دڵ بەرایی نادا لــە چاولێهەڵگرتنیان. ئەو بە مانای تەواوی وشەی شاعیر، «پەریزادی جوانی مەهابادی» بوو و لە بنەماڵەیەکی نەجیب و شۆڕشگێڕ خولقابوو.

## هەر خەریکی شەڕەسەگ بوو

دووبەرەکی لە ناو بەرپرســان و پێشــمەرگەکانی ناوچەی مەهاباد گەیشــتبوو بــە ئیهانەکــردن و ناوناتۆرەلێکدان. دوو بــەرەی تەواو دژ بەیەک هەبوون، لە هیچدا هاوڕا نەبوون و تەنانەت بۆیان کرابا ئیشیان لێکتریــش تێــک دەدا. حکومــەت یەکبەدوایەکــدا دەهاتە پێــش و چەند ناوچەی گرنگی ســتراتیژ و ئازادی لە پێشــمەرگە ستاند و داگیری کرد

١- وڵێو، پێکەوتوو، شۆخوشەنگ، جوانچاک.

و مۆڵگـە و مەکـۆی سـەربازیی لێ دانان. بیرمان کردەوە وا باشـە لە جادەی مەهاباد-گویکتەپە گورزێکیان لێ بوەشێنین. لە ڕۆژی حەڤدەی مانگـی ڕەزبەری ١٣٦١ (٩-١٠-١٩٨٢)دا، یونس پاڵەوانی گوتی، دەچین بـۆ نـاو باخەکانی ئەو ناوە و کەمین دادەنێین، ئێواران سـتوون دێ و کەمین هەڵدەگرن، ڕێک لەو کاتەدا دەسـتیان لێ دەوەشـێنین و کاتیان زۆر نابێـت تـا تاریکداهاتن. لەگەڵ یونس و یەک دوو دەسـتە چووین و بە درێژایی یەک دوو باخی سـەرجادە لە کەمیندا دانیشـتین، ستوون هات و زۆر بە کتوپڕی دەسـتمان وەشـاند، دەسـکەوتی باشمان بوو، خەریکی کۆکردنەوە بووین، لە خانووی یەک لە باخەکانەوە تەقە دەکرا، پاسـدارێک خۆی گەیاندبووە خانووی باخەوانەکە و چووبوو لە نهۆمی سـەرەوە سەنگەری گرتبوو، تەواو موسـەیتەر بوو بە سەرماندا، یەک پشـوو تەقەی لێ دەکردین، یونس خۆی لە خانووەکە نزیک کردەوە و ویستی بە پلیکانەکاندا بۆی وەسەرکەوێت، لەناکاو پاسدار قومبەلەیەکی فـڕێ دا خـوارێ و هـاوار لـە یونس بڵیند بـوو، پڕیشـکێکی گەورەی قومبەلەکە وەسـەر مسوڵدانی کەوتبوو، ڕامانکێشا و دوورمانخستەوە، خانووەکەمان ئاگر تێبەردا. سیمورغەکەی پێی هاتبووین لەمبەری جادە بەرەو خاتوونباغ لەناو باغەکانی لای ڕاسـتی جادە جێ هێشـتبوو، بە پەلە چووم و سـیمورغم بەسـەر جادەدا هێنا بۆ لای یونس، جێمان لە پشـتەوە بۆ ڕاخسـت و دوو پێشـمەرگە لەمبەر و ئەمبەری دانیشـتن، سیمورغ فڕی و لە بەردەرگای نەخۆشخانەی وەتەمیش وەستا، دوکتۆر لوقمان و شـاکری هاتنە دەر، یەک لەو پێشـمەرگانە، مینە گوتی، کاکە بـا داینەگرێـن و بگەڕێینـەوە، یەک بۆخـۆم هاوارم کـرد و گوتم بۆ؟! گوتیان هەر ئێسـتا تەواو بوو، تا بەر ماڵانناڵەی دەهات، دوکتۆرەکان هەر لە پشـت سـیمورغ فەحـس و چاویان لێ کرد، گوتیـان بەداخەوە خوێنڕێژی ناوسـکی کردووە و شـەهید بووە. لەدەسـتدانی دۆستێکی دێرینـی سـەردەمی منداڵیم دیسـان کارەسـاتێک بوو. زسـتانی پار و بەهاری ئەوساڵ هەمووی بەیەکەوە لە ئالان بووین بۆ هێنانی چەک و

ئەڕزاق و هەمیشــە دوو هاوڕێی گیانیبەگیانی بووین. ملی سیمورغمان وەرســووڕاند و بــەرەو حاجیاڵیکەند چووینەوە، بە کوشــتنی ســەدان پاســداریش برینــی لەدەســتدانی یونــس بۆ مــن ســاڕێژ نەدەبووەوە. کــوڕەکان گوتیان، لەوێ بووین تا هەمــوو خانووکە بووەتە خوڵەمێش و باخەوانەکەیــان لەگــەڵ خۆیانــدا بــە دیلــی هێنابوو، گومــان هەبوو پاســدارەکەی لە ماڵەکــەی خۆی ڕێ دابێت، بۆمان پرســیار بوو چۆن خۆی گەیاندووەتە ناو ئەو ماڵە و چووەتە ســەرەوە. هەموو شــەوەکە لــە مزگەوتی ناودێ بەدیار یونس-ەوە دانیشــتین و شــینمان بۆ گێڕا، بەیانی زوو لە گۆڕستانی شەهیدانی کۆمەڵە لە حاجیاڵیکەند بە خاکمان سپارد و ماڵئاوایی ئەبەدییمان لێ کرد. باوکی و کەسوکاری هاتبوون و لە سەرقەبران بوون. عادەت بوو پێشمەرگە، کە بە خاکیان دەسپارد بەرپــرس قســەی دەکرد و هەمووش هــەر ئەوە بوو: لــە بنەماڵەیەکی زەحمەتکێــش و هــەژار گەورە بووە و بۆ مافی زەحمەتکێشــان هەر لە منداڵییەوە خەباتی کردووە...، عەینی شــت کاک موحســین دەستی بەم قســانە کرد و گوتی شــەهید یونس بە هۆی نەداری و هەژاری دەستی لــە خوێندن کشــاندەوە و بۆ بژێوی و یارمەتیی باوکی زەحمەتکێشــی دەســتی بە کرێکاری کرد و... باوکــی لەناو جەماعەت دەنگی بڵیند کرد و گوتی وەڵا بابم هیچ وا نەبوو! کوێرەوەریی دنیام دەکێشــا بۆ ئەوەی بخوێنێت و شــوکور وەزعمان باش بــوو و هیچ فەقیر نەبووین. یونس بۆخــۆی نەیخوێند و هەر خەریکی شەڕەســەگ بوو و بە قســەی منی نەدەکرد! ئیتر دوای قسەکانی موحسین و وەدەنگ هاتنی باوکی یونس، بێدەنگی باڵی بەســەردا کێشــاین و چەند کەسێک چووینە لای باوکی و دڵمــان دایەوە و گوتمان ئەم قســانە هەر دەبــێ بکرێت و ئێوە نیگەران و لە دڵی مەگرن. یونس یەک لە فەرماندە نیزامییە چوســت و چالاک و بوێرەکانی کۆمەڵە بوو، کوێ سەخت و عاستەم بایە یونس لەوێ ئامادە و گیانلەسەردەست بوو.

# ٣٧

## سیامەند هەنگوینی نەهێشت

سـیامەند زەردوویی گرتبوو، لەوبـەری ئاوایی ژوورێکی بچووکی سـەر بیری ئاوی لێ بوو، ئەوێی ڕاخسـتبوو، خۆی دوور خستبووەوە نەکوو خەڵکی دی تووشی بن، هەرچەند ئەوێشمان کردبووە مەکۆیەکی خۆمـان و زۆر جاران لەبەر هاوڕێیان شـوێنی دانیشـتن نەدەبووەوە. کەسـمان ترسی گرتنەوەمان لێی نەبوو. سیامەند خۆی هەنگوینی زۆر پێ خۆشە، گوتیان هەنگوین بۆ زەردوویی باشە، ئیتر سیامەند هەنگوینی لەو ناوە نەهێشت و هەر بە قاپان دەیخوارد. ڕۆژانە سەردانمان دەکرد و خزم و کەس و دایکەکانیش، کە دەهاتن بۆ لای دەچوون. سیامەند لە لای هەموومان خۆشەویست و تاقانە بوو.

پاسدار و حکومەت لە جادەی مەهاباد- میاندواوەوە، بەرەو قووڵایی و ناوچەکانـی مەحال و ژێر ئیدارەی پێشـمەرگە دەهاتن، هەواڵمان بۆ هات هاتوونە دێی بادام و ماویشـنەوە و لە پشـت بڵێندایییەکەی گوندی بـادام بنکەی سـەربازیان داناوە. تەدبیر کرا تـا زووە بچین لێی بدەین تـا خۆیان قایم نەکردووە. چەند کەس لـە ژووری کۆمیتەی ناوچە کۆ بووینەوە و خەریکی پلاندارشـتن بووین، سەید خالید گوتی، من دێم و کـرا بە فەرماندەی ئەم عەمەلیاتە، سـەید ڕەحمانە درێژ کە خۆی وەک بەرپرسی نیزامیی ناوچە بوو، لە جێی ڕزگار داندرابوو، ئەویش گوتی، خۆم دەبم بە فەرماندە. چەند بەرپرسی تری پەل و مەفرەزەش هەبوون. بە ئاشـکرا دوودەستەگی و شپرزەیی بەو پێشمەرگانەوە دیار بوو، کە قـەرار بوو ئێـوارە بڕۆن و پایـگای تازەداندراوی بادام بگرن. سـەید خالید وەک کارەکتەری زەقی «بینشی نوێ» وا بوو، سەید ڕەحمان بە حسێبی دواکەوتووەکان و پۆپۆلیستەکان دادەندرا. ئێوارە لای سیامەند

قســەمان لە گرتنی ئەم پایگایە دەکرد و کەســمان فەرماندەیی ئەم دوو کەسەمان بەدڵ نەبوو، لە ڕاستیدا هیچیان ئیی ئەم بوارە نەبوون، لەناو پێشمەرگەشدا هیچ خۆشەویست نەبوون و ئۆتۆریتەیان نەبوو. بەهمەن مــەلازادەگان کەســوکاری هاتبــوون و دەســتێک کەواوپانتۆڵی جوانی ئەفســەرییان بۆ هێنابوو، گوتی منیش دەچــم. زۆرمان پێ گوت برا تۆ کەســوکارت هاتــوون مەچووە. ئینکار بوو گوتی هــەر دەچم. برایەکی بەهمــەن، کاک حەمەدەمیــن کادری کۆمەڵە بوو لەگەڵ هاوســەرەکەیدا ماڵیــان لە حاجیاڵیکەند بوو، براژنە عەتیفــەی خێزانی هەر لە ئەوەڵەوە لەناو پێشــمەرگەدا بوو، لەگەڵ هەمووماندا وەک خوشــکی لێ هاتبوو، گوتــی تووخوا مەهێڵــن بەهمەن بچێت، دڵم جۆرەیەکــە. عەتیفە تایبەت لەگــەڵ بەهمەنی هێوەریدا زۆر نزیک بوو، گوتمــان جوابمان ناداتەوە. هات بە چاوی گریانەوە باوەشی بە بەهمەندا کرد و سوێندی دا ئاگای لە خۆی بێت. هەســتام هەر لە لای ســیامەند پشــتێند و جامانە و جلە تازەکانیــم بۆ ڕێکوپێک کرد و دەســتمان بــە گاڵتەکردن کرد و گوتمان ئەم جلە تازانە ئیی شــەڕ نین و ئیی زاوایەتین. جامانەکەی لە تازەکان و هەرە باشــەکان بوو، کە دەتشۆری زۆر زوو ویشک دەبووەوە، زۆر بە توندی بۆم بەست تاکو لەسەری نەخزێت.

دوو ســێ دەســتە پێشــمەرگە ڕۆیشــتن، شــەریف تــازەزاوا بوو، نەمانهێشــت بچێــت و منیــش بەرپرســی مەقــەڕی ناوچە بــووم و لە ئامادەباشــیدا بووم بۆ هەر ڕووداوێک. ڕەنگە باشــم لــە بیر نەمابێت، بەڵام وا بزانم تەنیا بەرپرسی نیزامیی بەئەزموون و لێزان کە لەگەڵیاندا بوو، کەریم ئەفسەر بوو.

### شەڕەکە ئاوا دەستی پێ کرد

هاوڕێیانمان ڕۆیشــتن و شــەو نەهاتنەوە، زانیمــان پایگا نەگیراوە و بەری بەیانی هەموو پاشەکشــەیان کــردووە بۆ گوندی قوڵقوڵە زۆر نزیکی بادام، شەڕەکە ئاوا دەستی پێ کردووە:

پێشمەرگەکان بە فەرماندەیی سەید خالید و سەید ڕەحمانە درێژ لە ناو ئاوایی بادام بڵاو بوونەوە، دوای تێکگیران و قسەوباســی سەرپێی ســەرەنجام کەریم و چەند پێشــمەرگەیان ناردووە بۆ سەر پایگاکە بە تاریکی، ســەردەکەون و لێیان نزیک دەبنەوە، بەر قومبەلە و دەسرێژی تفەنگیان دەدەن و بە ئارپیجی هەموو شــاخەکە دەکەنە ئاگر و گوللەی ڕووناککەرەوەیــان بەســەردا دەبارێنن. حوســێن خەپــە بریندار دەبێ و کەریــم لــە بن بەردێــک لە خوار مۆڵگــەی پاســدارەکان دایدەنێت و دەڵــێ مەبزوو ئێســتا دەچــم دوو کەس دێنم و دەتبەینــە خوار. کەریم دەڵێ هاتمەوە نەمابوو، دیار بوو پاســدار هاتبوونە سەری و بە دیلیان گرتبوو. هەموو بە شپرێوی و هیلاکی دێنەوە ناو ئاوایی بادام و دەڵێن نەگیرا و حوســێنمان بەجێ هێشــتووە. کەریم و یــەک دوویەک دەچن بــەدوای حوســێندا، نایبیننەوە و تــا نزیک پایگاکە دەچــن هیچ فایدەی نابێت و حوســێن بووەتە ئاو و بە عــەرزدا ڕۆچووە. تا دەگەنەوە لای ئەوانــی دیکە، تەواو شــەو درەنگــی کردووە و پێشــمەرگەکان هەموو بــە هیلاکــی لە ناو دێ بڵاو بوونەوە. چ بکەین چ نەکەین و هەر کەســە شــتێک دەڵێت و کەس حیســێب بۆ ئــەم فەرماندانە نــاکات، یەک دەڵێ بــا تــا ڕۆژ نەبووەتــەوە بڕۆین و ئــەوی دی دەڵێ با بچیــن بۆ ئاوایی قوڵقوڵە. دێنە ناو ئاوایی قوڵقوڵە دیسان مشتومڕی ئەم دوو فەرماندەیە دەســت پــێ دەکاتەوە، جیبێک و ســیمورغێکیان پێ بــوو، کەچی لەبەر دووبەرەکــی و یەکتــر تاوانبارکردن بە نەزانی و ترســنۆکی، بڕیاریان بــۆ نادرێت. هەر ئەوکات پێش ڕووناکی بگەڕێنــەوە بۆ حاجیاڵیکەند و بــە تێداچوون، یان بەدیلگیرانی حوســێن ڕازی بن. لە دەوری مزگەوت و دێ پێشــمەرگەکان لــە ماندوویی و لە برســان هــەر کامەیان لە بن دیوارێک خەوی لێ دەکەوێت. کەریم بەزۆری پێشمەرگەیەکی دەستەی خۆی دەنێرێتە بڵیندایی پشتی دێ بۆ چاودێری. سەید ڕەحمان و سەید خالیــد هەر لە موناقشــە و قسەوباســدا دەبن، لەناکاو پێشــمەرگەکەی دەســتەی کەریم دێتەوە ناو دێ و هاوار دەکات، هەڵێن پاســدار هات.

ســەید خالید تەنانەت بە ســەید ڕەحمان دەڵێ چاکت فرۆشتین و سەید ڕەحمانیش هەمان شــتی پێ دەڵێتەوە، ئیتر هەر کەســە بۆخۆی قەرار دەدا چــۆن بــەرەو دێی ئازاد پاشەکشــە بکات، کە لە نێــوان قولقولە و حاجیالیکەندا بوو.

### شەهیدی نێو دارەکان

یەکەم دەســتە پڕ بە ســیمورغێک بەیانی زوو خۆیان بە حەوشەی مەقــەڕی حاجیالیکەنــدا کــرد و بە هاتوهــاوار گوتیان، فریــای ئەوانی دی بکــەون لــە پێش ئاوایــی قولقولە لەناو چنارەکاندا عاســێ بوون و ڕێی پاشەکشــەیان خۆمپارەبارانە[1]. شــەریف بە ماتۆڕێکی وەرزشــی ڕۆیشــت، منیش بە ســیمورغەکە چووم بۆ ئاوایی ئازاد، بەرامبەر ئازاد پایگایەکــی تریــان لێ دابوو، نێــوان قولقولە و ئازاد، شــێوەردێک بوو تازە کێڵدرابوو، ڕۆیشــتن و ڕاکردن لە ژێــر بارانی خۆمپارە و قەناس بەنــاو شــێوەردا کاری وزەی تراکتۆرە، نەک بنی ئــادەم. لە دوورەوە ناو دارستانی پێش ئاواییمان دەدیت، جێبەکە پڕ لە پێشمەرگە بە قەراغ شــێوەردەکەدا خۆیــان گەیاندە ئــازاد و لای ئێمە، کەریم ئەفســەریان لەگەڵدا بوو، گوتی تەنیا بەهمەن و کەریم کەلهوری، یوسف جیهانگیری، عەلــی بۆزە و ئەنوەر حەســەنخالی و یــەک دوویەکی تر ماون. ئەوەی ئــەو ڕۆژە بە چاوانی خۆم لە شــەریفم دی چی بــەم ماتۆڕە دەکرد لە ناو ئەو شێوەردە، دڵنیام بە فیلمیش دروستی بکەن کەس باوەڕ ناکات و ناگێڕدرێتەوە! بۆچی شــەریفیان لەگەڵ ئەو پێشــمەرگانەی لە پشتی ماتۆڕەکەدا ســواری دەکــردن نەئەنگاوتن؟! خــۆ وەک هێلکەی داکراو لەناو شــێوەردەکە وا بوون، حەرەکات و فڕینی شــەریف بە ماتۆڕەکە نومایشــێکی سەرسووڕهێنەر بوو. شــەریف چەند جارێک بە ماتۆڕ بە ناو شــێوەردەکەدا بە بەرچاوی ئێمەوە لەمســەر و پاســدار لەوسەری دەشــتایی کێڵــدراو ڕۆیشــت و هاتەوە، هەر جــارە یەکێکیانــی دێنا و

[1] - خۆمپارە، هاوەن.

دەگەڕاوە، نێوان ئازاد و قوڵقوڵە ئیتر بە تەواوتی کرا بە جەهەننەم و بە هاوەن و تۆپان جارێکی تریشیان کێڵا. دوای حەول و تەقەلایەکی زۆری هێنانەوەی پێشمەرگەکان و بریندار و شەهیدەکان، سەرەنجام یوسف جەهانگیری، فایەق تاهیری و عەلی بۆزە، کە بەداخەوە هەرسێکیان زۆر مێرمنداڵ و تازەپێشمەرگە بوون، بە بەرچاوی هەموومانەوە، لە شێوەردەکە و لەناو چنارەکانی دەرەوەی قوڵقوڵە بە قەناس لێیان درا و شەهید بوون. مەیتی هەرسێکیانمان هێناوە گۆڕستانی شەهیدانی حاجیاڵیکەند. ئەنوەر حەسەنخاڵی ئەویش مێرمنداڵ و تازە بوو، بەناو شێوەردا خۆی گەیاندە ئێمە، هەرچی لێمان پرسی هەر بە تەنیا بووی؟! گوتی، «کەس لەناو دارەکان نەما، منیش هەر خۆم بە هەڵاتن بەناو شێوەردەکەدا هاتمەوە».

ئێوارە درەنگ سێ لاوی تازەپێگەیشتووی جوان لەناو حەوزخانەی مزگەوت ڕاکێشرابوون و ئامادەی لەبەرکردنی کفنی شەهیدانی سەربەرزی کۆمەڵە بوون.

### لە سایەی هاتنی حیکمەت

دوای بەسەرکردنەوە، زانیمان زیانەکانی ئەم چالاکییە ناسەرکەوتوو و کارەساتە، کە بەشی زۆری بەرپرسانی خۆمان بوونە هۆکاری و تەنانەت ئەو نیفاق و دووبەرەکییەی لە سایەی هاتنی مەنسوور حیکمەت و ڕوانگە و تیۆرییەکانی تووشی بووبووین و یەکترمان بە فرۆشتنی ناوچەکە تاوانبار دەکرد، سێ شەهید، چەند بریندار و چوار دیلمان هەیە و هیچ دەسکەوتێکمان نەبوو. بە هۆی نەمانی دیسپلین و نەزمی ناو پێشمەرگە و بێکیفایەتی بەرپرسان، هەر کەسە قسەیەکی دەکرد و ڕووداوەکەی دەگێڕاوە. یەکیان گوتی بە چاوی خۆم بینیم هەژاریان بە زیندوویی گرت. ئەوی دی گوتی کەریم برای حوسێن خەپە خۆی تەسلیم کرد و... هەرچی دەمهێنا و دەمبرد ئەدی باشە تەنیا بەهمەن دیار نییە و کەس باسی ناکات، شەهید بوو یان گیرا؟!

**بۆچی وا نەزان و دەروێش بووم**

کارەساتی خراپی و شکستی ئەم شەڕە پڕ لە شەهید و بریندار و بەدیلگیرانە، بەبێ هیچ دەسکەوتێک کاری کردە سەر زۆربەمان، چاوەڕوان بووین سەرکردایەتیی کۆمەڵە بێت و ڕەخنە و جەزا بخاتە سەر هەموو بەرپرسەکان، بە تایبەت کۆمیتەی ناوچە، موحسین و سەید خالید و ڕزگار و سەید ڕەحمان و تەنانەت هەر هەمووی ئێمەش کە ئاگاداری ئەم شەڕە بووین و پلانمان بۆ داڕشتبوو. زۆر بەداخەوە تەواوی ئەم شەڕە دیزەبەدەرخۆنە کرا و تەنانەت کەس بە کەسی نەگوت بۆ وامان کرد، هەر ئەوەندە سەید خالید بە سەید ڕەحمانی گوتبوو فرۆشتت! لەم کاتانەدا بوو هەستم دەکرد ئیتر چیدی وەک پێشوو خوێنی پێشمەرگە و لاوەکانمان بۆ بەرپرسان و سەرکردایەتیمان، وەک جاران جێی بایەخ و داخ و حەسرەت نییە!

ڕۆژی دواتر ڕێکخستنەکانی ناوشار هاتن و دەنگدانەوەی کارەساتباری ئەم شەڕەیان لەسەر زاری خەڵکی مەهاباد بۆ دەگێڕاینەوە. گوتیان، هەواڵی ڕاستمان هەیە لە دیتنی بەهمەن، کەریم و حوسێن خەپەی کەلهوری و هەژار کەریمی، گوازراونەوە ناو پادگانی مەهاباد و هەر چواریان بە دیل گیراون، ئەوە یەکەم جار بوو لە شەڕێکی وا سادەدا، ئەوەندە شەهید و دیل بدەین، ئەمە تەنیا هۆکاری هەستنەکردن بە بەرپرسیاریەتی و بەهێندوەرنەگرتنی گیانی پێشمەرگەکانمان بوو. گۆڕینی دید و بۆچوونمان بوو، بە «بینشی نوێ» بۆ شەهید و پێشمەرگە و کەسبەکەسی بەرپرسان و دووبەرەکی لە ناوچەی مەهاباد و شایستەنەبوونی بەرپرسی یەکەم. کاک موحسین ڕەحیمی و دواتر سەید خالید سیادەت کە هەردوو لە دەرەوەی ناوچەی مەهاباد، بەسەر ئێمەدا داسەپێندرابوون! ڕزگار و سەید ڕەحمانیش ئەوە هەر هیچ، دوو گێلەپیاوی نەزان بوون، کە تەنانەت ئێستاش دوای چل ساڵ و لە ئەورووپا ژیاویش نازانن ناوی خۆیان بنووسن! ئاخر

چۆن دەكرێت ئەوانە بەرپرسی دەیان سولەیمان بللوری و ڕەحیمی و سوهەیلی و كەمال و یونس و جەعفەر و بەهمەن و ئەحمەد و ئاكام و كێ و كێ...، لە بەرپرسانی سیاسی و نیزامی ناوچەیەكی گەورەی وەك مەهاباد بووبن و تا ئێستاش وتارێك، لێكدانەویەك، شیكارێكی زانستی و نیزامییان لەو هەموو شەڕ و پێكدادانی كۆمەڵە نەبێت و ئێمە هەموومان دەبێت، چەند دەروێش و لەوان نەزانتر بووبین كە چووینە ژێر باری بەرپرسیارەتی و ژێردەستیی ئەم جۆرە پیاوانە؟! ئێستاش كە بیری لێ دەكەمەوە هەزاران جار سەركۆنەی خۆم دەكەم، بۆچی وا نەزان و دەروێش بووم!

یەك بەدوای یەكدا لە ڕێكخستنەكانی ناو شارەوە خەبەر دەهات بەهمەن لەگەڵ گیراوەكاندا لە پادگانە. گوتمان با دیلێكی باشیان لێ بگرین و گۆڕینەوەیان لەگەڵدا بكەین. لەگەڵ كەریم ئەفسەر و كەمال وەلیانیدا دەستەیەك ساز بووین و بەرەو شار بووینەوە، بەهمەن و یونس پاڵەوانی بۆ من و كەمال زۆر تایبەتی بوون، من لەگەڵیاندا ژیابووم و كەمال لەگەڵیاندا زیندانیی كێشابوو، هەمووی هەفتەیەك بوو یونسمان لە كیس چووبوو، ئامادە بووین خۆمان بە ئاو و ئاگردا بدەین و بەهمەن بێنینەوە ناوخۆمان.

## گۆڕینەوەی دیل

مامۆستایەكی مەدرەسەكانی مەهاباد هەبوو هەرچی مامۆستای شار بوو شكایەتیان لێی هەبوو، تەواو چووبوو ژێر باڵی مەلایان و یارمەتیی حكومەتی دەكرد، بە دەیان مامۆستای پاكسازی كردبوون و لە كاری لادابوون، بە بیانووی «زیدیی ئینقلاب»بوونیان. گوتمان، دەچین و دەیهێنین مادام ئەوەندە بۆ حكومەت گرنگە، بە دڵنیاییەوە گۆڕینەوەی دیلەكانمان لەگەڵدا دەكەن.

دوای پرسوڕا دەركەوتماڵیان بە پادگانی شارەوە نووساوە و لەبەر خراپەی زۆر كە دەرحەق خەڵكی شار و ئیدارەی فەرهەنگ

کردوویەتی زۆر لە خۆی دەترسێت. دەستەیەکی دانسقە ساز بووین و شەو بە سەرقەبراندا خۆمان بە شاردا کرد، دوو پەڕینەوەی سەختمان لە پێش بوو، یەکەم لە مەیدانی ئابیاری (فوتبۆڵ) بۆ بەری کۆڵانەکانی هەشت مەتری و لەوێشەوە بۆ لای پادگان، لە هەردوو جەمسەری ئەم پەڕینەوەیە مەقەڕی پاسدار هەبوو بە پرۆژێکتۆری زۆر بە هێزەوە، دەرگای مەیدانی فوتبۆڵ ڕێک لە نێوان حەمامی مەولەوی و پادگاندا بوو، هەردوو لا حەرەسیاتی پاسداری لێ بوو. دەبوو یەک یەک لەسەر سینگ و بە ئەسپایی لە پانایی خیابانەکە بپەڕینەوە، هەر وامان کرد، یەک دوو جار دەنگی مەخزەن و قایشوقروشمان وای کرد پلاژۆکتورمان تێگرن و بە سەدان تەقە بکەن، خۆمان مات دەکرد و ئارام دەبوونەوە، هەمووومان پەڕیینەوە و بە پشتەوەدا خۆمان گەیاندە بن پادگان و ماڵی کابرای جاشی حکومەتی، بە سەرباندا لێیان وەژوور کەوتین، کچێکی بێعار و دمهەراشی بە هاتوهاوار خەریک بوو پادگان و خەڵک تێکەیەنێت، بێدەنگ کرا و بابەکەیمان بە دەستوچاوبەستراوی هێنایە دەر.

### مامۆستای بارمتە

ماڵی کابرایەکی توودەیی لەو نزیکانە بوو، گوتمان مادام زوویە و سەرکەوتوو بووین لەم کارەمان، با ئەم تودەییە کە زۆری خەڵک بێزار کردووە بیبەین. ماڵی خالید چالاکی جیرانیان بوو، گوتمان، دەچین بۆ حەوشەی ئەوان و لەوێرا لەناکاو خۆ بە ماڵیاندا دەدەین و دەیبەین. دایە فاتم دایکی خالید، کە لە نزیکەوە زۆر ئاشنا بووین، بەرەوپیرمان هات و بە شەربەت و میوە زۆریان خزمەت کردین. داوای نەردیوانێکمان کرد پێی وەسەربان کەوین. دایە فاتم گوتی بۆ دەچن، دەزانم بۆ کوڕەکەیان هاتوون، بە خوا و بە پێغەمبەر ئێوارە خۆم بینیم، چوو بۆ تاران. گوتمان، مادام وایە با نەزانێت بۆی هاتووین، بۆ جارێکی دی. ماڵی باوکم دوای گرتنەوەی شار هەر لە خانووی کرێدا

بــوون، دەمزانی بە تازەیی هاتوونەوە گەڕەکــی کۆنی خۆمان و لەوێ ماڵیــان بــە کرێ گرتووە، لــە کۆڵانی خوار ماڵە کۆنەکەمــان، بەرامبەر کۆڵانی خەجەی حەمەدە. ساغ بووینەوە سەرێکیان لێ بدەین، لە کۆڵانی دوکانی خەجەی حەمەدە و حەمامی پاک دیســان لە دوو لاوە مەقەڕی پاســدار بــوو، لایەک لای ماڵــی حەبیبی و لای خوارێش لــە چوارڕێی ئازادی، هەر بە هەمان دەستووری پێشوو پەڕیینەوە بۆ کۆڵانی ئەوبەر. تەنیا من و کەریم و کەمال و موبەشــیر بووین، پێشــمەرگەکانی دیمان لەگــەڵ کابرای جاشــی حکومەتیــدا لە کۆڵانەکانی هەشــت مەتری جێ هێشت بۆ نانخوارن و قسەکردن لەگەڵ خەڵکدا.

## چاوبەستراوی چاوساغ

زۆرم چاو گێڕا و چاوەچاو کرد نەمزانی لە کام ماڵدان، نەماندەوێرا لە ماڵەکان پرسین. هاوشارییەکمان لە پەنجەرەوە گوێی لە دەنگەدەنگی ئێمە بوو، هاتە سەر پەنجەرە و گوتی، بە قوربانتان بم لە چی دەگەڕێن؟ ناسیم و گوتم لە ماڵی باوکم دەگەڕێین. هاتە خوار، نیشانی داین و تێر ماچی کردین. ماڵێک بوو پەنجەرەی ئاشپەزخانەکەی لە دیوی کۆڵانەکە بــوو، بەردێکی بچووکم پێــدا دا، خێزانی کاکم هاتە ســەر پەنجەرەکە، گوتــم بــراژن بیکەنەوە عەلیم. هەر ئەوەم گــوت، لە چریکەی دا و یەک بەخــۆی هــاواری کــرد ئەیرۆ کاک عەلییــە! ئیتر کاکــم و دایکم و بابم و نەرمیــن هەموو بەیەکەوە دەرگایان لێ کردینەوە. جەوێک دروســت بوو پڕ لە شــادی، ترس، خۆشەویســتی، بێحەجمینی بابم و بوژانەوەی نەرمین. یەکســەر مریشک وەســەر نرا و برنجیان دەم کرد. شەربەتی ئالووباڵــوو هات، چەند لێوانم لەســەر یەک خواردنــەوە، کاکم هاتە بن گوێــم گوتــی وەرن پیــاوی چــاک بن ویســکیی زۆر باشــم هەیە، دڵم مەشــکێنن و یەک دوو پیاڵە بخۆنەوە. گوتم کاکە هەرگیز ئێمە لە کاتی وادا مەشــرووب ناخۆینەوە. گوتی پیاوی چاک بە توو سەری ئەم بابە نازدارەت، خۆت کەر مەکە، ئیســتکانێکم لەگەڵدا بخۆ مەبادا نەتبینمەوە.

کەریم زۆری پێ خۆش بوو گوتم، نا کاکە گیان خراپە و پێشمەرگەمان لەولا جێ هێشـتوون و چاوەڕوانمانن. ئێستاش لەسەر دڵم داخە بۆچی دڵی کاکم وا شـکاند. هاتینە دەر، کەریم هەزار قسـەی پێ گوتم لەوەی نەمهێشت ویسکی بخۆینەوە. دیدارێکی یەکجار خۆش بوو، ماڵئاواییمان کرد. کەمال گوتی، مادام وایە ماڵی ئێمەش لە لای ماڵی حاجی سـاڵەی شـاتری و لای عەکاسـی ئەنوەرییە. چووین سەردانیان بکەین، هەر بە بەردەم ماڵە کۆنەکەی خۆماندا. زۆر گەڕاین و لە دەرگاکانمان دا، ماڵی باوک و دایکی کەمالمان نەدیتەوە و گەڕاینەوە بۆ لای کۆڵانی خەجەی حەمـەدە و دیسـان پەڕیینەوە. زۆر بە خەسـتی تەقەیـان لێ کردین و زۆری خایاند تا هەر چوارمان چووینەوە بۆ کۆڵانەکانی هەشت مەتری. دەبـوو بپەڕینـەوە بۆ لای مەیدانی فوتبـۆڵ و ئەوجار تەقەی پادگان و حەمامی مەولەوی. دەست و چاوی دیلەکەمان بەستبوو، بە خۆشییەوە بـێ زیـان هاتینەوە بـەری قەبران و بوداق سـوڵتان. لەگـەڵ کەمال و پیرەهەڵـۆدا کابـرای دیلمان جیا کردەوە و نمایشـێکی ئیعدامان سـاز کرد بۆ ئەوەی بترسـێ و لەم حاڵەتەدا زانیاریی لێ وەرگرین لەسـەر هاوکارەکانـی و پیاوانی سـەر بە حکومەت، لەم چۆڵایـی و تاریکییەدا زۆرمان ترسـاند، هیچ فایدەی نەبوو. گوتی: ڕۆڵە ئێوە فریوخواردوون و دڵم بۆتان دەسـووتێت. ئافتاوەیەک ئاوم بۆ بێنن دەسنوێژ دەشۆم و دوو ڕەکەعەت نوێژ دەکەم ئەوجار بمکوژن. لە پشت قەبران لە کەلاوە کۆنێـک پـڕ لە سـام و تاریکی ئامادەیی خۆی نیشـان دا بۆ کوشـتن. پیرەهەڵـۆ چوو لـە ماڵێک ئاوی هێنا و بە دەسـتیدا کـرد، نوێژی کرد هـەر بـە پێوە و قیت ڕاوەسـتا، گوتمان نا ناتکوژیـن و جارێ کارمان پێتە. چاومان بەستەوە، کەریم و پێشمەرگەکان پێش ئێمە کەوتبوون و بەرەو سـیمورغەکەمان ڕوویان لـە کۆنەدێ کردبوو. کەمال لە پێش و کابرای دیل دوای ئەو، پیرەهەڵۆ لە پشـت سـەری و منیش ئاخر. ڕیزە چنارێک و دووڕێیانێک هاتنە سەر ڕێمان. کەمال گوتی، ئەرێ لای سەر بگـرم، یان خوار. وەگومان و شـک کەوتین بە خـوار جۆگە ئاوەکە بۆ

کۆنـــەدێ دەچوو یان بە ســـەرەوەدا. لێمان بوو بە ئـــەرێ خوارێ بوو یان سەرەوە، لەپڕ کابرای دیل بە چاوبەستراوەیی لێمان وەجواب هات و گوتـــی: ڕۆڵە گیان گـــەر بۆ وزندەرێ دەچن خـــوار جۆگەکە بگرن و گەر بۆ کۆنەدێ دەچن ڕێیەکەی ســـەرەوە بگرن. هەرسێکمان چاوێکی بەماناوەمـــان لێک کرد و بە قســـەمان کـــرد، ڕوومان لە کۆنەدێ کرد و ڕاستیش دەرچوو.

دیلەکەمان تەسلیمی کۆمەڵە کرد و ڕەوانەی ناوەندی کرا، ڕایانسپارد ئامـــادەی گۆڕینەوەیـــن لەگـــەڵ بەهمـــەن و پێشـــمەرگەکاندا، حکومەت گوتبووی، چیی لێ دەکەن بیکەن، ئەو شەهید دەبێ و دەچێتە بەهەشت. هەرچـــی حەولیان دا بۆ گۆڕینـــەوە، چونکێ کورد بوو، هەر بە لایانەوە گرنگ نەبوو.

### ئەم شوانە چی دەوێت؟

دە دوازدە ڕۆژ بـــوو شـــەڕی قوڵقوڵـــە کرابوو، بە حســـێبی خۆمان کەســـمان ون نەبووە، ســـێ شـــەهیدمان بوو، هەرســـێکمان ناشتبوون، چوار دیلمان هەبوون بە قســـەی کۆمەڵەی ناوشـــار هەر چوار زیندانی بوون. ڕۆژێک پاسەوانی بەردەرگای مەقەڕی حاجیاڵیکەند هاواری کرد یەکێک بێت با بزانێ ئەم شـــوانە چیی دەوێت؟ چووم کوڕێکی شـــوانی خەڵکی خاتووخاس بوو، گوتی:

- کاکە لە ڕۆژی شـــەڕەکەوە منیـــش حەیوانم لێ ون بووە و مندار بوونەوە، ڕۆژانە بە شـــەو دەچم بۆ ئەو ناوە، لە نێوان ئازاد و قوڵقوڵە لەناو شێوەردەکە بۆنێک دەکەم وەبۆنی حەیوانی مندارەبووەوە ناچێت و گومانی ئینسانی لێ دەکەم. چەند جار ویستوومە بە ڕۆژ خۆم نزیک بکەمەوە، تەقە دەکەن و ناوێرم.

- سەردانێکی حیزب بکە بزانە کەسیان ون نەبووە.

- چووم و دەڵێن ئێمە لەوێ نەبووین.

- وەڵا ئێمەش کەسمان ون نییە.

- مــن ئەوەم بە موحســین و کۆمیتە ناوچە گــوت، هەڵبەت بۆ وان قســەی ئەم شوانە هەر هیچ مانای نەبۆو. یەک دوو ڕۆژ دواتر دیسان کاکی شوان هاتەوە بەر مەقەڕ.

- پیاوی چاک بن من ناوێرم، بەڵام دڵنیام ئەم ڕەشاییە لە دوورەوە شتێکە،

- باشــە ڕێک شــوێنەکەم پــێ بڵێ و لێم مەعلووم کــە لە کوێ ئەو ڕەشاییە دەبینی.

جــوان تێیگەیاندم. دیســان چوومەوە لای کۆمیتــەی ناوچە و گوتم کاکە تا ئێســتا کــەس بەهمەنی لە زیندان نەدیــوە، ماڵەوەیان چوون و دەڵێن لە پادگان و زیندان نەبووە، بۆ نەچین بەدوای قسەی ئەم شوانەدا، خۆ زەرەر ناکەین؟ لێم تووڕە بوون و گوتیان، لە سەرئێشــە دەگەڕێی. دڵم ئۆقرەی نەبوو، لەگەڵ کەریمدا باســم کرد و گوتی، جا شــەو دوای ئەوەی چراکانی مەقەڕ کوژانەوە خامۆشی لێ درا، خۆ نزیکە، بە پێیەک دەچین. دەنگۆی قســەی کاکی شــوان لەناو مەقــەڕدا بڵاو بووبووەوە، عەتیفــە هــات گوتی، توو خوا کاک عەلی گــەر چوون با منیش بێم، یان ئەگەر بەهمەنتان دۆزییەوە منیش ئاگادار بکەن. گوتم بە چاوان، ناکرێ تــۆ بەرین، بــەڵام ئەگەر بەهمەن بــوو، دێم خەبــەرت دەکەمەوە. کاک حەمەدەمین لە ماڵ نەبوو لە جەولەی سیاســی بوون. شــەو درەنگ کە خامۆشــی باڵی کێشابوو بەســەر هەموو دەڤەر و دەرکوباناندا، لەگەڵ کەریم و پێشمەرگەیەکدا جیبی تۆپی ١٠٦مان هەڵگرت و پری پەتوومان کــرد و ڕوومان لە ئاوایــی ئازاد کرد. گڵۆپی جیبەکە پێ نەکرابوو. هەر بــە تاریکی وەنێو شــێوەرد کەوتین و ڕێک ڕوو بــە قوڵقوڵە بە ئارامی دەچووینە پێش، نەدەبوو دەنگی مەکینە بەرز بێتەوە، وردەوردە بۆنێکی تونــد وڵاتی داگرت، بۆ لای بۆنەکە چوویــن، دەی، دەی، خۆمان تەواو لێ نزیک کردەوە، تەنانەت لەو ناو دەشــتاییە، بۆنەکە هێڵنجهێنەر بوو. لــە تــاوی بۆنەکە شــەدە و جامانەمان لــە دەموچاوی خۆمــان هاڵاند، دابەزیین و بە پێلێخشــان بۆ پێشــەوە چووین، کەریم قاچی وەشــتێکی

نــەرم کەوتبوو، بانگی کــرد وەرن بزانن ئەوە چییــە؟ بۆ چرکەیەکیش بۆنەکــە تەحمووڵ نەدەکرا، بە پەلە بەتانییەکمان ڕاخســت و ئەو شــتە ڕەش و نەرمەمــان تێــوە پێچا و هەڵمان گرت، بە ئەســپایی لە پشــتی جێبەکەمــان دانــا. بە خێرایــی دوور کەوتینەوە و نەمانهێشــت نە پایگا و نــە خەڵکــی ئاوایی ئــازاد پێ بزانن. هــەر ئەوەندە لە نــاو دێ دوور کەوتمــەوە، گلۆپــم هەڵکرد و پێم پێوە نا، بۆ ئەوەی بە بای ســەیارەکە بۆنەکــە لە خۆمان دوور بکەمەوە. گەیشــتینە ناو مەقەڕی حاجیاڵیکەند و بە سێیان پەتۆکەمان داگرت، بە بێ ئەوەی تا ئەو کاتە بزانین چیمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە. گومانی تێدا نەبوو حەیوان و شت نەبوو، دەبوو بەشەر بێت. بردمانە حەوزخانەی مزگەوت، (سولەیمان-خ)م هەستاند و هات، گوتم چراتۆڕمان دەوێت. هەرچی کردمان لە سێ چوار چراتۆڕان یەکیان هەڵنەبوو. ناعیلاج ســولەیمان چوو کاک کەریم قادری هەستاند و هات، گەڕا چراتۆڕێک نەبوو. ســولەیمان چوو بۆ لای ماڵی مەمەدی حەســەنخاڵی گوتی، ئەو هەمیشــە ساز و خاوەن شــتە. لە بەردەرگای مزگــەوت و پێــش حەوزخانەکە چاوەڕێ بوویــن. کاک کەریم دەیگوت پەکــوو لەم بۆنــە ئەوە چۆنتــان هێنا؟! نازانم یەکپشــوو دڵــم بووبوو بــە هێلانــەی چۆلەکە و لێی دەدا. لەوســەری ماڵانەوە بــە چراتۆڕەوە ســولەیمان و مەمەد پەیدا بوون. ڕوومان لە حەوزخانە کرد، ئێســتاش دوای نزیک ســی و ئەوەندە ســاڵ، وەحشەت دەمگرێت و مووی لەشم قــرژ دەبنەوە لە گێڕانــەوە و هێنانەوەی ئەو دیمەنە بۆ پێش چاوەکانم. هەمووی نیو سەعات نەبوو لەسەر تاتی حەوزخانەکە جێمان هێشتبوو، بــە ملیــۆن کرم بە هۆی فێنکی و ســاردیی نــاو ژووری حەوزخانە لە پەتۆکــە دوور کەوتبوونەوە. لەســەر تاتەکە، بــە پانیی ڕووبەری ئاوی حەوزەکــە وەک پەردەیەکــی ڕەش و کرێمی کــرم دایگرتبوو، مەمەد و ســولەیمان دەســتیان بە ڕشــانەوە کرد و دوور کەوتنەوە، لەگەڵ کاک کەریم قادری و کەریم ئەفسەردا پەتوومان لا دا، ئای چ دەبینم! دەموچاو هیچی نەمابوو، ئیسکلێتێک بوو پێستێکی چرچولۆچی بەسەردا کرابوو،

کەواوپانتۆڵی ئەفسـەریی کاتی خواحافیزیی بەهمەنم ناسـییەوە. گوتم کاک کەریم ئەوە بەهمەنە. گوتی چۆن دەزانی؟ گوتم خۆم پشـتێندەکە و جامانەکەم بۆ بەسـت لە کاتی ڕۆیشـتنیان بۆ ئاوایی بادام. بەهمەن ئەو ئێوارەیە لای براژنە عەتیفە دەموچاوی لووس لووس کرد و ڕدێنی تاشـی. هێندەی بەندی پەنجەیەک ڕیشـی هاتبوو. ئاخر حەڤدە ڕۆژ لە شـەڕی قوڵقوڵە گوزەرابوو. گوتم تەماشـا کەن، چـۆن جامانەکەی لە شانی خۆی هاڵاندووە. من ئەو جامانەیە دەناسمەوە تازە بۆی هاتبوو. چـووم بـۆ ژووری کۆمیتەی ناوچە و هەر سـێیانم لە خەو هەسـتاند، چیـم دیبوو و چۆن چووین و چۆن گەڕاینەوە بۆم گێڕانەوە. من لەبەر ڕێسـمەی دەرگاکەیان و ئەوانیش لە بن بەتانی بە چاوی نیوەکراوەوە گوێـم لێ دەگرن، گوتیـان کە وا بێ دڵنیای بەهمەنە و ئاواش کە دەڵێی زۆر شـێواو و بێلـەزەت بـووە. گوتـم بەڵێ لەبەر بۆن و ڕوخسـاری شێواوی تەنیا سولەیمان و کاک کەریمی قادری و مەمەد حەسەنخاڵی، ئەویش لەبەر نەبوونی چراتۆڕ ئاگادار کراونەتەوە و هەموو پێشمەرگە و خەڵـک لە خەودان. گوتیان دە باشـە برۆ بە پەلە بینێژن، زۆر خراپە بۆمـان، بـا خەڵک و پێشـمەرگە نەیبینن. گەڕامـەوە کاک کەریم گوتی، چـت کـرد و چیی لـێ بکەیـن؟ مردووشـۆر و مەلایەکمـان هەبوو لە ناودێ سولەیمان چوو هەردووکیانی هێنا. مردووشۆرەکە و مەلاکە بە سـوبحانەڵڵا و ئایەتەلکورسی یەکسـەر فەتوایان دا نە دەشۆرێت و نە کفن دەکرێت. بە پەلە مەلا ناردی قەبرێک ئامادە بکرێت. ویستمان هەر لە پەتۆکەیەوە بپێچین و بیخەینە سـەر دارەمەیتەکە. گوتم کاک کەریم، عەتیفـە سـوێندی دام ئاگاداری بکەمـەوە. گوتی کوڕە شـتی وا چۆن دەکەیـت؟ تا عومری هەیە لە بەرچاوانـی ون نابێت. دیار بوو بەهمەن لـە قوڵقوڵـەوە لەگەڵ ئەنوەردا بـەرەو ئازاد ڕایان کـردووە. لە نیوەی ڕێ لە پشـتەوەڕا بەهمەنیان ئەنگاوتووە و بەر شانی کەوتووە. ئەنوەر نەوەسـتاوە و بـەرەو ئاوایی ئازاد هاتووە. بیـرم کەوتەوە ئەوکات کە ئەنوەر گەیشـتە ناو ئاوایی زۆر نیگەران و پەشـۆکاو دیار بوو. لێمان

پرســی کەســی لەگەڵدا نەبوو؟ زۆر بە شــەرم و شـلەژانەوە گوتی نا! بەهمــەن دەکەوێت، کەس ئاوڕی وێ ناداتــەوە، بۆخۆی بە جامانەکەی برینی شــانی دەبەستێت و لە سەر زگ خۆی دەخشێنێت، تا دەگاتە ئەو شــوێنەی دۆزیمانەوە. لەوێ لە جووڵە دەکەوێــت و ئیتر نازانین چەند سەعات و چەند ڕۆژ بە برینداری و مردوویی لەم شوێنە دەمێنێتەوە، تا لەسەر قسەی کاکی شوان، من و کەریم چووین بەم وەزعە دۆزیمانەوە. گوتــم مادام ناکرێت براژنە عەتیفە ئــاگادار بکەینەوە با ئەم جامانەیەی لــێ بکەمەوە و بەیانی بیدەمێ بۆ ئەوەی بۆنی پێوە بکا و دڵنیا بێت. بە ئارامی دەستم دایە دەستی بۆ ئەوەی بیجووڵێنم و جامانەکە لە بن شانی دەرکەم. دەستی پێوە هات و هەڵکەندرا. ئیتر لە عاست خۆی دامناوە و هەرچۆنێک بێ جامانەم لە بن دەرکێشــا. بەهمەنمان بەرەو گۆڕســتانی حاجیاڵیکەنــد بــرد و زۆر بــە پەلە بەبێ ئەوەی خەڵک و پێشــمەرگە لە خەو هەســتێنین، لەگەڵ کەریم و ســولەیمان و مەمەد و کاک کەریم و مــەلای ئاوایی و یــەک دوویەکی دیدا بە خاکمان ســپارد، خەریک بوو زەردەی بەیانــی دەردەکەوت کــە ماڵئاواییم لە هاوڕێیەکی کۆنی دیکەم کــرد. ماڵی کاک حەمەدەمین و براژنە عەتیفە لەســەر ڕێی قەبران بوو، لەناکاو عەتیفە دەرکەوت و لە گابۆڕی دا و گوتی بۆ پێت نەگوتم؟ ئیتر هەمووومان بەیەکەوە شینمان گێڕا بۆ بەهمەنی جوان و پاکوخاوێن، کە بە ملیۆن کرمی لە جەستەی خۆیدا پەروەراند بۆ ئەوەی گزنگی ئازادی ببینێــت. جامانەکەی بەهمەنم پێدا بۆ ئەوەی دڵنیا بێت. لە گەڕانەوەماندا بۆ ناو دێ گوتم؛ ئەم بەرپرسانە تەنانەت بەهمەنیان بە شایانی ئەوەش نەزانی سەعاتێک خەوی خۆیانی بۆ دانێن و تا سەرقەبران بێن، هیچیان نەهاتــن، لەگەڵ ئەوەی ئاگادار کرانەوە و دەســتووری خۆیان بوو بەم چەشــنە بە خاکی بســپێرین. ئــەوە ســەرەتاکانی دڕدۆنگبوونم بوو لە وانەی تا دوێنێ بە ڕادەی پەرستن دەمپەرستن و ئامادە بووم خۆم بە ئاو و ئاگردا بدەم لەپێناویاندا.

ڕۆژی شەهیدبوونی بەهمەن وەک سێ هاوڕێکەی دیکەمان، یوسف

و فایەق و عەلی، بە ڕۆژی شـــەڕی قولقولە داندراوە و لە خەبەرنامەی کۆمەڵە دانووسـراوە بیسـتوچواری ڕەزبەری سـاڵی ١٣٦١ی هەتاوی (١٦-١٠-١٩٨٢). ڕاسـتە ئەم سێیە لەم ڕۆژەدا شەهید بوون و بە خاک سـپێردران. بەهەمەن بە دڵنیاییەوە لـەم ڕۆژەدا بریندار بووە، بەس من هیـچ دڵنیا نیم ڕۆژێک یان دوو یان سـێ یان... بەهەمەن بە برینداری و بێ تیمار و بێکەس لەناو ئەو شێوەردەدا لە گیانەڵادا بووە و چۆنچۆنی گیانی سپاردووە بە خاکی پیرۆزی کوردستان، لە کەس ڕوون نییە؟!

# ٣٨

## تێکچوونی شیرازەی کولتووری و فەرهەنگیی کۆمەڵە

دوای شەڕی کارەساتباری قوڵقوڵە و ئەم شکستە گەورەیە بۆ ناوچەی مەهاباد و نەچوونی کەس بۆ ژێر باری ئەم فەزیحەتە و لێنەپرسینەوە لە بەرپرسانی ناوچە و خۆدەربازکردنیان لە بەرپرسیارەتییان لە گیانی ڕۆڵەی خەڵک، ئیتر ئەو هەژموونی و حورمەتەی جاران بۆ ئەندام و بەرپرسانی کۆمەڵە دامان دەنا، لە لای زۆرێک لە ئێمە نەما. لە سایەی گۆڕینی کۆمیتەی ناوچە و هێنانەپێشی کۆمەڵێک خەڵکی نەشیاو و خۆمژوولکەر بە قسەی پڕوپوچ و بێئەساسی «بینشی نوێ» و پۆپۆلیزم لەناو پێشمەرگەی سادە، کە ئامانجی زۆربەیان، لە هاتنیان بۆ شاخ تەنیا حەزکردن بە پێشمەرگایەتی و ڕزگاری کوردستان و شەڕ لەگەڵ پاسداری داگیرکەردا بوو، شیرازەی کولتوور و فەرهەنگ و بوێریی تایبەت بە پێشمەرگەی کۆمەڵە، لێک هەڵدەوەشا و جێی خۆی دەدا بە هەلپەرستی، بێبایەخکردن و بە سووک چاولێکردنی قەرە و جوتیار و دەرکەوتنی حەزە شەیتانی و دوور لە ئەخلاقی سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. خەڵکی نەشیاو و ترسنۆک، لەژێر ناو و بیانووی تێگەیشتنیان بۆ «بینشی نوێ» و تیۆرییەکانی مەنسوور حیکمەت، هاتنە پێش. دەیانگوت، ئەوانە توانیویانە ئاڵوگۆڕی فیکری بەسەر خۆیاندا بێنن. ئامادەن بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی کرێکاری و بەدەستەوەگرتنی جڵەوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، توانیویانە پۆپۆلیزم لە گۆڕ بنێن. زۆربەی ئەوانە نە کادری کۆن و خاوەن خیبرە بوون و نە لەناو خەڵک و پێشمەرگەدا ناسراو و شوێندانەر بوون، نە کارنامەیەکی ئەوتۆشیان هەبوو لە خەباتی ناو کۆمەڵەدا، بەس ئەوەی کە کورد دەڵێ: «هەزار قەزوان بخۆیت بە گوێزێک دەتگرمەوە»، پڕ بە پێستی ئەو تاقمە تازەیەی

«بینشی نوێ» بوو. زۆربەمان لە پێشمەرگە هەرە سەرەتاییەکان بووین و لــە زەمانــی جەمعییەتەکانەوە خزمەتی کۆمەڵەمــان دەکرد، بە دەیان ئەرکی مەترســیدار و تاقەتپڕووکێنەرمان پێ ســپێردرابوو. سەربازێکی بە مانای تەواوی وشــە دەروێش و گیانلەسەردەست بووین، بۆ هەموو ئەرکێــک لــە هــەر کات و شــوێنێکدا، هەرگیز بۆ هیــچ ئەمرێک «نا» لە قامووسماندا نەبوو. بە دەیانی وەک کەمال، یونس، بەهمەن، سولەیمان، ئاکام، ڕەحیم و... ئەوپەڕی بەرئەندام یان هەوادار و پێشمەرگەی سادە بوون. کەچی یەک لەولاوە دەهات و دوو کتێبی لینین و چەند نامیلکەی لــە بنباخەڵــی دەنا و زوو زوو باســی لــە پێویســتیی پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیســتی ئێران و بلیمەتایەتیی مەنســوور حیکمــەت دەکرد و ناوی خۆی دەنا کادری «بینشــی نوێ» و یەکســەر زۆر بە شەقاوەیی داوای ئەندامبوونی دەکرد و زۆر بە توندی پێی دادەگرت کە شیاوی ئەندامبوونە و دەشیانکرد بە ئەندام. ئەو شتەی کە ئێمە هەرگیز تەنانەت لە ڕوومان هەڵنەدەهات بەرگری لە مافی خۆمان بکەین، یان داوای بکەین. ئەوانەیان ئامــادە دەکــرد وەک کۆیلە، ئەوانەی هەمیشــە ڕوویان لە دەســەڵاتە و چاویان لە دەســتی بەرپرس و ســکرتێرە، بۆ دەســتبەرزکردنەوە لەناو کۆنگــرەکان. ئەوانــە ئامادە دەکران بــۆ ئەندامێتیی کۆنگــرە و ژمارەی زۆر بــۆ مەشــرووعییەتدان بە ویســت و بەرنامەکانــی جەماعەتێک لە سەرکردایەتی و خێڵی کاکە مەنسوور حیکمەت، بۆ کۆنگرەی سێهەم کە پێشــەکیی دایاننابوو، دامەزراندنی کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیســت دەبێت بە دەنگێکی زۆری ئەندامانی کۆنگرەی کۆمەڵە، بێتە بڕیاردان. ئەو پلانە شــوومە بــۆ لەناوچوونی کۆمەڵە هەر ئەوێ ســاڵێ لە بەردەســووری سەردەشــت و کۆنگرەی ســێ داڕێژرا و بەردی بناغەکانی بە دەســتی خەڵکی وەک عەبدوڵڵا موهتەدی و مەنســوور و جەماعەتەکەی تارانێی، هاوڕێ لەگەڵ کۆمەڵێک حەڵقە بەگوێی خۆوێناکەری بێ ئەساسی خۆ بە کۆمۆنیســتزان و لایەنگری «بینشــی نوێ»، بە زاهیر و لە بنەڕەتەوەش هیچنەزان و بێسەواد داندرا.

بە گشتی دوای کۆنگرەی دوو، بە ماوەیەک و ئاڵوگۆڕیی بێ بەرنامە و پلان لە ناوچەی مەهاباد و هێنانی خەڵکی وەک موحسین بۆ بەرپرسی یەکەم و سەید خالید دووهەم، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ناوچەی زیندوو و چالاکیی کۆمەڵە لە مەهاباد بەرەو نوشستی و لاوازی دەڕۆیشت، خەڵکی نەشیاو و هیچلەباراندانەبوو جێی خەڵکانی چالاک و موخلیس و خاوەن ناوچەکەیان دەگرتەوە. ڕاستە لەو ماوەیەدا پاسدار زۆر دڕ بووبوون و شەڕی مان و نەمانیان دەکرد و پلانی توکمە و گرچوبڕیان دادەڕشت، بەڵام ئێمەش بە پێچەوانەوە خەریکی نیفاق و خۆخۆری و دانانی خەڵکانی نەشیاو بووین بۆ کاری گەورە و ئیدارەی ناوچەکە. یەکەم کارەساتیان لە ناردنەوەی ئەم دەستە لاوازە بوو بۆ شارویران و سێ قارەمان و کادری بەئەزموون و چەند بریندار و چەند شەهیدی دواتری لێ کەوتەوە. شەڕێکی خوێناوی و ماڵوێرانکەری ناوخۆ لەگەڵ حیزبی دێموکراتدا. ئەوجار شەڕی قەلیانتاغ، شەڕێکی بێبەرنامە و لەدەستدانی پێنج لە باشترین پێشمەرگەکان و برینداریی چەند کەس بەبێ دەسکەوت، شەڕی بادام و قولقولە و کارەساتی گەورە، دەیان عەمەلیاتی ناسەرکەوتووی وەک چوونەسەر حەیدەرئابادی گۆمی ورمێ و هێنانەخواری ئیعتباری پێشمەرگەی کۆمەڵە و نەچوونەوەمان بۆ ناوچەیەکی وەک شارویران، ئەمانە و زۆری دی کە بەداخەوە خەبەرنامەکانی کۆمەڵەم لە بەردەستدا نین تا زۆرتری بنووسم. لە کارنامەی سازماندهی تازەی تەنیا چەند مانگەی ناوچەی مەهابادا بوون، بە ڕابەریی ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە، موحسین ڕەحیمی و سەید خالید سیادەت.

### پلانی شکستخواردوو

دوو نموونەم هەیە لە پلاندانان و کردنی سەید ڕەحمان بە فەرماندەی نیزامیی شەڕی گەورە، گوتیان لەگەڵ ڕێکخراوی شاردا قسەمان کردووە و پلانمان دارشتووە لە ناوجەرگەی شاری مەهاباد

بۆ شــەڕێکی گەورە. قەرار بوو دوو پەل بە فەرماندەیی سەید ڕەحمان کــە هیچــی لە بارەی شــار و گەڕەکەکانی مەهاباد نەدەزانی، بە شــەو خــۆ بــە شــاردا بدەیــن و خۆ قایــم بکەین تا ســبەی بەیانی ســەعات دە، ئەوجــار تەقە دەســت پێ بکەین تــا درەنگانی ئێــوارە و تاریکایی. زیاتر لە شەســت پێشــمەرگە گەیشتینە شــار، ئامادەکارییەکی ئەوتۆی تۆکمە لەگەڵ ڕێکخراوی شــاردا وەک ئەوەی جاران خۆمان دەمانکرد، نەکرابوو. دەستەکەی ئێمە کە من و کەمال بووین و دەبوو فەرماندەی عەمەلیاتیش لەگەڵ ئێمەدا بێت، یەک لە کوڕەکانی شــار هات و پێشمان کەوت بۆ نیشــاندانی حەشــارگەکەمان. لە دوو شــوێن لە پەڕینەوە لە لای بــازاڕی مەنگــوڕان بۆ بــەری گەڕەکی ڕزگەیان تەقەمــان لێ کرا و زانییــان پێشــمەرگەین. لەگەڵ کەمالدا گوتمان، ســەید ڕەحمان ئەوە کەشف بووین، با بگەڕێینەوە و خەریکە شەو زۆر درەنگ دەبێت. گوتی نەخێر ئێوە دەتانەوێت من سەرکەوتوو نەبم و موحسین و سەید خالید بڵێن من شــیاوی هیچ نیم. کاکە مەســەلە ئەوە نییە، گیانی زیاتر لە سی چل پێشــمەرگە دەگۆڕێدایە، ئێمە دەبێت شەڕێک بکەین لە سەرکەوتنی دڵنیا بین. لەناو کۆڵانی ماڵی خۆمان دەســت کرا بە باس و موناقشــەی ســەید ڕەحمان و من و کەمال. ســەید هەڕەی لە بڕەی نەدەکردەوە و هەر دەپاڕاوە لە من و کەمال یارمەتیی بدەین بۆ ئەوەی شــەرمەزاری لای ســەید خالید و موحسین نەبێت. شــارەزا پێشمان کەوت تا کەلاوە کۆنــە ڕووخاوەکەی ڕێک ماڵی خۆمان. گوتم کاکە ئەوە ماڵی ئێمەیە و ئێرە بۆ خۆحەشاردان نابێت و لە هەموو لایەکەوە ڕووخاوە و هەموو کــۆڵان و جیرانــەکان دەناســم و دڵنیام هەر زوو کەشــف دەبین و لە چەند لاوە ئەم کۆڵانە ئاوەڵایە و پاســدار و ئەرتەش زۆر زوو دەتوانن گەمارۆمــان بدەن. کەمال زۆری پێ داگرت لەســەر بۆچوونەکانی من. ســەید ڕەحمان هەر ئینکار بوو و زۆریش دەترســا لەوەی بگەڕێینەوە. چەند ماڵی دیمان هەر لە دەوروبەری ماڵی خۆمان کرد، هیچیان شــیاو نەبوون، ســەید ڕەحمان بڕیاری پێ نەدەدرا و خەریک بوو ڕۆژ خۆی

دەرخاتەوە، ئێمە هێشــتا پەنامان نەگرتبوو، سەرەنجام بە پێداگریی من و کەمال دەوری ســەعات پێنجی بەیانــی قەناعەتی هێنا بڕۆینەوە و بۆ کاتێکی تر و بە هاوکاریی تەواو لەگەڵ ڕێکخراوی شاردا ئەم عەمەلیاتە بکەین. زۆر شــپرزە و بە بەرچاوی پاسدار و پایگاکانیان بە هەڵەداوان لە شــار چووینــەوە دەر. قەرار بوو ئێمە شــەڕەکە بکەین و مەرکەزی فەرماندەیی گەڕەکی ئێمە بوو، کە وەک بەری دەســتم تەنانەت ناوماڵی جیرانەکانیشــم دەزانی. حەشــارگە ڕێک ماڵی ئێمە بوو، کەچی بە هۆی نیفاقــەوە هیچیان لا باس نەکردبووین، ئێمەیان بە خۆیی نەدەزانی، یان ئەوەی ســەید ڕەحمان کرابوو بە فەرماندە، بە دڵنیاییەوە بۆ مەبەســت و شــکانی ئێمــە کرابــوو. بۆیە لەگەڵ کەمالدا ســاغ بووین ئەو شــەڕە نەکەین و گیانی دەیان پێشمەرگەمان پاراست، کە زۆر ئاشکرا بوو ئەو شوێنەی هەڵیان بژاردبوو زۆر بە ئاسانی گەمارۆ دەدراین.

دوو، گوتیان دەبێت بچن بۆ حەیدەرئابادی گۆلی ورمێ، پاسگایەکی لێیە لەسەر ئاوەکە و زۆر بە ئاسانی دەگیرێت. دیسان فەرماندە کرا بە ســەید ڕەحمان و وا بزانم ســەید خالیدیش هەر هاتبوو، دوو دەستەی بیســت کەســی یەک بۆ دەوری پاســگا و گەمارۆدانی بــە فەرماندەیی کەمال و ئەوی دی لە پێشتر بۆ لای ڕەزاییە و پێشی گوندی شیرین‌بڵاغ وەک قەڵغــان، لــە ئەگەری هاتنەپێشــی هێزی کۆمەکــی، کە من چووم. فەرماندەکان کە سەید ڕەحمان و سەید خالید بوون، لە گوندی تالاوەوە کە چەند کیلۆمەتر دوورتر بوو لە شوێنی چالاکیکە، لەناو ئەو لۆرییەی پێی چووبووین، مانەوە بــۆ فەرماندەیی کردن. دابەزیین، بە ڕێگەیەکی دووری یەک دوو سەعاتیدا بەناو شێوەردا و بە پێیان خۆمان لە پاسگا نزیــک کــردەوە، دوو هۆکیتۆکییــان دا بــە مــن و کەمــال و یەکیش بە فەرمانــدەکان بوو، هەر کە مەودایــەک دوور کەوتینەوە کاریان نەکرد و پەیوەندیمان بە فەرمانــدەی عەمەلیاتەوە نەما. هەموو دەوروبەرمان دێهاتی ئازەری و شیعە بوون. پاسگامان لێ دەرکەوت، دەستەی کەمال بەرەو پاســگا و ئێمەش ڕوو بە ڕەزاییە و تەنیشــت گوندی شیرین‌بلاغ

ســەنگەرمان گرت، هیچ پەیوەندیم نەما نە لەگەڵ فەرماندە و نە لەگەڵ کەمالدا، بەس لە دوورەوە لە تاریکیی شەودا شوێنی کەمال و پاسگامان دەدیــت. قەرار و پلان ئەوە بوو دەســتەکەی کەمال یەک دوو بازووکا بــە پاســگاوە بنێــت و تەقــە بکەن و بچنە نــاو ژووری پاســگا و چیی تێدا بوو بە دەســکەوت بیهێنن. لەناکاو شــۆق و گرمەی بازووکا بەرز بووەوە، کەس نەیزانی مووشــەکی بازووکا بۆ کوێ چوو. کەمێکی پێ چــوو لە پاســگاوە دەســت کرا بە تەقــە و هاوەنهاویشــتن. ئەوجار بە دەیــان ژن و منــداڵ و پیــاو بە پــاچ و خاکەناز و تەور و داســەوە بە اللهاکبــر و جنێــودان لە گوندی شــیرینبڵاغەوە بەرەو ئێمــە هاتن، کە فریای پاســگا بکەون، لێمان نزیک بوونەوە، کە سەیرم کرد هەموو ژن و منداڵــن، تەقەمــان لێیان نەکــرد و بە هەڵاتن بەناو شــێوەردا خۆمان گەیاندە شوێنی دەستەکەی کەمال، بۆ ئەوەی بڕیار بدەین تەقە لەم ژن و منداڵانــە بکەین یان چی بکەین؟ ئایا پاســگا گیــراوە؟! لەگەڵ هەموو پێشــمەرگەکاندا گەیشــتینە شــوێنی کەمال، کەچی کەس دیار نەمابوو. هۆکــی تۆکــی وزەی لێــوە نەدەهات، ڕوومان کردە تــالاو بە ناو کێڵگە و شــیوەردا و قەراغ جــادەی ڕەزاییە بۆ مەهاباد، لــە دوورەوە دیمان کەمال و پێشمەرگەکان لە پێشمانەوە دەڕۆن، خۆمان گەیاندەوە ئەوان. کەمــال بریندار بوو، لە کۆڵیــان کردبوو. فەرمانی پاشەکشــەی دابوو. ڕەحیم ویســتبووی بازووکاکە بە پاسگاوە بنێت و هەر چرکاندبووی و دەرنەچووبوو. چەغماخی بازووکا کارەبایی بوو، ڕێک وەک چەخماخی چەرخ (فەندەک) وا بوو، زۆر جاران گیریان دەکرد، کەمال چووبوو بە دەســت لە پشتەوەڕا بیجووڵێنێت و تەزووی کارەبا لە نێوان مووشەک و چەخماخدا پەیدا بێ. هەر کەمال لە پشــتەوەڕا لە ســەر شانی ڕەحیم دەست لە بنی موشەک دەدا، یەکسەر دەتەقێ و ئاگری موشەک دەستی کەمال بریندار و ســەقەت دەکا، ئیتر پلانەکە ئاشــکرا دەبێت و ئێمەش تووشــی هێرشــی ژنــان و منداڵەورکەی گوندی شــیرینبلاغ بووین و بە لەدەســتدانی دەســتێکی کەمال، پاشەکشــەمان لێ کرد. بە شــڕی و

ماندوویی و برینداریکەوە گەیشتینەوە لای گوندی گولێ و لۆری هات و هەمووومان چووینەوە مەقەڕی حاجیاڵیکەند. بەداخەوە کەمال دەستێکی سەقەت بوو، هەر نەمانزانی حیکمەتی عەمەلیاتیکی وا بەبێ لێکدانەوەی سیاسی و نیزامی لە ناو دڵی دێهاتی ئازەری چ بوو؟ بۆ یەکبەدوایەکدا ناوچەی مەهاباد لەژێر دەستی ئەم بەرپرسانە ئاوای لێ بەسەر دێ و هەر دەڵێی هەموو بڕیاریان دابوو، تا دەکرێت بە کوشتمان بدەن و شکۆ و حورمەتی پێشمەرگانەمان لە ناوچەی مەهابادا بشکێنن؟!

### کاتبەسەربردن

زۆربەی کوڕە بەئەزموون و کۆنەکانی ناوچە بەبێ ئیش و کارێکی جیددی، وەک جاران هەڵسوڕاو نەبوون و زۆرتر لە خۆخافڵاندن و کاتبەسەربردندا بووین، چەند کەسی دیکە لە سنە و ڕەبەت و سەردەشتەوە هاتبوونە ناوچەی مەهاباد و کاربەدەست بوون. ماوەیەک بوو سیامەند کاری نەدەکرد و نەدەچووە ژێر باری ئەوامر و فەرمانی سەید خالید و موحسین، ڕەحیم بابەتاهیری کەوتبووە داوی دڵداری و لە ئامادەکردنی ژنهێناندا بوو، کەمال تەواو خەمۆک و گۆشەگیر بووبوو، کەریم زۆری گوێ نەدەدایە و دەیگوت بیگوزەرێنن باشترە، پیرەهەڵۆ بێدەنگ بوو زۆرتر لە ئەسلەحەخانە خۆی سەرگەرم دەکرد، زۆربەمان بە کاری لاوەکییەوە خۆمان دەخافڵاند. لەگەڵ سیامەند و کەریم ئەفسەر و ڕەحیم، گوتمان با دوور بکەوینەوە و داوای ئیجازە و مەرەخەسیمان کرد بچین بۆ لای میراوا و ناوچەی سەردەشت و سەرێک لە هاوڕێیانی یەکێتی لە ناوزەنگیش بدەین. کۆمیتەی ناوچە قبووڵی نەکرد و گوتیان ئێوە دەتانەوێ ناوچە تێک بدەن و شکستی پێ بێنن، یەک دوو ڕۆژ کێشە و گفتوگۆ کرا لەسەر چوونمان بۆ ئیجازە و چەند ڕۆژێک حەسانەوە، بانگیان کردم و گوتیان خولێکی پەروەردەی پێشمەرگەی تازە دەبێ بکەینەوە و تۆ بەرپرسی ئەم خولە دەبیت و هەر ئێستا برۆ بۆ قزڵجە و هەموو ئەو کەسانەش کە

هاتوون بۆ پێشــمەرگایەتی بیانبە و دەست پێ بکەن، دەبێت زوو تەواو بێت و پێشــمەرگەمان کەمە، خێرا ئامادەیان بکە. دیار بوو مەبەســتیان دووبەرەکــی بوو لە نێوان ئێمە و دابەشــکردنمان، کە بەیەکەوە نەچین بۆ ئەم ســەفەرە. گوتم باشە و بە کوڕەکانم گوت من نایەم و ڕێکەوتم بۆ قزڵجە بە حەقدە کەســەوە کە هاتبوون ببن بە پێشــمەرگەی کۆمەڵە. کوڕەکان زۆریان ســەرکۆنە کــردم کە لەگەڵیاندا ناچــم. ئەوان جوابی کۆمیتــە ناوچەیــان نەداوە و ڕۆیشــتن بــەرەو میراوای سەردەشــت، منیش چوومە قزڵجە و دەســتم کرد بــە ئامادەکردنی ئەم کوڕە تازە و مێرمنداڵانە بۆ پێشمەرگایەتی. کوڕێکی عەجەمی مەراغەیان ناردبوو کە هــەواداری کۆمەڵەیە و دەبێتە پێشــمەرگە، زۆر جــوان و بەخۆوە بوو. سەرم سووڕ ما، غەیرە کورد کەم دەهات بۆ پێشمەرگایەتی، گەر هاتبا حەتمەن ڕۆشــنبیر و چەپ و سیاســی بوون، چەند دانەیەکمان هەر لە زووەوە هەبوو هەموویان کوڕی باش و کۆنە سیاســیی زەمانی شــا و چــەپ بوون. لە کۆمیتە ناوچەم ڕاســپارد ئەوە چییــە و کێیە؟! گوتیان ڕێکخســتنی خۆمانە و ڕێکخراوی شــار دەیناسن و نیگەران مەبە، تاقی کراوەتەوە، ئاشــکرا بووە و ناردوویانەتە دەرێ. کە گوتیان ڕێکخستنی نهێنــی شــار بووە، هیچم بــۆ نەگوترا. خولی ڕاهێنان دەســتی پێ کرد، بەیانیــان زوو هەڵدەســتاین و ڕوومــان لە شــاخ و کێــوی دەوروبەر دەکــرد و ڕۆیشــتنی پێشــمەرگانە و ڕاهێنانمــان دەکرد، ئــەم کوڕە لە هەموومــان ئازاتر و گورجوگۆڵتر بــوو، دوای نیوەڕۆیان لە ژوورەوە وانــەی چەکەکانمــان هەبــوو، هەڵماندەوەشــاندن و فێــری کردنەوە و بەســتنەوەیان دەبوون، دەمانچە، ژ٣، برنەو، کلاشــینکۆف، ئارپیجی و هەمــوو ئەو چەکانەی هەمــان بوون. کوڕە عەجــەم، زۆر باش بوو لە وانەی چەکەکان، ئێواران باســی مارکســیەت و کۆمۆنیســت و کلاسی سیاســیمان هەبــوو، هەرەی لە بــرەی نەدەکردەوە. لێم دەپرســی لەم بــوارەدا هــەر هیچی نەدەزانی و هیچ ئاگاداری مێژووی شۆڕشــەکانی دنیا و سەرکردەکانی چەپ نەبوو. گومانم هەر دەهات و زیادی دەکرد.

محەمەد لە مەراغەوە بۆ دەبێتە پێشمەرگە لە کوردستان و بۆ کۆمەڵە؟!
جارێـک چوومــەوە حاجیاڵیکەند بۆ هێنانی کەلوپەلی مەقەڕ، بە ســەید ڕەحمانم گوت کاکە با لێکۆڵینەوە بکەین. گوتی تۆ کاری خۆت بکە ئەمە ناسراوە و تەشکیلات ناردوویەتی. بەیانییەکی زوو هاتمە دەر لە مەقەڕ، لەبــەر ماڵانی دێ جێخوون هەبوو، کڵۆشـــی لێ نەمابــوو، گۆڕەپانێکی پــاک و خاوێــن بوو، دیم محەمــەد بە جلێکی وەرزشـــی ڕیازە دەکات، لــە دوورەوە زۆری تێفکریم، هەموو جووڵەکانی وەســتایانە و لێزانانە بوو، شەڵواری وەرزیشییەکەی ئەرتەشی بوو، ئێمەش جلی ژێرەوەمان بۆ دەهات سـپی بوون و لە زســتاندا لە بنەوە لەبەر سەرما لە بەرمان دەکرد. هەرچی پرسـیم کەس لەم ڕەنگەی نەبوو، لێی نزیک بوومەوە، لــەو ژێرجلانە بــوو ئەرتەش بەکاری دێنا. هیچم نەگــوت، نامەیەکم بۆ موحسین نووسی و گوتم، من دڵنیام محەمەد ساغڵەم نییە و ئەو ماستە مووی تێدایە، ئەم کوڕە بەم کارنامەیە کە زۆر ئازایە لە مەشقی نیزامی و تفەنگ، زۆر کڵۆڵە لە وانەی چەپ و سیاسی، بۆ لە مەراغەوە هاتووە بۆ پێشـــمەرگایەتی؟! هەمان وەڵامی دامەوە کە سەید ڕەحمان گوتی تۆ عەلاقــەت نەبێـت و کاری خــۆت بکە. ئەتواری محەمــەد وای لێ کردم لەبەر گیانی خۆم و ئەم کوڕانەی هاتبوون بۆ پێشـــمەرگایەتی ســـاتێک بە ئاســـوودەیی و دڵنیایی ئیستراحەت نەکەم و هەمیشە نیگەران بووم لە ڕوودانی کارەســـاتێک. زۆربەی شـــەوان، کە هەوای پاییزێکی خۆش بوو، دەچوومە ســـەربانی مەقەڕ و لەســـەر سـینگ درێــژ دەبووم، بێ ئــەوەی کــەس بزانێت چاودێریی مەقەڕ و محەمــەدم دەکرد. ڕۆژەکان تێپــەڕ دەبوون و دەورەکەمــان تەواو بوو. بۆ هەموویــان لاپەڕەیەکی کارنامەم دروست کردبوو، ناردم بۆ کۆمیتە ناوچە. محەمەد لە هەموو وانە نیزامییەکان زۆر لە خۆشم و لە هەموویان باشتر بوو. ڕادەی وانە سیاســـییەکانی هەر ئەوەندە بوو کە پاسدارێکی سەر جادە و لاتولووت هەیبــوو. ناردیــان گوتیان، کاک ناســر ڕەزازی دێت و پێشـــمەرگەکان چەکیــان پێ دەدەین و جێژن دەگرین بــۆ تەواوبوونی خولەکە. هەموو

هاتینــەوە بۆ حاجیاڵیکەند و دانە دانە بە ســروودە خۆشــەکانی ناســر چەکمان دەدانە دەســت و شەرەفی پێشــمەرگایەتیمان پێ دەبەخشین، ســەرەی محەمەد هــات، بە پێچەوانەی ئەوانی دیکەوە، کە دروشــمیان دەدا؛ گیــان بەخــت دەکەیــن لە ڕێی سۆســیالیزم و کۆمەڵــەدا، ئەو بە بێدەنگی وەریگرت و کشاوە دواوە.

دیســان زۆرم حەول دا نەیخەنە نــاو مەفرەزە و با ماوەیەک لەژێر چاودێریدا بێت. لە ڕقی من دایانە دەســتەی زگدڕاو، کە شــوێنکی هەرە حەساسی نێوان ئێمە و حکومەت بوو.

# ٣٩

## هیچنەزان کرانە بەرپرس

کورەکانــی چووبــوون بــۆ ئیســتراحەت و ناوچــەی سەردەشــت، گەڕابوونــەوە و هــەر بێئیش بوون. لە هاتنەوەیان بۆ ناوچەی ســابلاغ لە دەوروبەری بنکەکانی ناوەندی لە کۆمیسیۆنی پەروەردە و نووسین و داڕشــتنی کتێبی منداڵانی مەدرەســە، کاک کەریم دانشیاریان دیبوو، تێروتەســەل باســی ناوچــە و وەزعــی کۆمیتە ناوچــە و خۆمانیان بۆ کردبوو.

کاک کەریم لە سابلاغ مامۆستای دواناوەندی بوو، پیاوێکی خۆشنێو و بەحورمەت و زۆر ناسراو بوو لە ناو خەڵک و تەلەبەکان، هەموویان بە کچ و کوڕەوە ســوێندیان بە ســەری دەخوارد و لای ورد و درشت ڕێــزی زۆر تایبەتــی هەبوو. مامۆســتایەکی هەرە چالاکی ســەردەمی شۆڕش و تەزاهوراتەکان بوو. دۆست و یاریدەدەری یەکێتیی نیشتمانی و پێشــمەرگە و شۆڕشــی نوێی باشــوور بوو. دواتر زۆری یارمەتیی مامۆستا شێخ عیزەدین و دەفتەرەکەی کرد. لە دەستپێکی پێشمەرگایەتی هاتــەدەر و نوێنەری مامۆســتا بوو لە دەســتەی نوێنەرایەتیی وتووێژ لەگەڵ حکومەتدا. پێشــتر لە ســاڵانی چلەکانی هەتاوی و شەســتەکانی زایینیــدا ئەندامــی دێموکرات و دۆســتی نزیکی کاک عــەولای موعینی و شۆڕشــەکەیان بــووە. دوای شۆڕشــی گەلانی ئێــران لەگەڵ ئەوەی چەنــد جــار لێیان گێــڕاوە و بانگیان کــرد بۆ کارکردن، هیچ موشــتاق نەبــوو لەگەڵ حیزبــی دێموکراتــدا کار بکات. زۆرتر خــۆی لە بەرەی چــەپ و عەدالەتی کۆمەڵایەتی و بــەرەی نوێخوازدا دەدیت، هەر لەبەر ئەم بیروباوەڕ و سەرنجانەشــی، بە هــۆی نابەدڵبوونی ئەو خەڵکانەی دەوروپشــتی مامۆستا، دەســتی لێ هەڵگرتن و بوو بە پێشمەرگەیەکی

زۆر متەوازعـــی بێدەعێی کۆمەڵە. هەموو ئێمە و خەڵک زۆر لەوە زیاتر دەمانڕوانییـــە کاک کەریـــم و پێمـــان وا بوو یەکســـەر دەیبەنە ناوەندی و بـــە دڵ و گیـــان بەخێرهاتنی دەکـــەن. کاک کەریم چ لـــە باری فکر و چ لـــە بـــاری تواناوە زۆر لەوانە زیاتر بوو، کە بەرپرســـمان بوون. ئەو زۆر بە باشـــی دەیتوانی بەرپرســـی ناوچەیەکی وەک مەهاباد بێت، یان مەکتەبـــی سیاســـیی کۆمەڵـــە بێت، بەڵام زۆر ئاســـتەم بـــوو لە دیواری بنەماڵەی بچووکی ڕێبەرانی کۆمەڵە سەربکەوێت و ڕێی پێ بدەن بچێتە ناو بازنەی زۆر بچووک و تەنگ و داخراوی مەحفەلی ســـەرکردایەتی. ئێســـتاش دوای چل ســـاڵان باوەڕ ناکـــەم کەســـێکمان بووبێت لە کاک کەریم بەتواناتر و باشـــتر و باسەوادتر، کە دەیتوانی ناوچەیەکی ئاڵۆز و فەرهەنگی جیا و پڕ لە کێشە لەگەڵ حیزبی دێموکراتدا، بەڕێوە بەرێت و بە دەیان جار زیاتر خەڵک و پێشـــمەرگەی بۆ لای کۆمەڵە ڕاکێشـــابا. کۆمەڵـــە ئەم بەهـــرە گەورەیەی بە کاری لاوەکییـــەوە خەریک کردبوو، لـــە ســـەتدا دەی تواناکانی بـــەکار نەهێنا و تەنانەت خەڵکی بێســـەواد و هیچنەزانـــی کردبـــووە بەرپـــرس و مەســـئوولی ئـــەم پیـــاوە بەتوانا و خۆشەویستەی ناوخەڵک!

## پینەیەک بە جەستەی کۆمەڵەوە

بـــە گشـــتی ســـەرکردایەتیی ئەوکاتـــی کۆمەڵە، ناوچـــەی مەهاباد و کەســـایەتییەکانی پەیوەســـت بە کۆمەڵە، لە سەردەمی شۆڕش و دوای شۆڕشـــدا بە خۆیـــی نەدەزانـــی و زۆری متمانـــە پێیان نەبـــوو، ڕەنگە هۆکارێکـــی پێشـــینەی دێموکراتبـــوون هـــەر لـــە ســـەردەمی کۆمار و سەردەمی کاک ســـولەیمان موعینی و شۆڕشەکەیان بووبێ، یان ترس لـــە هەژموونـــی تاکەکانی ئەم دەڤـــەرە بووبێت، کە زیاتـــر لە کوورەی ناســـیۆنالیزمی کوردی بە واتایەکـــی دی کوردایەتیدا لەچاو ناوچەکانی خـــوارووی کوردســـتان قـــاڵ بووبێتن. کۆمەڵـــە باش دەیزانـــی ئەوەی کۆمەڵـــەی لـــە هێزگەلی دیکەی چـــەپ، جیا کردەوە هەر لە ســـەرەتای

شۆڕشــی بەرگری لە ڕۆژهەڵاتی کوردســتان، دەســت بۆ چەک بردن و خەباتــی کوردایەتــی بــوو. لەوەشــدا نوخبە و ڕۆشــنبیری کوردی ســابڵاغ، پێشــینە و مێژوویەکی پڕ لە حەماس و هەژموونیان لەپشــت ســەر هەبوو. ئەم ترســە بــە تایبــەت لای نوخبەی کۆمەڵە لە ســنە و بــۆکان هەمیشــە مۆتەکەیەک بوو مەبادا مەهابادییەکان بێن و دەســت بەســەر کۆمەڵەدا بگرن. بۆیە بە درێژایی ئەم ســاڵانە خەڵکی شــیاو و بەفەرهەنگ و سیاسییان وەلا دەنا و لەجیاتیان خەڵکی نەشیاو و گوندی و بێســەوادیان دێنا لە لادێکانی ناوچەی سابڵاغ، یان شارەکانی دیکەی کوردســتان و دەیانکردنە بەرپرسی دەیان خەڵکی زانکۆدیدە و خاوەن کەســایەتی و خۆشەویستی شــارەکە. ئێستا کە دوای ئەو هەموو ساڵە بیر دەکەمەوە لە دەســتپێکی شۆڕشــدا، مەسئوولی دەیانی وەک خەلیل بللووریان، حوســێن ســوهەیلی، کەریم دانشــیار، ســولەیمان بللوری، کەمال وەلیانــی، ڕەحمان زاهیدی، ســولەیمان ڕەحیمی، ڕەحیم قادری و زۆری تری شــەهید و زیندوو، خەڵکانی وەک ســەید، سەید ڕەحمان و ڕزگار بــوون، کە بــە زەحمەت دەیانتوانی تەنانــەت ناوی خۆیان بە فارســییش بە دروســتی بنووســن، یان خەڵکی وەک موحسین و سەید خالید کە هەر دەتگوت بە تەواوی و بە ئانقەســت بۆ ئەوە نێردرابوون ناوچەکە هەڵبوەشــێننەوە، گومانم نامێنێت کە زۆربەی ســەرکردایەتیی کۆمەڵــە، بە تایبەت موهتــەدی و ئیلخانیزادەکانی بۆکان وەک پینەیەکی موزاحیمی پێوەنووسراو بەسەر جەستەی کۆمەڵەدا دەیانڕوانییە نوخبە و ڕۆشنبیرە سابڵاغییەکانی ناو کۆمەڵە!

## لە حەسرەت جەهلی کۆمەڵە

بیرمە باوکی ســێ کوڕی پێشــمەرگە، کاک تاهیر مــەلازادەگان کە هەموویانــی لە تاران گــەورە کردبوو، خۆی فەرهەنگــی بوو، کوڕێکی پزیشــک و ئــەوی دی ئەندازیــار و ئــەوەی دیکەی دانشــجوو بوو، لە هیندستانەوە گەڕابووەوە بۆ پێشمەرگایەتی و لە شەڕی قوڵقوڵە شەهید

بوو، هاتبوو بە ماڵ و منداڵەوە بۆ سەردانی کوڕەکانی لە حاجیاڵیکەند، لــە بن دارەکەی حەوشــەی مەقەڕ دانیشــتبووین، لەســەریەک پیشــی دەخواردەوە و کوڕەکانی خۆی و ئێمەی پێ شێت و بە بێعەقڵ دەزانی و بۆی نەدەچووەوە ســەریەک، ئاخر چۆن دەبێت محەمەدی دوکتۆر و حەمەدەمینی موهەندیس و بەهمەنی کوڕی، ژێردەســتی کەسێکی وەک ســەید ڕەحمان یان ڕزگار و ســەید بن؟ چەند سەعاتێک مایەوە، وەک ئەوەی گوڕوەشانی بدەن و لە داخ و حەسرەتان، لێیدا ڕۆیشت.

لێرەدا بە ڕاشکاوی دەڵێم هێنانەوەی ئەم چەند ئەکتەرە لە ناوچەی مەهاباد بە هیچ کلۆجێک ئیهانە و بەکەمزانینی چینوتوێژی زەحمەتکێش و گونــدی نییــە، ئێمــە هەمــوو قەرزداری ئــەم خەڵکەیــن و خەبات و شۆڕشــمان بەشــێکی زۆری بۆ ڕزگاریــی ئەوانە بوو لەژێر ســتەمی زۆرداری و هــەژاری. ئەوانــەی من باســیان دەکەم توێژ و کاســتێکی بێلیاقەت بوون و بەکاریان دێنان بۆ گوێ لە مستی و بە کۆیلەبوونیان بۆ ســەرانێک کە ســەدان پلان و نیازی جۆراوجۆریــان هەبوو، ئەوانە باشــترین کەرەســتە بوون بۆ ئەم نیازانە و بە تەواوی لە چینوتوێژی خۆیــان دوور کەوتبوونــەوە و بووبوونە توێژی خۆشنشــین و دوور لــە خەتەر و ڕەچەڵەکی خۆشــیان. یەک جار نەمدیــت یەک لەوانە بێت و بێــژێ ئاخر برا کوا من بۆ بەرپرســی ئەو هەمــوو نوخبە و زیندانی سیاســیی زەمانی شــا و ئەندازیار و دوکتۆرە باسەوادە دەبم؟ خۆ من نازانــم تەنانەت دوو دێڕ نامەش بنووســم! بــە پێچەوانەوە لای خۆیان وایان چووبوو دە مێشکیان کە ئەوان بۆیە مەسئوولن تاکو خووخدەی وردەبورژوازیمان تێدا بکوژن و دەبێت کوڕی گەورەترین سەرمایەداری سابلاغ قبووڵی بکات، کوڕێکی بێفەرهەنگ و بێسەوادی «زەحمەتکێش» بەرپرس و مەسئوولی بێت. جارێکیان خوشکم و مێردەکەی لە تارانەوە دووربینێکــی زۆر بچــووک و گران و پۆســتاڵێکی زۆر عەنتیکەیان بۆ هێنابووم. کلاشــینکۆفەکەی من لەناو هەموو کۆمەڵەدا نایاب و ناسراو بــوو، مزەلییەکی باجەڕ بــوو، ڕزگار پۆســتاڵ و دووربینەکەی دیت و

لەمێـژ بوو چاوی لە کڵاشـینکۆفەکەم بـوو، کۆبوونەوەیەکی ڕەخنەی وەڕێخست، گوتی عەلی خەسڵەتی وردەبورژوازیی زۆرە و دەستی لێ هەڵنەگرتوون. بۆ دەبێت باجەڕی هەبێت و بۆ دەبێت پۆستاڵی ئەوەندە هـەزار تمەنی و دووربینی نایـاب هەڵگرێت؟ بە کورتی وایان کرد هەر سـێ شـتم هەر لەوێ دانان، تەنانەت پۆسـتاڵەکانم. دوای کۆبوونەوە و ڕەخنەلەخۆگرتنـم، ڕزگار کڵاشـینکۆفە قۆنداغدارەکـەی خـۆی پـێ دام و جووتێـک پاتەی لاسـتیک. ڕۆژی دواتـر ڕزگار باجەڕی منی لە شـان کردبوو، لەسـەر نانخواردنیش داینەدەنـا. دووربینە بێوێنەکەمی لە قایشـەکەی بەسـتبوو، پۆستاڵەکەمیشـی دە پێ کردبوو. چەند ڕۆژ بەسەرچوو ئەم ڕووداوە لە هەموو کۆمەڵەدا دەنگی دابووەوە. دوکتۆر جەعفـەر هـات بۆ ناوچە و بە توندی بە گـژ ڕزگاردا هات و پێی گوت کـە وا بوو ئێسـتا دەبێـت هەموو ڕەخنـە لە تۆ بگرین، کە خەسـڵەتی وردەبورژوازییت هەیە. یەڵڵا دەی هەموو شـتەکانی عەلی بدەوە خۆی، تۆ هەر لە ژووری کۆمیتەی ناوچە دانیشـتوویت، شـتی باش بۆ عەلی و هاوڕێکانی باشـە، کە شەو و ڕۆژ لە شەڕ و کەمیندان! هەزاران جار ڕۆحی شـاد بێت دوکتۆر جەعفەر، کە یەک لەو کەم کەسـانە بوو لەناو سـەرکردایەتیدا، کە خاکیبوون و تێگەیشتنی لەگەڵ زۆربەیان بەراورد نەدەکرا!

### نامەیەک وەک چرا

زۆربەمان لەم کوڕانەی ناسـاز بووین لەگەڵ بەرپرسان و خەڵکانی دەسترۆیشـتووی دوای کۆنگرەی دوو، یان کاریان پێ نەدەسـپاردین، یـان وەرمانەدەگـرت و بـە ڕقداچووبوویـن. نامەیەکـی کاک کەریـم دانشـیارم بۆ هـات، دوای ئەوەی کوڕەکانی دیبوون، زۆر بە سـۆز و خۆشەویستییەوە لێی پرسیبووم لەسەر ڕێبازەکەی سولەیمانی بللوریی جوانەمەرگ ماویت و ڕێبازی کوردایەتیت بەر نەداوە و نەچوویتە ژێر باڵـی جەماعەتی لایەنگری پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیسـت و مەنسـوور

حیکمـــەت؟! کۆمەڵێـک دەردی دڵ و ئامۆژگاریی بۆ مــن تێدابوو، دیار بوو بە تایبەت لە کەشوهەوای دەوروبەری ناوەندی و ئەفکاری لەناکاو گەشەکردووی ناو کادرانی کۆمەڵە لەمەڕ حیزبی کۆمۆنیست و «بینشی نوێ» و خەڵکانی مەراییکەر و ماستاوچیی دەوروبەری ناوەندی، تەواو جاڕز و ماندوو بووبوو. هاتنی ئەو نامەیە وەک چرایەکی ڕووناک بوو لەنــاو هۆش و بیرمدا، دەســتبەجێ وەڵامــم داوە و دڵنیام کرد هەرگیز لا نادەم لە ڕێبازی ســولەیمان و کوردایەتیمان، گەر قەرار بێت حیزبی کۆمۆنیســتیش پێک بێت، دەبێت حیزبی کۆمۆنیســتی کوردســتان بێت و نابێت بەرهەمی خەباتمان تەسـلیمی جەماعەتێـک بکەین لە تارانەوە هاتــوون و هیچ نایانناســین. ئێمــە دەمانزانی لە کاتێکـدا هەموو ناوچە ئازادەکان لە مەترســیی داگیرکردندان و ڕۆژانە هێرشـــەکانی کۆماری ئیســـلامی ئـەو ناوچانەمان لە ژێردەســت دێننــە دەر، کەچی زۆربەی کۆمەڵــە و ســـەرکردایەتییەکەی لـــە تەشــریفات و حەولــی پێکهێنانــی "حیزبی کۆمۆنیســتی ئێران"دا بوون، دەیانویســت لــە کۆنگرەیەکی بە پەلــە (کۆنگــرەی ســێ)دا بــە زیاتر لە ســەدا نەودونۆ بڕیــار بدەن بۆ یەکەمیــن کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیســت. وزەی کۆمەڵە و پێشمەرگەکان و سەرکردایەتی زۆرتر خەجڵی[1] ئەوە بوو تا وەکو پلان و بیرکردنەوە لە هێرشەکانی کۆماری ئیسلامی و پاشەکشەی ڕۆژانەی ئێمــە لە ناوچەکە و خەڵکی خۆمان! ئەوان، ســەرکردایەتیی کۆمەڵە، لە خــەون و خولیای خۆبەزلزانینیان وایــان دەڕوانی کە هەموو کۆماری ئیسلامی و ئیمپریالیزم ئاگادارن و لە ترس و هەراسی پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران خەو و خۆراکیان نییە، هەر بۆیە زۆربەی کات دە فکر و شــوێنی گونجاو و نهێنیبوونی کۆنگرەکەدا بوون و ئەم مەبەســتە لە سەرووی هەموو ئەولەویاتی کاری ڕۆژانەی حیزبێکی دەرگیری شەڕ و ململانێ لەگەڵ پاسدار و کۆماری ئیسلامیدا بوو. سەرەنجام لە ڕۆژێکدا و بە بژارکردنی هەموو ئەوانەی لێیان دڵنیا نەبوون و وەک ئەوانیان بیر

---

١- خەجڵ، خەریک، مژووڵ بە کارێک.

نەدەکردەوە، لەگەڵ هێرشـەکانی ڕۆژانەی کۆماری ئیسـلامیدا بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە، لە شوێنێکی زۆر چڕ و دوور، لە بەردەسـووری سەردەشت کۆنگرەی سـێیان لە یازدەی مانگی گوڵانی سـاڵی ١٣٦١ (١ی مایسـی ١٩٨٢)دا گرت و بە بەشداریی دەیان کادری گوێلەمسـت و ناحاڵی و خودی مەنسـوور حیکمەت، بە زۆرینەی هەر زۆری ئەندامـان بڕیار درا و کۆمیتەی ناوەندی ڕاسـپێردرا بە زوویی و لە یەکەم فرسـەتدا کۆنگرەی دامەزرێنەری «حزب کمونیست ایران» ببەسترێت! گرنگترین بڕیاری کۆنگرەی سێ تێپەڕاندن و پەسەندکردنی بەرنامـەی حیزبـی کۆمۆنیسـتی ئێران بـوو، کە ئیتحـادی موبارزانی کۆمۆنیسـت (ڕێکخراوە چەند کەسییەکەی مەنسوور حیکمەت -حەمید تەقوایی -خەسـرەو داور) نووسـیبوویان و بـە زۆرینەی هەرە زۆری ئەندامان پەسەند کرابوو!

### پێشمەرگایەتیکردن دای لە کزی

ئەوەی ڕاسـتی بێت دوای شـەڕی کۆمەڵە و دیموکرات، ڕووکردنی زۆرتـری کۆمەڵـە بـەرەو ئێرانچێتـی و هەڵوەدابوونـی بـۆ حیزبێکی کۆمۆنیستی سەرتاسەری، بە بیانووی ڕەدکردنەوەی پۆپۆلیزم پشت لە خەڵکی لادێ و بەهێند وەرنەگرتنیان و زۆرتر زەقکردنەوەی پرۆلیتاریای شۆڕشگێڕ لە لایەن چەند نوخبەی سیاسی، بە پێشینەی چینایەتی، زۆر دەوڵەمەند و تەنانەت سەرمایەدار، ڕوو لە پێشمەرگایەتیکردن لە کزیی دابـوو. خەڵـک وەک جاران گیـان و ڕۆحیان بە دەوری پێشـمەرگەوە نەدەگەڕا و زۆریش بوون لە خەڵکی شـار و لادێ، ئیتر بەدەسـتمانەوە مانـدوو بووبوون و چاوەڕوانـی ئەوەیان دەکرد حکومەت بێتەوە و لە دەستی ئێمە ڕزگاریان بێت.

نە تەنیا لاوانی تازەپێگەیشـتوو زۆر کەم دەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی و خولەکانـی پەروەردەی پێشـمەرگەی تازە، دەبـوو چاوەڕوان بین تا پـڕ دەبوونەوە و بە زۆر دەگەیشـتنە دە دوازدە کـەس، بەڵکو ڕۆژانە

یــەک دوو پێشــمەرگەی کۆنیش بــە بیانووی جیاواز دەڕۆیشــتن، یان خۆیــان تەســلیمی حکومەت دەکــرد، یان دەربــازی دەرەوە دەبوون و یانیــش دەچوونــە ناو دێموکرات. هــەر لەو ســەروبەندەدا کە دەنگۆی ئامادەســازی بــۆ کۆنگرەی دامەزرێنــەری حیزبی کۆمۆنیســت دەکرا، هەبــوو کادری ناســراو و کۆنــی وەک خالیــد عەزیزی (لەم ســاڵانەی دواییدا بوو بە ســکرتێری حیزبــی دێموکرات)، هەمــزە بایەزیدی، یان کادری نیزامیی وەک خدرەســوور ڕوویان کــردە حیزبی دێموکرات و زۆر زووش پۆســتی بەرزی سیاســی و نیزامییــان وەرگرت. زۆریش بوون چوونەوە شار و بە ئارامی و بێدەنگی و هەناسەساردی ڕوویان کردەوە ژیانی سادە و دوور لە سیاسەت.

### چ بکەین؟

ئــەو ڕۆژانە ئیتــر مەقەڕی حاجیاڵیکەنــد، مەقەڕەکەی جارانی پڕ لە جۆشــوخرۆش و گــەرم و پڕ لە هیــوا و ورە نەمابوو. سرتەســرت و دوو دوو و ســێ سێ بەیەکەوە لە هەموو کەلێن و قوژبنێک دەبیندران و باســەکان زۆرتر لە دەوری «چ بکەین»دا دەسووڕانەوە، ئیتر چیدی بــە موقەدەس باســکردنی کۆمەڵە و خۆفیداکردن و شــەهیدبوون، یان بــاوی نەمابوو، یان بــە کردەوە زۆر کەم بووبووەوە. زۆر بوون پێیان کەرێتی بوو، وەک جاران بە حەماســەوە برۆین بەرەو پیری مەرگەوە! کۆمیتەی ناوچە و ســەرکردایەتییش، زۆر بێمنەت دوای کۆنگرەی سێ لەگەڵ ئێمەماناندا قســەیان دەکــرد و وەک دەڵێن، چیتر نازیان نە تەنیا هەڵنەدەگرتین، بەڵکو پێشــیان ناخــۆش نەبوو ئەوانەی بەبێ دوودڵی و دەروێشئاسا خەتی مەنسوور حیکمەت و کۆنگرەی سێ پەیڕەو ناکەن، برۆن و لە کۆڵیان ببنەوە.

### هاوردەکردنی سێکس و مەشرووب لە سنەوە

چەند کەسێک لە دەرەوەی ناوچەی سابڵاغ هاتبوون و بەرپرسیاریەتیی دەستە و پەلیان پێ دابوون، کۆمەڵێک ئاکار و کردەوەم لێ بینین، ڕێک پێچەوانەی فەرهەنگ و تایبەتمەندیی پێشمەرگەی کۆمەڵە. ئەوەی جاران حەرام و بقە بوو، پێشمەرگەی لەسەر زیندانی و دەر دەکرا، بە ڕۆژی ڕووناک لەناو دێ لەوانەم دەبینی. خوشکی کوڕێکی پێشمەرگەی منداڵکارە بە بیانووی سەردانی براکەی، زوو زوو دەهات بۆ مەقەڕی ناوچە و ئێواران لەگەڵ یەک لەم بەرپرسە تازانە دەچوو بۆ ناو باخەکانی دێ و خەریکی ڕابواردن دەبوون. بەرپرسی مەقەڕ بووم، ئێوارەیەک یەک لە هەوادارە دڵسۆزەکانی ناو دێ هات و گوتی فڵانی عەیبە بۆ پێشمەرگەی کۆمەڵە بە بەرچاوی خەڵکەوە کچ دەبا بۆ ناو ئەم خڕە و دەیگەوزێنێت. هەستام چووم، جەعفەر تازە هاتبوو بۆ ناوچەی مەهاباد و بەرپرسی دەستە بوو. برای ئەم کچە، مێرمنداڵێک بوو پێشمەرگەی ئەو دەستەیە بوو، خۆی لەسەر داوای بەرپرسەکەی زوو زوو دەینارد بەدوای خوشکیدا و دەیهێشتەوە و لەگەڵ جەعفەردا مەجالیان بۆ ڕێک دەخرا. ڕۆژێک گوتیان کەسوکاری حوسێن، ئەویش یەکێکی تازە بوو لە ناوچە، هاتوون بۆ سەردان. ماڵێکی چۆڵیان پەیدا کردبوو، کە شەو و ڕۆژێک خۆیان بەیەکەوە بن. بە دەستی زۆر پڕەوە هاتبوون و یەکسەر چوون بۆ ئەو ماڵە، جاران باو بوو دایکان و کەسوکاری پێشمەرگە کە دەهاتن هەرچی پێیان بوو لە مەقەڕ، لەگەڵ هەموو پێشمەرگەکاندا دابەشیان دەکرد. ئەوان لەو شتانەی لە ناو بوخچە و تورەکەیاندا بوو هیچیان دەرنەخست، دواتر زانیم ئەم دوو سێ ژنە هیچیان خوشک و کەسوکاری نەبوون. یەک دوو ڕۆژ مانەوە و حوسێن، یەک دوویەک لەو پێشمەرگانەی کە زۆر لە خۆی نزیک بوون، دەبردەوە بۆ لای «کەسوکارەکانی». دواتر دەرکەوت، حوسێن و هاوڕێ نزیکەکانی ڕایانسپاردبوو لە سنەوە بە پارە ژن و مەشرووبیان بۆ بێت و لە ناو دێ بە بیانووی کەسوکار لەگەڵیاندا ڕابوێرن. ئەوکات

هەمــوو ئەم کردەوانە، لای من کوفر و قەباعــەت بوون، تەنانەت وەک خیانــەت بە شــەهیدان و ئارمانەکانی کۆمەڵە ســـەیرم دەکردن و دڵنیا بووم گەر سەرکردایەتی پێبزانێت تووشی لێپێچینەوە و دەرکردن دەبن!

## کاتی ڕەخنە نییە

کێشــەکانی ئێمــە و کۆمیتــەی ناوچــە گەیشــتبوو بــە کارنەکردن و قەڵســە لێــک گێران، دۆخەکــە زۆر ناخۆش بووبــوو، ڕێ بە ڕەخنە نەدەدرا، بە بیانووی ئەوەی شۆڕش بە سەردەمانێکی هەستیاردا تێپەڕ دەکات و دوژمــن لــە هەموو لایەکــەوە هێرش دەبات، لە «پێشــڕەو» (گۆڤاری کۆمەڵە بوو) شــوعێب زەکەریایــی وا بزانم ژمارە چوار بوو، بە ڕاشــکاوی و ڕوونــی وتارێکی نووســیبوو، وای وێنــا کردبوو لەم ســەردەمەدا ڕەخنەگرتن لە تەشــکیلات و ڕێبــەری خزمەت بە دوژمن دەکات و نابێــت خۆمــان بــەم شــتانەوە خەریک بکەین. بــە کورتی بە هەموو ئێمەی ڕاگەیاندبوو نە کاتی ڕەخنەگرتنە و نە گوێتان لێ دەگرین.

## ڕوانگە تازەکانی حەمەسوور وەک تەزووی کارەبا بوو

بە هۆی زەقبوونەوە و لێکترازان لە ناوچەی مەهاباد و کێشــەکانی ئێمە و بەرپرســان، ڕۆژێکیان ســەرکردایەتی، حەمەســووری نارد بۆ ناوچە و گوێگرتن و چارەی کێشــەکانمان. قســە زۆر کران و ڕەخنە لە موحســین و ســەید خالید و ڕزگار گیرا، دوو دەستە و دوو بۆچوونی تــەواو جیــاواز هەبــوو، یەکترمان قبــووڵ نەبوو هیچ، ڕقیشــمان لێک دەبــووەوە، بەشــێکیان بە بیانــووی لایەنگرانی حیزبی کۆمۆنیســت و «بینشی نوێ»، موزایدەیان دەکرد و خۆیان لە شەڕ و کەمین و کاری ســەخت نەدەدا و لایەکــەی دییان تاوانبار دەکرد بــەوەی تازە نابنەوە و پۆپۆلیســت و ناسیونالیســتن، بــۆ نموونــە ئەوانەی خــۆم دەمدیتن لەمــلا و ئــەولا لەناو دێ بێشــەرمانە خەریکی بێئەخلاقی و لە ســنەوە

بــە پارە ژنیان بۆ دەهــات. لە کۆبوونەوەکاندا لەوجڕی[1] وای تێدا بوو، ئێمەیان بە تاوانی ئەوەی توانای دەرکی بەرنامە و سیاســەتە تازەکانی کۆمەڵەمــان نییە و بەکاری ئەمڕۆی کۆمەڵە نایەیــن، تاوانبار دەکرد و هەرچی کردەوە و ئاکاری خراپی خۆیان بوو، لەژێر پەردەی لایەنگرانی ئەم فیکر و سیاســەتە تازەیەدا دەشــاردەوە. لەگەڵ حەمەســووردا لە کۆنــەوە نێوانمان خۆش بوو، نەمدەزانی لەم بەینەدا ئەو چۆن گۆڕاوە، لــە پەنایــەک لە میانەی کۆبوونەوەکاندا بە تەنیــا گرتمی و گوتی بۆ وا ســارد بوویتەوە؟ تۆ بەشــێک لە خۆمانی و دەبێت زۆرتر چالاک بیت. گوتم، کاک حەمە شــیرازەی ئەخلاق و چاکی و خراپی لەناو کۆمەڵەدا تێــک چووە و شــێواوە، ئەوەتــا فلان و فلانم دی بە چــاوی خۆم ژنی خراپــە دێنن و کەس هیچ ناڵێــت. گوتی عەلی ئەم بۆچوونانەی تۆ زۆر پۆپۆلیســتی و دواکەوتوانەن. ئەمە شــتی شەخسی و تایبەتی خۆیانە و پەیوەندیی بە تۆ و منەوە نییە و نابێت لەسەر ئەم شتانە پێداگری بکەیت. مەســەلەی جنس دەبێت جۆرێکی دی سەیر بکرێت و تەواو پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە، دەبێت ئازاد بێت و چیتر تابوو نەکرێت. ئەم فیکر و لێدوانەی حەمەســوور بۆ من تەواو وەک تەزووی کارەبا ڕایچڵەکاندم و بە ڕوونی هەســتم پێ کرد ڕێباز و فیکریان گۆڕاوە و بە هەموویان خەریکن کۆمەڵەکەمان بکەن بە شتێکی دیکە و دارودەستەی مەنسوور حیکمــەت وا دیــارە نیازیان زۆر خراوە. گوتم یانی کاک حەمەســوور، هیچ بە لاتانەوە موهیم نییە فلان و فیســار چ دەکەن و لەژێر ڕێبەریی کۆمیتــەی ناوچــەی تازە، کە بە زۆر بەســەر ئێمەدا ســەپاندتان، ئەوە خەریکە ناوچەی سابلاغ لەبەریەک هەڵدەوەشێت؟! بە پێکەنینەوە، وەک ئەوەی من لە زۆر شت حاڵی نیم، باسەکەمانی تەواو کرد.

---

١- لەوجڕ، چەنەبازی زۆروەڕ.

## ٤٠

**کتێب و ڕۆژنامەی نێو کادێن**

ڕۆژێکیـــان دایکم و نەرمین هاتن بۆ لامان، لە ماڵێک لە حاجیاڵیکەند هەموو کـــوڕەکان دەورەمان دابوون و خەبەروباســـی ناوشـــاریان بۆ بـــاس دەکردیـــن. دایکم گوتـــی ڕۆڵە ئەوە چەند جـــارە کاک عەلی کوانە ڕایسپاردووە کۆمەڵێک کتێب و وێنە و شتی تۆ لە عەولاباده، لایبەرین. کاتی خۆی کە پاسـدار شـاری گرتووەتەوە، دایکم لە ترسـان بەشێک لـــە کتێـــب و وێنە و شـــتومەکی قاچاغـــی ڕاگواســـتووەتە عەولاباد لای کاک عەلـــی، شـــوانکارە و نیـــوەکاری بابم بوو. دیار بوو کە هەســـتیان بە گرتنەوەی ناوچەکە کردووە، ئەوانیش ڕایانســـپاردووە لایان بەرین. شەریف لەوێ بوو، گوتی جا تا زووە هەستە بە ماتۆڕ دەتبەم بە یەک دوو ســـەعات دێینـــەوە. لەگەڵ شـــەریفدا بە ماتۆڕ جێمان هێشـــتن، کە وەک بـــا دەفڕی، چووینە عەولابـــاد و لای ماڵی کاک عەلی. زۆریان پێ خـــۆش بوو، زۆر بـــە گەرمی بەخێرهاتن کراین، گوتـــم کاک عەلی چیم لێرەیە با بیانبەم. پێشـــمکەوت بـــۆ کادێن و لە زارکی دەرگەکەوە چاوم بـــە کتێـــب و ڕۆژنامە و وێنـــە کۆنەکانی ســـەردەمی تەورێز و لاوێتیی خـــۆم کـــەوت، کە لە ناو کادێنەکەدا پرژوبـــڵاو بووبوونەوە، لە ناو دوو گۆنێـــدا هەموومان کۆ کردەوە و هاتینەوە بۆ لای دایکم. هەر ئەمدیو و ئەودیوی دەکردن و بەســـەریاندا دەگریا. وێنە و کاغەزەکانی خۆم جیا کردنـــەوە و لە پاکەتێکم نـــان و کتێبەکانمان دا بـــە کتێبخانەی کۆمەڵە. ئەو چەند ڕەســـمەی ئێســـتاش ماون ئیی ســـەردەمی منداڵی و تەورێز، هـــەر ئەوانەن کە لە ناو کادێنی ماڵی کاک عەلیدا لە عەولاباد لە فەوتان ڕزگارمان کردن.

**عەلی عاشقە**

شـــەریف تازەزاوا بوو، باس هەر باســـی ژنهێنان بوو، ســـیامەند و ڕەحیـــم باباتاهیری و هەموو کوڕەکانی دی لەوێ بوون. کاتی خۆی لە دەردی دڵـــی هاوڕێیانەدا لەمەڕ خەیاڵی خۆم و کیژی قژکاڵی چاوڕەش سەرەتایەکی لێڵ و ناسۆری دەروونیی خۆم بۆ شەریف باس کردبوو. بە دەوری دایکم و نەرمینەوە دانیشـــتبووین، شـــەریف ڕووی لە دایکم کـــرد و گوتی، عەلییش بۆی بلوێ ژن دێنێت و عاشـــقە. تووڕە بووم و حاشـــام کرد و گوتم شـــەریف لەم قســـانە گەڕێ. دایکم حەجمینی نەما و دەســـتی لە یەخەی شـــەریف نەدەکردەوە و دەیویســـت شەریف پێی بڵێت کێیە؟! دایکم لە خۆمپارەبارانی شـــار و ڕووخانی ماڵی خۆمان تا ڕادەیەک گوێیەکانی قورس بووبوون. دڵنیا نەبووم شەریف بزانێت کێیە بەس ســـرتەیەکی بە گوێی دایکمدا کرد، نێوچاوانی گرژ بوو و ســـەری ڕاوەشاند و گوتی نابێت، هەموو بێدەنگ بووین و باسەکەمان گۆڕی و سەرکۆنەی شەریفم کرد. بۆ خۆی پێ ڕاناگیرێت. کەمێک دواتر نەرمین بانگی کردم، وام زانی ئیشێکی هەیە، لەگەڵی چوومە دەرێ و پیاسەمان کرد، گوتی:

– تۆ دەزانی من هیچ لە تۆ ناشـــارمەوە، ئەدی بۆ تۆ شـــتی خۆت بە من ناڵێی؟!

– ئاخر هیچم نییە تا پێت بڵێم!

– ئەدی شەریف بۆ دەبێ بزانێ و من نەزانم؟!

– هیچ نازانێ و هیچیشم بۆ باس نەکردووە!

– ئەدی چیی بە دایکم گوت؟ من دایکم دەناسم، بە دەموچاویڕا زۆر تێک چوو!

–بـــڕوا بکـــە نازانم، ئەم هەتیوە هەر لەخۆوە قســـە دەکات و نازانم چی بە گوێی دایکم گوت؟!

– باشـــە عەلی توو خوا ئەگەر کەســـێکت خۆش دەوێت دەبێ بە من بڵێی.

- باشــە بە چاوان. هەســتم کرد شــک و گومانێکــی لا پەیدا بووە، کۆمەڵێک قســەی لەسەر کچانی ناو کۆمەڵە و دەستەخوشکەکانی کرد، لە زومرەی ئەواندا ناوی چاوڕەشەکەی منیشی هێنا و زۆر تاریفی کرد و خۆزیای خواست ژن دێنم و ئەویش دێنم، گوتم جا چۆن ئەو؟!

-بۆ نا! لەو باشــتر بۆ تۆ کێ هەیە؟ تۆ لە لامان زۆر خۆشەویســتی و ناوبانگت هەیە!

- نــا نەرمین گیان پێشــمەرگایەتی و ژنهێنان نابێت، ئینشــائەڵڵا کە هاتینەوە بە سەربەرزی تۆ بچووە و بۆم داوا بکە!

- بەڕاستی! ئەوە!

- نا هەر وا دەڵێم!

- بەخــوا دەزانم هــەوە هەر لە قزڵجەوە دەمزانی شــتێک هەیە، کە دەهاتی بۆ لامان و ســەرت هەڵنەدەهێنــا، زۆر جار دەیگوت ئەوە کاک عەلی کە دێت بۆ لامان، بۆ وا شەرمێونە، وەکی تر وا نییە؟!

- نەرمین گیان ئەم شــتە نابێت و مومکین نییە، فەرامۆشــی بکە و من هەرگیز ژن ناهێنم!

- باشە پێم بڵێ کێ دڵی داگیر کردوویت؟ با قسەی لێ بکەین بزانین مومکینە یان نا، من دڵنیات دەکەم یارمەتیت دەدەم! ئەوەی شــەریف بە دایکمی گوت، هەر ئەو هاوڕێیەی منە؟

- نازانم شەریف کێی بە دایکم گوت؟!

- دە باشە بە هەرچی سوێندە بە منی بڵێ، منیش شت دەزانم! ئەگەر تۆ متمانە بە من نەکەی، ئەدی بە کێی دەکەی؟!

- بــۆ ئەوەی زۆرتر لــە خۆمی نزیک بکەمەوە، گوتم ئا هەوە، بەڵام ئەو هیچ نازانێت و تا ئێستا هیچم نە بە قسە نە بە ئیشارە پێ نەگوتووە!

- هاواری کرد و خۆی بە باوەشمدا دا و گوتی دەمزانی، کەس لەو باشــتر نییە بۆ تۆ و ماڵی ئێمە، باشــترین هاوڕێمە و دەزانم دەبێت، تۆ کارت بە هیچ نەبێت، لە ئێستاوە براژنی خۆمە، ئەوە بۆ من گەورەترین دیارییــە، ئــەو کارە هــەر دەبێ ببــێ و دەزانــم ماڵی ئەوانیــش و ئیی

خۆشمان زۆریان پێ خۆش دەبێت، چەندی خوازبێنی بۆ هاتووە و هەر دەڵێ مێرد ناکەم، زۆری فشاری ماڵەوە و تەشکیلاتی لەسەرە، خۆی تا ئێستا هیچیانی بەدڵ نییە و هەر دەڵێ شوو ناکەم.

- باشــە نەرمیــن گیان خــۆت دەزانی ئەمە بۆ مــن چەند حەیاتی و گرنگە، نابێت کەس بزانێت، تەنیا کاتێک دەبێت باس بکرێت لە سەتاسەت دڵنیا بیت دەبێ و من هەرگیز ژن ناهێنم بۆ ئەوەی بیهێنمە شاخ!

- عەلی تۆ ئەوە بە من بسپێرە، قەولت پێ دەدەم بە دڵی تۆ دەبێت. جارێ دەبێ بزانم کاک شەریف چیی بە دایکم گوت؟!

چەنــد ڕۆژ دواتــر بەیانییەکــی نەرمین لە شــارەوە بــە هەڵەداوان هاتــەوە لام. بــە پێکەنین و خۆبەباوەشــدادان گوتــی، دەزانی دایکم بە یەکێکی دیکە حاڵی بووە، نازانم شــەریف ئــەو ناوەی پێ گوتووە، یان خۆی بە ســرتەکە وا حاڵــی بووە. کچێکی زۆر بێدەنگ و نەخۆشــمان هەبــوو لــە مەقەڕ، نازانــم دایکم بۆچی لە زمانی شــەریفەوە بەو حاڵی بووبــوو. کاتێــک نەرمین لــە ڕووی ناچاری و لەبەر بــاری دەروونیی دایکم ڕاســتییەکەی پێ دەڵێت لە خۆشیان شاگەشکە دەبێت و دەڵێ جا ئەوجــار ڕەبی موبارەکیان بێ و لەگەڵ بابــی چمان بۆ بکرێ بۆ عەلی و بۆ ئەم هەڵبژاردە باشــەی دەیکەین و ئەو وەســڵەتە هەر دەبێ ببێت، مەگەر مەرگ سەبەبکار بێ!

نەرمیــن ئاگرێکــی شــادی، لەنــاو دڵی دایکــم و بابــم و کاکم، لەم ڕۆژگارە تاریک و ناخۆشانەی ئەوکاتی خەڵکی کوردستان، بەم خەبەرە داگیرســاندبوو. هەر ســێ پێشــوازیی گەرمیان لەم خەبــەرە کردبوو. دەســبەجێ چووبوو بۆ لای و سەرەتای قسانی لەگەڵدا خۆش کردبوو، چەند شــتێکی ســەبارەت بە من و هاوسەرگیریی هاوڕێیان لە شاخ پێ گوتبوو بۆ ئەوەی لە بیروڕای تێبگات.

**نامەی دڵداری**

بۆچوونی نەرمین و تێگەیشتنی لەو، زۆر ئەرێنی و هیوابەخش بوو، قەناعەتـی پێ کردم نامەیەکی بۆ یەکەم جار بۆ بنووسـم و بە گشـتی چەند باسـێکی لەگەڵدا بێنمـە ئاراوە، خۆی بۆی بباتـەوە و زۆرتریش بەیەکەوە قسە بکەن.

نامەیەکـی دوور لـە دڵـداری و زۆرتـر سـەبارەت بـە کۆمەڵـە و گرفتەکانی شـاخ و بڕیارە تازەکان و بەرپرسـانی ناوچەم بۆ نووسـی و داوام لـێ کرد وەک هاوڕێیەک با بە نامەگۆڕینەوە زۆرتر لێک نزیک بین و لێک تێبگەین. نەرمین بە شـادییەکی بێسـنوور و بە چاوی پڕ لە ئەسرینی شادی و هەڵگری نامەی من، بۆ لای نزیکترین دەستەخوشکی خۆی گەڕاوە بۆ شار.

چەند جارێک بۆ نەرمینم باس کردبوو کە چەندە دژی هاوسەرگیریی تەشـکیلاتی و بڕیاردان لە لایەن چەند بەرپرسـی باڵا بۆ پرسـێکی وا گرنگم. پێم وا نەبوو بۆ کەس هەبێت لەسەر دواڕۆژی تاکەکان تەداخول بکات و بە بیانووی بەرژەوەندیی تەشکیلات، بڕیاری وەی بدەن لەگەڵ کێـدا هاوژینـی پێک بێنـم و لەگەڵ کێـدا نەیهێنم. ئەوانـەی دەربارەی ئەو بابەتە لەسـەر داهاتـووی تاکەکانی ناو تەشـکیلات بڕیاریان دەدا هەسـتم نەدەکرد خۆیان سـەرکەوتوو و خـاوەن ڕوانگەیەکی کراوەی کۆمەڵایەتـی بن. بۆیـە زۆر پێداگریم دەکرد لەوەی کەس بەوە نەزانێت و تەنانەت گەر وەراسـتیش گەڕا و سـەریگرت تەنیا ئاگاداریان دەکەم، نەک پرسـیان پێ بکەم و هەرگیز پێم خۆش نابێت بێتە دەرەوە و ماڵ و حاڵ لە شـاخ پێک بێنم. خەیاڵم ئەوە بوو بە سـەربەرزی دەچینەوە شارەکان و ئەوجار پێکەوە بە ئاسوودەیی دەژیین.

**لە ئێستاوە بووکی خۆمە**

هێندەی پێ نەچـوو دایکم هاتەوە و نامەیەکی پێچراوەی بوخچەیی دایە دەستم، شادی و ڕووگەشی لە سەرتاپای دەباری، گوتی هەموومان

زۆرمـــان پێ خۆشــە بۆ ئەم کچە، ڕەبی شــەریف بڵێــم چیت لێ بێ بۆ ســرتەی کــردت. من خراپی لێی حاڵی بــووم و چەند ڕۆژان تا نەرمین بۆی ڕاســت نەکردمەوە نازانی ڕۆڵە چۆنم لێ گوزەرا. گوتم دایە گیان تکایە لەســەرەخۆ بن، هیچ نەبووە و خۆی لە هیچ ئاگادار نییە، ئێوە بۆ وا خۆتان شڵەژاندووە و لای خۆتان هەموو شتێکتان بڕیوەتەوە؟! نابێ بزانیــن ڕای خــۆی چییە؟! گوتی: نا نا بەخوا هەر دەبێ ببێت و بابت لە ئێستاوە دەڵێ بووکی خۆمە!

نامەیەکی پڕ لە سۆزی برایەتی و هاوڕێیەتیی بۆ نووسیبووم، نامە بــە ڕوونی دەربڕیوی ئەوە بوو؛ ئەویش خۆشــحاڵە بــە نامەگۆڕینەوە و زۆرتر لێک نزیکبوونەوە، باســەکانی ئەویش هەر لە دەوری کۆمەڵە و پێشــمەرگایەتی دەســووڕایەوە. نە نامەی یەکەمی من و نە ئی ئەو تەنانەت بۆ وشــەیەکیش باســی دڵــداری و خۆشەویســتیی تێدا بەدی نەدەکرا، دیسانیش دەیان جار نامەکەیم خوێندەوە. دەستبەجێ نامەیەکی ترم بۆ نارد و وردەوردە باســی ژیانی هاوبەش و هاوســەرگیریی ناو تەشــکیلاتم هێنایە پێش. لە نامەی دووهەم و سێیهەمدا بۆم دەرکەوت ئەویش ڕوانینی وەکی منە ســەبارەت بە پێکەوەژیان و بڕیارەکە تەواو تایبەتە بە تاکەکان. تەشکیلات ناکرێت خاوەن بڕیار و ڕا بێت سەبارەت بە ژیانی هاوسەریی دوو ئەندامی خۆی.

نەرمیــن ئاگاداری کردم قســەی لەگەڵدا کــردووە و بە گوێیدا داوە، ئەگەر عەلی خوازبێنیت لێ بکا داخوا چی دەڵێیت؟! گوتبووی نازانم خۆ عەلی باسێکی وای نەکردووە؟!

بــە پەلــە نامەیەکــم بۆ نارد و زۆر بــە ڕوونی داوام لــێ کرد ببینە شــەریکی ژیانــی هەتاهەتایــی و ئامادەیی خۆم دەربــڕی بۆ هەنگاوی دواتر و ئاشــکراکردنی لای بنەماڵەکان. ئەوە یەکەم جارم بوو ســۆزی خۆشەویستی بۆ کچێک بدرکێنم و داوای ژیانی هاوسەرییشی لێ بکەم!

## نامەکانی لێکتێگەیشتن

دایکم کەسێکی نزیک لە خۆی، ئەویش دایکە پێشمەرگە بوو، دیبووەوە، بەبێ ئەوەی بزانێت، نامەکانی من و ئەوی دەگەیاند. دایە فاتم تا هاتبایە مەقەڕ نامەیەکی بۆ من پێ بوو، نامەیەکیشی بۆ دەبردمەوە. دوای نامەی خوازبێنی، وەڵامی نامەکەی ئەویش هات، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد من ئەوەندە بەختەوەر بم، نە تەنیا ڕازی بووە بە من، بەڵکو داوای پێکەوەبوونی لێ کردووم بۆ هەتاهەتایی و دڵنیام دەکات، گەر بێتوو هەموو ماوەی تەمەنی چاوەڕێم بکات، مەرگیش ئەم پەیمانەی پێ هەڵناوەشێتەوە و دوای مەرگی منیش هەر وەفادار دەبێت بەم پەیمانە چەند وشەیەی، کە بە نامە لە نێوانماندا بەبێ شاهید و حاکم گۆڕدراوەتەوە!

سەرەنجام دوای زیاتر لە سێ ساڵ، لە ئێوارەی زەماوەندی کاکمەوە، دوای نقورچی چاوە ڕەشەکانی لە جەرگم، ئاگری سۆزی عیشق و خۆشەویستیی کچە نازدارێکی کورد بڵێسەی کرد و زنجیر و کەڵەوەی وەفا و پێزانینم لە مل هاڵا و کرامە دیلی کچە کوردێکی نەشمیل. نامە و پەیمانەکەی لە ڕۆژی هەژدەی پوشپەڕی ١٣٦١ (١٠-١٠-١٩٨٢)دا نووسیبوو، لەمێژ بوو شادی و دڵخۆشیی وام بەخۆوە نەدیبوو، لەگەڵ خۆم و تەنیا بە شاهیدیدا خۆم عەهد و پەیمانم کرد، هەتا هەبم نە دڵ بە کەس بدەم و نە هەست و سۆزم بۆ هیچ ژنێک هەبێت، جیا لە ئەو!

نامە بەدوای نامەدا دەهات و دەڕۆیشت، لەبەر ماڵی باوانی، ترس و دڵەڕاوکێمان لە ئاشکرابوونی ئەم پەیوەندییە زۆرتر و زۆرتر دەبوو. بە باشمان زانی ئاشکرای بکەین و لای بنەماڵەکان و دۆست و هاوڕێیان شەرعییەتی پێ بدەین و تەنیا مارەکردن بکەین و ئەویش ڕزگاری بێت لە فشاری ماڵ و خوازبێنیکەری دی.

لە ناو هاوڕێکانی پێشمەرگەمدا تەنیا سیامەند، کەریم، شەریف و ڕەحیم سەرەتایەکیان دەزانی، زۆرم بە لاوە گرنگ بوو کۆمەڵە و تەشکیلات پێنەزانن و تەداخول نەکەن. لەگەڵ سیامەند و کەریمدا بە

بیانووی ئیسـتراحەت، ئیجازەمـان وەرگرت. گوتمـان دەچین بۆ ماڵی خزمێک لە حاجی خۆشیی شاروێران و دەنێرین هەردوو بنەماڵە بێن و لەوێ بە ئەسپایی و ئارامی مارەی دەکەین.

### فریشتەی خۆشی و ئۆقرەیی

هەرسێکمان بەرەو شاروێران وەڕێکەوتین، دەبوو ئێوارە بە تاریکی لە جـادەی مەهابـاد بپەڕینەوە بۆ شـاروێران، ڕێگـەی دووورودرێژی نێـوان مەقەڕی حاجیالێکەند و شـاروێرانمان بە خۆشـی و گاڵتەکردن و فشـقیات بە پێ بڕی. شـاد بـووم و دەمزانی هەنـگاو بۆ چی دەنێم، هەسـتم دەکرد لەسـەر ئەم گـۆی زەوییە هیچ مرۆڤێـک وەک منی بۆ هەڵنەکەوتووە و هەموو مرۆڤەکان لە ڕەشـبەڵکی زەماوەندی مندان و ئارەقە و تینی لەش و نێوچاوانم بە هۆکاری سەرچۆپیکێشـان دەزانی، نـەک هیلاکی و شـەکەتیی بە هەوراز چوونە سـەردا! ئـەوان گاڵتەیان پـێ دەکـردم و منیش لـە دەریـای خەیاڵاتی خۆمـدا نوقـم بووبووم. ئـەو خەونانـەی دڵنیا بووم تا چەند سـەعات و ڕۆژێکـی دی، دەبن بە ڕاسـتی و بـە چاوی خۆم دەیانبینـم؛ چیرۆکی عیشـق و دڵداریم باڵی لـێ دەڕوێت و بە هێمنی و ئارامی دەفڕێ و دەگاتە هەورە سـپییەکان. فریشـتەی خۆشـی و ئۆقرەیی ڕاکێشـی دەکردم و دەیبردم بۆ ئازادی و پێکەوەژیان، بۆ ئاشـتی و تەواوبوونی شەڕ، ڕەشبەڵەکی سەرگۆڕی شـەهیدان، پێ بە قەبردادان و هەستانەوەیان بە موژدەی سەربەستیی میللەتەکەمان، جادە و کۆڵانەکانی شارم دەدی بە ئاڵای سوور و سپی و کەسـکەوە، بە هـەزاران وێنە و پەیکەری شۆڕەسـوارانی لە خوێندا گـەوزاو، دەموچاوی گەش و بەبـزەی ڕێبوارانـم دەدی بەرەوپیرمان دێن و پێشـمەرگە لە ئامێزی خۆشەویسـتی دەگرن و ئازادیی وڵات و سـەربەخۆیی لە چاوی ئەوانەوە دەبینن. ئێوارەیە و قۆڵ لە قۆڵی دڵدار و هاوسـەرەکەم بەبێ تفەنگ و فیشـەکدان دێینە خوار بەرەو چوارچرا و پەیکەری قازی و ڕوو دەکەینە سـەرچۆم و پردی تازە. بە دەیان و

سـەدان جووت و تـاک ڕێ دەکەن بەرەو بلـوار و مەحموودکان، هەر سـلاوە و دەدریتەوە و هـەر ماچە و لە ئامێزهـالان، گوڵەبەڕۆژەیە و دەتروکێندرێ و گوڵەپێغەمبەرەیە دەبرژێندرێت. کچان و کوڕانی شـار بە جلوبەرگی کوردەواری، شەدە و جامانە بە سەر، فەقیانە و پشتێندی گرێگرێ، شاڵی شینکی و کراسی ڕەش، کچان بە کراسی کوودەری و ژۆرژێتی[1] گوڵ گوڵی، کەوای شـین و دەستماڵی پوڵەکەدار و پشتێندی پەشمینە، دەسرەی سرکەیی، بە چاوی کلتێوەردراو و لێوی سوورەوە، دێنـە خـوارێ، دوو بە دوو هـەر دەڵێی میرزادەکانی جزیـر و بۆتانی سەردەمی خانی و مەم و زینن.

### دیسان دەگەمەوە ترۆپکی خۆشی

جاروباریش لەناو خولیای خۆمدا دێوەزمەی ڕەش و چڵکنی شـەڕ پەیـدا دەبـوو، هەنگاوەکانم خێراتـر دەبوون و بە گـرژی و توورەیی پێشی هاوڕێکانم دەکەوتمەوە، بە ڕاکردن نا، بەس بە خێرایی لە پێشیان دەڕۆیشتم، ئاوڕم وێ نەدەدان و دەمزانی قسە دەکەن و پێم ڕادەبوێرن و تەشەرم[2] تێدەگرن و پێدەکەنن. لەناو گۆڕێکی تەنگ و تاریکدا بووم، فیشەکێک وەنێوچاوانم کەوتبوو، وڵات سووتاو و قاقڕ بوو، دار و بەرد پاسـدار بـوو، لە هەر چـوار لاوە مەیتی منـداڵ و ژن و پیرەپیاو بوو، دووکەڵ لە سەربانی مزگەوتەکان هەڵدەستا و سەگی بریندار و برسی و بەڕەڵا بە سـەر جادەکانی شـاردا دەسـووڕانەوە، ترس و دڵەڕاوکێ هەموو گیانیان دادەگرتم و کیژۆڵەی قژکاڵم دەدی ڕەشپۆش و لێوبەبار خوێن دەچۆڕێ لە چاوی. وام دەزانی بە خێراڕۆیشـتن دێوی شـەڕ و وێرانی بەجێ دێڵم و دیسان دەگەمەوە ترۆپکی خۆشی.

سـەرەوژوور و سـەرەولێژەکانم بـە زڕەخەونەکانـم دەبـڕی و

---

١- کوودەری و ژۆرژێت، چەشنێ پارچەن بۆ کراس و جلی کوردیی ژنانی موکریان بەکاری دێنن.
٢- تەشەر، تانە، قسەی بەتێکوڵ.

هەنگاوەکانم بە ئاهەنگی ناو خەیالاتم هەڵدەهێنا، جاری وا بوو ئەوەندە خۆش بوو، تێیدا نوقم دەبووم و بە ئارامی «وەکو نەرمەهەنگاوی لاوی بەرەوژوان»[1] دوادەکەوتم و جاریش هەبوو بە نەرمەغار پێشیان دەکەوتم، بۆ ئەوەی خۆم قوتار بکەم لە مۆتەکە!

## جەهەننەم بۆ ڕێکخستەکانی شار

بوومەلێڵ بووبوو گەیشتینە نزیک جادەی ئاسفالت، دەنگەدەنگی چەند کەسێکمان گوێ لێ بوو، بە حەزەرەوە لێک نزیک بووینەوە، یەکترمان دەنگ دا و یەکترمان ناسی، دوو سێ پێشمەرگەی کۆمیتەی ڕوستایی خۆمان بوون دەگەڕانەوە لە جەولەی سیاسی و یارمەتیکۆکردنەوە. یەکترمان لە ئامێز گرت و وەستاین بۆ بیستنی هەواڵ و چۆنێتیی ڕێگەوبان. گوتیان، ئەمڕۆ لە شار پاسدار و ئیتلاعات، هێرشێکی بەربلاوی پلاندارێژراویان کردووەتە سەر ڕێکخستنەکانی ناوشار و خەڵکێکی زۆریان گرتووە و بەندکراون لە زیندان، خەریک بوون ناوەکانیان دەگوتن لەناکاو گوێم لە ناوی ئەو و خوشکە بچووکە سێزدە ساڵانەکەی بوو، دنیا بەسەرمدا دەسووڕایەوە. هەر سێک سڕ بووین، تاریک بوو دەموچاوی یەکمان نەدەدی، دەنا هەستیان بە شڵەژانمان دەکرد. ناوێکی زۆری کچان و کوڕانیان پێ گوتین هەر ئەو ڕۆژە بەیانی زوو لە شار گیراون و حکومەت توندوتیژییەکی وەحشییانەی دەست پێ کردووە و زۆر لە کەسوکاری پێشمەرگە گیراون و تەنانەت دەستی نەپاراستووە لە منداڵی سێزدە و چواردە ساڵەی خوشک و برای پێشمەرگە.

بە تەواوی وڕوکاس بووبووم و هۆشم هەر نەما، لێک جیا بووینەوە، ئەوان ڕۆیشتن بەرەو حاجیاڵیکەند و ئێمەش بەرەو شاروێران. هەر کە لێمان دوورکەوتنەوە، سیامەند و کەریم بەر چەپۆکیان دام و گوتیان، دەچی ژن مارە دەکەیت؟!

---

١- ئیشارە بە دێڕێکی شیعری خەوەبەردینەی سوارە ئیلخانیزادەیە.

### بۆ وا کز و لاوازی؟

بە بیستنی گیرانی ئەو کچانە، نەرمین خۆی حەشار دابوو، ناردم بەدوای دایکمدا و لە حاجیخۆش ماڵی خزمێکی باوکم چاوەڕوان بووین. ڕۆژی دواتر لەناو دێ، دایکم و بەدواشیدا پوورم لە پاسەکەی نێوان شار و دێ دابەزین، چەند ساڵ بوو پوورم نەدیبوو، پێم سەیر بوو هاتووە، هەر لە دوورەوە دەستی کرد بە گریان و ئامێزگرتنەوە و لێستنەوەی دەموچاوم، هەموو خەڵک هاتبوونە تەماشا، بۆنی بە شەدە و کراس و بنهەنگڵمەوە دەکرد و بە دایکمی دەگوت؛ ئەیرۆ باجی بۆنی عەلی چەند خۆشە، لێم دوور نەدەکەوتەوە. زۆریان شتومەک هێنابوو لە شیرنی و خواردن و میوە و جلی زستانی. خانەخوێمان زۆری ڕێز لە دایکم و پوورم گرت و قازێکیان سەربڕی. لە سەر سفرە پوورم تەنیشتمی بەر نەدەدا و بەشە گۆشتی خۆی دێنا بۆ لای من. هیچم پێ نەدەخورا، ئاگرێک لە دەروونم داگیرسابوو مەگەر هەر خۆم پێم زانیبا، پوورم هەر قسەی دەکرد و پرسیاری دەکرد، بۆ وا زەعیف و لاوازی، بۆ وا ماتی، بۆ هیچ ناخۆی؟! دەمگوت پوورە گیان پێشمەرگە هەر وایە و دەبێ ئاگای لە خۆی بێت و زۆر قەڵەو نەبێ، دەنا جووڵەی باش بۆ ناکرێت، بەم قسانە وامان دەکرد بەوە نەزانێ بەرنامە چ بووە و بۆ هاتووینە نزیک شار!

### فەزای ترس و وەحشەت

دایکم تێیگەیاندم ڕۆژی پێش لە شار چ ڕەشبگیرییەک بووە و چۆن نەرمینیان ڕزگار کردووە و ڕەوانەی ماڵی خوشکمیان کردووە لە ڕەزاییە. پوورە هاجەرم زووتر چەند جاری بە دایکم گوتووە کە چوویە لای عەلی لەگەڵدا خۆت بمبە و ئەویش کە ئاگادار بووە لە نزیک شارین، لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. ئیتر نەدەبوو لە هیچ لایەکەوە باسی ئەم چیرۆکەی من بکرێت و کەس پێی بزانیت، زانیبایان نیازی

شـووکردن بـه پێشـمەرگەی هەبـووە، بێشـک ڕزگاری نەدەبـوو و ئەوەنـدەی دی تاوانی گرتنـی زیادی دەکرد. دایکم گوتـی، لە دوینێوە هیچمان هۆش و حاڵمان نییە و ناشـکرێت ئێمە خۆمانی تێهەڵقورتێنین، یەکسـەر گومان دەکەن و ئەوەندەی دی لێمان سـەخت و گران دەبێت. ڕۆڵـە ماوەیەک بوو بەم خەبەرە هەموو دڵمان خۆش بوو، لەناکاو دڵی هەموومانیـان هەڵقرچانـد. لەبەر پوورم و خەڵکی نـاو ماڵەکە نەدەکرا زۆر قسـە بکەین، بە هەناسەساردی و زۆر بە گریانەوە دواینێوەڕۆ بە هەمـان پاس بەڕێمان کردنەوە. هەر بە دایکمدا ڕامانسـپارد لە پوور و کەسـوکاری سیامەندیش بێن. ڕۆژی دواتر کۆمەڵێک لە خزمانی کەریم و سـیامەندیش هاتـن و هەموو چاویان بەیەک کەوت. قسـەی هەموو لایەک گوزارشـت بوو لەوەی کۆماری ئیسـلامی و ئیتلاعات دەستیان بەسـەر هەموو شتدا گرتووە و فەزایەکی ترس و وەحشەت و گرتن و ئیعدام بەڕێوەیە، پێشمەرگەش چیتر ناتوانێت وەک جاران جەولە بکات و لە نزیک شارەکان بمێنێتەوە.

خەم و پەژارە و کارەساتم زۆر بەسەر هاتبوو، زۆر جار دڵگووشینم تاقی کردبووەوە و دەمزانی ترۆپکی دۆشـدامانە، بە خەمی لەدەستدانی هاوڕێ و عەزیزەکانم ڕاهاتبووم و خارا بووم، هەموو جارێک گۆشەی تەنیایـی، خـەم ڕەوێنـم دەبـوو، تەسـکین و تیمـاری دەکـردم، بەڵام ئەژنۆکانـم نەبوون، بەڵکو تەنیا شـوێنێک کە دەسـت کەوتبایە و خۆم تێـدا حەشـار دابـا و لە چاوان دوور بـام و کەس بە قوڵپـی گریان و هەنیسکمی نەزانیبا، تەنیا نیوەشەوان و بن لێفەکەم بوو. لە مەقەڕ و ناو پێشمەرگە و ماڵان و جەولە، عاستەمە کونجێکت دەست بکەوێت و تێیدا هەر بۆ خۆت بیت و بە تەنیا ئارام بگریت. من خووم بەوە گرتبوو لەم کاتانەدا، خۆم بچووکی بچووک دەکردەوە، وەک گلۆفێکی بەن، لێفەکەم بەسەر خۆدا دەدا و ئەوجار شینم دەگێڕا، ئەوەم بۆیە دەکرد دەیانگوت، «پیاو» نابێ ئەسرین بڕێژێت و عەیبە بۆ پیاو بگری!

### ئەوەندە دڵپڕم پێم خۆشە بگریم

ئەم خەمەم وەک هیچ جارێک نەدەچوو، گیران و بەندکردنی خاوەنی هێلانەکـەی دڵم بە دەسـتی گـورگ و کەڵبە خوێناوییـەکان، لە هەموو کۆسـتکەوتنەکانی پێشـووم، تەواو جیاواز بوو. دەگمەن و یەکەم جار بـوو وام بەسـەر بێت و سـەری هەموو کێوانم لێ تاریـک بێت. ڕق و تۆڵە لە لایەک و بێدەسـەڵاتی و کەلەپچەکردنی ژن وەک «نامووسـی کـوردەواری» لە ڕوانگەی عەشـیرەتیی چل سـاڵ پێشـی کۆمەڵگەی کوردسـتان و فیکری دەسـتدرێژی و ناپاکی، قسـە و تانەی دۆست و خزمـی خەڵکـی وڵاتی پیاوسـالار لە لایەکـی دی، ئەو کۆسـتە بوو لە دڵگوشین و دۆشدامانەکانی دی نەدەچوو، ئەوەندە دڵپڕ بووم دەمویست بگریم، نەدەکرا، هاوار بکەم، نەدەکرا، هەرچی بیرم لێ دەکردەوە و بۆی دەچـووم ڕێگەکان داخراو و تاریک بوون، ئەدی پەنا بۆ کێ بەرم؟ دڵم ئەوەنـدە تەنگ و بچووک بووبووەوە، هەر ئەوەندەی دڵی چۆلەکەیەک و جێی کەسـی دیکەی تێدا نەدەبووەوە. ئێستا دوای نزیک بە چل ساڵ ناتوانم چۆن ئەو برینەی لە خەزەڵوەری خەزانی ١٩٨٢دا کاری کرد لە ڕۆح و گیانم، وەسـفی بکەم. هەر ئەوەندە دەزانم ناسـۆرێکی ئەوەندە بەئازار و پڕ لە کێم و زووخاو بوو، هەرگیز بیرم ناچێتەوە.

دوای چەنـد ڕۆژ لە ترس و وەحشـەت، دڵبرینـداری و بێئۆقرەیی، بێلێفەیـی و گریانی بێدەنگ، لەگەڵ خۆمـدا و تەنیا لەگەڵ خۆمدا، عەهد و پەیمانم بەسـت؛ هەتا هەم فەرامۆشـی نەکـەم، دڵ بە کەس نەدەم و تـا ماوم چاوەڕوانی بم و خۆم ئامادە بکەم بۆ لەسـێدارەدانی و دواتر فڕینی ڕۆحم بەدوای پەپوولەی عیشقی بەئاواتنەگەیشتوومان!

# ٤١

به دڵێکی غەمبار و لێوبەبار سـەفەری گەڕانەوەمان بەرەو مەقەڕ و پێشمەرگەکان لە حاجیاڵیکەند بەناو مۆڵگە و کەمینی پاسدار و شەوەکی ڕۆیشتن، گەیاندە ئەنجام.

سەرانسـەری کوردستان شەڕ و هێرشـی ئەرتەش و پاسدار بوو، هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە لە ئانووساتی داگیرکردندا بوون، سەرکردایەتیی حیزبی دێموکرات لە مەنگوڕان و دۆڵەتوو لەژێر هەڕەشـەی تەواودا بوون. گرتن و کۆنترۆڵی ڕێگەی ستراتیژ و گرنگی سەردەشـت-خانێ بۆ پێشمەرگە، ئامانجێکی سیاسی و نیزامیی بوو بۆ حکومەت. دەمانزانی دایانناوە بە هەر نرخ و زیانێکیش بێت لە دەسـتی پێشـمەرگەی دەرهێنن و کوردسـتانی بە تەواوی پـێ بێنە ژێر چۆکی خۆیـان. ئەمە تەنیا ڕێگە بوو بۆ ئەوەی پێی پێشـمەرگە لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان ببڕن و بگەنە سنوورەکانی عێراق، بۆ گواستنەوەی شەڕی عێراق-ئێـران بۆ میحوەرێکی دی و بەکارهێنانی کوردسـتان و هێنانی بەشێک لە بەرەکانی شەڕ بۆ ئەم ناوچەیە.

### هێزی پشتیوان و شاخەوان عەباس

دەنگۆی داواکاریی دوکتۆر قاسـملوو لە مام جەلال و یەکێتی هەبوو بۆ ناردنی هێز و یارمەتیدان. لە جادەی سەردەشـت-خانێ شـەڕ لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا لە لایەک و دێموکرات و کۆمەڵە و هێزی پشتیوانیی یەکێتـی نیشـتمانی لە لایەکی دی گەرم بـوو. کەرتێکی هەولێری یەکێتی بە فەرماندەیی شـاخەوان عەباس (دواتر لە کارەسـاتی یەکی شـوباتی ٢٠٠٤دا لـە هەولێر، لە ڕووداوی تەقینەوەی بارەگاکانی پارتی و یەکێتی شـەهید بـوو) گەیشـتنە لای ئێمـە لە ناوچـەی مەهاباد، بـۆ بەرگری و

پاراستنی ئەو شـوێنانەی بەدەستەوەمان مابوون لە لایەک و خافڵاندنی بەشێک لە هێزەکانی حکومەت لە لایەکی دیکەوە بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسـەر هێزی پێشـمەرگە لە میحوەری سەردەشت. زسـتانی ئەو ساڵە وەیشـوومە و سەخت و ساردتر لە چەند ساڵی ڕابردوو بوو. بە تایبەت کوێستانەکانی موکریان بە زیاتر لە مەتر بەفری تێ کردبوو. پێشمەرگەی دەشـتی هەولێر و گەرمیان بەو بەفر و سـەرمایە ڕانەهاتبوون و تەواو لە کەمین و حەرەسیات لەگەڵ ئێمەدا لە شاخەکانی حاجیاڵیکەند بێزار و ماندوو و وەڕەز بوون. بە هۆی ناسراویی پێشووم لەگەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتیـدا نامۆیان لە من نەدەکرد و منیـان بە ئی خۆیان دەزانی، گلەیی و گازەندەکانیـان دەهێنـا بـۆ لای من، ڕەفتار و هەسـتان و دانیشـتنی پێشـمەرگەکان و بەرپرسـانی ئێمەیان، بە لاوە زۆر نامۆ و غەریب بوو. لە ژیانی ڕۆژانە و خواردن و پشـوودا، لە ناو ئەو هەموو بەفرە، تاقەت و خۆڕاگریـی ئێمەیـان بە لاوە سروشـتی نەبوو. لای ئێمـە زۆر عادی و ئاسـایی بـوو بە هەفتـە و دوان تەنیا بڕوێش، شـۆرباولەپە، هەڵوا و شـیرێژی بۆگەنیو، خواردنمان بێت و گلەیی و پرتەوبۆڵەش نەبوو. لای ئەوان دەبوو جاروبار هیچ نەبێت حەیوانێک، گوێرەکەیەک لە عەرز بدرێ و پێشـمەرگەی پێ دەعوەت بکەن. شەهید کاوە مەخمووری فەرماندەی دەستە بوو، زۆر لێک نزیک بووین، سەرەی حەرەسیاتیان لە شاخ تەواو بووبوو، بۆ ئیسـتراحەت هاتبوونەوە ناو دێ، بانگی کردم و گوتی، کاکە ئیجازەمـان بدە خۆمان پارەمان پێیە و با بچین حەیوانێک بکڕین، ئەمڕۆ کەمێک خۆشـی کردووە و تۆف نییە و بیکەین بە کەباب و تشـریب. لە شـەرم و خەجاڵەتیدا زمانم نەدەگەڕا و ڕوخسـەتم لێ خواسـت ئێسـتا دێمەوە. چوومە لای موحسین بەرپرسی ناوچە و گوتم، زۆر عەیبە ئەوانە هاتوون خۆیان بۆ ئێمە بە کوشـت دەدەن و سـەرمابردوو دەبن، کەچی ئەوەندەیان پێ نادەین زگیان تێر بێت و تەعلیقمان لێ دەدەن. ئەوەندەیان پەنیر و شیرێژ خواردووە، دەڵێن لە سەرئاو لەجیاتی گوو، ڕیقنە دەکەین! ئێسـتاش بۆ من مردن باشتر بوو لەوەی میوان پارەم پێ بدا حەیوانیان

بۆ بکرم! باش بوو، موحسین گوتی، برۆ چیت پێ باشە بۆیان بکرە، با برنج و ڕۆنیان بۆ دابنێن و خۆیان چۆنیان پێ باش بوو با بە شێوەی خۆیان لێی بنێن. یەکێکی خەڵکی دێم ڕاسپارد و گوێرەکەیەکی کڕی و هێنایە مەقەڕ، کاوەم بانگ کرد و گوتم ئەمڕۆ میوانی کاک موحسین دەبین و خۆتان خەفەر بن، چیتان لە ڕۆن و برنج و پیاز و... پێویست بوو، تەنیا دەنگ بکەن، ئەمڕۆ دەیکەینە ئاهەنگ و شادی. پێشمەرگەی زۆر چالاک و لێزانیان لەگەڵدا بوو، یەکودوو گوێرەکە لە عەرز درا و کەوڵ کرا، گۆشت برژا و لەتوکوت کرا و تشریب وەسەر نرا، قبووڵی بە لەتکەنۆک بۆنی دە وڵات گەڕابوو، پێشمەرگەکانی ئێمەش لەخۆشیان دەستیان بە زگدا دێنا و لەگەڵ پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێردا لە عیوعیو و خۆبەهەردداران و چۆپیکێشان نەدەمانەوە. هەموو کارەکان و تەباخی هەر خۆیان کردیان و یەک لە خۆشترین خواردنەکانیان بۆ ئامادە کردین، کە بە لای پێشمەرگەکانی ئێمەوە زۆر تازە و نامۆ بوو. گوتیان کاکە ئێمە جاروبار وا نەکەین بۆمان ناگوزەرێت و خوا دەیزانێ کەی شەهید دەبین، با هیچ نەبێت بە خۆمان ڕابگەین!

زستانێکی سەخت و پڕ لە بەرگری و شەڕمان بوو، هەر ڕۆژە هەواڵی گرتنی ناوچەیەک دەهات، تەنانەت خەتەر کەوتبووە سەر مەنگوڕان، کە ناوچەیەکی زۆر سەخت و شاخاوییە و هەر لە کۆنەوە مەکۆی دێموکرات بوو.

بە بەشداریی زیاتر لە بیست لە پێشمەرگە کۆنەکان، لە لای پیرەهەڵۆ، کە بەرپرسی ئەسلەحەخانەی ناوچە بوو. لە ئاوایی چیچانبڵاغ کۆبوونەوەیەکمان کرد، دوور لە چاوی موحسین و سەید خالید، بەڵام ڕزگار و سەید ڕەحمانیش هاتبوون. کۆبوونەوەی قسەی ئاخر بوو، لەسەر بارودۆخی خۆمان و نارەزایەتی لە تەشکیلات و ڕێزنەگرتن لە ڕای پێشمەرگە کۆنەکان و گوێنەگرتن لە ڕەخنەکانمان بە بیانووی شەڕ و هێرشی بەربڵاوی حکومەت، ئەو قسەیەی بە دەمیانەوە گرتبوو، کە دەیانگوت کاتی ئەم قسانە و ڕەخنەگرتن نییە!

### ناوچەی مەهاباد وا بەڕێوە ناچێت

زۆربەی پێشمەرگە و فەرماندە ناسراوەکانی ناوچەی مەهاباد لەم کۆبوونەوەیە ئامادە بوون، زیاتر لە چەند سەعات گفتوگۆ کرا و دەتوانم بڵێم هەمووومان هاودەنگ بووین لەسەر ئەوەی ناوچەی مەهاباد وا بەڕێوە ناچێت و کۆمەڵە تووشی گەورەترین هەڵە دەبێت. بەروبوومی چەند ساڵەمان تەسلیمی جەماعەتی مەنسوور حیکمەت بکات و لە کۆنگرەی سێدا تەنیا ئەوانە چوون کە بە دڵی وان بوون و کەس تەنانەت بە وشەیەکیش دژیان نەبووە. ئێمە هیچمان نە لە کۆنگرە بووین و نە ئەندام. دواتر بیستوومە گۆیا تەنیا کاک مینەی حیسامی فەرماندەی هێزی پێشڕەو لە بۆکان، دژی پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بەم شێوەیە بووە!

### پشتمان لە سەروەت و سامان کرد

بڕیار درا چەند کەسمان لەگەڵ کۆمیتەی ناوەندیدا قسە بکەین و بە نوێنەرایەتیی ڕا و بۆچوونەکانمانیان پێ ڕاگەیەنین. لە گوندی کولیجە مەقەڕی ناوچە زیاتر لە دە دوازدە کەس لەگەڵ حەمەسوور و شوعێب زەکەریایی کە لە ناوەندییەوە بۆ ئەم کێشەیە هاتبوون، کۆبووینەوە و قسەمان کرد. ئەوان زۆر بێمنەت و لە سەرەوەڕا ئێمەیان دواند و سەرسووڕمانیی خۆیان نەشاردەوە بۆچی ڕزگار، کە ئەندامی کۆمەڵەیە لەگەڵ ئێمە کەوتووە. سەرکۆنەی سەید ڕەحمانە درێژیان کرد، حەمەسوور، ڕەحیمی بابەتاهیری جیا کردەوە کە قەرار بوو بە زوویی لەگەڵ خوشکی حەمەسووردا ژیانی هاوسەری پێک بێنن، دیار بوو ڕەحیمی ڕازی کردبوو بیکەن بە بەرپرسی نیزامیی پەل لە سەقز و واز لە بەربەرەکانێ و مانەوە لەگەڵ ئێمەدا بێنێت. خۆیان لە قەرەی کاک کەریم دانشیار و سیامەند نەدەدا، بە من و شەریفیان گوت دەبێ بێن بۆ ناوەندی و زیاتر کارمان پێتانە. بە هەڵسوکەوتێکی

دوور لە هاوڕێیەتی و گوێگرتن، بە پەلە کۆبوونەوەکەیان جێ هێشــت، ڕزگار و ڕەحیمیان برد و ڕۆیشــتن. کەمال وەلیانی دەســتێکی سەقەت بووبوو، گوتی من هیچ ئیمانم بەم کارە نەماوە، بەڵام ئەوەندەم کۆمەڵە خۆش دەوێت ناتوانم جێی بێڵم. هیچ مەســئوولیەتێک وەرناگرم و وەک پێشــمەرگەیەکی ســادە دەمێنمەوە. جەعفەر پیرەهەڵۆ گوتی، ئێمە زۆر هەژارین و بێمە دەر لە کۆمەڵە نازانم چ بکەم، بۆیە لێرە خۆم دەخافڵێنم تا بەڵایەکم بەســەر دێــت. چەندی دیکە ڕۆیشــتن و گوتیان دەچینەوە ســەر مووچە و مەزرای خۆمان، ئێمە بۆ کۆمەڵە هاتینە دەر و پشتمان لە کەســوکار و سەروەت و سامان کرد، نەک بۆ حیزبی کۆمۆنیست و فلان و فیسار. ئەوانە چوونەوە شار و لادێکانی خۆیان و تا ئێستاش نە ســەریان بۆ کەس داخســتووە و نە زەرەریان بۆ کەس هەبووە و جێی ڕێز و حورمەتی خەڵکیشن. بە هۆی پاراستنیان ناویان ناهێنم، دەنا زۆر ناسراو بوون لە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا.

دوای یــەک دوو کۆبوونــەوە و هاتوچۆی دیکە، لــە ئاخردا ماینەوە حــەوت هەشــت کــەس، کە ســوور بووین لەســەر ڕوانگــە و بڕیاری خۆمان، بە ڕاشــکاوی و ڕوونی گوتمان هەتاکو وەڵامی باوەڕپێکراو و سەرڕاستمان پێ نەدەن، لە هیچ ئۆرگانێک کار ناکەین و لەم کوردستانە پانوبەرینە خۆمان لە پەنایەک دادەنیشین و دەست لە دژایەتیی کۆماری ئیسلامی هەڵناگرین و ڕوو لە هیچ حیزبێکی دیکەش ناکەین.

### سیامەند هەستا سەر چۆکان

لــە کولیجە لــە ژووری کۆمیتەی ناوچە بۆ قســەی ئاخر و بڕیاری کۆتاییمــان، کەریم دانشــیار، ســیامەند موعینی، شــەریف مەعرووفی، حوسێن ئەنهاری (عەجەم)، کەریم ئەفسەر دلێر و من لەگەڵ موحسیندا دانیشــتین، زۆر قســە کرا و زۆری حەولی دا ڕازی بین و کار بکەین، بەڵام ئامادە نەبوو هیچ لە داواکاریی حیزبی و سیاسی و تەشکیلاتیمان بســەلمێنێت و وەک کەلامی خودا و ئایەی قورئــان دەیڕوانییە بڕیاری

پێکهێنانــی حیزبی کۆمۆنیســتیش، تەنانەت ڕازی نەبوو تاقە ڕەخنەیەک لەســەر خــۆی لەمەڕ ئیــدارەی ناوچەی مەهاباد قبــووڵ بکات، ئێمەش زۆر بــە ڕوون و شــەفافی گوتمان ڕازی نابین لە تەشــکیلاتێکی ئاوادا کار بکەیــن و هــەر ئەمڕۆ لێــرەش دەڕۆین. لەپڕ لە نــاو ژوورەکە، کە هەمووومان چوارمشــقی لە ســەر عەرز دانیشــتبووین، دەستی هەڵێنا و ســەیری سەعاتەکەی مەچەکی کرد و گوتی، تا ئێستا کە سەعات چوار و نیــوە، ئێوە هەموو شۆڕشــگێڕ و ئینقلابی بوون و لەم دەقە بەملاوە ئێوە ئیتر ئینقلابی و شۆڕشــگێڕ نین! ســیامەند هەســتا سەر چۆکان و گوتی، مادام وایە موحسین گوێبگرە، با منیش نەزەری خۆم لەسەر تۆ بڵێم: «تۆ پیاوێکی زۆر بێشعوور و پەخمەی[1]»!

### وێنەی ناسنامەکەی سیامەندم هەر لە لایە

موحســین داوای کــرد کارت و ناســنامەکانی کۆمەڵــە جــێ بێڵین، هەمووومــان فڕێمــان دایە بەردەمی، ســیامەند دەســتی درێژ کردەوە و هەڵیگرتــەوە، بە نینــۆک وێنەکەی خۆی لێکــردەوە و فڕێی دایەوە بەر دەمــی و زۆر بــە تووڕەییەوە گوتی، با وێنەکەشــم لاتــان نەبێت! ئەو وێنەیەی ســیامەند لە کارتی پێشمەرگایەتییەکەی کردەوە ئێستاش لای منــە و هەر ئەوکات هەڵمگرت. ســیامەند کوڕی ســولەیمان موعینی و برازای عەبدوڵلا و خانەی موعینی، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوو، ئاوای لەگەڵدا کرا، ئیتر دەبێت هەموو تێبگەن ئەمانە بە ناوی ســەرکردایەتیی کۆمەڵەوە چ بوون و چەند بەپەرۆش و لێزان بوون، بە کەلێن و قوژبنی فەرهەنگ و دابونەریتی کۆمەڵایەتی و بۆچی وا بێمنەت و لەخۆڕازی و خۆویســت بوون؟! ویســتی باسی چەکەکانمان بکات، زۆر بە توندی بە گژیدا هاتینەوە و پێمان ســەلماند هەموو چەکەکان نە تەنیا ئی خۆمانە و بــە پارەی خۆمــان کڕدراون، بەڵکو چەند تفەنگــی من و کاک کەریم هەر لە ســەرەتای شــۆڕش دراوە بە کۆمەڵە و ئێستاش لە شانی فلان

---

١- پەخمە، گێل و دەبەنگ.

و فلان پێشـــمەرگەدایە، پێمان عەیبە داواشیان بکەینەوە! ئیتر زۆر زوو بێدەنگیی لێ کرد و وەدەرکەوتین بەبێ خواحافیزی.

شـێخ و ئاغای کولیجە، حاجی شـێخ عەوڵا برای شـەهید سـەلاح شەمسی بورهان، کە کۆمەڵە لە خانووی ئەودا بوو، زۆر لە کاک کەریم و ئێمەش نزیک بوو. کەم و زۆر ئاگای لە دەنگەدەنگ و کێشـەی ئێمە هەبوو، لە لای ماڵە خۆیان پێشـــی پێ گرتین و سـوێندی لێ خواردین بەم بەفر و سەرمایە نابێت برۆین و هەموومانی بردەوە ماڵی خۆیان و خزمەتێکی زۆری کردین. شەریف کە کەسوکاری لای باوانی، ئاغاوەتی وەتەمیـش بوون و خزمی هەبوو، ماڵێکی بۆ خۆی و خەجیجی خێزانی دەستەبەر کردبوو، بە پەلە گەڕایەوە بۆ وەتەمیش، بەڵکو شوێنێکیش بۆ ئێمە ببینێتەوە و بچین هەموومان لە وەتەمیش، کە جارێ پێشـــمەرگەی تێدا مابوو دانیشین.

### سەید خالید زۆر هەڵەی

ئـــەوێ ڕۆژێ، محەمـــەدە عەجەمەکـــەی لای مـــن دەورەی دیبـــوو، زۆرم حەول دا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و نەیانکرد و ناردیان بۆ ناو مەفرەزە، ســـەرەنجام دوای چەند مانگ مانەوەی لەناو پێشـــمەرگە، بە هۆی ئیجازەی چەندبارە و چوونی بۆ مەراغە، دەستی کەشف بووبوو، بـــە گیراوی لـــە مزگەوتی کولیجە، ســـەید خالید تەحقیقـــی لێ کردبوو، هیچی نەدابوو بە دەستەوە، شەو هەر لە مزگەوت بە ئیهمالی دەرگایان لەســـەر داخســـتبوو و حەرەســـی بەردەرگایان بۆ دانابوو هەتاوەکونێ بەیانـــی بـــۆ زیندانی مەرکەزی بنێـــرن. بەیانی زوو هـــەلا بلێند بوو، کە دەرگای مزگەوتیـــان کـــردەوە، محەمـــەد بە شـــەلوار و دۆخینەکەی بە شیشـــی چراتۆڕی مزگەوت خۆی ئیعدام کردبوو. بە خەڵووزی زۆپاکە لە دیواری مزگەوت نووسیبووی: «سید خالد کور خوندی از من حرف بکشی» واتا سەید خالید، زۆر هەڵەی، بتەوێ قسە لە من دەربکێشیت!

ئـــەوەی زانـــرا محەمەد چەنـــد جارێک بە ئیجازە ســـەردانی مەراغە

و حکومەتــی کــردووە و بەنیــازی تیرۆریکــی گەورە بــووە، تا خۆی دەگەیەنیتــە ناوەندی بۆ لێدانێکی گــەورە لە هەموو ئەندامانی ناوەندی، پیشــمەرگەکانی دەســتەکەی خۆی لێــی وەگومان دەکــەون، بۆ هێندە ئیجازە وەردەگریت و دەڕوا و دیتەوە؟!

ئێمــە لەوێ بوویــن محەمەدیان لە کولیجە ناشــت و نیازی لێدان و کردەوەی تیرۆریستیی گەورەی لەناو کۆمەڵەدا، بردە ژێر گڵ.

# ٤٢

## هاتنەدەرەوە لە کۆمەڵە

بە کۆڵێک بیرەوەری و هەناسەساردی دوای زیاتر لە چوار ساڵ خەبات و پێشمەرگایەتی لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، بەناو بەفرێکی زۆردا ڕوومان کردە وەتەمیش. شەریف ژوورێک و پێشخانەیەکی لە بەرزایی دێ بۆ پەیدا کردبووین. ناردمان بەدوای دایک و کەسوکار و زۆر زوو مەقەڕی خۆمان ئاوەدان کردەوە.

هاتنەدەرمان لە کۆمەڵە و دانیشتنمان لە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە بە چەکەوە دەنگی دایەوە، بە دەیان پێشمەرگەی ناڕازی پەیوەندیان دەگرت و پرسیاریان دەکرد بەتەمای چین؟! هەبوو حەزیان دەکرد شتێک دروست بکەین و ئەوانیش بێن و بەیەکەوە درێژە بە خەباتی چەکداری بدەین و بۆشایی نێوان دیموکرات و کۆمەڵە پڕ بکەینەوە. لە زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا کادیر و پێشمەرگەی ناڕازیی لە دیموکرات و کۆمەڵە زۆر بوون، ڕۆژانە پەیوەندییان پێمانەوە دەکرد و داوای کار و دروستکردنی هێزی سێهەمیان لێ دەکردین. بە تایبەت بوونی کەسایەتیی وەک کەریم دانشیار و سیامەند لە ناوماندا، خەڵک زۆرتر هان دەدران و متمانەیان هەبوو، کە ئەگەر ئێمە بمانەوێت شتێکمان پێ دەکرێت. تەنانەت حیزبی دیموکرات بەرپرسێکی ناوچەی نارد و کاک کەریم لەگەڵیدا دانیشت، دوکتۆر قاسملوو ڕایسپاردبوو بێت و هەمووومان بانگهێشتی ناو دیموکرات بکات، بە تایبەت کەریم دانشیار و سیامەندی کوڕی سولەیمان موعینییان بە لاوە زۆر گرنگ بوو، تەنانەت وەعدی بوون بە ئەندامی سەرکردایەتی و پۆستی باڵایان بە هەموومان دابوو.

## خۆدوورگرتن لە شەڕی دۆڕاو

ئێمە هەموومان پێشـــتر بە کۆی دەنگ بڕیارمـــان دابوو نەچینە ناو هیچ حیزبێک لە لایەک و لە هیچ جێیەکیش بە دژی کۆمەڵە تەنانەت یەک وشـــەش نەدرکێنیـــن. هەتا بۆمان بکرێت لە ناوچەکانی ژێر دەســـەڵاتی پێشمەرگەدا دانیشین و زۆرتر خۆمان پەروەردە بکەین. ئیجازە بە هیچ پێشمەرگەیەک نادەین واز لە کۆمەڵە بێنێت و بێتە لای ئێمە. جارێ هیچ بڕیارێک نادەین بۆ دروســـتکردنی هێزێکی ســـێهەم. عەلاقەی ئەو کادر و پێشـــمەرگە دابڕاوانەی دیموکرات و کۆمەڵەمان، کە حەولی بەیەکەوە کاردکردنیـــان هەبـــوو، نەبێت و چاودێری بکەیـــن تاکو ئەو کاتەی دڵنیا دەبیـــن دەکرێت شـــتی چاکی لـــێ بەرهەم بێت. چاوەڕێـــی هەلومەرجی کوردستان بکەین و لە ئەگەری هێرش بۆ سەرمان پێ بە پێی پێشمەرگە ڕوو لە ناوچەکانی ژێر دەســـەڵاتیان بکەین و تا دەکرێت خۆمان دوور بگرین لە شـــەڕی دۆڕاو و خۆبەکوشـــتدانی بەخۆڕایی. کاک کەریم بۆ پرس و کێشە و پەیوەندییەکان برا گەورەمان بێت.

## تاقە بستێک نەما

لای خەڵـــک و حکومـــەت وا بـــڵاو بووبـــووەوە، ئێمـــە کوردســـتانی گەورەمان دەوێت و لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا نین. بەرپرسێکی ڕێکخســـتنەکانی کۆمەڵە لە مەهاباد گیرابوو، ئیعترافی لەسەر زۆر شت و کـــەس کردبـــوو، چەند بەرنامـــەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیـــان لە مەهاباد بـــۆ دانا؛ گوتـــی جەماعەتی وەتەمیش، واتا ئێمە لایەنگری کوردســـتانی گەورەیـــن و لـــە کۆمەڵـــە جیا بووینـــەوە. کابرا ناوی عومـــەر بوو و لە نزیکەوە دەمانناسی، ناوی یەک بە یەکی ئێمەی برد. ئەو قسانەی سەر تەلەفزیۆنـــی مەهابادمان زۆر پێ ناخۆش بـــوو، هیچ حەزمان نەدەکرد دوژمن و حکومەت بە کێشـــەمان بزانن و ئاوا بە گەرموگوڕی باس لە وازهێنانمان بکەن. کاردانەوەی خراپی لەســـەر خەڵک دەبوو، چارەمان نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی لە ناوشار و دەرەوە پەیوەندیی دەگرت

و پرسـیاری لیمـان بوو، بە یەک وشـەش هیچمان لەسـەر کۆمەڵە و پێشـمەرگە نەدەدرکانـد و زۆرتـر دەمانگوت، خۆمان مانـدوو بووین و کۆمەڵـە عەیبـی نییە. بە گشـتی رامـان وا بوو نابێـت بزووتنەوەکە لەسـەر راوبۆچوونی ئێمە لاواز بکرێت. هەرچەند زۆری نەبرد بە هەر هەمووومان تاقە بسـتێک نەما لە رۆژهەلاتی کوردستاندا لێی دانیشین و بە ورد و درشـتی دیموکرات و کۆمەڵە و ئێمەشـەوە پەرپوەی ناوچە ئازادکراوەکانی باشوور بووین و قسە لەوەدا نەما، ئاخۆ بزووتنەوەکە بە قسەی فلان و فیسار لاواز دەبێت، یان نابێت؟!

ئەوەی رۆژێک لە بزووتنەوە و شۆرشی چەکداریی کوردستاندا بە هەر دوو بەشی باشوور و رۆژهەلاتی ئەوکات و هەر چوار بەشەکەی ئێستاش، بە تایبەت باکوور و رۆژئاوا بەشداریی کردبێت و لە نزیکەوە ئاشـنا بێت بە وردەکاریی بەرێوەچوونی شۆرشەکانەوە، بێگومان رۆڵ و گەورەیی دایکە پێشمەرگە لە دڵسۆزی، فیداکاری، زیندان، ئەشکەنجە، نامەگەیاندن و یارمەتی بە هەموو شێوەکانی دەزانێت و کەس ناتوانێت حاشا لەوە بکات ئەوە دایکان بوون زۆر زیاتر لە حیزب و گرووپەکانی بەشدار لە شۆرش، ئاگایان لە پێشمەرگەکان بووە و لە رۆژە ئەستەم و شەوە ئەنگوستەچاوەکاندا، ئەوە ئەوان بوون بە هەزاران بیانوو و جۆر و خۆگۆرین و خۆ بە ئاو و ئاگردا دان، لە شار و لادێ و حەشارگەکان تەوارئاسا فریای رۆڵەکانیان دەکەوتن.

### دایکی سولەیمان موعینی

یـەک دوو رۆژ بـوو ماڵمان لـە کۆمەڵە جیا کردبـووە، وردەوردە هاتینـەوە هـۆش خۆمـان و ئەوجـار زانیمـان بـۆ گوزەرانـی ژیـان، پێویستیمان بە پارە و ئەرزاق و بژێوی هەیە، هیچمان نەبوو. بریارمان دابـوو دوای ئەو قسـە ناخۆشـانەی موحسـین لەمەر خۆمـان، داوای یارمەتـی لـە کۆمەڵە نەکەین. دەنگـۆی وازهێنانمان بـە پێچ و خوار و ناکامڵـی گەیشـتبووەوە کەسـوکارمان. رامانسـپارد هیچمـان نییە و

زۆرمان پێویستی بە سووتەمەنی و خۆراک هەیە. یەک دوو ڕۆژ دواتر لای نیـوەڕۆ هاڕە و ناڵـەی تراکتۆرێک لە ناو بەفری دێ پەیدا بوو، بۆ لای ماڵەکەی ئێمە دەهات، چەند کەسی داپۆشراو لە سەر گڵگیر، ئاسنی ڕەقوتەقی سـەر تایەکان تونـد خۆیان گرتبوو، گەیشـتنە بەردەرگای ئێمـە، هاتینـە دەر و بەرەوپیریان چووین، نەنکی سـیامەند، واتا دایکی کاک سـولەیمان موعینی و سـامرەندی خوشکی سیامەند و دایکم. دایە زارای نەنکی سیامەند و دایکم هیچ جووڵەیان نەبوو، قەرسان بووبوون و لـە زمان کەوتبوون، چەشـنی چەنـد پەیکەرێکی بێگیانی داپۆشـراو بـە بەفر. شـۆفێری تراکتور هـاواری لێ بڵیند بـووەوە: «بەخوا نازانم مـاون یان نا، زوو بیانبەنە ژوور و سـەرما لێی داون». بە هەموومان هێنامانە خوار و لە ناو پێشـخانەیەکی بچووک، حەپەسـاوبووم و وڕ و کاس چـاوم بڕیبووە دایکم و جووڵەم نەمابـوو. لەناکاو کاک کەریم گوڕانـدی و گوتی، عەلی بۆ وەسـتاوی، زوو کـە پێڵاوەکانی دایکت لە پێی داکەنە! هاتمەوە خۆ و ڕۆبوومە قاچەکان و جزمەکانی، وەک داری ڕەقیان لێ هاتبوو، پانتۆڵی پیاوانەیان لە پێدا بوو، وەک دەفە شەقوتەق بـوون، بە چنگ و ددان قەیتانەکانم کردنەوە، وەک پەیکەرێکی بێ گیان و جووڵە وەسـتابوون. هەموویانمان بردنـە ژوور، نەوتمان قەرز کرد و لیفەمان لەسـەر کوورە ساردوسـڕەکەمان لا دا و دامانگیرسـاند. بە ئاوی گەرم و داپۆشـینیان بە هەرچی پەتـووی هەمانبوون وردەوردە هاتنەوە خۆ و ڕوومەتە سـوورهەڵگەڕاوەکانیان دەرکەوتن، زۆپاکەمان لەمێـژ بـوو وا گرڤەی لێوە نەهاتبـوو. بە خواردنـەوەی چای گەرم و شـیرنییەکانی هێنابوویان، کەوتینە پرسـیار و بەخێرهاتن و قسەکردن. بە بیستنی ڕاسپاردنەکەمان و هەواڵی هاتنەدەرمان زۆر نیگەران دەبن و نەنکی سـیامەند ڕادەسپێرێت لە دایکم، بە هاتنی بۆ لای ئێمە ئەویش لەگەڵ خۆیدا بێنێت، ترسـی هەیە ئیتر سیامەند نەبینێتەوە. بەیانی زوو سـواری پاسی بۆکان دەبن و لە چەمسـەری مەلالەڕ دادەبەزن، بەناو بەفرێکـی زۆردا دەچن بۆ ناو دێ و تراکتۆر بە کرێ دەگرن، بیانهێنێت

بۆ وەتەمیش، هەرچەند ڕێگەکە زۆر دوور نەبوو، بەس لەو سـەرمایە و لەسـەر تراکتوری سـەرئاوەڵە دەبێ بزانین بۆ ئەم ژنە پیرانە چەند سـەخت و بەئازار بووە و چۆن توانیویانە خۆ بگرن لە بەر سـەرما و کڕێوەی بە بای زریانەوە!

### نانخواردنێکی خۆش

دوای گەرمبوونەوەیـان و خواردنـەوەی یـەک دوو چایەک، دایکم گوتـی، ئـەڕێ ڕۆڵە ئەوە هەر لەسـەر دڵـم مەراقە بپرسـم، کە هاتینە ژوور بۆچـی ئەم کوورەیە لێفەی پێدا درابوو؟! کاک کەریم گوتی، دایە گیـان کوورەمـان هێنا ئێمە گەرم کاتەوە، کەچی ئەوە دوو ڕۆژە نەوت نەبوو تێی بکەین، ناوێرین بە تەنیشتیدا بڕۆین سەرما لە دەرودەرووونی دەبارێـت، گوتمان گوناحە با خۆی سـەرمای نەبێت! ئیتر سـامرەند و هەمـوو کەوتنـە پێکەنیـن و دایکم و دایە زاراش بـە کوێر بم، کوێر بم بۆمان، دەستیان بە دوعا کرد. کەریم ئەفسەر عەلادینەکەی لە تەنیشت خـۆی دانابـوو، مەنجەڵی بوخارەکەی لەناو کۆشـی گرتبوو، لە پەتاتە، پیواز، فاسـۆلیا و کەمێک گۆشـت، هەر بە هەڵتروشکاوی و ئەژنۆکانی لەسەر سینگی، بە دەوریدا دەسووڕا و هەرچی وەدەستی کەوت تێی کرد و سـەری لێ قایم کرد و وەسەری نا، هەر سەیریان دەکرد و سەریان ڕادەوشـاند چۆن دەبێت؟! هێندەی نەبرد فسەفسـی مەنجەڵ ئەوەندەی دی ژوورەکـەی گەرم داهێنا و هەڵم شووشـە پەنجەرەکانی داپۆشـی و بۆنوبەرامـەی مەنجەڵی کەریم زگەکانی ڕێک دەگوشـی. سـفرەمان پـان کردەوە و هـەر هەموومان بـە دەوریدا دانیشـتین، خواردنەکەی کەریمیان زۆر پێ خۆش بوو. سـامرەند زۆر شـەرمێون بوو، پارووی زۆر بچووکی دەکرد و بە ئاستەم و دووبەلا[1] دەیخوارد و نەیدەخوارد. حوسێن عەجەم شۆخیی لەگەڵدا دەکرد و لاسای دەکردەوە، بە پێکەنین و کەشـێکی خـۆش و پڕ لە ڕێـز و حورمەت بۆیان، نانمـان خوارد و

١- دووبەلا، بە ئەسپایی، بە ئارامی، بە کەمی.

دەیانگـوت، هەرگیز تامی ئـەم خواردنەمان لە یاد ناچێت و زۆر خۆش بوو!

پـارە و خـواردن و ئەرزاقیـان بـۆ هێنابوویـن و وەعدیـان دا بە گەڕانەوەیان دەستبەجێ نەوتمان بۆ بەڕێ بکەن.

### چۆن سواری کۆڵم دەبی؟

چەند ڕۆژی نەبرد براژنە نەشـمیلی هاوسەری کاک کەریم دانشیار لەگەڵ کوردانی کوڕیان و شیلانی کچیان پەیدا بوون. زۆریان شتومەک بۆ هێنابووین. شـیلان زۆر منداڵ بوو، تازە فێری قسـەکردن بووبوو، باوکی نەدەناسـی و هەر دەگریا، حوسـێن عەجەم بە لاساییکردنەوەی نێوانـی لەگەڵدا خۆش کردبوو، کوردان خۆشەویسـتی هەموومان بوو، گەورە بووبوو، شەش حەوت ساڵانە بوو، کوردان بە مۆنگۆلی لەدایک بوو، ڕۆح و گیانی باوکی بوو، هەڵبەت ئێستاش کە زیاتر لە چل ساڵی تەمەنـە هـەر وان و نە ئەو بەبێ باوکی هەڵدەکات و نە باوکی دڵی دێ بۆ ساتێک لە خۆی دووری بخاتەوە. کەریم ئەفسەر بردی بۆ ناو دێ لە دوکانەکە شتێکی بۆ بکڕێت، لە گەڕانەوەدا لە ناو چەقی ڕێ و پڕ لە ژن و پیاو بە پەنجە ئیشـارە دەکات بە کەریم دابێتەوە بۆ ئەوەی سـواری کۆڵی بێت، هەرچی کەریم دەڵێ کوردان گیان عەیبە من بەم سـیمایەوە چۆن سواری کۆڵم دەبی؟! کوردان مل نادا و حوکم دەکات بچێتە کۆڵی کەریـم و بگەڕێنـەوە. حوکمـی موفاجاتە و بۆ کەریـم دەرچووە، هیچ عیلاجی نامێنێت و تا ماڵەوە کوردان لە کۆڵ دەکات و بە ناو دێدا و بە بەرچاوی خەڵک و پێکەنینی ژنان و کچانەوە هێنایەوە ماڵ، ئیتر کەریم دەسـتی کرد بە سـەرکۆنە و جنێودان بە خۆی و سـەری ڕادەوەشاند کـوردان چیی بەسـەر هێناوە. ئەوە بووە هۆی گـوزەران و پێکەنین و ڕابواردنمان بە کەریم بۆ ماوەیەک.

# ٤٣

**ئیدی گەیشتە پاسپۆرت**

ڕۆژانی سەخت و پڕ لە بەفری زستان، زۆر بەکاوەخۆ لە ژوورە ساردوسڕەکەی وەتەمیش، بە نیگەرانی لە دوا ڕۆژ و چارەنووسمان، بە تایبەت لەژێر گوشار و هێرشی ڕۆژانەی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر ناوچە ئازادەکانی کوردستان تێپەڕ دەبوو. شەو و ڕۆژ لەگەڵ یەکدا لە گفتوگۆدا بووین دەبێت چ بکەین و کام ڕێیە هەڵبژێرین.

بۆچوونی زاڵ کڕین و ئامادەکردنی پاسپۆرت بوو. بۆ چوونی دەرەوەی وڵات تەنیا پاسپۆرت نەبوو کە دەبوو بمانبێت، لەوە گرنگتر پارە بوو، لە پارەش گرنگتر ڕێگە بوو. پاسپۆرت بە پارە و بە قاچاخچی بوو، پارە بە دایک و باب و براکان و ڕێگەش یان حیزبەکان بوون لە ڕێی پەیوەندییەکانی بەغداوە، یان خۆ بە ڕەزاییەداکردن و بە ڕێی قاچاخ بەرەو تورکیا چوون بوو. ئەوەش بە تایبەت بۆ ئێمە مەترسیی گەورەی هەبوو بۆ لەدەستدانی گیانمان و کەوتنە دەستی جەللادانی کۆماری ئیسلامی.

بە یارمەتیی کەسوکارەکانمان پارەیەک کۆ کرایەوە. کەریم ئەفسەر لە ڕێگەی کاکیەوە پاسپۆرتی بە پارەیەکی یەکجار زۆر لە نرخی خۆی، بە چەندین جار هاتوچۆ بۆ شارویران و منەتی زۆر، چەند پاسپۆرتی زۆر بێکەڵک بە مۆرکی ساختەی زەق و بەرچاو بۆ پەیدا کردین. نەبوونی هیچ چەشنە ئەزموونێک و متمانەپێکردنی زۆر بە «دۆست» وای لێ کردین زۆربەی سەرمایەکەی کۆمان کردبووەوە وا بە ئاسانی لە دەستی بدەین و هەرچی بوومان لە دەستی برا گەورەکەی کەریمان کردا!

بە بۆچوونی خۆمان لە پێداویستییەکانی چوونی دەرەوە پاسپۆرت

ئامـــادە کرابـــوو. بۆ پـــارەش گوتمان کەی هاتینە ســـەر وڵاتجێهێشـــتن چەکەکانمان کە ئیی خۆمان بوون، دەیانفرۆشـــین و مەســـرەفی ڕێگەی پێ دەدەین. بۆ ڕێگەش گوتمان قسە لەگەڵ کۆمەڵە و دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدیندا دەکەین و منیش دۆستەکانی مامۆستا زەبیحی لە بەغدا دەدوێنم، بەڵکو یارمەتییان لەدەست بێت.

من و کەریم و ســـیامەند چەند جارێک بەم زســـتانە تووش و پڕ لە بەفـــرە، بە پێیان ڕێگەی وەتەمیش شـــاروێرانمان بـــڕی، یەک دوو جار لەبەر کڕێوە و ڕێونکردن هەر ئەوە بوو تێدا نەچووین!

### نامەی چاوڕەشەکەم

پێـــش گرتنـــی، قژکاڵی چاوڕەشـــەکەم لە ســـابلاغەوە، نامەیەکی بۆ نووســـیبووم و دابوویە نەرمین بۆمی ڕەوانە بـــکات، دایە فاتمی دایکی شـــەهید خـــدر زۆر لە ماڵە ئێمـــە نزیک بوو و هاتوچـــۆی گەرموگوڕی لەگـــەڵ دایکمـــدا هەبـــوو، دەیدەن بە دایـــە فاتم کە هات بۆ شـــاخ بۆمی بێنێت. لەو ماوەیەدا، کە زۆری پێ دەچێت و ســـەروبەندی کێشەکانمان لەگەڵ بەرپرسانی ناوچەی مەهاباددا بوو، دایە فاتم دێت و من نابینێت و پرســـیار دەکات عەلی لە کوێیە؟! هاوڕێیەک کە دواتر شـــەهید بوو و زۆریـــش دژایەتیی ئێمـــەی دەکرد لێی دەچێتە پێش و پێی دەڵێت عەلیت بۆ چییە؟ ئەویش دەڵێت کارێکی زۆر تایبەت و خۆمانەم پێیەتی. دەڵێت عەلـــی دوورە، بەس من زۆری لێ نزیکم و چی هەیە بە منی بڵێ. دەڵێ وەڵا ســـوێندیان داوم دایک و خوشـــکی ئەم نامەیە تەنیا بدەمە دەستی خـــۆی. ئەویش ســـوێندی بۆ دەخوا و ڕازیی دەکات، کە هەر ئەوشـــەو مـــن دەبینێت و دەمداتێ. بەم زمانە نامەکـــە لە دایە فاتم وەردەگرێت و یەکسەر دەیخوێنێتەوە و بە پەلە دەچێتە کۆمیتەی ناوچە و نامە دەداتە سەید خالید و دەڵێ ئەوەتا؛ ئەوانە بۆیە بیانوو دەگرن بەتەمای ژنهێنان و ڕۆیشـــتن لە کۆمەڵـــەن. نامەکە لای خۆیان ڕادەگـــرن و بێدەنگیی لێ دەکەن و هەرگیز نەیاندامەوە.

دواتــر و پاش ماوەیەک کە ئێمە لە وەتەمیــش ماڵمان دانابوو، دایە فاتمم دیت و بۆی گێڕامەوە کە نامەی داوە بە فلانەکەس. زۆری وەدوا کەوتین و دایە فاتم بە گژیدا چووەوە، هیچ فایدەی نەبوو.

لە ســەفەرێک لــە گەڕانەوەی شــارویران لە نێوان ئاوایــی ئازاد و عەولاباد تووشــی دەســتەیەک لە پێشــمەرگەکانی کۆمەڵە بووین، ئەو کــوڕەی نامەکەی منی وەرگرتبوو بەرپرســیان بوو. لەنــاو تووڵەڕێی ڕەچەشــکاوی بەفر لووتمان بە لووتی یەکدا کەوت. گوتم ئەمانەتییەکی مــن لای تۆیە هاوڕێ، وا باشــە ئەمانەتــداری بکەیــت و بمدەیەوە، بە ڕەوشــێکی زۆر بــازاڕی و دوور لە ئــەدەب و هاوڕێیەتی گوتی، ئێوە لەناو کۆمەڵەدا نەماون و ئەو شــتانەی ئێی ئێوەن دەســتمان بەسەردا گرتــوون! بوو بە دەمنەدەمانێ و میلهێناوە لەناو ئەم چۆڵگە و بەفرەدا، بــاش بوو بــە تەداخولی هاوڕێیانــی دی لێک جیا کراینــەوە و هەرگیز چــاوم بــە ئاخر نامەی پێــش زیندانی نەکەوت و چەند ســاڵ بە داخ و حەســرەتی ئەوەی، لە ئاخر نامەدا چیی بۆ نووســیوم، هەزاران فیکر و خەیاڵی خۆش و ناخۆشــم لە خــۆم دەکردە میوان. ئێمە تا ئەو کاتە بۆ یەک عەزیز و هاوڕێین، کە دەرویێشئاســا لەناو حیزب بەســەر یەکتردا هەڵبلێین، لەوە ترازا دەبینە دوژمن و بابەکوشتەی یەک!

ئەوان هەر ئەوەیان کرد کە موحسین ڕۆژی ئاخر گوتی، واتا تا ئەو کاتە شۆڕشگێڕ بووین کە لەگەڵیاندا بووین!

بــەرەو بەهــار دەچوویــن و لــە هەمــوو لاوە هێرشــی پاســدار و حکومــەت بۆ ســەر ناوچە ئازاد و ژێر دەســەڵاتی پێشــمەرگە زیادی دەکــرد، ناوچەکانــی محاڵ و گەورک و مەنگوڕان و شــارویران تەواو کەوتبوونە ژێر هەڕەشــە و داگیرکردن لە لایەن پاسدارانەوە. بیستمان هێزی پێشڕەو مەقەڕ لە وەتەمیش کۆ دەکاتەوە و زۆرتر گەڕۆک دەبن تا نیشتەجێی شوێنێکی تایبەت، ئەوەش بە واتای ئەوە بوو ئێمەش چیتر ناتوانین بە تەنیا لە وەتەمیش بژیین و شــەوان بە ئاسوودەیی بخەوین و لە ماڵ بمێنینەوە.

**لەگەڵ دکتۆر جەعفەر و موهتەدیدا**

لە ئاشی گوڵانەوە خەبەریان پێ داین سەرکردایەتیی کۆمەڵە دەیەوێت لەگەڵ من و شەریفدا دانیشن و بانگیان کردین بۆ کۆبوونەوەیەک. هاورێیان بە تایبەت سیامەند زۆریان بە لاوە سەیر بوو و پێیان ناخۆش بوو وەڵامیان بدەینەوە، دەیانگوت بۆ هەر ئێوەیان بانگ کردووە؟! دەیانەوێت شکاف و دووبەرەکیمان لە نێواندا بنێنەوە و نابێ بچن! من گوتم دەچم بزانم باسی چ دەکەن. زۆر بە عاجزی و نارەزایەتی لەگەڵ شەریفدا ڕێگەی بەفر و کوێستانەکانی نێوان وەتەمیش و ئاشی گوڵانمان بڕی و چووینە مەقەڕی سەرکردایەتی. کاک عەبدوڵلا موهتەدی و دوکتور جەعفەر شەفیعی هاتن و زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردین. گوتیان بۆیە ئێوەمان بانگ کردووە پێتان بڵێین، ئێوە جیاوازن لە ئەوانی دی، ئێمە ئێوە زۆرتر بە ئیی خۆمان دەزانین و نابێت کۆمەڵە بەجێ بێڵن، بە تایبەت ڕوویان لە من کرد و بیریان هێنامەوە کە هەر لە دەستپێکەوە تۆ کوڕی خۆمان بوویت و پەروەردەی سەرەتاکانی کۆمەڵەم. زۆر بە ڕاشکاوی گوتیان، حەز ناکەن ئێمە کۆمەڵە جێ بێڵین. گوتمان، ئێمەش وا دەزانین هەموو هەست و نەستی خۆمان بەجێ دێڵین و هیچ ئارەزووی ئەوەمان نییە دەست لە کۆمەڵە هەڵگرین، بەڵام وا دیارە لەو چەند کۆبوونەوەیەی، کە لەگەڵ حەمەسوور و شوعێب زەکەریاییدا کران، نیشانتان دا ئێمەتان لێ زیادە و پێویستیتان بە ئێمە نەماوە، بۆیە لە ئاخردا ئێمەش بڕیاری ئەوەمان دا کە ئیتر چیدی ناکرێت خۆمان بە زۆر هەڵاوەسین و بڕیاری کۆتاییمان دا و کۆمەڵەمان جێ هێشت. زۆر قسەمان کرد و دەیانویست ڕازیمان بکەن بگەڕێینەوە، لە ئاخریدا بە شۆخی و ڕاستی گوتم ئێوە ئەم عەجەمانەی هاتوون لە ئێمەتان پێ گرنگ و لازمترە، ئەگەر ئێمەتان دەوێت دەست لەوانە هەڵگرن با ئێمەش هەر ئێستا بگەڕێینەوە و یەکسەر بڕۆین بۆ ناوچەکانی شەڕ لە ڕیزی پێشمەرگەکانی کۆمەڵەدا! پێکەنین و گوتیان، ئەگەر ئەوە شەرتی ئێوە بێت هەرگیز نایبینن و ئەوانە دەبنە سەرکردەی دوارۆژ و حیزبی کۆمۆنیست لەگەڵ ئەوانەدا دروست

دەکەیـن بۆ ڕزگاریی چینی کرێـکار. وایان دانابوو بە پێدانی پێشـنیاری مەسـئوولیەتی باڵاتر، وەک ئەوانی دی ڕازی دەبین و دەگەڕێینەوە. ئیتر بەوەی کە بیری لێ دەکەینەوە و دەچین لەگەڵ هاوڕێیانماندا قسە دەکەین، ماڵئاواییمان کرد و گەڕاینەوە بۆ وەتەمیش.

کـوڕەکان چاوەڕێـی هاتنەوەمان بـوون و نیگەران بـوون لەوەی پەشـیمانیان کردبینـەوە و بگەڕێینـەوە نـاو کۆمەڵە، کە بیسـتیان چی گوتـراوە و ئێمـە چیمان گوتووە، نێوچاوانیـان کرایەوە و گوتیان زۆر دەترساین هەڵتانگێڕنەوە، بۆیە پێمان خۆش نەبوو بچن!

### بووین بە دوو دەستە

دوای دەیان سـەعات کۆبوونەوە و چەندین ڕۆژ و شەو، بڕیار درا ببین بە دوو دەسـتە. دەستەیەک کاک کەریم دانشیار و سیامەند و من بەرەوە ئالان و عێراق، دەسـتەکەی دی شـەریف و کەریم ئەفسـەر و حوسێن عەجەم بەرەو ورمێ و تورکیا. بەڵام ئەوان نەڕۆن هەتاکو ئێمە لە ئالانەوە وەڵامیان بۆ دەنێرین بە بوون و نەبوونی ڕێگە لە عێراقەوە. قـەرار بوو گەر ڕێگە نەبێـت ئێمەش بگەڕێینەوە و هەموو بەیەکەوە بە ورمێدا بڕۆین و گەر ڕێگەش هەبوو لە عێراقەوە وا باشە ئەوانیش بێنە لای ئێمە، کە مەترسیی کەمترە.

لە وەتەمیشـەوە هاوڕێ لەگەڵ کاک کەریم و سـیامەندا بە دڵێکی پڕ لە ژان و بیرێکی ئاڵۆز و پڕ لە بریا و خۆزیا، بە سەدان بیرەوەریی خـۆش و ناخۆش و یادگارییەکانی ئەم چەند سـاڵەم لە ناوچەکە وەک شـریتێکی نەپسـاوە بـەدوای خۆمـدا بەجێ دەهێشـت. بە هـەوراز و نشێوەکانی پڕ لە بەفر و قوڕی بەهاری و گرفەی ڕووباری تینووشکاو ڕێگـەی دووروودرێژی کوێسـتانەکانی موکریانمان دەبـڕی، بە هیوای گەرمێن و گەیشـتن بە بسـتۆڵکەی سـنوور. هەر لـە موکریان بووین تووشــی نەبی زەندی و مامۆسـتا حوسـێن هاتین. نەبی بۆ مەودایەک بوو بە هاوسـەفەرمان و مامۆسـتا حوسـێن هەتا ئالان لێمان هەڵنەبڕا

و بوو بە هاوسەفەر و یاریدەدەرێکی شارەزا و دڵسۆز. بە کارامەیی و خاکیبوون و قسە خۆشەکانی، هەنگاوە بێهێز و دڵە غەمبارەکانی لێ دەکردین بە تاقەت و خۆشی و ئەگەر ئەو نەبایە هەرگیز هەوراز بەدوای هەورازمان بۆ نەدەبڕدرا و ڕەچەمان پێ نەدەشکێندرا!

### شەهید کەمال وەلیانی

ئێوارەیەکی درەنگ لە ناوچەی سەردەشت گەیشتینە سیسێر و لە ماڵی مینە شەمی شەهیدی شۆڕشەکەی ٤٦-٤٧ (پێشمەرگەی کاک سولەیمان موعینی) کە کاک برایمی کوڕی مینە شەمیش هەر پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو، لامان دا و یەک دوو شەو ماینەوە، زۆرمان ڕێز لێ گیرا و بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی میوانداریمان لێ کردین. لە سیسێر نامەیەکی شەهید کەمال وەلیانیم پێ گەیشت، وەڕەز و بێتاقەت لە سۆمابرادۆست و شکاکان گەڕابووەوە بۆ لای موکریان و لە مەقەڕەکانی ئاشی گولان و خانەقا گیرسابووەوە و باسی لە سەرگەردانی و بێهیوایی خۆی بۆ کردبووم. بیستبووی ئێمە وەتەمیشمان جێ هێشتووە و بەرەو ئالان ڕۆیشتووین. هەزار خۆزگە و ئاواتم خواست پێش وەڕێکەوتنمان هاتباوە و دیبام و حەولمان دابا هاتبا لەگەڵماندا، من دەمزانی کەمال بڕوای بە هیچ نەماوە و وەک ئێمە لە ڕێبازی کۆمەڵە دڵسارد بووەتەوە و زۆر دەترسام لە هەستکردنی بە داخرانی شەشخانی ئومێدی، خۆی تووشی کارەساتێکی جەرگبڕ بکات. هەر واشی لێ هات، لە ئاخری بەهاردا، لە شەڕێکی بێئامان و دەستەویەخەدا، لە باخەکانی ئاجیکەند، کۆمەڵە تووشی شەڕێکی قورسی جاش و پاسدار دەبێت و کەمال خۆی پێ ناگیرێت و خۆی داوێتە گەرمە تەنووری شەڕەکەوە، زۆر بەداخەوە پاڵەوانانە لە بیستی جۆزەردانی ١٣٦٢ (١٩٨٣-٦-١٠)دا شەهید دەبێت.

وەڵامی نامەکەی کەمالم داوە و بە پێشمەرگەکانی کۆمەڵەی سەردەشتدا ناردم، نازانم گەیشت یان نا، باسی ئەو ماوەیەی خۆمانم

بۆ کرد و لە بڕیارەکانی دابوومان بۆ دەربازبوون و ڕۆیشتن ئاگادارم کردبــووەوە، داوام لــێ کردبــوو بــە زوویی ئێمــە بەرەو ئــالان دەچین، ئەویــش خۆی بگەیەنێتە ئێمــە و هەرچی کردمان بەیەکــەوە دەیکەین، تەنانــەت ئەگەر گەڕانــەوەش بێت بۆ ناو کۆمەڵە، بــا هەموو بەیەکەوە بین! بەداخەوە ئێمە هەر ســێ لە ئالان بووین، خەبەری شــەهیدبوونی گەیشت.

## عەلی خۆت خوار مەکەوە

وەڕێ کەوتین بەرەو ڕەبەت و ئەوبەری قوڵتێ، لە تاقگەی شەڵماش تێــر حەســاینەوە و هەوای ئەو سروشــتە جوانەی کوردســتانمان، بە شنەی شەماڵی بەهارێکی تەڕ و دڵڕفێنی کوردەواری، پڕ بە سییەکانمان هەڵمژی. لە نزیک ڕەزگە ڕووبارەکە پڕ بە چەمەکە دەهاتە خوار، مامۆستا حوســێن خۆی لێ هەڵکرد و گوتی، عەلی خۆت مەکەوە دەتپەڕێنمەوە، کاک کەریــم و ســیامەند چوونە ئەوبــەر، من چوومە کۆڵی مامۆســتا حوســێن، لە ناوەڕاســتی ئاوەکە هاواری کرد، لەبــەر هاژە و لوورەی ئــاو گوێــم لێ نەدەبــوو، کاک کەریم و ســیامەندیش لەوبــەرەوە هەر هاواریان دەکرد: عەلی، عەلی! خۆت خوار مەکەوە، هەر ئەوەندەم زانی بە خۆمەوە، مامۆســتا حوسێنیشم خستە ناو ڕووبارەکە. تفەنگەکەم لێ بەربووەوە ناو ئاوەکە، وەک شێتان چوومە بن ئاوەکە و تفەنگم دیتەوە، هەمــوو گیانم لە ئاودا بوو، ســاردیی بەفــراوی ڕووبارەکەی ڕەزگە لە سەرە بەهاردا وەسف ناکرێت و بەڕاستی کەللەتەزێن بوو، هاتمە قەراغ ئاوەکە، وەک شــەختە[1] لێدراوێک هەڵدەلەرزیم. لۆمەی هاوڕێیانم لەولا بوەستێت، فشەپێکردن و پێکەنین، هەر ئەوەندە بوو ڕۆحم دەرنەدەچوو، تفەنگەکەم ڕزگار کردبوو، بەس بە گوێی کاک کەریمدا سریواندم و پێم گوت، پاسپۆرتەکەم لە گیرفانمدا تەڕ بووە، کاک کەریم پێکەنین لەسەر دەمــی بزر بوو، زۆری پێ ناخۆش بــوو. ناو دێ زۆر دوور نەبوو، بە

١- شەختە، قەیسەربردوو، سەرمابردوو، سەرماوسۆڵە لێدان.

هەڵڵەرزین و تەڕی خۆمان گەیاندە یەکەم ماڵ لەناو ڕەزگە، دەسبەجێ زۆپایـان هەڵکـرد و چای گەرم و نـان و پەنیرێکـی زۆر خۆش هاتنە سەر سـفرە، کوڕەکان دەستیان کرد بە وشـککردنەوەی جلەکانمان و وەسـتا حوسێن تفەنگەکەمی وشـک و خاوێن کردەوە. پاسپۆرت لەناو نایلۆنێکـدا بوو، نەدەبوو وەدیاری خەم. مامۆسـتا حوسـێن نەیدەزانی بەرنامـەی چوونـی دەرەوەمان هەیە و لێمان شـاردبووەوە، نیگەرانی بـە هەر سـێکمانەوە دیـار بوو، هەتا ئێـوارە هەر لەو ماڵـە بووین، لە فورسەتێکی چوونی سەر ئاوی مامۆستا حوسێن، کاک کەریم پڕی دایە گیرفانـم و چاوی لێ کرد، ئاو تەڕی کردبـوو، ئەوەندەی تر عەیبداری کردبـوو، گوتی گوێ مـەدەرێ لە بێژوێ خەڵکی پەیـدا دەکەین بۆمان خاوێن بکاتەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی گەیشـتینە جەمسـەری شـوێنی تێکەڵاوبوونی دوو ڕووبارەکەی زێی بچووک، کە بە دووئاوان ناسراوە. چۆمی کەڵوێ بە بسـتێک بەرینی، ئالانی ئەمدیو و ئەودیـو، یان ئێران و عێراق لێک جیا دەکاتەوە. بە هەورازی سـەر چۆمیدا هەڵگەڕاین و لە گروێس لامان دا. نێوان گروێس و بێژوێ لەپێشدا تەختایی و دیسان هەورازمان بڕی. بە تووڵەڕێی ئێستر و وڵاغاندا هاتینە بەر مزگەوتی بێژوێ.

یەکـەم شـت هاتە پێش چاو، دوکانەکان و بۆنـی کەباب و چایخانە بـوو. نـاو دێ زۆر قەرەباڵغتـر بوو لەو کاتەی پێشـتر لەوێ بووم. پڕ لـە پێشـمەرگە و مەقەڕات بوو. مامۆسـتا شـێخ عێزەدیـن بە خۆی و مـاڵ و منداڵ و دەفتەرەکەی لەوێ بـوون، دێموکرات، کۆمەڵە، حیزبی ڕەنجبەران و زۆر پێشـمەرگەی دانیشـتوو لە دێموکـرات و کۆمەڵە لە ئالان و بە تایبەت بێژوێ بوون.

### خانە لە درەی شەهید بوو

ڕوومـان کردە ماڵی کاک محەمەدی مەلا عەلی، لە خۆشـیی بینینی سیامەند وەک تاقە کوڕی شەهید سولەیمان، بە خۆی و ماڵ و منداڵەکانی،

زۆر بە گەرمی پێشـــوازییان لێ کردین. خۆی بە دۆســتی باب و مامە عــەوڵای ســیامەند دەزانی و داخــی دەخوارد کە مامە ســەعیدی، واتا خانەی موعینی بۆ بە لای ویدا نەهاتووە تا ڕەوانەی لای سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشــتمانی کردبا و تووشــی ئەم چارەنووســە نەبا و شــەهید نەکرابا. ســەرکردەکانی کۆمەڵە، وەک دوکتۆر جەعفەر شەفیعی و کاک ساعد وەتەندوست ساڵی ١٩٧٨ بە لای کاک محەمەددا چووبوون و بە یارمەتیی ئەو بە ســەلامەتی گەیشتبوونە قەندیل بۆ لای یەکێتی. مخابن کاک سەعید موعینی بە بانەدا ڕۆیشتبوو و لە ڕێدا بە دەستی جەیش و جاشــی سەدام لەگەڵ ئەحمەد فەتحوڵڵای فەرماندەی یەکێتی لە گوندی دڕەی ناوچەی ماوەت، شەهید کرابوو.

### کوردی خوا غەزەب لێگرتوو

دوای حەســانەوە و هاتنــەدەر بــۆ ناو دێ و سەروسوراغکێشــان، تووشــی کۆمەڵێک لە هاوڕێیان بووین، کــە وازیان لە کۆمەڵە هێنابوو، سولەیمان خودایار، کەمال شەریفزادە، جەمال سەیدی، سولەیمان لالە، مەجیــد عەجــەم، پەرویز تاهیری، یونــس نانــەوا و زۆری دی، یان لە دەفتەری مامۆستا بوون، یان ژووریان بە کرێ گرتبوو و سەرگەردان و بێبەرنامە بوون. یونس خەریکی هاوســەرگیری بوو لەگەڵ سەیرانی کچــی مامۆســتا و ســولەیمان لالــەش لەگــەڵ مریــم ســەرهەنگیدا. پیرەپیاوەکانی ســازمانی ئینقلابی حیزبی تودە (ڕەنجبەران) وەک عەلی ســادقی و ئیرەج کەشــکولی و موحســین ڕزوانی و نیعمەت قەشــقایی و یــەک دوویەکی دی لە ســەرووی دێ ژووریکیــان هەبوو، زۆر جار بــۆ وەڕەزی و چاخواردنــەوە دەچوویــن بــۆ لایان و بــە گاڵتەوە پێم دەگوتن، ئێمە کوردین خوا غەزەبی لێ گرتووین، ئێوە چی دەکەن و بەم مەینەتییە دەژین؟! زۆربەیان دوکتۆر و شەهادەی زۆر بەرزیان هەبوو!

**خەرەفاو**

کوڕێــک هەبــوو فــارس بوو، نــاوی مەجید بــوو، لە زەمانی شــادا هاوڕێــی زیندانیی کاک فوئاد بووبوو، لە دەســتپێکی شۆڕشــدا هاتبوو بۆ کوردســتان و پێشــمەرگە بوو لەناو کۆمەڵەدا. لە بێژوێ دیتمەوە لە لای هاوڕێیانی ڕەنجبەران خســتبووی و دەیگوت ئیختلافی ئایدیۆلۆجیم لەگەڵ کۆمەڵەدا هەیە و جیابووومەوە. شەو و ڕۆژ ماندوو نەدەبوو، یەک پشــوو بەحس و دەمەتەقەی دەکرد لەســەر قۆناغی شۆڕش، ماهییەتی شۆڕش، کۆمۆنیستی، سۆشیالیست، دیموکراتیک و ئەم بابەتگەلە. منیش وشەی «خەرەفاو»ی کوردیم بۆ فارساندبوو، پێم دەگوت، ڕەفیق مەجید تــۆ «خەرفیدەیی». ڕۆژێک چووبوو لە یونســی پرســیبوو «خەرفیدە» چییــە «ڕەفیق عەلی» زوو زوو پێــم دەڵێت؟! یونس بە پێکەنینەوە بۆی ڕاڤــە کردبــوو؛ واتا تێکچــووی! بەیانییەک لە ئاودەســتخانەی مزگەوت دەموچاومان دەشــۆری، هات و گوتی «ڕەفیق بە خدا راســت میگی من خەرفیدەام» واتا بەخوا ڕاست دەکەیت من خەرەفاوم!

کۆمەڵــە بــەدوای کاک کەریمیــدا نارد و پێی گوتبــوو بە حورمەتی ناســراوی و خەبات و نەخۆشــیی گەدەی، ئامادەن بــە بەغدادا بینێرن بۆ ئەورووپا، ئەویش گوتبووی ئێمە ســێ کەســین و لێک جیا نابینەوە، گوتبوویــان ئێمــە تەنیا بۆ تۆ دەتوانین و بــەس. کاک کەریم گەڕاوە و گفتوگۆکــەی بۆ باس کردین، لەگەڵ ســیامەنددا پێمــان داگرت، نەخێر دەبێــت قبووڵــی بکات و فورســەتەکە لەدەســت نــەدا. ئێمە یــان لێرە کارێــک دەکەین، یان دەگەڕێینەوە لای کوڕەکان لە وەتەمیش و لەوێوە بەیەکــەوە دەڕۆین. بە فشــار و ســوێند کاک کەریمان ڕازی کرد ئەو بڕوات و ئەم هەلەی کۆمەڵە بۆی ڕەخساندووە لەدەستی خۆی نەدات. بە سەرنجدان بەوەی ئەو لە ئێمە بەتەمەنتر و خاوەن ژن و چوار منداڵە و تەندروستیی باش نییە، ڕازی بوو بچێتە مەقەڕی کۆمەڵە لە سلێمانی و چاوەڕێ بێت تا بەڕێی دەکەن. ماڵئاواییەکی گەرممان لێ کرد و دوای ماوەیەک گەیشتبووە سوید.

**ئیدی شاری سلێمانی**

بیرمان لێ کردەوە لەگەڵ سیامەنددا بچین بۆ سلێمانی و دۆستانی مامۆستا زەبیحی و ئیمکانات لە بەغدا تاقی بکەینەوە. بە یارمەتیی یونس کە بووبوو بە زاوای مامۆستا و کاک ئەحمەد ئەسکەندەری وەرەقەیەکی «عەدەم تەعەرووز»ی دە ڕۆژەی دەفتەری مامۆستایان پێ داین. بە کەڵەس لە ڕووباری کەڵوێ پەڕیینەوە و بە هۆی شارەزایی پێشترم خۆمان گەیاندە ماوەت و دواتر بە سەیارەی نەفەرات بۆ سلێمانی. بە هۆی نەبوونی پارە و گیرفانبەتاڵی هۆتێلێکمان لە جادەی کاوە، هۆتێل بەغدا، لە هەرە هەرزانەکان گرت. چەند تەلەفۆنی کۆنی دۆستانی زەبیحیم پێ بوو لە بەغدا، دەستم کرد بە پەیوەندی، هیچی لێ شین نەبوو، تەنانەت کە ناوی زەبیحیم دێنا یەکسەر تەلەفۆنەکەیان دادەخست و زۆر دەترسان. چەند جارێک هاتوچۆی ماڵی مەلا ساڵحی نەغەدەمان کرد لە سلێمانی، پەنابەرییان بە ماڵ و منداڵەوە پێ دابوون. یەک دوو کوڕی خەریکی کار و کاسبی بوون و تەنانەت وەکالەتی ئاردیان دابوو بە جەمالی کوڕی و محەلێکی گەورەی ئاردی هەبوو لە لای گەڕەکی ڕزگاری. مەلا ساڵە بە دیتنی من و سیامەند خۆشحاڵ بوو، بە گەرمی لەگەڵ هاوسەرە میهرەبان و زۆر بەلوتفەکەی بەخێرهاتنیان کردین. ڕۆژێکیان کە هەر بۆ سەردان چووبووین، لە دیوەخانەکە پیاوێکی باڵابەرزی جامانەبەسەری لێ بوو، مامۆستا مەلا ساڵە ئێمەی پێ ناساند و سیامەند کوڕی کاک سولەیمان و عەلی خوشکەزای مامۆستا زەبیحی و... میوانەکە کاک «محەمەدی پاقلاوە» بە بیستنی ناوی زەبیحی و موعینی یەکسەر هەستا سەرپێ و باوەشی پێدا کردین، باسی ئەوەی کرد لە جەلالییە کۆنەکانی سەردەمی بەکرەجۆ و سەرای سوبحاناغا و پێشمەرگەی کۆن و سابەقی مامۆستا زەبیحی بووە. زۆری باسی کاک سولەیمان و هاوڕێیانیان لە بەکرەجۆ لە سەردەمی جەلالیدا بۆ کردین. وەک کەسێکی خزم و نزیک لە ئێمە خۆی وێنا

کرد و ئامادەیی خۆی بۆ هەر چەشـنە خزمەت و هاوکارییەک نیشـان دا. ئەدرەس و تەلەفۆنی خۆی پێ داین. چەند ڕۆژ دواتر بە سـەیارەی خۆی بە قاچاخ و بێ ناسنامە و بەڵگە، منی برد بۆ بەغدا. باسی حاجی محەمەدی ڕەشـادیم بۆ کرد، خەڵکی سـابڵاغ و لە بەغدا نیشـتەجێیە، ئاڵتوونچییە و لە زەبیحی نزیک بووە، یەکسەر گوتی دەیناسم و ڕاست وایە، ئێسـتاش لە بازاڕی ئاڵتوونچییەکانی بەغدا دوکانی هەیە، دەتبەم بۆ لای. مەبەسـتم بوو زیاتر بپرسـم لە چارەنووسـی زەبیحی و بزانم چۆن تێدا چووە؟!

### زەبیحی ناناسم

گەیشـتینە بەغـدا و چوویـن بۆ ناو بـازاڕ، من هەر تەقەی سـەرم دەهـات، یەکـەم جارم بوو بەغـدا ببینم. کاک محەمەد زۆر شـارەزا و زۆری ئاگا لە من بوو. گەیشـتینە بـەردەم زێڕنگەرێک و کاک محەمەد گوتـی ئەوە خۆیەتی. وەژوورکەوتین و سـڵاومان کـرد، بە کوردی و فەرمووی لێ کردین. گوتم جەنابتان حاجی محەمەدی ڕەشادین؟ بەڵێ فەرمـوو! کاک حاجـی من ناوم عەلی کەریمییە، خوشـکەزای زەبیحیم! ئیتـر هەر ئەوەندم گوت، ڕەنگی بزر بوو: چیت دەوێ کاکە؟! نایناسـم! پارەیەکی زۆرم لە سـەری تێدا چوو و... لەم قسـانە بە لەرز و پسـکە فسـک و زمانتێکهـاڵاوی، بـە کـوردی دەری کردین لـە دوکانەکەی و مەگەڕێنەوە، سـەرم بە فەتەرات مەدەن و ئەم قسـانە، لە کوێوە پەیدا بـووی و خاڵـت ئاڵتوونی لە لایە و پارەی نەداوە و... هەر باش بوو، بۆ ڕیش چووبووین، خەریک بوو سمێڵیشی بخەینە بانی!

### مەلا ماتۆڕ

لە بیرم نییە لە چێشتخانە بووین، یان لای دۆستێکی کاک محەمەد، ئیسـتراحەتمان کرد و گوتم کاک محەمەد خۆ هەر هاتووین، تەلەفۆنی مـەلا ماتـۆڕم هەر لە کۆنەوە کە زەبیحی لە سـابڵاغ بوو لە ١٩٧٩دا لا

ماوه، دەڵێی چی تەلەفۆنێکی بۆ بکەین، بەڵکو وەڵام بداتەوە. گوتی زۆر باشە و تەلەفۆنەکەی هێنا پێش خۆی و ژمارەکەی لێ دا:

- ئەلۆ ئەلۆ...
- مامۆستا عەبدوڵڵایە؟!
- نەخێر لە ماڵ نییە! (وا بزانم گوتی خزم، یان سکرتێری مامۆستایە).
- کاری بەپەلەمان پێیەتی کەی بۆی بکەینەوە؟!
- پێم بڵێ با ئاگاداری بکەمەوە!
- خۆمان تەلەفۆن دەکەینەوە.

ســاڵی ١٩٧٩ کــە زەبیحی هاتەوە لە ســابلاغ، زۆر جار لە بەغداوە تەلەفۆنیــان بــۆ دەکرد، یەک لەوانــە مەلا ماتۆڕ (عەبدوڵڵا ئیســماعیل) فەرماندەی کۆنی شۆڕشــی ئەیلــوول و دواتر وەزیری دەوڵەت بوو لە زەمانــی جەلالییەکانــدا. هەموو جارێک کە زەنگی لــێ دەدا و من هەڵم دەگــرت، زۆری قســە لەگەڵدا دەکردم و دەیگــوت تۆ دەبێت عەلی بیت. مامۆســتا زەبیحی زۆری بۆ باس کــردووم. هەر بە تەلەفۆن، تەواو بە یەک ئاشــنا بووبووین و دەیگوت جارێک دەبێت کە مامۆستا گەڕایەوە بێــی و میوانی ئێمە بیت. هەر لەســەر ئەو هەوایــە منیش بە تێڕادیوی دەمگوت بە کوڕەکان بگەینە لای مەلا ماتۆڕ، وەزیرە و هەموو شتێکمان بــۆ دەکات، یانــی ئومێدێکــی زۆرم دابــوو بــە خۆمان، کــە یارمەتیی گەورەمان دەکات بۆ دەربازبوون.

ئــەو جار کــە تەلەفۆنم کردەوە، خۆی بوو، یەکســەر ناســیمەوە و ئەویــش منــی ناســییەوە. بــە هەولێرییەکی خــۆش تێیگەیاندم باشــم نەکردووە هەر وا بە سانایی تەلەفۆنم بۆ کردووە، بە کورتی تێیگەیاندم ئیتر کاری وا نەکەم و شەبقە زۆر توندە و ئەو هیچی لەدەست نایەت، خۆی لەژێر گوشــار و چاودێریدا دەژی. بە نائومێدی و بێهیوابوون لە دۆســتانی خاڵم، لەگەڵ کاک محەمەددا بە سواری جێبەکەی گەڕاینەوە سلێمانی.

لە هۆتێل بەغدا دەفتەردارێکی لێ بوو، ناوی کاک ڕەحیم بوو، لەگەڵ

ئێمەدا زۆر بەڕەحم و لوتف بوو، نەیدەزانی چ کارەین و بۆ لەوێین، زۆری پرسیار و جاروباریش بە نازونوزێک بیری دەخستینەوە ناکرێ هەر وا لەوێ بین و دەبێ ئیدارەی ئەمنی لێ ئاگادار بکاتەوە، دەنا بەرپرسیارێتی بۆ ئەو دەبێ. پارەیەکمان دەدایە و سەری لار دەکردەوە.

## ڕەشەی قاچاخچی

سیامەند گوتی، باوکم ڕەفیق و پێشمەرگەیەکی هەبوو، دەبێ ئێستا لەگەڵ ماڵ و منداڵیدا لە سلێمانی بن، ناوی ڕەشەی قاچاخچی بوو، بە منداڵی دیومە کە لەگەڵ باوکمدا لێرە بووین. بە یارمەتیی کاک محەمەد پاقلاوە و پرسیاران ئەدرەسی ماڵەکەیمان دۆزییەوە و چووین. هەر کە سیامەندی بینی، بە خۆی و هەموو منداڵ و ژنەکەی هەر ئەوەندە بوو لەبەر پێی سیامەنددا نەدەتوانەوە. ئەوەی بۆیان کرا لە پێشوازی و میوانداری کردیان، لەگەڵ ئەوەی ئەم جۆرە پیاوانە هەمیشە مەترسی و چاودێرییان لەسەر بوو، لەگەڵ ئەوەی کوڕە گەورەکەی برایم لای مولازم عومەر لە یەکێتیی نیشتمانی پێشمەرگە بوو، خۆی «کۆنە ئێرانی» و پێشمەرگە بوو، بەڵام زۆر ئازا و نەترس بوو. کاکە ڕەشە وەک ئەوەی ونبوویەکی خۆی دۆزیبێتەوە، لە خۆشیان هیچ نەما نەیکات!

ئیتر هەموو ئێواران بەدواماندا دەهات و یەکسەر لەبەر هەیوانی ماڵەوە بەزمی سفرە و عەرەقخواردنەوەی بڵاو دەکردەوە و بە زۆر دەیگوت دەبێ بخۆنەوە. بەزمی ئەو، هەموو ئێواران بوو، سیامەند، کە دەیگوت ئێمە ناتوانین بخۆینەوە، زۆر دڵی دێشا. ئەوەندەی حورمەت گرتبووین، ئێواران خۆمان لێ دەشاردەوە.

ئەوجار هەر بە هۆی کاک محەمەد و جەمالی مەلا ساڵە سۆراغی کاک محەمەدی شاپەسەندم کرد، بیستبووم لە سلێمانی دادەنیشێت و ژن و منداڵی هەیە و خەریکی خەیاتین. دۆزیمەوە و لە دوکانەکەی کاک محەمەد پاقلاوە لەگەڵیدا دانیشتم، زۆر دەترسا و زۆری گلەیی هەبوو،

باســی پاشــماوەی قامووسم کرد و خۆی لێ لادا و گوتی لای ئەو هیچ دەســت ناکەوێت، هەر ئاخ و حەیف و ئەســەفی هەڵدەکێشا و دەیگوت، زەبیحی لە من مردووە!

## خاڵێکی تریشم هەیە

ڕۆژێکی لای قاوەڵتون لە دوکانی کاک محەمەدی پاقلاوە لە فولکەی ســابوونکەران دانیشــبووم، گوتــم دەزانــی کاک محەمەد مــن جگە لە زەبیحی، خاڵێکی تریشــم هەیە، خاڵە عەبدوڵڵا، هەر لە زووەوە هاتووە بــۆ ئەمدیــو و هەرگیز نەگەڕاوەتەوە، خۆی لە دایک و برا و خوشــکان ون کردووە و چل ساڵە کەس سۆراغی نازانێت؟! گوتی با، من دەیناسم، ســاڵی ٦٨-١٩٦٩ لەگەڵ مامۆســتا زەبیحی ئێوارەدرەنگێک لە ســەرای ســوبحاناغا دەگەڕاینەوە لە سەردانی پێشمەرگە جەلالییەکان، مامۆستا گوتی: «برایەکم لەم تەپی ســەفا و ئەوانە هەیە، با بچین بزانین ماوە؟! کاتی خۆی ســەرەتای شۆڕشــی عەبدولکەریم کە لــە بەغدا مەقەڕمان بــوو، جارێــک هات بــۆ بەغدا و منــی دۆزییەوە، منیــش یارمەتیم دا و ناردمەوە بۆ شارەزوور». ئیتر بە درێژایی ئەو سی چل ساڵە، ئەم دوو برایە لە غوربەت ئەو یەک دوو جارە یەکتریان بینیوە، ئەمیان سەرقاڵی سیاســەت و نووســین، ئەوی دی لە خزمەتی شــێخانی نەقشبەندی و فەلاحەت و ماڵ و منداڵدا بووە. دوو برا و دوو ڕێباز و دوو کەسایەتیی تەواو جیاواز!

کاک محەمەد خۆی جووڵاند و تەلەفۆنەکەی هێنا پێش خۆی و چەند جار چەند ژمارەی گرت، لەپڕ:

ها مامۆستا گوڵالە چۆنی؟ ئەڕێ کاتی خۆی تۆ لە کام گوند مامۆستا بوویت، عەبەسووری لێ بوو؟!

قســەکەیان تەواو کرد و بە بزەوە گوتی دۆزیمەوە! لە تەپەگوڵاوی دەژی و ئێستاش هەر لەوێن، بە «عەبەسوور» ناسراوە.

### بەرەو تەپەگوڵاوی

لــە دوکان هاتە دەر و هاواری کــرد؛ حاجی جەمال، حاجی جەمال! بەڕازیلییــەک لەوبەری فولکەکە هاتە بەردەم دوکانەکە و دابەزی، کاک محەمــەد چــوو بۆ لای، گوتــی ئەم کوڕەم بــۆ بەرە بــۆ تەپەگولاوی. دیــار بوو حاجیی ســایەق تاکســی، خۆی خەڵکی هەڵەبجــە بوو. گوتی بــا بڕۆیــن. بەم قەد و شــکڵ و ڕوخســارەوە، لــە دوورەوە دیار بوو خەڵکی ئەودیوم، جووتێک عەینەک، کلێتەیەک لە ســەر، قەمســەڵەیەکی ئەمریکی و ڕانکوچۆغە لە بەر. لە پێشەوە سوار بووم، دوای یەک دوو سەعات لە سەرجادە قیرەکە نەگەیشتوو بە سیروان ڕایگرت و دەستی ڕاداشــت بۆ لای ڕاستی جادە و گوتی، ئەها ئەم دێیە تەپەگولاوییە. من دەگرێمەوە و خۆت بە پێیان بچووە. هەر چوارســەد پێنجسەد مەترێک دوور بوو لە جادەکە. لای نیوەڕۆ بوو ســەرم داخســت و هاتم بەرەو گوندەکە، کۆمەڵێک پیاو لە بەرهەتاو دانیشــتبوون، ســڵاوم کرد و زۆر بە گەرمی وەڵامیان دامەوە؛

- ماڵی عەبەسوور لێرەیە؟!

- بەڵێ فەرموو کاکە!

- نەوەڵا گەر یارمەتی بدەن و نیشانم بدەن.

- دادەی کوڕە هەســتە بچووە بیبە بۆ ماڵی کاکە عەبە، ئەمڕۆ نۆبە گاوانێتی، هەها لەم دەشتە لەگەڵ وڵاغەکانە!

- جا کە وایە کەسم ناوێ خۆم دەچم بۆ لای!

- ســەرم داخســت و بەرەو گاڕانەکە، بۆ دەرەوەی دێ چووم، لێی نزیک بوومەوە و پشتی لە من بوو، هیچ هەستی پێ نەکرد. پیرەپیاوێک چەناگەی خســتبووە ســەر گۆچانەکــەی و گاڕانیش بــڵاوەی کردبوو دەلەوەڕین. لە پشتەوەڕا دەستم لە شانی دا، ڕاچڵەکی و ئاوڕی دایەوە، سڵاوم کرد.

- عەلێکمە سەلام، ئەتۆ کێی؟

- کێ بم باشە؟!

- نازانم!
- خەڵکی سابلاغم!
چاوی زیت بوو!
- ئەگەر کوڕی ڕەعنا و هاجەر نەبیت، نازانم!
- من عەلی کوڕی ڕەعنای خوشکتم!
گۆچانەکەی بەردایەوە، دانیشت و دەستی بە ئەژنۆیانەوە گرت. پرم دایە و لە باوەشم گرت، تێر گریا و لەسەر شێوەردەکە بۆی دانیشتین، هەر لەو پرسیار و لە من وەڵام، چەند ساتێک تێپەڕی و دمەتەقەمان گەرم بوو، لە دوورەوە منداڵێک پەیدا بوو.
ئەوە جەمالە، وەرە دانیشە جەمال ئەوە عەلی کوڕی پوورێتە. ماچم کرد و دانیشت، کەمێکی پێ چوو منداڵێکی دیکە بە غاردان لەناو ماڵانەوە هات، ها! جەلال وەرە ئەوە عەلی کوڕی پوورێتە هاتووە! ئەویشم ماچ کرد و دانیشت، کەمێکی تر کەمال هات و هەر بەم چەشنە. گوتی، هەستە با بڕۆین بەخوا تەلەێی خاڵۆژنت ئێستا تا لێی حاڵی دەبێ تۆ کێی، هەموو گوندەکەمان وەسەردەگێڕێت. تومەز دوای من، کە لەناو دێ پرسیبووم، یەکیان چووبوو بە خاڵۆژنمی گوتبوو کەسێک هاتووە لە کاکە عەبەی پرسیوە، هیچ لە خەڵکی ئێرە ناکات و شێوە و ڕوخساری لە کاکە عەبە دەچوو! ئیتر خاڵۆژن ئۆقرەی نامێنێت و یەکبەدواییەکدا کوڕەکانی دەنارد بزانن من کێم. هەرچی دەهات نەدەگەڕاوە و ئەو لەناو دێ زۆرتر نیگەران بووبوو!

### عەبەسوور خزمی بۆ پەیدا بوو

خاڵم گاڕانی بەڕەڵا کرد و لەگەڵ سێ لە کوڕەکانیدا چووینەوە بۆ ناو دێ. لە دوورەوە هاواری کرد وەرە تەلێ کوڕی ڕەعنای خوشکم هاتووە. بە باوەشان بەخێرهاتن کرام. بۆ چاو و دڵ ڕوونی لە خاڵم و منداڵەکانی خەڵکی ئاوایی وەسەرمان گەڕان. ئەوە یەکەم جار بوو لەم دێیە، عەبەسوور خزمێکی بۆ پەیدا بێت!

ماڵێکــی فەقیرانــە و فەلاییانەی زۆر خــۆش و پاکوخاوێن، مەزرا و تراکتۆر و بیری ئاو. پیاوێکی بێدەنگ و مرادخانی و مشکی و هەتا بڵێی مەتین و لەســەرخۆ. شــەش کوڕی هەبوو، کوڕە گەورەکەی عوسمان، لە ماڵ نەبوو، لە موسڵ خوێندکار بوو، تاقە کچێکی هەبوو تازە شووی کردبوو، ماڵیان لە هەڵەبجە بوو، کچێکیشی بە منداڵی هەر لەم دێیە ون بووبــوو، یان دەیانگوت بەحر بردوویەتی، یانیش قەرەجی لەوێ بوون و دزیویانە. دوو ڕۆژ مامەوە، شــێخ خالید نەقشــبەندی کە بیستبووی، هــات و بەخێرهاتنی کــردم. ڕۆژی دواتر بەیەکەوە چووین بۆ هەڵەبجە و حەمیدەی کچی و عوسمانی هاوسەریمان دیت.

ڕۆژی دواتر، خاڵە عەبدوڵڵا لەگەڵمدا هاتە سەر جادەکە، بیستوپێنج دینارێکی دامێ، کە ئەوکات زۆر بوو. تاکسییەکی بۆ ڕاگرتم و گەڕامەوە ســلێمانی. تەواو بە دیتنیان شــاد بووم و خۆزیام دەخواســت توانیبام زوو بە دایکم بڵێم، براکەیم دۆزیوەتەوە!

**عەلی ئەم پەلەیەت لە چییە؟**

چەند ڕۆژێک بە مات و مەلوولی و بێکار لە سلێمانی و لەناو هۆتێلدا خۆمــان دەخافڵاند. زۆر جار دەهاتین بۆ ســەرجادە، مــن عادەتم بوو خێرا دەڕۆیشــتم و ســیامەند لە دواوە جێ دەما، دەســتی بە جنێودان دەکرد و دەیگوت، باشە عەلی ئەم پەلەیەت لە چییە، ئێمە هاتووین کات بەرینە ســەر و پیاســە دەکەین، بۆ وا توند دەڕۆی؟ ئەوە کوا بەیەکەوە ڕۆیشــتنە؟! تۆ هەمیشە دە هەنگاو لە پێش من دەڕۆی! کەمێک هێواشم دەکردەوە و دیســان بە خــۆم نەدەزانی و ئاوڕم دەداوە، ســیامەند دە دوکان لــە دواوە دەهات. چەند جار لێمان بوو بە شــەڕ و هەر کەســە بۆخۆی دەچووینەوە هۆتێل. سیامەند شکایەتی دەکرد و دەیگوت بەس پێم بڵێ؛ بۆ پەلەتە؟! کارمان چییە و کێ چاوەڕوانمانە؟! ئەوەندە وەڕەز و بێهیــوا بوویــن، لێک لە بیانــوو بووین و خۆش خۆش وردەشــەڕ و ئاشتبوونەوەمان هەبوو.

ڕەحیم بابەتاهیری هاتبوو بۆ بێژوێ و توبای خوشکی حەمەسووری مـارە کردبوو، ئەویش بەتەمای دەرچوون بوو لە کوردسـتان. جوابی بۆ ناردین شـیلانی حەسـەنپووری کچی مامی لە مەقـەڕی کۆمەڵە لە سلێمانییە، بەڵکو بچین یارمەتیی بدەین بچێت بۆ بەغدا بۆ ماڵی پووری، کە هاوسەری شێخ محەمەد مەعسووم بوو. کۆمەڵە نەیدەبرد بۆ بەغدا و «عەدەم تەعەڕوزی» بۆ وەرنەدەگرت. شیلان لە سەردەمی شۆڕش و ڕووخانـی شـا، لە ئەمریکاوە گەڕابووەوە و ڕێگـەی تارانی نەمابوو بـۆ چوونەوەی ئەمریـکا. هاتوچۆی کۆمەڵە و دیموکـرات و مەقەڕاتی پێشمەرگەی دەکرد. هاتبوو هەتاکو کۆمەڵە بەڕێی بکات بۆ ماڵی پووری لە بەغـدا، بەڵکو ئەوان ڕەوانەی ئەمریکای بکەنەوە. لەگەڵ سـیامەنددا جوابمان بۆ نارد بێتە بەر دەرگای مەقەڕی کۆمەڵە لە ڕزگاری. چووین بەبێ ئەوەی کەس بزانێت سواری تاکسیمان کرد و بردمانە ماڵی شێخ موحسـینی خزمیان و تەسـلیمی ئەوانمان کرد. ئەوانیش بردبوویان بۆ ماڵی شـێخ محەمەد مەعسوم لە بەغدا، دواتر دەوڵەتی عێراق بە فڕۆکە ناردبوویان بۆ سوید.

### دەبێ سلێمانی جێ بهێڵین

دوای دە دوازدە ڕۆژ، ئێوارەیەک جەمالی مەلا سـاڵە هات و گوتی ڕایانسـپاردووم، پێتان بڵێم تەنیا بیسـتوچوار سـەعاتتان هەیە و دەبێ سـلێمانی جـێ بێڵـن و بچنەوە بـۆ ئەودیو. زۆرمان پـێ ناخۆش بوو، تاکسیمان گرت و ڕۆیشتین بۆ ماوەت و لەوێشڕا بۆ بێژوێ.

بە هاتنەوەمان بۆ بێژوێ لە ڕێگەی هەباسـی برام لە بێسـیمخانەی کۆمەڵـە بـە ڕەمـز وەڵاممان بـۆ کوڕەکانـی وەتەمیش نـارد، کە لێرە «تێکۆشـین بەتەمـای جیـران ویشـکە» و ئـەوان بۆخۆیـان بڕۆن و مشووری خۆیان بخۆن، کاک کەریم دەرباز بووە.

لەگەڵ یونسـدا تەدبیرمان کرد، کە بووبوو بە خزمی مامۆستا شێخ عێزەدین، سیامەند بچێت بۆ لای مامۆستا و قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵکو

یارمەتیمـــان بـــدات و ئیجـــازەی ســـەفەرمان لە بەغداوە بـــۆ وەرگرێت. سیامەندی زۆر بە حورمەتەوە وەرگرتبوو، بە کورتی پێی گوتبوو تەنیا خۆت بەڕێ دەکەم و ئەوانی دیکەم بۆ ناکرێت. سیامەند گوتبووی بەڵام هیچ نەبێت عەلییش با بێت و من بە تەنیا ناڕۆم. مامۆستا و دەفتەرەکەی گوتبوویـــان تۆ تاقانـــەی قارەمانێکی کوردی و هەموو پێتان قەرزدارین و دەبـــێ بتپارێزیـــن، وەرە بـــڕۆ کارت بە خەڵکی دی نەبێت. ســـیامەند سوپاسی کردبوون و گوتبووی بەبێ عەلی ناڕۆم. ئەوەی بۆ گێڕامەوە یەکســـەر چـــووم بـــۆ لای دەفتەری مامۆســـتا و گوتم، ســـیامەند بەڕێ بکـــەن من هەر بەتەمـــای چوونەدەر نەبووم، بە زوویی دێن بەدوامدا و دەچمەوە ناو یەکێتی.

### سیامەند قیرسیچمەیە

سیامەند ڕەش و شین بووەوە و گوتی، بۆ درۆ دەکەیت؟ من بەبێ تۆ ناڕۆم. پێم گوت ئەوە هەڵکەوتووە و ئێمە تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بووین لە ســـێیان ئەوە دوومان ڕێگەی ڕۆیشـــتنی بۆ کراوە. بەڕاســـتی ســـیامەند من بەنیـــازی چوونی ناو یەکێتی لێـــرەم و بە زوویی بەجێت دێڵم. ســـیامەند هەتا خوا حەز بکات کەللەشەق و عیناد و قیرسیچمەیە. دەیگوت دەگەڕێینەوە بۆ موکریان، تا کوڕەکان نەڕۆیشتوون دەچین و لەگەڵ ئەواندا هەموو بەیەکەوە دەڕۆین بۆ تورکیا. منیش بە لادا کەوتم و گوتـــم، هـــەر بەیانی زوو دەڕۆم و بەجێت دێڵم، ئەتۆش کەیفی خۆتە! شـــێروڕێویی دنیام بۆ هێنایەوە، تۆ ناسراو و کوڕی بنەماڵەیەکی پڕ لە شـــەهیدی و دەتناســـن. ڕێگەی ورمێ بۆ تۆ نابێت و دەبێ بە سەلامەت دەرچیت. ســـیامەند ڕازی بوو مامۆســـتا بەڕێی بکات و بچێت بۆ بەغدا، لەوێشـــەوە بۆ لای کاک کەریم، کە ماوەیەک بوو بە هاوکاریی کۆمەڵە لە سوید گیرسابووەوە.

### کەریم ئەحمەد کەلەپچە کرابوو

فاروقـی بللـوری بە نەخۆشـی لـە مەقـەڕی کۆمەڵە لە سـلێمانی کەوتبـوو. جوابیان نارد، بەڵکو بۆ مەسـرەفی چوونـی ئەورووپای، لە برادەرانی یەکێتی، یارمەتیی ماڵی بۆ وەرگرم. لە بێژوێڕا بە پەلە چوومە ناوزەنـگ، ئـەو ڕۆژە گەیشـتم هێزێکی گەورە بە سەرپەرشـتیی کاک نەوشیروان دەڕۆیشتن بۆ شەڕی جود لە قڕناقە و پشتئاشان و شەڕی شـیوعییەکان. یـەک دوو ڕۆژ لـەوێ بووم، هەر لـە مەقەڕەکەی کاک نەوشـیروان. ئێوارەیەک پۆلێک پێشمەرگە چەند سەرکردەیەکی حیزبی شیوعییان بە دەستبەستراوی هێنا بۆ بارەگای مام جەلال. هەموو لێیان کۆوەبووین. کە مام جەلال دەستی کەریم ئەحمەدی بە بەستراوی بینی، گوڕاندی و جنێوی دا، بە پەلە خۆی دەستی کردەوە و لە باوەشی گرت و بردی بۆ ژوورەکەی خۆی و زۆری ڕێز لێ گرت!

### لەگەل دلێر سەید مەجیددا

دواتر مام جەلال و مولازم عومەر بە هەردووکیان سێسەد دیناریان (ئەوکات دینارێک زیاتر لە سێ دولار بوو) پێ دام بۆ فاروقی بنێرم، کە لە سلێمانی لەسەر سەفەر بوو. هاتمەوە و دەسبەجێ بە پەیکی کۆمەڵەدا و بە نامەی خۆمەوە پارەکەم بۆ فاروق نارد، ئەویش سەفەری کرد بۆ سوید، کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو بە نەخۆشیی خوێن دەتلایەوە.

دوای گەڕانـەوەم بـۆ بێژوێ، دەمزانی کاک دلێر سـەید مەجید، بە کاروانێکەوە دێن و لەوێڕا دەچن بۆ مەڵبەندی یەک لە شـارباژێر. خۆم ئامادە کرد، لەگەڵیاندا بچم بۆ لای ئەبوو شەهاب، بەرپرسی ڕێکخراوی سێی کۆمەڵەی ڕەنجدەران.

### لەگەڵ مەنسووری حیکمەتدا

یەک دوو ڕۆژم فرسـەت بوو، حیزبی کۆمۆنیسـت لە مێشـکەپەی نزیک بێتووش لە ئالان دروسـت کرابوو، هەموو سـەرکردایەتیی کۆن

و نوێی کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیست لەوێ مەقەڕیان بوو، هەباس لە بێسیم (موخابەرات)ی کۆمەڵە کاری دەکرد، ئەویش لەوێ بوو، ڕێگەی دوو بۆ سێ سەعات بە پێ و بە هەورازاندا چووم بۆ لای. هەموویانم دی و لەگەڵ مەنسووری حیکمەتدا ئاشنا بووم. قسە و گاڵتەی زۆرمان کرد و پێم گوت: ئەوە ئاوارەی دەستی تۆم. ئەوکات زۆر خۆمانی و میهرەبان بوو ، لەگەڵ هەموو پێشمەرگەکانی سەرکردایەتیدا خاکی و لە سەردلان بوو. کاک عەبدوڵلا و هەباسی برام زۆریان حەول دا بگەڕێمەوە و لە ناو کۆمەڵەدا درێژە بە خەبات بدەم. دیسان گوتم، با ئەو عەجەمانە برۆن و کۆمەڵە ببێتەوە ئیی خۆمان، ئێستا لە هیچەوە بوونە سەرکردایەتیی شۆڕشێکی وا گەورە و خاوەنی کۆمەڵە، بۆیە وا موخلیس و بۆمان دادەنوێنن، دوو ڕۆژی تر گەورەتر بن و قاچیان بێتە سەر عەرز، حسێبی پووشێکمان بۆ ناکەن و بێزیان نایەت بشماندوێنن! شەو لای هەباس مامەوە و بەیانی گەڕامەوە بێژوێ.

لە سەربانی مزگەوتی بێژوێ لەگەڵ سیامەنددا قسەمان دەکرد، گیرفانەکانمان لێک دان و دابەشمان کرد، سیامەند هەر دەیگوت با بەیەکەوە برۆینەوە بەرەو موکریان و کوڕەکان. دەمگوت بڕیاری خۆم داوە و هەر ئەمڕۆ یان سبەی دێن و دەڕۆم بۆ خوارووی ناوچەکانی ئەودیو.

سیامەند ڕۆیشت بۆ سلێمانی و دەفتەری مامۆستا، هەتاکو سەرەی دێت و دەیبەن بۆ بەغدا.

بەیانییەک لەبەر بەلۆعەکانی مزگەوت لە سەر کۆلکەدارێک دانیشتبووم و دەموچاوم دەشۆری. هێزێکی کۆمەڵە لەگەڵ کۆمەڵێک زیندانیدا، لە ناوچەکانی خوارەوەڕا هاتبوون بۆ ئالان و گواستنەوەی زیندانییەکان بۆ زیندانی مەرکەزی. سەرم هەڵنەبڕی و خەریکی کاری خۆم بووم. ئەوەی تەنیشتم گوتی:

- سەلام ئاغای کەریمی!

- لە دێهات و پێشمەرگایەتی! لەمێژ بوو کەس بەو ناوەوە بانگی

نەکردبووم. بە سەرسوورِمانەوە ئاوڕم دایەوە و سڵاوەکەم ستاندەوە.

- گوتی نامناسیتەوە؟!

تێیفکریم، زیندانی بوو، پێشمەرگەیەک بە چەکەوە بە سەریەوە بوو، دیار بوو بۆ خۆشۆرین و ئاودەست دەستیان کردبووەوە!

- عەبدوڵلاپوور نییت؟!

- با خۆمم!

- ئەوە هەر ماوی و ئازادیان نەکردووی؟!

- خــودا کەریمە، ئینشــاڵڵا ئێــوە هیدایەت دەبن و منیــش یان ئازاد دەبم، یان دەچمە لای باری تەعالا!

- هیوادارم، خۆشحاڵ بووم جارێکی تر دەتبینمەوە!

- بیســـتم لەگەڵ هاورێکانتدا لە کۆمەڵە نەماون و جێتان هێشـــتووە! پێم گوتی ئێوە هەمووتان فەقیر و هەڵفریوێندراون و ســـەرکردەکانتان بەکارتان دێنن!

- نا وا نییە خۆم وەڕز و ماندوو بووم!

- هەرگیــز بــاوەڕت پێ ناکــەم، من لە زیندان زۆریان باســی تۆ و هاورێکانتیان بۆ کردووم و دەزانم ئێوە ئیی ماندووبوون نین و لەگەڵ ســەرکردەکانتاندا ئیختلافتان هەیە، لە سەرقەبرانی مەهاباد پێم نەگوتی ئێوە فەقیر و تەنیا سەربازن و سەرکردەکانتان بەکارتان دێنن؟!

- ئەوە نییە ناتوانن بەکارم بێنن و چیتر لەگەڵیاندا نیم؟!

- ئافەرین، بەڵام زۆر درەنگە، ئینشاڵڵا مۆفەق و سەلامەت دەبیت!

بردیان و ڕۆیشـــت، ســـڕ بووم و حەپەســـام، بۆ تووشی بوومەوە؟ ئەویــش لێــرە، ئەو هەر دیلــە و منیش پێشـــمەرگەی کۆمەڵە نەماوم و بێزارم لە خۆم و لە هەموو کەس!

ئێوارە کاک دلێر ســـەید مەجید لەگــەڵ هێزێک و چەند باری وڵاغدا پەیــدا بــوو. گوتی بەیانی زوو ســـاز بە دەڕۆین بــۆ ئەودیو. کارتۆنێک ویســـکیی پێ بوو بۆ ناسر ڕەزازی و گوتی، چۆنی پێ بگەیەنین؟ گوتم هەر لە ماڵی کاک محەمەد باشە دێ و دەیبات.

# ٤٤

## دوو کۆمەڵە و دوو چارەنووس

تاریکــوڕوون وڵاغ بار کرانەوە و بە غــار بەرەو لێژ بووینەوە و تا ســەر چۆمی نەوەســتاین و دیســان بە کەڵەس پەڕیینەوە، بارەکانیان کردەوە و ئێسترەکانیان بە ئاودا دا و ئەوانیش بە مەلە و لە خوارەوەی ئێمە هاتنە ئەوبەری ڕووبارەکە.

بــە ئالانی ئەودیو و گوندە خاپوور و ســووتاوەکان و باخ و ڕەزی بێشوماری بێســاحێب، بە شانەخسێدا، لێی وەســەرکەوتین و ڕوومان لــە چیــا و هەورازی بێبڕانەوەی گمۆ کرد. کــوڕەداوێ یەکەم مەنزڵ و شــوێنی پشــوومان بوو. ئاگری تۆپ و هاوەن لە سورێنەوە دەبیستر‌ا، شــەڕێکی قورســی بەرەی جود لە ئێرانەوە لەگەڵ یەکێتیی نیشــتمانی، هێزی لە خەڵک و پێشمەرگە بڕیبوو.

ڕۆژی دواتر، دەمەو ئێوارە لە چەمەکەی دۆڵپەموو ســەرکەوتین و هاتینە ناو دێ، چەند هەنگاومان مابوو بۆ مەقەڕی ئەبوو شەهاب، ڕێک تۆپێک لە سەری سورێنەوە، چەند هەنگاو دوورتر لە مەقەڕ گرمەی لێ هەستا، باش بوو خەساری نەدا، دەنا دەبوو بە پێوقەدەمی ئێمە!

من لای ئەبوو شــەهاب بەجێمــام و جەماعەت بەرەو مەلا بەختیار، بەرپرسی مەڵبەندی یەک لە حاجیمامەند ڕۆیشتن.

ئەبــوو شــەهاب وەک برایەک بەخێرهاتن و پێشــوازیی لێ کردم و هەموو مەقەڕ و پێشــمەرگەکانی ئاگادار کــرد، ئێتر عەلی لێرە لەجیاتی منە و قســەی ئەو قســەی منیشــە و ئەو حســابەی بۆ منی دەکەن، بۆ ئەویشی بکەن. بە گەرمی لە دایک و باب و خوشکان و برایانمی پرسی، بیرەوەرییەکانی شەهید سولەیمان بللوری هەردووکمانی خستەوە بیری ئــەو کوڕە مەزن و قارەمانە. ئەبوو شــەهاب، ســولەیمانی زۆر خۆش

دەویست. دواتر بۆی باس کردم کە کاتی خۆی چۆن و لە کوێ خەبەری شەهیدبوونی سولەیمانی بیستووە و یەکسەر لە ئاست خۆی دانیشتووە و بۆی گریاوە. لە تەنیشــت دیوەخانەکەی خۆی، کە بارەگای ڕێکخراو بوو و خۆشی لێی دەژیا، ژوورێکی بچووک وەک سندووقخانە هەبوو، تەنیا جێی یەک کەسی دەبووەوە، گوتم من لێرە دەبم و ئەوەم بەسە. لە تەنیشــت ماڵەکەی ئەبوو شەهاب، مەقەڕی پێشمەرگەکان و نانەواخانە و مۆلیدە هەبوو. شــێخ نەبەز بەرپرســی مەفەرەزەکەی ئەبوو شەهاب بوو. وەســتا کەریم کە تا ئێســتاش وەک برایەکم وایە، بە نانەواخانە و کاروباری مەقەڕ ڕادەگەیشــت. لە دۆڵپەمــوو کۆمەڵێک هاوڕێی کۆن و تــازەی لێ بوون؛ کاکەکان: حەمەی فەرەج، ڕەفعەتی مەلا، ئەوڕەحمانی حەمــەی فەرەج، دانــا ئەحمەد مەجید، بەکر فەتاح، ســورکێو، فەرهەنگ گروون، ســەرهەنگ ســمایل بەگ، شۆڕش ئیســماعیل، وەهاب، ئاوات قارەمانی، ســالار حاجی دەروێش، حەمەدەمین، شــێخ کامیل، ڕزگاری کاک قادر، غەریب، مامۆســتا جوامێر و ڕووناکی هاوســەری، مامۆستا ساڵح ژاژڵەیی، هەڵۆ ئەحمەد کوردە و زۆری دیکە.

یــەک دوو ڕۆژ بــوو هاتبووم، چەند شــتێکی ســەرەتایی و ناکاملم لەمەڕ باڵی کوردستانی و عێراقچێتی لەناو کۆمەڵەی ڕەنجەدەراندا بەر گــوێ کەوتبوو. ئەوەی ڕاســتی بێت باری دەروونــی خۆم و نیگەرانی لــە دوارۆژم، جێهێشــتنی هەموو هیوا و ئاواتی ژیانیــم، واتا کۆمەڵە و هاوڕێیانم لە ڕۆژهەڵات، دۆخێکی بۆ خوڵقاندبووم، هێز و تاقەتی هیچم نەبوو. خەمۆش و غەمبار بووم، لە سیاسەت و تەنانەت لە خۆشم بێزار بــووم، دەمگوت دە وەرە خۆت لەســەر چــی وازت لە کوڵەکەی ڕۆحی خۆت، واتا کۆمەڵە هێنا و هاتوویت بۆ کۆمەڵەی ئەودیو، لێرەش عەینی بەزم، لەوێ لەسەر ئێرانچێتی و دیسانیش لێرە بەزمی عێراقچێتی باوە. مــن نەمدەزانی مێژووی ڕووداوەکانــی ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران دوای یەکەم کۆنفرانسیان لە مانگی ئایاری ١٩٨١دا لە مالیمۆس بە چ ئاقارێکدا ڕۆیشتووە و چۆن دوو باڵ دروست بوون. دوای وەرێکەوتنی شۆڕش

لــە ڕۆژهەڵات و بوونم بە پێشــمەرگەی کۆمەڵە، من پەیوەندیی جارانم لەگەڵ هاوڕێیانمدا لەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران نەمابوو. هەر نەشــدەکرا من لە شــاخ بووم و دژی کۆماری ئیسلامی لە شەڕدا بووین، ئەوانیش لە پەیوەندیدا بوون و تەنانەت هاتوچۆی تارانیان دەکرد. لێرەدا ستراتیژ و ڕێبازی سیاســی و فیکریی دوو پارچەی کوردستان دوور لە خەیاڵ و موزایدەی نەتەوەیی و هەست و دروشمی کوردایەتی و یەک نەتەوە بــوون، زۆر بــە ڕوونی و واقعی خۆی نیشــان دەدا و بە کردەوە دوو پارچــە بــوون و دوو وڵات بوون و تەنانــەت دوو بەرژەوەندیی جیای نەتەوەیــی بە زەقــی خۆی دەردەخات. کوردی ئێران بە حوکمی شــەڕ بەبــێ ویســتی خۆی دەبێت لــە حکومەتی عێراق و بەعســی کوردکوژ و ئەنفالچــی نزیــک بێتــەوە و کوردی عێــراق بە هەمان چەشــن و لە ڕووی ناعیلاجی لەگەڵ مەلا کوردکوژەکانی ئێراندا. فەلسەفەی دوژمنی دوژمنم دۆســتمە، بە دەیان ســاڵ کوردەکانی دوو پارچەی ڕۆژهەڵات و باشووری لە بەرداشی نێوان حکومەتەکانی ئێران و عێراقدا هاڕی و سەرکردەکانیشــی لە ناوخۆ و ناودۆســت و بێگانەدا تا ڕادەیەکی زۆر، سووک و بێئیرادەش کردووە.

**لە نێوان دوو دەوڵەتی دیکتاتۆردا**

زۆر جار هەبوون و ئێستاش هەن ئەو خەڵکانەی بەبێ بیرکردنەوە و دیتنــی خۆیان، تانوتەشــەر لە ســەرکردەی لایــەک دەدەن بۆ لەگەڵ دوژمنی کورددا هەڵدەســتن و دادەنیشــن و یارمەتیــی لێ وەردەگرن، بــە بێ ئەوەی لەو کاتەدا خۆیان ببینن و ئاوڕ بدەنەوە. خۆشــیان هەر ئەوەیــان کردووە، لەگەڵ دیکتاتۆری وڵاتێکی داگیرکەری کوردســتاندا، هاوپەیمانــی و پەیوەندییــان هەبــووە. کاتێک من و چەند پێشــمەرگەی کۆمەڵە لە ماوەت خەریکی چەکهێنان بووین و بە جلی پێشمەرگایەتی لە گوند و شارەکانی باشوور دەبیندراین، بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی پێشــمەرگەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ، دەمگوت ئێستا ئەو خەڵکە بە چاوی

جاش سەیرمان دەکەن و هەر ئەو کاتیش بیرم لەو هاوڕێیانەی باشوور دەکردەوە کە لە شارەکانی ڕۆژهەلات و تاران دەهاتن و دەچوون، بۆ پەیداکردن و سوالی چەک و ئەرزاق و نەخۆش و بریندارەکان، دەبێ خەلکی شارەکانی ڕۆژهەلات چۆنیان سەیر بکەن، کاتێک هەموو ڕۆژێک دەیانبیست دوو یان سێ لە جوانترین ڕۆلەکانیان لە مەیدانی شەڕ لەگەل پاسداری مەلایاندا شەهید دەبن، یان بە پێچەوانەوە کە دەیاندیت من لەگەل ئامرفەوجی ماوەتدا دادەنیشم و تەرمی شەهیدێکی پێشمەرگەی باشوور بە مێکزەمینی ڕادەکێشن. دیارە خەلکی وەک من، زۆرتر تێگەیشتنی لەم دۆخە هەبوو و بە چاوێکی دوور لە ئیحساسات و موزایەدەی نەتەوەیی دەیڕوانییە هەلومەرجی کوردەکان لەم دوو پارچەیە. پرسیارەکە ئەوەیە ئەوانەی وەک من و چەند سەد کەسێک کە ئەم ڕاستییانەیان دەزانی، دەبێت چەند لە سەدی کۆمەلگەی کورد بووبن؟ بە دلنیاییەوە ئەوەندە کەمین بە یەک لە هەزاریش نابین. بریا سەرکردایەتیی کورد لەگەل خەلکی خۆیدا زۆرتر شەفاف و ڕاستگۆ بووبان و ئەم شتانە لە خەلک نەشاردرابانەوە، بەلکو حەولی ڕۆشنگەری و درکاندنی ڕاستییەکانیان دابایە و خەلک زۆرتر لە واقعی شۆڕشەکانی کورد گەیشتبا و هەلومەرجی جیۆپۆلیتیکی کوردیان زۆرتر شەنوکەو کردبا. تەنانەت هەبووە دەولەتانی داگیرکەری کوردستان، بۆ شەڕ لەگەل یەکدا، کوردیان بەکار هێناوە. زەقترین نموونەی بەرپاکردنی شۆڕشی ئەیلوول بە سەرکردایەتیی بارزانی بۆ لێدانی دەولەتی عێراق بە سەرۆککۆماریی عەبدولکەریم قاسم بە دەستی شای ئێران و ئەنجامی بوو بە ئاشبەتالی کوردان و وەرگرتنی ئیمتیازێکی زۆری ئێران لە عێراق، دوای پەیمانە شوومەکەی ئەلجەزایر لە سالی ١٩٧٥دا!

### بالی زال نەوشیروان بوو

بیستم لە کۆنفرانسەکەی مالیمۆس چەند سەرکردەیەکی کۆمەلە کە خۆیان زۆرتر بە ڕێڕەوانی شەهید ئارام دەناساند و دژی ڕێبەریی

نەوشیروان مستەفا بوون، وەک سالار عەزیز و مەلا بەختیار و مامۆستا جەعفەر (فازل کەریم) و شێخ عەلی و چەند کادری دی، دەنگیان نەهێناوە، هەڵوێستیان گرتووە و زیز بوون و ڕۆیشتوون. دواتر مام جەلال ئاشتی کردوونـەوە. هەڵبەت مەلا بەختیار بە دەنگێکی کەم دەرچووبوو، بەڵام هەر ناڕازی بوو. ئیتر ئەمە هەر لەو کۆنفرانسـەوە بووبوو بە هەوێنی دژایەتیـی دوو باڵ لەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران. باڵی نەوشـیروان بەوە تاوانبار دەکرا دەستی بەسەر کۆمەڵە و ڕێبازی شەهید ئارامدا گرتووە و دوور کەوتووەتەوە لە ڕێچکەی مارکسیسـتی کۆمەڵە. نەوشیروان و باڵەکەی، ئەوانی دیکەیان بە توندئاژۆیی و بەدخوویی و دوورکەوتنەوە لـە پێشـمەرگە و خەڵک، خۆبەزلـزان و بێکەڵکی تاوانبـار دەکرد. باڵی زاڵ نەوشـیروان بوو، کۆمەڵە بەتەواوی لەژێر هەژموون و دەسـەڵاتی مام جەلال و نەوشـیرواندا بوو. مامۆسـتا جەعفەر دەستی بە نووسین دژی نەوشـیروان و کۆمەڵـە کردبـوو و بەرنامـەی چوونـەدەرەوەی داڕشـتبوو، دواتر ڕۆیشـت و لە ئەڵمانیا بوو بە پەنابەر. مەلا بەختیار کرابوو بە بەرپرسی مەڵبەندی یەک و زۆربەی هاوبیرانی لەو مەڵبەندە کۆ کردبوونەوە. سالار عەزیز بە قینێکی زۆرەوە، بە کردەوە دژایەتیی نەوشـیروانی دەکرد و خۆی بە جێگرەوەی ئـارام دەزانی و کۆمەڵەی بە ئیی خۆی دەزانی، سـەری ئەو باڵە بوو کە دژایەتیی نەوشـیروان و مـام جەلالیـان دەکرد. دواتر لـە پاڕەزان مەقەڕی کـردەوە و زۆربەی جەماعەتـی ناڕازی و دژ، لـەم گوندە، لە دەوری کـۆ بووبوونەوە، کە چەند هەنگاوێک لە دۆڵپەموو دوور بوو، ئەو شـوێنەی مەقەڕی ئەبوو شەهاب و ڕێکخراوی سێی کۆمەڵەی لێ بوو.

### لە چارەڕەشیی بەختی خۆم

ئەبوو شەهاب و ڕێکخراوەکانی یەک و دوو و سێی کۆمەڵە، زۆرتر بە لایەنگر و جەماعەتی نەوشیروان و باڵی زۆرینەی کۆمەڵە دەناسران. ڕق و دژایەتیـی ئـەم دوو باڵـە، جار هەبوو دەگەیشـتە تووڕەبوون و

تەنانەت کردەوەی ناحەز و دوور لە گیانی هاوڕێیەتییش، ڕووی دەدا.

تەنیا دوو ڕۆژ بوو لە مەقەڕی سێی ڕێکخراوی کۆمەڵە بووم، گوێم لە زۆر شت دەبوو، هەرچی دەهات بۆ لای ئەبوو شەهاب هەمووی کادری کۆمەڵە بوون و دژی مەلا بەختیار و سالار عەزیز قسەیان دەکرد. دۆڵپەموو وەک ناوەندی کوردستانیبوونی لێ هاتبوو، پارەزانیشیان بە ناوەندی عێراقچێتییان ناوزەد کردبوو. ئەوەی ڕاست بێ من زۆری لێ تێنەدەگەیشتم و هێزی خۆپێوەماندووکردنیشم نەبوو. هەر ئەوەندەم دەزانی و بێزار بووم، لە چارەڕەشیی بەختی خۆم لە چی ڕام کرد و تووشی چ بووم.

### سەیارەکەی مەلا بەختیار

ڕۆژی دووهەم یان سێهەم بوو لەسەر بەرزایی بەر هەیوانەکەی مەقەڕی ڕێکخراو چەند کەسێک دانیشتبووین، لە دوورەوە تەپوتۆزی سەیارەیەکی تویۆتا پەیدا بوو، دیار بوو تازە لەناو ڕیزەکانی پێشمەرگەدا سەیارە پەیدا بووبوو، کە زۆرتر ئیی بەرپرسەکان بوو، هەموویان دەناسرانەوە. گوتیان وەڵا ئەوە سەیارەکەی مەلا بەختیارە بۆ ئێرە دێت! زۆریان پێ سەیر بوو مەلا بەختیار و هاتن بۆ لای ئەبوو شەهاب؟! بە خێرایی چەند لێکدانەوە کران و نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک. سەیارەکە گەیشتە بەر مەقەڕ، مەلا بەختیار و پێشمەرگەکان دابەزین. لە هەیوانەکەوە مەلا بەختیارم ناسییەوە و بە پەلە چووم بۆ پێشوازیی، زۆر بە گەرمی یەکمان لە باوەش گرت، جەماعەت کە ئەوەیان دیت، ئەوجار تێگەیشتن هاتنەکە بۆ لای دۆستە، ئەبوو شەهاب و جەماعەتیش بە گەرمی بەخێرهاتنیان کرد و لە هەیوانەکە دانیشتین. قسەی خۆش و تانەوتەشەر بەیەکەوە دەکران. مەلا گوتی، کوڕی باش دەبوو لە لای من لات دابا و هاتووم دەبێ بێی بۆ لای من. چاوێکم لە ئەبوو شەهاب کرد و ئەویش گوتی، ئێرە ماڵی عەلییە. دوای موجامەلە و ئامادەییدەربڕین بۆ میوانداریی من لە لایەن مەلا بەختیار و مەڵبەندەوە،

گوتم کاک بەختیار خۆت دەزانی بۆ من فەرق ناکات و تازە لێرە کونەکەویڵێکم[1] بۆ خۆم خاوێن و ئامادە کردووە، وەرە بیبینە، لە لای ئەبوو ئاسوودەم. گوتی، چۆنت پێ باشە ئێمە لە خزمەت داین و ئێرەش هەر ئیی خۆتە و ئەوێش.

### هیچ فایدەی نەبوو

یەک دوو چایان خواردەوە و ڕۆیشتن، گوتی وەرە سەردانمان بکە. من لە ڕۆژانی دواتردا یەک دوو جار چووم بۆ مەقەڕی مەڵبەند لە حاجی مامەند، پێشمەرگەکان و ڕووناک خانی خێزانی کاک بەختیار زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێ کردم. تێگەیشتم ئەوان کە زۆربەی هەرە زۆریان لە باڵەکەی دژی نەوشیروان و ئەبوو شەهاب بوون و هیچی باشیان بە جەماعەتی ئەبوو شەهاب و ڕێکخراو نەدەگوت، وا لە من حاڵی بووبوون، کە بە مەبەست و بەرنامەی پێشووتر لە لای ئەبوو شەهاب لام داوە و کوردستانی بیر دەکەمەوە. ئەوان کۆمەڵەی ئێران و حیزبی کۆمۆنیست و جەماعەتی مەنسوور حیکمەتیان زۆر لە خۆیان نزیک دەدیت و سەرسام بوون بە تیۆر و قسەکانیان. هەر لەو ڕوانگەیەوە، پێیان وا بوو دەبێت من لەوان نزیکتر بم، تاکو نەوشیروان، یان ئەبوو شەهابی کوردستانی! زۆرم حەول دا ڕاستیی دەروون و واقعی حاڵی خۆمیان بۆ ڕوون بکەمەوە، هیچ فایدەی نەبوو. غافڵ لەوە بوون من لە داخی هاتن و دەسبەسەرداگرتنی کۆمەڵەکەم لە لایان جەماعەتی مەنسوور حیکمەت خۆم ئاوارە کردووە!

دابەزین لە لای ئەبوو شەهاب و بەدواداهاتنی مەلا بەختیار و نەچوونم و مانەوەی من لە لای مەقەڕی ڕێکخراو، بە کوردستانیبوونی من لێک درایەوە و بەبێ ئەوەی خۆم پێ بزانم، ناسنامەی کوردستانیبوون بە بەژنم بڕا، دواتر خۆشم هەر وا دەرچووم و هیچ پێم ناخۆش نەبوو!

---

[1] – کەوێڵ، کۆخ، کولبە، ژوور و خانووی بچووک، وەک ئەشکەوت.

دەستیان بە ژنهێنان کردبوو

چەند ڕۆژێک پەڕیمەوە ئەودیوی جادەی چوارتا و لە قەیوان لە لای کاک سەلاح چاوشین مامەوە. هەر لە سەرەتای شۆڕشی ئێرانەوە کاک سەلاحم دەناسی و لێک نزیک بووین. کە چووم چەند پێشمەرگەیەکی لە لا بوو، بارەگاکەی لە سەرەوەی ئاوایی بوو. دایە حەلاوی دایکی هاتبوو لە لای بوو، ژنێکی نورانی و بەخشندە و میهرەبان. منی زۆر خۆش دەویست و ئاگای لێم بوو، بە غەریبی دەزانیم و دوورکەوتوو لە خاک و وڵاتی خۆم. خواردنی زۆر خۆشی دایکانەی بۆ دروست دەکردین. کاک سەلاح کۆمەڵێک هاوڕێی کۆنی سەردەمی شورتەی هەبوو، زۆر بەوەفا بوون و لەگەڵ هەموو خەتەر و چاودێریی ئەمن و حکومەت، بۆ سەردانی دەهاتن و هەموو جارێک پیکابێک لە خواردن و خواردنەوە و پاقلاوە و هەرچی شتی خۆشە دەیانهێنا، شەو دەمانەوە و بەزمیان خۆش دەکرد. کاک سەلاح ماوەیەک بوو لەگەڵ مام جەلالدا تێکچووبوو، خۆی ماڵێکی لەگەڵ دایک و خوشکەزاکانی و چەند پێشمەرگەیەکی لە قەیوان دانابوو، خەڵک زۆری حورمەت دەگرت. پێشمەرگە کۆنەکانی وەک کاک سەلاح وردەوردە دەستیان بە ژنهێنان کردبوو، کاک نەوشیروان پێشیان کەوتبوو، لەبەر خۆڕزگارکردنی لە قسەوباسی خەڵک و پرسیارکردنیان، ژنی هێنابوو، ڕێگە بۆ ئەوانی دیکەش خوش کرابوو. ئەبوو شەهاب دەستی لەسەر کچی مام قادری دۆڵپەموو دانابوو. سامان گەرمیانی لە بەری قەراخ بوو، کاک بەختیاری برای کاک نەوشیروان خزمێکی دووری خۆی بۆ دۆزیبووەوە. کاک سەلاح لە فیکری ژنهێناندا بوو، بەس ساغ نەدەبووەوە و زوو زوو عاشق دەبوو، یان فریای نەدەکەوت و بە شوویان دەدا، یان دەیانگوت کچ بە پێشمەرگە نادەین. ئەو ماوەیە کە من لە لای بووم تەواو دڵخۆش بوو، گوێم بۆ دەگرت و هاودەمی بووم لە وەسف و بوون و نەبوونی فلان کچ و فلان گوند. دەیبردم بۆ گوندەکان و ئەو کچانەی لە دوورەوە نیشان دەدام، کە چاوی گرتبوونی.

ڕاستییەک هەبوو هەموو ئەو گەنجانەی تەمەنی کاک سەلاح و ئەبوو شەهاب و... لە ساڵی ١٩٧٦ەوە کە لاوێکی ٢٥-٣٠ ساڵە بوون وردەوردە دوای ئەو هەموو ساڵە لە شاخ پیر دەبوون و کچانی سەردەمی خۆیان لە شــار، یان شــوویان کردبوو، یان مابوونەوە. دەبوو ژن بهێنن و لە کچــە باشــەکانی لادێ هەڵبژێرن و زۆر جار ئەوەش ســەخت بوو، بە پێچوپەنا دەیانگوت کچ بە پێشمەرگە نادەین.

ئــەو ماوەیــە لە ماڵی کاک ســەلاح، لەگەڵ دایکی و پێشــمەرگەکاندا بــۆ من حەســانەوەی ڕۆح و جەســتەم بوو، چەند جارێــک بە دەوری گوندەکانــی کارێــزە، باڵــخ، گاپێلــۆن، مالوومــە، ســەرگەڵوو، هەڵەدن، چالاوە، گەڕەدێ و هەموو ئەو دۆڵەدا جەولەمان کرد. گەڕان و ناسینی ئەم ناوچانە بوون بە بەشێک لە کۆڵەباری کۆکراوەی مێژووی ناسینی جوگرافیا و کۆمەڵگەی بەشــێکی کوردستان، دواتر زۆربەی بەشەکانی تری باشووری کوردستانی گرتەوە و دەتوانم بڵێم کەم شوێن و گوندی کوردستان هەیە پێی ئاشنا نەبم و نەمدیبێت.

### مشکەکانی ئەبوو شەهاب

لەبــەر بێپەنایــی و بەتاڵکردنی داخ و حەســرەت و بوونی کەســێک، غەمڕەوێنێک، بۆ ســفرەی دڵ لاکردنەوەیەک، بۆ هێندە پێشنەخواردنەوە و لە ناوخۆداڕانەگرتن، کۆنەکردنەوەی خەم و مەراق، ئەبوو شــەهاب و سەلاح ئاگاداری زامی دڵی ئەسیر و بریندارم بوون. بۆم باس کردبوون چــۆن بەنــدی دڵ و هەناوم لە زیندانەکانی ئێران جێ هێشــتووە و چۆن نەرمینی خوشــکم بە شەق و گریان بەیانی زوو لە باوەشی دایک و بابم هێناویانەتە دەر و ئەویش ڕەوانەی زیندان کراوە! جووتێک دەستەخوشکی یەک لە یەک لە لام خۆشەویســتتر، یەک لە خوێن و گۆشــت و ئێســقانم و ئەوی تریش ســوڵتان و خاوەنــی دڵ و دەروونم، بووبوونە مۆتەکەی شــەوانی تەنیایی و پڕ لە خەون و خولیا و خەیاڵی بێبڕانەوی غەریبێکی سەرگەردانی خەبات و شۆڕشی کوردایەتی. بیرم دەکردەوە دەبوو ئێستا

زانکۆم تەواو کردبا و لە شارەکەی خۆم ئەندازیاری کارەبا و فیزیا بام، ناردبام بۆ خوازبێنی و دایک و خوشکان بۆ جل و ئاڵتوونکڕین دوکانان گەڕابان. داوەتێک گیرابا لە حەوشــەی ماڵی بابان ئەمســەر و ئەوسەری دیار نەبا، لەم شــوێنەی ئێســتا بووەتە کەلاوەیەکی خاپوورکراو بە تۆپ و هــاوەن، هەر یەک لە یەکێی ســەرچۆپی وەرگرتبایە، کەچی ئێســتا لە کونجی گوندێکی ئەم باشــوورە، ئەوەندە لە خۆمدا پێچاومەوە و گرمۆڵە بــووم لە ناو لێفەیەکی چڵکن و ســەرینێکی پڕ لە ڕشــک و ئەســپێدا، بە خــۆم نازانم، کــە خەویش دەمباتــەوە. ناڵەی هەنیســک و گریانم ناگاتە گوێــی ئاســمان، بەڵکو دەبێتە کوڵ و بە ناخمــدا وەک خەنجەر جەرگ و ڕیخۆڵە دەبڕێت و جیڕەی ددان بەیەکەوەچوونم، مشــکەکانی کۆخەکەی لای دیوەخانەکەی ئەبوو شەهابیشیان هەراسان کردووە!

### ددانئێشە برستی لێ بڕیم

بە هۆی ددانلەچیڕەوەبردن و شەوانی پێشمەرگایەتی و نوستن لەم مزگەوت و ئەو ماڵ و بن بەرد، تووشی نەخۆشیی پووکەکانم هاتبووم، کێــم و لەقــی ددانەکانم ژیانیان پەک خســتبووم، چەنــد جار لە ڕووی ناعیلاجی هەر بە گازی ناڵبەندان دوو سێ ددانیان بۆ کێشابووم، بەڵام شــەوی وا بــوو ژانی پــووک و ددان، برســتیان[1] لێ دەبڕیــم و پەنام دەبردە بەر دووکەڵی سیگار و عەتر و مێخەک. جار هەبوو بەدڵ حەزم دەکرد یەکێک بێت و هەر هەموو ددانەکانم هەڵکێشــێت و نەجاتم بدات. ژانــی ددان لەبەر ئەوەی عەســەبە، کار لەناو مۆخــدا دەکات و مرۆڤ بەرەو زەلیلی و دەستەوەستان دەبات.

چەند مانگ پێش لە دوکانەکەی بەناو ددانســاز لە بێزوێ خلێنەیەک هەراسانی کردبووم، چووم بۆ لای و هەڵیکێشا، دوای یەک دوو سەعات هەســتم کرد ساغەکەی تەنیشــتی هەڵکێشــاوە و کرمۆڵەکە لە شوێنی خۆیەتی. چوومەوە لای و ئەویشی کێشا، گوتی، باش بوو، چەند مانگی

---
١- برست، وزە و توانا، هێز و گوڕ.

دی هەر دەبوو دەریکێشیت، ئەوە نەجاتم دای. ئیتر ئەو هەڵە گەورەیەی کە کردبووی، کردی بە منەت بەسەرمدا! ئەشکەوتێکی گەورە لە لای ڕاستی زارم پەیدا بووبوو، هیچم بۆ نەدەجوورا و پاروەکانم هەر وا قووت دەدان. گوتی، تاقمێکی جوانت بۆ دروست دەکەم. پلاستیکێک بوو لەمسەر و ئەوسەری دوو قولاب بوو، دەچوونە ناو دوو ددانی ئەوبەر و ئەمبەر، زۆر بە عەزاب و ژان بوو. گوتی تاقەت بێنە عادەتی پێ دەکەی، شەقەشەقیان دەهات، هەموو جارێک لە کاتی نانخواردندا دەرمدێنا و لە گیرفانم دەنا، لەجیاتی ئەوەی نانی پێ بخۆم. پاش ماوەیەک هەردوو ددانی، کە قولاپەکانیان ڕادەگرت، ڕەش بوون و وەلەقین کەوتن.

بە هۆی ئەوەی کاک سەلاح و ئەبوو شەهاب لە دەردی دووری و دەروون و موعاناتم تێگەیشتبوون، زۆر ڕێزیان دەگرتم و بەڕاستی ئاگایان لێم بوو. هەردووکیان منیان بە شیاوی ئەوە دەزانی باسی دڵداری و ویستی ژنهێنانی خۆیان لە لام بکەن و زۆر جار بە تایبەت سەلاح لە باسی کچان و دیتنەوەی ژن بە پێکەنین و وەی وەی و لێوگەستنی دڵی خۆی لە خۆ دەکردەوە و دەیگوت، ئیتر تەواو ژن دێنم و بچن بۆ خوازبێنی!

## سالار عەزیز گوتی: شۆڕش هەمووی درۆ و فشەیە

چەند ڕۆژێک بوو لە قەیوان، لای کاک سەلاح بووم، ڕۆژێکیان کاک سالار عەزیز و یەک دوویەک پەیدا بوون و لای کاک سەلاح لایان دا، وا بزانم شەویش مانەوە و دەبوو بپەڕینەوە بۆ ئەوبەری جادە و بەرەو مەڵبەندی یەک و پارەزان بچن. کاک سەلاح زۆری خزمەت کردن و ڕێزی لێ نان. بەیانی کە خواحافیزییان دەکرد و بەڕێمان دەکردن، کاک سالار ڕووی لە من کرد و گوتی:

– چ دەکەی لێرە؟!

– وەڵا وازم لە کۆمەڵە هێناوە و هاتووم بۆ ئێرە. ئەدی چ بکەم شوێنی ترم نییە؟!

- بـۆ نیتە، بچووەوە وڵاتی خۆتان و دەســت لەم قایشــوقوریش و تفەنگە هەڵگرە!

- ئاخر دەمكوژن، ئەوە نییە تەنانەت نەرمینی خوشكمیان گرتووە و هەموو ڕۆژێك دایك و بابم بانگ دەكەن!

- ئاخر بۆیە دەڵێم بچووەوە، خۆتیان تەسـلیم بكە و با ئەم دایك و باب و خوشكەش بە هۆی تۆوە هێندە لە عەزابدا نەبن! حكومەتەكەتان هیچ عەیبی نییە و لەگەڵیدا بســازێن، ئەوەتــا ئێمە لە حكومەتی خۆمان یاخی بووین، كێ قازانجی كرد؟!

- كاكــە چۆن دەكرێت بچم خۆم تەسـلیم بكەمــەوە، خەڵك چیم پێ دەڵێن و خۆم چۆن قبووڵی دەكەم بچمە ژێردەستی پاسداران؟!

- برا بێعەقڵ مەبە، شۆڕش هەمووی درۆ و فشەیە، كەسیان ڕاست ناكــەن و منداڵــی خەڵكی، ئــی وەك تۆ بە كوشــت دەدەن، ئەوەتا ئێمە ئەوە چەند ساڵە بەم شاخانەوەین، چیمان كردووە؟ هەموو هەر كوتانی ئاسنی ساردە. بڕۆ باوكەكەم خۆشت ڕزگار بكە و ئەم كەسوكارەشت!

ئێتــر زۆر هاتە خــوار بە ســەركردایەتیی خۆیاندا، بــە تایبەت مام جــەلال و كاك نەوشــیروان و... گوتــی، هەموو درۆ دەكــەن، تا بۆیان بكرێت ملی خۆیان و خەڵكی دی دەشكێنن!

دڵــم بەقەد دڵی چۆلەكەیەكــی لێ هاتبوو، هەر ئەوەنــدە بوو لەبەر عەیبە بە كوڵ لە گابۆڕم نەدا، سەری هەموو كێوانمی لێ تاریك كردم.

مــن لە زووەوە كاك ســالارم وەك ســەركردەیەكی شۆڕشــگێڕ و بەسام و هەیبەت دەناسی، هەرگیز پێم وا نەبوو ئاوا ڕووخاو و بێئومێدە و خەڵكــی وەك من هان دەدات بۆ تەسـلیمبوونەوە. بەڕاســتی ئێســتا كە زیاتر لە ســی ســاڵ تێدەپەڕێت و بیر لەو قســانەی سەركردەیەكی شۆڕشی كوردەواریی ساڵانی حەفتا دەكەمەوە، دەڵێم تۆ بڵێی «ئەسپی ســووكەڵە ســواری كورد كە وەســتا، خەتای ســواران بوو یان پێش سوارەكانمان قورس و ناوەستا بوون و هەن[1]»؟!

---

١- ئیشارە بە شیعری «بەهار هەر دێ»ی مامۆستا هێمنە.

### ئەوانە ڕووخاون

هەر کە میوانەکان ئاوا بوون، کاک سەلاح دەستی لەسەر شانم دانا و گوتی، نەکەی بەگوێی ئەوانە بکەیت، ئەوانە ڕووخاون و بەتەمای وازهێنانن. باسی کۆنفرانسی کۆمەڵەی بۆ کردم و گوتی، ئەوانە دەنگیان نەهێنا، هەر لەبەر ئەم ڕەوشت و کردەوانەیان کە پێشمەرگە سارد دەکەنەوە و خۆیان پێ زۆرە و بە کەمی سەیری پێشمەرگە دەکەن. تۆ کوڕێکی بەشەهامەت و بنەماڵەیەکی شۆڕشگێڕن، نەکەی ئەم قسانە کارت تێ بکەن، هەتا ئێمە هەبین ئێرە ماڵی تۆیە و چیمان بۆ کرا بەیەکەوە دەیکەین، ئێمەش هەموو خوشک و برا و دایک و بابمان بە هۆی پێشمەرگایەتیی ئێمەوە گیراون و ئیعدام کراون، ئیتر بڵێین چی ئەوە بەشی ئێمەی کوردە و تۆش لە ئێمە زیاتر نییت، ئێرەش وڵاتی خۆتە! بەم قسانەی کاک سەلاح هاتمەوە سەر خۆ. پێش هاتنی من بۆ باشوور، چەند هەفتەیەک بوو بەرزانی خوشکەزای کاک سەلاح لە شەڕێکی قارەمانانەدا لە کارێزە شەهید بووبوو.

### پرچی زەردت وەک زنجیرێ

بەرزان عوسمان ئەمین، شاعیر و هونەرمەند، دەرچووی پەیمانگەی هونەرەجوانەکان، ساڵی ١٩٨٢ هاتبوو بۆ لای خاڵی (سەلاح چاوشین) و تفەنگی پێشمەرگایەتیی لە شان کردبوو. گزینگ خوشکەزایەکی تری کاک سەلاح و کچی نەجات خان و کاک حوسێن شیرین شووی پێ کردبوو. لەمێژ نەبوو نۆبەرە، کچێکیان بووبوو. دایکی لە شارەوە هێنابووی بۆ یەکەم جار باوکی چاوی پێی بکەوێت. لە کۆمەڵگەی کارێزە، بەرزانی پێشمەرگە لە چاوەڕوانیی هاوسەر و کچی تازەلەدایکبوویدا دەبێت، کە جاش و جەیش دەوری دەدەن و شەهیدی دەکەن، تەرمەکەی بەدوای ترۆمبێلی سەربازیدا بەناو شارۆچکەی کارێزەدا ڕادەکێشن (١٨-١٢-١٩٨٢)، هەر لەو کاتەدا کیژۆڵەی تازەلەدایکبوو لەگەڵ دایکیدا

دەگەنێ و ڕێک بەسەر ڕووداوەکەدا دەکەون، بە شەپۆلی ئەسرین و خوێن لەگەڵیدا دەچن بۆ ژوانی ئەبەدی. شەهید بەرزان شاعیرێکی هەستناسک و کادرێکی کارامە و خۆشەویستی ناو خەڵک و پێشمەرگە بوو. چەند نموونەی شیعرەکانی لە لایەن هونەرمەندانەوە کرانە گۆرانی و ڕەنگە کەم کەس هەبێ گوێی لەم گۆرانییە نەبووبێ، کەم کەسیش هەبێ بزانێت ئەمە شیعرێکی ناسک و جوانی شەهید بەرزانە:

پرچی زەردت وەك زنجیرێ
لە دەست و قاچم ئاڵاوە
نیگای چاوت وەکو تیرێ
ئاوێتەی ڕووتی پێکاوە
چاوی کاڵ و بەسەر زاری
هێمن و مات و داماوە
بەڵام لەژێر پەردەی بینین
ناز و جادووی تێیازاوە.

# ٤٥

## ئەبوو شەهاب ژن دێنێت

لە دۆڵپەموو، ئەبوو شەهاب، کاک ڕەفعەتی مەلا و حەمەی فەرەج و چەند کەسێکی ناردبوو بۆ خوازبێنی لای کاک قادر. ڕەزامەندی نیشان درابوو. کاک قادر پیاوێکی باش و هەمیشـــە بەرەی شۆڕش بوو، لەناو خەڵکی دێیەکەش خۆشەویست و جێی ڕێز بوو. سروە کچی کاک قادر جـوان و جەوان بـوو، کچێکی بە تەواو مانا لادێیی و ســادە و بێگەرد بوو. زۆری نەبرد لەسەر دەستی مەلایەکی قۆشمەچی و قسەخۆش لە ماڵی کاک قادر بە بەشداریی چەند کەسێکمان، سروە لە ئەبوو شەهاب مــارە کــرا، ڕۆژ بوو بە ڕۆژی ئەبوو شـــەهاب و گاڵتـــە و ڕابواردن بە زاوای دۆڵپەموویيان!

## ئیعدامکردنی نەرمین کەریمی

لە قووڵایی ناوچەکانی باشوور و لە گوندێکی بچکۆلانەی ناو شاخە سەختەکانی شاربازێر، لە هەموو دنیا بڕدرابووم و ئاگام لە هیچ نەبوو، هەواڵ و خەبەری لای خۆمان، لە دیوی ئێرانم زۆر کەم پێ دەگەیشت، جاروبــار زۆر بە زەحمەت و بە قرەقــڕی پاڕازیت، ڕادیۆی دێموکرات یــان کۆمەڵــەم دەگرت. ئێوارەیــەک لەگەڵ ئەبوو شـــەهاب و کوڕەکان لەبەر هەیوانەکە دەســـتم لە ڕادیۆکــە وەردەدا، ڕادیۆی دێموکرات زۆر بە ســافی گیرا، بێژەرەکە زۆر بە حەماســـەوە باسی خەڵکی خۆڕاگری ســـابلاغی دەکرد و هەواڵی پۆلێک لاوی خوێندەوە، کە لە ورمێ ئیعدام کرابوون. هەموو گوێمان قولاغ کردبوو، لەناکاو گوتی: نەرمین کەریمی و ناوی چەند کەســـی دیی جەوانی خەڵکی شاری خوێندەوە، بە تاوانی هەواداری لە کۆمەڵە و دێموکرات ئیعدام کراون!

هەموو سـەرەکان سـووڕان بەرەو من و منیش حەپەسـاو و سـڕ بووبووم، هیچم پێ نەدەگوترا. ئەبوو شـەهاب ویستی دایپۆشێ و بڵێ، شـەرت نییە و با دواتر خەبەر بنێرین و زۆرتری لێ بکۆڵینەوە، ڕەنگە وا نەبێت! ئەو خورپەیەی لە دڵم هات دڵنیا بووم ڕاستە و خەڵکێکی زۆر لە زینداندا ئیعدام کراون.

من مات و پەشـۆکاو، بێقەرار لە دەروونندا، بیرم دەکردەوە دەبێ چ بکەم؟ ئەو شەوە زۆربەی پێشمەرگە و بەرپرسەکان لە دۆڵپەموو هاتن بۆ دڵنەوایی، ئەبوو شـەهاب زۆری حەول دەدا ڕادیۆکانی تر بگرێت و خەبەری تازەی دەستکەوێت، بەڵکو درۆ بێت.

یـەک دوو ڕۆژ دواتر لە هەمان شـوێن دیسـان ڕادیۆی دێموکرات باسی لە دەیان دایک و بابی پێشمەرگەی دێموکرات و کۆمەڵە کرد، کە لە سـەربازخانەی مەهاباد گیراون و دەیانەوێت بۆ سـەرووی ئێران لە دامغانیان ڕاگوێزن. زۆر بە حەماس و دەنگێکی دلێر بێژەری دێموکرات، وەک دایک و بابی پێشـمەرگە ناوی بابم؛ ئیبراهیم کەریمیی خوێندەوە، لە سەربازخانەی مەهاباد گیراون!

گیرانی دایک و بابم لەو کارەساتە گەورانە بوو، کە هەرگیز بیرم لێ نەکردبووەوە و پێم وا نەبوو بابم بتوانێت بەرگەی شتێکی وا بگرێت.

پێش ئەو خەبەرانە، دەمزانی ئەبوو شەهاب بەتەمای ژنگواستنەوەیە و ڕەنگە بۆی زەحمەت بێ بە بوونی من بەو وەزعەوە خۆ لە زەماوەند و ژنگواستنەوە بدات. دڵ و دەروونم دەکوڵی و ئارام و قەرارم نەمابوو، دەتگوت لەسەر ساجێکی پڕ لە پشکۆ ڕایانگرتووم و حەزم لە جووڵە و ڕۆیشـتن بوو. نەمدەویست ببمە هۆکاری تێکدانی ژنگواستنەوە و هاتن و شادیی کەسوکاری ئەبوو شەهاب لە کەرکووک و وەدەنگخستنەوەی ژنهێنانی.

## وەک بیلبیلەی چاو دەیپارێزم

گوتـم ئەبوو؛ بوونم لێرە هیچ خۆش نییە و ئاسـوودە نیم، ئیجازەم بدە با سـەردانێکی ئەودیو بکەم و لە نزیکەوە هەواڵی نەرمین و دایک و بابم بزانم. کەمێک تێراما و بیری کردەوە، سالاری حاجی دەروێشی بانگ کرد و گوتی: سالار، عەلیت بدەمە دەست دەیبەیت بۆ ئەودیو و بە سـەلامەت دەیهێنیتەوە؟! گوتی: کاک ئەبوو شەهاب وەک بیلبیلەی چاو دەیپارێزم و کاک عەلی شتێکی لێ بێت ئەوە بزانە سالاریش نەماوە!

کاک سـالاری حاجـی دەروێـش جوامێرێکی ڕۆحسـووکی ئازا و وێچـوو بـوو، توندوتۆڵ و کوڕی شـاخ و دەشـتودەران بـوو، کوڕی ڕۆژی تەنگانە و حازربەدەسـت و ئازا و شـارەزا بوو، بەرد بە بەردی ناوچەکە، تا دەگەیشـتە ناو سـنووری ئێرانیش شارەزا بوو. لە هەموو گوند و شـوێنێک دۆسـت و خزم و ناسراوی هەبوون. پێشمەرگەیەکی هەڵکەوتوو و کادری ڕێکخراوی سێی کۆمەڵە، لای ئەبوو شەهاب بوو.

## ڕابواردنی ناو کۆمەڵە

ڕۆژی دواتـر بە سـەیارە لە جادەی چوارتا نزیکیـان کردینەوە، بە نـاو ڕەبایـە و پەڕینەوە لە جادەی قیر و خۆماتکردن بە ڕۆژ و بە ڕێدا ڕۆیشتن بە شەو، دوای دوو شـەو گەیشتینە ئالان. دیوی ئێران خۆشتر بـوو، ئـالان پێشـمەرگەی تێدا مابوو. نەوەسـتاین و بـە گەورکایەتیدا خۆمـان گەیاندە مەنگوڕان، بازاڕێکی خۆش و پڕ لە کەلوپەلی قاچاخ و قاچاخچـی لە جانداران وەڕێ خرابوون، لە خەڵک و لە هەموو کاڵایەک جمەی دەهات، لە سەلاجە و تەلەفزیۆنەوەی تێدا بوو تا دەگاتە شمشی زێڕ. پڕ بوو لە پێشـمەرگەی دیموکرات. گوتیان، لە گاگەشـی مەقەڕی کۆمەڵەی لێیە. لەناکاو لەناو بازاڕی جانداران جیبێکی سـەرئاوەڵە هات سێ چوار پێشمەرگەی حیزبی لەسەر بوو. وردبوومەوە خدرەسووری لەسـەر بوو. خدر پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو، هەر لە دەسپێکی شۆڕشدا لە ڕەبەت لەگەڵ کاک سەید برایم و پێشمەرگەکانی سەردەشتدا دەبوو،

زۆر دۆســت بووین. دوای ئێمــە، ئەویــش وازی لە کۆمەڵــە هێنابوو، چووبووە ناو دێموکرات. باوەشــی پێدا کردم و زۆرمان لەیەک پرسی. ئەو دەیزانی لەگەڵ کاک کەریم دانشــیار و ســیامەندا ڕۆیشتووین بۆ عێــراق، نەیزانیبوو مــن چوومە ناو یەکێتی. خدر پێشــمەرگەی نیزامی و ئــازا بــوو، زۆری تاقەتــی تیۆری و ڕەخنە و کۆبوونەوە و شــتی وا نەبوو، زۆر دژی ئەو هەموو دیســپلین و توندوتیژی و دوورکەوتنەوە لە خواردنەوە و ڕابواردنی ناو کۆمەڵە بوو، دەیگوت بابە من بۆ کۆمەڵە دروســت نەکراوم، کۆمەڵە زۆر پاکە، حەیفە من پیسی بکەم. دێموکرات کە دەیانزانی چەند ئازا و شارەزای کاری نیزامییە، یەکسەر کردبوویان بە سەرلک. خدر گوتی؛ عەلی شوێنی خۆم دۆزیوەتەوە و هەرگیز پشت لــە کۆمەڵەش ناکەم و هەر دۆســتیانم. زۆری گــوت با بچین و میوانی ئەو بم. گوتم خدر نازانم چ قەوماوە و بەس دەڵێن دایک و بابم گیراون و خوشکم ئیعدام کراوە. دیارە بیستبووی و لەبەر من قسەی نەدەکرد، لە چایخانەکەی ناو بازاڕی جانداران لیســتی ٣٩ کەســی ئیعدامکراوی لاوی سابڵاغیان هەڵواسیبوو. ناوی نەرمین و چەند ناسراوی تێدا بوو. هەروەتر لیســتی ماڵــە ڕاگوازراو و گیراوەکانیش بــە دیوارەوە بوون، لەوێش ناوی باوکم دیتەوە!

گوتیــان، کاک کەریم قــادری و براژنە مریەمــی خێزانی لە گاگەش دەژین و مەقەڕی کۆمەڵە هەر ئەم دوانەی لێ بەجێماوە. لەگەڵ سالاردا ڕوومــان کــردە گاگــەش. دوور نەبوو چەنــد هەنگاوێک بــوو، دێیەکی دڵڕفێن و کوێستان، پڕ لە لەند و شیو و لێرەوار و گیاوگوڵی بۆنخۆش، زەمەنــدی پــڕ لە گیابەند و بیــزا، مەندۆک، کەما و خــاو هەر هەمووی تێکچــڕژاو و کوێســتانەکانی ئەو دەڤەرەیان ســەرتاپا ســەوزەپۆش و هــەزار ڕەنــگ کردبوو. زەنوێری پڕ لە شــلێر و بەیبوون و سوێســنە، وڵات سەرخۆش بوو بە بۆنی هەڵاڵان!

### بە تڕی بنگۆم نەچی

بە گەیشتنمان و دیتنەوەی ماڵەکەیان (مەقەڕ) کاک کەریم قادری و براژنە مریەم منیان لە باوەشــی برایانە و خۆشەویســتی گرت، یەکجار زۆر لەگەڵمدا بەســۆز بوون. زۆریان پرســیاری کاک کەریم دانشــیار و ســیامەند و خۆمیــان لــێ کــردم. دەیانزانی کاک کەریم و ســیامەند ڕەوانــەی ئەورووپا بوون. براژنە مریەم بە ڕەحمەوە دەیپرســی ئەدی تۆ بۆ لەگەڵیاندا نەچوویت؟! گوتم کەس یارمەتیی نەدام، دەبوو هێزێک، حیزبێک بەڕێت بکەن و کەس نەبوو، شــەرتیان هەبوو بە من جێبەجێ نەدەبوو. گوتی، ئەیاڕۆ عەلی گیان شــەرتی چی؟! ئیتر براژن گیان هیچ کارێک بە خۆڕایی ناکرێت، منیش پێم نەدەدرا و بۆم نەدەکرا. وازم لێ هێنا و ئێســتا لە لای برادەرانی یەکێتی گیرســاومەوە. گوتی، توو خوا ئاگات لە خۆت بێت، با لە هیچ و خۆڕایی و بێکەس بە تڕی بنگۆم نەچی. بەخــوا باجــی ڕەعنا بەرگە ناگرێــت و زۆر گوناحە، چــاوی پڕ بوو لە فرمێســک و دەستی بە گریان کرد. کاک کەریم چای داینێ و دەستمان بە جگەرەکێشــان کرد، دیار بوو خەبەری نەرمینیان زانیبوو، خەبەری گیرانــی بنەماڵەکانی پێشــمەرگە بــڵاو بووبووەوە. گوتــم خەبەرەکەم زانیــوە و لێم مەشــارنەوە، لە بازاڕی جانداران هــەردوو خەبەریان بە چایخانەکــەوە دابوو. ئــەوەم گوت هەردوو باوەشــیان بۆ کردمەوە و سەرەخۆشییان لێ کردم. گوتیان پێمان وا بوو نەتزانیوە.

### وڵات شڵەژابوو

حیکایەتی بیســتنی هەواڵەکان و وەرێکەوتنمان لە شــارباژێڕەوە بە پێیانــم بۆ کــردن. یەک دوو ڕۆژ لەو ماڵە بچــووک و فەقیرانە و پڕ لە گەرمیی باوەشــی خوشــک و برایانەی کاک کەریم و براژنە مریەم، بۆ من حەسانەوەیەکی پڕ لە خەم و دەرد و کەسەر بوو. وڵات شڵەژابوو، مەقەڕەکانــی پێشــمەرگە هەموو کۆ کرابوونەوە و تەنیا پێشــمەرگە بە گەڕۆکــی دەهاتــن و دەچــوون. خەبــەری شــەڕ و داگیرکردنی ناوچە

ئازادەکان بە دەستی پاسداران تا دەهات زیاتر و زیاتر دەبوو. کاک کەریم و براژنە مریەم دەبوو چۆڵی بکەن و بەرەو ناوەندی لە ئالان هەڵکشێن. ڕۆژانە جیپ و مینیبووس هاتوچۆی شاریان دەکرد، خەبەرێکم نارد بۆ دوکانی کاکم کە وا هاتوومەوە و نزیکم، بەڵکو کەسێکیان ببینم. شۆفێری مینیبووسەکە ئاگاداری کردمەوە، کە گوتوویانە سبەی بەیانی دایکم دێ بۆ زێوە. زێوە دێیەکی مەنگوڕان بوو لە نزیک مەهاباد لەسەر جادەی سەردەشت-سابلاغ. بەیانی زوو چووین بۆ سەرجادە و لە چایخانەی زێوە چاوەڕوانی مینیبووس بووین. پێشمەرگەی دێموکرات لە هاتوچۆدا بوون. مینیبووسێک بە تەپوتۆز پەیدا بوو، لەبەر چایخانەکە ڕایگرت، جووڵام و چوومە پێش، سەراپام بوو بە تۆز و خۆڵ، چاوم هەڵنەدەهات، لەپڕ دەرگای مینیبووس کرایەوە و گوێم لە قیژەی ژنێک بوو: «ئەی گیان ئەوەتا عەلی»! بە گریان و لەخۆدان باوەشی پێدا کردم و بە زمان بنهەنگڵ و جلەکانمی دەلێستەوە و تفەنگەکەمی ماچ دەکرد، هەموو مسافر و خەڵکی دێ و سەرجادەکە هاتبوونە تەماشای ئەم ژنە پیرە، پووره هاجەرم بوو خوشکی دایکم، بە هیچ جۆرێک لێم نەدەبووەوە، دایکم دی لە دواوە وەستاوە و بە چاوی گریان سەیرمان دەکات، هاتە پێش و گوتی هاجەر بەسە، عەلی لەوە زیاتر ناڕەحەت مەکە، عالەم هەموو چاوتان لێ دەکەن! ڕۆ بوومە دایکم و ئەویشم لە باوەش گرت، ژنێکی ئازا و بەورە بوو. هەر لەسەر قەراغ جادە و لەسەر خۆڵەکە دانیشتین و هەموو خەبەر و باسیان بۆ گێرامەوە. دایکم بەبێ ئیجازە لە دامغانەوە لەبەر خەبەری نەرمین، باوکمی بەجێ هێشتبوو و هاتبووەوە سابلاغ، خەبەری منی بیستبوو نزیکم، لەگەڵ پوورمدا هاتبوو. باوکم لە دامغان بە خەبەری ئیعدامی نەرمین سەکتەیەک لێی دابوو، هەر لەوێ بردبوویانە نەخۆشخانە.

دایکم گوتی ڕۆڵە دەبێ زوو بڕۆمەوە و جارێ هیچ مەعلووم نییە و دەڵێن ماوە، جەنازەیان نەداوینەوە، حەسەن دەمباتەوە بۆ لای باوکت و دوعا دەکەم درۆ بێت و نەرمین مابێت!

**گەر بمێنم تەنیا ئیی عەلیم**

ماوەیــەک لە قەراغ جادەکە دانیشــتین، دایکم پوولــی بۆ هێنابووم، دەیزانــی دڵم بــۆ خەبەرێک لــە دەزگیران و خۆشەویســتەکەم لە بەند دەکوڵێت. لەبەر پاراستنی لە زیندان کەس بە خەبەری ئێمەی نەدەزانی لەناو خزمان، هەر بۆیە پووریشم نەیدەزانی، دایکم لە فرسەتێک دەگەڕا باسێکی ئەویشم بۆ بکات. مینیبووس خەریکی جووڵە بوو بۆ لای شار، خەڵک ســوار دەبوون، هــەر نەکرابوو لە دایکم بپرســم. لە لایەک هەر نەکرا بە تەنیا بین و لە لایەکی تر لەبەر خەبەری نەرمین زۆرم شەرم دەکرد و پێم عەیب بوو لەو کاتەدا خەبەری بپرسم. بە هەناسەساردی دەستم لە ئەستۆیان کرد و چوون کە سوار بن، پوورم چووە سەرێ و دایکم گەڕایەوە بۆ لام. توند باوەشی پێدا گرتمەوە و لە بن گوێم گوتی پێش ڕۆیشتنمان بۆ دامغان چووم لە زیندان دیتم، گوتی پێت بڵێم: «من لەسەر عەهدی خۆمم و گەر بمێنم تەنیا ئیی عەلیم، ئەگەریش نەمام بە عەلی بڵێ بیر لە من نەکاتەوە و ژیانی خۆی بکات». بەخوا کوڕم قامکت لەســەر کچێک داناوە لە نەرمینم خۆشــتر دەوێــت، باوکت هەر زۆری خۆش دەوێت، شــوکور ئــەو حوکم دراوە و بە حەوت ســاڵ مەحکوم بــووە و دەبــێ چاوەڕێی کەرەمــی خولای بین و تــۆش نابێت هەرگیز فەرامۆشی بکەی. «زۆر مەردە ئەو کچە»! دایکم وای گوت بە گوێمدا.

هاتوهــاواری خەڵــک و هۆڕنلێدانــی شــۆفێر و زووکــە درەنگە، لە ئامێزی دایکمی کردمەوە و بە چاوەکانی پڕ لە ئەســرینی دایکم، پوورم و هەموو خەڵکەکە وا حاڵی بوون دڵی لێم نابێتەوە، بۆیە ئەوەندەی پێ چوو تا سوار بێت!

**باخەوانی بێسەمەر**

بە کوڵێک باری خەمەوە، بە کوورەی لە جۆشــی ئاورینگپڕژێنی دڵ و دەروونــم، بە سســتی و لەرزینی ئەژنۆکانمــەوە، ڕێمان گرتەوە بەر بەرەو گاگەش و ماڵئاوایی لە کاک کەریم و براژنە مریەم.

ئەوانیش و مەقەڕەکەی سەرووتریان لە گوندی کارگێ ئامادە بوون بۆ چۆڵکردن و بەرەو ئالان چوون. بێهیوایی و بێئومێدی لە دار و بەرد و لە نێوچاوانی هەموو مرۆڤەکاندا بە زەقی خۆی دەنواند. هەر دەڕۆیشتین و دێ بە دێ تووشی «لەشکری شکاو و تاجری کەشتی شکست و باخەوانی بێسەمەر» دەبووین. پۆل پۆل پێشمەرگەی دیموکرات و کۆمەڵە، لەو دێ بۆ ئەم دێ بەرەو پاشەکشە دەچوون و ڕۆژانە ناوچەی داگیرکراو و مۆڵگەکانی پاسدار لەسەر بەرزاییەکان ڕووی لە زیادبوون دەکرد. بەدەم ڕێگەوە لە جانداران بوو کە تووشی هاوڕێی کۆنم، شەهید کەمال عەلیار بووم.

بە دوو شەو و ڕۆژان و هەر بە پێیان گەیشتینەوە بێژوێ.

بێژوێ هەر وەک جاران پڕ لە حەشیمەت و سەرکردە و پێشمەرگە و مەقەڕات بوو. دیسان ماڵی کاک محەمەد مەلا عەلی.

### بەرەو سنوور

کۆمەڵە لە بێژوێ، تییەت، ئەشکان و مێشکەپە، کە هەموو سەرکردایەتیی حیزبە تازەکەیان؛ کۆمۆنیستی ئێرانی لێ بوو، مەقەڕات و خەڵکێکی زۆری هەبوو. هەرچی لەم چەند ساڵە لە قووڵایی ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە هەیبوو، هەر لە خەستەخانە، چاپخانە، خەیاتی، جبەخانە و مەقەڕی کۆمیتە ناوچەکان، زیندان، لە شۆفڵ و ماشێن و مۆلیدەی کارەبا و... ئەوەی بۆیان دەرچووبوو ڕایانگواستبوو بۆ ئالان لەسەر سنووری عێراق، واتا باشووری کوردستان. بە هەمان دەستوور حیزبی دیموکرات لە لای سەرووتر زۆربەی هێز و قورسایی و سەرکردایەتی لە گوندی بێتووش و چەند دێیەکی وەک، هەرزنە و دوولکان کۆ کردبووەوە. هەر هەموویان لە دوو هەنگاوی سنوورە ڕەسمییەکانی دەوڵەتانی ئێران و عێراق ئۆقرەیان گرتبووەوە. تەنانەت ڕێبوارێکی بێگانەش بە زوویی لەم کەشوهەوایە تێدەگەیشت، هەر هەموو ئامادەن لە کاتی هێرشی پاسداران بە قەڵەمبازێک بپەڕنەوە

ئەوبــەری ســنوور و لــە بەرامبەر هێرشــی مەغۆلئاســای پاســداران، پەنــا بەرنە بەر دەســەڵاتی دەوڵەتێکی وەک بەعــس، کە لەگەڵ ئێران و هەروەتر پارچەیەک لە کورددا لە شەڕدا بوو!

بێجگە لە دیموکرات و کۆمەڵە و دەفتەری مامۆســتا، هێزگەلی وەک موجاهیدینی خەڵق، ڕاهی کارگەر، چریکی ئەقەلییەت، چریکی ئەشرەف، ڕەنجبەران و خەڵکێکی زۆری دوورکەوتوو و دانیشــتوو لە حیزبەکان، هــەر هەمــووی میوانــی ئەم ناوچــە شــاخاوییە و خەڵکــە میواندار و میهرەبانەکەی بوون. لە هەموو ناوچەی ئالان تەنانەت چەند مەترێکیش ڕێگەی ماشــێن و سەیارەی نەبوو، لەم هەزاربەهەزارە تەنیا توولەڕێی شــوێن ســمی ئێســتر و ولاغانت دەدی، کە وەک نەقشەی مار و پەیژە بوون لەسەر تیرەگ و گەوە و لاپاڵی شاخەکان. بۆ ساتێک چاوت غافڵ بایــە دەکەوتیــە خوار و تا بنی دۆڵ و شــیوەکە خۆت بۆ نەدەگیرایەوە و هەپروون بە هەپروون دەبوویت. لە ڕۆژی چۆڵکردن و پاشەکشــەی هێزەکان بۆ ئەودیوی سنوور، خۆم بە چاوی خۆم خەڵک و ولاغم بینی چۆن کەوتنە خوار و تا لێواری چەمەکە نەگیرسانەوە.

## ٤٦

**دەنگوباسی تازە**

لـە بێژوێ تووشـی کۆمەڵێک لـە هاوڕێیانی پێشـمەرگەی ناوچەی مەهابـادی کۆمەڵـە بووم، وازیان لـە کۆمەڵە هێنابوو، سـەرگەردان و بێبەرنامـە ئـەو گوند بە ئەو گونـد دەخولانەوە. بە بینینـی یەکتر زۆر شـاد بوویـن، زۆریان پێ خوش بوو بزانن مـن چیم کردووە و بۆچی سـەرکەوتوو نەبووم لە ڕۆیشـتن و هاوڕێکانم کاک کەریم و سیامەند چۆن دەرباز بوون؟!

گوتم وا باشـە ماوەیەک لە بێژوێ لەگەڵ ئەم هاوڕێیانەدا بمێنمەوە و یارمەتیدەریان بم بۆ ئەگەری هاتنیان بۆ باشوور.

بە سـالارم گوت، وا باشـە ئـەو بگەڕێتەوە و بچێتـەوە لای ئەبوو شەهاب و منیش چەند ڕۆژێک لای ئەم هاوڕێیانە دەبم و دەگەڕێمەوە. زۆری پێ خۆش بوو، بەڵام نەیدەویسـت مـن بەجێ بێڵێت، دڵنیام کرد خۆم شـارەزام و بە تەنیاش نابم. نامەیەکم بۆ ئەبوو شـەهاب نووسی و باسـی ناردنەوەی سـالار و هەروەتر پاشەکشەی هێزەکانی کوردی ئێران و مۆڵگەیان لە ئالانم کرد و هەموو خەبەر و باسی ماڵێ و هێرشی دەوڵەت و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتم بۆ نووسی. بۆم نووسیبوو پێم باشە چەنـد ڕۆژێک لێـرە لە نزیکـەوە چاودێر بم و ئاگام لـە گۆڕانکاری و ڕووداوەکانـی ئێرە بێت. لێرە ڕۆژانە دەنگوباس تازە دەبێتەوە و ئاگام لە دنیا نابڕێت.

سالار بەرەو چوارتا ڕۆیشت و منیش بۆ قسە و باس و چ بکەین و چ نەکەین، لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەدا مامەوە!

ڕۆژانـە لـە کەبابخانـە و چایخانەکـەی بێژوێ، ئـەوەی بە خەونی شەوانیشمدا نەدەهات، دەمدیت. هەر لە دایکە پێشمەرگەوە کە هاتبوون

بۆ ســەردان یان بردنــەوە و تەســلیمکردنەوەی کوڕەکانیان، تا دەگاتە بازرگان و قاچاخچیی زێڕ و مەشرووبات.

ولاغدارەکانی ئــالان وەعەرز نەدەکەوتن و کەســابەتیان لە برەودا بوو، یان باریان دەگواســتەوە، یان خەڵکی پیر و پەکەوتووی بریندار و نەخۆش. کۆگای باری ولاغان بووبوو بە ســیمای دیاری بەر مزگەوت و دوکانەکانی بێژوێ، ڕۆژانە بە ملیۆن دینار و دۆلار و تمەن دەکڕدرا و دەفرۆشرا.

### پێشمەرگەی سەرگەردان

دەیــان هاوشــاری و کۆنەپێشــمەرگەی دێموکــرات و کۆمەڵــە بــە سەرگەردانی لەوێ بوون، تەسلیم بوونەوە و گەڕانەوەیان بۆ شارەکان پێ عەیبە و ملشــۆڕکردنەوە بوو. لە لایەک شەرم و ترس لە چوونەوە و خۆهاویشتنە بەر چنگی جەللادێکی خوێنمژی وەک کۆماری ئیسلامی و لــە لایەکــی تریشــەوە ســەختیی گــوزەران و بێپارەیــی و دنیای پڕ لــە کێشــە و بێپەنایی لەم شــاخ و کێــوە و نائومێدی لــە حیزبەکان و شۆڕشــێکی چەکداریــی تەریک و بێئاســۆ، لەناو ئەو دوو بەرداشــەدا خەریــک بوو وردوخاشــی دەکردن. زۆری تێدا بــوو بە هیوای ئازادی کوردســتان دەستی لە خوێندنی زانکۆ و تازەکارمەندی و دایک و بابی پیر هەڵگرتبوو، دەســتی دابووە چــەک بۆ ڕزگاری و خزمەت بە دایکی نیشتمان، بەهیوای گەڕانەوە بە سەربەرزی و لێدانی تەپڵی سەرکەوتن بەسەر ئەهریمەنی زەمانە و سەرچۆپیکێشی جێژنی ئازادی بێت، کەچی ئێستا بەسەر هەواری خاڵیدا کەوتووە و یەک بەدوای یەکدا دیرەکەکانی هیوا و ئومێدی تێکڕماو و شکاون.

### ئەوەم پێ قبووڵ نەدەکرا

دەبوو هەباســی برام ببینم، ئەو لە بێسیمخانەی کۆمەڵە لە ناوەندی بــوو، پەیامــم بۆ نارد ئــەوە لە بێژوێم و بــە زوویــی دەگەڕێمەوە بۆ

باشــوور. ناوەندی لە مێشکەپە بوو، هەر بۆ بەیانی هەباس هات. دوای هەواڵی دڵتەزێنی ئیعدامی نەرمین و گرتنی دایک و بابمان، هەردووکمان پێویستیمان بەم دیدارە بوو. هەباس زۆر لە نەرمین نزیک بوو، بەدوای یەکدا هاتبوون و زۆرتر هاوڕێ بوون. زۆر کز و غەمبار بوو، لەســەر ئــەم حاڵــەش نیگەرانی من بوو، زۆر دەترســا بە چەکــەوە و بە تەنیا لەنــاو ئەو هەموو ئاڵۆزی و کەس بە کەســییەدا دێم و دەچم. ڕاســتی دەکــرد، تەنیــا من بە چەک و ڕەختی خۆمەوە، هەر وەک پێشــمەرگەی جــاران دەردەکەوتــم، بەبێ ئەوەی ناســنامەی هیــچ حیزبێکم پێ بێت! زۆری حــەول دەدا بــڕۆم بۆ دەرەوە، لەگەڵ ناوەندی کۆمەڵەدا باســی کردبــوو؛ کــە ناکرێت عەلــی وا بە تەنیــا بمێنێتەوە و وا باشــە بەڕێی بکەن. گوتبوویان عەلی بەڕێ بکەین بە دەیان پێشمەرگە و دانیشتوو لە کۆمەڵەش چاوەڕوانیان دەبێت. با بێت لە دەوروبەری ناوەندی بۆخۆی دانیشــێت و دەیپارێزیــن. مــن هەرگیز ئەوەم پێ قبــووڵ نەدەکرا بەبێ ئیشوکار لە دەوروبەری سەرکردایەتی دانیشم و هیچ نەکەم!

یــەک دوو ڕۆژ هەباس لام مایەوە و زۆرمان باس لە وەزعی خۆی و خــۆم و کۆمەڵــە کرد. هیچمان بۆ نەدەکرا، نە من دەگەڕامەوە بۆ ناو کۆمەڵە و نە ئەو وازی دێنا، نە هیچمان بۆ دەکرا دەربارەی ماڵەوەمان لەو دۆخە پەرێشانەی، کە ئێمە سەبەبکاری بووین.

### گرتنی ئالان

چەند ڕۆژێک لەگەڵ کوڕەکانی دانیشتووی کۆمەڵەدا لە بێژوێ بووم و زۆرمــان قســە و بــاس و چی بکەین کــرد. بەیانییەک لەنــاکاو ڕزگار خەبەری هێنا لە هۆملی پشــت بێژوێوە هێرش بۆ ســەر ئالان دەستی پێ کردووە، هەر واش بوو، دەنگی تەقە و تۆپ و هاوەن دەهاتە ناو دێ. چەند پێشمەرگەیەک ڕۆیشتبوون بۆ پێشگرتنیان، ئاڵۆزی و هەرچیوپەرچی بە هەموانەوە دیار بوو، هەر کەســە قســەیەکی دەکرد، هەر زوو دەرکەوت هێــزەکان بەتەمای بەرگــری نین و زۆر زوو ئالان بەدەســتەوە دەدەن.

هەرچی هێزی کۆمەڵە بوو خەریکی ڕاگواستن و لە فیکری دەربازبوونی سەرکردایەتی و خۆیاندا بوون. موجاهیدین تەواو شێوا بوون و هەموو شتەکانیان بۆ دەرباز نەدەبوو. کەلوپەلی زۆریان لە ڕووباری کەڵوێ هاویشت و زۆر شتیان تەقاندەوە. خەڵکی دیکەش، هەر کەسە سەری داخستبوو، شۆڕ دەبووەوە بەرەو تییەت و سەر چەمەکە.

بە کەمال و سولەیمان و چەند کەسی تری دانیشتووی کۆمەڵەم گوت وەرن دەتانبەم بۆ ئەودیو و لە دێهاتی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دەحەوێنەوە. وەڕێکەوتین دێ بە دێ بەرەو چەم برۆین، تەنیا من چەکم پێ بوو. لە یەک دوو شوێن تووشی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و دەفتەری مامۆستا و ئەوانی دیکە بووین، لە هۆملەوە لە دوورەوە دەماندیت شەڕ و هاتنەپێشی هێزەکانی حکومەت و هاوەن و تۆپبارانی خەست بەردەوام بوو. هیچ بەرنامەیەکی ئەوتۆی داڕێژراو نەبوو بۆ ئەوەی خەڵک و پێشمەرگە بە ڕێکوپێکی و شێنەیی پاشەکشە بکەن، هەر کەس بۆخۆی بوو. کەس بەرنامەی نەبوو بۆ کوێ دەبێت بچن، هەموویان تەنیا یەک شتیان دەزانی؛ بەرەو چەم و پەڕینەوە و کوردستانی عێراق!

### کەوتنەخوارەوەی هێسترێک

بەرەو تییەت، ئەو چەند کەسە بە تووڵەڕێیەکی شوێن سمی وڵاغاندا بە پاڵ یاڵێکەوە دەڕۆیشتین، کاروانی وڵاغدارانی موجاهیدینی خەڵق بە باری ڕادیۆکەیان و چەکدارەکانیان لە پێشمان بوون، لەناکاو جسمێکی گەورە خلۆر بووەوە بۆ خوارێ و تەپوتۆز بڵیند بووەوە. نزیک بووینەوە، کابرای وڵاغدار دەگریا و جەماعەتی موجاهیدینیش دەسەبەئەژنۆ لە سەر ڕێیەکە دانیشتبوون و چاویان لە دۆڵەکە و گوێیان لە هاژە و گرفەی چەمەکە گرتبوو، دوای سڵاو و ماندوونەبوونی، دیار بوو ئێسترێکیان بە بارەوە هەڵدێردرابوو، تا ناو چەمەکە نەگیرسابووەوە. کەسمان هیچمان پێ نەدەکرا!

بە پاڕانەوە و پارە، بە کەڵەس پەڕاندیانینەوە بۆ ئەوبەری چەم، لە

شــوێنک دەیانپەڕاندینەوە لــە خوارووی تییەت، لەناو خاکی باشــوور، گەروویەکی چەو و خڕکەبەرد بوو، کە بە ساڵیانی زۆر ئاو دایدڕیبوو، وەک داڵانێکی لێ کردبوو، بە ملیۆن گاشــەبەرد و خڕکەبەرد ڕۆیشتنی بەســەریاندا گەلێک زەحمەت کردبوو، هــەر بەم دۆڵەدا دوای ماوەیەک جادەیەکــی ڕوخــاو و وێران هەبــوو، کە دەچــووەوە گەلاڵە و قامیش. هەمــوو ئــەم دێیانــە لە لایــەن ڕژێمی عێراقــەوە دوای پێکگەیشــتن و مۆرکردنی پەیماننامەی شــوومی ئەلجەزایر لــە نێوان ئێران و عێراقدا، ڕووخاو و وێران کرابوون.

**ڕادیۆکەی دێموکرات**

لــە نزیک گەلاڵە پردێکی کۆنکرێتیی جادە تەواونەکراوەکە هەبوو، تا ڕادەیــەک پــان و دووورودرێژ بوو، کۆمەڵە باروبنــەی لەوێ بە عەرزدا دابوو. دەفتەری مامۆســتا لە ســەرووتر یەک دوو خێمەی بۆ مامۆستا و منداڵانــی لــێ دابــوو، کەمێــک ئەولاتر حیزبــی دێموکــرات خەریکی چادرلێــدان و دامەزراندنــی ڕادیۆکەیــان بوون. لە پانتایــەک کەمتر لە کیلۆمەترێک سەدان کەس و چەندین حیزب و هێزگەل پەنایان گرتبوو، دوای ئەو هەموو ســاڵە ئاخر نوقتــەی ناوچەی ئازادی ڕۆژهەلات واتا ئالانی مەکۆی جوانی و خزمەت بە لێقەوماو و پێشــمەرگەمان لە پشت ســەر بەجێ دەهێشــت و بە یەکجاری لە خــاک و وڵاتی خۆمان دوور دەکەوتینــەوە. ئەو پێیەی کە بڕیم لەو خاکە، ئەوە ئێســتا بۆ ســیوپێنج ساڵ دەچێت، نەکرا بۆ تەنیا هەنگاوێک و چرکەیەکیش پێی تێبنێمەوە!

مــن دەیــان جار بــەو ســیمە نەفرینلێکــراوەی، لــە دوورەوە بۆنی مەرگ و کارەســاتی لێ دەهات، لەمدیوی ســنوور بۆ ئەودیو خۆم پێ هەڵاوەســیبوو و پەڕیبوومەوە، ئــەوێ ڕۆژێ هەرگیز بە بیرمدا نەهات و بە خەونی شەوانیشــمدا نەدەهات ئەوە دەبێتە ئاخر جارم و ئیتر من بــۆ ئــەم خاکەی باب و باپیرانــم دەبمە بێگانە و دوژمنەکانیشــم دەبنە خاوەنماڵ!

### بەرد لە جێی خۆی سەنگینە

ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە دەزانم برینی ئەم دابڕانە چەند بە سۆ و ئازارە و کورد گوتەنی؛ بەرد لە جێی خۆی سـەنگینە و هەر ئەوەندە هەڵقەندرا، ئیتر ئەم قورساییەی جارانی نامێنێت!

زۆر جـاران بیـر دەکەمـەوە و بە خۆم دەڵێم؛ باشـە مـن بە خۆم ڕادەپەڕمووم و دەزانم هەرگیز بۆنی ئەم خاکە فەرامۆش ناکەم، دواتر دەڵێـم ئەدی کێ دەڵێت ئـەو منی لە بیر دەمێنێت و ئەو ڕۆڵەیەی خۆی لە یاد ناکات، دوای ئەو هەموو ساڵە تۆ بڵێی بمناسێتەوە و جارێکی دی لە باوەشم گرێتەوە؟!

ئەوێ سـەعات و ڕۆژێ، من لەبەر کوێرەوەری، بێکەسی، غەمباری و بێلانەیـی خـۆم، دەڕۆیشـتم ئۆغـر و تەنانەت ئاوڕێکم نـە لە دایکی نیشتمان و نە لە دایکی خۆم دایەوە و لەژێر زنجیر و کۆت و کەڵەمەی داگیرکەری دڵ پڕ لە قین، بە تەنیا جێم هێشتن!

برسـێتی و ڕێگەڕۆیشتن برسـتی لێ بڕیبووین، نە ماڵە جوتیارێک، نـە مزگەوتێـک و نـە چایخانەیەکـی سـەر ڕێ بوونیان هەبـوو. تەنیا پێشمەرگەی حیزبەکان و سەدان باری بە عەرددادراویان بەدی دەکرا، ئەوان بەشـی خۆیان شـتومەک و پێخۆریان پێ بوو، دەماندیتن لە پەنا پـرد و دارسـتان پشـوو دەدەن و نان و چـا دەخۆن، بە تەنیشـتیاندا گوزەرمـان دەکـرد و پێمان عەیب بوو لادەین، یـان داوای خواردن لە لەشـکری شکاوی پێشمەرگەی حیزبەکان بکەین، بە تایبەت بۆ لادان لە لای پێشـمەرگە و مەقەڕەکانـی کۆمەڵە زۆرمان پـێ عەیب بوو، ئەوان وەک دانیشـتوو و چەکدانـان چاویـان لە ئێمە دەکرد و لایان پەسـەند نەبووین.

### لەگەڵمدا نەبیت، دوژمنمی

لەناو کولتووری حیزبە سیاسـییەکان و بـە تایبەت ئەوانەی وڵاتی ئێمـە، دیـاردەی «لەگەڵمدا نەبیـت، دوژمنمی» بەداخەوە تا ئێسـتاش

حوکـم دەکات. ئێمــە هەمان کوڕە باش و ئازاکانــی دوێنێی ناو کۆمەڵە بووین و لەسەر هەڵوێست یان هەر شتێکی دی، تەنانەت ماندوو بووین و ئەمــڕۆ لەگــەڵ کۆمەڵەدا نەماویــن، یان جیاوازیــی بیروباوەڕمان لا دروست بووە، یەکسەر دەخراینە ڕیزی دوژمن تا ئەو ڕادەیەی نەکرێ داوای قومێـک ئاویان لێ بکرێـت. تەنانەت ئەمڕۆش، ئەو کولتورە هەتا سەرئێسقان بەرگری لە تیۆری سەقەت و نامرۆڤانەی «لەگەڵمدا نەبیت، دوژمنمی» دەکات.

دەبــوو ڕێ ببڕیــن و خــۆ ڕزگار بکەیــن و دوور بکەوینــەوە لــە دامەزرێنەرانــی بــەردی بناغــەی ئۆردووگاکانی پێشــمەرگەی کوردی ڕۆژهــەلات، بۆ ماوەیەکی دووروودرێژی دەیان ســاڵە. ئەو ڕۆژە کە بە تەنیشــت ئەو دار و خێمانەی هێشــتا هەڵنەدراوی یــەک بەدوای یەکی حیزبەکانــدا لــە ســەفرە و زەروون، گــوزەرم دەکــرد و بــە لاچاوێک سەیریان دەکردم، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە ئەوە دەبێتە دەسپێک و بناغەدانانی کەمپ و ئۆردووگای پێشــمەرگەکان لە وڵاتێکی دراوسێ و تەنانەت ڕۆژ بە ڕۆژ دەگوازرێنەوە بۆ قووڵایی خاکی باشوور!

هەردوو هاوڕێی ســەفەرم کەمال و ســولەیمان، لەگەڵمدا هاودەنگ بــوون لە هیچ کام لەو کۆگایانەی پێشــمەرگە و حیزبــەکان کە بەدیار شتومەکی ڕاگوازراوی مەقەرەکانیان لەسەر جادە خۆڵەکە دانیشتبوون، لانەدەین و تەنانەت ورکەنانێکیش داوا نەکەین.

بــەرەو گەلاڵە و هەموو گونــدە خاپوورکراوەکانی ئەو دەڤەرە، ڕێی پڕ لە هەوراز و نشــێومان گرتە بەر، بە برســێتی و سستی هەنگاومان دەنا. بۆ من حەوت مەخزەن و تفەنگەکەم بووبوونە بەشێک لە جەستەم و لێک جیا نەدەکرانەوە و بۆ ساتێکیش ئامادە نەبووم لە خۆمیان دوور بخەمەوە.

### ئاوایی سەرگەڵوو

ئێـوارە درەنـگ، بە توولەڕێیەکی پڕ لە دارسـتان و چنار و کانی و ئاوەوە گەیشـتینە ئاوایی سەرگەڵوو، شـوێنی مەڵبەندی دووی یەکێتی نیشـتمانی. لـە ماڵی کاک مسـتەفا سـەرگەڵوویی، پێشـمەرگەی کۆنی یەکێتـی لامان دا و بە تەواوی حەسـاینەوە، میوانداریيەکی گەرموگوڕ کراین. سـەرگەڵوو پڕ بوو لە ئاشـنا و پێشمەرگە و بەرپرسی یەکێتی، کە هەموویان بۆ من دۆست و هاوڕێ بوون.

### مامڵێ بوو بە کێشە

سولەیمان و کەمال بەنیاز بوون لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا شوێنێک ببیننەوە و لە یەک لەو گوندانە ماڵ دانێن، دوور لە حیزبایەتی، بۆ خۆیان بژین و چاوەڕوانی قەزاوقەدەر و ڕووداوەکان بکەن. خەڵکی باشوور هەر ئەوەندە دەیانزانی سولەیمان خزمی هونەرمەند محەمەدی مامڵێیە، زۆریان ڕێز لێ دەنا و چاوەڕوان بوون یەکسەر گۆرانییان بۆ بڵێـت. هەرچی دەیگوت بابە من دەنگم خۆش نییە و دایکم خێزانی کاک محەمەدە، فایدەی نەبوو. دەیانگوت ئیلا تۆش دەنگت خۆشـە و دەبێت بۆمان بڵێی!

سـولەیمان کوڕی شەهید ئەسـعەد خودایار بوو، یەک لە چالاک و کادرەکانی ساڵانی ١٩٥٠ و زیندووکردنەوەی حیزبی دیموکرات، دواتر دێتە ناوچەی قەڵادزێ و لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق و سـولەیمان موعینی و سـەدیق ئەنجیریدا وەک کادرێکی حیزبی دیموکرات لە تێکۆشاندا بوو، ئەحمەد تۆفیق گومانی لا دروست دەبێت و لە نزیک سونێ بە پیلانێکی ناجوامێرانـە و دوور لە ئەخلاق، لە ناوچەی ژێردەسـەڵاتی شۆڕشـدا تیـرۆری دەکـەن. خێزانـی، باجی ئامیـن بە خـۆی و دوو منداڵەوە کە یەکیان سـولەیمان بـوو، گەڕانەوە بۆ مەهاباد. دواتر شـووی بە کاک محەمەدی مامڵێ کرد.

ئەوان لە بناری ئاسـۆس لە ناحیەی مەرگە ماڵێکیان بە کرێ گرت،

مەمەد حەسەنخاڵیش لەگەڵیان کەوت، بۆ ماوەیەکی لە مەرگە بەیەکەوە نیشتەجێ بوون. مەرگە دەکەوتە نزیک ئاوەژێ، کە تازە بووبوو بە شوێنی مەقەڕی کاک نەوشیروان و زۆر جار سەر ڕێ و گوزەرم بوو. زۆربەی پێشمەرگە و ناسیاوەکانمان کە لە کۆمەڵە دادەنیشتن، سەردانی ئەو ماڵەی سولەیمان و مەمەد و کەمالیان دەکرد و منیش زوو زوو بۆ سەردان دەچوومە لایان.

# ٤٧

## لە خەیاڵێک زیاتر

دوای هاتنــەوەم بــۆ باشــوور و ماڵئاوایی لە کەمال و ســولەیمان، لە ســەرگەڵووەوە گەڕامەوە قەیوان بۆ لای کاک ســەلاح چاوشــین و لەوێشەوە بە ڕێیان کردمەوە بۆ لای ئەبوو شەهاب لە دۆڵپەموو.

دوای ئــەو ســەفەرە پــڕ لــە هــەوراز و ڕۆیشــتنە، بــە پێیــان لــە شــارباژێڕەوە بــۆ مەهابــاد و ئەوجــار گەڕانــەوە، وردەوردە وڕ و کاســی بەری دەدام و حاڵی دەبووم، چی بەســەر خۆم و کەســوکارم هاتووە! تووشــی ڕاچڵەکانێک بووبووم، ئــەوەی بیرمان لێ دەکردەوە، کە لــە ماوەیەکی کورتدا کۆماری ئیســلامی و خومەینی دەڕوخێنین و بە ســەربەرزی دەچینــەوە و هەموو ئازادی و مافەکانمان دەســتەبەر دەکەیــن، ئــەو حکومەتە بەرگەی ســێ ڕۆژ ناگرێت، جگــە لە خەون و خەیــاڵ و لێکدانەوەیەکی ســادە، هیچــی دیکە نەبووە. ڕاســتی ئەوەیە شۆڕشــێک کراوە و حکومەتێکی کۆنی وەک پەهلەوی ڕووخێندراوە و یەکی پیستر و جەللادتر و زۆر دوور لە بنەماکانی ئینسانی و مافەکانی مرۆڤ، ئیســلامێک بە تامی ســەردەمی جاهیلییەتی ســەردەمانی زوو، جێگیر کراوە، بۆ کردن بە قەڵغانێک دژی سۆڤییەت و کۆمۆنیستی. بەم زوانــە دەســتبەرداری نابن و زۆریان کار پێیەتــی، ئێمەش تازە دەبێت یان ئەوەتا لەسەر دەستی ئیسلام تۆبە بکەین و بگەڕێینەوە باوەشیان، یــان دەبێــت ژیانی ئاوارەیی و دوور لە نیشــتمان هەڵبژێرین و خۆمان ئامادە بکەین، بۆ ساڵیانی ساڵ ڕووی گەشی دایکی نیشتمان نەبینینەوە. من ڕێگەی دووەمم هەڵبژارد و بۆ یەک چرکە تەنانەت بە مێشکیشــمدا نەهات بگەڕێمەوە ناوشار و پشت لە هەموو خەون و ئامانجەکانم بکەم.

**سێبەری یەکیتی**

دیســـان باوەشی گەرمی پێشمەرگەکان و ئەبوو شەهاب بە ڕوومدا کرایەوە و بە گەیشـــتنەوەم وام هەســـت کرد گەڕاومـــەوە ماڵی گەرمی خۆم. لەو ماوەیەدا ئەبوو شـــەهاب، ســـروەی هاوسەری گواستبووەوە و ماڵیـــان هەر لـــە ناو مەقەڕ بوو. پیرۆزبایـــی گەرموگوڕم لێ کردن و دیار بوو ئەبوو شـــەهاب، زۆر باســـی منی بۆ سروە کردبوو، بەڕاستی سروەش بۆ من وەک خوشکێک وا بوو و ئێستاش هەر وایە.

بـــە درێژایی مێژووی پەیوەندیم لەگەڵ یەکێتیـــدا، هەرگیز ئیلتیزامی حیزبیـــم نەبـــووە و ئەوانیش چاوەڕوانـــی ئەوەیان لێ نەکـــردووم. من کەســـێکی عەزیـــز و جێی ڕێزبووم بۆیـــان و ئەوانیش بۆ من هەروەتر، بۆیـــە لـــە کۆبوونەوە فەرمـــی و کۆنفرانســـەکاندا بەشـــداریم نەدەکرد، ئـــەوکات من تەنیا ســـەرپەنایەکم دەویســـت و ئەوان بۆ من باشـــترین بوون. هەمیشـــە لـــە بەرچاویان بوو کە کاتی خۆی لـــە ٧٩-١٩٧٨ ئێمە یارمەتی و دۆســـتایەتیمان کردوون و ئێســـتاش ئەوە منم پێویستیم بە یارمەتیی ئەوانە. ئەوەندەشم دەزانی لەناو هەر کۆمەڵگە و خەڵکێکدا بۆ ئـــەوەی ســـەربار و زیادە نەبیت، باش وایە بـــۆ تێربوونی ورگیش بێت ئەوەنـــدە کار و جووڵـــە بکەی و خـــۆت دوور نەگری لە ئەرکی ڕۆژانە، بە تایبەت لەناو پێشـــمەرگە، کە هەر هەمووی خۆبەخش بوون، دەبوو خۆیـــان لێ جیا نەکەیتەوە. ئێمە لە کۆمەڵە بەوە ڕاهاتبووین هیچمان لە هیچمان زیاتر نیین و دەبێت لە حەرەســـیات و خەفەریات و ئەرکەکانی نـــاو مەقەڕ و چەکهەڵگرتن و کەمیـــن و هاتوچۆدا هاوڕەنگی جەماعەت بیـــن، لە لایەکی دیکەوە بـــە ئەزموونی خۆم دەمزانـــی ئەوانەی خۆیان جیا دەکەنەوە، یان لە شەڕ و کەمیندەرکردن خۆ وەدواوەدەخەن، زۆر خۆشەویست و لەبەردڵانی ئەوانی دی نابن!

## حەمەجەزا دەنگ و خواردنی خۆش

لە شەڕەکانی جود و پارتی، پیکابێکی شینی بەرزی تۆیۆتا کەوتبووە دەستی پێشـمەرگەکانی مەقەڕەکەی ئەبوو شەهاب. سەیارەیەکی زۆر تۆکمە و توندوتۆڵ بوو، بە دار و بەردیدا سـەردەکەوت، بۆ ئەم شاخ و کێوە زۆر باش بوو، زۆر جاران لەگەڵ ئەبوو شەهابدا پێی دەچووین بۆ ئەملا و ئەولا؛ بۆ قەیوان لای کاک سەلاح، بۆ چنگیان لای کاک وەهاب و کاک ئاوات، لای کاک دانا و شۆڕش ئیسماعیل، یان ئەوەتا دەچووین بۆ باراو لای کاک حەمەجەزا و هاوسـەرە میهرەبان و دەسـترەنگینەکەی، هەمـوو لە زمان کاکە حەمەوە پێمان دەگوت «خەپە». کاک حەمەجەزا بۆخۆی دەستی بالای هەبوو لە لێنانی خواردنی زۆر خۆش و بە دەنگە زولال و هەسـت بزوێنەکەیەوە، زۆر جاران تا بەیانی لەم شاخ و کێوە میوانداریيەکی وەها گەرمی لێ دەکردین، ئەوە زیاتر لە سـیوپێنج ساڵە بیر ناچێتەوە!

حەمەجـەزا لـەو هونەرمەندانە نەبوو کە دەبوو هەمیشـە دەعوەت بکرێن و بە ئەرکی خەڵکی دەزانن خزمەتکرێن و لای سەرەوە دابندرێن، بەڵکـو ئـەو خـۆی زۆر حەزی لـە میوانـداری و خزمەتی دۆسـت و هاوڕێیانـی دەکرد، دەسـتودڵێکی ئاوەڵە و سـەغیتەبیعەتی هەبوو، لەو هونەرمەندگەلـە نەبوو کە تەنیا دەعوەت دەخۆن و کەس لە دەسـتیان نـان ناخوات، بە پێچەوانەوە ئەو سـفرەی ماڵـەوەی زۆر ئاوەدان و پڕ بوو.

## حەولی دروستکردنی حزبی تازە

لەو ماوەیەدا لە دۆڵپەموو، دەمبیسـتەوە تێکۆشەران و پێشمەرگەی دیموکـرات و کۆمەڵـە دوای پەڕینـەوەی هێزەکانی کـوردی ئێران بۆ خاکی باشوور، گلەیی و گازەندەیان زۆرە و دادەنیشن، هەر کامیان بە هۆیەکی حیزبی و تەشکیلاتی، یان بەرنامە و ئایدیۆلۆژی، لە حیزبەکان جیـا دەبنـەوە. حەولی دروسـتکردنی حیزبـی تازە هەبوو، بە قسـەی

خۆیان بۆشایی نێوان دیموکرات و کۆمەڵە هەیە و دەبێت پڕ بکرێتەوە. زۆربەیـان دەهاتن بۆ لای یەکێتی و حەولی دیتن و دانیشـتنیان لەگەڵ مـام جەلال یـان کاک نەوشـیروان دەدا. لـە لایەکی دیکـەوە هەرچی تودەیـی و کۆنگرە چواری و چریکی ئەکسـەرییەتی هەبـوو، لە تاران و شـارەکانی ئێران دوای ئەو هەمـوو هاوکارییەیان لەگەڵ ڕژیمدا، کە کاری پێیـان نەمابـوو ڕاوی نابوون و زۆربەیانـی زیندانی یان ئیعدام کردبوو، بەشێکیان دەرباز بووبوون بۆ باشوور و پەنایان بردبووە لای حیزبی شیوعی و پارتی.

### کاک نەوشیروان بانگی کردم

ڕۆژێک، کە لە ئاوەژێ بووم، کۆمەڵێک لەو برادەرانەی دیموکرات و کۆمەڵەم دی، هاتبوون و داوای یارمەتییان لە کاک نەوشـیروان دەکرد بـۆ دروسـتکردنی حیزبێکی تازە. قسـەم لەگەڵدا کردن و پرسـیاریان کـرد مـن چ دەکەم؟! گوتم لە لای یەکێتی جێ و ڕێم هەیە، بڕواشـم بە حیزبی تازە نییە و بەم کەسـایەتییانەش بۆمان دروسـت ناکرێت! ئەی وای تێـدا بـوو تا دوێنێ هەتا سـەر ئێسـقان دژی دیموکرات بوو، یان کۆنـە کۆمەڵە وتاری دەنووسـی لە ڕادیۆ دیموکـرات بە دژی کۆمەڵە، دیموکراتی تێدا بوو لەسـەر قسەیەک بە دوکتۆر قاسملوو لێت ڕادەسا و ئێسـتاش ئەوە لە لای کاک نەوشـیروان دەڵێت دوکتـۆر دیکتاتۆرە. زۆرێک لەم خەڵکانە، تاکە شت، بێزارییان لە دیموکرات و کۆمەڵە کۆی کردبوونەوە. کە ڕۆیشـتن کاک نەوشیروان بانگی کردم و گوتی، عەلی ئەوانـە کێـن و بۆ وازیـان هێناوە؟! ئەوەی دەمزانی و پێم ڕاسـت بوو بـۆم بـاس کرد و بە ڕاشـکاوی گوتم ئەمانـە نـە ئاڵتەرناتیڤی حیزبی کۆمۆنیسـتی ئێرانن و نە حیزبی دیموکرات! قسـەکەمی بەدڵ بوو، دیار بـوو هەرچەنـد زۆر بە حیزبی کۆمۆنیسـتی ئێران تـوورە بوو، بەدڵ حەزی دەکرد هەڵوەشـێتەوە، بەس هیچ یارمەتیی ئەو خەڵکانەی نەکرد و هیچ وەعدێکی پێ نەدابوون. بۆ ناوچە ئازادکراوەکانی ژێردەسەڵاتی

یەکێتـی بڵاوەیان کـرد و زۆربەیان لە کاریزە، یـەک و دوو بەیەکەوە ماڵیـان دانـا. دواتر زۆربەی ئەوانـە بە هیممەتـی کاک ئەمیر قازی لە سـویدەوە بە یارمەتیی سەرداری جاف، کە ئاوەڵزاوای بوو، لە ڕێگەی بەغداوە گەیشـتنە ئەورووپا و چەند کەسێکیان لە ڕێی تورکیا گیران و چەندێکیش خۆیان تەسلیمی ئێران کردەوە.

### ئەوەی بیرم ناچێتەوە

یـەک لـەو شـتانەی هەرگیـز بیـرم ناچێتـەوە کوڕێکـی فەقیـری پێشمەرگەی کۆمەڵەی ناوچەی بۆکان بوو، دێ بە دێ پرسیبووی تا لە دۆڵپەموو هاتە لام، گوتی لە لای تۆ دەبم و هەرچی تۆ بڵێی وا دەکەم. زۆرم حەول دا بڕواتەوە ناو کۆمەڵە، ڕازی نەبوو. دەیگوت لە کوێ بی لـەوێ دەبم. تاهیر لە مەقەڕی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە دۆڵپەموو لامان مایەوە و پێشـمەرگەیەکی زۆر خۆشەویست و لەبەردڵان بوو. هەموو جەماعەت دەیانگوت «پێشـمەرگەکەی کاک عەلی». دواتر کە من لەوێ نەمابـووم و ڕۆیشـتبووم، لەگەڵ ڕزگاری ژنبرای ئەبوو شـەهابدا، کە بووبوونە هاوڕێ، دەچن بۆ سەردانی ماڵی بابی لە ناوچەی بۆکان، زۆر بەداخەوە هەردوو لە نزیک بۆکان، دەکەونە کەمینی جاش و پاسدارەوە و هەردوویـان شـەهید دەبن. لە سـاڵانی دوای دووهەزارەکاندا، کە لە سلێمانی بووم، یەک دوو جار بە هۆی هۆشیاری برا گەورەی سروەوە، باوکـی لـە بۆکانەوە هـات بۆ لام، بـە یارمەتیی دەزگای شـەهیدان و شاهیدیدانم لەسەری و هێنانی وەرەقەی پشتگری لە ئەبوو شەهابەوە، بە یارمەتیی کاک شۆڕش ئیسماعیل و شێخ کامیل لە دەزگای شەهیدان، مووچەیەکی باش بۆ ئەو کات، وەک پێشمەرگەی شەهیدی بۆ بڕایەوە، وەک بزانم ئێسـتاش هۆشیار لەگەڵ شـەهیدانەی ڕزگاری برایدا، بۆی وەردەگرێت و بۆی دەنێرێت.

### کەرەپیاو یان کەڵەپیاو

هەر لەو سەروبەندەدا بوو، لەگەڵ ئەبوو شەهاب چووینە لای کاک نەوشیروان، یەک دوو ڕۆژ ماینەوە، ڕۆژێکیان چەند سەرۆکعەشیرەت و پیاوەماقووڵی خۆشـــناوەتی هاتن و کاک نەوشـــیروان لەگەڵیاندا زۆر بە ڕێزەوە دەجووڵایەوە. لە بەڕێکردنیان لە بەر مەقەڕەکەی لە ئاوەژێ بە پیاسە لەگەڵیاندا تا سەر جادە چوو، ئێمەش لە پشتەوە لەگەڵ چەند کەسێکیاندا دەڕۆیشتین. یەکیان بە زاراوەیەکی خۆشی هەولێری گوتی: بەخـــوا برا ئەم نەوشـــیروانە عەجەب «کەرە پیاوەێکــە»! یەکەم جارم بوو شـــتی وا ببیستم و هەر سەرم لێ سووڕ مابوو چۆن لە بەرچاوی ئێمە وا بە کاک نەوشـــیروان دەڵێت؟! هێندەی نەمابوو بەگژیدا بچمەوە. ســـواری ســـەیارەکانیان بوون و ڕۆیشتن. لە گەڕانەوەدا بۆ لای مەقەڕ گوتم؛ کاک نەوشـــیروان یەکیان زۆر بێحورمـــەت بوو! گوتی، بۆ عەلی ئەوانـــە زۆر پیاوی گەورە و دەسڕۆیشـــتووی ناوچەی هەولێرن! گوتم ئاخر گوێت لێ نەبوو لە پێشـــێ دەڕۆیشـــتی یەکیان گوتی نەوشـــیروان «کەرەپیاوە»! پێکەنی و گوتی جا ڕۆڵە خۆ تاریفی کردووم. ئەوەندەی دی ســـەرم لێ ئەســـتوور بوو، خەریک بوو چاوەکانم دەرپەڕێن! گوتی ئـــەوە نەیگوتـــووە «کەرەپیاو» گوتوویەتـــی «کەڵەپیاو» لـــە لەهجەی هەولێـــر «ڵ» دەکەنە «ر». ئەوجار کە بە کەســـێک دەڵێن «کەڵەپیاو» ئەوە ئێتر ئەوپەڕی ئازایەتیی ئەو کەسە دەگەیەنێت!

### لە بەرزایی شاخ دەترسێ

کاک نەوشیروان، بە ئەبوو شەهابی گوت چەند سەر حەیوان بکڕن و لەگـــەڵ عەلیـــدا بە ئاسۆســـدا بچن بـــۆ گەلاڵە و قامیش و ســـەردانی هەموو هێزەکانی کوردی ئێران بکەن. لەگەڵ پێشمەرگەکانی دەستەکەی ئەبوو شـــەهابدا دە ســـەر حەیوان کڕدران و بە پشـــت ئاوەژێ و کانی توودا ســـەرکەوتین بۆ ســـەری ئاســـۆس. لە ڕێگە من و ئەبوو شەهاب زۆر بەکاوەخۆ دەڕۆیشتین، هەموو بەجێیان هێشتین و لەسەر ترۆپکی

ئاسۆس چاوەڕوانیان دەکردین. چەند هەنگاوێکمان مابوو بۆ سەر لووتکەی شاخ، لەناو بەردەلانێکی سەختدا ئەبوو شەهاب بە لادا کەوت و هەر ئەوەند گوتی دەستم بگرە. هەرچۆنێک بوو دامنیشاند، نە ئاوی لێ بوو، نە دەنگم دەگەیشتە پێشمەرگەکان، تێیگەیاندم فۆبیای بڵیندایی هەیە، بۆیە زەختی دابەزیوە، دوای چەند خولەکێک ڕاست بووەوە و بەکاوەخۆ سەرکەوتین. زۆر لە پێشمەرگەکان تووڕە بوو، کە ئاوڕیان نەداوەتەوە بزانن چیمان بەسەرهات، بە گاڵتە و فشقیات تووڕەبوونمان لە بیر بردەوە و گوتمان بڵێین چی تۆ لە بەرزایی شاخ دەترسی؟!

بۆ خوارەوە شۆڕ بووینەوە و تا مەقەڕەکانی جەماعەت نەوەستاین، سەری هەموویانمان دا، پۆلا و مریەم چادرێکیان هەبوو، لە ڕادیۆی دێموکرات کاریان دەکرد، سەری ئەوانیشمان دا.

**لە شەرمان و لە گەرمان**

گوتیان، باجی ڕەخشندە خوشکی گەورەی شەهید سولەیمان بللوری قاچاغ بووە، هاتووەتە دەر و لای کۆمەڵەیە، پرسیم و نیشانیان دام. ژنەکان لە ژێر پردەکەی جادەی گەلاڵە بوون. ئەبوو شەهاب گوتی، هەر دەبێ ببینم و بچۆ بزانە نایبینیەوە. نزیک بوومەوە هەر لە زارکی پردەکەوە تا بنەوە تاریک و ژنە زاو و پەککەوتوو و نەخۆشی تێک خزابوون. فەقیری و داماوی و بێئیمکاناتی لەناو ئەم خۆڵ و بەردە، بۆ کوڕ و پیاو کوێرەوەریی و مەینەتی بوو، جا چ بگات بە ژنی نەخۆش و بەساڵداچوو، بەبێ خوراک و پێخەف! وەستام و ڕامام، لە لایەکەوە شەرمم لەو هەموو ژن و منداڵ و هەرایە دەکرد و لە لایەکی ترەوە دەبوو بە گاگۆڵکە چووبامە ژێر پردەکە. بە دەیان ژن ڕاکشابوون و ناڵەیان دەهات، هەریەک بە هۆکارێک. سەرم دانەواند و وەژوور کەوتم، پرسیم باجی ڕەخشندە لێرەیە؟ بۆ نەگبەتی گوتیان لە بنی پردەکە، لای سەری سەرەوە نەخۆشە ڕاکشاوە. لە شەرمان و لە گەرمان تەواوی لەشم شەلاڵی ئارەقە بوو، هەرچۆنێک بێت بە پێلێنان و

خوشـــین، بە ببوورە ببوورە خۆم گەیاندە ئەوسەری پردەکە. چەند ژن بەم گەرمایە لە ژێر بەتانی ڕاکشابوون، یان خەوتبوون. بە باجە باجە، ڕەخشندەم دیتەوە و هاتینە دەر. ئەبوو شەهاب کە خوشکی سولەیمانی ئاوا بە نەخۆشی دیت، زۆر خەفەتی خوارد. گوتی عەلی، نابێت ئاوا لێرە بەجێـی بێڵین و لەگـەڵ خۆماندا دەیبەین. براژنـــە مریەم و کاک کەریم قادریـــش لـــەوێ بوون، زۆر مانـــدوو و نەخۆش بـــوون. چووم بۆ لای کاک ســـەید برایم و داوای ئیجازەم بۆ کـردن لەگەڵ خۆماندا بیانبەین. کاک ســـەید برایـــم زۆری پێ خۆش بوو، گوتی هاوکاریی باشـــی ئێمە دەکەن، ناتوانین بەڕێیان بکەین بۆ مەقەڕی ســـلێمانی، ئەگەر وا بکەین، دەبـێ هەموویان بنێریـــن، ئیجازەمان نادەن و مەقەڕی ســـلێمانی جێی ئەو هەموو کەســـانەی تێدا نابێتەوە، زۆریش مەمنوون دەبم، بە تایبەت باجە ڕەخشـــندە بەرن، لەبەر ئەوەی زۆر نەخۆشـــە. کوڕە گەورەکەی ئیدریـــس عەزیمـــی، ئەویـــش هاتبوو چەکـــی هەڵگرتبـــوو و بووبوو بە پێشـــمەرگەی کۆمەڵە. زۆر بە هەست و ئیحساســـەوە پێداگریی دەکرد لەسەر درێژەپێدانی ڕێگەی خاڵی، شەهید سولەیمان بللوری. بیستبووی لە کاتی شـــەهیدبوونیدا مـن لەگەڵیدا بووم، بە پرســـیاران دایگرتبووم. هەموو حەولی بۆ ئەوە بوو تفەنگەکەی شەهید سولەیمانی بۆ ببینینەوە و بزانیـــن کەوتـــە دەســـتی کێ. حـــەزی لەوە بـــوو بڵێ تفەنگـــی خاڵم هەڵگرتووە و ناهێڵم وەعەرزی بکەوێت. پرسیم و دەمزانی تفەنگەکە لە ناوچەی مەهاباد چەند دەستاودەستی کردووە و خوا دەزانێت ئێستا لە کام مەفرەزەی گەڕۆکی ناو وڵاتدا بە کێیە! زۆرم حەول دا بە قسەکردن ئەو مەراقەی بۆ نەهێڵم و بۆی بســـەلمێنم تفەنگ پارچە ئاسنێکە و هیچ فـــەرق ناکات، ڕێباز و درێژەپێدانی مەرامی خاڵی گرنگە. ئیدریس لەناو دەستە پێشمەرگەی موکریان جێگیر بووبوو و لەگەڵماندا نەهات بیبەین بـــۆ لای خۆمـــان. بەداخـــەوە دواتر لـــە چوونەوەیەکی پێشـــمەرگەکاندا بـــۆ ناوچـــەی مەهابـــاد، ڕۆژی ١٣ی پوشـــپەڕی ١٣٦٤ (١٩٨٦/٧/٤) لە شـــەڕێکی نابەرامبەر، لەگەڵ پاســـدار و بەکرێگیراوانی ڕژیمی کۆماری

ئیسـلامیدا شەهید دەبێت. ئیدریس بە شەهیدبوونی، کاروانی شەهیدانی بنەماڵەی بللوریی گەیاندە ترۆپکی خۆی، ئەو لە شـانزە سـاڵیدا هاتبوو بـۆ هەڵگرتنـەوەی چەکی خاڵی و لە هەژدە سـاڵیدا گەیشـتە کاروانی شەهیدان.

لەگەڵ ئەبوو شەهاب و پێشمەرگەکان و کاک کەریم قادریدا، براژنە مریـەم و باجـی ڕەخشـندە، بەرەو سـەرگەڵوو و دوڵـەپووت ڕێمان داگـرت. ڕێگە دوور و هەوراز بوو، بۆ باجی ڕەخشـندە زەحمەت بوو دەرچێت، وڵاغدار هاتن بۆ شارباژێر دەچوون، ئەبوو شەهاب وڵاغێکی بۆ ڕەخشـندە بـە کرێ گرت، ئەوانی دی هیچیان نەیانویسـت و بە پێ لەگەڵماندا هاتن.

### تەسبیح هەڵدەسووڕێنن

لـە ڕێ ئێمـە لـە وڵاغـدارەکان دوا کەوتبووین، لـە وڵاغلوو باجی ڕەخشـندەیان لای دوکانەکان دابەزاندبوو، دە دیناریان لێ وەرگرتبوو، پەلەیـان بووبوو، ڕۆیشـتبوون. چیـی وای نەبرد ئێمەش گەیشـتین و باجیمان دیت لە سـەر بەردێک دانیشـتووە و چاوەڕێـی ئێمەیە، ئەبوو گوتـی، ئـەدی کوا وڵاغدارەکان؟ باجە گوتـی، پەلەیان بوو دە دیناریان لێ وەرگرتم و ڕۆیشـتن. ئەبوو هەر ئـەوەی گوێ لێ بوو وەک بۆمب تەقییەوە و پڕ بەو دێیە جنێوی دەدا. بە نەبەزی مەسئوول مەفرەزەکەی گوت؛ غاردە ئەو سـەگبابانە بگەڕێنەوە. ئەوجـار ڕووی کردە باجی و زۆر بـە توندی پێی گـوت عەیبە تۆ پـارە دەدەی. ئیتر زۆرمان حەول دا کاکـە هیـچ نەبووە، ئەبوو شـەهاب بـۆ وا دەکەی؟ فایـدەی نەبوو. ڕەخشـندەی بێچـارە کە یەکـەم جاری بوو دەهات بۆ باشـوور و ئەم ناوە، حەپەسابوو و دەیگوت باشە بۆ وا دەکەیت؟ باشە بمدەوە! لەناکاو ئەبـوو شـەهاب دە دیناریەکـی دەرهێنا و ئاگـری دا، ئیتر هەموو ئەو خەڵکە لێمان کۆ بووبوونەوە و سەیریان دەکردین. ڕەخشندە زۆر تێک چوو، زۆرم دڵخۆشـی دایەوە و گوتم لە بیرت نییە شـەهید سولەیمان

دەیگوت ئەبوو شێتە؟ ئەوە هەمان شێتەکەی شەهید سولەیمانە و لەدڵی مەگرە. لە خۆشەویستییانی بۆ ئێوە پێی ناخۆشە دەستت بۆ گیرفانت بردووە و پارەی ولاغدارەکەت داوە. ئیتر ئەو کارە مەکە و تۆ میوانی ئەوی! نەبەز گەڕایەوە، نەگەیشتبووە ولاغدارەکان و ئاوا بووبوون. گوتم باش بوو نەتانهێنانەوە، دەنا بەخوا فەلاقەی دەکردن! ئەبوو شەهاب ئەوکات لە شارباژێر ناوبانگی بوو بە تووڕەیی و ئازارداني قاچاخچی و عەسکەری فیرار! دەیگوت «باشە ئەوانە نە کار بۆ شۆڕش دەکەن و نە بۆ حکومەت، نێرەکەرانە زەلام زەلام لە ناو دێ تەسبیح هەڵدەسووڕێنن و بێناموسی دەکەن و چاو لە ئافرەتان دەکەن، تەمبەڵ و تەوەزلن، ئەوانە لە شۆڕشگێڕی نییە هەڵاتوون و سەربازی ناکەن، بەڵکو لە هیچوپووچی و بێغیرەتییانە». زۆر جار لەناو گوندەکاندا کۆی دەکردنەوە، ئاودەستی پێ دروست دەکردن، یان پێی خاوێن دەکردنەوە. خاکەنازی دەدایە دەستیان و جادەی پێ خۆش دەکردن، ئیتر بەڵایەک بوو بەسەریانەوە، زۆر جاریش شکایەتیان دەگەیاندە لای مام جەلال و ئەبوو بانگ دەکرا بۆ سەرکردایەتی. دەیانگوت جارێک بەنیاز بووە بچێت بۆ سەرکردایەتی، لە شارباژێرەوە دەنێرێت باری دوو ولاغان لە شارەوە هەرچی شتی خۆشە و مام جەلال پێی خۆشە بۆی دەکڕێت و ڕێ دەکەوێت. لە ئالان لای بێتووش، تووشی تەتەر دەبێت لە مام جەلالەوە بۆ ئەبوو شەهاب، گۆیا شکایەتی لێ کراوە و بانگ کراوە بۆ سەرکردایەتی، ئەویش کە ئەوە دەزانێ، بە پێشمەرگەکان دەڵێت لادەن و ئیستراحەت بکەن. چەند ڕۆژ دەست بە شتان دەکەن، هەر هەمووی دەخۆن و لەداخان هیچ بۆ مام جەلال نابات.

### تۆ یەکێکم بەرێ

گوتیان کە لە شارەزوور بەرپرسی لق بووە، دەعوایەکی دوو بنەماڵە دێتە لق، کچێک هەڵگیراوە و ماڵی باوانی کچە داوای خوێن دەکەن و دەڵێن کراوە بە ژن. ئەبوو شەهاب یەکسەر دەیبڕێتەوە،

کــە ماڵــی کوڕە چوار هەزار دینــار بدەنە ماڵی کچــە. داد و بێداد بڵێند دەبێــت، ئەی هاوار چۆن چوار هەزار دینار؟ ئەوکات گۆیا یەکجار زۆر بووە. خەڵک کە دەبینن قسەکردن لەگەڵ ئەبوو شەهابدا فایدەی نییە و پێداگــری لە حوکمی خۆی دەکات، پەنا دەبەنە بەر کاک حامیدی حاجی غالی، بەرپرسی عەسکەریی لق. لە بارەگای لق هەموو کۆ دەبنەوە، پڕە لــە پیــاوی ماقووڵ و ماڵی کچ و کــوڕ. کاک حامید دەڵێت؛ ئەبوو چوار هەزار یەکجار زۆرە، خۆ ژنهێنانی ڕەســمییش چوارســەت پێنجســەت دیناری تێناچێت. زۆر شێر و ڕێوی دێننەوە، ئەبوو ڕازی نابێت و دەڵێ زۆر نییە. کتوپڕ لە ئیسراری کاک حامید تووڕە دەبێت و دەست دەداتە جانتاکەی و چوار هەزار دینار دەردێنێت، فڕێی دەداتە پێش کاک حامید و دەڵێــت، ئەگەر ڕاســت دەکەیت ئەوە چوار هــەزار دینار و تۆ یەکێکم بەرێ!

### بە جلوبەرگی خۆیانەوە

کاک کەریــم و براژنە مریەم، بۆ ماوەیەک لە مەقەڕەکانی یەکێتی لە سەرگەڵوو و هەڵەدن و ماڵی دۆستان، ئیستراحەتیان کرد و دوای ئەو هەموو گواســتنەوە و پاشەکشــەیە بۆ باشــوور و بێ خەو و خۆراکی، مەجالێکی باش بوو بۆ ئەوەی بێنەوە ســەرخۆ. باجی ڕەخشــندە زۆر نەخــۆش و بێتاقــەت بوو، بردمانــە قەیوان بۆ لای دایکی کاک ســەلاح چاوشــین. چەنــد ڕۆژێک مایەوە و کاک ســەلاح نــاردی نەجات خانی خوشــکی لە شــارەوە هات، لەبەر ئەوەی هیچ ناســنامە و ئیجازەیەکی نەبــوو، نەجات خان جلــی خۆیانی بۆ هێنابوو، بردی بۆ شــار لە ماڵی خۆیان. زیاتر لە مانگێک باجی لە ماڵی نەجات خان و هاوسەرەکەی (کاک حوسێن شیرین) و منداڵەکانیان مایەوە، لەو ماوەیەدا ئەم ماڵە هیچ نەما لــە خزمەت و جوامێری و دەوا و دەرمان و دوکتۆر بۆی نەکەن، وەک خوشــکێکی خۆیان، بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە میوانداریيان لێ کرد. دۆستایەتییەکی گەرم لە نێوانیاندا دامەزرا و ئێستاش هەر بەردەوامە.

# ٤٨

## شتێکی زۆر تازە

لەگەڵ ئەبوو شەهابدا گەڕاینەوە دۆڵپەموو، هەڵبەت جەولەی ئەبوو شەهاب لەناو هەموو یەکێتیدا ناوبانگی هەبوو، قۆناغ بە قۆناغ بە لادان لە لای دۆست و هاوڕێیان چەند ڕۆژی پێ دەچوو، دێ بە دێ لایدەدا و خۆی بە عەرزدا دەدا و هاوڕێکانی بەسەر دەکردەوە. گوتی، سامان گەرمیانی ژنی هێناوە، با بچین لە گەرمیان سەردانی بکەین. هاتوچۆی پێشمەرگە بە سەیارە زۆر بووبوو، تەنیا کێشە پەڕینەوە لە جادەی قیر بوو، ئەویش شەوانە و بە کەمینەرکردن دەکرا. جەولەی پێشمەرگە بە سەیارە یەکجار خۆش و خێرا بوو. لە کرپچنە کاک سامان، تازە تارا خانی گواستبووەوە، ماڵێکی بچکۆلانەی خۆشیان هەبوو، مەقەڕی تیپەکەشی هەر لەو ناوە بوو. یەک دوو ڕۆژ ماینەوە و زۆرمان ڕێز لێ گیرا. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ڤیدیۆم دیت، بە تەلەفزیۆنیان ڕەبت دەکرد و فیلمی خۆشیان پێ نیشان دەداین. دیار بوو، لە کەوتنە بازاڕی ئەم ئامێرە ئاگادار نەبووم و لە ئێران نەمدیبوو، شتێکی زۆر تازە بوو، کەم هەبوو و گرانیش بوو. لە گەڕانەوەمان بۆ شارباژێر بە ئاوایی حەمەی کەرەمدا هاتین و لای شێخ جەعفەر لامان دا، دیسان خزمەت و خواردنی خۆش. ئاوایی حەمەی کەرەم لە قەراغە و بنەماڵەی شێخ جەعفەر مستەفا خەڵکی ئەوێن.

## پاڵەوانێتیی پێشمەرگە

کە شەڕی قرناقە و پشتئاشان لەسەر دەستی کاک نەوشیروان بە سەرکەوتوویی تەواو بوو، مام جەلال بۆخۆی لە ناوزەنگ بەرەو دەشتی هەولێر هاتە خوار و بە بەشداریی دەیان تیپی پێشمەرگە

له دەشـــتی هەولێر، فەرماندەیی شـــەڕێکی گەورەی کرد. لەم شـــەڕەدا هێزەکانـــی ئەنـــوەر بەگی بێتواتە بە تـــەواوی تەفروتونا کران و هەموو موڵک و دیوەخانی ئەنوەر بەگ لە بێتواتە بە دەستی خەڵک و پێشمەرگە داگیر کران و لەناوچوون. پێشـــمەرگە چەک و تەقەمەنیی زۆری کەوتە دەست. ئێستاش بەرقییەی تیپەکان و کاک نەوشیروان و مام جەلال کە لە ڕادیۆی شۆڕش بۆ یەک لێدەدران و بە حەماسەوە لە قورگی فەرهاد ســـەنگاوی و بێژەرەکانی دیکەی ڕادیـــۆوە دەخوێندرانەوە، دەمخاتەوە یادی پاڵەوانێتیی پێشمەرگە.

دوای ئـــەو شـــەڕە، مام جـــەلال هەر لە دەشـــتی هەولێـــر مایەوە و نەگەڕایەوە بۆ ســـەرکردایەتی لە ناوزەنـــگ، لە تەکیەی زیخان مەقەڕی دانا و ناوچەیەکی بەرفراوان کەوتە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە. تا دەهات ورە و دەســـەڵاتی پێشـــمەرگە زیادی دەکرد و بە هۆی شکســـتی یەک لەدوای یەک، لە شـــەڕی ئێران و سەرکەوتنەکانی یەکێتیی نیشتمانی لە ئازادکردنی ناوچە داگیرکراوەکان، ورە و تواناکانی جەیشـــی سەدام لە کورتیی دەدا و پاشەکشەی پێوە دیار بوو.

مـــام جەلال و شـــێخ دارای حەفید لـــە ســـیتەک، خوازبێنیی مەریەم خانیان بۆ کاک سەلاح چاوشین کرد، دوای ڕازیبوونیان، مارەبڕین کرا و کاک سەلاح بوو بە خاوەن دەزگیران.

**هەی مریەمێ مریەمێ**

لەگەڵ ئەبوو شـــەهاب و کاک ســـەلاحدا لە شارباژێڕەوە بە سواری پیـــکاب بۆ چوونـــە لای مام جەلال، ڕێی دەشـــتی هەولێرمان گرتە بەر. پێشـــمەرگەکان لە پشـــتی پیکاب بە خۆشـــی و گۆرانیگوتن، تەپوتۆزی ڕێیـــان بەســـەردا دەباری، فێـــرم کردبـــوون گۆرانیی هـــەی «مریەمێ مریەمێ» بۆ کاک ســـەلاح بڵێن. یەک لە خۆشـــترین ئەو سەفەرانە بوو کـــە کردبێتم. لـــە ڕێ بیرەمان پەیدا کرد و دەمانخواردەوە، بە شـــادیی کاک سەلاح و چوونی لای مام جەلال و ئازادبوونی ئەو هەموو گوند و

ناوچەیە، تەواو کوردستانێکی ئازادم لای خۆم وێنا کردبوو، ئاخر زۆر جار بە کوڵ گریابووم و ئەژنۆی غەریبی و بێکەسیم لە باوەش گرتبوو، دوای ماوەیەکی زۆر یەکەم جار بوو بزەی شادی گەڕابووەوە بۆ سەر لێوانم و بەدڵ شـاد بووم بەم سـەرکەوتنانەی پێشـمەرگە لە قووڵایی خاکی باشووری کوردستان.

### بە سەرخۆشی هاتوون

بە دڵێکی خۆشـەوە گەیشتینە بەر مەقەڕی زیخان، ماڵی مام جەلال لەنـاو تەکیەکە بوو، بـەر دەرگا و دەرەوەی ماڵەکەی پڕ بوو لە خەڵک و پێشـمەرگە، دابەزیین و مام جەلال بـەرەو پیرمان هات، هەموومانی مـاچ کـرد، گوتـی: حەی! خـۆ بە سەرخۆشـی هاتوون بـۆ لام! ئەبوو شەهاب گوتی، تەنیا بە خۆشیی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی بەسەر ئەم جاشـانەدا هێناوتانە، لـە ڕێ بیرەیەکمان خواردەوە. فەرمووی ژووری لێ کردین و زۆر قسـە کرا. دواتر لە هەسـتاندا، هەریەکەمان بە دیاری بیرە و بوتڵە ویسکیی پێ داین. داوای لە کاک سەلاح کرد بێتەوە دەوام و وەک پاسـەوانی تایبەتـی خـۆی لەگەڵیدا بێت. لە کاتـی خواحافیزیدا پێشـمەرگەیەکی مـام بە پەلـە هات و پاکەتێکی بـۆ ڕاگرتم. گوتم ئەوە چییـە؟! گوتـی، پارەیـە مام بۆ تۆی نـاردووە. بەبێ کردنـەوە و بزانم چەندی تێدایە، گوتم عەرزی بکە لە لای ئەبوو شەهابم و لە هیچم کەم نییە و ناردمەوە. دواتر ئەبوو شـەهاب و کاک سـەلاح، کە پێیان زانی زۆر تووڕە بوون و گوتیان ئەوە یەک بێعەقڵ ببینین پارەی مام جەلال بگەڕێنێتەوە! باشـە بۆ نەتدا بە ئێمە، کێ خوا دەیداتێ لەم دەشـتە مام پـارەی بـۆ بنێرێت؟! دیار بوو مام دەیزانی من لە کەسـوکار دوورم و ڕەنگـە پێداویسـتیم هەبێت، بەس من هەرگیز جگە لـە بابم، تا ئەوکات پـارەم لە کەس وەرنەگرتبوو. زۆرم شـەرم دەکرد، هەڵبەت عەقڵم پێی نەشکا، ئەوە کارێکی گونجاو و شایستە نییە پارە بۆ کەسێکی وەک مام جەلال بگەڕێنێتەوە!

**جەمال تاهیر**

ئێوارە چووینە مەقەڕی دوکتۆر کەمال خۆشناو بەرپرسی مەڵبەندی هەولێر لە بالیســـان. میوانداریيەكی خۆشـــی لێ کردیـــن و هەرچی مام پێی دابووین، شـــەو خواردمانەوە. ئـــەو چەند ڕۆژە کە لەو ناوە و لای دوکتـــۆر کەمـــال بووین، بەداخـــەوە بە ڕووداوی وەرگەڕانی ســـەیارە، ئەندامـــی ســـەرکردایەتیی کۆمەڵـــەی ڕەنجدەران جەمال تاهیر شـــەهید بووبوو. دوای ئەو هەموو ســـەرکەوتنانە، ئەم ڕووداوە زۆر ناخۆش و دڵتەزێن بوو.

لە بیرم نەماوە بە چەند ڕۆژ و قۆناغ گەیشـــتینەوە دۆڵپەموو. دوای یەک دوو ڕۆژ، لەگەڵ ئەبوو شەهاب و مەفرەزەیەک لە پێشمەرگەکان، (بۆ من وەک یەکەم جار)، بە قزلڵەردا خۆمان بە شاردا کرد. کە گوتیان ئەمشەو مەفرەزە دەکەین بۆ شار، زۆرم پێ خۆش بوو، لام وا بوو هەر وەک سەردەمی مەهاباد و لای خۆمان دەچین بۆ ناوشار و چالاکییەکی پێشـــمەرگانە دەکەیـــن و بـــە باوەشـــێک دەســـکەوتەوە دەگەڕێینـــەوە. ئـــەوکات نەمدەزانـــی و تەنیا دوایان دەکەوتم، ئێســـتا دەزانم بە تاریکی هاتووینە لای شەســـتی و لەوێڕا ڕۆیشـــتووین بۆ ناو گەڕەکەکانی ناو شـــار. ماڵێکی زۆر خۆش و دەوڵەمەنـــد و زێڕنگەر بوون، لە خزمان و تایفەی ئەحمەدی زێڕنگەر، یەک بەدوای یەکدا، بە ئەســـپایی و بێدەنگی خۆمـــان بـــە ژووردا کرد. بـــە پەلە ناردیـــان لە نادی موهەندیســـین کە ئـــەوکات بۆ کەباب و خواردنەکانی زۆر ناوبانگی هەبوو، یەک ســـینیی گەورەیـــان کەبـــاب و گۆشـــت هێنا. وەک مـــەڕی گێژ هەر ســـەرم دێنا و دەبـــرد و لێی تێنەدەگەیشـــتم، ئەدی کەی دەچیـــن چالاکی دەکەین و لـــە مەقەڕێکی دوژمـــن دەدەین؟! هـــەر دەهات و شـــەو درەنگ دەبوو، بەزمی خواردنەوەش داندرابوو، هەر پێشـــمەرگەی لە سووچێک بە لادا کەوتبوو. زوو زوو پرسیارم دەکرد، ئەرێ ئەبوو، درەنگ دەبێت، کەی دەڕۆینە دەر لە شار؟! گوێی نەدەبزووت، دەیگوت بێخەم بە خۆم ئاگام

لێیەتی! گوتی ئەوە بۆ تەلەفۆنێک بۆ حوسـێنی برات ناکەی لە سـوید؟! زۆرم بـە لاوە سـەیر بـوو. گوتم بۆ دەبێـت؟! ئەی بۆ نابێت، هەسـتە ئـەو تەلەفۆنـەی بۆ بێنن. ڕۆژژمێرێکی زۆر بچووکـی باخەڵم پێ بوو، چـاوم لـێ کرد، ژمارەی حوسـێنم دیتەوە و وەک خـۆی یەک بەدوای یەکدا ژمارەکانم سـووڕاند، کەمێک چـاوەڕوان بووم و دەنگێکی دوور لەوسـەرەوە بـەرز بووەوە، ئەلوو ئەلوو حوسـێن لەوێیـە؟! بە دەنگی بەرز حوسـێن... حوسێن... دەنگەدەنگێک دەهات تێنەگەیشتم، چیی وای پێ نەچوو دەنگی حوسـێنم بۆ هات و ناسـیمەوە. حوسێن گیان عەلیی براتـم! عەلی گیان چۆنـی؟! ئەوە لە کوێی؟! گوتم لە سـلێمانیم و ئەوە لەگەڵ ئەبوو شـەهاب ئەمشەو هاتووینەوە. زۆرمان قسە کرد و ئەبوو و خاوەن ماڵ و هەر هەموو بە خۆشـیی منەوە قسـەیان لەگەڵدا کرد. یەکجـار دڵم خۆش بوو کە گوێم لە دەنگی حوسـێن بووەوە. خەبەری دایـک و بـاب و ماڵەوەی پێ دام کە هەر وا لە دامغان دەسبەسـەرن و دایکم بە ئیعدامی نەرمین هەر وا بێتاقەت و غەمبارە.

### دەنگ مەکە مفاوەزاتە

شەو تەواو درەنگی کردبوو و بەرەو بەیانی دەچووین، زۆر نیگەران و شـڵەژابووم، بۆچی ئەبوو ناجووڵێت و خۆی بە عەرزدا داوە، بەیانی دێن هەمووومان بە دەسـت دەگرن! لەناکاو گوتیان وەڵا بچن سەروپێی دوکانـی فلانەکـەس بێنن، دەڵێـن زۆر خۆشـە. شـەهید ئەوڕەحمانی حەمـەی فـەرەج، گـورج خۆی گـۆڕی و جلێکی مەدەنیی کـردە بەر و لەگەڵ خاوەنماڵ ڕۆیشـت. هێندەی پێ نەچوو بە مەنجەڵێک سەروپێوە گەڕانـەوە. لە نیگەرانی و نەزانینم نـە ئۆقرەم هەبوو، نە نانم پێ خورا. دوای نانخواردن ئەوجار ئەبوو شەهاب بڕیاری دا ئیستراحەت بکەین و بنووین. هەر هەموو ڕۆژەکە لەم دیوەخانە نوست، ئێمەش هیچ نازانین، هەموو دەسـتیان بە چوونە حەمام و جل و خۆشـۆرین کرد، یەک دوو جار ڕێکخسـتنی ناوشـار هاتن و چوون لەگەڵ ئەبوودا سرتوخورتیان

کرد. ئێواره به تاریکی قەمەرەیەکی جوانیان هێنا و لەگەڵ ئەبوو و یەک دوویەکی دیدا ڕاگوازراین بۆ ماڵێکی لەو ماڵە خۆشـتر. دیسان خزمەت و خواردن و خواردنەوە. سەرەنجام دوای ئەوەی هەستی پێ کرد زۆر نیگەرانم، بە گوێمدا گوتی دەنگ مەکە بەس کاک فەریدوون عەبدولقادر لـە بەغدایە و مفاوەزاتە، قەرارە لەگەڵ حکومەتدا پێک بێین. تێگەیشـتم هەر بۆ ئەوەش لە زێخان چووینە لای مام جەلال و بە ئەبووی گوتبوو، ئەویش ئەوەی دەزانی، بۆیە وا بێخەم خۆی بە شاردا کردبوو.

فەرەیدوون نێردرابوو بۆ بەغدا

دواتر زانیم چەند ڕۆژ پێش ئەوەی بچین بۆ لای مام جەلال، دوکتۆر قاسـملوو لـە لای بـووە و پەیامی ڕازیبوونی سـەدامی بـۆ مفاوەزات لەگـەڵ یەکێتیـدا هێناوە بۆ مـام جەلال و نێوەندگیریی باشـی کردووە بـۆ پێکهاتنی یەکێتی و حکومـەت. یەکێتییش بۆ نیبەتپاکی و ڕازیبوون، ئەندامـی مەکتەبی سیاسـیی خـۆی کاک فەرەیدوونی لەگـەڵ دوکتۆر قاسملوودا ناردبوو بۆ بەغدا.

ئەمشـەو بە ئەمشـەوی ئەبوو شـەهاب بۆ چوونەوەی دەرەوەمان زیاتـر لە دە شـەوی خایاند. لە شـاخ و لای بەرپرسـانی یەکێتی بڵاو ووبووەوە، ئەبوو شـەهاب لەگەڵ فڵان کەس و کێ و کێدا ون بوون. ئەبوو کاتێک خۆی ئاشـکرا کرد لە ناوشـارین، کە تەپڵی مفاوەزات لێ درابـوو، لیژنەی تەنسـیق لەگەڵ حکومەتدا لە کەرکـووک پێک هاتبوو، شـەهید شـوانی کەرکووک و کاک ئـاوات عەبدولغەفوور لـە یەکێتی، نوێنەری لیژنەی تەنسیقی مفاوەزات بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتیی یەکێتی، لە هەموانی قەدەغە کردبوو بەبێ ئیجازە و کاری پێویسـت و لیژنەی تەنسـیق، بێنە ناو شار، هەتا ئەنجامی مفاوەزات، بەڵام ناو شارەکان پڕ بووبوو لە پێشمەرگە.

**مەرگی تۆفیق وەهبی**

هەر لەو سەروبەند و دەسپێکەی مفاوەزاتدا بوو، سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ (٥-١-١٩٨٤) هەواڵی کۆچی دوایی توفیق وەهبی بەگ لە لەندەنەوە گەیشت. خۆی وەسیەتی کردبوو لە چیای پیرەمەگروون ئەسپاردەی بکەن. مام جەلال کاری بۆ کرد و تواندرا کەڵک لە هەلی مفاوەزات وەرگیرێت و بە ڕێی ئاسمان و بەغدادا، دوای چەند ڕۆژ تەرمەکەی بێننەوە بۆ کوردستان و لە چیای پیرەمەگرون بە خاکی بسپێرن. ئەو ڕۆژە بە دەیان و بگرە زیاتر، لە پیرەپیاوان و ئەدیب و شاعیرانی کورد، لە بەغدا و شارەکانی دیکەوە هاتبوون بۆ بناری پیرەمەگروون. کاک سەلاح چاوشین ئیتر وەک پاسەوانی تایبەت لەگەڵ مام جەلالدا بوو، لەگەڵ ئەبوو شەهابدا بە پیکابەکە تا توانیمان ئەو پیرەمێردانەی زۆر بە زەحمەت و هانکەهانک لە هەورازەکە سەردەکەوتن، بۆ لای گۆڕەکە نزیک بکەینەوە. بە سەدان خەڵک و پێشمەرگە لە ماڵئاوایی تۆفیق وەهبیدا بەشدار بوون. چەندین وتار لە زمانی ئەدیب و شاعیرانەوە خوێندرانەوە، لەناو هەمواندا وتارە پڕ لە حەماسەکەی مام جەلال و شیعرەکەی شێرکۆ بێکەس بۆ ئەو سەردەمە دەنگیان دایەوە. ئەوە یەکەم دەربڕینی دەنگی ئازادی بوو، دوای ئەو هەموو ساڵە لە سەرکوت و زەبروزۆری دەزگا تۆقێنەرەکانی بەعس، لە فەزای مفاوەزاتدا کۆمەڵانی خەڵک بیستیان.

# ٤٩

**عەبدولستار تاهیر شەریف**

وەســتا کەریم قەمەرەیەکــی کۆرۆنای هەبوو، ئەبوو شــەهاب لێی وەرگرت، چوو لە دۆلْپەموو لەگەڵ ســروەی تازەبووکدا گەڕایەوە شار و یەکســەر چوو بۆ کەرکووک و ماڵی باوان، دوای ئەو هەموو ســاڵە، لەوێشــڕا بووکی بردە بەغدا بۆ «شــهر العســل» (مانگی هەنگوینی) و ماڵی خوشــکی، کە خێزانی شــێخ ستار تاهیر شــەریفی وەزیر بوو، لە حکومەتی عێراق.

**پێشتر نەمدیبوو کورد دشداشەی لە بەر بکات**

لــەو ماوەیــەدا بۆ یەکەم جار شــاری کەرکــووک و گەڕەکی ئیمام قاســم و ڕەحیمــاوام بینــی، ماڵــی کاک برایمــی برای و دایکــی ئەبوو شــەهاب لــە خانوویەکی زۆر کۆنــی گەڕەکی ئیمام قاســمدا بوون. لە کەرکــووک کولتوورێکی تــا ڕادەیەک جیاواز هەبوو، پێشــتر نەمدیبوو کورد دشداشــەی لــە بەر بکات، بــۆ یەکەم جار کە ئەبوو شــەهاب لە ماڵــی خۆیــان چوو بۆ ژوورێکــی دیکە و بە دشداشــەوە هاتەوە دەر، هــەر ئەوەندە بوو نەپســام لە پێکەنین. گوتی بــۆ پێدەکەنی؟ ئێمە هەر وایــن. ئیتر زمانەکەشــیان تێکــەڵ دەبوو، جار بــوو عەرەبی و کوردی و جاریش بوو تورکمانی. زۆربەی خەڵک بە هەر ســێ زمان قســەیان دەکرد. ئەوکات زۆر کەم هەستم بە جیاوازی و ڕق و کینە لە نێوانیاندا دەکرد، تەنیا شتێکی زەق هەبوو یەک دوو گەڕەکێکی حکومی هەبوون بــە خانووی خۆش لە چاو گەڕەکە کۆنەکانی کوردنشــین، کە زۆربەی عــەرەب و تورکمــان و پیاوی میری بوون. یەک لەم گەڕەکانە تســعین و ئەوی دییش ڕێی بەغدا بوو. دایکی ئەبوو شــەهاب ژنێکی زۆر پیری

بەساڵداچوو بوو، پشتی کۆم بووبووەوە، لەگەڵمدا زۆر میهرەبان بوو، سەرگورشتەی خۆیانی بۆ باس دەکردم. براکانی ئەبوو شەهاب، کاک عەبدوڵلا دارتاش بوو، دوکانی هەبوو، خەلیل کاری دەکرد و عەلی خەریک بوو ببیتە پێشمەرگە لای خۆی.

بە دڵنیاییەوە دەڵێم گەر یادداشتی ڕۆژانەم هەبایە و ڕۆژژمێرم پڕ کردبایەوە، هەموو زستان و بەهاری ١٩٨٤ و مانگەکانی هاوینی ئەو ساڵە، پڕپڕی دەبوو لە ڕووداوگەلی خۆش و ناخۆش، هەر لە نەورۆزی مێژوویی سورداشەوە تا دەگاتە کارەساتی پڕ لە خەفەتی تیرۆری مولازم سەید کەریم لە تاسلۆجە.

دوای ئاشکرابوونی مفاوەزات و هاتوچۆی چەند جاری وەفدگەلی کورد و بەغدا بۆ لای یەک، خەڵک تەواو دڵی خۆش بووبوو کە ڕزگاریان دەبێت لە زوڵمی بەعس و چیتر کچ و کوڕانیان لە زیندانەکاندا بەند ناکرێن و سەریان ناچن بە دارەوە.

مەقەڕی سەرەکیی یەکێتی بۆ ماوەی مفاوەزات، هاتبووە سورداش، نزیک سلێمانی. مام جەلال و زۆربەی سەرکردایەتی لەوێ بوون.

### تۆ لە یابانی دەچی

بە کردەوە، بە ڕۆیشتن بۆ بەغدا و کەرکووک و ئەملا و ئەولاکردنی ئەبوو شەهاب، پێراگەیشتن بە مەقەڕی دۆڵپەموو و داخوازییەکانیان هاتە سەرشانم، بەبێ وەستا کەریم و شێخ نەبەز هیچم بۆ نەدەکرا، ڕۆژ هەبوو دوو جار بە پیکابە شین دەچوومە شار و دەگەڕامەوە. ئەوکات ماوەیەک بوو لەجیاتی مشکی و جامانە، کلێتەیەکم لە سەر دەنا، لە شێوەی یابانی دەچووم. ئەوەندە بەم پیکابە بە ئەزمەڕدا هاتبوومە خوار، ڕۆژێک سەربازی سەیتەرەکە عەرەب بوو، ڕایگرتم و زۆر بە میهرەبانی گوتی تۆ لە خەڵکی ئێرە ناچیت. من عەرەبیم نەدەزانی، بەس کەم کەم تێدەگەیشتم. شێخ نەبەز لە پەنام دانیشتبوو گوتی، ئەوە دەڵێت تۆ لە یابانی دەچی. گوتم پێی بڵێ کوردی یابانم! ئیتر سەربازە عەرەبە

دەستی کرد بە قاقالێدان و دیار بوو دەیپرسی بۆ کورد لە یابانیش هەیە؟! هەموو جار کە لە ئەزمەڕ دەهاتمە خوار لە دوورەوە تەحیەی دەکرد، بە تەعال و تەفەزەل تەفەزەل و کورد... کاکە... یابان... بە دەنگی بڵیند بەخێرهاتنی دەکردم و یەکسەر ڕێی بۆ دەکردمەوە!

### پێڵاوی غەریبیمان کردەوە

شێخ نەبەز، مونیر خوشکەزای مستەفای سەید مەجیدی خەیات، لە بنەماڵە کۆن و ناسراوەکانی سلێمانی بوون. دوکانی خەیاتیی کاک مستەفا زۆر ناسراو و مەکۆی پیاوانی سلێمانی بوو. کاک جەمال، شەماڵ و کەمال، براکانی کاک مستەفا بوون و ئەو دوکانە ئێستاش هەر ماوە و بەیەکەوە ئیش دەکەن. دایکی مونیر (شێخ نەبەز)، عایشە خان و پوورەکانی، ڕووناک خان، شوکریە و نەزیرە، زۆر بەڕوحم و دڵسۆز بوون بۆ مونیر و زۆریان میوانداری و خزمەتی منیش دەکرد. هەموو بنەماڵەکە، کە زۆرتر لە ماڵی باوکیان لە سابونکەران بەیەکەوە دەژیان، زۆر میواندۆست و بەخزمەت بوون بۆ پێشمەرگە و شۆڕش. زۆڕ جار لەگەڵ شێخ نەبەز لە لایان لام دەدا و لەگەڵ ئەبوو شەهاب زۆرمان پێلاوی غەریبی لەو ماڵە، کە پڕ بوو لە بۆنی کوردەواری، کردەوە.

### خۆم و کامێراکەم

لە ماوەی مانەوەم لە باشوور و لە کاتی گفتوگۆی حکومەت و یەکێتی نیشتمانیدا، دوو جار حوسێنی برام وەک کادری کۆمەڵە بۆ ئیشی حیزبی گەڕایەوە بۆ کوردستان و لای کۆمەڵە. هەردوو جار منیش چەند جار بینیم و بردم بۆ ماڵی کاک مستەفای سەید مەجید و دایکی وەستا کەریم. سەروەتێکی کە باش بێ و مابێ و وەبیرهێنەری بیرەوەریکانم بێت، لە ژیانی ئەو سەردەمەمدا، مەمنوونی حوسێنم کە کامێرایەکی زۆر باشی بە دیاری بۆ هێنابووم و زۆربەی ئەو وێنانەی

خۆم و هاوڕێیانم لەو سەردەمەدا، کە لە لام ماون، بەو کامێرایە گیراون.

زۆرم هاتوچۆی شار پێ خۆش بوو، سەردانی دۆستان و هاوڕێیانی ڕۆژهەڵاتم دەکرد، چەند جار بۆ لای مەقەڕەکانی کۆمەڵە و مامۆستا شێخ عێزەدین، کە چووبوونە مالوومە و گاپێلۆن، چووم. سەردانی باجی ڕەخشندە، ماڵ و منداڵی کاک کەریم دانشیار، کە لە شار هاتبوونە دەر و چاوەڕێی ڤیزا بوون لە سوێدەوە بۆیان بێتەوە و لای کۆمەڵە جێیان کرابووەوە، هەباسی برام و ئەوانی تریشم دەکرد.

### کۆنگرەکەی دێموکرات

حیزبی دێموکرات کۆنگرەی شەشی لە گەلاڵەی ناوچەی شینکایەتی، لە ڕۆژی ٢ی ڕێبەندانی ١٣٦٢ (١٩٨٤-١-٢٢)دا گرتبوو. لە کۆنگرەدا دوکتۆر قاسملوو بەرنامەی سوسیالیزمی دێموکراتیکی باس کردبوو، بە کورتەباس ناوی دەرکرد، دژایەتیی زۆری کرابوو. جەماعەتێک بەبێ لێحاڵیبوون دەیانگوت جا چۆن دیکتاتۆری پرۆلیتاریا ڕەد دەکرێتەوە؟ وەک ئەوەی بەردی بە کەعبەیدا دابێت. لەملاوئەولا باسیان دەکرد. کادرێکی زۆری کۆمەڵە و دێموکرات بە هۆکاری دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیست و کورتەباسی دوکتۆر قاسملوو وازیان لە پێشمەرگایەتی هێنا و خۆیان تەسلیمی حکومەت کردەوە، یان هاتنە دەر و جیابوونەوە. ئەم دوو هۆکارە لەگەڵ گرتنەوەی هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و پاشەکشە بۆ باشووری کوردستان و هاتنی سەرکردایەتیی حیزبەکان بۆ ژێر دەسەڵاتی حیزبی بەعس لە لایەک و دواتر کێشە و شەڕی نێوان حیزب و کۆمەڵە، هۆکاری هەرە سەرەکی بوون بۆ ئەوەی جووڵانەوەی خەڵکی کورد لە ڕۆژهەڵاتدا تووشی نشوستی و دوورکەوتنە بێت لە کۆمەڵانی خەڵک و پەراوێز بخرێت لە ناو خاکی وڵاتێکی دی. ئەوە دەبینین، دوای زیاتر لە سیوپێنج ساڵ ئێستاشی لەگەڵدا بێت خۆیان نەگرتووەتەوە و دێموکرات و کۆمەڵە بە شوێنپێی جارانیان نەگەیشتوونەوە.

زۆر لــە کادرە تۆراوەکانیــان دەهاتــن بــۆ لام و داوای وەرقــەی هاتوچۆیان بۆ شــارەکانی باشــوور لێ دەکردم. کاک شــوانی لیژنەی تەنســیق و کاک وەهابی سەرتیپی شارباژێر زۆریان یارمەتی دەدام و هەرچەندی وەرەقەم ویستبا نەیاندەگوت نا، منیش دەمدانێ. زۆریان لە هۆتێل ســەلام و کانی لە سلێمانی کۆ بووبوونەوە، چایخانەیەک هەبوو لە لای ئۆرزدی، هەموو بۆ تاوڵە و دۆمینە دەچوون بۆ ئەوێ، بووبوو بە مەکۆی پێشمەرگە دانیشتووەکانی کۆمەڵە و دیموکرات.

چەند جارێک لەگەڵ هەباسیدا برام، چووین بۆ ماڵی خاڵم لە گوندی تەپەگولاویی شارەزوور. لە سەروبەندی مفاوەزاتدا بوو، هەباسیش بۆ یەکەم جار ماڵی خاڵی دیت.

**بۆ سومعەی حیزبەکان بە خراپ دەزانرا**

مفاوەزاتی یەکێتی دەرفەتێکی باش بوو بۆ کورگەلی ڕۆژهەلاتی بۆ ئیســتراحەت و بەخۆداچوونەوە و بڕیار لەسەر داهاتوویان. زۆربەیان نیــازی چوونــی ئەورووپایــان هەبوو، بــەلام هەم ئیجــازەی دەوڵەتی عێراقیــان دەویســت و هەمیش پــارە. دیموکرات و کۆمەڵــە، بەدەگمەن ئیجازەی هاتوچۆیان بە پێشمەرگە دانیشتووەکان بۆ ناو شارەکان دەدا، جا چ بگات بە ئیجازەی چوونەدەر لە عێراق! کادری کۆن و ناســراوی وەک ســەید حەسەن هاشمی، مەلا ڕەســووڵ پێشنماز، ڕەسووڵ ئاریا، عومــەر بابامیــری، پەرویــز تاهیری، خالیــد عەزیزی، ســەلاح گادانی، پۆلا نانەوا، عەبدوڵلا ئیقدامی، ســولەیمان خودایار، کەمال شــەریفزادە، محەمەد حەسەنخاڵی، جەمال سەیدی، سەعید ســەرهەنگی و... دەیان کادری کۆنی ســەربازی و سیاسیی هێزگەلی ڕۆژهەلات لە بێپارەیی و بێمەسکەنی بە قاچاغ و لەم ماڵ و ئەو ماڵ بە شەرمەوە دەژیان! ئەوانە نــە تەنیا لە لایــەن حیزبەکانیان، کە تــا دوێنێ هەمــوو فیداکارییەکیان بۆ کردبوون، هیچ یارمەتی نەدەدران، بگرە دوژمنایەتییشــیان دەکردن و بــە دەســتی حیزبــەکان بوایە، هەموویــان لە ســلێمانی دەردەکردن.

هۆکارەکەشـــی ئەوە بوو ئەم کادر و کۆنە پێشمەرگانە لەملا و ئەولا و لە مالان مەجبوور بوون قســە بکەن و پرســیاریان لێ دەکرا کە بۆچی وازیــان هێناوە؟ ئەوەش بۆ ســومعەی حیزبەکان بە خــراپ دەزانرا و هیچ حەزیان نەدەکرد پێشــمەرگەی دانیشتوو بێتە سلێمانی، یان بچێتە ئەورووپــا. لە ڕوانگەی حیزبەکانــەوە، خۆتەســلیمکردنەوەیان بۆ لای حکومەتی ئێران زۆرتر پەسەند بوو، یەکسەر دەیانگوت ئەوەتا بەزیون و پێشمەرگایەتییان پێ نەدەکرا و گەڕاونەوە بۆ لای حکومەت. لە لایەکی تریشــەوە ئەوانەی دەچوونەوە و تەســلیم دەبوونــەوە ئیتر لە ڕوویان هەڵنەدەهــات هۆکارەکەی بگەڕێنــەوە بۆ کەموکــوڕی و ناعەدالەتی و خراپــی نــاو حیزبە کوردییــەکان! ڕاســتییەک هەبوو لە کەشــوهەوای ئەوکاتی ڕۆژهەلاتی کوردســتان، کاتێک پێشــمەرگەیەک خۆی تەسلیم دەکــردەوە، لەگەڵ هەموو مەترســییەکانی دەزگای ئیتلاعاتی ســوپای پاســداران و گرتــن و تەنانەت ئیعدامکردنی، دەبــوو خۆی بۆ تیرۆری شەخســییەتی لە لای کۆنە هاوڕێ و حیزبەکەی و هاوشارییەکانیشــی ئامادە بکات! حەقیقەتێکی تاڵ لەناو هەموو حیزبەکان بە ڕاست و چەپەوە هەبــوو؛ ئەگەر لەگەڵیاندا نەدەمای وەک دوژمن ســەیریان دەکردیت و لــە هیچ بوختان و ڤڕکردنێک[1] ســڵیان نەدەکردەوە بۆتی ســاز بکەن! ئاشبەتاڵی، بەزیو، ترسنۆک، ئۆپۆرتۆنیست، سازشکار، جاش، ئیتلاعاتی و دەیانی وا، ئەمە ئەو وشــەگەلە بوون ڕۆژانە بەبێ بەڵگە و ســەبەب پێیان تاوانبار دەکران و کەســایەتییان لەنــاو دەبردن. لەناو کۆمەڵگەی دواکەوتــوو، هێزگەل و مرۆڤــی هیچلەباراندانەبوو و بوودەڵە زۆرن و دەبنە کەوچک بەدەســت و کوێخا، ئەوانە گەورەبوونی خۆیان لە هۆش و کەرامەت و زیرەکی و سیاســەت و ڕێبازی دروست و پاکی خۆیاندا نادۆزنەوە و ناتوانن ببن، بەڵکو ئەو کەمایەسییە لە بچووککردنەوەی بە درۆ و بوختان، بۆ هێز و تاکەکانی بەرامبەریاندا وەدی دێنن. بە کورتی، بچووککردنەوەی ئەوی تر گەورەبوونەوەی خۆمی تێدا دێتە دی!

---

١- ڤڕ، درۆودەلەسە، فشە.

## دەروویەک کرایەوە

بەهاری ساڵی ١٩٨٤ بۆ خەڵکی باشوور، بە تایبەت ناوچەی سلێمانی و پێشمەرگەکانی یەکێتی، پڕ لە خۆشی و موژدە بوو. خەڵک بە تەواوی بوژابوونەوە و سەیران و چوونی دەرودەشت بە بەرفراوانی دەستی پێ کردبووەوە. دوای ئەو هەموو ساڵە لە ژیانی سەرکوت و تۆقێنەری پیاوانی بەعس بەسەر خەڵک و بێزارکردنیان لە ژیان، دەروویەک کرابووەوە بۆ خەڵک، تا کەمێک ڕووی شادی و حەسانەوە ببین، تا ڕادەیەک خەمی لەدەستچوونی عەزیزان و بەندکراوەکانیان بیر بچێتەوە و هیوادار بن بە ڕۆژانی خۆشی و ئازادی لە دوارۆژێکی نزیکدا.

## ئاهەنگەکەی سورداش

نەورۆزی ئەو ساڵە بوو بە بیانوویەک بۆ خەڵک و یەکێتی، یەکتر لە ئامێز بگرن و بۆ یەکەم جار خەڵک و پێشمەرگە لە گۆڕەپانی بەر سورداش ئاهەنگێکی چەند سەد هەزاری ڕێک بخەن، لە بەیانیی زووی بیستویەکی مارسدا، بە هەزاران سەیارە و پاس لە سەرتاسەری کوردستان لە باشوور، بەرەو سورداش، لە نێوان دوکان و سلێمانی وەڕێکەوتن. بە هەزاران مەنجەڵە یاپراخ و شیشە گۆشت و کەباب لەو دەشتە، لەسەر سفرەی ماڵان بڵاو بووبوونەوە. کچان بە جلی سوور و ئاڵاوە، کوڕان بە فەقیانە و پشتێندی گوڵگوڵی و قژی ڕۆناوییەوە، لەو دەشتە دەستیان گرتبوو و بە دروشم و هاواری بژی پێشمەرگە، پێیان بە عەردا دەدا و هەستی خۆشی و سەربەستیی خۆیان دەردەبڕی. پێشمەرگەکان لەناو خەڵک و سەر سفرەکان، لە دیار دیارتر بوون و لەبەر فەرموو فەرموو بەرنەدەکەوتن. سفرەیەک پۆزی لێ دەدا و شانازیی دەکرد، کە پێشمەرگەیەک لە لایان دانیشتووە. ئەوێ ڕۆژێ ناو و هەیکەلی پێشمەرگە بە بەرزیی لووتکە هەرە بەرزەکانی کوردستان بوو، لە ئاوی ساردی کانیاوەکان بێگەرد و ڕوونتر بوو. ئەو دیمەنە

کاتێک خۆی زۆر نیشان دا و دەرکەوت کە دەنگ بڵیند بوو؛ مام جەلال هات و قسەیان بۆ دەکات. هەرووژم و بەرەوپیرەوچوونی ئاپۆرای خەڵک بەرەو مام جەلال، مرۆڤی بیر تەوافی موسڵمانان لە ڕۆژی جەژنی قورباندا دەخستەوە. مام جەلال لەگەڵ کۆمەڵێک سەرکردە و فەرماندەی عەسکەری، لەسەر بڵیندییەک پەیدا بوو. پێکەنین و گەشانەوەی دەموچاوی لە دوورەوە نمایان بوو. بە زبان و جووڵەی تایبەت بە خۆی، وتارێکی پڕ لە حەماسی پێشکەش کرد و هەموو خەڵکی خرۆشاند. دەشتودەر و شاخ هەر هەمووی یەک پارچە بە سروود و دروشمی کوردایەتی، دەنگیان دایەوە.

## هاتنی مامەڕیشە

لەناکاو هەموو خەڵک ڕوویان وەرگێڕایەوە و بە پرتاو هرووژمیان بۆ پیکابێک برد، کە لە لای جادەوە بەرەو گۆڕەپانەکە دەهات. یەک و دوو هەر ئەوەندە بوو پیکابەکە لە عەرز جیا نەکرایەوە، هەزاران باوەش و ماچ بۆ پێشمەرگەی فەرەنجیپۆشی سەر پیکابەکە فڕێ دەدرا و فرمێسکەکانی شادی جۆگەلەیان بەستبوو. دیمەنێک هەرگیز بیر ناچێتەوە، ئەو خەڵکە بەوەفایە چۆن پێشمەرگەی پارێزەری خاک و نیشتمانی خۆیان لە ئامێز دەگرت و چۆن پاداشتی فیداکارییەکانیان بە هەست و عیشقی لەبننەهاتووی خۆیان وەڵام دەدایەوە. ئاوێتەبوونی دوو ڕۆحی پێشمەرگە و خەڵک، گەیشتە لووتکە و سۆزی ئەم عەشقە بوو بەم تەوارە لەسەر لووتکەی هەرە بەرزی شاخەکانی ئەم کوردستانە، لە شاباڵی دەدا و نیشتمانی کوردانی دەخستە ژێر باڵی. فەرەنجیپۆش مامەڕیشە بوو، ئەوەی هەرچی ملازم و جاشی بەعس بوو تەنانەت بە بیستنی ناویشی لەرزە دەکەوتە گیانیان و بە ڕۆح لێی تۆقیبوون و هەموو خەڵکیش ئەو ڕاستییەی دەزانی، بۆیەش ئاوا خۆشەویستی وردودرشت و پیر و منداڵ بوو. هاتنی مامەڕیشە بۆ سەر خانی ئەم میللەتە زەجرکێشراو و داماوەی دەستی بەعس، کەشوهەوایەکی

لەبیرنەکراوی بەخشییە ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٨٤ لە سورداش.

ئەو ڕۆژە منیش دڵخۆش بووم بە بوونی هەباسی برام و کۆمەڵێک لـە هاوڕێیانی ســابڵاغی و کۆمەڵە، کـە بە بۆنەی منــەوە هاتبوون بۆ نـەورۆز. هەرچەند لـە کونجی دڵمدا غوربەت تەمێکــی قورس و گران و تاریکی بەســەردا کێشــابووم، بە بینین و پێکەنینی هەر جووتە کچ و کوڕێک و دەســتگرتنیان و ســرتوخورتیان برینم دەکولایەوە و خەیاڵ هەڵیدەگرتم بۆ موکریان و بەسەر سابڵاغ و ماڵی یاردا دەسووڕامەوە، بۆ چرکەســاتەکان لەناو ئەو هەمــوو هەراوهوریای دەهۆڵ و زوڕنا و حیلکــە و پێکەنینە، هــۆش و بیرم باڵیان دەگرت و منیشــیان دەبرد بۆ شایی و چۆپی و هەڵپەڕکێ، لەناو حەوشەکەی ماڵی خۆمان و ماڵی یار.

## ٥٠

**هەر سەربازە و هەڵدێ**

هاتوومەوە ناو خاکی ڕۆژهەڵات و بە سەردەشتدا، بە سواری سیمورغێک باڵم گرتووە بەرەو زمزیران، چەند پێشمەرگەیەکین، بە جلی خاکی و شەدە لە سەر و مزەلی لە شان و سەروگوێلاک هەموو خۆڵاوی. هەموو سەیارەکانی بەرامبەرمان لایتیان داگیرساوە و فلچەی شووشەکانیان ئاڵای کوردستانی پێوە کراوە و سەما دەکەن. هەر کە نزیکمان دەبنەوە بە هۆڕنلێدان و دەستراوەشاندن موژدەی ئازادیی وڵات ڕادەگەیەنن. دەوەستین و لەگەڵ ئەم خەڵکەدا یەکتر لە باوەش دەگرین. پێمان دەڵێن زوو بگەنێ و ئازادکردنی سابلاغ تەنیا چەند گەڕەکێکی ماوە و هەر سەربازە و هەڵدێت، پاسدار جارێ بەرگری دەکات، دەیان تانک و مێکزەمینی تێکشکاون و خەڵک دەستی داوەتە چەک و یارمەتیی پێشمەرگە دەدەن و شار هەموو خرۆشاوە. منیش لە خۆشیان باڵ دەگرم و بە هەموو توانامەوە بەنزین دەشێلم. ئەوەندە بە پەلەم ناڵەی بەرزی مەکینە نابیسم و خێرایی خولانەوەی تایەکان نابینم، لۆفە و پێچاوپێچی جادە تەسکەکەی سەردەشت-سابلاغ بە خێرایی ١٥٠ و ١٦٠ کم دەبڕم. لە ئاوێنەوە تۆزی دواوەی سیمورغ وەک بورکانە و تا دوور بڕوانی هەیە. پێشمەرگەکان لەبەر تەپوتۆز شەدە و جامانەیان لە دەموچاو هاڵاندووە و نە تەنیا ناڵێن هێواش، بەڵکو بە مستڕاوەشاندن ئیشارەتم بۆ دەکەن خێراکە. دەنگی بەرزیان دێتە گوێم:

سەدەی بیستەمە کورد دە تۆ ڕاپەڕە
تەواوی مێژووت بە خوێن پەڕپەڕە

تەواوی گەلان هەموویان سەربەخۆن
لە کوردستانا زۆردار خوێنمان دەخۆن
زانا بین تێبکۆشین دەور دەوری مەیە
وڵات چاوەڕێی شۆڕشـــی ئێمەیە

**سەردانەواندن کاری نامەردانەیە**

کاوڵان، کیتکـە و کامەم، تێدەپەڕێنین و دەگەینە عەوڵاکوردە، خەڵک لەسەر جادەیە و ڕایدەگرین، بەرەوپیرمان دێن و لە باوەشمان دەگرن، خەبەری شارمان بۆ باس دەکەن و قسە لە کوژراو و برینداری زۆری دوژمـــن دەکەن، گۆیا چەند مەفرەزەیەک پێشـــمەرگە لەناو شـــارە، ناو جەرگ و دڵم دەکوڵێت و سمکۆڵمە زوو بگەینە شار. وا باشە بە جادەی ئەسـڵیدا خۆ بە شـــاردا نەکەین و دەوری پشتی سەربازخانە لێدەین و بـــە پشـــتەپ و گومبەزاندا خۆ بە شـــاردا بکەین، خەڵکی ســـەر جادەکە و ڕێبـــواران وایـــان دەگوت. لێمخـــوڕی بەرەو بەیتاس و ســـەدەکەمان لێ دەرکەوت، لامان دا و بە شـــاخەکانی پشـــتی سەربازخانەی شاردا، خۆمان گەیاندە ڕۆژهەڵاتی شار و ڕووی سیمورغم کردە سەرقەبران، هەر هەموو دابەزیین و ڕیزمان گرت، بە چاوانی پڕ لە فرمێسکی شادی لەسەر گۆڕی سولەیمانەکان و هەموو شەهیدەکانی دی، بە یەک دەنگ گوتمانەوە:

«پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین
نامـــرن، ئەوانە وا لە دڵـــی میللەتا ئەژین
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە
گرتن و لێدان و کوشـــتن عاملی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەپچە، لام وەکو ئەفسانەیە
بیـــری ئازادیم لە زیندانـــا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بەسەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە

چه‌ کی شۆڕشگێڕی من نووسین و بیروباوه‌ڕه
ڕاپه‌ڕینه‌ هه‌ڵمه‌ته‌ پڕ نه‌عره‌ته‌ی کوردانه‌یه‌»

**شیوه‌نی خۆشی دایکم**

ڕوومان کرده‌ شار و کۆڵان به‌ کۆڵان و جاده‌ به‌ جاده‌ هه‌ر بیره‌وه‌ری بوو و ده‌هاته‌وه‌ یاد، هه‌ر خه‌ڵک بوو ئامبازمان ده‌بوون و به‌ شه‌ربه‌ت و میوه‌ و شـیرینی پێشـوازییان ده‌کرد، شار یه‌کپارچه‌ جێژن و شادی بوو. ده‌چمه‌وه‌ ماڵ، دایک و باب و کاکم و ده‌روجیران سـه‌ر کۆڵانیان لێ گرتووم، هه‌موو ده‌موچاوم سـواغی گڵوێز[1] و لیکی خۆشه‌ویستیی عه‌زیزانه‌. شیوه‌نی دایکم له‌ خۆشیان و له‌ ئازاری نه‌مانی نه‌رمین، به‌رد ده‌توێنێته‌وه‌ و هه‌موو گه‌ڕه‌کی هێناوه‌ته‌ ته‌ماشا!

وه‌ژوورده‌کـه‌وم، ماڵه‌که‌ ئه‌وه‌ نییه‌ که‌ جێم هێشـتووه‌، ڕووخاوه‌ و دروست کراوه‌ته‌وه‌، ئه‌و ماڵه‌ی تێیدا له‌دایک بووم و گه‌وره‌ بووم ئێستا نایناسـمه‌وه‌ و ده‌بێ وه‌ک میوان بپرسـم کامه‌ ژوور و ده‌ستشـۆر له‌ کوێیه‌؟!

**هه‌ر مه‌لایه‌ و هه‌ڵدێت**

یه‌ک دێ و یه‌ک ده‌ڕوا، هه‌موو شار و کوردستان له‌ جۆشوخرۆشدان، هه‌واڵه‌کان باس له‌ ڕووخانی ڕژیم ده‌که‌ن له‌ تاران و ده‌ڵێن هه‌ر مه‌لایه‌ و هه‌ڵدێت، عه‌با و عه‌مامه‌کان، که‌ڵاوه‌ و سه‌تڵه‌خۆڵه‌کانیان پڕ کردووه‌ و به‌ ده‌گمه‌ن له‌سه‌ر جاده‌ی شاره‌ گه‌وره‌کانی ئێران ڕیش به‌ ده‌موچاوی پیاوان و چارشێو و مه‌قنه‌ئه‌[2] و مانتۆ به‌ ژنانه‌وه‌ ده‌بیندرێن.

دوای ئـه‌و هه‌مـوو نه‌هامه‌تـی و خوێن و زیندانه‌ به‌ده‌سـت مه‌لای زاڵم و بێبه‌زه‌یی، ئێسـتێ ئه‌و ڕۆژه‌ خۆشـانه‌، به‌هارێکی پڕ له‌ شـادی

---

١- گڵوێز، ئاوی زار، تف.

٢- مه‌قنه‌ئه‌، چارشێو و له‌چکه‌، ژنان سه‌ر و قژیانی پێ داده‌پۆشن، ئه‌م جۆره‌ زۆرتر له‌دوای هاتنه‌سه‌رکاری کۆماری ئیسلامی بوو به‌ باو.

و کامەرانییـان بـۆ خەڵک هێنابوو. هەموو ڕۆژانی هەینی سـەر گۆڕی شـەهیدان جمەی دەهات و بەڕاسـتی کرابوونە تاجی سـەری خەڵک و کەسـوکاریان، لەوپـەڕی ڕێز و خۆشەویسـتیی میللەتدا بـوون. دار و دیوار بە وێنەکانیان نەخشابوون و ڕۆژانە کۆڕ و سیمیناراتیان لەسەر سـاز دەکـرا و دەیانگوت ئـەوە ئەوان بوون بـە فیداکاریی خۆیان ئەم ڕۆژە پڕ لە سەروەری و خۆشانەیان بۆ ئێمە بە دیاری هێناوە.

### بۆ دڵداری نابم

یار لە بەندێ ڕزگاری بووبوو، لە ماڵی خۆیان، لەبەر حەشـیمەت و میوان نەدەکەوتە بەر من. هەرچەند دەمزانی ئەو چاوی لە ڕێیە بۆ دیدار و ئەویش دەیزانی من چەند تامەزرۆی نیگایەکی ئەوەم. نەمانی نەرمین بۆشـایەکی تەواوی لەم پەیوەندییەدا جێ هێشتبوو. چەند جارێک خۆم گەیاندبووە ماڵەوەیان و لە دوورەوە بێ قسەکردن چاوم پێی کەوتبوو. من خۆمم دەناسی و دەمزانی بۆ دڵداری بە دزی و فزی نابم، زۆرم بۆ قورس و شەرمە بێهودە بە دەوری ماڵی یاردا بێم و بچم.

دایـک ئـەو مرۆڤە پاک و بێگـەردەی توانای هەیـە دڵ و دەروونی جگەرگۆشـەکانی بخوێنێتەوە و لە ئازار و شـادییەکانیان تێبگات و لە کونجـی دڵیانـدا بەخەبەر بێ، ئەویش دایکی من، کـە دوای ئەو هەموو سـاڵە منی دەدەیتەوە لە ماڵەکەی خۆی و ڕۆژانە سـەدان جار دەستی بـەرز دەکردەوە و دەیگوت: «خودایە گیان شـوکرت؛ عەلیت دامەوە و بە سـاغی بۆت ناردمەوە». زۆر زوو لە ڕازم گەیشت و دەیزانی چەند بەپـەرۆش و مگێزم[1] بۆ گەیشـتن بە ئاواتی دڵـم. دڵنەوایی دەکردم و هیـواداری دەکردم بە زوویی قۆڵی لـێ هەڵدەماڵێت و بووکم بۆ دێنێتە ماڵێ.

---

١- مگێز، واز و ئارەزوو.

### کێ جلمان بۆ ئامادە بکات؟

لــە چوارڕێی ئازادی، لەگەڵ ســولەیمان، کەمال، ڕەحیم، ســیامەند، ئەحمەد، پیرەهەڵۆ و... بەرەو خوار دەچین، هەر کام باســی هاوڕێیەکی لــە دەســتچوومان دەکەین؛ ئەگەر ســولەیمان بللــوری، ڕەحیم قادری، ســولەیمان ڕەحیمی، کەریم بللوری، جەمال موفتی، مەمەد ســەبزەچی، بەهمــەن مەلازادەگان، کەمال وەلیانی، یونس پاڵەوانی، خەلیل بللوریان، عەلــی موهاجیــری، ڕەحمان زاهیدی و ئەوانــی دی مابان، چەند خۆش دەبــوو. بــە بــەر تەلەفۆنخانــە و گوزەری تــازەدا هاتینە خــوار، یادی جەعفەری مورادیی (خەیات)مان کرد، چۆن لە ڕۆژی پێش شەهیدبوونی ســولەیماندا، لە ســەربان، کاتی ماڵینی بەفری ڕێبەندانی ســابلاخ، بەر فیشەکی وێڵی سوپای پاسداران کەوت و گیانی سپارد. حەیف بۆ کاک جەعفەر، تازە کێ بێت جلەکانمان بە چەند سەعات بۆ ئامادە بکات؟!

### بۆ یەک نەبین، بۆ کەس نابین

دەردی دووری و دڵئەنگاوتــن چەنــد ســاڵێک بوو پشــووی لەبەر بڕیبــووم، نــە دەموێــرا و نــە کەس هەبوو پرێســکەی دڵــی تیماری لا بکەمەوە. هەر خۆم بووم و خۆم، بە تەنیایی و هەناسەســاردی لە کێو و هەردان، لە بن لێفەی شڕ و چڵکندا، لە غوربەت و بێکەسیدا، ژانی دڵ و دووریی یار بڕســتیان لێ بڕیبووم و شەشخانی ئومێدم لێ گیرابوو. من نەمدەزانی و نەشــم چەشــتبوو خۆشــی و ئازاری عاشــقبوون، لە داســتان و ڕۆمانەکاندا لەســەر مەم و زین، خەج و سیامەند، شیرین و فەرهــاد، لەیل و مەجنوون و ڕۆمیۆ و ژولێت و... زۆرم خوێندبووەوە، بــە خوێندنەوە و ســەیرکردنیان هەرگیز هەســتی ئەم ئــازارەم لا وێنا نەبووبوو، کە خۆم لە ماوەی ئەم چەند ســاڵەدا لەگەڵیدا ژیابووم. زۆر جار دەمگوت خۆ گەر چیرۆکی عەشــقی منیش وەک ئەم بەســەرهاتانە بێــت، ئاخــری بە ناکامــی دەمرم و نابێــت بە ئاواتم بگــەم. من لە لای خــۆم و دەروونی خۆمدا پێشــتر خــۆم بۆ تراژیدیای بەیەکنەگەیشــتن

ئامادە کردبوو. هەزاران بار لەناو خۆمدا سۆز و سوێندم تەنیا بۆ خۆم خواردبوو، گەر ئێمە بۆ یەک نەبووین، بۆ کەسی تریش نابین.

بە دەنگدان و قاقایەکی وەســتا کەریــم ڕاچڵەکیم و لەم زیندەخەوە خۆشــەی خۆم، لەناو دەریایەک لە سفرە و مەکۆی خەڵک، لە دەشتایی بەر ســورداش هاتمەوە خۆ. لەگەڵ هەباس و وەســتا کەریمدا چووین لەســەر سفرەی ماڵی خوشکی کاک سەلاح چاوشین لامان دا. خواردن و خواردنەوە بە پای فیلان ئەوەندە زۆر بوو لەم دەشتە، بەشی هەموو کوردستانی دەکرد. کاک سەلاح خۆی پشتی مام جەلالی چۆڵ نەدەکرد و هــەردەم لەگەڵیدا بوو. یــەک دوو جار بە پەلە دەهات و هەر بە پێوە یــەک دوو پێکی هەڵدەدا و بە شــفتە و کوبە خواردنــەوە ڕایدەکردەوە لای مام جەلال.

کــە دەڵێن ڕۆژی حەشــر، ئــەو ڕۆژە بوو. بەرەو ئێــوارە زۆربەی خەڵک شــاد و سەرمەســت، بە هەڵپەڕکێ و سەرچۆپیکێشــان دڵیان لە دەشــتایی بەر گوندی سورداش نەدەبووەوە و کەس پێی خوش نەبوو ئەو ڕۆژە تەواو بێت.

### خەونبینین بە سابلاغەوە

وردەوردە تاریکی باڵی کێشــا و ئێمە دەبوو ڕوو لە شار بکەینەوە. جوامێری و خزمەتکردنی وەستا کەریم هەرگیز فەرامۆش ناکرێت. لەگەڵ هەباس و وەستا کەریمدا درەنگانی شەو گەیشتینەوە ماڵە هەژارانەکەی دایکی وەســتا کەریم. خوشــک و برا و دایک، بە چرکە لە خزمەتکردن نەدەوەســتان و بە ڕووخۆشی و قوربان و سەدەقە و... ماڵی خۆتانە... وایــان لێ کردبوویــن، غوربەتیان لە بیر بردبووینەوە. چیی وای نەبرد، لەبەر هیلاکی و سەرمەســتیی ئەو ڕۆژە خۆشــە، سەرمان خستە سەر ســەرین و خەوی قووڵ و خەونی بوون لە ئامێزی ســابلاغدا بەرۆکی گرتم و بردمی بۆ ناو دەریای خەیاڵ و کووچەی یار.

# ٥١

**مام جەلال داوام دەکات**

کاک سـەلاح بە مام جەلالی گوتبوو با عەلی بەڕێ بکەین بۆ دەرێ، خۆی نەخۆشە و دایک و بابی گیراون و خوشکی ئیعدام کراوە و ئەوە خاڵیشـی خۆت دەزانی بەعس شـورت و گومی کرد و لەناوی برد. مام جـەلال پێی گوتبـوو ئەوجار کە چووینـەوە بۆ بەغدا لەگـەڵ خۆماندا دەیبەین و با خۆی سوراغی خاڵی لە کاربەدەستان بکات. من بیکەم گەر زیندووش بێت ئەوە دەزانن ڕەبتی بە منەوە بووە و نەشیانکوشـتبێت، ئەوجار لەناویدەبەن.

ئێوارەیـەک لەگـەڵ وەسـتا کەریمدا لـە دۆڵپەموو هاتینـەوە و بە پیکابە شـینەکەی مەقەڕی ئەبوو شـەهاب ڕوومان لە دوکانی مەزنگی خوشکەزای کاک سەلاح چاوشین، لە عەقاری کرد. لە دوورەوە مەزنگ گوتـی، ئەوە خاڵـم هەموو شـوێن بەدواتدا دەگەڕێـت و چەند جار لە سورداشـەوە تەلەفۆنـی بۆ ماڵـەوە کردووە و دەڵێ دەبـێ زوو عەلی بیبیننەوە و بێت بۆ سـورداش، مام جەلال داوای دەکات. زۆر پەشۆکام و بە پەلە تەلەفۆنی سورداشم کرد، گوتیان مام و جەماعەت بە کۆپتەر بەرەو بەغدا ڕۆیشـتوون و هەر ئەوەندە گوتوویانە؛ بە عەلی بڵێن بێت بۆ بەغدا و ژمارە تەلەفۆنێکیان بۆ جێ هێشـتوویت. هەر کە گەیشـتیتە بەغدا تەلەفۆنیان بۆ بکەیت.

خۆم دەمزانی چ باسـە، گوتم وەسـتا کەریم ئەگەر بێی هەر ئێسـتا دەڕۆین بەرەوە کەرکووک، بۆ لای کاک شوانی لیژنەی تەنسیق دەچین و ئەو بەڕێم دەکات بۆ بەغدا. وەسـتا یەک و دووی لێ نەکرد و گوتی با بڕۆین. چووینەوە ماڵی وەسـتا، کرۆلایەکی هەبوو، سـواری بووین و هـەر بەم ئێوارەیە ڕوومان لە کەرکووک کرد. ئێوارە درەنگ بە هەر

جۆرێک بوو دیتمانەوە. یەک دوو جار لەگەڵ ئەبوو شەهابدا چووبووم بۆ لای کاک شوان لە لیژنەی تەنسیق. ئەو پیاوە، ئەو شەهیدە گەورە و ڕوحسووکە دەمودەست بەرەوپیرم هات، گوتی شەوە درەنگە نەڕۆیت باشە. گوتم، مام جەلال گوتوویەتی زوو بکەومە ڕێ و بەیانی لە بەغدا بم.

### بەغدایەکی پڕ لە گڵۆپ

بــە پەلــە پێکەوە چووین بــۆ لای کابرایەکی کەتەی چوارشــانە، بە نــاوی غەســان. بەڵگــەی عبوور یــان «عدم تعــرض» بۆ بەغــدای بە چەکــەوە بــۆ وەرگرتم و هەر لەوێــوە چەند ئامــۆژگاری ڕێوبانی ناو بەغدای کردین و ڕێمان گرتە بەر. بەری بەیان و بوومەلێڵ گەیشــتینە بەغدایەکــی پــڕ لە گڵۆپ و منارە و مەیدانی گــەورە. دەخولاینەوە و لە شــوێنێک دەگەڕاین بۆ چەند ســاتێک تێیدا بســەکنین. لەناکاو چاوم بە تابلــۆی «هۆتێــل هەورامان» کەوت. گوتم، وەســتا لێــرە ڕایگرە دەبێ ئەوانە کورد بن. لە تەنیشت شۆستەی بەردەم هۆتێلەکە ڕایگرت، ڕەخت و تفەنگ و دەمانچەکەم لە بن کوشــنی قەمەرەکە شــاردەوە و بە جلی پێشــمەرگایەتی وەژوور لۆبی هۆتێلکە کەوتین. گوتم کارێکی تایبەتمان هەیە و دەبێ تەلەفۆنێک بکەم، بەس ئێستا زووە و هەڵنەستاون، دەکرێ چەند ســاتێک لەســەر ئەو قەنەفانە دانیشــین و دەموچاومان بشۆرین، گوتــی زۆر ئاســاییە. وا بزانم بە جاش و موستەشــارمان تێگەیشــت. چووین بۆ سەرئاو و لەسەر قەنەفەکان بۆ چەند ساتێک وەنەوزمان دا.

### دەنگی دانای ئەحمەد مەجید

گزنگی خۆر لە دەرگای هۆتێلەکەوە تیشکی خستە ناو و هۆرنلێدان و هاتوچۆی سەیارە زیادی کرد. دیسان خۆم خافڵاند و پاش کەمێکی دی چوومە پێش و لە پێشــخانی هۆتێلەکە داوای تەلەفۆنم کرد، ژمارەکەی پێیــان دابووم گرتــم و دەنگــی کاک دانای ئەحمەد مەجید لەوســەری

ســیمەکان بە گوێم ئاشنا هات و خۆشــیی دوورکەوتنەوە لە نیگەرانی، لە شارێکی وەک بەغدا بە غەریبی و ناشارەزایی، ئاوپڕژێنی دڵی کردم و بە کاکە گیان کاکە گیان تێمگەیاند تازە گەیشتووم و لە فڵان شوێنم. بە پێکەنین و چەند وشــەی فارسی کە عادەتی بوو، هەر دەگەیشتە من بۆ فشقیات قسەی پێ دەکردن، گوتی نیگەران مەبە هەر ئێستا دێین بە شوێنتدا.

چیــی وای نەبرد قەمەرەیەکی ڕەشــی دیپلۆماتکاران لەبەر دەرگای هۆتێل ڕایگرت، کاک سەلاح چاوشین و کاک دانا لێی دابەزین، بە چاک و چۆنی و پێکەنین و ڕابواردنەکانی تایبەت بە کاک دانا، لەگەڵیاندا سوار بـووم و هــەر وا بەبێ هیچ باسوخواســتی ئەو شــوێنەی بۆی دەچین، وەک مــەڕی گێــژ دوایان کەوتم. گوتیان با وەســتا کەریــم بگەڕێتەوە سلێمانی و دواتر پەیوەندیی پێوە بکە.

لەســەر شۆســتەکە ماڵئاوایــم لە وەســتا کەریم کــرد و گوتم گەر نەگەڕامەوە دەمانچەکەم بدە بە هەباس، لە مەقەڕی کۆمەڵە لە شینکاوێ.

## پیاو ئاوا دێتە بەغدا؟!

قەمــەرەی ئاخــر مۆدێل بە شــۆفێرێکی عەرەبەوە، کاک ســەلاح لە پێشــەوە و من و کاک دانا لە پشــتەوە، بەبێ ئەوەی بزانم کوێ کوێیە، ئەم جادە بەو جادە دەڕۆیشــت. تا لە جادەیەکی زۆر ئەمنی و خانووی زۆر جوان، لە بن دەرگای ماڵێکی زۆر فاخر ڕایگرت و هەموو دابەزیین. پێشم کەوتن و من بەدوایاندا. هیچ نازانم لە کوێم و کێ دەبینم. لەناکاو لە هۆڵێکی گەورە و پڕ لە ســورەیا و قەنەفەی زۆر شــاز چاوم بە مام جەلال کەوت لە لای سەرووی هۆڵەکە چرووتی بە دەستەوە بوو. بەبێ چــاک و چۆنی و بەخێرهاتن گوتی؛ خۆ تۆ بەخێر خەڵکی شــاری! توو شــەرەف پیاو ئاوا دێتە بەغدا و قەســری جمهووری؟! نەتبوو دەستێک چاکەت و پانتۆڵ بکڕی و بێیت؟! لە ئاســت خۆم وشــک و لاڵ بووم و دەســتم بە لەرزین کرد. هەر ئەوەندە بوو عەرد نەدەقڵیشــایەوە قووتم

بدا و نەجاتم بێت. هێشتا دەوروبەری خۆم بە تەواوی بەر دیدە نەدابوو ئاخۆ کێ لەوێیە. برۆ سەیرێکی ئاوێنە بکە بزانە چۆن هاتوویت؟! مژێکی لە چرووت دا و گوتی، وەرە دانیشە. وردەوردە چاوم گێرا و هەناسەی پەنگخواردووی ناو سـینە و گەرووم دایە دەر و سـەیری دەوروبەری خۆم کرد، زۆربەی بەرپرسە عەسکەری و ئامر تیپەکانی یەکێتی لەگەڵ مـام جەلالـدا بوون. چاکـەت و پانتۆڵی ڕەش و بۆینبـاخ و دەمانچەی جوانـی چواردەخۆر بە قەدیانەوە، لە خزمـەت مام جەلالدا بوون. کاک سـەلاح و کاک دانا بە بزە و پێکەنینی شـاراوە لە مام جەلال، سەیریان دەکردم و ڕازی لەوەی پەندیان پێ داوم، بزە و فیکەی سمێڵیان دەهات. تێگەیشـتم ئیتر کەرەسەی ڕابواردنیان دەستکەوتووە و لە من فەقیرتر و گێژتریـان دەسـت نەکەوتووە، ئەوان و زۆربەی کوڕەکانی شـار لە شـاخیش خـوای ڕابواردن بـوون بە خەڵکانـی تـازە و فەقیرحاڵ، کە دەهاتن بۆ پێشـمەرگایەتی. خۆشـی و شـادی و پێکەنینی مەقەڕەکانی پێشـمەرگە زۆرتـر ڕابواردن و نوکتەگێڕانەوەیان بـوو، ئەوان کوڕانی شار، خوای نەکردبایە کەسێکی لادێ یان فەقیرحاڵیان دەست کەوتبایە، بەڕاسـتی هــەر وەک خۆیـان دەیانگـوت، بـە تایبـەت منداڵەبەدفەڕی سـلێمانی کە دەهاتـن بۆ پێشـمەرگایەتی، تەقلەیان بـە فیلیش لێ دەدا و زۆر بوون لە داخی ئەوانە یان تەسـلیم دەبوونەوە، یان لە شـوێنی پێشـمەرگایەتییان جێگۆڕکێیان دەکرد. هەڵبەت چەمکی مەخسەرەکردن و ڕابواردن بە خەڵکانی مەزڵووم و سـادە لەناو هەموو نەتەوەکاندا و تەنانەت لە مەدرەسـەکانی ئەورووپا و دنیای مودێرن لەناو منداڵاندا و تەنانـەت گەورەکانیش، زۆر باوە و زۆر جار بووەتە دیاردەیەکی پیس و ناخۆشـی کۆمەڵایەتی و هەبووە لە داخان خۆی کوشـتووە، یان بەو هۆیەوە تووشی خەمۆکی بووە.

مام جەلال ڕاستی دەکرد، من بە جلی پێشمەرگایەتی و لە دوورەوە بە زەقی جێی ئارەقاویی ڕەخت و قایشـی مەخزەنەکان لە سـەر شانی چۆغە و پشـتێندەکەم دیار بوو، بە شـەرواڵێکی کوردیی (پانتۆڵ) فش

و پیسەوە هاتبووم بۆ خزمەتی و بۆ بەغدا. دواتر بیرم دەکردەوە بۆ خۆم عەقڵم پێی نەشکا، بۆ لە کەرکووک کاک شوان نەیگوت وا مەڕۆ، بۆ کاک سەلاح و دانا لە بەردەمی هۆتێلکە نەیانگوت با بچین کراس و پانتۆڵێک بکڕین و ئینجا بڕۆین بۆ لای مام؟! ڕاستی هەم بۆ خۆم و هەمیش بۆ خەڵک لەوانەیە ئەوەندە بەم جلانەوە قەدمان گرتبوو، زۆر ئاسایی بووبێت لە نیگای یەکەم منیان وا دیبێت و هیچی سەیر و ناسروشتییان تێدا بەدی نەکردبێت! بە درێژایی ئەو ساڵانە دەیان جار هەر بەم شێوەیە و بەم جلانەوە چوومە خزمەت سەرکردەکان، نە جلی پێشمەرگایەتی و نە بۆنی ئارەقە و نە پیسی و چڵکنیی جلەکانم نەبوونە جێی سەرنج و بەخۆداشکاندنەوەم!

**وەک بنەماڵەی مامۆستا عولەما**

مام جەلال کێشامی بۆ لای خۆی و بە ئارامی گوتی، مەبەستم لە هاتنت بۆ ئێرە دوو شتە: یەکەم خۆت بە زمانی خۆت وەک بنەماڵەی مامۆستا عولەما، داوا لە کاربەدەستانی بەغدا لەمەڕ سەروشوێنی بکەیت، گەر تۆ بیکەیت زۆر تەبیعی و مافی خۆتانە، بەس گەر من داوای بکەم ئەوە یەکسەر دەیسەلمێنن خاڵت سەر بە ئێمە بووە و گەر ئیعدامیش نەکرابێت و تا ئێستا شاربێتیانەوە، کە بەعس ئەم کارانەی زۆر کردووە، ئەوە یەکسەر بە تاوانی پەیوەندی لەگەڵ ئێمەدا هەر دەیکوژن. دووهەم ئێتر ئێستا ئەوە لە ساڵ نزیک دەبێتەوە و هیچ پێشەوەچوونێک نەبووە لە مفاوەزات و ئەگەری زۆرە دیسان شەڕ دەست پێ بکاتەوە. ئێمە هەر جۆرێک بێت لەگەڵ ئێراندا ئەوەندەمان هەر دەبێ نەخۆش و برینداری خۆمانی پێ دەرباز بکەین، ئەدی چی لە تۆ بکەین؟! گوتم وەڵا مامە گیان زۆر ڕاستە خۆشم وەزعی تەندروستی و قاچ و پووک و ددانم هەر وێرانە، یەک بەدوای یەکدا ددانەکانم دەکەون. گوتی، دە باشە با بزانم چیم پێ دەکرێت؟!

بیستم هەموو بەیانیان فازڵ بەڕاک کە تازە بووبوو بە بەرپرسی

هەموو دەزگای ئەمن، لە جێی بەرزانی برای سـەدام، دێت بۆ لای مام. وام لە بیرە «ئەبوو لەهیب» یان «ئەبوو ئەحمەد»یان پێ دەگوت.

### فازل بەڕاک هاتە لام

ڕۆژی دواتر هەموو لە دەوری مام لە هۆڵەکە دانیشتبووین و فازڵ بەڕاک هات، زۆری حورمەت بۆ مام هەبوو، زۆر بە گەرمی دەستیان بە قسەوباس کرد و من هیچی لێ تێنەدەگەیشتم، دیارە عەرەبیم نەدەزانی لە تاکوتوک وشە زیاتر. دوای ماوەیەک کە من لە خوارەوە لەگەڵ کاک سەلاح و ئەواندا دانیشتبووم و کابرایەکی درێژی میسری (دواتر زانیم) بە کالسکەیەکی فاخر و پڕ لە ساردەمەنی و مەشرووب و چەرەسات و شـتی خۆش خۆش بەناوماندا دەگەڕا و پەزیرایی لێ دەکردین، هەستم کرد بە ئیشـارەت فازڵ دەسـتی بۆ من ڕاداشـتووە و پرسـیار لە مام دەکات. مـام بـە دەنگـی بڵیند کە کاک سـەلاح و وان گوێیان لێ بێت و منیش تێبگەیەنن، وەڵامی دایەوە ئەوە خوشـکەزای مامۆسـتا زەبیحی و خەڵکـی ئێـران و مەهابادە. تێگەیشـتم فـازڵ بە مامـی گوتووە ئەم کوڕە واتا من، وەک ئەوان ناچم و کێم، مامیش وەڵامی داوەتەوە. هەر ئەوەنـدە مام نـاوی زەبیحیی هێنا، فازڵ لەم سـەری هۆڵەکەوە بۆ لام هات و دەستی لە ئەستۆم کرد و بە عەرەبی دەستی بە قسان کرد. کاک سەلاح زوو فریا کەوت و ئیجازەی لێ خواست وەرگێڕانمان بۆ بکات و دیاربوو بۆی باس دەکرد عەرەبی نازانم و فارسی دەزانم. فازڵ گوتی: زەبیحی پیاوێکی گەورە و دانشـمەند بوو، من کاتی خۆی لە سـۆڤیەت کە تەلەبە بووم ناویم بیسـتبوو، لێرەش مامۆسـتای مامۆستایان بوو. زۆری تاریـف کرد و دەسـتی هەر لەسـەر شـانم بوو. لـەو ماوەیەدا مـام هیـچ خۆی تـێ هەڵنەقورتاندین و خۆی بە شـتی تـرەوە لە لای سـەرووی ژوورەکە مـژووڵ کردبوو. فازڵ بە دەنگێکـی زۆر ئارام و پـڕ لە میهرەبانی گوتی، دەتوانـم چیت بۆ بکەم؟ تۆ لێرە میوانی عەزیز و خۆشەویسـتی ئێمەیـت. گوتـم ئەگـەر بکرێت چارەنووسـی خاڵم و

شـتومەک و نووسـراو و قامووسـەکەیم پێ بدەنەوە. ئەگەر نەماوە و گڵکۆی هەیە حەز دەکەم بچم. بە هەناسـەیەکی قووڵ سەیری لای مام جەلالی کرد و گوتی، هەموو شـت لە دەسـتی ئەو دایە. ئیتر مام هاتە پێش و ئەویش درێژەی بە قسـەکانی دا و گوتی گەر مفاوەزات سـەر بگرێـت و لەگـەڵ جەنابی مام جەلال بـە چارەسـەری کۆتایی بگەین، ئـەوە دڵنیا بە هەموو شـت باش دەبێت و مـاڵ و کتیبەکانیش لای ئێمە پارێـزراون و دەتدەینەوە، مام چاوێکی بـە مانای ئیتر بێدەنگ بەی لێ هەڵتەکاندم و منیش بێدەنگ بووم.

### هەرگیز عەرەب ئەوە ناکات

دواتر مام بانگی کردم و گوتی، ئەوانە عەرەب و عەشـیرەن ئەوەتا مـن حوکمی رەمیم هەیە، بەس هاتـووم وەک چۆلەکە دەتوانن بمگرن، بـەس هەرگیز عەرەب ئەوە ناکات، هەتا بە سـەلامەتی دەگەمە شـوێن و مەنزڵـی خـۆم. ئەوجـار گەر بیانەوێـت هەرچی خراپـە دەیکەن، کە کردووشـیانە. وەک هەسـتم پێ کرد ئەم پیاوە فازڵ زۆری حورمەتی تۆ گرت و زۆریش بە گەورەیی باسـی مامۆستا زەبیحیی کرد. من پێم باشـە بەیانی کە هات داوای لێ بکە بەڵکو سەفەرێک بۆ دەرەوە بکەیت و ئیتر شـوێنت ئەمن بێت. سـەرم بەلادا خسـت و گوتم ئەمر دەکەیت. گوتـی: هەرچییـەک داوای لێ بکەیت مادام گوتـی میوانی ئێمەی، بۆت دەکـەن. هەر بەم زمانە کە نەخۆشـی و دایـک و بابت گیراون و دەچم بۆ لای براکەم، بەڵکو دوای کارەساتی ئیعدامی خوشک و لەناوچوونی خاڵمان، چەند ڕۆژێک لای بم و دواتر ئینشاڵڵا مفاوەزات سەر دەگرێت و منیش بە ئازادی دێمەوە!

ڕۆژی دواتـر بەیانی زوو هاتەوە بۆ لای مام و دواتر ڕووی لە من کرد و فەرمووی لێ کردم. کاک سـەلاح بە عەرەبی ئەوەی مام گوتی، لـە زمان منەوە بۆی باس کرد. دیار بوو مام گوتبووی عەلی ئیشـێکی پێتە، دوێنێ لە ڕووی نەهاتووە و بە منی گوتووە.

**یەکەم بیتاقە بۆ سوید**

هــەر ئەوەنــدە کاک ســـەلاح قسـەکانی تەواو بـــوون، فــازڵ بانگی شــۆفێرەکەی کرد و چەند وشەیەکی پێ گوت. شۆفیر بە پەلە ڕۆیشت. کاک ســـەلاح و دانــا بـــە پێکەنینەوە چاویان لە من دەکرد، کاک ســـەلاح گوتی، ئەوە ناردی بۆ بیتاقە. بە شــۆفێرەکەی خۆی گوت بچێت، یەکەم بیتاقەت بۆ سوید بۆ بکڕێت و بێتەوە!

وڕ و کاس بووبــووم! جــا چۆن وا دەبێت؟! ئەدی خۆئامادەکردن و خواحافیزی لە هەباس و چی و چی؟! کاک سەلاح گوتی، سەیەکوێر لێت داوە، ئەم شــتانە هیچ نین، موهیم ئەوەیە گەر ئەم دوانیوەڕۆیەش بوو، بڕۆ نەجاتت بێ. ئەوی تر هەموو خۆمان بۆت دەکەین و گەر شتێکیشت هەبوو، بۆت دەنێرین.

نازانم حاڵی دەروونم چۆن وەســف بکەم، وەک لەســەر پشکۆیەکی زۆری ئاگــر بم، حەجمینم لێ بڕابوو، دڵەڕاوکێ و نیگەرانی هەموو ناخ و جەستەمی داگرتبوو.

چیــی وای پــێ نەچوو، ســایق گەیشــتەوە و دەســتە و نــەزەر لە بەردەمی فازڵدا بە چەند وەرەقەیەکەوە وەستا، بە پێکەنینەوە ڕووی لە کاک سەلاح کرد و بۆی باس کرد هەینیی داهاتوو بە ئەڵماندا سەفەری بو سوید بۆ ڕێک خستووە، ئەم پێنج شەش ڕۆژە تا هەینی میوانی من دەبێت و وا دیار بوو مام دەچووەوە بۆ کوردستان.

# ٥٢

ئێوارە شـــۆفێرێک کە ناوی برایم بوو خەڵکی خانەقین، هات و منی بـــردە هۆتێلێکـــی زۆر خـــۆش و ڕاقی، گوتیان ئەمە خۆشـــترین هۆتێلی عێراقە و جێی میوانی تایبەتە، ناوی «الرشید»ە.

برایم گوتی، ئەمرم پێ کراوە ڕۆژانە تا ئۆغر دەکەیت بێم بۆ سەردان و بتبەمە گەڕان و بەغدات نیشان بدەم.

**بڵێی تەسلیمی ئێرانم نەکەنەوە؟**

شـــەممە بوو، دەبوو تا ڕۆژی هەینی ســـەعات نۆی بەیانی کە کاتی فڕینم بوو، چاوەڕێ بم. ئیبراهیم چەند جارێک بەیانیان دەهات و دەیبردم بۆ شـــوێنە مێژووییەکانی بەغدا. لە ڕاســـتیدا خۆم هەر لە دڵەڕاوکێ و بێئۆقرەییـــدا بووم، شـــەو و ڕۆژ فیکر و خەیـــاڵ و تەنانەت ترس بەری نەدەدام. ترس لە دیوەزمەی بەعس بە تاقی تەنیا کەوتبوومە ناویان، بە تایبەت کە لە مام جەلال و ئەو کوڕانەی لەگەڵی بوون، بیستم؛ مفاوەزات بەرەو کۆتایی و شکست دەڕوات. ئەی من بە تەنیا لە ناو زاری گورگدا چ دەکـــەم؟ بە هـــەزاران خەیاڵی ئەشـــکەنجە و گیـــران و بیرهاتنەوەی چارەنووسی ئەحمەد تۆفیق بە دەستی نازم گزار و ونکردن و کوشتنی خالم، هەموو ئەم داســـتان و وەحشیگەریی زیندانەکانی بەعسم لە خۆم کردبوو بە دێوەزمەی ئەم چەند ڕۆژەی مانەوەم لە بەغدا. لە هەمووی ترسێنەرتر بۆ من ئەوە بوو، لە هیچ و خۆڕایی دەمگوت بڵێی تەسلیمی ئێرانـــم نەکەنەوە؟ ئاخر کاتی خۆی زەبیحـــی و قزڵجی و زۆری تریش تەســـلیم کرابوونەوە. تـــرس لە ئێران و عێـــراق مۆتەکەیەک بوو بەری نەدەدام و تۆز و غوماری[1] خەمێکی قورســـی بەسەردا دەباراندم و بە

١- غومار، خۆڵ، تەپ و تۆز، غوبار.

چرکەسات لێم دوور نەدەکەوتەوە. بێئەزموونی لە سەفەر، ناشارەزایی لـە بەغـدا، دووریم لە پێشـمەرگە وەک قەڵایەک لە پشـتم بە درێژایی پێنج شـەش سـاڵی ڕابردوو لە هەڕەتی جەوانیم، بێ زمانی و عەرەبی نەزانینـم، بـێ خزم و کەسـوکاری لەم شـارە گەورەیە، شـەو و ڕۆژ بووبـوو بـە وێردی زمانـم و لە ناوخۆمـدا دەمگوتەوە، «سـەفری بە نابەڵەدی و نابەدڵی». ئای کە ناخۆشە!

لەم هۆتێلە بە خۆشـترین خواردن و خواردنەوەی شـاهانە، ڕۆژ تا ئێوارە پەزیراییان دەکرد، من دڵم خۆش نەبوو. لە سەختترین ڕۆژەکانی ژیانی پێشـمەرگایەتی و ئەو کاتانەی چواردەورمان لە کوڵانێکی شـار، لـێ گیرابـوو، بۆنی ئاگر و باروت هەموو وڵاتی داگرتبوو. دوو سـێ بریندار و یەک دوو شەهید بە کۆڵەوەن، بە مانگ و هەفتە تامی گوشتمان نەکـردووە و لەپە و نیسـک خواردنمان بوو، ئەوەندە نەترسـابووم و ئەوەندەش بێزەوق نەبووبووم.

دەهاتمە دەر زۆر بە ئاسپایی و نیشانەکردن، ڕێگەکەم لێ ون نەبێت و بتوانم بگەڕێمەوە بۆ هۆتێل. چەند هەنگاوێک پیاسەم دەکرد و چاوم لـە فرۆشـگەکان دەکرد. دوکانێکی جلفرۆشـیم دی و چوومە ژوور بە زمانی لاڵان دەسـتم بۆ پانتۆڵ و کراسـێکی زۆر تەنکی هاوینی برد و ئێسـتاش نازانم چۆن کڕیم. دینارم دەرهێنا و بە چاو تێمگەیاند حەقی خـۆت هەڵگـرە. ئیتـر نازانم بەڕاسـتی حەقی خۆی هەڵگـرت یان فێڵی لـێ کردم، چونکە لەمێژ سـاڵ بوو هیچم بۆ خـۆم نەکڕیبوو. زۆربەی کاتەکانـم لـە ناو ژووری هۆتێلکـەدا دەگوزەراند، لۆبی و پێشـخانەکە بـە زۆربـەی کات خەڵکی بیانیی لێ بوو، چەند جارێک هەسـتم کرد و گوێم لێ بوو خەڵک هەبوو بە فارسـی قسـەیان دەکرد. ئەوەندەی دی دەپرینگامەوە و لە ژوورەکەی خۆم نەدەهاتمە دەر.

هـەر ڕۆژی یەکەمی چوونم بۆ هۆتێلەکە تەلەفۆنم بۆ ماڵی وەسـتا کەریم کرد، تەلەفۆن لە ژوورەکەم هەبوو، چەند جار تەلەفۆنی حوسێنی برام لە سوید کرد، نەمدەوێرا ئێران بگرم. وەستا کەریمم تێگەیاند تازە

زەحمەتە بگەڕێمەوە سلێمانی، با بچێت و هەباسی برام لە وەزعی من حاڵی بکات و چەند ناسنامە و ڕەسم و وێنەم هەبوو لە موشەممایەکدا هەڵمگرتبوون، بۆ بێنێت و کڵاشینکۆفەکەم بۆ بفرۆشێت، لەبەر ئەوەی پارەیەکی وام پێ نەبوو.

## چارەنووس بەرەو کوێم دەبات؟

ئێواران دەچووم بۆ ڕێستورانتەکە و لە قوژبنێکی نەدیوو دادەنیشتم، کوڕێکی درێژی ڕەشی میسری لەوێ خزمەتی دەکرد، بانگم دەکرد بە «میستەر عەلی». هیچ لێک نەدەگەیشتین، بەس زۆر بە کردەوە حورمەتی دەگرتم و وەک شتێک ڕەفتاری لەگەڵ مندا بەزەیی تێدا دەبیندرا و چی باش بوو لە خواردن و خواردنەوە لە پێشی دادەنام. بە دەیان مەزەی خۆشی عەرەبی و لوبنانیی لێ بوو، چی مەشرووبی گران و باش هەبوو هەیانبوو. لە بێکەسی و خەم و ترس و غەریبی، هەنگوین بە دەمم وەک کەکرە بوو، خۆم سەرخۆش دەکرد بە مەشرووبی تاڵ و مژی قووڵی جگەرەی یەک لەدوای یەکم. جا کە بە تەواوی سەرخۆش دەبووم، بە حەوت و هەشت ڕۆیشتنەوە، خۆم دەگەیاندە ژوورەکەم، ڕادەکشام و هەتا بەیانی بە هەنیسکان خەو دەیبردمەوە، هەر بەتەمای خۆم نەبووم چیم بەسەر دێت و چارەنووس بەرەو کوێم دەبات؟!

دوای دوو سێ ڕۆژ وەستا کەریم وەک شێر هات و ئەوەی گوتبووم بۆی هێنابووم. نامەیەکی هەباس و وێنە و ناسنامە و ئەو شتانەی حوسێن بە تەلەفۆن پێی گوتم بۆ پەنابەری باشن و بەکارم دێن، ئەو پاسپۆرتەی لێم دە ئاوێ کەوت، کە هەموو شوێنی تەزویر بوو، لەگەڵ شتەکانمدا بوو.

لەگەڵ وەستا چووین بۆ چەند شوێن و چەند ڕەسمێکمان گرت، ئەو گەڕایەوە و بە هیوای دیداری نادیار یەکترمان لە باوەش گرت.

### فازڵ حورمەتی نواند

ئێوارەی ڕۆژی پێنجەم لە هۆتێل، فازڵ لەگەڵ برایمدا هاتن و بەیەکەوە چا و قاوەمان خواردەوە، زۆر بە حورمەتەوە گوتی: تۆ بەیانی دەڕۆیت و خـوا ئـاگادارت بێت. ئەوە بزانە ئێرە هەمیشـە ماڵـی خۆتە و من بۆ خزمەتت ئامادەم. دەستی لە گیرفانی نا و چەند ویزیت کارت و ژمارەی خۆی و سـەفارەتی عێراقی لە سـوید پێ دام و پێداگریی کرد هەرگیز دوودڵ نەبم لە پەیوەندی بۆ هەر کار و خزمەتێک. پرسیی پارەم پێیە؟ گوتم، بەڵێ زۆرم پێیە و پێویستیم بە هیچ نییە. ئیتر لەسەری نەڕۆیشت و بەبـێ هیـچ داوایەک ماڵئاوایی کرد و گوتـی، لە ڕێ لە هەر کوێ لێم قەوما بە تەلەفۆنەکەی خۆی ئاگاداری بکەمەوە.

سـەرەنجام شـەش ڕۆژی پڕ لە غەریبی و کەساسی کۆتایی هات. بەیانـی زوو ئیبراهیـم هـات، ماوەیەک بـوو لە لۆبێکە ئامـادە بووم و چاوەڕوانی بووم، گوتی پاساپۆرتەکەت بشارەوە، یان فڕێی بدە بەکاری هیچ نایە. گوتم دەزانم دەیبەم بۆ براکەم داوای کردووە بۆی بەرم.

### بەرەو هەندەران

جلەکانـی پێشـمەرگایەتیم و ئـەم چەنـد وێنـە و کاغەزانـەم لەناو کۆڵەپشـتێکی بچووک بە شـانەوە بوو. خاوەنی هۆتێل خواحافیزیی لێ کردم و چەند وەسڵم ئیمزا کرد و بەرەو فڕۆکەخانە ڕێ کەوتین. وەک کەڕ و لاڵ و گێژ سـەیری جادە و پرد و ئەم شـارە مێژوویی و پڕ لە کارەسـات و جوانییەم دەکرد. هیچم بۆ نەدەچووەوە سەریەک و تەنیا حەپەسابووم. ڕایگرت و منیش بەبێ هیچ گوتن تەنیا دوای دەکەوتم. بە چەند پلیکان و ڕاڕەودا گوزەراین، زۆر بە توندی هەنگاوی دەنا و منیش بەدوایدا دەڕۆیشـتم. نازانم بەرەو کوێ، هەر نەمزانی گەیشتووینە ناو فڕۆکەخانە، بە تونێلێکی خرتوومیدا لەپڕ چووینە ناو ژووری تەیارەکە، لەگەڵمدا هات تا لەسـەر کورسـییەکی دانام و داوای سەفەری خۆشی بۆ کردم و ڕۆیشت.

بە چاولێکەری لەوانی دی منیش خۆم بەستەوە و هەرچی جیرانەکەم دەیکرد، منیش وام دەکرد. هێندەی پێ نەچوو تایەی فڕۆکە لە عەرد جیا بوونەوە و کەوتینە فڕین بەرەو ئاسمان و بەرەو ئاسۆ، ئیتر نەمدەزانی تاریکە یان ڕوون!

### لەخۆنامۆبوون

جیرانەکـەم بە فارسـی دەسـتی بە قسـە کـرد و پرسـیار بەدوای پرسیاردا زۆر شتی لێ پرسیم. هەستم کرد دەبێت لە موجاهیدینی خەڵق بێـت. ئـەوکات یەکجار زۆر بوون لە بەغدا و سـەدام ئیمکاناتی باش و زەوەندی پێ دابوون و زۆر دڵنیا بوو خومەینیی بۆ دەڕوخێنن. دەمزانی فڕۆکەکـە دەچێتـە فڕانکفۆرت لە ئەڵمان و دوای چەند سـەعات دەبێت بچم و سـواری فڕۆکەی سـوید بم. بەس ناشـارەزایی وات لێ دەکات بڕوات بە هیچی خۆت نەبێت و تووشـی کۆمەڵێک هەڵە و سـاویلکەیت بکات. زۆر بە نەزانی و خاوی چەند پرسیارم لێ کرد، کە ئێستا دەزانم چەند سانا و سادەن. سەبارەت بە فڕۆکەخانەی فرانکفۆرت و ترانزێت چییە و لە کوێ دەبێت، چاوەڕێی فڕۆکەی سوید بم و تێمگەیشت چەند حەپەڕووت و هیچ نەزان و نەشارەزام. لە هۆتێل بە تەلەفۆن، حوسێنی برام چەند جارێک بە وردی بۆی باس کردبووم ڕێگە و گۆڕینی فڕۆکە و فڕۆکەخانەکان چۆنن و دەبێ چ بکەم و چی نەکەم، بەڵام ئەم هەموو شـتە تازانە و فێربـوون و لە یاد مانەوەیان بـۆم هەر قورس بوون و بیـرم دەچوونـەوە، ترس و دڵەڕاوکێ و قەلەقـی زۆر، وای کردبوو لە خۆشم نامۆ بم.

هـەڵا و گرمە و جووڵەجووڵیک پەیدا بوو، میواندارەکانی ناو فڕۆکە دەسـتیان بە هاتوچۆ و سـەردانی کورسـییەکان کرد و یەک پشووش موکەبەرە بە عەرەبی و ئینگلیزی قسـەی دەکرد و هیچ تێنەدەگەیشـتم، بـە دەروجیرانـەوە، دیسـان تێگەیشـتم دەبێت خۆ ببەسـتمەوە و قیت دانیشم و خەریکە دەگەین.

**لە کێ پرسم؟**

فڕۆکە زلەی لوفتانزای ئەڵمانی هەر هات و نەوی بوو، تا وردەوردە خوشـی و تایەکانـی عەردیـان ماچ کرد و بـوو بە چەپڵەڕێـزان. هەر نەمزانی بۆ، بەس گوێم لە سەڵەوات و سوپاس بۆ خوا بوو.

هەرچەند کابرای جیران وەعدی پێ دابووم کە گەیشتینە فرانکفۆرت پارمەتیـم بدات و بمبات بۆ لای فڕۆکەی سـوید و ڕێنماییم بکات، هەر نازانـم کـە دەرگاکان کرانـەوە بە کوێـدا ون بوو. ناعیلاج کۆڵەپشـتە بچکۆلانەکەم دەست دایە و وەدوای شەپۆلی چوونەدەری خەڵک کەوتم. ئەوجـار لە هۆڵێکی گەورەی پڕ لە حەشـیمەت و بە سـەدان دوکان و بازاڕدا خۆم دۆزییەوە، بەڕاستی خۆم وەک قەترەیەک ئاو دەدیت لەناو دەریایەک. گێژ و مل بە هەر لایەکدا سووڕاندن، دەهاتم و دەچووم. ئەو چوار وشـە ئینگلیزییەی لە خوێندن فێـری بووبووم، لە هیچ قوژبنێکی نـاو مێشـکمدا وەدەر نەدەکەوتن و نەمدەوێرا پرسـیار لە کەس بکەم، ئاخر نەمدەزانی لە کێ و بە چ زمانێک بپرسم.

**سەفەری بێ پاسپۆرت**

بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەم بەو کاتە زۆرەی لە پێشـم هەبوو، شـتێک لـە چۆن و چوونـی و چەندایەتی ئەم فڕۆکەخانـە گەورەیە فێر بم، بە حەیرانی و سـەرگەردانی کاتم بەسەر دەبرد. برسیبووم و پارەشم پێ بـوو، یەک دوو بـاڕ چووم دۆلاریان لێ وەرنەگرتـم، بە زمانێکی زۆر شەڕانی و تیژ و دوور لە میهرەبانی، بە ئەڵمانی داوای «مارک»یان لێ کـردم، زانیم پارەی ولاتەکەیە، بەلام تەنیا دیناری عێراقی و دۆلارم پێ بـوو. هیچ، فایدەی نەبـوو، زۆریش گرنگ نەبوو هیچ بخۆم. وردەوردە سـەعات لە پێنجی ئێوارە نزیک دەبووەوە، بیتاقەکەم بە دەستەوە گرت و بە یەک دوو کەسـم نیشـان دا، شـانیان هەڵدەتەکاند و دەڕۆیشـتن، کاتم لێ درەنگ دەبوو، دەبوو شـتێک بکەم، چاوم گێڕا دوو کەس جلی تریان لە بەردا بوو، دەترسـام پۆلیس بـن و وێیان نەدەکەوتم. ئاخری

بە دوو سـێ وشـەی ئینگلیزی پێشـم بە یەکیان گـرت، هەرچی کردم تەنانەت یەک وشەش ئینگلیزی نەدوا و بە ئەڵمانی کە زۆرتر لە مێلۆدی و ئاهەنگی شـەڕ دەچوو، بە هاتوهاوار بە دەسـت داڵانێکی نیشان دام و ڕۆیشـت. گەیشـتمە شـوێنێک لە هۆڵێکی گەورە هەموو شووشـەی تەبـەق زۆر گەورە بوو، بانـدەکان دیار بوون و بە دەیان فڕۆکە پارک کرابـوون. خەڵـک بە جیا ڕیزیـان گرتبوو. دەچوومـە پێش و دەمگوت «سـویدن»؟! وەڵام «نـۆ». دوای چەنـد جار یەکیـان گوتی «یەس». چەنـد کەس لە سـەرە بـوون و یەکێک چاوی لە پاسـپۆرت و بیتاقەی مسافیرەکان دەکرد، چوومە ئاخری ڕیزەکە و یەک یەک دەچوونە پێش و ڕێگەیان پێ دەدرا بۆ ئەو دیوی کۆنترۆڵەکە بچن و سواری تەیارەی سوید بن. دڵم لەسەر سەت لێی دەدا و پەشۆکاوی بە تەواوی سیما و ڕوخسـارمەوە هاواری دەکرد من تەواو نیم. نەفەری پێش من چاویان لە بلیتەکەی کرد و ڕۆیشـت، سـەرەی من بوو دەبوو هەنگاوێک بچمە پێش، دەتگوت دوو پوتی گەورەی ئاسـن بە لاقەکانمەوە زنجیر کراون و جووڵەم نەمابوو. بە ئەڵمانییەکی هاوئاهەنگ وەک شـیرەی ئیگزۆزی تراکتۆر بە دەنگی بەرز نەڕاندی و بە دەستەکانی تێیگەیاندم بچمە پێش. بە ترسێکی نزیک لە زیپەکردن و لەرزین بلیتەکەم دایە دەست. چاوێکی لێ کردم و لە بلیتەکە ڕاما. بە ئەڵمانی و بەوپەڕی زمانشڕی و بێلوتفی گوتی «پاسـپۆرت»! لە ئاست خۆم وشک بووم و گوتم «نەو»! نازانم بـە ئەڵمانـی چیی گوت، ڕەنگە ئێسـتا تێبگەم کە گوتبێتـی؛ ئەوە کەری کوێی و چۆن بێ پاسپۆرت سەفەر دەکرێت؟!

### خۆشترین جگەرەکێشان

بە دەست وەلای نام و تێگەیشتم گوتی لەم گۆشەیە بوەستە با ئەوانی تر بێن و بڕۆن. چیی وای پێ نەچوو دوو زەلامی باڵابەرزی چەشـنی بارگینـی کەتـەی ئینگلیزی بە قەیاسـە و کەلەپچە و زنجیر و باتووم و دەمانچە و کلیل و چی و چی بە قەدەوە وەک باری ئێسترێکی تۆپخانە

ئەملا و ئەولایان گرتم، بە مسـقاڵ تروسـکایی ڕەحم و خۆشەویسـتی و میهرەبانیـت تێدا بەدی نەدەکردن. جاران لە سـینەما فیلمی وایکینگم دیبـوو، دڵنیا بووم ئەوانن هاتوون بـۆ گیانم! کەلەپچەیان نەکردم و بە نـاو قەرەباڵخیـی خەڵکـدا ئـەولا و ئەولایان گرتم و پێـش خۆیان دام. بردیانـم بۆ ژوورێکی گەورە، ژوورەکـە لە ناو خۆیدا چەند بەش بوو، بە دیواری شووشــە و ناوقەد لێک جیادەکرانەوە. کورسییەکیان نیشان دام و دانیشـتم. بە هەردوو دەسـت سەرم لە ناو ئەژنۆکانم گرت و بە بەخـت و چارەڕەشـی خۆم سـەری هەموو دنیام لـێ تاریک بووبوو. ئەوەندە بێئەزموون و ناشارەزا و هیچنەدیتوو بووم، پاسدار و پۆلیس و هەموو ئەوانەم پێ وەک یەک وا بوو. لە ڕاسـتیدا ئەوە یەکەم جارم بوو بە دەسـتی پۆلیس، یان سـەرباز و کەسـێک دەسبەسـەر کرابێتم. سـوێم دەبـووەوە بۆ سـیگارێک، هەرچەند ئەوکات سـیگارکێش وەک ئێسـتا بێقـەدر و حورمەت نەبوون و لە هەموو شـوێن و تەنانەت ناو فڕۆکەش بۆیان هەبوو دووکەڵی خۆیان بە با بکەن، بەس من نەمدەوێرا پاکەت و شـەقارتەکەم بێنمە دەر. خوا ڕەحمی کرد لەو کاتەدا یەک کە لە پشت مێزێک دانیشتبوو، جگەرەیەکی هەڵکرد، تینم دایە خۆ و پاکەتم دەرهێنا و بەبێ ئیجازە هەڵم کرد. تامی ئەو مژە سوکنایی پێ بەخشیم و وەک سەرخۆشـان سـەرم سووڕا و مژ بەدوای مژدا بە چەند چرکە تەواوم کرد و یەکی ترم داگیرساند.

یەک لێم هاتە پێش و بە ئەڵمانی قسـەی کرد، سەرم لقاند، واتا هیچ تێناگەم. گوتی «ئینگلیش»؟! بە دەسـت ئیشـارەتی کـرد چی دەزانم؟! گوتم فارسـی، کوردی! ئۆکـەی ئۆکەیەکی کرد و ڕۆیشـت. ماوەیەکی باشـی پێ چوو یەکیان دیسان دەستی بۆ قوژبنێکی ژوورەکە ڕاداشت، ماشێنی چا و قاوەی لێ بوو، بە ئەڵمانی شتێکی گوت، بەبێ ئەوەی لێی حاڵی بم، قوشقی بووم و گوتم «یەس یەس»!

چـام تـێ کرد و هەر بەدوایـدا جگەرەیەکم داگیرسـاند. ئیتر بێهیوا بووم و دەمزانی تازە درەنگە و فڕۆکەی سـوید جێی هێشـتووم. هەتا

ئاخر سات ئومێدم دەدا خۆم سواری فڕۆکەی سویدم دەکەن، نیگەرانی حوسێنی برام بووم، دەمزانی لە فڕۆکەخانە بێسەبرانە بەهیوای دیداری منــە. وەک منداڵێکــی بێناز لەتاو باوەشــێک و دەستبەســەردا هێنانێک خەریک بوو دڵ لە سینگ بێتە دەر و هەستم بە لیچکردنی خۆم دەکرد. دڵم دەگوشــرا و گەرووم قوڵپی گریــان تێیدا پۆنگی خواردبووەوە. پێم خــۆش بــوو بگریم و هاوار بکەم و ســینگی خودا دابدڕم و شــکایەتی لێ بکەم، بۆچی من ڕووی خۆشــی نابینــم؟ بەم کەمە تەمەنەوە بۆچی ئەوەندە ئازارم دەدا و چیی لێم دەوێت؟!

## وەرگێڕە ئەفغانەکە

یەک لە ئەفسەرەکان هاتەوە و پیاوێکی کورتەباڵای ڕوخسارئێرانیی لەگەڵدا بوو، بە زمانێک کە فارســی نەبوو، بەس تێدەگەیشــتم، بانگیان کردم بۆ سەر مێزی ئەفسەرەکە. بە فارسییەکی زۆر کۆن و پڕ لە وشە لەبیرکراوەکانی ئەو ڕۆژی زمانی فارســی خۆی ناســاند و گوتی؛ من وەرگێڕانت بۆ دەکەم. گوتم باشت لێ حاڵی نابم. شتێکی بە ئەفسەرەکە گوت و دواتر گوتی، وەرگێڕی فارسی و کوردی ئێستا بەردەست نییە و من دەبێت یارمەتیت بدەم. ئەفغانم.

ئــێ! قســـە لە پۆلیــس و وەرگێڕ و مــن و پرســیار و وەڵامی زۆر، بــە کورتــی گوتی: تــۆ بە غەیرەقانوونــی هاتوویت بۆ وڵاتــی ئەوان و پاسپۆرتیشــت نییــە، یــان دەبێت بتگریــن و ڕەوانەی زیندانــت بکەین، یــان ئەوەتا ئەگەری ئەوە هەیــە بۆ عێراقت بنێرنەوە. هەر ئەوەندە بوو دڵ قەفەســی ســینەی نەدەقڵیشــاندەوە و خۆی لە زیندانی ناخم ڕزگار نەدەکرد. هەستم کرد کە باسی ژیانی خۆم و دژایەتیی کۆماری ئیسلام و مەلاکانــم بۆ پۆلیســەکە دەکــرد، کابرای وەرگێڕ بۆخــۆی تەداخولی دەکــرد و لایەنگیریی حکومەتی ئێرانی دەکرد. تــەواو بێهیوا بووبووم. ئەفســەرەکە ماندوو بووبوو، چەند جار وەرقەی لە پێشــم دانا ئیمزای بکەم، هەر گوتم نا! تێگەیشتم داوای پەنابەری بوو لە دەوڵەتی ئەڵمانیا.

گوتم نامەویٚ لێرە پەنابەر بم. بلیتی من بۆ سویدە، یان بمنێرن بۆ ئەویٚ، یان ئەوەتا لە کوێڕا هاتووم دەچمەوە بەغدا. کە زانیی وەرەقەکان ئیمزا ناکـەم، بە تووڕەیی ڕۆیشـت. بە زمانێکی پاڕانەوە لـە کابرای وەرگێڕ داوام لـیٚ کـرد با تەلەفۆنێک بکـەم بۆ بەغدا، زۆر بە منـەت و ناقایلی دەیگوت نابێت. شـەو درەنگی کردبوو، دوو پۆلیس هاتن بمبەن، پێم وا بوو دەمبەن و تەسـلیمی ئێرانم دەکەنەوە. دەسـتم بە هاتوهاوار کرد و چەند جار خۆم ڕاپچکراند. خۆ بەم شووشە تەبەق گەورانە دا بدەم کە ڕووو بە باندەکانی فڕۆکەخانە بوون. یەک دوو جار تێیان سـرەواندم و دایاننامەوە، هەر دەمگوت «تەلەفۆن، تەلەفۆن». ئیتر متمانەم بە کابرای وەرگێر، کە بۆم دەرکەوتبوو لە ئەفغانەکانی سەر بە ئێرانە، نەمابوو.

### کیٚ باوەڕ دەکات میوانی فازڵ بەڕاکم؟

دڵیـان نەرم بوو، گوتیان بچـووە ناو ترانزێت لە تەلەفۆنی گشـتی بـە پـارە تەلەفـۆن بکـە. چەنـد دۆلارم دەرهێنـا و گوتم بـەو پارەیە دەبێت؟! وەرگێر گوتی، تەنیا پارەی ئاسنی مارک دەبێت. گوتم لە کویٚ بیگۆڕمەوە؟! گوتی داخراون! بە زمانێک کە بۆنی دڵپیسووتان و بەزەیی لێـوە دەهـات، لەگەڵمدا هات و نازانم دە بوو یان بیسـت دۆلارێکی لیٚ وەرگرتم، یەک دوو مارکی پیٚ دام و بردمیە بەردەم تەلەفۆنی گشـتی. دوو سـیٚ جار ویسـتم بەغدا بگـرم، نەدەگیرا. یەک بەدوای یەکیشـدا دوو پۆلیسـەکە لە دوورەوە پەلەیان لیٚ دەکردم و دەیانگوت خێرا کە! حوسـێنم وەرگرت لە سـوید، تازە هاتبووەوە لە فڕۆکەخانە، بە هاوار و دەنگـی بـەرز گوتی عەلی لە کوێی، بـۆ نەهاتی؟! حاڵی خۆم بۆ باس کـرد و گوتی، چاکت کردووە ئیمزات نەکردووە. ئەگەر هەیە بتنێرنەوە بـۆ عێراق. گوتم حوسـێن کـە وا بێت تۆ دەبێت بە هـەر جۆرێک بێت تەلەفۆنێک بۆ فازڵ بکەیت و داستانی منی بۆ باس بکەیت. بێتوو ئەوان یەکسـەر سـواری فڕۆکەی عێراقم بکەن و من لـە فڕۆکەخانەی بەغدا دابـەزم، هەتا حاڵییـان دەکەم بەبیٚ زمانی، کەوڵم لـە حاجەت دەخەن.

لـە پۆلیـس و ئەمنی فڕۆکەخانــە کێ باوەڕ بە مــن دەکات، من میوانی حکومەت و فازڵ بەڕاک بووم؟!

تەلەفۆنەکەیـم دا بــە حوسـێن و پێم گوت یەک پشـوو حەول بدات بــەم ژمارەیە قسـەیان لەگەڵدا بکات و تەنیا ئاگاداریان بکات ئەمشـەو یان سـبەی عەلی لەوانەیە بگەڕێتەوە بەغدا و ئاگایان لێم بێت، تووشـم بە تووشـی ئەمنی فڕۆکەخانەوە نەبێت. حوسـێن گوتی لە کۆڕیدۆری شـوقەی خوێندکاریـم کوڕێکـی کەرکووکی هەیە ناوی حەسـیبە، ئەو عەرەبییەکەی باشــە، ئێستا دەچین و قسـەیان لەگەڵدا دەکەین. ئیتر بە دەرد و ئازار و غەمبارکردنی حوسێن، خۆم ڕادەستی پۆلیسەکان کرد.

## هەزاران فیکر و خەیاڵ

کابرای وەرگێڕ ڕۆیشت و دوو پۆلیسەکە ئەولا و ئەملایان لێ گرتم و پێش خۆیان دام. بە چەند پلیکان و ئاسانسۆر گەیشتینە ژێرزەمین، پڕ بوو لە پاس و سـەیارە و ماتۆڕی پۆلیس. گەراجی پۆلیسی فڕۆکەخانە بوو. سـواری ڤانێکی لەو نۆ نەفەرییانەیان کردم، لە سـجنێکی گەڕۆک دەچوو، چواردەوری شـیش و تۆری موشـەبەک بـوو. لە هیچ ئاگادار نەبـووم و وەک کوێر و لاڵ وا بـووم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: دەمبەن بۆ سـەفارەتی ئێران، لە زیندانم دەکەن، جاری وا بوو دڵخۆشـیی خۆم دەداوە و دەمگوت، دەمبەن بۆ هۆتێل و بەیانی دەمنێرنەوە بۆ بەغدا، یان دەمگوت حوسـێن خەڵک و دۆسـت و برادەرانی ئەڵمانیی خۆی ئاگادار کردوونـەوە و هەربینـا هاتن و ڕزگاریان کـردم،... بە هەزاران فیکر و خەیاڵ. لە گۆشـەی پەنجەرە ڕەشەکانی سـەیارەکەوە سەیری جادە و مــاڵ و دوکانەکانی ناو فرانکفۆرتم دەکرد و سـەیارەکە تیژ تێدەپەڕی. گەیشـتینە بـەردەم بینایەکی کۆنی بە بەرد دروسـتکراوی سـەردەمی جەنگی جیهانی. دایانبەزاندم و یەک پشوو توند توند بە ئەڵمانی قسەیان دەکـرد. لە سـێ چوار پلیـکان سەریانخسـتم و دەرگایەکی داری زۆر کۆنی مەحکەمی جوانیان کردەوە و کەوتینە ڕاڕەوێک و دواتر داڵانێکی

دووررودرێژ و ئەمدیو و ئەودیوی دەرگای ئاسن و قفڵکراو. من هەرگیز سـجن نەکرابووم و هیچ سجنێکم تا ئەوکات نەدیبوو، بەس دڵنیا بووم ئێرە زیندانە و لە زیندانی فیلمەکانی سەردەمی جەنگی جیهانی دەچوو. وەک دەڵێن ئەژنۆم شکا، ویستم بەرەنگاریی بکەم و دەستم ڕاپچکراند، بـە دەنگـی بەرز بە کوردی و فارسـی بـە ئاهەنگ و ناڵـەوە دەمگوت بۆ زیندانیم دەکەن و هیچم نەکردووە؟ یەکسـەر کەسـایەتیی ئەم دوو پۆلیسـە گـۆڕا و بـە هەردووکیان کەوتنـە گیانم. بە مسـت، پێلاقە، بە بەعـەرزدادان و قاچ لەسـەر مل دانان، بە دوو نێرەکەری ملئەسـتوور کەوتنـە گیانـی لاوێکـی لاواز و بێدەرەتـان، کـە ئەوکات کێشـم تەنیا پەنجا و شـەش کیلۆ دەبوو. لەم بگرە و کێشـمەدا پانتۆڵەکەی لە بەغدا کریبووم لە نێفەکەوە هەتا سێبەندەی پشتم دڕا و هەڵوەشا. تفێکیان تێ کردم و ڕایانکێشـامە ناو بەندەکە و فڕەیان دام و دەرگایان کڵۆم کرد. لەوەتی هەم و هاتوچۆی وڵاتان دەکەم، هەرچەند زۆر کەم تووشـم بە تووشی پۆلیسـی وڵاتانەوە بووە، بەڵام لە پۆلیسی ئەڵمان نامرۆڤانەتر و بێبەزەیـی و نەخـۆش و ڕەقتر شـک نابەم. من دەزانـم لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا کام لە مرۆڤەکان دەبن بە پۆلیس و سروشتی پیشەکە بەزۆری مرۆڤی جوان و بەڕەحمیان لێ دروسـت ناکات، بەس دیسـان دەڵێم باوەڕ ناکەم لە پۆلیسی ئەڵمان کە بە هەزاران و ملیۆن جوولەکە و مرۆڤیان لە شـەڕی جیهانی کوشـت و سـووتاند؛ بێڕەحم، بێئەدەب، بێمستەوای فەرهەنگی، قینلەدڵ، مەغروور و نامرۆڤانەتر هەبێت لەسەر گۆی زەوی؟!

# ٥٣

ئەو شەوە تەختێک و بەتانییەک، دەسشۆرێک و توالێتێک لە ژوورێک بــە پانتایــی مەتر و نیو بــە دوو و نیو، کونجی زیندانــی من بوو. هیچ هەســـتم بە ئازاری لەشم و شــوێن پێلاقە و مست و زللەکان نەدەکرد. هەرچی بوو، تەنیا ئازاری ڕۆح و نیگەرانی لە بەیانی و تەسلیمکردنەوەم بــوو. ئاخــر دوای ئەو ڕەفتارەی لە فرۆکەخانــە لەگەڵمدا کرا، دەمگوت دەمدەنەوە بە ئێران. لە سەر تەختەکە خۆم گرمۆڵە کردبوو هەر هێندەی باڵینجێک دەبووم و نەدەبووم. بە هەنیســک و خۆخواردنەوە لە هۆش چووم و نەمزانی دەرگایان کردووەتەوە و قاپێکی پیسی خواردن نازانم چ بــوو دایاننابــوو، هەڵبــەت کاتێک دیتم کە بەیانی بــوو هاتن بردیانم. دەرگا کرایەوە پۆلیسێک بە ئەڵمانی بانگی کردم و نەمزانی چی دەڵێت؟! ویســـتم بە بێزمانی حاڵی بکەم پانتۆڵەکەم هەمووی دڕاوە، دەســـتم بۆ نــاو نێفەکــم برد بۆ ئــەوەی حاڵیی بکەم، کەچی دەســتی بە پێکەنین و ڕابواردن کرد. پاڵی بە شــانمەوە نا و پێش خۆی دام. حەوشەیەک بوو ڤانێک وەســـتا بوو، چەند کەسی لە پشــتەوە تێدا بوو، منیش لەگەڵیاندا ســوار بــووم، هەمــوو کەلەپچــە کرابوون، منیشــیان کەلەپچــە کرد و لەســەر کورســێک دایاننام. نازانم جاری وایــە ڕۆح دەرناچێت و تەنیا پیش دەخۆیتەوە، بینیم لەگەڵ ســێ چوار کەسی کە وەک دز و ترياکی دەچوون، لەناو ڤانێکی بەزیندانکراو هاوسەفەرم، بۆ کوێ، نازانم؟!

ئەوان بەیەکەوە قســە دەکەن، هیچ تێناگەم و بێدەنگ دوو دەســتی کەلەپچەکــراوم لە ناو کۆشــم گرتووە و کۆم بوومــەوە و چەناگەم بە ئەژنۆکانمەوە نووساون.

لەناو موشەبەک و پەنجەرەکانی ڤانەکەوە، جادە و ماڵەکانم دەدیتن، کەوتینە جادەی جووت سایت و چوار و هەشت سایت.

### فڕۆکەکانی ئێران

لەناکاو چاوم بە باندی فڕۆکەخانە کەوت و چەند دانە فڕۆکەی ئێران و هومائێر وەستابوون. ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە کە ئەو دێڕانە دەنووسم و بیری ئەو چەند ساتە دەکەم، کە چاوم بە فڕۆکەکانی ئێران کەوت، توانای ئەو دەربڕینەم نییە و ناتوانم هەستی ئەوکاتم بێنمە سەر کاغەز و وێنای حاڵی خۆم بکەم. ئیتر وام زانی فیکر و خەیاڵەکانم بوون بە ڕاستی، ئەوە تەسلیمی ئێرانم دەکەنەوە، ئەگەر وا نییە بۆ هێناویانم بۆ ناو ئەو هەموو فڕۆکەی ئێرانیی؟! فیکری خۆفڕێدانم هەبوو، بە دەستی کەلەپچەکراو و دەرگای شیش و موشەبەککراو چۆن دەتوانم؟!

لە قوژبنێکی نادیاری ناو فڕۆکەخانە، نەمدەزانی کام فڕۆکەخانەیە، ڕایانگرت و پۆلیسێکیان دابەزاندم. دەرگایەکی ئاسنی بچووکیان کردەوە و بە قادرمە چووینە سەر و کەوتینە هۆڵێکی گەورەی پڕ لە حەشیمەت، گومانم هەبوو شوێنەکەی شەوی پێشوو بێت، بەس کە کەمێک ڕۆیشتین، چووینەوە هەمان ئۆفیسی پۆلیسەکانی ناو فڕۆکەخانە، کە شەوی پێش ئیفادەیان لێ وەرگرتم. واتا هەمان فڕۆکەخانەی فرانکفۆرت بوو.

### پانتۆڵی دڕاو

کاتی دابەزین لە ڤانەکەدا، پۆلیس کەلەپچەکانی لە دەستم کردبووە، چەند قسەی لەگەڵ ئەفسەرەکاندا کرد و ڕۆیشت، من لە شوێنی شەوی پێش دانیشتم. قسەیان لەگەڵدا دەکردم و دەیانزانی هیچ تێناگەم، بێدەنگ دەبوون. دڕاویی پانتۆڵەکەم زۆر پێ عەیب بوو، نەمدەزانی چیم لێ دەکەن و لە پەنجەرەکانەوە تەنیا فڕۆکەی ئێرانی کە وەستا بوون، لێمەوە دیار بوون. لە نەزانی پێم وا بوو ئەم شوێنە بەشی فڕۆکەکانی ئێرانە و لێرەوە هەرچی فڕۆکەیە دەڕۆن بۆ ئێران.

چەند جار بە مێشکمدا هات خۆم بەو تەبەقە شووشە گەورانەدا بدەم و خۆم فڕێ بدەمە خوار و کۆتایی بە ژیانم بێنم، دیسان دەمگوت

پەلە مەکە بەڵکو وا نەبێت. ئەوەتا فڕۆکەی وڵاتانی تریش چەند دانەیەک دیارن. هەرچی سەرنجم دەدا فڕۆکەی عێراقم نەدەدیت، دیسان دڵخۆشیی خۆم دەدایەوە و دەمگوت خۆ ئەوەی پێی هاتم ئارمی عێراقی پێوە نەبوو، ئەڵمانی بوو.

### نەو ئێران

بە دەست نێفەکم بە یەکیان نیشان دا و ئاماژەم بە مەکینەی دروومان و دەرزی و دەزوو کرد، لە قاقای پێکەنینیان دا و بە ئەڵمانی دەستیان بە گاڵتە کرد. هیچ فایدەی نەبوو، دانیشتمەوە. هەموو بەیانی و پێشنیوەڕۆکەی لەم ژوورە بە دیار چارەنووسی نادیار لە فیکر و خەیاڵاتی هەرچی مومکین و نامومکینە بە جگەرەکێشان و هەناسەی سارد تێپەڕ کرد. لای سەعات سێ و چوار بوو، هاتن و هەڵیانستاندم، بە هاتوهاوار و قیژاندن هەر دەمگوت: «نەو ئێران»، پێم وا بوو کابرای موجاهید لەناو فڕۆکەی بەغدا، یان کابرای وەرگێڕی ئەفغانی ڕاپۆرتیان لێ داوم و تەسلیمی ئێرانم دەکەنەوە. هەرچی دەمگوت، «موتەرجم موتەرجم...» تەنیا سەریان دەلەقاند و پاڵیان پێوە دەنام بەدوایاندا بڕۆم.

سەرەنجام بە تونێلێکدا بردیانم و کەوتمە ناو فڕۆکەیەکی گەورە. میواندارێکی خوێنشیرین دیار بوو، بە سەر بەخێرهاتنی کردم و لەگەڵ ئەفسەرەکەدا چەند وشەیەکیان گۆڕییەوە، هەر لە پێشەوە لەسەر کورسییەک دایان نام و پۆلیسەکە ڕۆیشت. ویستم لە میواندارەکە بپرسم بۆ کوێ دەچین؟ بۆم جێبەجێ نەبوو. فارسی و کوردی نەیخوارد، بە دەست و سەرلقاندن ویستم حاڵیی بکەم. لەناو وشەکانیدا بە ئەڵمانی بەغدام گوێ لێ بوو. هەر باوەڕم نەدەکرد و دەمگوت جاری دەمخافڵێنن بۆ ئەوەی هیچ نەکەم.

## وشەی بەغدا ئارامبەخش بوو

فڕۆکە هەستا و کەوتینە ئاسمان، دیسان لە بڵیندگۆکانەوە کە یەک پشوو قسەی دەکرد و دیار بوو ڕێنموونیی موسافرەکان دەکات و یەک بە دەست و ئیشارە دەیگوت چ بکەین، دیسان گوێم لە وشەی بەغدا بوو. ئای بۆ ساتێک ئەم وشەیە لە گوێمدا چەند خۆش و ئارامبەخش بوو.

وردەوردە دەست کرا بە پەزیرایی، چا و ساردی و مەشرووب هات. لە پیاوێکی کورسیێکی ئەوﻻترەوە کە هەستم کرد لە خەڵکی وﻻتانی ﻻی خۆمان دەچێت، بە ئیشارە و چەند وشەی عەرەبی، فارسی و کوردی و ئینگلیزی، وەک کوێر و ﻻﻻن پرسیم بۆ کوێ دەچین؟! ئاخر هەر گومانم هەبوو. بە ڕوونی تێی گەیاندم بەغدا!

ئەوجار پشووییەکم دا و وردەوردە دەهاتمەوە خۆ. دڵەڕاوکێ و نیگەرانی لە بەغدا چۆن دەبێت، فیکر و خەیاڵمی داگیر کردبوو. تۆ بڵێی حوسێن کەسی ئاگادار کردبێتەوە؟ دەستم بۆ کۆڵەپشتەکەم برد و ژمارە تەلەفۆن و دەفتەرەکەم و چەند کاغەزی هۆتێلەکەمی تێدا بوو، ژمارە تەلەفۆن و ئەدرەسم پێ بوو، دەمگوت هیچ نابێت و ئەگەر نەیانناسیم و کەس نەهاتبوو ئەم شتانەیان نیشان دەدەم. لەوپەڕی برسێتی و هیلاکیدا، نە هیچم بۆ دەخورا و نە خەوم لێ دەکەوت.

دوای سێ چوار سەعات، هاتوچۆی میواندارەکان و دەنگی بڵندگۆکان پەیامی گەیشتنی بەغدایان دەدا. خورپە و لێدانی دڵم لە زیادبووندا بوو. خۆم کۆ کردەوە و هەرچی دەمکرد چۆن دڕاویی پانتۆڵەکەم بشارمەوە؟ بۆم جێبەجێ نەدەبوو.

## بەیانی فازڵ دێت

فڕۆکە نیشت و تونێلێکی گەڕۆکیان پێوە نووساند، من لە پێشی پێشەوە بووم و هاتمە دەر. لە زارکی تونێلکە گوێم لێ بوو بڵندگۆکە دەیگوت: «سەیدی عەلی ئیبراهیم...»! ئیتر دڵنیا بووم بە شوێنمدا

هاتـــوون، لــه دوورەوه هـــەر لـــه کۆتایی تونێلەکـــه چاوم بـــه ئیبراهیم شـــۆفێری فازڵ کەوت، له خۆشـــیان هاوارم لێ کرد و بەرەوپیرم هات. جانتا و شـــتم پێ نەبوو، یەکسەر بەبێ پاسکۆنترۆڵ و شتی وا چووینه دەر و ســـواری ســـەیارەکەی بووم. لێی پرســـیم و باسوخواســـی خۆم بـــۆ گێڕایـــەوه، دڵخۆشـــیی دامەوه و گوتی بەیانی فـــازڵ دێت بۆ لات و خـــەم مەخۆ. خەتای خۆمان بـــوو، دەبوو به دانیمارکـــدا بەڕێت بکەین. ئەڵمـــان زۆر نانەجیبـــه. لێی خوڕی بۆ هەمـــان هۆتێل و تەنانەت عەینی ژوورەکەی خۆمیان دامەوه.

### تەنیا لەبەر ئەوەی عەرەبی دەزانی

تەلەفۆنی حوســـێنم وەرگرت، دەمزانی حاڵـــی ئەویش له من خراپتر بووه. باســـی هاتنەوه و شـــەوی ناخۆشـــی نـــاو زیندانـــی فرانکفۆرت و گەیشـــتنەوه بـــۆ هۆتێل له بەغـــدام بۆ کرد. ئەویـــش دوای تەلەفۆنەکەی مـــن لـــه فرانکفۆرت و ئەگـــەری گەڕانەوەم، چوو بوو بۆ لای حەســـیب، هاوکۆڕیـــدۆری خوێندکاریـــی و داوای لێ کردبوو بێته ژوورەکەی و به تەلەفـــۆن لەگـــەڵ بەغدادا به عەرەبی وەرگێڕیی بۆ بکات. کاک حەســـیب که خوێندکارێکی کەرکوکی دەبێت له ســـوید و دژی بەغدا و حکومەتی ســـەدام بـــووه، دەڵێت جا چـــۆن تەلەفۆن بۆ ئـــەو ســـەگبابانه دەکەم و قســـەیان لەگەڵدا دەکەم؟! دوای هێنانوبردن و گفتگۆیەکی زۆر؛ بابه خۆ تۆ ناڵێی کێم، بڵێ من حوسێن برای عەلیم! تۆ تەنیا لەبەر ئەوەی عەرەبی دەزانیـــت ئـــەو کاره بۆ من دەکەیت، شـــێر و ڕێوییەکـــی زۆری بۆ باس دەکات و ئەوجار قەناعەت دێنێت به هەزار منەت و خاتر و هاوڕێیەتی، ئـــەو تەلەفۆنه بکات. گوتی تەنیا چەند چرکەی خایاند و هەر که گوتمان عەلی دێتەوه، گوتیان، خەمتان نەبێ خۆمان دەچین به شوێنیدا.

هەرگیز ئەو ســـاته خۆشـــەم بیر ناچێتەوه که خۆم به تەختەکەدا دا، دەرگای سەلاجەکەم کردەوه و دەستم کرد به بیرەخواردنەوه. خەوێکی قووڵ دایگرتم و تا بەیانییەکی درەنگ نوستم.

### ئەڵمان نەدەبوو وا بکەن

لــە خواردنگەکە دانیشــتبووم فازڵ و ئیبراهیــم هاتن، ئیبراهیم بۆی بــاس کردبوو چیــم بەســەرهاتووە و زۆری پێ ناخۆش بــوو. گوتی، ئەڵمانیــا نەدەبوو لەگەڵ موســافری ئێمەدا ئەم ڕەفتــارە بکات. ئێمە بە یەکــەوە هاوکاریمــان هەیــە، پێم ســەیرە ئاوایان کــردووە. ئێمە پێیان دەڵێین و گلەیان لێ دەکەین. ئێمە تەنیا ترانزێتی ئەوانمان بەکار هێناوە، چییــان بــەوە داوە تۆ بۆ کوێ دەچیت؟! دەبوو بە بۆرِدینگ پاســەکەت ڕێگەیان دابا ســواری فڕۆکەی ســوید بیت! بێغەم بە، ئێســتا ئیبراهیم دەنێرم، بە دانیمارکدا بلیتت بۆ بێنێت، ئەوان بێ کێشەن. زۆرم سوپاس کــرد و هەر ئەوەندەی بــە پیرمەوە هاتبوون لە فڕۆکەخانە، زۆر گرنگ و چارەنووسساز بوو بۆ من.

ئێــوارە ئیبراهیم هات و گوتی، پێنج ڕۆژی دی فڕۆکەی کۆپێنهاگنت هەیــە و لەوێشــەوە بــۆ ســتۆکهۆڵم. ئەم چەنــد ڕۆژە بۆ خــۆت لێرە ئیستراحەت بکە.

### مام جەلال ئاگادار دەکەین

دیسان پێنج شەو و ڕۆژی دی لە بەغدا، ئەوجار وردەوردە بە پێ لە هۆتێلەکە دوور دەکەوتمەوە و بۆخۆم دەگەڕام. چەند شوێن و جێگەی گەشتیاری چووم و چەند وێنەم لێ گرتن. چەند جارێک تەلەفۆنی ماڵی خوشــکی کاک ســەلاح چاوشین و وەستا کەریم و ماڵی ئەبوو شەهابم لــە کەرکووک گــرت و تا ڕادەیەک ئــاگاداری خۆمم کــردن و گوتیان، گــەر شــتێک بوو خەبەرمان پێ بــدە، دەتگەڕێنینەوە بۆ کوردســـتان و مــام جەلالیش ئاگادار دەکەین کە تۆ هەر لــە بەغدایت و ئەوەندە بزانە مفاوەزات خەریکە بە تەواوی فەشــەل دێنێ. گەر ترسێکیش بوو خەڵک دەنێرین و دەتشارنەوە.

### کچ بە ئیشارەتی چاو

مــن دیســـان وەک میوانێکــی قەدرگــران و زۆر بــە حورمەت ئەم چەند ڕۆژە پەزیراییم لێ کرا. دیســـان بەیانی زوو وەک جاری پێشــوو برایــم هـــات و ســواری فڕۆکەی دانیمارکــی کردم و گوتــی، هیوادارم ئەمجارە نەگەڕێیتەوە. لە جاری پێشــوو باشــتر بــووم و چاو و گوێم کرابوونەوە و ئەو چەند ڕۆژەش هەموو شـــەوێک لەگەڵ حوســێندا بە دووردرێژی بە تەلەفۆنی هۆتێل قسەمان دەکرد و وردەکاریی هەموو ســـەفەرەکەمی بۆ باس دەکردم. چۆن دێم بۆ فڕۆکەخانەی کۆپنهاگن و چەند لە فرانکفۆرت بچووکترە و ئەم شــتانە. گوتی، هەر نیگەران مەبە باشــترە من کچێکی هاوڕێی فارســم هەیە، هەمان ســەعات دەینێرم بۆ فڕۆکەخانەی کۆپێنهاگن و ڕێوبانەکەت نیشـــان دەدات. ئەو وێنەی تۆی دیــوە و خــۆی دێتە پێش، تۆ تەنیا دوای بکەوە و بە ئیشـــارەتی چاو و پەنجە پێت دەڵێت چ بکەیت، بەس قسەت لەگەڵدا ناکات، با کەس گومانی لێ نەکا. بە هەمان فڕۆکە کە تۆ دێنێت بۆ ســوید، ئەویش دەگەڕێتەوە. لە فڕۆکەشدا لە پشتی پشتەوە دادەنیشێت، بۆ ئەوەی کە لە ستۆکهۆڵم دابــەزی، ئەو لە ترانزێت بە ئاســـایی دێتە دەر و پێت دەڵێت لێرە خۆت تەسلیمی پۆلیس بکە و داوای پەنابەری بکە.

ســەفەرێکی چــوار ســـەعاتە و ئێوارەیەکی درەنگ لەنــاو ترانزێتی کۆپێنهاگــن خــۆم دیتــەوە. چاوم گێــڕا و هەر زوو کچێکــم دی چاوی لێ دەکردم، بەســـەر و چاو ســـڵاوعەلێکمان کرد و دووراودوور دوای دەکەوتم و ئەویش ئاگای لێم بوو. بەرەو گەیتی ســوید چوو و بە پەلە بۆردینگ پاسەکەی لێ وەرگرتم و چووە پێش و ئەوەی خۆی و ئەوەی منــی بەیەکەوە لە پێش دیســکی کۆنتــڕۆڵ دانا. لایەکیـــان لێ کردنەوە و گوتیــان فەرمــوون. بــە خەرتوومێکدا چووینە ناو فڕۆکە و لە ســـەر ژمارەکەی خۆم دانیشــتم، ئەویش بەرەو دواوەوە ڕۆیشــت و خۆی لێ نەناس کردم.

# ٥٤

**ئای ئەم کوردیش**

هـــەر ئەوەنـــدەی چایەکـــم خـــواردەوە و ســـیگارێکم کێشـــا، دەنگی دابەزیـــن لە بڵیندگۆکان بەرز بووەوە و لەســـەر ئاســـمانی ســـتۆکهۆڵم بـــووم. یـــەک بەدوای یەکدا هاتینـــە خوار و ڕوو بـــە چوونی دەرێ، بە نەرمی هەنگاوم دەنا، هاوڕێکەی حوسێن بە پەلە بە لامدا تێپەڕی، لەبن خۆیـــەوە گوتـــی وەدوام بکەوە. گەیشـــتینە دیوار و یـــەک دوو ژووری بچووکی شووشەیی، خەڵک سەرەی گرتبوو، یەک یەک دەچوونە پێش، بە ئیشـــارە گوتی، لەســـەر ئەم کورسییانە دانیشـــە و خۆی چوو پێش، لە بەردەم ژووره شووشـــەیەکەدا بە پەنجەرەیەکی بچووکدا چاویان لە پاسەکەی کرد و چوو بۆ ئەودیو و لە من نەدیو بوو.

لە پشـــتی دیوارەکە دانیشـــتم و چاوم لەو خەڵکە دەکرد کە بە پەلە دەچوونە ئەودیوی پاســـکۆنترۆڵ. نقەم لە خـــۆم بڕیبوو، پێی گوتبووم دانیشـــم، تـــا دێـــن و لێم دەپرســـن. دوای ئەوەی زۆری پـــێ چوو، هەر نەدەچووم بەرەو ئەو شـــوێنەی پاسپۆرتیان کۆنترۆڵ دەکرد. پۆلیسێک هات و بە ســـویدی پرســـیاری لێ کردم؛ هەرچەم لە بـــڕەی نەدەکردەوە چـــی دەڵێت، هـــەر دەمگوت: «ئای ئـــەم کوردیش»! زۆر بـــە ئارامی و ئاســـایی ســـەری ڕاوەشـــاند و دیاربوو دەڵێ؛ چاوەڕوان بە. چیی وای نەبـــرد هات بردمـــی بۆ ژوورێکی بچووک، هەر لە بـــەری ناو ترانزێت. مێزێک و دوو کورســـی و چەند ئامێرێکی تەلەفۆن و شـــتی وا لەســـەر مێزەکەی بوون. پەنجەی بە ئامێرێکەوە نا و بە سویدی قسەی کرد، لە تەسجیلێکی بچووک دەچوو، پەنجەی لەسەر ئامێرەکە هەڵبڕی، دەنگێک بە کوردی لە ئامێرەکەوە هات و بەخێرهاتنی کردم بۆ سوید! حەپەسام، ئەی ئەمە کێیە؟! بە ســـویدی قســـەی کرد و ئەوجار بە کوردی گوتی،

کاکــە من وەرگێڕم و لە ماڵەوە بە تەلەفۆن کار دەکەم. ئێســتا هەرچی قسەی تۆیە، بۆی وەردەگێڕم و ئیی پۆلیسەکەش بۆ تۆ! لە خۆشیان و حەپەساوی کە کوردێک وا بە میهرەبانی قسەم لەگەڵدا دەکات، خەریک بوو باڵم دەگرت!

### کەوتوومە کام بەهەشتی سەر زەوی؟

لە ماوەی کەمتر لە چارەکەسەعاتدا باسی خۆمم بۆ کرد و چەند بەڵگە و وێنەی پێشــمەرگایەتی و ئەم شــتانەم نیشان دا. زۆر بە ڕووخۆشی کاکــی وەرگێڕ گوتی، داوای پەنابەری دەکەیت؟ گوتم بەڵێ و براکەم لە دەرەوە چاوەڕوانە. گوتی، ئێمە تۆ دەبەین بۆ شــوێنێکی وەک هۆتێل و دواتــر بە کاروبــاری پەنابەریی تۆ ڕادەگەن. هەمووی زۆر کورت بوو. پۆلیســەکە هەســتا بە ئیشــارە گوتی، دوام بکەوە. چووین بۆ هۆڵێکی گــەورە، چەند قایشــی گــەورەی جووڵێنەر بۆخۆیان دەســووڕانەوە و جانتایان لە ســەر بوو. لە تەنیشت یەکیان وەستا و بە پەنجە ئیشارەی کرد کامیانە؟! منیش تێگەیشــتم دەڵێت جانتاکەت هەڵگرە! منیش هەر بە دەســت و سەر دەمگوت «نۆو»! وردەوردە بێزار دەبووم. من مەبەستم ئــەوە بوو بڵێم جانتــام نییە و نەمدەزانی چۆنی بڵێــم، ئەویش باوەڕی نەدەکرد لەو ســەفەرە دووروودرێژە، هاتبێتم بۆ ئەمســەری دنیا و هیچ جانتا و شــتومەکم پێ نەبێت. هێندەم گوت «نۆو نۆو» ماندوو بوو. بە ســەر گوتی دوام بکەوە. هاتین بۆ گەراجێک لــە ژێر بینای فڕۆکەخانە و ســواری مینی پاســێکی پۆلیس بووین، شۆفێرەکەش جلی پۆلیسی لە بەردا بوو. بە حســێبی ســەعاتی خۆم و جیاوازیی کات دەبوو سەعات یەک و دووی بەیانی بێت، کەچی خۆر لە ناوەڕاســتی ئاســمان بوو، لە بەیانییەوە کە لە بەغدا دەرکەوتبووم، ئەوە یەکەم جار بوو ئاسمانم لێ دیار دەکەوت. بە جادەی باریک و ئاسفاڵتی چۆڵ و بێدەنگدا سەیارەکە بــە ئارامی ڕێی دەکرد. ئەمدیو و ئەودیــو جەنگەڵ و داری بەرز بەرز، دیمەنێکی دڵفڕێن لە ژێر ئەم خۆرە گەشە خۆی نیشان دام و بە تەواوی

دڵی خۆش کردم. قسەمان نەدەکرد، بەڵام بە نێوچاوان و بزەی سەر لێوان زۆر بە میهرەبانی لەناو سەیارەکەدا لەگەڵمدا دەجووڵانەوە. دار و جەنگەڵ و باخچە و خانووی جوان و سەقفگۆشەییەکان بە خێرایی وەک شریتی سینما بە بەرچاومدا ڕێشکەوپێشکەیان دەکرد و بە خۆمم دەگوت، کەوتوومە کام بەهەشتی سەرزەوی، وا دیارە ڕۆژەکانی تەنگانەیی و بێپەناهیم تەواو دەبێت؟!

## ماڵە تازەکەم

هەر دوای چەند خولەکێکی کەم، لە بەردەرگای بینایەک ڕایانگرت و فەرمووی دابەزینیان لێ کردم. لە بیناکە چوونە ژوور، چەند هەنگاوێکیان بڕی و لە ناو کۆریدۆرەکەدا دەرگای ژوورێکیان کردەوە، بەستەیەکیان لەگەڵ کلیلی ژوورەکەدا پێ دام و بە سەر و دەست ماڵئاواییان لێ کردم. دوای ساڵانێک ئاوارەیی و بێماڵی، ئەوە یەکەم ماڵی غوربەتم بوو. هەنگاوم نایە ناو ژوورەکەم و چاوم بە چواردەورمدا گێڕا، پەنجەرەیەکی گەورە ڕوو بە جەنگەڵ، تیشکی پڕ لە ڕووناکی، خۆری دەخستە ناو ژوورەکە. پەنجەرەکە پەردەیەکی قاش قاشی پێوە بوو، کە دەتسووڕاند ژوورەکەی بۆ دەکردی بە شەوەزەنگ. نیوەشەو بوو، بەڵام نیوەڕۆیەکی گەرمی خۆر لە ئاسمانی هاوینی بوو، بەستەکەی پێیان دابووم مەلافە و سەرسەرین، شەش هێلکە، مرەبایەکی بچووک، ڕۆنەکەرە، پەنیر و چەند شتی وای تێدا بوو. تەختێکی جوان بە دۆشەک و مەلافەی ئوتووکراو، کۆمۆدێکی بچووکی تەنیشت تەخت، دوو کورسی و مێزێکی بچووک کەرەسەی ناو ماڵە تازەکەم بوو.

## هەتیم لێرە چی دەکەی؟!

لەسەر تەختەکە بۆی ڕاکشام، بەڵکو خەوم لێ بکەوێت، زیاتر لە پانزدە بۆ بیست سەعات بوو بەڕێوە بووم. نەمتوانی بنووم، خەو لە چاوەکانمدا زڕابوو. نەمدەزانی ئەم شوێنە چییە و کێی لێیە، بە ئەسپایی

دەرگای ژوورەکەم کردەوە و سەرم بە چەپ و ڕاستی کوریدۆرەکەدا گێڕا، ئەوبەر و ئەمبەر بە درێژایی، دەرگای ژوورەکان بوو. هەستم ڕاگرت دەنگێک دەهات، وەک پێکەنین و قسەکردن. دوای دەنگەکە کەوتم، لە نهۆمی سەرەوە بوو، چەند پلیکانی بۆ چوومە سەر، لە هۆڵێکی گەورە دوو سێ کەس لە ناوەڕاستی هۆڵەکە لە سەر مێزێک پینگ پۆنگ (تێنیسی سەر مێز) بە هاتوهاوار بە کوردی قسە دەکەن و یاری دەکەن. لێیان چوومە پێش:

- ئای، هەتیم ئەوە تۆ چی دەکەی لێرە؟!
- ئەی، باوەحیز تۆ لێرەی؟!

یەکسەر وا وەڵامی هاوڕێم عەلی زەمانیم داوە، کە لە زووەوە دەمناسی، پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو.

بە دیتنیان زۆر شاد بووم، یەک دوو پێشمەرگەی برینداری کۆمەڵە لەوێ بوون، ئەوانیش هەر یەک دوو ڕۆژ بوو گەیشتبوونە سوید. تێیانگەیاندم ئێرە هۆتێل یان کەمپێکی پۆلیسی فڕۆکەخانەیە و ناوی گوندەکە «مەشتا»یە. زۆربەی پەنابەری فڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم بۆ ماوەی کاتی دێننە ئەوێ، هەتاکو شوێنی یەکجارییان بۆ دابین دەکەن.

### حوسێن و کەیسی پەنابەری

عەلی زەمانی کوڕە خاسەکەی سەردەمی شەڕی نەورۆزی خوێناویی سنە گوتی، حوسێنی برات ئێوارە تا درەنگ لێرە بوو، چاوەڕوانی تۆی دەکرد، دەیزانی دەتهێنن بۆ ئێرە. زۆری باسی پیاوچاکیی حوسێن کرد. ئەوکات حوسێن بەرپرسێک بوو لە ڕێکخراوی دەرەوەی کۆمەڵە، گوتی، زۆرمان پێ ڕادەگات و سەردانی کردووین. بۆی باس کردم بە دەیان پێشمەرگەی برینداری کۆمەڵە و دانیشتوو هاتوون بۆ سوید و کەمپەکان پڕی پڕن لە پێشمەرگەی کۆمەڵە. حوسێن زۆر چالاکانە بەشداریی لە دابینکردن و سازکردنی کەیسی ئەم پەنابەرانەی کۆمەڵە کردبوو. یارمەتیی زۆریانی دابوو لە وڵاتەکانی تری وەک تورکیا و

عێراق و ئەورووپاش بێن بۆ سوید.

موبەقێکی گەورەی لێ بوو بۆ هەموان، چووین لەوێ نان و چای بەیانیمان خوارد و ئەوەندەمان قسە کرد، لە زۆر شتی سوید و پەنابەریتی حاڵی بووم.

لەناکاو حوسێن هاتە ژوور و هەموو دەموچاوی یەکترمان لێستەوە. کە لەوێ منی بە سەلامەتی بینی، شادی لە هەموو گیانی دەباری. عەلی زەمانی لەگەڵماندا زۆر شاد بوو، ڕووی تێ کردم و گوتی: «باوەحیز کاک حوسێن زۆرت بۆ نیگەران بوو». ڕووی لە حوسێن کرد و گوتی: «کاک حوسێن بوەخشە برا، لەگەڵ عەلی شۆخیمان هەس، بەشی باوکی تۆ نایەژم»!

لەگەڵ حوسێندا چووین بۆ ژوورەکەم و شتەکانی هێنا لە موبەقەکە داینان و کلیلەکانی لای خزمەتگوزاری جێ هێشت. گوتی با بڕۆین!

ئەو ماڵەی چەند سەعات پێش پێیان دام و زۆرم دڵ پێی خۆش بوو، تەنیا چەند چرکەیەکیش تێیدا نەحەسامەوە و جێم هێشت. هەرگیز نەمبینییەوە!

بە پاس و قەتار گەیشتینە ستۆکهۆڵم، بۆ یەکەم جار سواری مێترۆ (قەتاری ژێرزەوی) بووم، هەر سەرم دەلەقاند و حوسێن توند گرتبوومی. چووینە ماڵی حوسێن و ڕەفیقە کچەکەی، ئەوەی بە شوێنمدا هاتبوو بۆ دانیمارک.

یەکەم ڕۆژی پەنابەری و قۆناغێکی تازەی ژیانم وەک کەسێکی مەدەنی و هاووڵاتییەکی سادەی وڵاتێکی ئەورووپایی، بە هەموو ماف و ئاسایش و ئەرکێکەوە دەست پێ کرد.

لە ماوەی کەمتر لە هەفتەیەکدا، بە حەولێکی زۆر و شارەزایی حوسێن، یەکەم ماڵی خوێندکاریم لە گەڕەکی «لاپیس»، سەر بە زانکۆی ستۆکهۆڵم وەرگرت و لە کۆرسی خوێندن بۆ زمانی سویدی ناونووسیم کرد.

بە کەمتر لە دوو مانگ، ئیقامە و پاسپۆرتی سیاسییان پێ دام.



سەرەتای شەستەکان حەوشەی ماڵی خۆمان.
لە ڕاستەوە، عەلی، عەتا، حوسێن، عەباس کەریمی



باخاتی دەوری ساباڵخ لە سەیران،
لە ڕاستەوە، حەسەن، مامە مەجید، عەتا، عەلی کەریمی



حەوشەی ماڵی خۆمان، پوورە هاجەر و دایکم و مناڵەکان



لە ڕاستەوە حوسێن، پەروین، کاکم حەسەن، عەتا بە باوەشیەوە،
ڕیزی پشتەوە دایکم ڕەعنا، پوورم هاجەر، عەلی بە باوەشیەوە



ە ڕاستەوە: کاکم حەسەن، دایکم ڕەعنا و پوورم هاجەر زەبیحی عەتا
لە باوەشی، ڕیزی پێشەوە عەلی و پەروین کەریمی و منداڵەکانی خاڵە
ساڵحی بابانزادە لە باخی دەرەوەی شاریان، سابڵاخ



حەوشەی ماڵی خۆمان و
ماڵی مامم، لە ڕاستەوە، عەتا،
حەسەن، نەرمین، حوسێن، مامە
مەجید و عەلی کەریمی



عەلی لە کاتی منداڵیدا



حەوشەی ماڵی خۆمان،
لە ڕاستەوە، حوسێن، عەتا، عەلی و عەباس کەریمی



هاوپۆلەکانم لە چواری سەرەتایی
لە ڕاستەوە، ڕەحمان، سمایل، عەلی کەریمی



زیندەیادان دایک و بابم



لە ڕاستەوە، پەروین، حوسێن، حەسەن، عەلی، عەتا،
بابم برایم کەریمی و دایکم ڕەعنا زەبیحی



له ڕاستەوە، عەلی، عەباس، حەسەن و حوسێن



له ڕاستەوە، ڕیزی پێشەوە، عەلی، عەباس، حوسێن،
ڕیزی پشتەوە، کاکم حەسەن و بابم



باوکم لە سەردەمی لاویتیدا



هاوڕێی منداڵیم، کاوە ئیمامی کە شەرحی مردنەکەیم باس کرد



حەوشەی ماڵی خۆمان، لە ڕاستەوە: زیندەیادان ١_ حەسەن کەریمی
٢_ جەعفەر عابد ١٩٨٢ لە زیندانی ورمێ بە بێ تاوان ئیعدام کرا
٣_ عەلی کەریمی



سابڵاخ، سەرەتای کوردایەتی
لای ڕاست عەلی کەریمی و ئەسعەد یوسفی



ماڵەکەی تەوریز، لای ڕاست عەلی کەریمی و ناسر جیهانی



١٩٧٨ خۆپیشاندانی خەڵکی سابڵاخ دژی شا،
لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێیانی شەهید و زیندوودا



خۆپیشاندان لە سابڵاخ ١٩٧٨، گۆشەی خوارەوە لای چەپ مەمەد سبزەچی، عەلی کەریمی، حوسێن کەریمی، لە ڕیزی سێهەم لە لای چەپەوە جەعفەر پیرە هەڵۆ، کەمال وەلیانی، یوسف ڕەعنایی، خالید چالاکی و... دەبیندرێن



سەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێران،
مەهاباد، خۆپیشاندانی خەڵک دژی شا



مینەی خەیات (قەڵەو)



تەوریز، عەلی لە سەردەمی خوێندکاریدا ١٩٧٧



ماڵەکەی تەوریز لە لای ڕاستەوە لەگەڵ سمایل مستەفازادە
دواتر لە ڕیزی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە شەهید بوو.



عەلی لەماڵەکەی تەوریز سەردەمی خوێندکاری



شەهید جەمال موفتی



ناوزەنگ لای ڕاست، مارتین بروانسێن لەگەڵ زیندەیاد عادل موراد



سیامەند موعینی، ئەحمەد خان پینەچیی ناسراوی سابڵاخ،
بەهمەن سەدیقی ١٩٧٨



سابڵاخ ماڵی خۆمان ١٩٧٩ ئەبوو شەهاب، عەلی کەریمی، عادل موراد



یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانساڵی ١٩٧٩، دەستەیەک چووبووین لەوانە ناسر ڕەزازی، جەمال موفتی، ئەبووبەکر و کەریم بلوری، حوسێن کەریمی، خالد چالاکی و...



مەلا بەختیار، یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران ١٩٧٩



یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران،
مام جەلال و شەهید نەجمەدین بیوک قایا دەناسرێنەوە
لە ڕیزی پێشەوە



مام جەلال قسە دەکا لە یادی دامەزراندنی
کۆمەڵەی ڕەنجدەراندا لە توژەڵە



یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران ١٩٧٩ تۆژەڵە



١٩٧٩ تۆژەڵە، یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران
شێخ عەلی وتار دەخوێنێتەوە



لەگەڵ چەند مامۆستا و دەستەی شاخەوانی لە دەورووبەری سابلاغ
لە کانی شیخان، ڕیزی سەرەوە دەستی ڕاست عەلی، عەباس، ناسر
،بودی، سالار حەیدەری، برایم قەزاق، حوسین مەدەنی، ڕیزی دووهەم
لە ڕاستەوە، حوسین کەریمی، ئاغای موعینی، کەریم قادری و کەریم
دانشیار، ڕیزی پیشەوە جەعفەری نەوزاد و وەستا حەمەدەمین



سابلاغ ماڵی خۆمان، لە ڕاستەوە عەلی ئامەخان، ئەبوو شەهاب،
سیروان تاڵەبانی، حوسێنی برام، خۆم وێنەکەم گرتووە



سابلاخ ماڵی خۆمان ١٩٧٩، لە ڕاستەوە سولەیمان بلوری، دوکتۆر
کەمال خۆشناو، عەلی حەوێز، عەلی کەریمی



١٩٧٩ سابلاخ ماڵی خۆمان لە ڕاستەوە سولەیمان بلوری، ئازاد
هەورامی، عەلی حەوێز و لایەکی منیش دیارە



ساڵی ١٩٧٩ توژەڵە، لە ڕاستەوە، ئەحمەد ئەسکەندەری، مامۆستا
شێخ عێزەدین، مامۆستا زەبیحی



ئەحمەد ئەسکەندەری، مامۆستا شێخ عێزەدین، مامۆستا زەبیحی



سالی ١٩٧٩، سنوری باشوور و ڕۆژهەلاتی کوردستان، لە ڕاستەوە چوارەم کەس، مامۆستا زەبیحی، ئەحمەد ئەسکەندەری، مامۆستا شێخ عیزەدین، یوسف ئەردەلان، لە چەپەوە دووهەم کەس سەلاح شەمسی بورهان، دیارن



شێنێ ١٩٧٩، مامۆستا شێخ عیزەدین و زەبیحی



له لای چەپەوە، عەلی ئامەخان، نەوشیروان مستەفا، ---، عادل موراد، ---



ناوزەنگ، لە ڕاستەوە نەجمەدین بیوک قایا، نەوشیروان مستەفا، عەلی ئامەخان ۱۹۷۹



سابلاخ، حەوشەی مالی خۆمان، ۱۹۷۸



ساڵی ١٩٧٩ لە ڕاستەوە ڕاوەستاوان شەهید قادر چاوشین، حەمە سەعید قەڵەو، کۆچکردوو خاڵە شێخ سدیقی چۆخماخ، سەلاح چاوشین، شەهید دڵشاد بەنگینە، عەلی کەریمی، دانیشتوەکان لە ڕاستەوە ساڵح زەرونی، شەهید حەوێز سێدەری، ساڵە سووری هەڵەدن، شەهید خەلیل موغاغی



ساڵی ١٩٧٩، ناوزەنگ، زێرۆ



ساڵح ١٩٧٩ ئازاد هەورامی و فاروق بلوری



ساڵی ١٩٧٩ توژەڵە، یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، مام جەلال، ئەحمەد دادی، نەجمەدین بیوک قایا دەناسرێنەوە



١٩٧٩ سابلاخ، له ڕاستەوە عەلی، عادل موراد، سولەیمان بلوری



سولەیمان بلوری، عادل موراد، عەلی کەریمی



۱۹۷۹، ناوزەنگ، لە ڕاستەوە--، مام مەولود، دوکتور خدر مەعسوم، ئەبوو شەهاب



شەڕی نەغەدە و بەخاکسپاردنی شەهیدەکان لە گۆڕستانی سابلاخ



سالی ۱۹۸۲ بێژوێ، لەدەستی ڕاستەوە، کامیل ئاغا، سەلاح چاوشین، عەلی کەریمی، جەمال حەمەی خواکەرەم



دەسپێکی هێرشی حکومەتی ئیسلامی ئێران بۆ کوردستان، مەهاباد ۱۹۷۹، یەکەم لەدەستی ڕاستەوە، عەلی کەریمی، دووهەم شەهید محەممەدی سەبزەچی



**یەکەم مەقەری کۆمەڵە لە شاری مەهاباد**



له لای چەپەوە شەهید محەممەد سەبزەچی له سابڵاخ ئیعدام کرا



سابڵاغ لەگەڵ سولەیمان بلوری



لە ڕاستەوە، سولەیمان بلوری، ئەبوو شەهاب، عەلی کەریمی



شەهید نەرمین
ساڵێک پێش ئیعدامکردنی ١٩٨٢



نەرمین کەریمی بە منداڵی



ماوەیەک پێش گرتن و ئیعدامکردنی، نەرمین لەگەڵ
زیندەیاد بابم ئیبراهیم کەریمی



ساڵی ١٩٨٣، کاری کوێستان داودی لە زیندانی ورمێ
بۆ شەهید نەرمین کەریمی





١٩٧٨، مەهاباد، شۆڕشی گەلانی ئێران



میتنگی ئەشرەف دەهقان لە مەهاباد ۱۹۷۹



۱۹۷۸، مەهاباد، شۆڕشی گەلانی ئێران



بەنداوی مەهاباد، لە ڕاستەوە، ڕەحمەت، جەواد، جەمال، عەلی و عەتا کەریمی کە لە سەر تویوب دانیشتووە



١٩٧٩ سابلاغ زەبیحی لە ماڵی خۆمان



له ڕاستەوە، عەلی کەریمی، ڕەحیم باباتاهیری، شەریف مەعروفی، یونس پاڵەوانی، سیامەند موعینی، بەهمەن مولازادگان، حاجیالیکەند ١٩٨٢



زەماوەندی شەریف لە حەوشەی مەقەڕی حاجیالیکەند



عەلی کەریمی



شەهید بەهمەن مولازادەگان



شەهید یونس پاڵەوانی



شەهید یوسف جەهانگیری



شەهید جەعفەری پیرەهەڵۆ



ئەو وینەیەی سیامەند لە ناسنامەی
کۆمەڵەی کردەوە و فڕێی دا



لە ڕاستەوە، ناسر تاهیری و عەلی کەریمی



له ڕاستەوە وەستا کەریم، کاک حەسەن چاپەزی مامۆستا،
شێخ عیزەدین، عەلی کەریمی، ---



گەلاڵە ساڵی ١٩٨٣ لە ڕاستەوە، عەلی کەریمی،
مامۆستا شێخ عیزەدین، حوسێن کەریمی



له ڕاستەوە، کەریم قادری، سەید برایم عەلیزادە، مینە قەڵەو، عەلی کەریمی، گوندە ڕووخاوی گەڵاڵە ١٩٨٣



گەڵاڵە ١٩٨٣، له ڕاستەوە، عەلی کەریمی، مینە قەڵەو، بازید قادری



عەلی کەریمی و کەریم قادری



حاجیالیکەند، بەردەم ئەو حەمامەی شەهید جەمال موفتی سازی
کرد، لە ڕاستەوە: ---، شەهید ڕەحیم قادری، عەلی کەریمی، کەریم
ئەفسەر، ڕەحیم باباتاهیری، بە پێوە شەهید حامد ئەعلی



له ڕاستەوە، ڕەحمان شۆڕش، ڕزگار، شەریف، عەلی کەریمی



مینە قەڵەو، هەباس و عەلی کەریمی، بێژوێ ١٩٨٣



دوكان ١٩٨٤، له ڕاسته‌وه، كه‌مال شه‌ریفزاده، عه‌لی كه‌ریمی،
سه‌عید سه‌رهه‌نگی



١٩٨٤، دوكان له‌گه‌ڵ عه‌باسی برام



دوکان ١٩٨٤ لە ڕاستەوە، عەلی، سالار حاجی دەروێش و وەستا حەمەدەمین



لە ڕاستەوە، کەمال شەریفزادە، وەستا حەمەدەمین، عەلی کەریمی سولەیمان خودایار



له ڕاستەوە، عەلی کەریمی، سالار حاجی دەرویش،
وەستا حەمەدەمین



موکریان، زستانی ١٩٨٢، له ڕاستەوە نەبی زەندی، عەلی کەریمی،
سیامەند موعینی، کەریم دانشیار



نەورۆز ١٩٨٤، عەلی کەریمی و سولەیمان خودایار



نەورۆز ١٩٨٤، سورداش، لە ڕاستەوە، سولەیمان خودایار، عەلی کەریمی، پۆلا نانەوازادەگان، کەمال شەریفزادە و محەمەد حەسنخالی



١٩٨٤ له سلیمانی ماڵی مستەفا سەید مەجید، له ڕاستەوە، یوسف زۆزانی، ئەبوو شەهاب، عەلی کەریمی



١٩٨٤ له ماڵی وەستا ئەحمەد له سلێمانی



سورداش نەورۆزی ۱۹۸٤، عەلی کەریمی و پۆلا نانەوازادەگان



گەلالە ۱۹۸۳ لەگەل کەریم قادری



دۆڵپەموو، ١٩٨٢ لە ڕاستەوە، شەهید ڕزگاری ژنبرای ئەبوو شەهاب، غەریب، عەلی کەریمی و ئەبوو شەهاب



لەگەڵ شەهید حوسێن مستەفازادە لە کەلالە ١٩٨٢



نەورۆزی سورداش ١٩٨٤



سورداش نەورۆزی ١٩٨٤ لە ڕاستەوە، کاک عومەر بابامیری، عەلی کەریمی، ڕەحیم باباتاهیری، پۆلا نانەوازادەگان



محەمەد حەسنخالی و عەلی



وەستا حەمەدەمین، عەلی و وەستا کەریم ١٩٨٤ سورداش



١٩٨٤، سلێمانی، لە پێشەوە ڕا، شۆڕش ئیسماعیل، عەلی کەریمی، سەلاح چاوشین و---



١٩٨٢، کەرتی ڕێکخستنی پێنجوێن و مەفرەزەکەی ئەبوو شەهاب، ڕاوەستا لە ڕاستەوە: ڕەحمەتی عوسمانی حاجی مەحمودی پەرخی، شەهید سەردار عەلی، عەلی کەریمی، ڕەحمەتی حەسەن حاجی خوامرادی، دانیشتووەکان لە ڕاستەوە، شێخ کامیل پێنجوێنی، ڕەحمەتی عوسمان مکلّی



شەهید
سولەیمان ڕەحیمی



شەهید کەمال وەلیانی



ئەبوو، شەهیدان سولەیمان و کەریم بلوری



عەلی، ١٩٨٣ شاربازێر



شەهید سەعید گەوهەری



سولەیمان و باوکی میرزا مینە بلوری



عەلی کەریمی، زستانی موکریان



زیخان ١٩٨٣ لەگەل مام جەلال



لە لای مام جەلال ١٩٨٣، شێخ نەبەز، شەماڵ، مام جەلال، سەلاح چاوشین، وەستا حەمەدەمین، عەلی کەریمی



دەورەی تەقەمەنی لە موکریان، لە ڕاستەوە، یونس نانەوا. یوسف جیهانگیری، نەبی زەندی، بەهمەن مولازادگان، یونس پاڵەوانی، ڕیزی دواوە عەلی کەریمی



لەگەڵ دایکم کاتی سەردانی بۆ شاخ ١٩٨٠



لەگەڵ دایکم، کتێبی ناڵەی جودایی مامۆستا هێمنی بۆ دەخوێنمەوە



موکریان ۱۹۸۳ نەبی زەندی و عەلی کەریمی



تەرمی شەهید یونس پاڵەوانی لە مزگەوتی حاجیالیکەند، لە ڕاستەوە،
جەعفەر پیرەهەڵۆ، قادر ئیبراهیم خاس، عەلی کەریمی، محێدین مەجنون



هەڵگری ئەم نووسراوە کاک علی کریمی
ناسراوی دەفتەری ماموستا شیخ عزالدین
حسینی یە و بە سەر دەچی لە ناحیەی
سەردەشت داوا دەکەین لە هەموو
پێشمەرگەکانی کوردستان لە کاتی پێویستدا
هاوکاری لەگەڵ بکەن

دەفتەری ماموستا شیخ عزالدین
٢/٢/٦٤

نامەی دەفتەری شێخ عیزەدینی حوسەینی



ئەوە لە گیرفانی شەهید ئەبوو شاهین (فواد عەرەب) دا بوو، لە کاتی پێکانی لە نێو شاری سنە، خەریکی فێربوونی کوردی بوو، پەڵە خوێنەکان بە کاغەزەکەوە خوێنی ئەم شەهیدەیە و زیاتر لە ٤٠ ساڵە پاراستوومە.





شیعرەکەی برایم جەلال بۆ کاک فوئاد مستەفا سوڵتانی
دوای شەهیدبوونی بۆی نووسی بوو



لیستی بکوژەکانی یوسف حەسنخاڵی لە شەڕی دیمۆکرات و کۆمەڵە
زیاتر لە ٤٢ ساڵە پاراستوومە




یەکێک لە کتێبەکانی خۆم، کە لە کادێنێکدا لە عەولاباد شاردبوویانەوە

## کورِم عەلی کەریمی عەزیز ١٣٥٩.١١.٦ (١٩٨١.١.٢٦)

دوای سڵاو، کارێک بکە ئەبوو بەکر نەگەڕێتەوە مەهاباد و بە زمانێکی نەرم چەکەکەی لێ وەرگرنەوە، نەبادا خۆی بکوژێت، ئاگاداری بن. ئەگەر دەکرێ چەکەکە[1] تەسلیمی حزب (مەبەست کۆمەڵە) بکەن، کۆمەڵێک بەڵگە و پوڵ دە گیرفانی سولەیماندا بوو، یەکێک دیاری بکە با تەحویلی بدەم. منیش جارێ بە دەردی خۆمەوە گرفتارم. سڵامەتیی ئێوەم دەوێ.

محەمەدئەمین بلوری

● دوو ڕۆژ دوای شەهیدبوونی سولەیمان بللوری، کە ئێمە لە شار چووبووینە دەر و ئەم بابەمان لەگەڵ دەرد و ناسۆرەکانی بەجێهێشت، زۆر بە پەلە ئەم نامەیەی بۆ ناردبووم، دیارە هەر لە بازاڕ و لەسەر کار ئەم پارچە کاغەزەی دەسکەوتووە و پەلەی بووە کە ئێمە بزانین چی لە گیرفانی جلەکانی شەهید سولەیماندا بووە تا بۆمانی بنێرێتەوە.

---

١- چەکەکەی شەهید سولەیمان کڵاشینکۆفێکی سیخۆی زۆر جوان بوو، لە سەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێراندا، لە بەرامبەر زەحمەتەکان و یارمەتیی لە ڕادەبەدەری خۆی و هەموو بنەماڵەکەیان بۆ یەکێتیی نیشتمانی، مام جەلال خۆی پێشکەشی کرد و دواتر درا بە کۆمەڵە.

## برای عەزیزم هاوسەنگەری شەهید سولەیمان، ڕۆڵەکەم عەلی گیان

دوای سڵاو هیوادارم وەزع و حاڵی هەمووتان چاک و باشتر بێت و ئەگەر لە حاڵ و وەزعی من و خانەوادەی بەدبەخت و پیر و دڵشکاو بپرسی، جاریَ دەگوزەریَ و ئومێدەوارم دوای ڕۆیشتنی سولەیمان، منیش زیندوو نەمێنم. براکەم نامەکەت کە ڕێکەوتی ۲۰-۱۱-۵۹ ناردبوو سەعات ٤ی دوانیوەڕۆ بە دەستم گەیشت و لە ناوەڕۆکی ئاگادار بوومەوە. بزانە و ئاگادار بە کە هێشتا سەرەخۆشیی سولەیمان تەواو نەبووە، بەڵام من زۆر ناڕەحەت بووم لەوەی کە ئەوەی لە گیرفانی سولەیمانی شەهیددا بوو، بریتی بوو لە ۱۸۵۰ تمەن پوڵی نەقد، چەند بەڵگە و قەبزی یارمەتی کە لە زەرفێکی پلاستیکیدا بوو، ۳ ڕۆژە کە بۆ تەسفیە لە لایان سەید حەسەن کوڕی لوتفیانی بەنێوی حوسێن چکۆل هات و بردی، من نەمدایە و هاتووە لە دایکی سولەیمانی وەرگرتووە و بردوویەتی، ئەو جۆرەی مەعلوومە لە ئاوایی سەیداوا شتەکانیان ئایا تەسلیمی ئەبوو بەکر کردووە یان لێم مەعلووم بکە کە کێ وەریگرتووە. زۆر ناڕەحەت بووم و تەنانەت ئێوارە کە چوومەوە ماڵ و لە جەریانەکە خەبەردار کرامەوە چەند ناڕەحەت بووم و لە نامە بۆ سەید حەسەن لە جوابی سەرەخۆشییەکەیدا بۆم نووسی ئەگەر مەعلووم بوو بڕی پوڵەکە زۆرترە، ئاگادارم بکەنەوە تا بینێرمە خزمەت. ئەما لە بابەت چەکی سولەیمان هیچ کەس مافی ئەوەی نییە جگە لە سەید حەسەن، نە من کە باوکی ئەوم و نە براکانی. لیباس و مەدارک و ناسنامە و هەرچی ڕەبتی بە سولەیمانەوە هەیە، لە مەقەڕ لە لای سەید حەسەن بێ تا ئەگەر کات هەبوو خۆم یەک بە یەک بێمە مەقەڕەکان و لەگەڵ تاک بە تاکتان دادەنیشم. و ئەبوو بەکرم نەناردووەتە وێ کە جێی سولەیمان بگرێتەوە، بەڵکو جێی سولەیمانی شەهید هیچ کەس لە هەموو حیزب پڕ ناکاتەوە، با ماوەیەک لەوێ بێت تاکو نامە دەنووسم بۆ سەید حەسەن تا بیگەڕێنەوە بۆ مەهاباد، بۆ ئەوەی ئەو بەکاری پێشمەرگایەتی نایە،

چونکێ ژن و منداڵی هەیە. بە هەرحاڵ لە سەید حەسەن و من مەعلووم بکەن کە ئایا پوڵ و مەدارکی گیرفانی گەیشتووەتە دەستی کێ، ویژدانی من زۆر ئاڵۆز و لە خەتەردایە و بزانە من موحتاج بە پوڵ و یارمەتیی کۆمەڵە نیم و ناخوازم ئەبوو بەکریش ئیستفادەی لێ بکا و تا بتوانم و عومرم هەیە و بکرێ خزمەت دەکەم و موزاحیم نابم. بە هیوای دیدار و ئەگەر نامەت نووسی بە فارسی بینووسە تا باش بیخوێنمەوە، بە یەک یەکی کورەکان سلاو دەگەیەنم.

**محەمەدئەمین بلوری**
**٥٩-١١-٢١**

● نامەیەکی دیکەی باوکی شەهید سولەیمان، ئەوە دەردەخات کە چەند دڵی گەورە بووە، کوڕێکی جوانچاک و پاڵەوانی وەک سولەیمانی پێشکەشی خەباتی بەرگریی کوردستان کردووە و ناشخوازێت هیچ چەشنە یارمەتییەک لەو حیزبەی سولەیمان خەباتی بۆ کردووە قبووڵ بکات و تەنانەت چی لە گیرفانیدا بووە بە موڵکی کۆمەڵەی دەزانێ و نایەوێ خۆی خاوەندارییی لێ بکات و دوای پێشکەشکردنی شۆڕەسوارێکی وەک سولەیمان بە خاک و نیشتمان هەر ئامادەیە زیاتر ببەخشێت!

## زنجیرە چاپکراوەکانی ناوەندی غەزەلنووس

١ جیهانی سۆفیا/ یۆستاین گاردەر/ و: بەهرۆز حەسەن
٢ کچەی پەرتەقاڵ/ یۆستاین گاردەر/ و: بەهرۆز حەسەن
٣ لەتەمدا دیارنیم/ دلاوەر قەرەداغی
٤ سەفەرنامە/ هیوا قادر
٥ ئێستا کچێک نیشتمانمە/ شێرکۆ بێکەس
٦ هەزار ماڵ لە خەون و ترس/ عەتیق ڕەحیمی/ ئازاد بەرزنجی
٧ زۆربای یۆنانی/ نیکوس کازانتزاکیس/ و: ڕەووف بێگەرد
٨ دەروازەیەک بۆ جوگرافیای سیاسی/ هاوڕێ یاسین محەمەد
٩ پاسەوانێک لە مەزرا/ ج. د. سالنجەر/ و: ژوان جەلال
١٠ نامبینیت چون پاییز دەبمەوە/ جەمال غەمبار
١١ جوگرافیای هەرێمی کوردستان/ هاوڕێ یاسین محەمەد
١٢ تەنیاییەکی پڕ هەراوزەنا/ بوهیمیل هراباڵ/ و: دلاوەر قەرەداغی
١٣ کازینۆی منداڵان/ کاروان کاکەسوور
١٤ ڕاپۆرتی مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو/گارسیا مارکیز/ و:حەمە قادر
١٥ خێراکە... مردن خەریکە بگات/ شێرکۆ بێکەس
١٦ سوارچاکێکی نەبوو/ ئیتالۆ کالڤینۆ/ و: ئەحمەدی مەلا
١٧ ئەحمەد شاملوو/ ئەحمەد شاملوو/ و: بەڕۆژ ئاکرەیی
١٨ نوسین بە ئاوی خوڵەمێش/ شێرکۆ بێکەس
١٩ تۆ مەچۆ بۆ شەڕ/ ماردین ئیبراهیم
٢٠ جوگرافیای ستراتیجی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست/ جیفری کەمپ ڕۆبەرت هارکاوی/ هاوڕێ یاسین محەمەد
٢١ کەوتن / ئەلبێر کامۆ/ و: سەیوان محەمەد
٢٢ حەفتاکێل/ یەدوڵڵا ڕوئیایی/ و: بەڕوژ ئاکرەیی
٢٣ ئیتر لە دەرگا نادات پۆستەچی/ بوشرا کەسنەزانی
٢٤ لۆلیتا/ ڤلادیمێر نابۆکۆڤ/ و: توانا حەمەنووری
٢٥ جۆناسانی نەورەس/ ڕیچارد باخ/ و: ئازاد بەرزنجی
٢٦ عاشق هەمیشە تەنیایە/ سوهراب سپهری/ و: ئازاد بەرزنجی

٢٧ ژنێک لەبەردەم ورزێکی سارددا/ فرووغ فەڕوخزاد/ و: ئازاد بەرزنجی
٢٨ دیوانی لەتیف هەڵمەت
٢٩ دیوانی ڕەفیق سابیر
٣٠ ئیمپراتۆریای لم/ ڕەفیق سابیر
٣١ بەستاندارکردنی زمان و ئەلفوبێی کوردی/ ڕەفیق سابیر
٣٢ ئەفسانەی سیزیف/ ئەلبێر کامۆ/ و: ئازاد بەرزنجی
٣٣ کوڕێژگە بیجامە خەتخەتەکە/ جۆن بۆین/ و: ماردین ئیبراهیم
٣٤ گوڵی ڕەش/ شێرزاد حەسەن
٣٥ حەسار و سەگەکانی باوکم/ شێرزاد حەسەن
٣٦ لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا/ ساموێل بێکێت/ و: سەرکەوت جەلیل
٣٧ فەهرەنهایت ٤٥١/ ڕەی برادبێری/ و: سەیوان محەمەد
٣٨ جوگرافیای خاک/ د. هاوڕێ یاسین محمدامین
٣٩ جیۆپۆلەتیکی گۆڕانی ئاووهەوا/ جیمس. ئار. لی/ د. هاوڕێ یاسین محمدامین
٤٠ چەمکی ژیان و مردن لە شیعری مەولەوی و مەولانای ڕۆمیدا/ د. سەبور عەبدولکەریم (شکار)
٤١ ڕەنگدانەوەی کەسێتی و دنیابینی حەلاج لەشیعری کلاسیکی کوردی و فارسیدا/ د. سەبور عەبدولکەریم (شکار)
٤٢ تاوان و سزا/ فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی/ و: ڕەووف بێگەرد
٤٣ مەسخ/ فرانس کافکا/ و: پێشەوا فەتاح
٤٤ ماڵی نانی/ کاروان کاکەسوور
٤٥ بێگانە/ ئەلبێر کامو/ و: د. موحسین ئەحمەد عومە ر
٤٦ مەنفا و مەملەکەت/ ئەلبێر کامو/ و: د. موحسین ئەحمەد عومەر
٤٧ زەماوەند و هاوین/ ئەلبێر کامو/ و: د. موحسین ئەحمەد عومەر
٤٨ هەزار خۆری درەوشاوە/ خالید حوسەینی/ و: ئازاد بەرزنجی
٤٩ چیاکانیش دەنگیان دایەوە/ خالید حوسەینی/ و: ئازاد بەرزنجی
٥٠ زۆربای یۆنانی/ نیکۆس کازانتزاکیس/ و: ڕەووف بێگەرد/ چاپی شەشەم
٥١ چیرۆکی ئەیووب بە گێڕانەوەی تەورات/ و: حەمە قادر
٥٢ پاریس جەژنی نەبڕاوە/ ئێرنست هەمنگوەی/ و: ژوان جەلال

٥٣ بەرەی ڕۆژئاوا ئارامە/ ئێریش ماریا ڕیمارک/ و: کەریم پەڕەنگ
٥٤ دەروازەیەک بۆ میتافیزیکا/ ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام/ و: هۆشمەن جەلال
٥٥ گفتوگۆ لەگەڵ مێژوودا/ ئۆریانا فالاچی/ و: عەزیز گەردی
٥٦ گاتسبیی مەزن/ ف. سکۆت فیتزجێراڵد/ و: سەیوان محەمەد
٥٧ کاک برایم و گوڵەکانی قورئان/ئێریک ئیمانوئیل شمیت/ و: سەلاحەدین بایەزیدی
٥٨ مێروولەکان بەژێر ڕووناکیی مانگدا دەڕۆن/ بەختیار حەمەسوور
٥٩ بەخێر بێن بۆ بیابانی ڕیاڵ/ سلاڤۆی ژیژەک/ و: وەلید عومەر
٦٠ حیکایەتی چل شەوەی شاری قەلەندەران/ بە ڕیوایەتی بوشرا کەسنەزانی
٦١ قاوەکان خراپ سەفەر دەکەن / پەری کەریمی نیا
٦٢ کێ-لە-من-و-ڤیرجینیا-ڤۆلف-دەترسێت/ پەری کەریمی نیا
٦٣ هەموو ڕێگاکان دەچنەوە قرەجاڕ؟ / پەری کەریمی نیا
٦٤ ئاسمان و ڕێسمان /حوسێن حوسێنی
٦٥ گیرۆدەیی: گەورەترین نهێنیی فیزیا /ئامیر ئەسڵ/ و: حوسێن حوسێنی و د. ئومێد غەریب
٦٦ عەشیقی وەرگێڕ / جان دۆست / و: سەباح ئیسماعیل
٦٧ مێژووی ڕەخنەسازی / پ. د. کامل حەسەن بەسیر
٦٨ ئیسلام لە شەبەنگی فەلسەفەی ئایینەوە / ئازاد قەزاز
٦٩ کۆمار / ئەفلاتوون / د. محەمەد کەمال
٧٠ سۆسیۆلۆژیای بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان / عادل باخەوان
٧١ وڵاتێک بۆ مردن / عەبدوڵلا تایع / و:سەلاحەدین بایەزیدی
٧٢ ئەودیوی فیزیا چاوپێکەوتن و گفتۆگۆ/ ویرنەر هایزەنبێرگ / و: حوسێن حوسێنی
٧٣ فەرهەنگی زاراوەکانی ئەدەب و زانستە مرۆڤایەتییەکان/ د. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد
٧٤ بوودای ناو هەورەبانەکە / جولی ئۆتسوکا / و: سەیوان محەمەد
٧٥ سەرهەڵگرتن / هێرتا مولەر/ و: عەبدولغەنی کاکۆ
٧٦ ستروکتوورەکانی بیرکردنەوە و گەشەسەندنی مەعریفیی منداڵان/ فایەق سەعید

٧٧ مۆسیقا فەرامۆشی کردم/ شالاو حەبیبە
٧٨ دەرۆزەکەرەکانی سەربەستی / شێرزاد حەسەن
٧٩ هۆمۆسێکسوالی و داهێنان / د. ڕەمسیس عەوەز / و: شوان ئەحمەد
٨٠ ئیمان یا بێ ئیمانی / ماریا مارتینی و ئەمبەرتۆ ئێکۆ / و: مەحموود شێرزاد
٨١ مامۆستای نەزان / ژاک ڕانسیێر / مەنسوور تەیفووری
٨٢ گەردوون، کات و پەیدابوونی ژیان/ گۆران ئیبراهیم
٨٣ پێناسەیەکی زۆر کورت بۆ هیچ / فرانک کلۆز / و. گۆران ئیبراهیم
٨٤ ڕیبەنێکی سوور و ملپێچێکی ڕەش/ کاروان عومەر کاکەسوور
٨٥ نەوەکەی مسیولین / فیلیپ کلۆودێل / و. سەلاحەدین بایەزیدی
٨٦ گەڕان بۆ کاتی لەدەستچوو (بەرگی یەکەم)/ مارسێل پرووست/ و. سیامەند شاسواری
٨٧ دڵی تاریکی/ جۆزیف کۆنراد/ یاسین محەمەد
٨٨ قاچی چەپم/ کریستی براون/ و. باهۆزێ میر داوود
٨٩ دیاردەناسیی شوێن و شوناس/ ڕێبوارسیوەیلی
٩٠ گێلەکانی چێلم و مێژوویان/ ئیزاک بێشڤیس سینگەر/ و. عەزیز گەردی
٩١ دەربارەی ستەمکاری/ لیۆشتراوس/ و. فاروق ڕەفیق
٩٢ خۆشم ویست / ئانا گاڤاڵدا/ و. ژوان جەلال
٩٣ نەخۆشی مەرگ/ مارگریت دوراس/ و. کەریم تاقانە
٩٤ سۆسیولوژیای زەبروزەنگ/ و. عادل باخەوان
٩٥ ئەفسانەی سیزیف/ ئەلبێر کامۆ/ و: ئازاد بەرزنجی/ چاپی دووەم
٩٦ دەقە شیعرییەکانی گۆران لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونشیکارییە/ سامان عیزەدین سەعدون
٩٧ هەڵزنین بەرەو هەڵدێرگە / فاروق ڕەفیق
٩٨ کوندەپەپووی کوێر/ سادق هیدایەت/ و. فەرشید شەریفی
٩٩ بەفر/ ماکسێنس فێرمین / و. ئازاد بەرزنجی
١٠٠ کەمانچە ڕەشەکە / ماکسێنس فێرمین / و. ئازاد بەرزنجی
١٠١ هەنگەوان / ماکسێنس فێرمین / و. ئازاد بەرزنجی
١٠٢ دیزاینی مەزن / ستیڤن هۆوکینگ / و. حوسێن حوسێنی و کامیار سابیر

١٠٣ ئەزموون و یاد ( کتێبی سێیەم / ١٩٨٩_ ٢٠٠٣) / پشکو نەجمەدین
١٠٤ ئاهەنگی ماڵئاوایی / میلان کوندێرا / و. ڕەووف بێگەرد
١٠٥ دەروازەیەک بۆ جوگرافیای سیاسی/ هاوڕێ یاسین محەمەد/ چاپی دووەم
١٠٦ جوگرافیای مرۆیی ململانێی مرۆڤ لەگەڵ ژینگە/ عبدلله عەتوی/ و: م. ئەحمەد عەلی و هاوڕێ یاسین محەمەد
١٠٧ جوگرافیای دەرەمەتە سروشتییەکان/ د. هاوڕێ یاسین محەمەد
١٠٨ یادگارییەکانی خانەی مردووان/ دوستۆفیسکی/ و. حەمەکەریم عارف
١٠٩ کارکردنی ئەکتەر لە سەر خۆی لە میانەی کاریگەری وەرگرتندا/ ستانیسلافسکی/ و. پێشڕەو حسێن/ بەرگی یەکەم
١١٠ شتەکان لێک دەترازێن / چینوا ئەچێبێ/ و. یاسین محەمەد
١١١ سمایل گەشتێک بە هزر و ڕۆحدا/ دانیاڵ کوین/ و. دیلان قادر
١١٢ گەڕان بۆ کاتی لەدەستچوو (بەرگی دووەم)/ مارسێل پرووست/ و. سیامەند شاسواری
١١٣ ساڵانی هەورین/ عەلی ئەشرەف دەروێشیان/ و. عەزیز گەردی
١١٤ هەر تەنها مانگ نییە لەژێر درەختا بیردەکاتەوە/ عەبباس بەیزون/ و. عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی
١١٥ پەڕەسێلکەکانی کابول/ یاسمینە خەزرا/ و. تارا شێخ عوسمان
١١٦ پاسەوانێک لە مەزرا/ ج. د. سالنجەر/ و: ژوان جەلال
١١٧ قارەمانەکان و گۆڕەکان/ ئێرنستۆ ساباتۆ/و: حەمە قادر
١١٨ ماتریالیزمی مێژوویی/ ئالان وودس و ڕۆب سیوێل/ و: کارزان عەزیز
١١٩ ماڵە ئەندەلوسییەکە/ واسینی ئەلئەعرەج/ و: سەباح ئیسماعیل
١٢٠ دارستانی ونبوو/ ڕافایل ئەلبێرتی/ بورهان عەتا
١٢١ زەنگەکانی ڕۆما/ جان دۆست/ سەباح ئیسماعیل
١٢٢ کورتیلەیەک لە مێژووی کات/ ستیڤن هۆوکینگ و لیۆنارد ملۆدینۆ/ و. حوسین حوسینی و د. هاوڕێ عومەر
١٢٣ نامە بۆ میلینا/ فرانتس کافکا/ و. ڕەووف بێگەرد
١٢٤ تەپڵی تەنەکە/ کوینتەر گراس/ و. کەریم پەڕەنگ
١٢٥ برسێتی/ کنووت هامسۆن/ حەمە قادر

١٢٦ کتێبی نووسینەوەی هەزارویەک خەون/ لازۆ ئازاد
١٢٧ خوێنبەربوونی بەرد/ ئیبراهیم ئەلکونی/ ئازاد مەولوود
١٢٨ وشەکان و تابلۆکان/ فۆکۆ و هاوڕێکانی/ و: هاوار محەمەد
١٢٩ ژیان لەگەڵ چەترەکەمدا/ ڕۆمەن گاری/ و:سەلاحەدین بایەزیدی
١٣٠ پڵینگەکانی کافکا/ مواسیر سکلیر/ و: سەیوان محەمەد
١٣١ گەردوون لە توێکڵەگوێزێدا/ ستیڤن هۆوکینگ/ و: حوسێن حوسێنی
١٣١ ئیتر قیتارەکان ناگەن/ سیروان کەریم
١٣٢ کالیگولا/ ئەلبێرت کامو/ و: د. موحسین ئەحمەد عومەر
١٣٣ دادپەروەران/ ئەلبێرت کامو/ و: د. موحسین ئەحمەد عومەر
١٣٤ گەڕان بۆ کاتی لەدەستچوو (بەرگی سێیەم)/ مارسێل پرووست/ و. سیامەند شاسواری.
١٣٥ هەشت نامە/ کوینتەرگراس و کینز بۆرا/ و. ڕەووف بێگەرد
١٣٦ ئەو مریشکەی خەونی بە فڕینەوە دەبینی/ سۆن می هوانگ/ باهۆزێ میر داوود
١٣٧ پیاوی ناو هەورەکان/ کۆس مایندەرتس و ئانێتا فینیخ/ ڕۆشنا محەمەد
١٣٨ کچەبەفرینە/ کۆس مایندەرتس و ئانێتا فینیخ/ ڕۆشنا محەمەد
١٣٩ ئەستێرەکان بژمێرە/ لویس لەوری/ شلێر ڕەشید مەحمود
١٤٠ عەتری ئەو عاشقانەی مردن/ ئەدۆنیس/ تەلعەت تاهیر
١٤١ شازادە چکۆلە/ ئەنتوان ئیگزۆپێری/ سەلاحەدین بایەزیدی
١٤٢ هەڵەی ناو ئەستێرەکانی بەختمان/ جۆن گرین/ ژیوار جەوهەر
١٤٣ خوایە تۆ لەوێی، منم مارگریت؟ جودی بلوم/ هەژار عوسمان
١٤٤ ئەم هونەری شیعرە/ بۆرخیس/ سەیوان محەمەد
١٤٥ ئێستای ئەلوشن/ گۆران ئیبراهیم
١٤٦ هێشتا لە سەفەردام/ سوهراب سپهری/ و: پێشڕەو حسێن و سۆران نەقشبەندی
١٤٧ سێ هەنگاو و سێدارەیەک/ جان دۆست/ وریا غەفووری
١٤٨ هیچ کەس وەک تۆ هیی ئێرە نییە/ میراندا جولای/ و: هێشوو خسرەوی
١٤٩ لەدایکبوونی وشە/ فاروق عومەر سدیق

١٥٠ بیرەوەرییەکانی ئانا گریگۆریڤنا/ خێزانی ڕۆماننووس دۆستۆیڤسکی/ و: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد
١٥١ ئینسانێک بە پێوە/ د. فریدیریک تیسۆ/ د. موحسین ئەحمەد عومەر
١٥٢ بۆچوونەکانی لێبووکێک/ هاینریش بوێل/ و:کەریم پەڕەنگ
١٥٢ گەڕان بۆ کاتی لەدەستچوو (بەرگی چوارەم)/ مارسێل پرووست/ و. سیامەند شاسواری
١٥٣ منداڵە پێخاوسەکان/ تەقی کاغەزچی/ ڕووناک شوانی
١٥٤ ڕووەکی/ هان کانگ/ و: هەژار عوسمان
١٥٥ خۆزگە بەردەکان دەیانتوانی بدوێن/ ماگدا ئێگێنس/ و: کەریم تاقانە
١٥٦ بە ناوی دایک/ ئێری دی لۆکا/ و: خەسرەو مەحموود
١٥٧ با بە ڕووتی بچینە ژێر باران/ سوهراب سپێهری/ و: مەریوان هەڵەبجەیی
١٥٨ مەرگی من ڕۆژێک/ فرووغ فەرۆخزاد/ و: مەریوان هەڵەبجەیی
١٥٩ دەروونناسیی گەشەکردن/ نووسینی: میران زوهدی
١٦٠ سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان/ قادر عەبدوڵلا/ و: سەلاحەدین بایەزیدی
١٦١ میلارێپا/ ئێریک ئیمانوئێل شمیت/ و:سەلاحەدین بایەزیدی
١٦٢ هاوسەنگی ئاویی لە عێراق و قەیرانی ئاو لە جیهاندا/ فواد قاسم الامیر/ و:دکتۆر خلیل کریم محمد و مامۆستا احمد علی احمد
١٦٣ ئەو ڕۆژەی کە خۆی فرمێسکەکانم دەسڕێتەوە/ کینزابۆرۆ ئۆ/ فەرشید شەریفی
١٦٤ بنەما زانستییەکانی ئاووهەوای پراکتیکی د. هاوڕێ یاسین محمد ئەمین
١٦٥ شەوانی هیندی/ ئەنتونیۆ تابووکی/ ماردین ئیبراهیم
١٦٦ فەلسەفە و ئازارەکانی ژیان/ ئارتۆر شوپنهاوەر/ عەبدوڵلا ئەمینی
١٦٧ گۆڕانکاری ئاووهەوا و کاریگەری لەسەر ژینگەی سلێمانی و دەوروبەری/
د. هاوڕێ یاسین محمد ئەمین
١٦٨ دەزانم باڵندەی ناو قەفەزەکە بۆچی گۆرانی دەچڕێت/ مایا ئەنجیلۆ/ یاسین محەمەد

١٦٩ فیزیای کوانتەم، وەهم یان هەقیقەت؟/ ئالستەر ڕای/ حوسێن حوسێنی
١٧٠ گەڕان بۆ کاتی لەدەستچوو (بەرگی پێنجەم)/ مارسێل پرووست/ و. سیامەند شاسواری
١٧١ مەسخ/چ٣/ فرانس کافکا/ و: پێشەوا فەتاح
١٧٢ میریام/ تروومان کاپۆتی/ و: هەژار عوسمان
١٧٣ کەشتیی تاریک/ شێرکۆ فەتاح/ و: پێشەوا فەتاح
١٧٤ ڕێگەکانی ژەهر/ کاروان عومەر کاکەسوور
١٧٥ خۆڵەمێشی ناودارەکان/ سیامەند هادی
١٧٦ پیاوی سێیەم/ گراهام گرین/ و: ئاران موهەندیس
١٧٧ هایدی/ یۆهاننا شپیری/ و: سەلاحەدین بایەزیدی
١٧٨ حەسار و سەگەکانی باوکم/ شێرزاد حەسەن
١٧٩ پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکان/ شێرزاد حەسەن
١٨٠ تەمی سەر خەرەند/ شێرزاد حەسەن
١٨١ خەونی جاڵجاڵۆکەکان و ژنێکی منگن/ شێرزاد حەسەن
١٨٢ ژنێک بەسەر منارەوە/ شێرزاد حەسەن
١٨٣ دوا شەوی دابەزینی عیسا/ شێرزاد حەسەن
١٨٤ تەنیایی/ شێرزاد حەسەن
١٨٥ گوڵی ڕەش/ شێرزاد حەسەن
١٨٦ گەڕەکی داهۆڵەکان/ شێرزاد حەسەن
١٨٧ پیرەپەپوولەکانی ئێواران/ شێرزاد حەسەن
١٨٨ ژیان چییە؟ لایەنە فیزیاییەکانی خانەیەکی زیندوو/ ئێراوین شرودینگێر/ و: حوسێن حوسێنی و هێمن حوسێن
١٨٩ نانی بەیانی لە تیفەنی/ تروومان کاپۆتی/ و: ئاران موهەندس
١٩٠ ڕۆحی ئێمە لە شەودا/ کێنت هاروف/ هەڵۆ فەریق
١٩١ سلوولی ١٨/ عەلی ئەشرەف دەرویشیان/ و: عەزیز گەردی
١٩٢ نامەیلێ بۆ شاعیرێکی گەنج/ ڕەینە ماریا ڕیلکە/ و:دیلان قادر
١٩٣ ڕاگەردان/ کاروان عومەر کاکەسوور
١٩٤ قیژە/ فەرهاد چۆمانی
١٩٥ پیاسەیەک لەگەڵ جۆن دۆن/ نەزەند بەگیخانی

